دەکوژرێ و، محەمەدسانیش بەرەو شارەزووردەچێ. لەم کاتەدا فەرمانی سانیەتی بۆمنیرە خانی کچی محەمەد عەلی بەگ، دەردەچێ و، بۆماوەی ساڵێك دەبێت بەسانی لهۆن. پاشان ،میرزا هیدایەت، محەمەدسان، دڵخۆش دەکات و، دەگەڕێتەوە هەورامان و، منیرەسان دەخوازێ و، محەمەد سان خۆی دەبێتەوە بەسانی هەورامانی تەخت و شامیان و، قادر بەگی عومەر بەگیش دەکرێت بەسانی لهۆن.

**قادرسانی غەفار بەگ لەشکر دەهێنێتە( ملە شۆپە ):**[٢٠]

بەهۆی ئەوەی،خوشکی ئەم قادربەگە،(خاتوو زوبەیدە)،بوو بەخێزانی والی سنەو، خزمایەتی‌یان پەیدا کرد...فەرمانی سانیەتی،بۆقادر بەگ دەرچوو، بوو بەسانی لهۆن و، لەهانەگەرملە دانیشت. هەربەفەرمانی والی، قادرسانی عومەربەگیش لەسانیەتی لادەبرێت، بەڵام قادرسانی‌عومەر بەگ،مل نادات بەقادر سانی غەفار بەگ.

ئیتر، چونکە،قادرسانی غەفار بەگیش،خۆی ناتوانێ لادێکانی ژێر دەسەڵاتی قادرسانی عومەربەگ، بخاتە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە،بۆیە:پەنادەباتە بەرسوپای عوسمانی‌و، ئۆردویەکی گەورەو فراوان،لەلهۆنی جاف و بەگلەرانی سوپای تورك، دەهێنێتە سەر قادر سانی عومەربەگ،ئەمیش(کوڕی عومەربەگ) لەنەوسود بەفەرمانەدەی، ئەحمەدبەگی مەحمودبەگ،کەبەئەحمەدی خاتونلە بەناوبانگە- کەژنەکەی خاتوو شازەی کچی محەمەد سانە،کەبەناوی ئەوەوە ناوبانگی دەرکردووە- لەشکرێك ئامادە دەکات،لەتفەنگچی لهۆن وهەورامانی تەخت و ڕەزاوو ... محەمەد سان پشتگیری قادرسانی عومەر بەگ دەکات و،ئەم ئەحمەدی خاتونلەی ناردووە،کەهەم زاوایەتی‌و،هەم برازایەتی‌و، جێگە داریشیەتی.

کەلەشکری قادرسانی‌غەفار بەگ دەگاتە(تەوێڵە)،شێخ عوسمان سراجەدین و مەلانەزیری گەورە،دەچن تکا لەقادرسانی غەفاربەگ دەکەن،کەواز لەم براکوژی‌یە، بهێنێ‌و موسوڵمانان بەکوشت نەدات.بەڵام قادر سان گوێ‌ی بەو ئامۆژگاری‌یە نەداوە،ملی پێوە ناو، گەیشتە (ملە شۆپە).

لەشکری هەردوولا،بەرامبەر یەکتر،وەستان و،کەوتنە شەڕەوە،دەنگی تەقەو دوکەڵ و هاوار ناڵەو گرمە،ئەو چەم و دۆڵەی پڕکرد. زۆری پێ‌نەچوو لەشکری قادرسانی عومەربەگ، بەفەرماندەی ئەحمەد بەگ سەرکەوت و لەشکری جاف و عوسمانی و قادرسانی غەفار بەگ شکاوبەرەو تەوێڵەو دزاوەر ڕایان

کردو، قادرسانی غەفار بەگیش خۆی کوژرا، ئەمەش لەساڵی (١٨٣٥ن) دەبێت، ئەمیش زۆری پێنەچوو، کوڕانی عوسمان سان (ئەحمەد بەگ و محەمەد سەعید بەگ)، قادرسانی عومەربەگ لەنەسود دەکوژن و، ئەحمەدبەگ، دەبێت بەسانی لهۆن.

پاشان ئەحمەد بەگ و حەمە سەعید بەگ ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیان،بۆیە حەمە سەعید بەگ چووە لای حەسەن سانی هەورامان. ئەویش لەشکرێکی بەسەر کردەی بارام بەگی برای،ناردە پشتیوانیو،لەگەڵ حەمە سەعید بەگ دا هێرشیان بردەسەر ئەحمەد سان وشەوێك دایان بەسەری داو گرتیان و ئیتر محەمەد سەعید بەگ بوو بەسانی لهۆن. (دواترباسیدەکەین).

**محەمەدسانی کوری محەمەد یوسف سانی کوڕی پیری بەگ:** [٢١]

ئەوەبوو، محەمەد بەگی کوڕی محەمەد یوسف سان، کەبرای ئەسکەندەرسان بوو، بووبە جێگری (نائب الحکومە)ی،ژنی ئەسکەندەر سان کەناوی (خاتو هۆریزاد)ە زۆر بەسەر سانیەتی (خاتو هۆریزاد سان)دا، نەچوو، کەمحەمەد بەگ چووە سنەو، لەوێ لای والی فەرمانی،سانیەتی بۆخۆی هێناو، (خاتو هۆریزاد)سانی برازنیشی مارەکردو، بوو بەسانی هەورامانی تەخت و ڕەزاو شامیان و دزلی،ئەحمەد بەگی مەحمود بەگی برازای(ئەحمەد خاتونلە)ش دەبێتە جێگری...پاش دوو ساڵێ ئەحمەدبەگ، سەرپێچی دەکاتو، محەمەد سان دژی دەوەستێ، بەلام والی کوردستان پشتگیری ئەحمەد بەگ دەکاتو،دەیکات بەسان و،محەمەد سان لادەبات. محەمەد سان بەبێ دەستکردنەوە، بەرەو شامیان دەڕوات و، لە(قەلاگا)،بۆخۆی دانیشت تالەساڵی(١٨٤٢ن)کۆچیدوایی دەکات.

هەرسێ کوڕی محەمەد سان، (حەسەن بەگ ومستەفا بەگ وبارام بەگ)، لەدوای باوکیان دەسەلات پەیدا دەکەن و،دوانیاندەبنە سان ویەکێکیشیان دەبێتەخان. حەسەنیان لەگەڵ براکانی ،تفەنگچی کۆدەکەنەوە و ،هێرش دەکەنەسەر ئەحمەد سان و،بەرەو سنەراوی دەنێن ،حەسەن بەگ ،ئعلانی سانیەتی خۆیدەکات و لەهەورامان نیشتەجێ دەبێت.

ئێستا بائەمەبێنینە بەرچاو: لەهەورامانی تەخت و ڕەزاو و دزلی... کورانی محەمەدسان..حەسەن سان و بارامبەگ ومستەفابەگ ـ دەسەلاتداران، بەلام حەسەن، سانی هەورامانە. لەهەورامانی لهۆنیش ـ هانەگەرملە و نەوسود ـ کوڕانی عوسمان سان، ئەحمەد سان و حەمەسەعید بەگ و بەکربەگ

دەسەڵاتدارن، بەڵام ئەحمەد،سانی لهۆنەو، زۆری پێ نەچوو محەمەد سەعید بەگ بوو بەسانی لهۆن.

**حەسەن سانی کوری محەمەد سان**[٢٢]

لەپێشتر، ئەوەمان باس کرد کەچۆن توانی خۆی بکات بەسان ... هەرکاتێك، سانێك دەسەڵاتی دامەزرابێت و، شەڕو ئاژاوە نەبووبێت، یاخود دوو سان نزیك بووبنەوە لەیەك و، پشتیوانی یەکیان کردبێت، والی سنە -کێچ چوەتە کەوڵی- و ئارامی لێبڕاوەو، خەریکی پیلان بووە، چۆن ئەم وەزعە تێك بدات...

بێگومان حەسەن سان و حەمەسەعید سان، هەم دەسەڵاتیان خەریك بوو، دادەمەزراو، فراوان دەبوو، هەم نزیك بووبوونەوە لەیەك، لەهەوڵی سەربەخۆیی هەورامان بوون، بۆیە: لەوکاتە ئەمانوالله خان ناسراو بە غوڵامشاخان، والی سنە دەبێ، هەندێك شکاتی حەسەن سان دەکەن لەلای، ئەویش، فەرمانی گرتنی دەدات و، لەخانەی دیوان بەگی سنە دارکاری دەکرێت.. پاشان ئازاد دەبێت. ئیتر لەوە بەدواوە، حەسەن سان، گوێ بەفەرمانی والی نادات و، باوەڕ بەسوێندر قسەکانی ناکات، بۆیە والیش لەوە بەدواوە، لای نەصرەدین شای قاجار، حەسەن سان بەیاخی لەقەڵەم دەدات.

دوایی والی ناردیشی بەشوێن حەمەسەعید سان دا، بەڵام ئەو یش نەچوو، چونکە سزادانی هاوڕێکەی (حەسەن سان)ی لەبەرچاو بوو... لەبەرئەوە لەساڵی (١٨٥٢ز)دا، والی لەشکرێکی گەورە کۆدەکاتەوەو دەیکات بەدوو بەشەوە:

بەشێکی بەفەرماندەیی (سەرهەنگی فەوجی کوردستان -نەجەفقولی خان)، بەرەو لهۆن دەکەوێتەڕێ...

بەشەکەی تری لەشکر-غوڵامشاخان- خۆی فەرماندەیی دەکات و بەرەو ناوچەکانی حەسەن سان دێت...

حەسەن سان، بۆئەمە چووە خزمەت شێخ عوسمانی سەراجەدینی تەوێڵە، بۆ ئەوەی شێخ بکەوێتە نێوانیانەوەو، والی هێرشەکەی نەکاتە سەر هەورامان، شێخ هاتە دێی (نژمار) گەیشتە لای والیو، پاش گفتوگۆو بەخێر هاتن، شێخ داوای لەوالی کرد کەهێرش نەکاتە سەر خەڵکی هەورامان و، باشتر وایە وازیان لێبهێنن بۆ ئەوەی بۆخۆیان بژین! بەڵام والی بەگوێی شێخی نەکردو، شێخیش بەرەو دێی دەگا شێخان، گەڕایەوەو، ئالەوێوە نامەیەکی گلەیی بۆ والی نووسیو، والیش لەوەڵامی نامەکەدا کەلەداوێنی نامەکەی شێخدا نوسیبووی:

ما شێخ و زاهد کمتر شناسیم      یا جام، بادە، یا قصە، کوتاە

وەڵامەکـەی والی، بـۆ شـێخ لەکاتێکـدا گەیشـتە بـەرەوە، لەگەردنگـەی پیادەڕێدا، درایە دەست شێخ و شێخیش بۆ جاری دووەم، بەم شێوەیە وەڵامی والی دایەوە:

گدای کوی میکدەام لیک ویستی بین  کەبر فلک و حکم بر ستارە کنم

حەسەن سان کەزانی هیچ جۆرە بەرگرییەکی پێناکرێت، بەخاوو خێزان و هۆزانـەوە بـەرەو شـارەزوور ڕۆیشـت، لـەنیوەی ڕێگـا خێزانەکـەی -دایکـی ڕۆستەم سـان و بـرزوو بـەگ- کۆچـی دوایـی کـردو لـەمیری سوور ناشتیان... غوڵامشـاخانیش دەگاتـە حەوشـی بـەدرانی، پـاش (٢٠) ڕۆژ، لـەوێ مایـەوە، لەوکاتەدا هەواڵی بریندار بوونی شای پێگەیشت.. ئیتر بۆ سنە گەڕایەوە.

لەولاشـەوە لەشـکری والی لـەلهۆن دا، تووشـی شـەڕێکی قـورس دەبێـت و، دەشکێت، بەڵام لە هەورامانی تەخت دا، بێبەرگری کردن، والی سەرکەوتووە.

زۆری نەبرد، لەلایەن والییەوە، حەسەن سان و حەمەسەعید سان، فەرمانی سانیەتیان بۆ دەرچوویەوەو کرانەوە بەسان.

ئـەمجارە حەسـەن سـان، پایتـەختی بـردە دزڵـی، کەپێشـتر لـە هـەورامانی شـاردا بـووە، وە ناوچـەو دێکـانی بـەش کـرد بەسـەر بـەگزادەکانی بـرای و ئامۆزاکانیدا.

والی هەرچەند دەکات، حەسـەن سان ناچێت بۆ سنە، بۆیـە والی سـەردانی حەسەن سان دەکات و، دێتـە دزڵـیو پاشـان، دەچێتە کەیمنـەو لـەوێ بەخزمـەتی شێخ عوسمانی تەوێڵە دەگات و، لەهەجیجەوە بۆ سنە دەگەڕێتەوە.

پـاش دوو سـاڵ غوڵامشـاخان (گوڵـە زەڕخـانم = کلاوزەڕ خـانم)ی کچـی بـارام بـەگی برایهەسـەن سـان، دەبێتـە هاوسـەری، هەر لەبـەر ئەمـەش بـوو، بـارام بـەگ کـرا بەحاکمیهەورامان و مەریوان.پاش ساڵێ مستەفا بەگیش دەکات بەحاکمی مەریوان.

بێگومان والییـەکانی سنە، زۆر هـەوڵیان داوە، ژن و ژنخـوازی یـان، لەگـەڵ سان و بەگزادەکانی هەورامان دا ببێت، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەکە:

- شۆخ و شەنگی ئافرەتی هەورامان.
- ژیـری و سـەلیقەیان، لـەماڵ و کاروبـاری ژیـان و هاوسـەرێتیو میـوان بەڕێکردندا.
- بـۆ کـۆنترۆڵ کردنـی هـەورامان، بـۆ ئـەوەی سـانەکان دامـرکێن و، سـەر بەوالی بن و پاڵ نەدەن بەشوێنـی تـرەوەو، سەرپێچـی نەکـەن، واتـە مـەرامی سیاسی بووە...هتد.

پاش تێپەڕ بوونی سێ‌ساڵ، مستەفا سان، لەلایەن والی‌یەوە لەسنە بەند دەکرێت، دوایی بەهۆی حەسەن سان و بارام بەگەوە، مستەفا سان ئازاد دەکرێت دوای جەریمە کردنی بە (٤٠٠) تمەن.

**فەرهاد میرزاو کوشتنی حەسەن سان[٢٣]:**

دوای مردنی غولامشاخان، فەرهاد میرزا کرایەوە بەوالی سنە. فەرهاد میرزا نیەتی باش نەبوو، لەگەڵ سانەکانی هەورامان دا، بڕیاری لەناوبردنیان دەدات، بەتایبەت حەمەسەعید سان و حەسەن سان. چونکە: لەلایەکەوە هەردوکیان دەسەڵاتیان هەیەو، تفەنگچی زۆریان کۆکردووەتەوە.لەلایەکی تریشەو فەرهاد میرزا ڕقی لەو کەسانەیە، کەلەگەڵ غولامشاخان دا خزمایەتیان هەبووە، جگە لەمەش، ئەمانیش قسەی ناخۆشیان هەبوو دژی والی. حەسەن سان لەڕیزی سانە دیارەیەکانی هەورامان بووە، (مەهدی بامداد) لە مێژووی پیاوانی ئێراندا باسی کردووە. ئەم سانە هەموو وەختێك دوو هەزار تفەنگچی هەبووە، یەکێتی‌یەکیان لەگەڵ حەمەسەعید سانی لهۆنی و حەمە پاشای جافدا لەهەڵەبجە هەبووە.

مەردۆخ دەڵێ: حەسەن سان، ساڵەها نافەرمانی حاکمی سنەی کردووە، لەسەردەمی ئەمدا هەردوو دیوی هەورامان یەکی گرتۆتەوە.

لەساڵی (١٨٦٧ز)یەوە فەرهاد میرزا بەهۆی شەرەفولمولکەوە، حەسەن سان و برایانی ئاگادار دەکاتەوە، کەدەبێت لەقەڵای (شاھ ئاوا)دا ئامادەبن، بۆ پێشوازی فەرهاد میرزا. ئەوانیش بەدوو هەزار تفەنگچی‌یەوە چوونە خزمەت فەرهاد میرزا، دواتر بەڕێ دەکەون بۆ (بێڵو = بێڵك) لەوێ فەرهاد میرزا دەچێت بۆ شوێنی تایبەتی خۆی و ئەمانیش دەچن بۆ ماڵی شێخ عەبدوالله و شێخ عەبدولقادر، بۆ بەیانی والی هەردوو شێخ، دارکاری باشیان دەکات، چونکە دەعوەتی سان و براکانی‌یانی کردووە.

بۆ بەیانی‌یەکەی حەسەن سان و هەردوو برای لەلای فەرهاد میرزا، ئامادە دەبن، بەفێڵ هەرسێ براکە دەکەنە ژوورێکەوەو لەبەرچاوی دوو براکەی ترەوە – حەسەن سان– دەکوژێ. ئەو دوانەکەی تریش (مستەفا سان و بارام بەگ) بەیەکەوە دەبەستێتەوەو بەندیان دەکات.. ئەمە بێ ئەوەی تفەنگچی حەسەن سان بزانن، کاتێ ئاگاداردەبن، جگە لەبڵاوەکردن هیچیان پێ‌ناکرێت. پاشان هەردوو برا (مستەفاو بارام) دەهێنێت بۆ سنەو، هەورامانی خستە ژێر دەسەڵاتی میرزا عەلی دیوانبەگی‌یەوە.

لەم کاتەدا کوڕانی هەرسێ‌براو بەگزادەکان کۆدەبنەوە، بەسەرکردەی ڕۆستەم سانی کوڕی گەورەی حەسەن سان، نزیکەی هەزار تفەنگچی ئازا کۆدەکەنەوەو، هێرش دەبەنە سەر حاکمی مەریوان (محەمەد باقرخان) دەیشکێنن و ڕاوی دەنێن، لەم کاتەدا خەڵکی شامیان کۆچ دەکەنە دزڵی و دەبنە پشتیوانی ڕۆستەم سان، کەخەڵکی هەورامان خۆیان بەیەکگرتوویی پیشان داوە، فەرهاد میرزا ترسی لێ‌دەنیشێ. بۆیە (شەرەفولمولك) بەلەشکرێکەوە بۆ مەریوان دەنێرێ، خۆیشی سەرکردەی لەشکری کوردستان و کۆماسی و کەلاتەرزان و ئەحمەد بەگی خاتونلەو کۆمەڵێ لەبەگزادەی هەورامان و هەزار سوارەی مەنمی دەکات، بەهەر شێوەیەك بێت خۆی دەگەیەنێتە دێی (ئەنجومنە) ئەمەش لەساڵی (١٢٦٨ك - ١٨٥١ز) دەبێت.

ڕۆستەم سانیش کەئەمە دەبیستێ، چوارسەد تفەنگچی ئازاو دڕ هەڵدەبژێرێ، بەفەرماندەی عەباسقولی بەگی مستەفا سان و برزوم بەگ، سەرەتا بەئەسپایی خۆیان دەگەیەننە (مەحمود بەگی ئەحمەد خاتونلە)و دەیکوژن. دوایی شەڕ گەرم دەبێت و هەورامی‌یەکان دەستی خۆیان دەوەشێنن و شەرەفولمولك بریندار دەبێت و کوشتارێکی زۆر دەدەن و، فەرهاد میرزا بەهەزار ناڵەو عەلی بۆی دەردەچێت و شکست دەخوات.. هەورامی‌یەکانیش بەکۆڵ و بارێکی زۆرەوە بەسەرکەتویی دەگەڕێنەوە بۆ دزڵێ.

فەرهاد میرزا حاڵی شڕی خۆیان دەگەیەنێتە شای ئێران. بۆیە: ئەمجارە بەفەرمانی شا، دە فەوج سەرباز، بەهەموو تفاقێکەوە ئامادە دەبن بۆ هاوکاری میرزا فەرهاد.

ئەم دە فەوجەو لەشکرێکی تری زۆری ناوچەکە، جارێکی تر دێنەوە سەر هەورامان، ئەمانە بەفەرماندەی کەسانی لێهاتوو لێزان و شارەزاوە دێن بۆ داگیر کردنی هەورامان. بەم شێوە لەشکری هەردولا، لەشکری فەرهاد میرزاو لەشکری هەورامی لەدەربەندی (کەڵویم) و دەشتی (باو) گەیشتنە یەك، شەڕێکی قورس ڕووی‌دا، بەڵام ڕۆستەم سان کەزانی لەشکرەکەیان یەك بەسەدی لەشکری دوژمن نیە، فەرمان دەکات کەتفەنگچی‌یانی کۆچ بکەن بۆ (سەرکلاوان و قەڵاخانی و کەماجەڕ) تائامادەبن لەوێوە بەرەو شارەزوور بڕۆن.

ئیتر لەشکر دەگاتە دزڵی و داگیری دەکەن و ماڵی بەگزادەو تفەنگچی‌یان تاڵان دەکەن و دەیسوتێنن، ماوەیەك هەورامی‌یەکان بەشەو دادەبەزێنە سەر لەشکری دوژمن و پەلاماریان دەدەن و ئیسراحەتیان لێ بڕیبون.. پاشان

هەورامی‌یەکان ناچار بوون هاتنە شارەزوور و، بونە پەناهەندەی عوسمانی و بەرەو سلێمانی هاتن. هەرچەند فەرهاد میرزا بەڵێنی پی‌دان و پیاوی نارد بەشوێنیان دا، بەڵام ئەوان نەگەڕانەوە، بەرەو دیار بەکرو حەڵەب و کەرکوك و سرۆچك بران و، موچەیان بۆ بڕایەوە.

لەم لاشەوە لەشکری فەرهاد میرزا بەرەو لهۆن ڕۆیشتووە، محەمەد سەعید سانیش، بووەتە پەناهندە لەشارەزوور. لەم کاتەدا هەورامان بەگشتی دابەشکرا بەسەر پیاوانی دەوڵەتدا.

هێشتا مستەفا سان و بارام بەگ هەر لەزینداندا بوون، دوای سێ ساڵ زیندانی بەزەهر کردنە ناو خواردنەوە بارام بەگ دەکوژن و مستەفا سانیش، بەردەبێ و موڵکەکانی پی‌دەدرێتەوەو دەبێتەوە بەسانی هەورامان.

لەساڵی (١٨٧٤ز) شێخ محەمەد بەهائەدین کەدەچێت بۆ حەج، لەوسەرەوە ماڵ و خێزانەکەی ڕۆستەم سان لە(دیار بەکر)ەوە، بۆ کەرکوکی دەهێنێتەوەو، کەدێتەوە تەوێڵە ڕۆستەم سان بۆ دیدەنی بۆ تەوێڵە بانگ دەکات و پاش چەند ڕۆژێ بۆ کەرکوك دەگەڕێتەوە.

پاشان هەورامان دەکەوێتەوە ژێر دەسەلاتی هەورامی‌و، بەگزادەکان دابەشی دەکەن بەسەر خۆیاندا، بەم شێوەیە:

* هەورامانی تەخت و دەوروبەری: بۆ حەسەن سانی دەبێت، کە ڕۆستەم سان دەبێتە برا گەورەیان، ئەم سانە بۆ ماوەی سێ ساڵ سانی هەورامان بووە، لەسەردەمی ئەم دا زوڵم و زۆرو ستەم نەکراوەو دادپەروەرو بەخشندەش بووە، لەساڵی گرانی‌یەکەدا زۆر هاوکاری هەژارانی کردووە.

* ڕەزاوو کەمەرە: بۆ مستەفا سانی دەبێت، پاش ماوەیەکیش عەباسقولی بەگی مستەفا سان، لەلایەن ئیقباڵولمەلیکی حاکمی سنەوە دەکرێت بەسان و لەجێگەی باوکی دادەنیشی‌و، پاشان دەکرێت بەسانی هەموو هەورامان بەلهۆنیشەوە، عەباسقولی سانیش پشێوی‌و ڕاوو ڕووت ناهێڵێت لەناوچەکەیدا. لەدوای ئەمیش حسێن خانی ڕەزا قولی‌سانی برازای دەبێت بەخان.

* دزڵی و دەوروبەری: بۆ بارام بەگی دەبێت... ئەمانیش کوڕانی بارام بەگ دەسەلات دەگرنە دەست، بەتایبەتی عەزیزخان، لەدوای ئەویش ئەحمەدخان دەسەلاتی دەبێت و ئیتر مەحمود بەگی دزڵی دەبێتە خانی دزڵی و فەرمانڕەوایی پەیدا دەکات. (لەدواتردا باسی دەکەین).

ڕشتەی بنەماڵەی محەمەد سەعید سانی لهۆن
محەمەد سەعید سان
جافر سان
عەبدوڕەحمان بەگ
محەمەد سان
فەتاح بەگ
عوسمان بەگ
ڕۆستەم سان
حەمەصالح سان
ئافراسیا بەگ
تۆفیق بەگ
حسێن بەگ
مەحمود بەگ
مەجید بەگ
کەیخەسرەو بەگ
حەمەلاو بەگ
محەمەد سەعید بەگی
محەمەد صاح بەگ
عەباس بەگ
کەیخەسرەو بەگ
حەمە تایر بەگ
نادر بەگ
عوسمان بەگ
قادر بەگ
ئەمین بەگ
حەمەخان بەگ
زوراب بەگ
حەمەسەعیدبەگ
ڕۆستەم بەگ
جەمیل بەگ
یارئە حەمەد بەگ
ئەنوەر بەگ
ئەسکەندەر بەگ
کەریم بەگ
غازی بەگ
ئەسعەد بەگ
فەریدون بەگ
فەتحی بەگ
تایر بەگ
محەمەد بەگ
یونس بەگ
تەلعەت بەگ
ڕفعەت بەگ
نەزهەت بەگ
عەبدوڵڵا بەگ
کەمال بەگ
تەقی بەگ
نەجیب بەگ
فایق بەگ
١- ئەحمەد بەگ
٢- کەریم سان
٣- حەمەئەمین سان
٤- حەمەڕشیدبەگ
٥- قادر بەگ
٦- مستەفا بەگ
٧- فەتحوڵڵە بەگ
٨- حەمەسەعید بەگ
٩- عەلی محەمەدبەگ
١٠- حەسەن بەگ
١١- غەفار بەگ
١٢- غەفور بەگ
١٣- حەمەعەلی بەگ
١٤- حەمە تەقی بەگ
١٥- مەحمود بەگ
١٦- حەمەڕەزا بەگ
١٧- مەنصور بەگ
١٨- سەیفوڵڵە بەگ
١٩- ناصر بەگ
تۆفیق بەگ
ئەمین بەگ
عیزەت سان
بەهمەن
ئەسفەندیار
زوراب
سەعدی بەگ
قەیصەر بەگ
فەیصەڵ بەگ
فەیزوڵڵا
جەمیل
حەمدی
عیزەت
نیازی بەگ
مەجید بەگ
عەلی مەردان
دارا
مەهدی
سەلیم
عەزیز
ئارام
شەماڵ
شەهباز
ئەرشەد بەگ
داریوش
هۆشەنگ
فەریدون
وریا
ئەحسین
تەیمور
سەریاس
قەیصەر
غالب
بارام
هۆشەنگ
بارام
حکمەت
فەهمی
عەلیحەسەن
داود بەگ
ئازاد هەورامی
عەبدوڵڵا
سەعید
نوری
فاتیح
شەوکەت
ئیقبال
ڕەحمان
ئالیع
پەروێز
هوشیار

**تێبینی /**

١- بۆ ئەم ڕشتەیە سود وەرگیراوە لە (مێژووی هەورامان، م. هەورامانی)، (پەیامی هەورامانی هادی بەهمەنی)، (کرد و ترك وعرب، ئەدمۆنز)، (وەستا محەمەدی حاجی حەمەصاڵح تەوێڵەیی).

٢- هەندێك دەڵێن جافرسان ٢٠ یا ٢١ یا ٢٤ کوڕی بووە، بەڵام دوای دڵنیابوون (١٩) زیاتری نەبووە.

٣- لەسەر قسەی محەمەدی وەستا حەمەصاڵح کوڕەکانی جافرسان لەدایکەوە بەم جۆرە برابوون:

ژمارە (١+٣+٤+٦) لەژنی یەکەمی جافرسان بوون.

ژمارە (٢+٥+١١) لەژنی دووەمی جافرسان بوون.

ژمارە (٨+١٠+١٢+١٤+١٥+١٦+١٧+١٨+١٩) لەژنی سێهەمی جافرسان بوون.

ژمارە (٧+٩+١٣) لەژنی چوارەمی جافرسان بوون.

ئەمە ڕەئی‌یەکە کەچوار ژنی هێناوە نەك شەش.

### محەمەد سەعید سوڵتان[٢٤]

پێشتر، بنەماڵەو چۆنیەتی بوون بەسانیمان باس کرد- وتمان بەهۆی هاوکاری (حەسەن سانی هەورامانی تەخت)ەوە، توانی ببێت، بەسانی لهۆن، بۆیە نێوانیان زۆر باش بووەو، هاوکاریەکیان زۆر کردووە، دژ بەنەیارو دوژمنەکانیان. حەمە سەعید سان، سانی لهۆن بووە، کە پێکهاتووە، لەنەوسودو، نۆدشەو، شۆشمیۆ، دزاوەرو هانە گەرمڵەو بێدەروان، لەم کاتەدا بیارەو تەوێڵەو (پشت دەڵێن)، بەدەست سەرکاری پاشایانی بابانەوە بووە. لەم کاتەدا: (کوێخا محەمەد)ی فەقێ مەحمودی مەلا ئیبراهیمی بیارە، وەکیلی پاشایانی بابان بووە لە بیارە، لە تەوێڵەش (عەبدوالله ئاغا (باوکی قادر ئاغا) وەکیل بووە، ئێستا:

محەمەد سەعید سان ... فەرمانڕەوای هەورامانی لهۆنە.

حەسەن سانیش ... فەرمانڕەوای هەورامانی تەختە.

ڕەزا قولی خانی خەسرەو خانی بچوك (ناکام) دواتر ئەم مانوالله خان - ناسراو بە غولامشاخان -والی ئەردەڵانن لە سنەو لە گەڵ قاجاری‌یەکانن. عەلی ئەکبر خان (شەرەفولمولك)یش، فەرمانڕەوای جوانڕۆیە، دواتریش فەرهاد میرزا، دەبێت بە فەرمانڕەوای جوانڕۆو سنەو دەورو بەری. نەسرەدین شاش، شای

قاجاریەکان دەبێت لە ئێران. بێگومان، عەلی ئەکبەرو فەرهاد میرزاش سەر بە قاجاڕیەکانن بە تایبەت فەرهاد میرزا هەر حاکمی دەوڵەتە لە سنە.

کە حەمە سەعید سان، دەکەوێتە جمو جوڵ، بۆ زیاد کردنی دەسەڵاتیو ئازاد کردنی هەورامان و سەربەخۆیی بوون....ئەردەڵانیو قاجاریەکان، دەکەونە پیلان گێڕان. بۆیە سێ هێرشی گەورە دەکرێتە سەری:

- **لە جاری یەکەمدا**، لە کۆتایی ساڵی (١٨٥٢ ز)دا دەبێت..والی ئەردەڵان لە سنە فەرمان دەکات کە فەوجێکی سەربازو، دوو هەزار، چریکی سوارە، لەگەڵ نەجەف قولی خان، ئامۆزای عەلی ئەکبەر خان، وە ئەبولقاسم یاوەر، هێرش بەرنە سەر هەورامانی لهۆن. حەمەسەعید سان تفەنگچی خۆی ئامادە دەکات. بەفەرماندەی عەبدوڕەحمان بەگی کوڕی، لەمبەری ئاوەکەی سیروان سەنگەر دەگرن، بەلام پێشتر، پردەکەی سیروان دەڕوخێنن: لەشکر بەهەر جۆرێك بوو کردیە ئەوبەری ئاوەکە ئەمەش دوای زیانێکی زۆر بە خنکان و بە کوژران. تفەنگچی سان دەکشێنەوە بۆ شاخەکانی نەوسود: هەر ئەو ڕۆژە لەشکر گەیشتە نەوسود، بۆ شەو هەورامیەکان، هێرش دەکەنە سەریان، تا دەتوانن لێیان دەکوژن و ئەوانی تر، بە شپرزیو بە ماندوییو تینویەتی گەرمای هاوین، ڕادەکەن بەرەو پاوە، پاشان دەگەڕێنەوە جوانڕۆ. شکانی لەشکری نەجەف قولی خان، لە لهۆنداو، ڕۆیشتنی لەشکری غولامشاخان بۆ هەورامان و، هەوشی بەدرانیو، کشانەوەی، حەسەن سان، بەرەو شارەزور ڕێکەوتی ساڵی(١٨٥٢ ز) بووە.

محەمەد سەعید سان، لە نەوسودا، بە ئاگایی‌یەوە دانیشت... بەلام وا دیارە، دوای ڕێکەوتنێك دەبێت لە نێوان سان و والیدا.

- **لە جاری دووەم دا لە ساڵی ( ١٨٦٦ز)دا**: پاش ماوەیەکی تر، ناحەزانی حەمە سەعیدسان، شکاتی سان دەکەن، لای والی، هەروەها والیش غولامشاخان لەقەلای شاە ئاوای لای مەریوان، عومەر پاشای بابان دەبینێ وشکاتی تفەنگچی حەمە سەعید سان دەکات لای والی.

..ئیتر والی دەست بەجێ دەگەڕێتەوە، سنەو، لەشکرێکی گەورەو فراوان دەکاتە سەر لهۆن، کە لەشگر دەگاتە پاوە، سان، نەوسود چۆڵ دەکات وبەرەو عەبابەیلێ دێت بۆماڵی خەزورانی.

والی لەم هێرشەیدا، مستەفا سان و عەلی ئەکبر خانی، لەگەڵ دا بووە، کە گەیشتنە نەوسود والی هەردوکیان بۆلای حەسەن سانیان دەنێرێ،

لەم کاتەدا عومەر پاشا، دێتە ( گوڵعومەر= خورماڵ) لەگەڵ والی‌دا، کۆدەبنەوە بۆئەوەی چارەسەری کێشەی سەر مەرز بکەن، دەسەڵاتی سانەکانیش بەشتێك بکەن وبیبڕن بەلایەکدا.

حەمە سەعید سان ئاگای لەمە بوو، بۆیە: خۆی گەیاندە لای حەسەن سان، بۆئەوەی چارەسەری کێشەکەی بکات، بۆ ئەمە حەسەن سان، بارام بەگ و عەلی ئەکبەر خان دەنێرێ، بۆ خورماڵ، بۆ لای عومەر پاشا، خۆی‌و حەمە سەعید سانیش پێکەوە دەچنە خزمەت، شێخ عوسمانی تەوێڵە، بۆ خۆش کردنی کاری محەمەد سەعید سان. شێخیش دەنێرێ بەدوای شێخ عەلی عەبابەیلیێ و محەمەد پادشای جاف دا، ئەوانیش، دێنە تەوێڵە. ئەوجا شێخ: مەولەوی و عەبدوڕەحمانی کوڕی‌و مەلا ئەحمەدی نۆدشە، وەك، نوێنەری خۆی دەنێرێ لەگەڵیاندا. هەموو دەکەونە ڕێ بۆلای والی تاوەکوو لە محەمەد سەعید سان خۆش دەبێت کاتێ دەگەنە لای والی: مەولەوی ڕوو دەکاتە والی‌و دەڵێ:

روی عقیدهء تشیع علی را بشفیع آورده ایم

وباعتقاید اهل سنت وجماعت محمد را شافع کرده ایم

وباعتقاداتیم عامه نیز بسم الله الرحمن الرحیم

مەبەستی لە(علی)، شێخ عەلی عەبابەیلیێ‌یەو، لە(جماعت محمد)یش مەبەستی لەمحەمەد پاشایەو، لە(بسم الله الرحمن الرحیم)یش مەبەستی لەناوەکەی خۆیەتی کە(عەبدوڕەحیمە). کەوالی، گوێی لەم وتە پەسەندو، دڵخۆشکەرو، جوانە دەبێ، لە محەمەد سەعید سان خۆش دەبێت..

- **هێرشی سێهەم بۆسەر محەمەد سەعید سان لەساڵی (١٨٦٨ز):** دووساڵ بەسەر ڕوخانی ئەردەڵاندا، تێپەڕی، فەرهاد میرزا بوویە والی کوردستان، وەك لەپێشتر وتمان، بڕیاری دابوو، بە گەکانی هەورامان، بەهەر جۆرێك بووە لەناو بەرێ. ئەوەبوو، بەفڕ وفێڵ، سەری حەسەن سانی، خوارد بوو، ویستی سەری محەمەد سەعید سانیش، بخوات. بەڵام محەمەد سەعید سان لەسەرەتاوە ملی بۆ نەئەدا، بۆیە: لەهەمەدانەوە دوو فەوج دەکەونە ڕێ، بەفەرماندەی (مستەفا قولیخان= ئیعتیما دوسەڵتەنە) و (بیوکخان) دێنەلای شەرەفولمولك، لەجوانڕۆ، ئەویش بەخۆی‌و لەشکرەکەیەوە بەرەو لهۆن لەگەڵیان دێت.

لەم کاتەدا محەمەد سەعید سان داوای کۆمەك، لەعەباسقولی سان وبرزو بەگ دەکات ئەوانیش (٣٠٠) تفەنگچی دەنێرن بۆ کۆمەکی سانی لهۆن. ئیتر شەڕێکی قورس ڕوودەدات لەنێوانیاندا، لەسەرەتاوە لەشکری دەوڵەت دەشکێ،

بەڵام لەم کاتەدا تفەنگچی عەباسقولی دەبێت بگەڕێنەوە بۆ هەورامانی تەخت، چونکە لەم لاوە خۆیان زۆریان بۆهێناون. لەلایەکی تریشەوە، بیوکخان، کەوتە خەڵاتکردنی، خەڵکی ناوچەکە، کەسانی وەك محەمەدی خاتوو خانمیٚ چوو بەدەمیانەوە..ئیتر محەمەد سەعید سان ناچار بوو، بکشێتەوەو بەرەو شارەزوور هات و لە سلێمانی دانرا، لەم کاتەدا هۆزی حەسەن سانیش لەئەحمەد ئاوا خۆیان گرتووەتەوە، بەڵام تفەنگچیانی لەگەردەنەی کەمانجەرەوەن. شای قاجاڕی بەمە ڕازی نابێت فەرمان دەر دەکات، بۆفەرهاد میرزا، بەهەر شێوەیەك بووە، دەبێت سەری حەمەسەعید سان و کوڕەکەی بخورێت، لەبەر ئەمە فەرهاد میرزا، شەرەفولمولك، لەمە ئاگادار دەکاتەوەو پێیٚ دەڵێ، بەشەڕ سەرناکەوین بەسەریاندا، مەگەر بەدۆستایەتی کردن وڕێکەوتنێك لەگەڵیاندا کەلە ژێرەوە پڕبێت لەفرو فێڵ. فەرهاد میرزا، شەرەفولمولکی ناردە سلێمانی بۆلای بەگزادەکان، دڵخۆشی کردن کە بگەڕێنەوە، بەڵام ئەوان نەگەڕانەوە.

ئیتر هەورامان دابەشکرا، بەسەر کەسانی سەربە دەوڵەت، بەڵام جار جارە پیاوانی محەمەد سەعید سان، لەلهۆن دەست دەوەشێنن.ماوەیەك ئاوا گوزەرا..پاشان بەهەر شێوەیەك بێت سان ڕازی بوو، بەگەڕانەوە بۆسنە، بۆلای فەرهاد میرزا.. ئالەوێدا، فەرهاد میرزا بەدەسخەتی مەولەوی فەرمانی سانیەتی بۆ محەمەد سەعید سان بۆ لهۆن، دەر دەکاتەوەو، لەگەڵ (شەرەفولمولك)دا، بۆقەڵای جوانڕۆ دەکەونە ڕیٚ، بۆئەوەی، لەویٚوە، بۆلهۆن بگەڕێتەوە. کەچی کە دەگەنە ئەویٚ، پاش دوو سیٚ ڕۆژ، لەمانگی(شەوال)ی (١٢٨٩)ی کۆچی ئەوڕەحمان بەگ لەبەر چاوی باوکیەوە بەفەرمانی شەرەفولمولك دەکوژرێت. بۆ بەیانیەکەشی لەبەرچاوی پیرۆزە خانمی خێزانیەوە. محەمەد سەعید سان ،یش دەکوژن" دەشڵێن:

لەپێشەوە سان و پیاوێکی بەناوی میرزا ئەبوبەکر، دەکوژن، پاشان کوڕەکەی، دوایش کەپیرۆزەخانم لەمە ئاگادار کرا، ئەویش خۆی خنکاند.[٢٥]

محەمەد تایر سوڵتانی، پلانی سەر خواردنەکە، بەم جۆرە دەگەڕێنێتەوە:

(شەرەفولمولك، سان، بەدرەختێکەوە ئەبەستێتەوە، سەرۆکانی ناوچەکەی بانگ کردوون، داوایان لیٚکراوە، هەریەکیٚ خەنجەرێکی لیٚبدەن. تابەم کارە، تۆوی ناکۆکی لەنێوان، هەورامان و جوانڕۆدا بوەشێنێت.)[٢٦]

زۆربەیان لە محەمەد سەعید سان یان دا، جگە لەهەندێكی كەم نەبن. كەئەم هەواڵی كوشتنە درا بەفەرهاد میرزا، نازناوی شەرەفولمولكی بەعەلیئەكبەر خان داو موسا خانی براشی كردە سانی هەورامان.

شەرەفولمولك بەمەڕازی نابیٚ، سەروەت وسامانی سان و، كەسو كاری لەنەوسودو دەور وبەری، هەموو تالآن دەكات وئیتر ڕۆستەم بەگی كوڕیو كەسوكاریشی ناچار دەبن بەرەو شارەزوور هەڵبێن.[٢٧]

دوای ساڵێك ڕۆستەم بەگ، دەگەڕێتەوە، نەوسود، بارو دۆخ دەگۆڕیٚ وهەلێكی بۆپەیدا دەبێت و، لەساڵی(١٢٩٢ك)ی فەرمانی سانی بۆ دەر دەچێت ودەبیٚ بەسانی لهۆن. دەستی خۆی دەوەشێنێت لە نەیارەكانی، بەتایبەت، ئەوانەی دەستیان بووە لەكوشتنی محەمەد سەعید سانی باوكیدا، وەك مستەفا بەگی ئەحمەد سان ومحەمەد بەگی خاتوونلیٚو حەوت كەسی نۆدشی.. ئەوانەش لەسەر محەمەد سەعید سان، زەحمەت وئازار دران پاداشتی دانەوە.

ڕۆستەم سان، دوای كوشتنی، مستەفا سان، ژنەكەی دەخوازێت، ئەم ژنە كوڕێكی منالی دەبێت بەناوی (حسێن)لە مستەفا سان دەبیٚ. لەگەڵ دایكیدا دەبێت ولە ماڵی ڕۆستەم سان دا، گەورە دەبیٚ، دوایی، كەگەورە دەبیٚ جارێكیان لەگەڵ ڕۆستەم سان، دەچن بۆڕاو لەنزیك هاوار، لەویٚ ڕۆستەم سان دەكوژیٚ، ئەمەش ڕێكەتی ساڵی(١٨٩٢ز) دەبیٚ.

ڕۆستەم سان ئەم ژنانەی هێناوە:

- شیرین كچی ڕەزا قولی بەگ.
- دەوڵەت كچی یاقۆ سوری تەوێڵەی..ئافراسیاو بەگ (سالار) لەم ژنەیە.
- شاه پەسەندی هاواری.
- دەوڵەت لەمەلازادەكانی نەوسودەو كۆنە ژنی شامحەمەد (حەمەی فەقیٚ مەحمود)ی مەلا ئیبراهیمی بیارە.

ڕۆستەم سان لەدوای خۆی حەمەساڵح بەگی كوڕی بۆماوەی سیٚساڵ سان دەبیٚولە ساڵی (١٣١٢ك)ی دەكوژریٚو جافر بەگ دەبیٚ بەسانی هەورامانی لهۆن.

**تێبینی:** لێرەدا بەپێویستی دەزانین كەمێك زیاتر بدوێین لەسەر ژیانی دوان لەكەڵە پیاوو فەرمانڕەوایانی هەورامان، سانێك وخانێك، كەژیانیان دوورنیە لێمانەوە،هەردوكیان،خاوەن هەڵوێست بوون، خەباتیان كردووە دژ بەداگیركەران، خزمەتی دەڤەرەكەیان كردووە.ئەوانیش:سانی هەورامانی لهۆن- جافرسان و،خانی هەورامانی دزلی، مەحمود خانە.

## ( جەعفەر سوڵتان )
## (١٨٣٤-١٩٤٢)

وتمان حەمە صاڵح سان، لەساڵی(١٣١٢-ك١٨٩٤ز) كوژرا، یەكسەر، جافر بەگی محەمەد سەعید سان، كرا بەسانی لهۆن و،جێگەی گرتەوە. شێخ عومەر چیائەدین، كەهاتبوو بۆ پرسەی حەمە صاڵح سان، نەڕۆیشتەوە، تاوەكوجافر بەگ، كرا بەسانی هەورامانی لهۆن.

**هاوكاتی سانیەتی جافرسان:**

سەردەمی ژیانی جافرسان، هاوكات بووە لەگەڵ چەند ڕووداوێكی جیهانیو ناوچەیی، وەكو جەنگی یەكەم و دووەمی جیهانیو، پەلاماری داگیركەری سوپای ڕوسیا، بۆ سەروی ڕۆژ ئاوای ئێران، وەهی ئینگلیز بۆ خواروی. پەلاماری دەوڵەتی عوسمانی وئێرانی بۆسەر هەورامان، شۆڕشی ئۆكتۆبەر لەڕوسیا، نەمانی حوكمی قاجاری وهاتنی حوكمی پەهلەوەی، دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق وجیاكردنەوەی سنور لەنێوان عێراق وئێران دا، دامەزراندنی یەكەم حكومەتی كوردی بۆ شیخ مەحمود لەسێمانی...ئەم ڕووداوانە كاریگەری خۆیان هەبووە بەشێوەیەكی ڕێژەیی، بۆ سەر دەسەڵاتی جافرسان، هەندێكیشیان بونەتە هۆی دروست بوونی شەڕو پێكدادانی سان، لەگەڵ لەشكری تردا.

**جافرسان لەهەوڵی یەك پارچەییدا بووە:**

هەورامانی لهۆن، پێش سەردەمی جافرسان، هەرلە شەڕو شۆڕدا بووە، لەگەڵ دەورو بەرەكەی خۆی، لەگەڵ ناوچەكانی هەورامانی تەخت و ڕەزاو دزڵی...هەروەها لەگەڵ هۆزەكانی جوانڕۆو، ئێناخیو، باوە جانیو، جافی، وەڵەد بەگیو..تاد، بەڵام جافرسان بیری لەمە كردەوە، كەچۆن ئەم ناوچەو هۆزانە، یەك بخات ونزیك ببێتەوە، لێیان، بۆ ئەوەی بتوانێ دژ بە دوژمنەكانی، دەوڵەتی عوسمانی وئێرانی، بوەستێتەوە، بۆ ئەمەش:

- هەولیدا ژن وژنخوازی لەگەڵ ئەو سەرۆك وبەگ وسانانەی ئەو هۆزو ناوچانە بكات، تاوەكو ڕەحم و سۆزو خزمایەتی لەنێوانیان دا، زیاتر دروست ببێت.

هەرچەندە، لەبنەڕەتدا، هەموو لەیەك وەچەن. ئیتر بۆئەمە كچێكی خۆیو كچێكی برازای دابە كوڕان وبرازایانی مەحمودخانی دزڵی. لەبەگزادەكانی ڕەزاو ژنیان لێ دەهێنیو ژنیان پێ دەدات. كچێكی خۆی، داوە بەسەرۆكی

ئێناخی‌یەکان، دەڵێن: خۆشی (٦) ژنی بووە، سیانیان، ژنی‌سانەکانی پێش خۆی بوون، هەروەها بەهۆی ژن و ژنخوازی‌یەوە لەگەڵ جافەکانی جوانڕۆ هەڵەبجەش دا خزمایەتی دروست کردووە. حەنیفەخانی هاوسەری جافرسان و حەپسەخانی هاوسەری سالار (مستەفاسان)ی کوڕی جافرسان، لەجافەکان بووە.

- هەولی‌داوە، منالی زۆری ببێت، دەڵێن:(٣٦)منالی بووە،٢٠ کوڕ ١٦کچ، بەلاّم ڕاستر ئەوەیە کە(١٩) کوڕو (١٢) کچی بوو بێت[٢٨].

- سیاسەتیشی -وەك لەدواتردا باسی دەکەین- دادپەروەر بووە، چووە بەدەم سکالاّی خەڵکی‌یەوە.

جافرسان لەم هەوڵەی‌دا سەرکەوت، سنوری دەسەلاّتی فراوان بوو، لەملە پاڵنگانەوە بۆ خورماڵ و پشتی دەلێن بووە، بەلاّم بەداخەوە دوژمنان وناحەزان نەیانهێشت، ئێرەیی(حەسادەت)یش، جارجارە لەدڵی بەگزادەکانی تردا، دورست دەبوو، شەڕیان تووش دەکرد.

عیزەت بەگی جافرسان لەوەلاّمی پرسیارێکدا کەڵی دەکرێ: بۆچی شەڕی جوانڕۆو هەورامان، لەدەمی جافرساندا ڕووی‌دا؟ دەڵێ:

بێگومان ئەو جۆرە پەرەسەندنەی، لهۆن و، ئەو خۆشەویستی‌یەی جافرسان وئەو یەکگرتنەی هەورامان، بوو بەهۆی بەرپا بوونی(کوڵنج وبرك)و، چووەتە ناو چقی تەن و لەشی، هەندێ هۆزی سنجاویی‌و وەڵەد بەگی‌و، سێلاسی و باوەجانی‌و قوبادی، بۆیە ئەوانە بوون بەیەك و، دژی جافرسان، لەشکرکەشیان کردو هێرشیان، هێنایە سەرلهۆن.[٢٩]

هەربە قسەی عیزەت بەگ،پێش جافرسان، پاوەو خانەگاو دشەو نوریاو بەلەبزان وهیروی‌و، هۆزەکانی ئیمامی و ئێناخی‌و... سەربە لهۆن نەبوون، بەلاّم لەسەردەمی جافرساندا، بەهەوەس وئارەزووی خۆیان، لەسەر داخوازی خۆیان. هاتوونەتە لای جافرسان، بۆئەوەی یەکێ لە کوڕەکانی بنێرێ بۆ ناویان، تابتوانن، بەهۆیەوە، پارێزگاری خۆیان و خواستیان بکەن.[٣٠]

**ڕاوێژکارانی جافرسان:**

جافرسان، بۆ ئیش وکارو ڕووداوەکان، پرس وڕاوێژی کردووە، بەهەندێ لەدڵسۆزو خزمان وزاناو ڕیش سپی‌یەکانی دەورو بەری خۆی، ڕای لێ وەرگرتوون.

لەوڕاوێژکارانەی:

- میناخانی ڕۆستەم سان ژنی حەمەئەمین بەگی دوریسان.
- حەمەئەمین بەگی دوریسان
- حەمە سەعید بەگی کوڕی، کەجێگری بووە.
- هەندێ ڕیش سپیش -هەریەکە بۆکارێ بەپێی تواناو زانایی، ئەوڕیش سپیە لەوکارەدا..

## سانیەتی جافرسان و حکومەتەکەی:

لەمێژووی هەوراماندا - م. محەمەدئەمین هەورامانی ل(١٤٥)دا دەڵێ:

سان، سەرگەورەی دەوڵەتی سانیەتی‌یەو، فەرمانی ئەرکەو، دەبێ جێبەجێ بکرێ و دێهاتەکانیشی بەسەر، بەگەلێهاتوو ئازاکان دا، هەرکەسە بەپێی توانای خۆی، دابەشی دەکات وهەربەگێ لەوبەگانە، لەدێیەکەی خۆیدا، حاکمێکی سەر لەبەرو فەرمان ڕۆیشتووەو، لەوەوبچوکتر(سەرکار) یان هەندێ جار(کوێخا)یە!

جافرسان، خۆی سەرۆکی حکومەتی سانیەتی‌یەو، فەرمانی هەمووکاتێ، سەرلەبەرەو لەپایتەخت کە(نەوسود)ە لەوێ دادەنیشێو، جێگری (نایب لحوکمە)ی هەبووەودێ کانی لهۆن بەم جۆرەی خوارەوە حاکمی بۆداناون:

١- ئەحمەد بەگی کوڕی، کراوە بەحاکمی نۆتشە.
٢- کەریم بەگ(کەریم سان) کراوە، بەحاکمی خانەگاو گڕاڵ ودەرموور.
٣- حەمە ڕەشیدبەگ، کراوە، بەحاکمی پاوەو دشەو دەرەبەیان.
٤- قادر بەگ وغەفار بەگ، کراون بەحاکمی تەوێڵەو سۆسەکان.
٥- حەمەمین بەگ (حەمەمین سان) لەگەڵ حەمە ڕەشید بەگ دا، هاوبەشی حاکمیەتی‌یە!
٦- حەمە تەقی بەگ حاکمی( هیروێ)یە.
٧- مەحمود بەگ، لەگەڵ کەریم بەگ دا، هاوبەشی حاکمیەتی بووە.
٨- حەمەڕەزا بەگ ومەنصور بەگ، لەگەڵ سەیفوالله بەگ وناصر بەگ دا، هاوبەشی حاکمیەتی، هەردووشۆشمێ بوون.
٩- ئۆلغەفور بەگ، حاکمی( نجارو کۆمەدەرەو دەریبەر)بووە.
١٠- ئەلی محەمەد بەگ، حاکمی دەودان بووە.
١١- هەسەن بەگ، حاکمی نوریاو بووە.
١٢- حەمە سەعید بەگ، تەشارو شێخانی بەدەست بووەو(نایبە لحکومە)ش بووە.

١٣- فەتحوالله بەگ، حاکمی بەلەبزان بووە.

١٤- مستەفا بەگ، حاکمی دەگا شێخان وبەڵخەو خەرپانی بووە.

١٥- حسێن بەگی ڕۆستەم سان، حاکمی نەروی‌و بوین وگریانە بووە.

١٦- تۆفیق بەگی ڕۆستەم سان، حاکمی دزاوەرو هاوارو هەوارە کۆن و دەرەتفیێ بووە.

١٧- ئەفراسیاو بەگی ڕۆستەم سان، حاکمی سەرگەت وهانەی دن ودەرەی مەڕو باخە کۆن وگەچێنەو گوڵپ ونارنجڵەو کەیمنەو هانەگەرملەو بێدروازو بیارەو بنجەی دڕە بووە!.

هەریەکێ لەم بەگانە (حاکمانە)، بەپیێ توانای حاکمیەتەکەی- کەلەژێر، دەستیایەتی شاخانە، بۆ دیوانی سان، دەهێنیێو کاتی پێویستیش، سان بۆی هەیە، لەشکریان پیێ کۆبکاتەوەو لەژێر فەرمانی خۆی‌داو، بەفەرماندەی خۆی، لەگەڵ دوژمنیان دا، بجەنگن!

هەریەکێ لەوحاکمانەش، تفەنگچی خۆی ئامادەن و تفەنگچی دیکەشی هەن، بەلاَم ئەوانە، تەنها هی جەنگن، واتە لەکاتی تێگیرا نەدا!!.

**جافرسان وسکالاَی‌خەڵکی وحاکمی دێیەکان:**

جافرسان چووە، بەدەم کێشەی خەڵکەوە، ئەگەر کەسێك شکات و سکالاَیەکی ببردایە، لای، دەربارەی کوڕەکانی، کەهەر یەکەیان، حاکمی ناوچەیەکی هەورامان و لهۆن بوون، دەچوو بەدەمیەوە، بەبێ گوێدانە، ئەوەی کە ئەوە کوڕیەتی، یا کەسیەتی. بۆ وێنە:

- بەهۆی شکاتەوە کەلە لایەن، تەوێڵەیی‌یەوە کراوە لە قادر بەگ، جافرسان، جەریمەی قادر بەگ دەکات، پیاویش دەنێرێتە سەری (بچوکترین پیاو لە ڕووی پایەوە) بۆ ئەوەی پارەی جەریمەکەی بداتێو ئەگەر نەشی‌دا لە تەوێڵەدا باری پێبکات!

- لەکاتی گرانیەکەدا، کوێخا کەریمی عەربەت لە عێراقەوە، بەرەو ئێرانە دەڕوات، لە قەلاَی شاتر کەلە نێوان بەڵخەو تەوێڵە دایە، چەتە ڕووتی دەکەنەوەو هێسترەکەشی دەبەن: کە سکالاَی خۆی دەباتە لای جافرسان: جاریێ سان، دوای ڕێز لێنانی کوێخا کەریم، ئەوەی لێی سەنراوە بۆی دەبژێریێو پاشان، سان (عەبە بەلاش) کە مەیتەری ماینەکەی دەبێت، دەنێرێتە سەر، قادر بەگ، حاکمی تەوێڵەو مستەفا بەگ حاکمی بەڵخە، یەکی سەد لیرە، جەریمەیان لێدەسێنێت، لەبەر ئەوە لە ژێر دەسەلاَتی ئەوان دا، خەڵك (کوێخا کەریم) ڕووت کراوەتەوە.

- یان نۆتشی شکاتی ئەحمەد بەگ دەکەن و جافرسانیش (یوسۆ تاڵ) ناوێ دەنێرێتە سەریو، لە نۆتشەدا، باری پێدەکات، هەرچەند بەگزادەکانی تر، هەوڵی گەڕانەوەی دەدەن، بەلام سان تاوەکو، نۆتشی‌یەکان، نەهاتنەوە لای جافرسان، لێی خۆش نەبوو.

- لەسەر هەڵەیەکی بچوکیش، کەریم بەگ، لە خانەگا، بار پێدەکات. هەروەها، وەها لە حەسەن بە گیش دەکات.

**پەیوەندی جافرسان و ئینگلیز:**

پاش دەرکەوتنی لێوەشاوەیی، مێژوو نوسی گەڕۆکی ڕوسی (مینۆڕسکی)، ئینگلیزەکان توانیان بیقۆزنەوەو، ڕایکێشن بەلای خۆیان دا، بۆیە کۆچی کردە لەندەن و لەوێش مایەوە تامردن. ئەم مینۆرسکی‌یە لەبەر ئەوەی لەدیاری کردنی سنوری نێوان ئێران وتورکیادا، بەشداری بووە، وەدوو جار سەردانی ناوچەی گۆرانی کردووە، هاتوەتە هەورامان، لەگەڵ جافرسان دا کۆبوەتەوە. نزیك بوونەوەکە، لەم کۆبونەوە دەست پێ دەکات. ئینگیلیزەکان موچەیەکی سالأنەی (٣٠٠) لیرەیان بۆ بڕیوەتەوە. وە(١٥٠٠) ڕوپیە بەهۆی شابەندەری عوسمانی‌یەوە، وە(٥٠٠) تمەن لەلایەن دەوڵەتی ناوەندی تارانەوە بووە.[٣١]

لەشوێنێکی تردا هاتووە:[٣٢]

کە جافرسان بەهۆی نامەیەکەوە، بۆی دێت لەلای ئینگلیزەوە، پەیوەندی دەکات ووەلأمی دەداتەوە، لەوکاتەوە پەیوەندی بووەو مانگانە(١٠٠) لیرە مەعاشی بووە، لەعێراق مەعاشەکەی وەرگرتووە.

بەپێی ئەوەی پێشەوە بێت، جافرسان سێ موچەی هەبووە، جائەو سێ لایەنە: ئینگلیزو عوسمانی‌و ئێران، ئەبێ بەیەکیان زانیبێت؟ واسان لەسێ لاوە موچەی هەیە!

ئەگەر وەلأم بەڵێ بێت. ئەوە هەرلایەنەی پێشبڕکێ‌ی کردووە کەئەو زیاتر بەلای خۆیدا ڕایکێشێت. وەئەوە. ئیسپاتی دەکات، کەئەم سانە دەورێکی گرنگی هەبووە، لەناوچەکەدا. ئەگەر وەلأم نەخێریش بێت. سیاسەتی سانێکی سیاسەت مەدار خۆی دەنوێنێت. واسێ دەوڵەتی لەکەمەنی کوێ خۆی‌دا، پێکەوە شەتەك داون.[٣٣]

**عەبدوالله خانی تەهماسپی لەساڵی ( ١٩٢٦ ) سەردانی جافرسان دەکات[٣٤]:**

میر عەبدوالله خانی تەهماسپ کەنوێنەری شای ئێرانە سەردانی ڕەزاوو نەوسود دەکات، بەمەبەستی نزیك بوونەوەی خۆی لەسانەکان، کەمەرامی سیاسی خۆی هەیە لەم سەردانەدا، ئەمەش بۆلای مەحمودخانی دزڵی و جافرسانە. محەمەد تاهیر سوڵتانی دەنوسێت:

جافرسان لە ماڵی دونیا وەك: کۆشك و تەلار خاوەنی شتێکی وانە بووە، ژیانێکی سادەی هەبووە. کەمیر دێتە نەوسود، شوێنێکی لایەقی بۆ ئەو میوانە نەبووە. ناچار بۆ حەوانەوە ناردونی بۆ شاری تەوێڵە (بە سواری لەوێوە سێ چارەك زیاترە). بۆ ماڵی قادر بەگی کوڕی، ئەم سەردانی میرە، سان بەلای خۆیدا ڕائەکێشێت.[٣٥]

**شۆڕش و پێکدادانەکانی سان:**

کەم ڕێکەوتووە، لە لایەن دوژمنانەوە، هێشتبێتیان، پاشاو میرو خان و سانەکانی کورد، بۆ خۆیان میرنشین و ناوچەکانیان بەرن بەڕێوە، هەمیشەو هەردەم لە پیلان دا بوون، بۆیان و، هێرشیان کراوەتەوە سەر، بەلام کەم ڕێکەوتووە، لە شەڕدا سەرکەوتو بووبن بە سەر کوردا، بەڵکو زیاتر بە فرو فێڵ و، دۆستانە، هاتوونەتە پێشەوەو لەژێرەوە بە دەرمان خواردن پیلان گێڕان توانیویانە، سەر کەون بەسەر کوردا، یا بە نانەوەو دوو بەرەکی لە نێوانیاندا،

نەبەگە مەئمون، نە تەیموری لەنگ　　هیچ کەس هۆرامان، نەگرتەن وە جەنگ
غەیر جە، خان ئەحمەد، بەگلەری خانان　　ئاییچ، بە بەدگۆ، گرتەن هۆرامان

**لەو پێکدادان و شەڕو شۆڕانەی جافرسان:**

**- شەڕی نۆریاو ( ١٩١٠ ):**

مەلا عەبدوالله ی قازی دەڵێ:

لە ئەنجامی دەرکەوتن و، بەرەو پێشەوە چونی کارو باری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابوری لەهەورامانی لهۆن دا، حسێن خان (زەفەرولمولك) فەرمانڕەوای جوانڕۆ[٣٦] مەترسی پەرەسەندنی ئەو دەسەڵاتە، وا لەناو براو دەکات و، بکەوێتە بەرامبەری کردنی ئەو پەرەسەندنە.

بۆیە: بەسەر کردایەتی ئەحمەد بەگ و عەبدولغەفور بەگی مامەی وەکیلی جوانڕۆ، لەشکرێك بۆ سەرکوت کردنی جافرسان بەرەو لهۆن ئەنێرن، لە نۆریاوی لای پاوەدا، توشی لەشکری سان دەبن، بەسەر کردایەتی ئەفراسیاو بەگ برازای سان، پاش بەیەکادان هێزی پەلاماردەر ئەشکێت و ئەگەڕێتەوە جێی خۆیان.[٣٧]

- **ڕاپەڕینی ساڵی** ( ١٩١١ ز )

هۆیەکانی بەرپابوونی ئەم ڕاپەڕینە:

- ناکۆکی نێوان ئەحمەد شای قاجاریو ئەبولفەتح میرزا، ناسراو بە (سالارە دەولە) کە کوڕی موزەفەرەدین شای قاجاری بوو، کەلەو کاتەدا لە گۆڕەپانی سیاسەت لادرا بوو.

- زوڵم و زۆری ڕژێمەکانی ئێران، بە تایبەت ستەمی ئەحمەد شای قاجاری، لەو کاتەدا کە هەموو هەورامیو ئەردەڵانیو سنجابیو جاف و لوڕو کەلهوڕی بێتاقەت کردبوو.

- هاوکاری کردنی عەشائیری کورد لە ناو خۆیاندا، دژی ستەمی قاجاری‌یەکان.

- بونی جۆرە هاوپەیمانیەتیەك لە نێوان عەشائیرو سالارە دەولەدا، کە دەکرێ بڵێین: زیرەکیو دبلۆماسی سالارە دەولەش لێرەدا ڕۆڵێکی گرنگی بینی، کە هێشتا نەگەیشتوەتە سەر کورسی حوکم، نازناوی (سالار)ی بەخشی بە ئەفراسیاو بەگی ڕۆستەم سان و مستەفا بەگی جافرسان.

سالارە دەولە، لە جافرسان و سەرۆك هۆزە کوردەکانی دیکەی ڕۆژهەلاتی ئێران، پەیمان وەر دەگرێ کە تفەنگچی بۆ بنێرن بۆ یارمەتی‌دانی.

سەرەتا: جافرسان هەورامان ڕزگار دەکات لە دەستی قاجاریو بەرەو کرماشان دەڕۆن. (فەریدولمولك قراگزلو) لێپرسراوی کاری دەرەوەی کرماشان دەنوسێت: لەشکری هەورامان هاتە ناوشاریکرماشانەوە، بۆیارمەتی دانی‌سالارە دەولە.[٣٨]

پاش ماوەیەکی کەم لەشاردا، لەشکرێکی(٢٥) هەزارکەسی بۆکۆمەکی ناوبراو کۆکراوەتەوە لەعەشائیرو بەرەو تاران کەتوونەتە ڕێ، تانزیك شاری ساوە لای‌خواروی ڕۆژئاوای تاران، ڕادەماڵن، لەوێ لە(نۆبران و باخی شا) توشی شەڕێکی گەورە دەبن و، عەشائیری کورد، دەستێکی باش دەوەشێنن، بەلاّم لەشکری دەوڵەت، لەشکرێکی تردێت بەهانایانەوە، ئیتربەهۆی زۆری سوپاو لەشکری دەوڵەت وەهەروەها زۆری وچاکی چەکەوە دەوڵەت سەردەکەویو، سالارە دەولە و عەشائیری کورد دەشکێت، کوردێکی زۆر لەم شەڕەدا، کوژراون وەهەر لەهەورامی‌یەکان نزیکەی (٨٠) تفەنگچی کوژراون، لەوانە: عەزیز بەگ و حەمەخان بەگی فەتاح بەگی برازای سان و حەمەلاو بەگی هانەگەرمڵەیی و ئەحمەد بەگی جافرسان کە کوڕی گەورەی سانە، بریندار دەبیو، دەیهێننەوە

(هەمەدان) و بەنهێنی لەماڵێکدا دەبێ تا چاك دەبێتەوە. کەریم بەگی جافرسانیش لەم شەڕەدا، دیل دەکرێ دەبرێ بۆ تاران بەڵام ئاشکرا نابێ کە کوڕی جافرسانە، بۆیە، دوای ماوەیەکی کەم بەردەبێت[٣٩].

**سەردار زەفەر بەختیاری دەربارەی ئەم شەڕە دەنوسێت:**

(مەریوانیو هەورامی‌یەکان پیادە بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، شەڕێکی دلاوەرانەیان کردووە، تانە کوژرانایە، چەکیان لێ نەئەگیرا. جافرسان پاش ئەم شەڕە نازناوی (سەردار موعتەضید)ی لێ دەنرێت.[٤٠]

حاجی محەمەد ڕەحمان تەوێڵەیی کەخۆی یەکێك بووە لەبەشدارانی ئەم شەڕە، بەم شێوە ئەمەی گێڕایەوە بۆمان لەڕۆژی (٢٠٠٢/١١/١٤)دا:

سالارە دەولە، کەلێی قەوما بوو لەلوڕستانەوە، هات بۆلای جافرسان پێی‌وت هاوکاریم بکە، لەم هێرشەدا، ئەگەر سەرکەوتین تاهەمەدانت بۆتاپۆ دەکەم، ئێوەش و منیش ڕزگارمان دەبێت لەم ستەم و زوڵمەی شای قاجاری.

جافرسانیش هەر لەدەلێن و بیارەو تەوێڵەوە، داوای چەك هەڵگرتنی لەخەڵکی کرد، تەوێڵەیی(٢٥) کەس چەکدار بوون، لەڕەوانسەر شەڕێکی باشمان کردو سەرکەوتین و بەرەو کرماشان ڕۆیشتن، ئەو شەوەی کرماشان زۆر سارد بوو لەبەر سەرما کەسمان نەخەوت، لەو شەوەدا دوو (خەفیە)مان گرت، گەنجێك و بەتەمەنێك، خێشەی تەوێڵەیی خەریك بوو بیانکوژێت بەتەمەنە ڕیش سپی‌یەکە پاوەیی بوو، وتی: خەفیە (جاسوس) نین مەمانکوژن بمان بەن بۆلای جافرسان نامەمان پێ‌یە بۆی.

دوایی لەشکر، لە کرماشانەوە بەرەو هەمەدان و تاران ڕۆیشت، لەنزیك تاران جەنگێکی گەورە ڕووی‌دا، لەوێ لەشکری سالارە دەولەو لهۆنی‌و عەشائیر نەیانتوانی سەرکەون کشانەوە.

لەم شەڕەدا ئێرانی و کوردێکی زۆر کوژرا، لە شەڕەکەی ڕوانسەر (١٠٠) کەس لەسوپای قاجاری کوژرا، لەشەڕی لای تارانیش لە هەردولا زۆر کوژرا.

**ناکۆکی نێوان سانی لهۆن و خانی دزڵی[٤١]:**

ئەم دوو سەرۆکەی هەورامان، هەردوکیان دژایەتی زۆر کراون، لەلایەن دوژمنانیانەوە، بە هۆی ئەو دەسەڵات و خەباتەی کە بوویانە، بەڵام بە داخەوە لەناو خۆیشیاندا، ماوەیەك ناکۆك و ناتەبا بوون و شەڕ لەنێوانیاندا بووە، کە ئەمەش بەهۆی: دواکەوتویی سیستەمی دەسەڵات و بواری کۆمەڵایەتی‌و هاندانی فیتی ڕژێمەکانی ئەو کاتەوە بووە.

....عوسمان پاشای جاف، عەبدوالله ئاغای تەوێڵە بۆ ناوچەی بەرزنجە بۆ سەندنی خەرج و باج دەنێرێت!

بەهەمان شێوە، مەجید بەگی بانیشاریش، کەلەبەر ئازایی‌و جەربەزەیی، بە(وەرگەبۆر = گورگەبۆر) ناسراوەو، ئامۆزای مەحمود خانە، ئەویش لە لایەن خانی دزلی‌یەوە بۆ ناوچەی بەرزنجە ڕۆیشتووە، بۆ هەمان مەبەست. لەنێوان عەبدوالله ئاغاو مەجید بەگ دا لەسەر وەرگرتنی ئەو خەرج و باج و شاخانەیە ناکۆکی‌و دەمەقاڵە ڕوودەدات! لە ئەنجامدا تەقە لەنێوانیاندا هەڵدەستێ‌و چەند کەسێك دەکوژرێت، دەگێڕنەوە: حەمە لاوە کوێری نادر ئاغا، هۆی هەڵگیرسانی ئەو تەقەیە بووە، وە لەسەرەتاوە هەشت کەس بەدەستی ئەو کوژراون.

پاشان مەجید بەگ بۆ دزلی دەگەڕێتەوەو، ئەوەندەی پێ‌ناچێ لەشکرێکی گەورە کۆ دەکاتەوە، بەمەبەستی هێرش بردنە سەر لهۆن.

لهۆنیەکانیش کە ئەو هەواڵە ئەکەوێتە گوێیان جەعفەر سان لەگەڵ عوسمان پاشای جافدا لەشکرێکی زۆر کۆ دەکەنەوە بۆ بەرگری کردن، لە خۆیان و ماڵ و منداڵیان، لە نزیك تەپی (تلەوەر) -گردێکە لەلای گوڵپ- هەردوو لەشکر لەیەکتری دەدەن و، لەهەردولا خەڵکێکی زۆر دەکوژرێت، لەشکری دزلی دەشکێ‌و کوژراوەکانی ئەم شەڕە لەنزیك گوندی ئەحمەد ئاوا دەنێژرێن.. ئەم گۆڕستانە ئێستا پێی دەوترێت- زیارەتی هەورامی-. بەهەر حاڵ لەشکری دزلی بە شکاوی دەگەڕێتەوە شوێنی خۆیان و، بەڵام ئەمەیان لە دڵ دەرناچێت، هەر لەمەڵاسدان بۆ هێرشێکی تر، بۆیە زۆری پێنەچوو لەشکرێکی تریان پێکەوە ناو، بەرەو لهۆن، ڕووەو ڕێگای هانەگەرمڵە، ڕێگا بەبێ ترس و لەرز دەبڕن و تا دەگەنە دەربەندی کێمنەو هانە گەرمڵەو ئا لەوێدا لهۆنیان، لە سەنگەردا دەبن بەبێ ئەوەی، دزلیان پێیان بزانن، کەشەڕ گەرم دەبێت هانە گەرمڵە دەسوتێنن و ژمارەیەك لەهەردولا دەکوژرێن. کوژراوەکانی دزلی: حەمەد بەگی برای مەحمود خان و مەجید بەگی ئامۆزای دەبن. لە کوژراوەکانی لهۆنیش- مچەی حەمەلەی هانە گەرمڵەیی دەبێت.

لە دوای ئەم شەڕە جافرسان و مەحمود خان ڕێك دەکەون و ژن و ژنخوازی لە نێوانیاندا دەبێت و ئامینە خانی کچی جافرسان شوی کردووە بە عەبدوالله خانی کوڕی مەحمود خان و، عایشە خانی کچی ئەفراسیاب بەگیش شوی کردووە بەحەمە ئەمین بەگی برای مەحمودخان. ئەم ژن و ژنخوازی‌یە بۆ ئەوە

بووە خزمایەتی دروست ببێتەوەو ناکۆکیو دوژمنایەتی نەمێنێت، چونکە ئەم بەگزادانە لەئەسڵدا لەیەك بەرە بوون، ئیتر خوێن ڕشتن بنەبڕ کرا لەنێوانیاندا.

**شەڕی کرماشان ( ١٩١٢ ):**

لە پەیامی هەورامان ل- ١٥٤-هادی ڕەشید بەهمەنی دەڵێت: لەگەڵ پەیدابونی سەرهەڵدانی مەشروتیەت لەڕۆژئاوای ئێرانیشدا، یار محەمەد خان دژی دەوڵەتی ناوەندیو فەرمانفەرما، شۆڕشێکی بەرپا کرد، جافرسانیش هەرچەندە هێشتا کوڕەکەی کە کەریم بەگ(سان ) لای دەوڵەت لەگەڵ هەندێکی تردا بەند بوون، بەشداری شۆڕشی یار محەمەدخانی کرد بە دوو کوڕی بەناوی ئەحمەد بەگ و محەمەد ڕەشید بەگ لەگەڵ دوو سەد چەکدار. هەروەها عەبدولکەریم بەگ وەکیلی جوانڕۆ، وە فەتاح بەگی وەڵەد بەگ، بە هێزێکی چەکدارەوە بەشداری‌یان کردووە. وە لەگەڵ فەرمانفەرما تاقمەکەی کە سوارانی سنجابی بوون، بەشەڕ هاتن. لە ئەنجامدا وەکیلی جوانڕۆو چەند کەسێك دەکوژرێن. شەڕ نزیکی قونسوڵخانەی ئینگلیز دەکەوێتەوە لەو شارەدا، ئەمان لەوێدا دەبنە پەنابەرو لە ڕێگەی گاوارەوە دەگەڕێنەوە جوانڕۆو هەورامان.

**ناکۆکی جافرسان و عوسمانیەکان:**

لە ساڵی(١٨٤٨ ز) دەستکاری سنوری دەسەڵاتی نێوان دەوڵەتی عوسمانیو دەوڵەتی ئێران کرا، ئەو هێڵە سنوریە بە هێڵی هۆمایۆن ناسراو، بوو بەهۆی ئەوە بەشێك لە هەورامان بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکانەوە، لە ساڵی(١٩٠٥ ز)ی‌دا هەندێك گۆڕانکاری بەسەردا هات، دواتر لەساڵی (١٩١٤ ز)دا دوا گۆڕانکاری‌یەکان لە سنوردا دەست نیشان کران.

لەئەنجامی دیاری کردنی ئەم سنورەدا، نێوان جافرسان و سوپای عوسمانی تێك چوو، بەڵکو دەکرێت بڵێین نێوانیان هەر کۆك نەبووە، جا لەساڵی (١٩١٤ ز)دا سانی لهۆن بەرەنگاری هێزی عوسمانیەکان بوویەوەو لە گوندەکانی هەورامانی عێراق دەری کردن. بەڵام زۆری نەبرد هێزی عوسمانی ناوچەکەیان گرتەوەو، کەوتنە گیانی خەڵکەکەیو قەسفی شارۆچکەی نەوسودو نۆدشەو لادێکانی دەورو بەریان کرد بە تۆپ و، بووە هۆی سوتاندن و وێران بونی ناوچەکە.[٤٢]

سان خۆیو جەنگاوەرەکانی لە پەنای چیاکانی ناوچەکەدا لە سەنگەردا بوون، دواتر لەشکری جافرسان لە چەند قۆڵەوە کەوتنەوە پەلاماری عوسمانیەکان، لە قۆڵێکەوە بەسەر کردایەتی کەریم بەگی جافرسان هێرش کراو،

پاش شەڕێکی گەرم هەندێك عوسمانی دیل دەکەن، ئەمە کەمێك پاشەکشەی پێکردن، قادر بەگی کوڕی جافرسان بە لەشکرێکەوە بە یارمەتی خەڵکی تەوێڵە، تەوێڵە دەگرن و عوسمانی دەردەپەڕێنن، ئیتر لەشکری عوسمانی زیاتر دەشکێت و شازدە گوندی تری لێداگیر دەکرێت. هەرچەندە ئەم گوندانە هەر هەورامان بوون، بەڵام لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون. ئەمڕۆ ناوچەی هەورامانی دیوی عێراقە.[٤٣]

لەم کاتەدا عوسمانیەکان لە شوێنێکی ترەوە توشی دوو شەڕی گەورە بونەوە، بە ناوی شەڕی (ئیتالیا و بەڵقان) ئەمە بوو بەهۆی پەشۆکاندنیان بەکاری ناوخۆی خۆیانەوە، چونکە لەم دوو شەڕەدا دووچاری شکاندنێکی گەورە بوونەوە، ئەم شەڕانە بووە هۆی هێنانەوە یەکی قەوارەی عوسمانیەکان، نەك هەر لە هەورامان و کوردستان دا، بەڵکو لە ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاو سەروی ئەفریقاشدا.[٤٤]

**پشتیوان کردنی سان لە عەباس خان:**

(عەلی محەمەد خان) ناسراو بە (شەریفودەولە) حاکمی سنە بوو، ئەوەندە خەڵکی کوردی لە سنەو دەورو بەری کوشتبوو ناویان نابوو شەریفە قەساب.

جا عەباس خان، ناسراو بە سەردار ڕەشید کە خەڵکی ڕەوانسەرەو فەرماندەیەکی ئازای کورد بووە، چەند جار سەرهەڵدان و ڕاپەڕینی دژی ڕژێمی ئێران بەرپا کردوە، لە ساڵی (١٩١٩ ز) دژی شەریفە قەساب حاکمی سنە، ڕاپەڕینی بەرپا کرد.

جافرسان بە هەزار کەس (٣٠٠ سەربازو ٧٠٠ سوارەوە) بەشداری کرد لەم ڕاپەینەو، بووە پشتیوانی سەردار ڕەشید. هەرچەندە دەستێکی باش ئەوەشێنن لە لەشکری شەریفە قەساب، بەڵام لە پەلامارێکی دژدا، سەردار ڕەشید دەگیرێت و ڕەوانەی تاران دەکرێت.[٤٥]

**هێرشی ڕەزا خان بۆ سەر هەورامان لە ساڵی (١٩٢٢ ز):**

لەسەردەمی هاتنە سەرکاری زیائەدین تەباتەبائی، (ڕەزاخان کەدوایی بوو بەڕەزاشا) کەفەرماندەی هێزە چەکدارەکانی ئێران بوو، بۆئەوەی هەورامان بخەنە ژێر دەسەڵاتیانەوە، بەرەو هەورامان لەشکرێکی (٦) هەزار کەسی نارد، ئەم لەشکرە خرایە ژێر دەسەڵاتی عەلی ئەکبەرخانی سنجابیو ڕەشید سەڵتەنەو سەردار ڕەشیدەوە.

جافرسانیش بەهۆی (٤) هەزار چەکدارەوە، لە(سەریاس) خۆی ئامادە دەکات هەرلەوێ شەڕێکی گەورە ڕوودەدات و، چەند کەسێك لەهەردولا دەکوژرێن و بریندار دەبن، لەئەنجام دا جافرسان سەردەکەوێ و، لەشکر پاشەکشێ دەکات. لەم شەڕەدا ئەگەر ڕەشید سەڵتەنە نەبوایە، سەردار ڕەشید، عەبدورەحمان بەگی وەکیلی جوانڕۆی کوشتبوو، لەبەرئەوەی گوایە هاوکاری جافرسانی کردووە.

ئەوەی شایەنی باسە: دوای ئەم شەڕە سەردار ڕەشید، خۆی گەیاندە لای مەحمودخانی دزلی، خانیش لەگەڵ جافرسان دا ئاشتی کردنەوە.[٤٦]

**داڵدەدانی جوانڕۆیان لەلای جافرسان:**

لەمێژووی هەورامان دا ل.(١٤٦) مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی دەلێ: دەوڵەتی ڕەزاشا، ناوبەناوکەوتبووە بیانووگرتن لەعەشایرە کوردەکان وئالەو دەمەش دا، کەوتەگرتنی جوانڕۆیان وبەوبۆنەشەوە، هەندێ سەربازو فەرماندەیان هاتەسەر جوانڕۆو هەندێ لەسەرکردەی جوانڕۆیانیان گرت و زۆربەی زۆریشیان، لەدەست گرتنی (کلیش) کەسەرکردەی سەربازانی دەوڵەت بوو، خۆیان دەرباز کردبوو، هاتبونە پەنای جافرسان.

جافرسانیش پەنای دان و، زۆر ڕێزی لێگرتن و، شەوێکیش بەسەر کردەی کوڕانی (کەریم بەگ وحەمەڕەشیدبەگ) دایان بەسەر قەڵای جوانڕۆداو چی سەربازی دەوڵەت لەوێ دەبێ لەناوی دەبەن، ئەوەش کەلێیان دەمێنێتەوە، بەپەلە پڕوزێ خۆیان دەربازدەکەن و لەگەڵ سەرکردەکەیاندا (کلیش) بەرەو دواوە بۆکرماشان دەگەڕێنەوە، بەو جۆرە ئەوجوانڕۆیانەی کەگیرابوون، بەردەدرێن ولەدەست دەوڵەتی شاە سەرفرازدەبن و، ئەمەش لەڕێکەوتی سالآنی (١٣٤٤ك، ١٩٢٥ز) دەبێت.

دواتر دەوڵەت، لەشکرێك بەسەرکردەی ( خەسرەوخان) دەکاتە سەر هەورامان.

جافرسانیش لەشکرێك بەسەرکردەی (کەریم بەگ وحەمەڕەشیدبەگ) کۆدەکاتەوەو بەرەو (ملە پاڵنگانە) دەینێرێ.

لەشکری هەردوولا، لەنێوان( قوری قەڵا) و(ملەپاڵنگانە) دەگەن بەیەك وشەڕ لە نێوانیاندا ڕودەدات، لەشکری جافرسان لەشکری دەوڵەتی ئێران تەفروتونا دەکات وچەندانیان، لێدەکوژن وچەندانیان لێبەدیل دەگرن، بەشەکەی تری لەشکر بەپرژو بڵاوی وبەشکاوی بەرەوکرماشان دەگەڕێنەوە.

دیلەکان ڕێزێکی زۆریان دەگرن وپێداوویستیان بۆدابین دەکەن و ئازاد دەکرێن و دەگەڕێنەوە بۆلای دەوڵەت.

**ئاخرڕاپەڕینی جافرسان:**

دوای‌ئەوەی دەوڵەتی قاجاری ڕوخا، لەساڵی (١٩٢٥ز) ڕەزاشای پەهلەوی هاتەسەرحوکم و، وەك هەموو دکتاتۆرەکانی دنیا کەوتە دڵخۆش کردنی خەڵکی بەتایبەت، سەرۆك هۆزو کەسایەتیەکان، بەڵام سەرۆك هۆزەکوردەکان زوو دەرکیان بەسیاسەتی گڵاوی ڕەزاشاکرد، بۆیە: لەساڵی(١٩٢٦ز) بەولاوە، ڕاپەڕین و جموجوڵی چەکداری زیاتر جۆشی سەند. هەرلەوساڵەدا، تیرەکانی بانەو سەقزو سەردەشت و شوێنەکانی تر، دەستیان دایە ڕاپەڕین و ژمارەیەکی زۆر لەسەربازگەو بارگەوبنەی دەوڵەتیان سوتاند.

لەناوچەکانی باشوریش، تیرەکانی (هەورامان ومەریوان) بەسەرکردایەتی (مەحمود خانی دزڵی) و(مەحمود خانی کانی سانان)و لەگەڵ (جافرسانی هەورامان) پەیامی ڕاپەڕنیان ڕاگەیاندوو هەرلەوکاتەدا، پەیوەندی‌یان بە(سالارودەولە) وە کردوو، بۆماوەیەکی زۆر ناوچەکانیان جەنجاڵ کردوو، لەژێردەسەلاٚتی دەوڵەتیان دەرهینان[٤٧].

**هێرشی ڕەزاشا بۆسەر هەورامان:**

پاش ئەم ڕاپەڕینانە، ڕەزاشا کەوتە بیرکردنەوە بۆکۆنترۆڵ کردنی ئەم ناوچانەو داماڵیینی چەك لێیان، لەساڵی (١٩٣٠ز) دا داوای لەهەمو سەرۆك خێڵ و تیرەکانی کوردستان کرد، کەدەبێت هەموو چەك و پێداویستی جەنگ تەسلیم بکەن، هەندێکیان ڕێکەوتن وچەکیان تەسلیم کرد، بەڵام مەحمود خانی دزڵی‌و جافرسان بەم داوایە قایل نەبوون ئیتر شاکەوتە درۆو دەلەسەو فڕوفێڵ و خەڵەتاندن. بۆیە: هەرلەم ساڵەدا (سەرهەنگ مەحمودخانی ئەمینی) لەلایەن دەوڵەتەوە دیاری کراو، کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ مەحمود خانی دزڵی، جۆرە ڕێکەوتنێك بوو لەنێوانیاندا، سوێندیش بەقورئان خورا، کەفروفێڵ نەکرێت، ئیتر عەبدوالله خانی مەحمود خانی، لەگەڵ خۆی برد بۆدزڵی، کەچی لەوێ خستیە زیندانەوە.

لەم کاتەدا ڕەزاشا، گەورەترین هێزی کۆکردەوە لەسوپاو هەندێ عەشائیرو داروەستەکانی‌و، لەنیوەشەودا بەشێوەیەکی کتوپڕ پەلاماری هەورامانی‌دا، شەڕێکی قورسی -نابەرامبەر لەچەك و ژمارە- ڕووی‌دا.

ڕۆژێ پێش ئەم هێرشە (مەحمود خانی دزڵی) و(سەروان حەسەن خانی کرمانی) گفتوگۆیان کردووە، گوایا دڵنیایە، بۆیە ئەوشەوە دەربەندەکانی (دزڵی و کەڵیم) چۆڵ بوون وتفەتگچیان پێوەنەبووە.[٤٨]

سوپای ئێران، بەشێکی بەرەو دەربەندی دزڵی ڕۆیشت، پاش شەڕێکی گەورە مەحمودخان ئاوایی دزڵیو دەوروبەری چۆڵ کرد وبەرەو هەورامانی عێراق ڕۆیشت وکەوتە دەست عێراق[٤٩]، مەحمودخان ماوەیەك بەشاخەکانی هەورامانەوە ماوەتەوە و، شەوانە هەڵمەت دەبەنە سەر دارودەستەی ڕژێم، تالە ئەنجام دا، بەهۆی شێخ عەلادینەوە خۆی دایەدەست دەوڵەتی عێراق.[٥٠] بەشەکەی تری سوپای ئێران، بەرەو سنوری دەسەلاتی جافرسان ڕۆیشت بەسەر کردایەتی (ڕەزم ئارا).

(جافرسان )یش، بە خۆیو تفەنگچییەکانەوە کەوتە بەرەنگاری ئەم هێرشە گەورەیە، شەڕێکی سەخت و قورس لە (ڕەوانسەر) و دواتر لە (شمشێر) ڕوویدا. هەرچەندە جەنگاوەرانی سان، زیانێکی زۆریان گەیاند بە سوپای ئێرانی، بەلام دواتر جەنگاوەران نەیانتوانی ئەو بەرەنگارییە بکەن. ئەمەش لەبەر زۆری سوپاو چەکی قورس و زەبرو زەنگی دوژمن، بۆ ئەوەی ناوچەکەش زیانی زۆری لێنەکەوێت جافرسان، بڕیاری کشانەوەیداو، بەرەو (نەوسود) هات و لەوێشەوە هاتە (تەوێڵە)، ماوەیەك لێرە مایەوە، لەم کاتەدا نامەیەکی تری، ئایەتواللە ی مەردۆخی، پێگەیشت، کە لەسەر ویستی ئێران ئەم نامەیە نوسراوە، بەڵکو جافرسان قەناعەت پێبکات بگەڕێتەوە بۆ ئێران، کورتەی دوا نامەکەی دەڵێ:[٥١]

جناب امیر الامراء العظام آقای جعفر سلطان سردار معتضد، حکمران لهۆن و مضافات دام اقباله.

چەند نامەم بۆ ناردویت وە ئەمە دوا نامەیە، سەردەمی هۆزایەتی تێپەڕی، تەواوی سەرۆک هێزەکانی ئێران سەریان بۆ دەرگای شاهەنشاهی خاوەن پایە دانەواندووەو هەموو گوێڕایەڵی فەرمانن... لە کۆتاییدا هاتووە:

تەواوی خۆشبەختیو بەدبەختی ئێوە، بەسراوە، بە وەلامی ئەم نامەیەوە. فەرمانبەردار دەبیت یا یاخی دەبیت:

محەمەد مەردۆخ

کورتەی وەڵامی سان بۆ مەردۆخ:
(حضور مبارک مستطاب غوث الأنام وحجة الاسلام، آقای آیة الله مردوخ دامت برکاته....)
دەست و خەتی پیرۆزت، کەسەرانسەری ئامۆژگاری باوکانە بوو، زیارەت کرا... من یەکەم کەس بووم کە بۆ خزمەت کردن بە دەوڵەت و کوژانەوەی سەر پێچی هۆزەکان لەم سنورەدا ئامادە بووم، ئێستا چی ڕوویداوە، وا لەکۆمەڵەی ناپاکان دەژمێردرێم .. ئەو بڕیارو قسەی سەر تیپی لەشکرە جێی بڕوا نیە. هەر کام لەوانە گۆڕا یەکێ تر هات، گوێ بەبڕیاری پێشوو نادات.
بۆ خانی دزڵی بە قورئان سوێندیان خوارد، کە کوڕەکەیان برد بەناوی پلەو پایە پێدانەوە، کەچی ئاوارەو دەربەدەریان کرد، دوای سوێندی قورئان بەدرۆ خواردن، بەچی باوەڕ بکەم؟
ئیتر من بێجگە لە کۆچ کردن بۆ ناو خاکی عێراق هیچ چارەیەک نابینم......
جەعفەر سوڵتان

د. موکەڕەم تاڵەبانی لەم بارەیەوە دەڵێ[٥٢]:
(... کوردەکانی هەرێمی هەمەدان و هەورامان لە کوردستانی ئێران، بەسەرۆکایەتی جافرسانی سەرۆکی هەورامان ئاڵای شۆڕشیان دژی حکومەتی دکتاتۆری ڕەزاشا هەڵگرت، کوردەکان مەردانە پەلاماری لەشکری ئێرانیان داو، دۆڵەکانی هەورامانیان بەلاشەی ئەفسەرو سەربازی ئێرانی پڕکردەوە، بەڵام کۆمپانیاکانی نەوت، لەگەڵ حکومەتی ڕەزاشادا، بەمەبەستی خۆیان گەیشتن وئیتر نەیان دەویست، سەرئێشە بۆئەو حکومەتە دروست بکرێت و، هەڕەشەیان لەجافەرەسان کرد، کەدەبێت چەك فرێدات و ناوچەی هەمەدان و هەورامان بەجێبێڵێت، ئەگینا وەکو شێخ مەحمودی لێدەکەن. ئیتر جافەرەسان دەستی لەشۆڕش هەڵگرت وخۆی وکوڕەکانی پەنایان هێنایە کوردستانی عێراق.)

**پەناهیندەیی جافرسان:**

لەدوای گفتوگۆیەکی زۆر لەنێوان حکومەتی عێراقیو ڕەزاشادا، عێراق لەساڵی(١٩٣٠) پەنای سیاسی دا، بەسوڵتان وشوێنکەوتوانی، کەپێکهاتبوون لە خێزان و نەوەو پێشمەرگەکانی کەنزیکەی(٣٠٠) کەس بوون... کەلەناویاندا (٣٦) کەسایەتی ناوداری هەورامان لەگەڵ جافرسان دابوون.[٥٣] حکومەتی عێراقی، لەڕومادی و بەصرەو بەغدادو موصل نیشتەجێی کردن، دواتر

لەکەرکوك جێگیر بوون، بەلاّم لەماوەی (١٠) ساڵ دا بواری نەدا، بەسوڵتان و شوێنکەوتوانی سەردانی شوێنەکانی تری کوردستانی عێراق بکەن، هەر لە کەرکوك و لیواکانی تری عێراق دا ئازاد بوون.[٥٤]

بەدرێژای سی‌یەکان، ڕەزاشای ئێران داوای لە حکومەتی عێراق دەکرد کە جەعفەر سوڵتان و شوێنکەوتوانی تەسلیم بەئێران بکاتەوە، بەلاّم حکومەتی عێراق تەسلیمی نەکردنەوە... ئیترسان و شوێنکەوتوانی لەکەرکوك مانەوە، لەماوەی سالآنی (١٩٣١بۆ ١٩٤١) وەك پەناهندەیەکی سیاسی، یارمەتی زیندەگی‌یان بۆدابین کرا.

هەندێك لەکوڕو شوێنکەوتوانی سوڵتان نەهاتنە عێراق، گومانیان وابوو لەئێران بمێننەوە، ڕەزاشا لێیان دەبورێت. کەچی ئەورژێمە ستەمکارە، هەڵسا بەگرتن و زیندانی کردنیان لەقەسری قاجار لەتاران. ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆری دان ونزیکەی دەسالێك مانەوەو زۆریشیان هەرلە زیندان دا، کۆچی دوای‌یان کرد، بەهۆی ئەوئازاردانەیانەوە. وەك پێشینان دەگێڕنەوە: ڕژێمی ئێران بەپیسترین شێوەو، بەجۆرێکی وەحشیانە، مامەڵەی کردووە لەگەڵ ئەم بەگزادانەی هەورامان. ئەوانی تر، لەدوای ڕوخانی ڕەزاشا، لەساڵی(١٩٤١ز) دا، لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە ئازادکران.[٥٥]

**لەئەنجامدا چی گوزەرا:**

لەساڵی (١٩٤١ز) هێزە بیانی‌یەکان ڕەزاشایان ناچارکرد، کەئێران بەجێ بهێڵێ‌و بچێت بۆ( جۆهانسبێرگ) لە خوارووی ئەفریقا، پاشان محەمەدی کوڕی خرایە جێگەی... لەم کاتەدا زۆرێك لە کوڕان ونەوەو شوێنکەوتوانی جافرسان، بەنهێنیەوە- هەرچەندە لەم کاتەدا عێراق مەنعی نەئەکردن- گەڕانەوە هەورامانی لهۆن. هەربەگەیشتنەوەیان، جەنگاوەران بەهاوکاری خەڵکی پاوەو نەوسودو نۆدشە، دەستیان گرتەوە بەسەر، سەربازگەکانی ڕژێمی پەهلەوی‌و، هێزەکانی شایان بەدیل گرتن و، دەریانکردن لەناوچەکەو فەرمانڕەوایی‌یان گرتەوە دەست.[٥٦]

بەلاّم جافرسان بەهۆی: ئەوەی چوو بووە ساڵەوە، پیر بوو بوو، وەکۆمەڵەکەشی پەرتەوازە بوو بوون و، یەکیان نەئەگرتەوە، هەروەها بەهۆی بارو دۆخی نوێی ناوچەکەوە... تاد، نەڕۆیشتەوە بۆ هەورامان، بەڵکو گەڕایەوە سلێمانی، لەوکاتەدا کەریم بەگی کوڕی، کەدوای (١٠) ساڵ زیندانی، لە قەصری قاجار، بەردەبێت و دێتە سلێمانی بۆلای باوکی وبراکانی وکەسەکانی.

جافرسان لەسێمانی لەماڵی مستەفا بەگ، زۆرێک لە بەگزادەکان کۆدەکاتەوە، بەڕێو ڕەسمێکی قەشەنگەوە، کەریم بەگی کوڕی دەکاتەوە بەجێگەداری خۆیو دەبێتە سانی هەورامانی لهۆن.

کەریم بەگ لەساڵی(١٨٨٢ز) لە نۆدشە لەدایک بووە کەلە ساڵی (١٩٤١ز) دەبێتە سان، دەگەڕێتەوە بۆ خانەگای لای پاوە، دادەنیشێت و سانیەتی خۆی دەکات تا لەساڵی (١٩٤٥ز) کۆچی دوایی دەکات و، لە نەوسود بەخاک دەسپێرری.[٥٧]

پاشان حەمەئەمین بەگ دەبێتە سان، بەڵام لەسەردەمی ئەم دا دەسەڵاتی بەگایەتی کەم بوویەوە، هەم لەعێراق و هەم لەئێران، چونکە ڕژێمەکان دەسەڵاتی ناوچەکەیان گرتە دەست و، لەلایەکی تریشەوە، خەڵکی لەدەوری حیزب و بیرو بۆچونەکان کۆبوونەوە، بەتایبەت لە هەورامانی عێراق.

حەمەئەمین سانیش لەساڵی(١٩٨٣ز) لەشارۆچکەی پاوە، کۆچی دوایی کردو، هەرلە وێ نێژرا. لە دوای ئەم، بەتەواوی دەوری سانیەتی نەما، هەرچەندە عیزەت بەگی کەریم سان وەك ڕیش سپی‌یەکی ناوچەکەو وەك سانێك سەیرکراوە، لەلایەن کەس ودۆستانی یەوە.

جافرسان دوای ئەوەی کەریم بەگی کردە سانی هەورامان لە دوای خۆی ... ئیتر لە سلێمانیەوە گەڕایەوە هەڵەبجە، لەگەڵ هەندێکی کەم لە شوێنکەوتوانیو، سێ لە کوڕە بچوکەکانی، کە ئەوانیش (مەنصورو سەیفواللەو ناصر) بوون. ئەوانی تر، لەگەڵ کەریم سان دا، بەڵکو هەندێکیان پێشتر چوونەوە هەورامانی ئێران.

لەم ماوەیە کە جافرسان لە هەڵەبجە بوو، ئەمری ڕەسمی بۆ دەرچوو کە بکرێت بە قائیمقامی هەڵەبجە، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕەگەزنامەی ئێرانی هەبوو ئەمرەکە هەڵوەشێنرایەوە،[٥٨]

سان لەساڵی (١٩٤٢) لە تەمەنی (١٠٨) ساڵیدا، کۆچی دوایی کردو لە یەکێك لە گۆڕستانەکانی عەشیرەتەکەی عەبابەیلیێ، بەخاك سپێردرا.

ئەم بنەماڵە زۆربەیان لە هەورامانی لهۆنن لە ئێران، کەمێکیان لە عێراقن. ئێستا هیچ لە کوڕەکانی جافرسان لە ژیاندا نەماون جگە لە ناصر بەگ، کە بچوکترین منالی بووە، لە دایك بووی (١٩٣١ز) یە ئێستاش لە تارانە سەرهەنگ (عەقید)ی خانەنشینە.

**کەسایەتی و هەندێ هەڵوێستی جەعفەر سوڵتان:**

- جافرسان لە ساڵی (١٩٢٢) دا چەند مەزبەتەیەکی، پێشکەش بەکۆمەڵانی گەلان کردووەو، داوای کردووە کەدان بنرێت بەمافی چارەی خۆ نوسینی کوردا.لە بەڵگەنامەکانی نەتەوە یەکگرتوەکاندا ئاماژە بۆئەمانە کراوە.

- لە ساڵی (١٩١٩) شێخ مەحمود سەردانی جافرسانی کردووەو، هاتووە بۆگوندی دەگاشێخان بۆلای، بەمەبەستی پشتیوانی کردنی لە شۆڕشەکەیدا، بەلام.. نەبووەتە پاڵپشتی شێخ مەحمود[٥٩]، هاوپەیمانی عادلە خانمی وەسمان پاشای جاف بووە. بەڵام!

- مستەفا بەگی جافرسان وئافراسیاب بەگی ڕۆستەم سان، بوونەتە پشتیوانی شێخ مەحمودو، هەردوکیان، بەشداری شەڕەکەی دەربەندی ئەشکەوڵیان کردووە دژبە ئینگلیز.[٦٠]

- لەلایەکی ترەوە، جافرسان، لەڕووداوە نیشتیمانیەکان دا، بێدەنگ نەبووەو بەشداری کردووە، بۆنمونە:

لەکاتێکداو لەکۆتایی مانگی ئابی (١٩٣٠) دا، موتەصەڕیفی سلێمانی، زانای خوالێ خۆش بوو(تۆفیق وەهبی) لەسەرکار لادەبرێت ودەگوێزرێتەوە جافرسان، لەگەڵ جەماوەری کوردا، داوای گەڕانەوەیان کردو هەڵوێستی جوامێرانەی هەبوو.[٦١] [٦٢]

**سیاسەتی جافرسان هەمیشە لەهەوڵی:**[٦٣]

- پاراستنی شەرەفی خەڵکیدا بووە.
- دوور کەوتنەوە لەشەڕی ناو خۆو، یەکگرتنی هۆزەکان.
- هەروەها هەوڵی داوە، وڵات هێمن و ئاسایش بێت.

م. هادی بەهمەنی دەڵێ:[٦٤]

- لەناو سانەکانی هەورامان دا کەسێکی هەڵکەوتوو بووە، ڕێزی لە ڕۆشنبیران گرتووە، بەپێچەوانەی سانەکانی پێش خۆی. هەرچی ڕووداوی خوێناوی هۆزایەتی بووە شوێنەواریانی سارێژ کردووە، خەڵکێکی زۆری لێ کۆ بووەتەوە.

- ژیانێکی سادەی بەسەر بردووە کەلەهی فەرمانڕەواکانی پێش خۆی نەئەکرد.

- ساچان و خۆپاراستنی سانشینی هەورامان کردووە، بۆ ماوەی چل ساڵێك لەنێوان سێ هێزی گەورەی تەراتێکنەر لە ناوچەکەدا (ئێران، عوسمانی، ئینگلیز..).

هەروەها: [٦٥]

.. جافرسان ناوبانگی بەژیری ودانایی وئازایەتیو دەست بلاّویی‌و وردبینی ودڵسۆزییو بەرەحمی وداوێن پاکی‌یەوە دەرکردووە.

بەتوانایی و وردبینیەوە، توانیویەتی هەمەجۆر رێگای پیاوانەو ئازایانەو دڵسۆزانە بەکار بهێنێ، لەپێناوی رەزامەندی لهۆنیان و، خزمانی ودراوسێ‌یانی دەوڵەتانی دراوسێیانیدا!.

لەگەڵ شێخەکانی هەورامان و، پیاو ماقوڵانی خوێندەوارانی هەورامان دا، هەوڵی داوە تێکەلاّویان، لەگەڵ بکاو لێیان نزیك بکەوێتەوەو،سود لەبیرو راو هەڵسوکەوتیان وەربگرێ! تکاشی وەرگرتوون.

پیاوێکی بەدین بووەو دەڵێن: نوێژی نەرۆیشتووە، رێزی پیاوانی ئاینی زۆر بەلاوە بووە.

دەگێرنەوە:

کە کاتێك جافرسان بەرەو عێراق دێت دوو قەرانی پێ دەبێت وئەوانیش دەخاتە حەوزە لارەوە، دەڵێت با پارەم نەچێتە ولاّتی بێگانەوە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە جافرسان ولاّتەکەی خۆی خۆش ویستووەو، لەولاشەوە هەوڵی نەداوە ماڵ وسامان کۆبکاتەوە...

جگە لەمەش، لەسەردەمی جافرسان دا، لە هەورامان، خزمەتێکی باشکراوە بەزانایان وحوجرەو پشتیوانی کردون، لەسەردەمی ئەمدا، لەپاوەو نەوسود ونۆدشەو تەوێڵەو بیارەدا، خوێندنگایەکی زۆر هەبوون، کەلە هەموولایەکی کوردستانەوە دەهاتن بۆ خوێندن؟. [٦٦]

مامۆستا صدیق بۆرەکەیی دەربارەی دەڵێت:

(... جافرسان پیاوێکی‌سیاسەتمەدارو بەتواناو لێهاتوو ئازاو دیندار بوو، خەڵکی خۆشیان دەویست وسەرەتا سوپایەکی دروست کردو خەڵکی هەورامانی کرد بەیەك..)

دکتۆر موکەرەم تاڵەبانیش دەڵێت: [٦٧]

(... جافرسان، پیاوێکی بالاّبەرزی چوارشانەی بەتەمەن، کەواو سەڵتەی کوردی گەرمیان لەبەرو، عەبایەکی چۆغەی شینی لەشان دا، بەلاّم (مشکی)یەکی

سەوزی بەشێوەی هەورامی، لەسەر ئالأنووە، لەگەڵ هەموو بانگدانێکی نوێژ، لەبەر تەکیەوە، لەماڵەکەی شێخ ڕەزای تاڵەبانیەوە، لەگەڵ چەندپیاوێکی هەورامی، دەچنە نوێژو، لە پاشان لەگەڵ شێخ جەمیلی مامم، بۆقاوە خواردن و، دەمەتەقێ، دێنە دیواخانی مامم، مامم زۆر ڕێزی لێ دەگرت: فەرموو سان بەرەو ژوور، لەژووری کۆڕەوە، دای دەناو، لەنزیکیانەوە سوکە پیاوێکی ژیری ئێسك سوك دادەنیشت، ئەمە عینایەت بەگی نوسەرو، ڕاوێژکاری جافرسان بوو.

ئەم عینایەت بەگە لەزوبانی کوردیو فارسی وتورکی دا، زۆر شارەزا بوو، ئاگایشی لەکاروباری ئەم ولأتانەو جیهان هەبووە، بەئەندازەی ئەو سەردەمە، ڕۆشنبیرێکی ژیر بوو. هەروەها دەڵێ: جافرسان پیاوێکی بێفیزو قسە خۆش وقسەزان بوو، لەگەڵ زۆربەی شێخانی تاڵەبانی ودانیشتوانی بەرتەکیە ئاشنایی پەیدا کردبوو، گاڵتەو گەپی لەگەڵیان دادەکرد...).

جافرسان داد پەروەری بەرابەر گەلەکەی و بەهێزی بەرامبەر بە دوژمنانی وای کردووە لەشاعیری گەورەی کورد (عەلی باپیرئاغا) لە لاواندنەوەکەی جافرسان دا بە فارسی بڵێ:

| | |
|---|---|
| نبیند دیده گردون | نزاید مادر دوران |
| عدالت پرور عالی | همان چون جعفر سلطان |
| چەرحلت کرد ازما | به بهشت گشت شاه هورامان[٦٨] |

هەروەها میرزا عەبدولقادری تەوێڵەیی پارچە هەڵبەستێکی هەیە لەسەرەتاکەیەوە دەڵێ:

سوڵتانی عادل، نەوشیروان سیفەت     دارای عەدالەت، دارای مەعریفەت

لە کۆتایەکەشیدا بەحسابی ئەبجەدی ساڵی مردنەکەی (سان ) دیاری دەکات و دەڵێ:

تەئریخی فەوتش، بکەردم حەسیب   ئەبجەد وات، واچە (سلطانی غریب).[٦٩]

## مەحمودخانی دزڵی [٧٠]

(١٨٧٠-١٩٤٦ ز)

کوڕی عەزیز خانی کوڕی بارام بەگی محەمەد سانی یەکەمە، دایکی پیرۆزەیەو کچی حەسەن سوڵتانی گەورەی هەورامان بووە. باوکی سەردارێکی هەورامان بووەو، لە دوای باوکی ماوەیەکی کەم ئەحمەد خانی برای دەبێتە خانی دزڵی، پاشان مەحمود بەگ دەبێتە خان و دەسەڵات زیاتر پەیدا دەکات و، وەك ناودارێکی کورد دەناسرێت.

**خێزانەکانی:**

زێبا، فاطمة، مریەم، زینەت، فەرەنگێز، نازیف خان- ئەمەی دوایی‌یان کچی مەحمود خدری سەرداری هەمەوەند بووە کەلە پێشدا خێزانی پاڵەوانی مەلیك مەحمود(کەریم بەگی فەتاح بەگ) بووە، دوای شەهید کردنی کەریم بەگ خواستویەتی. پانزە کوڕو شەش کچی بووە.

**کچەکانی ئەمانەن:**

عەینە، ئامینە، سوڵتانە، عاصمە، حەنیفە، نەجیبە.

دکتۆر موکەڕەم لە نوسینێکی‌دا بەناونیشانی (مەحمود خانی دزڵیم چۆن ناسی)، کەلە دوای ئەوەی کە خان لە بەندیخانەی کەرکوك بەر بووە، بەم شێوەیە بینیویەتی‌و باسی دەکات:

(... مەحمود خان پیاوێکی باڵابەرزی چوار شانەی، ڕووپانی سوورو سپی بوو، جووتە سمێڵی درێژو ڕێك، بەڵام ماندویەتی - ئیچ قەڵا-و هەشت ساڵی بەندیخانەی کەرکوك و بێکەسی‌و دەست کورتی، هەندێك شێوەی گۆڕی بوو، سمێڵەکانی بۆزو ، قورسی باری ژیانیش، هەندێك پشتی کۆم کردبوو، پیاوێکی کەم دوو، مەندو بەویقار، ئاهە درێژەکانی لە ئاوو دووکەڵی نێرگەلەکەی‌دا، ون دەکرد، بۆ ئەوەی کەس هەست بە سۆزی نەکات.[٧١]

ڕشتەی بنەماڵەی مه حمود خانی دزلی (٧٢)
بارام بەگی دزلی
حەبیب الله بەگ
حەیدەر بەگ
جان الله بەگ
عەزیزخان
سەردار بەگ
قادر بەگ
محەمەد عەلی بەگ
محەمەد صالح بەگ
محەمەد ئەمین بەگ
حامد بەگ
حەمەشەریف بەگ
عەلی محەمەد خان
ڕەزا بەگ
محەمەد ڕەشید بەگ
ئەحمەد بەگ
بارام بەگ
جافر بەگ
مه حمود خانی دزلی
حەمەڵ بەگ
عەبدوڵلا خان
حەمەئەمین بەگ
عەبدولکەریم
عەزیز
خەلیل
محەمەد
ئەنوەر
مەنصور
ڕەفعەت
سەردار
مەجید
لوقمان
ئەرکان
عەرەسو
ئەحمەد
ئەمیر
حەمەد بەگ
کەمال
خەسرەو
فەیصەل
بورهان
جەمال
جەمیل
کاوە
ئەدهەم
مادح
عیزەت
مەنصور
ڕێبوار
بەختیار
کاوە
ئاری
ئاریز
ڕەنج
ڕۆژ
کۆسالان
میرخان
ئاریان
کاوان

**دزڵی پایتەخت:**

(... دزڵی، گەورەترین قەڵاو سەخترین، قەڵای هەورامان، لە قەڵەم دەدرێ‌و هەر لەبارام بەگەوە، تا دەگاتە مەحمود خان، هەمیشە حەزیان لەوەدا بووە، کەسەر بۆ خەڵك دانە نەوێنن و هەمیشە دژی زوڵم و زۆری دەوڵەت و، ڕەش و ڕووتی وەستاون.

دزڵی یەکێکە لەو قەڵایانە، کە دەوڵەتەکانی ئێران، یەك بەدوای یەك داو، حاکمانی کوردستان ( سنە) یەك لەدوای یەك، بەچاوێکی دوژمنایەتی تەماشایان کردووەو، هەمیشە سەرکردانی دزڵی‌یان بەسەر کەشیکەر لەقەڵەم داون.[٧٣]

هەروەها:

... دزڵی پایتەختی حکومەتی مەحمود خان بووە، خۆی لەدزڵی دادەنیشت، جگەلە دێهاتەکانی خۆی، ئەمانەی تریش هەرلەژێر فەرمانی خاندا بوون: زەوی بەردەلێن، نەویێ‌و بەردە بەل، توتەقاچ، زێڕۆن، بانی‌شار، عامورە.

ئۆڵلاّ خانی کوڕی، ئەرکان حەربی بوو، وەکوڕو براکانیشی، هەریەکە حاکم وبەرپرسی ناوچەیەك بوون.[٧٤]

**خەبات وکەسایەتی خانی دزڵی:**

ئەم سەرداره لەئەنجامی تێکۆشان وگیانی بەرهەڵستکاری‌دا، چەندین جار لەسالأنی جیاوازدا، دەربەدەر کراوەو، خراوەتە گرتوخانەکانی(هندستان)، سنە، قەصری قاچار، هنێدی، ڕومادی، سلێمانی، کەرکوك، بەغداد)و زۆر جاریش بەدەست بەسەری ڕەهەندەی شارەکانی ئێران و، عێراق کراوە.

هەرلەبەندیخانەکەی کەرکوك ( ٢٨٠٨) ڕۆژ زیندانی کراوە.

خانی دزڵی، پیاوێکی بەخشندەو، ئازا بووە، لەسەردەمی دەسەڵاتیدا، دزڵی‌و ئاواییەکانی دەوروبەری، بووبوونە، پەناو داڵدەی، ئەوکەسانەی کەلە دەست ڕژێمە داگیرکارەکانی هەڵاتوون و، لەو مەڵبەندەدا حەساونەتەوە. خزمەتێکی زۆری شێخ مەحمودو شێخانی عەبابەیلیێ کرد، کاتێك کەچوونە دزڵی کەلەدەستی ئینگلیزەکان ڕایان کردبوو. چەندین چاریش دژی ڕژێمەکانی ئێران وئینگلیز جەنگاوەو شکستی پێ هێناون.

پەیوەندیەکی بەتین ونەبڕاوو برایانەی لەگەڵ شێخ مەحمودا، هەبووە.( ڕەفیق حیلمی) لەیاداشتەکانی‌دا، خانی دزڵی بەپاڵەوانی شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحمود داناوە.

دۆستی خۆشەویستی: سمکۆی شکاك و سەردار ڕەشیدی ئەردەلان و حەمەڕەشی خانی بانەو، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندو، سەید محەمەدی جەباریو، شێخانی تاڵەبان و،کەسنەزان بووە، لەڕووی ئایینی‌یەوە، پەیوەست بووە بەشێخ نەجمەدینی بیارە، تەنانەت دوو خوشکی خان بەرودوا خێزانی شێخی ناوبراو بوون.

لەکۆتایی دەسەڵاتی ئەحمەد شای قاجاریدا،( بەپیلانی E)، مەحمود خانی دزڵیو مەحمودخانی کانی سانان هەردوکیان بەفێڵ بانگ کران بۆسنەو لەوێ زیندانی کران. خانی کانی سانان زوو بەربوو، بەڵام خانی دزڵی پترلە (٣) ساڵ گیرا، دوایی بەهۆی خانمی وەسمان پاشا بەپارەیەکی زۆر بەردرا.

لەسەرداوای شێخ مەحمود، خانی دزڵی لەبەرە بەیانی (١٩١٩/٥/٢١) بەسەر کەلی گۆیژەوە دای بەسەر لەشکری ئینگلیزەوە، (دانلیس) ی فەرماندەشیان بەدیل گرت و، تەسلیمی شێخی کرد.

واتە: داینەمۆی ڕزگار کردنی شاری سلێمانی، میر مەحمود خانی دزڵی بووەو، هەر ئەو بوو، کە توانی ئەم ئەرکە پیرۆزە مێژوویی‌یە، بە ئەمانەتەوە ڕاپەڕێنێ.

بە کورتە:

خانی دزڵی یەکێك بووە، لە دۆستە ڕاستگۆو بەوەفاکانی شێخ مەحمودو، لە زۆربەی شەڕەکانیدا، پشتیوانی شێخی قارەمانی کردووە، لە شەڕی بازیان دا، ڕۆڵی سەرەکی بینیووە، دواتر بەفەرمانی ئینگلیز، شای ئێران گرتیو تەسلیم بە ئینگلیز کراو، نێررا بۆ هندستان، لەگەڵ شێخ مەحمود دا زیندانی کران.

مێژوو نوسەکان زۆر باسی ئازاییو بەوەفاییو نیشتمان پەروەری، ئەم خانی دزڵی‌یە دەکەن و، بەڵگەنامەکانی بەریتانیا دان بەم ئازایەتیەدا دەنێنن.

خانی دزڵی وەك شەخسیەتێکی بەهەڵوێست و، دەرکەوتووی ناوچەکە لە دوو بەرەدا سەرقاڵی خەبات و جەنگین بووە، لە لایەکەوە دژی ستەمی کۆلۆنیالیزمی ئینگلیزی لە عێراق داو، لە لایەکی ترەوە بەرامبەر سیاسەتی ئێران وەستا بوو.

لە ژیانیدا، ڕستێك دیاردەو خاسی‌یەتی پێوە دەرکەوتوە کە لەپێش خانی دزڵی‌یەوە بەدی نەکراوە، لەوانە:

– یەکەم فەرماندەی ڕاپەڕیوی کوردە، لەسەرتاپای مێژووی ئەم نەتەوەیەدا، کەلە پاڵ خەباتی خوێناویدا، دژی ستەمکارانی ئێران، بەگەرمیو ئەوپەڕی لە خۆ بوردنەوە، بە هانانی شێخ مەحمودەوە هاتووە، لە ساڵی (١٩١٩) شاری سلێمانی ڕزگار کردووە، تا دەوروبەری جەنگی ئاوباریك، ساڵی(١٩٣١) لەهەموو شەڕەکانیدا بەشداری کردووە، باوەڕی نەگۆڕی بەیەك پارچەیی کوردستان بووە.

– لە پێشڕەوی ئەو سەرکردانە بووە، کە زیرەکانە، پەی بەجەنگی پارتیزانی بردووە.

– لەگەڵ ئەوەی، کە بەشداری شەڕی بازیانی کردووە، سەرجەم ئەرك و پێویستیو مەسرەفی جەنگی لەسەر خۆی بووە، بە ئەرکێکی پیرۆزی نەتەوایەتی، مامەڵەی کردووە. سەبارەت بە ساڵی (١٩٢٤) ئەحمەد خواجە دەڵێ:

(١٠٠) لیرەی زێڕم برد بۆ مەحمودخان، لەسەر فەرمانی مەلیك مەحمود، کەچی سەرەڕای ئەوەی کە مەحمود خان وەری نەگرت وتی: لە باتی ئەوەی ئێمە بەبار، قەرانی ئێرانی بهێنین بۆ شێخ مەحمود، ئەو لیرەمان دەداتێ، یەك لیرەی هەڵگرت و ماچی کردو( (٩٩) لیرەکەی دایەوە دەستم و، وتی: ئایا دەبێت بە گیرفانی بۆش هاتبم؟. کەچی حەمە ڕەشید بەگی وەیسە، لەبەر کەمی وەری نەگرتووە.

– کە لە بەرواری ساڵی (١٤/١٠/١٩٢٦)و تووێژی ئاشتی لە نێوان شێخ مەحمودو، بەریتانیا کرا لە گوندی (ئێڵانپێ)ی لای خورماڵ، مەحمود خان بەشدار بوو، وە ئەبێت دیاری کردنی ئەم شوێنەش پەیوەندی بە مەحمود خانەوە بووبێت.

**دۆکیۆ مێنتەکان گەواهی لەسەرخەباتی خان دەدەن:**

– لەدۆکیۆمێنتی ژ ( C.o 730-95 ڕۆژی ١٢/١٠/ ١٩٢٦)، سەبارەت بە بۆردومان کردنی دێهاتەکانی ناوچەی هەورامان هاتووە:

(هۆی بۆردومان کردنی دێهاتەکانی هەورامان وەکو- کانی گوڵ- وئەحمەدئاوا- و-یالانپی- بۆئەوەبوو کەسزا بدرێن، بەرامبەر بەهاوکاری کردنیان، لەگەڵ شێخ مەحمود، هەرچەندە دێهاتەکانی هەورامان هەمویان بەشداریان کردبوو، بەڵام تەنها ئەو چەند گوندەمان دەستنیشان کردو، ئەوانی تر هەڕەشەیان لێکراو، دەغڵ ودانیان سوتێنرا، بەڵام زیانی گیانی نەبوو[٧٥].

- ڕاپــۆرتی ســاڵی (١٩٣١)ی ئینگلیزەکــان، بــاس لــەوەدەکات کەچــۆن ئینگلیزەکــان، دوای هاتنــەوەی شــێخ مــەحمود، لەســەر داوای ڕەزاشــا، هێــزی تایبەتیان کردووە سەر، مەحمود خانی دزلیو دەست بەرداری نەبوون، تاڕۆژی (٣١/ مایسی/ ١٩٢١) بەدیلی گرتوویانەو، ڕەوانەی بەغدایان کردووە[٧٦]، ئیتر کۆتایی بەزنجیرەی شۆڕشی شێخ مەحمودی مەلیك هات.

- مـەحمود خـان لەسـەرەتاوە پەیوەنـدی هـەبوو، لەگـەڵ کەمالی‌یـەکان، کەبۆی دەرکەوت ڕاستگۆ نین لەگەڵی‌دا، باوەڕی پێیان نەما..

- لەڕاپۆرتێکی تردا هاتووە، کەئینگلیزەکان دەڵێن:

مـەحمودخان لەیاخی‌بووەکانـەو، ئـەم پیـاوە لـەدژی ئێمەیـەو پاڵپشـتی شێخ مەحمودە[٧٧].

بەڕاستی خانی دزلی دۆستێکی ڕاستەقینەی مەلیك مەحمود بووە، مەلیك مەحمودیش لەنامەکانیدا، دەردەکەوێ کەهەستی بەمە کردووە.

ئـەو سـوپایەی شـێخ مـەحمود، ڕەوانـەی دەربەنـدی بازیـانی کردبـوو، ژمارەیەکی زۆری لەجەنگاوەرەکانی مەحمودخانی دزلی پێکهاتبوو[٧٨].

خـانی دزلـی، لـە پێشـڕەوی، ئـەو کەسـانەدا بـوو، کەبـەگیان و دڵ هاوکاری‌یـان کـردووەو، بـۆ ئـەم ڕاسـتیەش بەیاننامـەکانی ئـەو سـەردەمەکە زۆربەیان لە کۆڕی جەنگدا دەرچوون، باشترین بەڵگەو شایەتی ڕۆژگارن:

- بەیانامـەی ژ (٣) کـە مێـژووی بەسـەرەوە نی‌یـەو شـێخ مـەحمود بڵاوی کردوەتەوەو تیایدا دەڵێت:

(هێزی پیادەی هەورامی، بە فەرماندەی عەبدوالله بەگی دزلی،[٧٩] لە بانی مەقان، بەرەنگاری هێزی دوژمن بوون و، دوژمن پەرێشان کراو ئێمەش یەکێکمان برینداره.

- بەبیانامەی ژ (٤)، دووەم شەوە، هەورامی دزلی‌و دوژمن لە قەرەهـەنجیر لە جەنگدان، ئەمڕۆ سوارەی مەنمی‌و هەمەوەندیش ئاوێتەیان بوون و، لە دوژمن کوشـتار زۆرەو تـالان زۆر گـیراوە، پێـنج لەهـەورامی‌و، دوو لەمـەنمی‌و بیسـت و دوو، بریندار هاتووەتەوە.[٨٠]

- خانی دزلی لەسەر داوای، دەستەیەك لەنیشتمان پەروەرو، ڕوناکبیرانی کورد، بووە بەئەندامی پارتی هیوا.

- لەسەرەتای چلەکانەوە کە مستەفا بارزانی، بۆ شاری سلێمانی، دوور دەخرێتەوە، لە هەمان کاتدا، خان لە سلێمانی دەست بەسەر دەبیو، هـەردوکیان

ماوەیەك لە سلێمانی دەمێننەوە، لە(١٩٤٣/٧/١٢) بارزانی بەیارمەتی، شێخ لەتیف، خۆی دەرباز دەکات و دەگاتە بارزان.

- لە دوای سێ ڕۆژدا، واتەلە(١٩٤٣/٧/١٥)شدا، بە هاوکاری شێخ بابا عەلی شێخ مەحمود ڕێگای دەرچوونیش بۆ خانی دزڵی، ئاسان دەبێت، ئەویش دەگاتەوە، ئاوایی دزڵی‌و، سەر لە نوێ پشکۆی ڕاپەڕین و تێکۆشان دەگەشێنێتەوە،

- لەسەرەتای ساڵی(١٩٤٦)دا، خانی دزڵی ڕوو دەکاتە گوندی(هانەی قوڵ) لە ئەشکەوتی(وشکەناو)-کەبە ئەشکەوتی(مەحمود خان )یش ناسراوە، دەمێنێتەوە، پاش ماوەیەك حکومەتی (حەمە ڕەزا شا)ی ئێران، داوای دانیشتن و وتووێژی لێدەکات و بەو مەبەستەی کە بگەنە ئەنجامێك و، گیرو گرفتی ناوچەکە، بە شێوەیەکی ئاشتیانەو، بێ شەڕو شۆڕ ببڕێننەوە، (خانی دزڵی)یش بە پیر ئەم داوایەوە دەچێت، بەڵام بە فێڵ و تەڵەکە بازی، کە هەمیشە بەرنامەی کارو هەڵسوڕانی دوژمنانی کورد بووە، لە بەهاری ساڵی(١٩٤٦) دا، بەدەستی ئەفسەرێکی ئێرانی لە کەلی (مڵە خورد) کە دەکەوێتە سنوری ئێران و عێراقەوە، دەرمان خوارد دەکرێ‌و، دوای نۆ ڕۆژ بەو ڕووداوە پڕ لە ناسۆرەوە کۆچی دوایی دەکات.[٨١]

- بەم شێوە مەرگە ساتە، لاپەڕەی ژیانی پڕ لەدڵسۆزی و مەردایەتی پێچرایەوەو، لە کاتی کۆچکردنیدا، ئێران، داوای تەرمەکەیان کردەوە، بەڵام شێخ مەحمود نەیهێشت بدرێتەوە بە ئێران و، بە جۆرێکی شایستەو، قەدر زانین لە گوندی (هانەی قوڵ) بە خاکی ئازیزی کوردستان دەسپێرێ‌و، سەری هەمیشەیی دەنێتەوە، دوای ئەوەی کە نیو سەدە کاراترین دەوری شۆڕشگێڕی لەسەر شانۆی سیاسەت و کوردایەتی بینی.[٨٢]

## ناوی زۆرینەی ( فەرمانڕەوا ) یا بڵێین ( سانەکانی ) هەورامان [٨٢]

| ز | فەرمانڕەواکان | بەرواری ژیان یا فەرمانڕەوایی |
|---|---|---|
| ١ | بەهمەن بەگی یەکەم کوڕی ئەسفەندیار کوڕی کوشتاسپ کوڕی لوهراسپ. | (٦٠٢-٥٣٣ پ.ز)ف |
| ٢ | بەهمەن بەگی دووەم | (٤٦٤-٢٤٢)پ.ز-ژ |
| ٣ | بەهمەن بەگی سێیەم | (٩٩٧-١٠٥٢)ز-ف |
| ٤ | باریە بەگی کوڕی بەهمەن بەگی سێهەم | (١٠٥٢-١١٠٩)ز.ف |
| ٥ | میر جەلالەدینی کوڕی باریە بەگ | (١١٠٩-١٢٠٨)ژ |
| ٦ | میر سەعید جیاشا کوڕی میر جەلالەدین | (١٢٩٨-١٣٩٦)ژ |
| ٧ | سلێمان بەگی یەکەم کوڕی میر جیاشا | (١٣٩٦-١٤٩٢)ژ |
| ٨ | بارام میرزا بەگی کوڕی سلێمان بەگی یەکەم | (١٤٩٢-١٥٧٧)ژ |
| ٩ | عەباسقولی سان کوڕی بارام میرزا بەگی کوڕی سلێمان بەگی یەکەم | (١٦٣٧-١٦٤١)ف |
| ١٠ | بارام سانی یەکەم کوڕی عەباسقولی سان | (١٦٦٥-١٦٨٩)ف |
| ١١ | قاسم سانی کوڕی بارام سانی یەکەم (چەند مانگێ) | (١٦٨٩-١٦٨٩)ف |
| ١٢ | گەنجعەلی سانی کوڕی بارام سانی یەکەم | (١٦٨٩-١٧٠٢)ف |
| ١٣ | عەباس سانی کوڕی گەنجعەلی سان | (١٧٠٢-١٧٠٥)ف |
| ١٤ | عیساسان کوڕی بارام سانی یەکەم | (١٧٠٥-١٧١٦)ف |
| ١٥ | ئیسماعیل سان کوڕی قاسم سان | (١٧١٦-١٧٢٦) ف |
| ١٦ | جەمشید سانی کوڕی بارام سانی یەکەم | (١٧٣٧-١٧٤٣) ف |
| ١٧ | مەنوچەر سانی کوڕی جەمشید سان (چەند مانگێ) | (١٧٤٣-١٧٤٣) ف |
| ١٨ | حسێن سانی کوڕی دەروێش بەگ کوڕی حسێن بەگی یەکەم | (١٧٤٥-١٧٤٨) ف |
| ١٩ | بارام سانی دووەم کوڕی گەنجعەلی سان | (١٧٤٨-١٧٥٢) ف |
| ٢٠ | نەزەر عەلی سان کوڕی گەنجعەلی سان | (١٧٥٢-١٧٥٤) ف |
| ٢١ | خالید سانی کوڕی بارام سانی دووەم | (١٧٥٣-١٧٥٦) ف |
| ٢٢ | ڕەزا سان کوڕی حسێن بەگی یەکەم کوڕی بارام سانی یەکەم | (١٧٥٨-١٧٨٣) ف |
| ٢٣ | عەلیمەردان سان کوڕی حسێن سان کوڕی دەروێش بەگ - لهۆن | (١٧٨٣-١٧٨٥) ف |
| ٢٤ | محەمەد تایر سان کوڕی حسێن سان کوڕی دەروێش بەگ - تەخت و ڕەزاو | (١٧٨٥-١٧٩٣) ف |
| ٢٥ | فەتحعەلی سان کوڕی محەمەد تایەر سان - تەخت و ڕەزاو | (١٧٩٣-١٧٩٨) ف |
| ٢٦ | محەمەد یوسف سان کوڕی پیری بەگ کوڕی حسێن بەگی یەکەم - هەموو هەورامان | (١٧٩٥-١٨٠٨) ف |
| ٢٧ | ئەسکەندەر سان کوڕی محەمەد یوسف سان - تەخت و ڕەزاو | (١٨٠٠-١٨١٧) ف |

| ٢٨ | خاتو هوریزاد سان خێزانی ئەسکەندەر سان | (١٨١٧-١٨١٧) ف |
|---|---|---|
| ٢٩ | محەمەد سانی یەکەم کوڕی محەمەد یوسف سان - تەخت | (١٨١٧-١٨٢٤) ف |
| ٣٠ | عوسمان سانی کوڕی عەلیمەردان سانی کوڕی حسێن سان - لهۆن | (١٨١٩-١٨٢٣) ف |
| ٣١ | مەنوچەر سانی دووەم کوڕی عەلی مەردان سان - لهۆن | (١٨١٧-١٨١٨) ف |
| ٣٢ | قادر سانی کوڕی محەمەد عەلی بەگ کوڕی حسێن سان - حەوت مانگ | (١٨٢٤-١٨٢٤) ف |
| ٣٣ | حەیدەر سانی کوڕی عەلیمەردان سان - لهۆن | (١٨٢٤-١٨٢٦) ف |
| ٣٤ | خاتو منیره سان (مەنیجەسان) کچی محەمەد عەلی بەگ - لهۆن | (١٨٢٦-١٨٢٧) ف |
| ٣٥ | قادر سانی دووەم کوڕی عومەر بەگی کوڕی عەلیمەردان- (لهۆن ) | (١٨٢٧-١٨٣٥) ف |
| ٣٦ | قادر سانی غەفار بەگ - لهۆن | (١٨٣٥-١٨٣٥) ف |
| ٣٧ | ئەحمەد سانی یەکەم کوڕی مەحمود بەگی محەمەد یوسف سان | (١٨٣٥-١٨٤٧) ف |
| ٣٨ | ئەحمەد سانی دووەم کوڕی عوسمان سانی کوڕی عەلیمەردان سان - لهۆن | (١٨٣٥-١٨٤٧) ف |
| ٣٩ | حەسەن سان کوڕی محەمەد سانی یەکەم - سانی تەخت و ڕەزاو | (١٨٤٦-١٨٦٩) ف |
| ٤٠ | محەمەد سەعیدسانی یەکەم کوڕی عوسمان سانی کوڕی عەلیمەردان - لهۆن | (١٨٤٨-١٨٧٢) ف |
| ٤١ | مستەفا سانی یەکەم کوڕی محەمەد سانی یەکەم - تەخت و ڕەزاو | (١٨٦٧-١٨٨٧) ف |
| ٤٢ | مستەفا سانی دووەم کوڕی ئەحمەد سانی دووەم -لهۆن | (١٨٦٧-١٨٧٠) ف |
| ٤٣ | محەمەد صاڵح سان کوڕی جیهانگیری بارام بەگی سێهەم | ( - ) |
| ٤٤ | عەزیز خانی بارام بەگی محەمەد سانی یەکەم - دزڵی | ( -١٩٠١) ف |
| ٤٥ | مەحمود خانی دزڵی کوڕی عەزیز بەگی بارام بەگی سێهەم - دزڵی | (١٩٠١-١٩٤٦) ف |
| ٤٦ | ڕۆستەم سانی حەسەن سانی محەمەد سانی یەکەم - تەخت و ڕەزاو | (١٨٨٣-١٨٩٢) ف |
| ٤٧ | نادر سانی حەسەن سانی محەمەد سانی یەکەم - تەخت و ڕەزاو | ( - ) |
| ٤٨ | عەباسقولی سانی کوڕی مستەفا سانی یەکەم - تەخت و ڕەزاو | (١٨٨٧-١٩١٦) ف |
| ٤٩ | ڕەزا قولی سانی کوڕی مستەفا سانی - تەخت و ڕەزاو | ( - ) |
| ٥٠ | حسێن خانی ڕەزا قولی سان | ١٩١٦- ) ف |
| ٥١ | فەره جوالله سانی مستەفا سانی یەکەم - تەخت و ڕەزاو | ( - ) |

| ٥٢ | ڕۆستەم سانی محەمەد سەعید سان - لهۆن | (١٨٧٥-١٨٩١) ف |
|---|---|---|
| ٥٣ | محەمەد صالح سانی ڕۆستەم سان - لهۆن | (١٨٩١-١٨٩٤) ف |
| ٥٤ | جافرسانی محەمەد سەعیدسانی یەکەم - لهۆن | (١٨٩٤-١٩٤١) ف |
| ٥٥ | کەریم سانی کوڕی جافرسان - لهۆن | (١٩٤١-١٩٤٥) ف |
| ٥٦ | محەمەد ئەمین سانی جافرسان - لهۆن | (١٩٤٥-١٩٦١) ف |
| ٥٧ | عزەت سانی کەریم سان - لهۆن | (١٩٦١-١٩٩٥) ف |

**لە کۆتایی ئەم بەشەدا دەڵێین:**

- بەڕاستی مێژووی سیاسی میرنشینیە کوردی‌یەکان بەتایبەت لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بەولاوە، زۆرجەنجاڵ و پڕ لەکێشەو پێشبڕکێ لەسەر دەسەڵات ودژایەتی کردنی ناوخۆو وبێنەو بەردە دابووە، هەرسەرۆکێك هەوڵی‌داوە سەربە بەرەیەك بێت... کەچی کەم توانراوە سەرکەوتن بەدەست بهێنن.

- شاکانی ئێران، زۆر زاڵم ودکتاتۆرو خوێن ڕێژ بوون، بەرامبەر بەسان وبەگزادەو خەڵکی هەورامان، نەیان هێشتووە بەئاسودەیی وبێ‌شەڕو شۆڕ کورد ئیسراحەت بکات.

- ئینگلیزیش دەستی خستووەتە ناو بەگزادەو سانەکانی هەورامان، داونی بەگژ یەکتری دا، ئەویش لەشەڕە ناوخۆیی‌یەکاندا دەستی زۆر بووە بۆ هەڵگیرساندنیان.

- شەڕە ناو خۆیی‌یەکانیان جگە لەوەی دەستی بێگانەی تیا بووە، کوردەکە خۆیشی خۆش باوەڕ بووەو فریوی خواردووە. هەر( ٢٠) تفەنگی بووە، چوە بەگژ دەوڵەتێکی زلهێزداو، کەچی شکستی خواردووەو ئەمەش چەند جارە دووبارە بووەتەوە...

## پەراوێزەکان

(١) مێژووی هەورامان ل (٤١١، ٦٠٦، ٦٠٨، ٦١٩، ٦٣٤، ١٠٧٤) .

(٢) العشائر العراق، محامی عباس العزاوی ص(١٦) هەروەها هەڵاڵە برایمەی هەورامان ل(١١)

(٣) لە عەممانەوە بۆ ئامێدی (گەشتێك بە كوردستانی باشوردا) ل ٦٥

(٤) مێژووی هەورامان ..ل ٩٤٧ ..دەكرێت بۆ زیاتر شارەزا بوون سەیری بكەن.

(٥) تاریخ کردو کردستان – د. صدیق بۆرەکەیی–ل ٤٢٣–٤٣٥ فارسیە.

(٦) مەحمود خانی درزلی–شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتی کوردستان –ل ٢٢– نوسینی (عومەر مەعروف بەرزنجی–چاپی دووەم بژار کراو).

(٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٤.

(٨) مێژووی کوردو کوردستان –ن. محەمەد مەردۆخی–و. عەبدولکەریم محەمەد سەعید.

(٩) مێژووی هەورامان –محەمەد ئەمین هەورامانی –ل (٦٠٩–٦١٣) سەیری پەراوێزی ئەم پەڕاوەش بکە ژ–(٤).

(١٠) مێژووی هەورامان –ل ٦١٧.

(١١) لێرەدا هەر ئەوەندە بوارمان هەیە بە کورتە لەسەر ئەم فەرمانڕەوایانە بنوسین.

(١٢) پیر شالیاری زەردەشتی—محەمەد بەهائەدین صاحب –ل (١٢).

(١٣) پەیامی هەورامان – ل (١١٢–١٢٢) کەچی لە (ئاینی کوردی)ی (م.حەسەن مەحمود حەمە کەریم ل ١٢) هاتووە: باوکی ئەسفەندیار، پاشای وڵاتی باختەرە، زەردەشت لەساڵی (٦٦٨پ.ز) دا بردویەتی یە سەرئاینەکەی‌و، بوەتە فەرمانڕەوای بەڵخ و (٢٨) کوڕی بووە، یەکێك لەوکوڕانە ئەسفەندیارە.

(١٤) مێژووی هەورامان ل (٦٦٦– ٦٧٥).

(١٥) هەمان سەرچاوە ل(٦٧٨).

(١٦) هەمان سەرچاوە ل(٥٦٨، ٦٨٠)، کردو ترك وعرب ص ١٤٢، الاتحاد ١٩٩٩/٩/١٠/٣٣٥.

(١٧) هەمان سەرچاوە ل (٦٧١) یان سەرچاوە ئەصڵیەکەی ( تاریخ جدید أورامان- ملا عبدالله قازی ل(٣٦-٣٧).

(١٨) بۆئەم بەشە سودم زۆرتر لەمێژووی هەورامان وەرگرتووە.

(١٩) بۆ بوونی عەباسقولی بەگ بەسانی هەورامان ڕەئیەکی تر هەیەو دەڵێ:

عەباسقولی کوڕی فەتحعەلی سوڵتانەو، خێزانی فەتح علی دەچێت بۆسەردانی ماڵی باوکی کەوالی لوڕستان دەبێت- لەوکاتەدا سکی پڕ دەبێت ولەوێ عەباسقولی لەدایك دەبێت ولەباوەشی خاڵوانیدا گەورە دەبێت، پاشان خان ئەحمەدخان شێت دەبێت ودوایی دەمرێت... دواتر عەباسقولی گەورەدەبێت و خۆی ئامادە دەکات بۆ هێرش و سەندنەوەی ولاتی باوو باپیری، لەدەستی ئەردەلانی یەکان.

زۆری پێ ناچێ بەیارمەتی والی وخاڵوانی لەشکرێك لە لوڕستانەوە بەڕێ دەکرێت بەرەو هەورامان، دوای شەڕێکی قورس، عەباسقولی بەگ سەردەکەوێ و دەبێتە، فەرمانڕەوای هەورامان و وەجاخی باوانی ڕۆشن دەکاتەوە. بێگومان ئەمە لەدوای ئەوە دەبێت ، کەلەشەڕێکدا سەر دەکەوێ بەسەر(کەڵ مەجنون) پاڵەوانی سوپای عوسمانیدا، بۆیە لەلایەن شاە عەباسەوە فەرمانی سانیەتی بۆ دەرچووە، کەببێت بەسانی هەورامان - (کرد وترك وعرب) سی. جی. أدموندز- ترجمە جرجیس فتح الله ص١٤١.

لێرەدا ئەوەی جێگەی تێبنییە ئەوەیە: لە( تاریخ جدید اورمان)ی مەلا عەبدوالله ی قازیدا-ل٣٥ ئاماژەی بەهەڵەی ئەدمونس دەکات کەباوکی (عەباسقولی)، فەتح عەلی سوڵتان نیەو بەڵکو بارام میرزا بەگە، ئێمەش ئەمە بەڕاست دەزانین، چونکە مەلا عەبدوالله خۆی شارەزایەو خەڵکی هەورامانە.

(٢٠) مێژووی هەورامان - ل (١٢٢-١٢٤، ٧٤١-٧٤٦).

(٢١) مێژووی هەورامان ل (١١٩...، ٧٣٨...) هەروەها پەیامی هەورامان ل ( ١٤٢، ١٥٢).

(٢٢) پەیامی هەورامان ل (١٤٥-١٥٠) مێژووی هەورامان ل(٧٤٦- ٧٥٦

(٢٣) پەیامی هەورامان ل (١٤٥-١٥٢) مێژووی هەورامان ل( ٧٥٧-٧٨٠)

(٢٤) مێژووی هەورامان ل( ١٢٤- ١٣٠، ٧٥٧)، پەیامی هەورامان ل (١٤٧-١٥٢)

(٢٥) لەمێژووی هەورامان ل(١٢٩)، وە لە پەیامی هەورامان ل (١٥٢)دا

دەڵێن: دوای ئەو ڕووداوە ماوە و شووی کردووە بەشێخێك.

(٢٦) پەیامی هەورامان –ل (١٥١) هەندێك لەسەرۆك تیرەکان ناچاربوون هەڵسان بەم کارە، بەڵام یەکێکیان ئەم کارەی نەکردووە خەنجەری لێنەدا بۆیە لەسزای ئەوە گوێ یان بڕی. الاتحاد ژ ٢٢٥

(٢٧) پاش لەناو بردنی (سان و کوڕەکەی وپیاوێکی کەناوی ئەبوبەکر بوو) ڕۆستەم بەگی ئێلبەگی کە لە جافەکانی جوانڕۆیە، سانی کوژراو، مامەی دایکی بووە، پەلاماری جوانڕۆ ئەدات و، براو، کوڕی (شەرەفو لمولك)ی دەست دەکەوێت لەهەقی ئەواندا دەیانکوژێت... پەیامی هەورامان ل ١٥٢.

(٢٨) بەپێی قسەی وەستامحەمەدی حاجی حەمەساڵحی تەوێڵەیی. کە ١٩ کوڕی بووە. بۆ کچەکانیشی لەعەمانەوە بۆئامێدی –ل ٦٧.. لەوانەش: ئامینە خان، مریەم خان، ڕەعنا خان...

(٢٩) مێژووی هەورامان ل ١٤٢

(٣٠) مێژووی هەورامان ل ١٤٢

(٣١) تاریخ جدید اورامان– ملا عەبدواللە قازی– دەستونس ل٦٦

(٣٢) مێژووی هەورامان ل ١٥٢ بەدرێژی ئەم باسی نامەیە دەکات.

(٣٣) پەیامی هەورامان ل١٥٥.

(٣٤) پەیامی هەورامان ل ١٦٢، مێژووی هەورامان ل ٩١٢.

(٣٥) تاریخ جدید اورامان– ملاعەبدواللە قازی ل( ٧٦).

(٣٦) تاریخ جدید اورامان– ل٦٥

(٣٧) پەیامی هەورامان – ل ١٥٣.

(٣٨) تاریخ جدید اورامان– ل ٦٥.

(٣٩) مێژووی هەورامان ل ١٥٥.

(٤٠) پەیامی هەورامان ل١٥٤.

(٤١) مێژووی هەورامان –ل (٩٢٠– ٩٢٢)، کتێبی (مەحمود خانی دزڵی ل (١٨٢– ١٨٣)

(٤٢) ڕۆژنامەی الاتحاد ژ ٣٣٥، ١٠/٩/ ١٩٩٩.

(٤٣) پەیامی هەورامان ل ١٥٦.

(٤٤) کرد وترك وعرب–انمۆندز ص–(١٤٠) هەروەها پەیامی هەورامان ل( ١٥٦).

(٤٥) تاريخ جديد اورامان– ملا عەبدوالله– ل (٧١).

(٤٦) پەیامی هەورامان – ل (١٥٨) تاريخ جديد اورامان –ل (٧٣).

(٤٧) مەحمود خانی دزڵی– ل ٤٧.. كە ئەویش لەكتێبی (حسن ارفع، كرد هاويك بررسی تاريخی وسياسی ل١٦، ئەم كتێبە لە بنەڕەتدا بەزمانی ئینگلیزی دانراوەو، دواتر وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی.

(٤٨) مێژووی هەورامان ل ٧٨٩.

(٤٩) مەحمود خانی دزڵی– ل ٤٧. لێرەدا دوو تێبینی گرنگ هەیە پێویست بەنوسین دەكات لێرەدا بینوسین:

یەكێكیان ئەوەیە، داستانی ئەم شەڕە، لەسەر بەردێكی مەڕمەڕ، لە هەیوانی مزگەوتی جامعەی شاری سنە، هەڵكەندراوەو، باس لەهێرشەكانی سوپای ڕەزا شا دەكات بۆسەر ئاوایەكانی مەحمودخانی دزڵی...هەر لەو كتێبەدا، دەقی فارسیەكە لە (ل ٢٣٩)دا بڵاو كراوەتەوەو كوردیەكەشی لە(ل ٤٨) دایە. لەمێژووی هەورامانیشدا لە( ل ٧٨٩)دا هەیە.

– ئەویتریان ئەوەیە كە مەحمود خان دەكەوێتە دەست حكومەتی عێراق هێنرایە سلێمانی، دەست بەجێ، ڕەزا شا، داوای لە دەسەڵاتدارانی عێراق كرد كەتەسلیم بەئێران بكرێتەوە، بەڵام عێراق بەو بیانووەی كەخانی دزڵی لەعێراقیشدا، تاوان بارە، تەسلیم بەئێران ناكرێتەوە، تاحوكمی تەواوی خۆی وەرنەگرێ لەعێراق . لەئەنجامدا، چەندساڵێكی بە بەندی ودەست بەسەری تێپەڕاندوو، ڕەهەندەی شاران كرا، لەم كاتەدا، شێخ عەلائەدینی بیارە، هەوڵێكی زۆری بۆداو( سەید مەزهەری) نوێنەری تایبەتی خۆی نارده لای مەلیك فەیصەڵی یەكەم، بەو مەبەستەی كەگیانی پارێزراوبێت وتەسلیم بەئێران نەكرێتەوە.

هەروەها لەوكاتەی كەخانی دزڵی لەسلێمانی دەبێت لەڕۆژی( ١٩٣١/٩/٢٠) شێخ حسێنی كەسنەزان نامەیەكی پڕ لەسۆزو وەفا دەنێرێ بۆ موتەصەڕیفی ئەوكاتەی سلێمانی، بۆی ڕوون دەكاتەوە، كەخانی دزڵی، یەكێكە لەسەرداره ناودارەكانی ناوچەی هەورامان و، شایانی، قەدر زانینەو، داوایشی لێ‌دەكات كەبە كەفالەت لە بەندیخانە، بهێنرێتە دەرەوە.

(٥٠) مێژووی هەورامان –ل ٩١٩.

(٥١) پەیامی هەورامان – ل (١٦٣– ١٦٤).
(٥٢) گۆڤاری ڕەنگین ژ (٥٧) ل(٦) ساڵی( ١٩٩٣) چمکێك لەژیانی جافرسانی هەورامان.
(٥٣) کوردو کوردستان لەبەڵگەنامەکانی بەریتانیا– نوسینی د. وەلید حەمدی– وەرگێڕانی لەعەرەبی یەوە–محەمەد نوری تۆفیق.
هەروەها... لەمێژووی هەورامان دا– ل ٢٩٨– داهاتووە کە لەو کاتەدا جافرسان هاتە عێراق، بەریتانیا لەماوەی( ٢٤) سەعات دا، بڕیارێکی دەرکرد کە( مجرمی سیاسی) دەبێت پەناهندە بدرێت، بۆیە: سان و کۆمەڵەکەی بە پەناهندە، قبوڵ کران.
(٥٤) وادیارە، لەسەر داوای سان و، شێخانی تاڵەبان، لە کەرکوك جێگیر کراون، چونکە نێوان سان وخان وشێخان وزانایانی هەورامان لەگەڵ بنەماڵەی شێخانی تاڵەبانیدا باش بووەو ڕێزی یەکتریان گرتووە... د. موکەڕەم تاڵەبانی لەم بارەوە دەڵێ:
(هەر لە کۆنەوە شێخانی تاڵەبان پێوەندی ئایینیو خزمایەتیان لەگەڵ ناوچەی هەورامان دابووە، لەبەر ئەوە، هاتوو چۆی هەورامییەکان بۆ تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکوك شتێکی ئاسایی بووە..) ڕەنگین ژ ٥٧/ ١٩٩٣ لەو ماوەیەدا کە جافرسان و کۆمەڵەکەی، لە ڕومادی وبەصرەو بەغدا دەبن، بەنهێنی سەردانی تەکیەی تاڵەبانیان کردووە.
د. موکرەم لەهەمان گۆڤاردا، دەڵێ:
ئەوساڵە– واتە ساڵی ١٩٣٣– نەهات و وشکە ساڵ بوو، نەهاتی دەشتی گەرمیانی وەکوو، نەگبەتی وایە، ئاغاو جوتیار، کەوتنە سەرساجی عەلی، باوکم بۆ ئەوەی لە یارمە تیان، دریغی نەکات وهەست بەدەست کورتی نەکەن فەرشی ناومالی بۆ فرۆشتن... پاشان دەڵێ:
.. ئەوەندەی پێ نەچوو میوانەکانی باوکم– کە لە ڕومادیو شارەکان جێگیر کرابوون– لەپاش بڕیاریی حکومەتی عێراق بۆمافی پەنا بەرییان، ئەوانیش هاتنە کەرکوك وخۆیان ژن ومنداڵیان لەگەڕەکی بەرتەکیەو ئیمام قاسم، جێنشین بوون.
(٥٥) لەمێژووی هەورامان دا ل ٧٩١ دەڵێ:

..کە شەهریوەری ساڵی( ١٣٢٠) ی ئێرانی، هاتە پێشەوە، سەدان زیندانی، لە زیندانە جۆربەجۆرەکانی ئێران دا، ئەوانەیان، کەلە ژیان دا بوون، بەردران وهەریەکە، بۆناوچەی خۆیو خێزانی خۆی چوویەوە.

– لە هۆزی مستەفا سانی، حەسەن خان، عەلی بەگ ومحەمەد شەریف بەگ وکوڕانی حاجی فەرەجوالله بەگ، وەك محەمەد عەلی بەگ و مەحمود بەگ.

– تایفەی بارام بەگیان: محەمەد عەلی بەگ، عەبدوالله بەگی قەڵاجیێ، محەمەد ساڵح بەگی قەڵاگا، ئۆڵڵابەگی دزڵی، محەمەد ڕەشید بەگی باراماوا.

– هۆزی هەسەن سانی: محەمەد بەگ، حەسەن بەگ، جافربەگ، محەمەد ئەمین بەگ، عەبدوالله بەگی محەمەد شەفیع بەگ، تایەر بەگ محەمەد شەریف بەگی وەیسە، جافر بەگی دەگاشێخان، ئەسەد بەگ وئاغا برابەگ وجافر بەگی دەرەوکیێ.

[٥٦] لە هۆزی جافرسانیش: کەریم بەگ و... ڕۆژنامەی (الاتحاد) ژ (٣٥) بەرواری ١٠/ ١٩٩٩/٩.

[٥٧] وەك دەردەکەویێ، خەڵکی هەورامان بەگشتی و خەڵکی پاوە بەتایبەتی، لە کەریم بەگ ڕازی بوون.. پیاوێکی دیندارو خۆشەویستی خەڵك بووە دڵسۆزو بەخشندەو زیرەك وئازاو بەخزمەت ومیوان دۆست بووە. (٩٠٪) خەڵکی پاوە لە دوای نوێژەکانیان (فاتحە)ی بۆ ڕەوانە دەکەن، زۆر دژ بەئینگلیز بووە و متمانەی پیێ نەبووە. ئینگلیز زۆر هەوڵی لەگەڵ دا، داوە، نەچووە لەگەڵیدا.

دڵی خەڵکی هەورامان زۆر ڕاگرتووە، نێوانی لەگەڵ زانایان وشێخاندا باش بووە بۆ ئیشەکانی پرس و ڕاوێژی زۆردەکرد.

بۆ زیاتر لە ژیانی کەریم سان سەیری مێژووی هەورامان ل( ١٨٥– ٢١٠) بکە.

[٥٨] کرد وترك وعرب– ادموندز– ص ٣٣٩.

[٥٩] العشائر الكردية– ترجمة فؤاد حەمەخورشيد-مطبعة الحوادث بغداد،١٩٧٩ص ١٥ ئەمەش لەڕاپۆرتێکدا هاتووە، هەندیێ سەرنجە، سەبارەت بەخێڵەکانی باشووری کوردستان، لە نێوان زابی گەورەو دیالەدا، کەلەساڵی ١٩١٩ بەزمانی ئینگلیزی چاپکراوە، لەلایەن د. فوئاد حەمە خورشیدەوە، کراوە بەعەرەبی.

سەیری کتێبی مەحمود خانی دزڵی بکە ل( ١٨٢).

(٦٠) ڕۆژنامەی الاتحاد ژ ٣٣٥، ١٩٩٩/٩/١٠. هەروەها لاپەڕەیەك لەمێژووی هەڵەبجە- بەکر حەمەصدیق- ل ٦٨.

(٦١) مەحمود خانی دزڵی، ل( ١٨٠) لەلاپەڕە (١٨١) شدا، دوو بروسکەی بەم شێوە بلاّو کراونەتەوە:

بروسکەی: ١٩٣٠/٨/٢٦

بەغداد فخامە مندوب السامی

( رئیس الوزراء).

گۆڕینی موتەصەریف تۆفیق وەهبی بەگ ئەبێ بەسەبەبی تەئەثوری عمومی کوردان، رجا ئەکەین ئیعادەی بفەرموونەوە.

ڕەئیسی هەورامان

جەعفەر سوڵتان

ڕۆژنامەی ژیان: ژ٢٥٩

ڕۆژی ٤ ی ئەیلول ١٩٣٠

بروسکەی: ٢٤/ ١٩٣٠/٨

فەخامەتی مەندوبی سامی

صورەتی بۆفەخامەتی( رئیس الوزراء )

تەبدیلی موتەصەڕیف مەغایری ئەفکارمان وسەبەبی تەئەثوری عمومی کوردانە، ئیسترحام دەکەین زوو ئیعادەی بفەرموونەوە:

هەورامان : ئەفراسیاب بەگی ڕۆستەم سوڵتان

هەورامان: مصطفی بەگی جەعفەر سوڵتان

هەورامان: محەمەد ئەمین بەگی مەحمود خانی دزڵی

هەورامان: شێخ محەمەدی شێخ حیسامەدین

ڕۆژنامەی ژیان:ژ ٢٩٥

ڕۆژی ٤ ی ئەیلول ١٩٣٠

(٦٢) تۆفیق وەهبی بەگ کێ بووە؟

یەکێ بووە، لە پیاوە دڵسۆزو زاناو خەباتکارەکانی شاری سلێمانی، لەمایسی (١٩٣٠)دا کرا بە موتەصەریفی سلێمانی، خەڵك زۆریان پێ خۆش بوو، لەسەردەمی

---

ئەودا، جوڵانەوەی سیاسی وفیکریو ڕۆشنبیری، کەوتوەتە گەشەکردن حکومەتی عێراق، بێ تاقەت بوو بەم چالاکی‌یە، بۆیە، دوای چوار مانگ لای بردو ئەمەش بووە هۆی ناڕەزایی خەڵك وجەماوەر.

(٦٣) مێژووی هەورامان – ل (١٤٤، ١٤٨)

(٦٤) پەیامی هەورامان –ل (١٥٢، ١٦٥)

(٦٥) مێژووی هەورامان –ل (١٣٩)

(٦٦) تاریخ کرد و کردوستان – دکتر صدیق صفی زاده (بۆرەکەیی) ل٤٣٥

(٦٧) گۆڤاری ڕەنگین ژ ٥٧ ساڵی ١٩٩٣.. ئەمە دکتۆر موکەڕەم لەو کاتەدا جافرسانی ئاوا بینیووە لە کەرکوکدا کەپەناهەندە بووە.

(٦٨) الاتحاد ژ ٣٣٥، ١٩٩٩/٩/١٠.

(٦٩) مێژووی هەورامان ل (١٥٩– ١٦٠) هەموو شیعرەکە لە دواتردا لە ژیانی میرزا عەبدولقادری تەوێڵەیی‌دا بلاّو کراوەتەوە.

(٧٠) بۆئەم بابەتە زۆرسود وەرگیراوە لەکتێبی (مەحمود خانی دزڵی)، هەروەها دەبێ بزانین کەهەندێك لەڕووداوی ژیانی ئەم خانە لەژیان نامەی جافرسان دا، باس کراوە.

(٧١) گۆڤاری ڕەنگین– ژ ٥٣ ساڵی ١٩٩٣.

(٧٢) مەحمود خانی دزڵی –عومەر مەعروف بەرزنجی– ل (٣٨)، هەروەها مێژووی هەورامان – م محەمەد ئەمین هەورامانی– ل (٧٦)

(٧٣) مێژووی هەورامان .. ل( ٧٨٨).

(٧٤) مێژووی هەورامان .. ل (٨٩٩).

(٧٥) مەحمود خانی دزڵی–ل ١١٦

(٧٦) چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد –بەشی یەکەم –د.کمال مەزهەر–ل١٢٢

(٧٧) العشائر الکردیة–ترجمة فؤاد حەمە خۆرشید–ڕاپۆرتێکی گرنگە ص(١٦)

(٧٨) دور الشعب الکردی فی ثورة العشرین–د.کمال مظهر–ص ١٤٢

(٧٩) عەبدوالله بەگی دزڵی، کوڕی گەورەی مەحمود خانی دزڵێیە، کەلەگەڵ باوکی‌دا فەرماندەی دەستەیەك لە شۆڕشگێڕەکانی گرتبووە ئەستۆ، ساڵانێکی زۆر لە زیندانەکانی (ڕەزا شا)دا بووەو ماوەی (٧)ساڵ لە زیندانی (تاریك) دا، ژیانی بەسەر بردووە، ساڵی (١٩٤١)لە شکاندنی بەندیخانەی (قەسری قاجار)دا ئازاد کراوە، ساڵی

(١٩٨٧) لە ئاوایی دزڵی کۆچی دوای کردووە و هەر لەوێ نێژراوەو نەوەکانی لە ئاوایی دزڵی نیشتەجێن-مەحمود خانی دزڵی ل(٨٤).

[٨٠] بۆ ئەم دوو بەیانامەیە، بڕوانە: چیم دی-ئەحمەد خواجە-بەرگی یەکەم ل(٤٦-٤٧)

[٨١] بەداخەوە زۆرێك لە سەرکردەکانی کورد بەم شێوەیە کوژران و لە ناوچون.دوژمن نەیتوانی‌وە لە مەیدانی جەنگدا سەرکەوێت، هەر بەفڕو فێڵ نامەردانەو بێ ویژدانانە سەرکردەی کوردیان لە ناوبردوە، بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەوە سەیری کتێبی (تیڕوانینێك بۆ دۆزی کورد) نوسینی (عەبدو ڕەزاق عەبدوڕەحمان)ل(٧٠)

[٨٢] مەحمود خانی دزڵی-ل(٣٦)

[٨٣] چەند تێبینیەك لەسەر ئەم فەرمانڕەوایانە:

أ-مێژوو نوسەکان بەهمەنی سێهەم، دەبەنەوە سەر بەهمەنی یەکەم بە(١٨) پشت، بەلام ئەمە هەڵەیە، چونکە لەبەهمەنی سێهەمەوە، بۆ بەهمەنی یەکەم (١٥٠٤)ساڵ دەکات=(٥٣٣ پ ز تا ٩٧١) ئەمەش، ئەگەر بۆ هەر پشتێك (٣٠)ساڵ دابنێین ئەو کاتە، (٥٠) پشتی دەوێت(٣٠×٥٠)= ١٥٠٠ ساڵ، ئینجا دەگەنەوە بەیەك.)

ب-ئەو بەروارەی کە نوسراوە بۆ بەهمەن بەگی دووەم-جێگەی پرسیارە؟ !چونکە تەمەنی دەکاتە(٢٢٢)ساڵ ئەمەش دەگمەنە تۆ بڵێی ئەمە لە دەگمەنەکان بێ؟!

ج-ماوەی نێوان بەهمەنەکان ڕۆشن نیە، بۆیە زیاتر لە بەهمەنی سێهەمەوە باس و خواس دەکرێت.

د-ئەم فەرمانڕەوایانەی کەلێرە نوسراون، ئەوانەن کە(سان)ی هەورامان بوون، یا هەندێکیشیان نازناوی (خان)یان پێ درابێ، چونکە خانیش لە ئاستی(سان)دا بووە.لە عەباسقولی سانیشەوە، وشەی (سان)دیارە لە پاشکۆی ناوەکانەوە، لەوەو پێش وشەی بەگ بووە، وشەی بەگ، دواتر بۆ حاکمی سانەکان بەکار هاتوە لە دێ کاندا، واتە دەسەڵاتی بەگ دوای کەم بووەتەوە.

ه-هەندێ جار بۆشایی‌یەك لە نێوان سانەکان دا دەبینین، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کەلەو کاتەدا، یان نازانین چی ڕووی داوەو ئەو ماوە هیچ تۆمار نەکراوە یاخود لەلایەن غەیری سانەکان و هەورامی‌یەکان خۆیانەوە حوکم کراوە .بۆ نموونە:

لەسالانی(١٦١٤-١٦٣٢ ز) خان ئەحمەد خانی ئەردەلانی حوکمی هەورامانی کردووە، لە سالانی ( ١٧٢٠-١٧٣٠ز) بابانەکان حوکمی زۆربەی خاکی هەورامانیان کردووە. هەروەها .....تاد.

و- لەسالی (١٧٨٣) هەورامان لەڕووی دەسەڵاتەوە بووە بە دووبەشەوە، دوو (سان) فەرمانڕەوایی یان کردووە، یەکێکیان(سان)ی هەورامانی لهۆن بووەو ئەوی تریش( سان)ی هەورامانی تەخت، هەندێ جاریش بووە بەچوار بەشەوە (لهۆن ودزلیو ڕەزاو و تەخت)، جار جارە لەسەردەمی هەندێ( سان)دا، بووەتەوە بەیەك، وەك سەردەمی محەمەد یوسف سان لەسالی (١٧٩٤ز).

ز- لەپاڵ سالی بەروارەکاندا، پیتی( ژ) مان بەکارهێناوە، لەباتی ی سەردەمی ژیان، بەلام پیتی(ف) مان بۆسەردەمی ماوەی فەرمانڕەوایی بەکارهێناوە، ئەگەر هیچیش دانەنرابێت ئەوە نەزانراوە.

ح- بەڕەئی ئێمە فەرمانڕەوا سەرەکیەکان ئەمانە بوون، ئەگەر کەسێکیشمان نەزانی بێت یالەبیر چووبێت بەدووری نازانین.

ط- سەرچاوە بۆناوو بەرواری ژیان وفەرمانڕەوایی ئەم فەرمانڕەوایانە:

(پەیامی هەورامان ومێژووی هەورامان وتاریخ جدید اورامان وپیر شالیاری زەردەشتی وکوردو کوردستانی م. صدیق بۆرەکەیی) یە بەتایبەت یەکەم سەرچاوەیان زیاتر سودم وەرگرتووە.

## هەورامان مەڵبەندێکی ئایینی بووە لەکۆن و نوێدا

- هەورامان و ئایینی زەردەشتی:
- پیرەکانی هەورامان
- پیرشالیاری دووەم
- ڕۆڵی پیران لەکاروباری ڕامیاری و ئیداریدا
- کەی وەچۆن خەڵکی هەورامان ئیسلامیان پێگەیشتووە؟
    - بۆچون و ڕەئی یەکەم:
        - شیعری هورمزگان
        - دوکتۆر سەعیدی کوردستانی
        - چەند سەرنجێك لەسەر ئەم شیعرە
    - بۆچون و ڕەئی دووەم
    - بۆچون و ڕەئی سێهەم
    - بۆچون و ڕەئی چوارەم
- سەرەنجام ... بۆمان دەرکەوت:

# هەورامان مەڵبەندێکی ئاینی بووە لەکۆن و نوێدا

**- هەورامان و ئایینی زەردەشتی:**

بێگومان لەپێش ئیسلام دا، خەڵکی کوردستان بەشێوەیەکی گشتی و هەورامان بەتایبەتی، پەیڕەوی ئایینی زەردەشتی کردووە[1]، چونکە ئەم ئایینە نزیکەی (١١٠٠) ساڵ، ئایینی ڕەسمی گەلە ئێرانی‌یەکان بووە، هەرچەندە مەسیحی و یەهودیش، لەکوردستاندا بووە، بەڵام نەبوونەتە ئایینی ڕەسمی لەناوچەکەدا.

ئەم ئایینە پەڕاوێکی بووە بەناوی (ئاڤێستا)وە، کەبەزمانی پەهلەوی کۆن نوسراوەتەوە، کەلەهەورامی‌یەوە نزیکە. زمانی (ئاڤێستاو پەهلەوی و هەورامی، لەهەموو زمانەکانی دنیا هاوبەشیان زۆرترە.

**ئاڤێستا**: کۆنترین فەرهەنگی زمانە ئێرانی‌یەکانە، کەماوەیەکی زۆر سەرچاوەی ئیلهاماتی‌یان بووە، لەڕووی باوەڕو لەڕووی کاری دونیاوە[2].

(قانع)ی شاعیر دەڵێ:

کتێبی زەردەشت، کەئاوێستا     وەک باقی کتێب، خەلاتی خوایە
بەزوان هەورامی، هاتەسەر بەشەر     یانی های زەردەشت، بوو بەپێغەمبەر
تادەوری خۆی بوو، وەک باقی دینان     بەلام نەسخ بوو، ئەویش بەقورئان[3]

ئەو کەسانەی، کەوەك زاناو حەکیمێك، پەیڕەوی ئەم ئایینەیان کردووەو، بوونەتە (مەرجەعێك)، پێیان وتون (پاوەر)، دوایی ئەم وشە بووەتە، (پیر). جایەکێ لەو پیرانە، (پیرشالیاری کوڕی جاماسب) بووە، کەبە پیرشالیاری یەکەم ناسراوە، کەلەساڵی (١٥٠ پ.ز) ژیاوەو، پەڕاوێکی لەڕوانگەی (ئاڤێستا)وە داناوە، بەناوی (ماراف=ماریفەت)[4].

ئەم پەڕاوە بەهەورامی نوسراوەو، پڕە لەئامۆژگاری و پەند ... لەیەکێ لەبەندە مژدە بەخشەکانیدا، کەلە ئاڤێستای وەرگرتووە، دەڵێ:

وەروێوە، وارو، وەروە، وەرینە     وەریسە، بریۆ، چوار، سەرینە
کەرگێ سیاوە، هێڵە چەرمێنە     گوشڵێ مەمێریۆ، دوە بەرێنە

هەندێ لەپیاوە ریش سپی‌یەکان ئەڵێن، مەبەستی پیرشالیار ئەوەیە کەئاینێك پەیدا ئەبێت، وەك ئەو بەفرە وایە، کەبەفر دەتوێنێتەوە، ئاینێك دێت ئەم ئایینەی ئێمە بەتاڵ دەکاتەوەو، ئەو ئایینە وەك چۆن گوریس دەپچڕێ دەبێت بەچوار سەر، ئەوەش مەبەست لەچوار مەزهەبەیە، یا چوار یاری

پێغەمبەرە، وەك چۆن مریشکی ڕەش هێلکەی سپی دەکات، (محەمەد) پێغەمبەریش (د.خ) لەعەبدوالله ئەکەوێتەوە، هەرکەسیش مرد، یابەهەشتی‌یە یادۆزەخی.

لەبەندێکی تردا ئەڵێ:

داران گیان داران، جەرگ و دڵ بەرگن    گاهێ پڕبەرگن، گاهێ بێ‌بەرگن

کەرگە جەهێڵە، هێڵە جەکەرگەن    ڕەواس جەڕەواس، وەرگ جەوەرگەن

واتە:

درەختەکان وەك ئادەمیزاد گیانلەبەرن، وەئەوانیش جەرگ و دڵیان هەیە، کەگەڵاو ڕیشەیانە، ماوەیەك گەڵایان هەیەو، ماوەیەك ئەوەرێ، مریشك لەهێلکەیەو، هێلکەش لەمریشکە، ڕێوی لەڕێوی‌یەو گورگیش لەگورگ..

مەبەست ئەوەیە:

وەك چۆن درەخت پێویستی بەڕەگ و ڕیشە هەیە، هەروەها مرۆڤیش پێویستی بەخزم و یارمەتیدەر هەیە، بۆ ئەوەی بەهەموویانەوە، بەکۆمەڵ بژین و ژیانێکی پڕکامەرانی بەدەست بهێنن. مرۆڤ لەمرۆڤ بووە، پێویستە لەگەڵ مرۆڤ بژیت.. جازۆرجار، لەپاش تەواو بوونی هەموو بەندێك، لەفەرمودەکانی ئەمەی خوارەوە دوبارە دەکاتەوە:

هۆشت جەواتەی، پیرشالیار بۆ

گۆشت جەکیاستەی، (زانای سیمار) بۆ

ئەڵێن مەبەستی ئەوە بووە:

بەدڵ ئاگات لەفەرمودەکانی پیرشالیار بێت و، گوێش بگرە بۆ نێروای زانای ڕەمزگۆ، کەمحەمەدە (د.خ)[٥].

مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لە (زاری زمانی کوردی)دا (ل١٦) دەڵێ:

ماریفەت دوو بەشە: بەشی یەکەمی زۆر کۆنەو، وتن و نوسینی دەگەڕێتەوە بۆ سەروکلاوی پیرشالیاری زەردەشت، زۆربەی سرودو دۆعای دینی زەردەشتین، بەڵام بەشی دووەمی، لەسەردەمی پیرشالیاری دووەم، کەئیسلام بووە نوسراوە، باس لەڕەویەو ڕەوشتی دینی ئیسلام و چۆنیەتی پەیڕەوی کردنی دەکات.

- **پیرەکانی هەورامان**

م. محمد ئەمین هەورامانی لەمێژووەکەیدا، ل(٦٣٦-٦٥٥) کەئەویش لەهەردوو دەستنوس [(تأریخ اورامان)ی موزەفەرخان و، (تأریخ اورامان)ی شین]وەری گرتووە، ناوی (٢٨) پیری لە (٩٩) پیرەی هەورامانی نوسیووە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- پیر محەمەدی غەیبی کەلەنەوەی کوڕانی ئیمام ڕەزایە، ئەگەرچی گۆڕەکەی دیار نیە، بەڵام لەنێوان هانە گەرمڵەو کەیمنەدا دیار نەماوە.

٢- پیرشالیار - ناوی باوا مستەفایەو کوڕی باوا خوادایە، باوا خوادا ئامۆزای پیر محەمەدی غەیبییە، لە هەورامانی شار ژیاوە. پیرەکانی تر لەشوێنەکانی ترەوە هاتون بۆلای ئەم پیرە.

٣- پیرخالد، لەشاری هەورامان ژیاوە.

٤- پیرصاد، چونکە ڕاوکەر بووە، بەپیر (صیاد) ناوبانگی دەرکردوەو ناوی (عەبدوڕەحمانە).

٥- پیرهەوتی، یان (پیر هەستیرقی)، گۆڕی لەتەنیشت گۆڕی پیرشالیارەوەیە.

٦- شالیارە سیاوە، دەوترێ لەشازادەکانی هیندستانەو، ناوی ڕاستی حەیدەرە.

٧- شێخ نیعمەتو الله، گۆڕی لە گۆڕستانی هەورامانداية.

٨- پیر ڕۆحواللە، گۆڕی لە هەسەن ئاوایە.

٩- پیر نەدی.

١٠- پیر بابا.

١١- پیر محەمەد، لەنەهاوەندەوە، دەوروبەری هەمەدانەوە، هاتووە بۆسەردانی پیرشالیار لە هەورامان، دوایی لەوێ ماوەتەوەو، مردووەو، گۆڕەکەی لە(هانەوسەردێ)یە لەکۆسالان.

١٢- سەید محەمەدی ڕۆسەم، کوڕی یاخود لەکوڕانی سەید (أبیض)ە.

١٣- پیر محەمەد، کە (باواخۆشێن) و (سەید ئەلوەندی)یشی پێدەوترێ کەلەکوڕانی باوا تایری هەمەدانییە. لەدێیەکی لای کێوی ئەلوەندەوە هاتووەتە لای پیرشالیار لەشلێرانیو، وەیسیای هەورامان نیشتەجێ بووە.

١٤- پیرقەلەندەر، ناوی ئەحمەدەو کلاشکەر بووە، هەموو ساڵێ کلاشی بۆ پیرشالیار کردووە، ئێستاش تاکێ لەو کلاشانەی ماوە.

١٥- پیرکومسایی ناوی (پیر مەحمود)ە، لەبەر ئەوەی لەنزیک پیرشالیارەوە نێژراوە، واتە بووەتە هاوسێی پیرشالیار، بۆیە بەپیر کومسایی ناودەبرێ -بەردی کومسایی لەنزیك گۆڕەکەیدایە، کە بەتەبەڕوك دەژمێررێ‌و، خەڵکی هەورامان دەچنە سەری و هەریەکە کەمێکی لێدەپچڕێنێ‌و دەیبا، دەیخاتەناو مەشکەوە، گوایا (کەرە)ی زیاد دەکات، ئەو بەردە نزیکەی هەزار کەسێ لێی ئەپچڕێنێ، تاوای لێدێ لەتەختی زەویدا نامێنێ، کەچی بۆ ساڵی ئایندە وەك (گیا) دەڕوێتەوە.

١٦- پیر تەرجان، ناوی پیر محەمەد صادقەو، لەتەرجانەوە، هاتووە، گۆڕەکەی لای سەروی وەیسیانەوەیە.

١٧- پیر ژەنگەڵ، ناوی ئەحمەدە، گۆڕەکەی لای سەروی گۆڕی (باوا مەردۆخ)ەوەیە.

١٨- پیر سیاو، ناوی (عەبدوالله)یەو گۆڕەکەی لە(وەیسیا) دایە.

١٩- پیر نەدیم، گۆڕەکەی لای سەروی دێی (وەیسیا)وەیە.

٢٠- پیر وەیسی، گۆڕەکەی لای ڕاستی شاری هەورامانەوەیە.

٢١- پیر دانا، ناوی محەمەدە، لەهەورامانی شاردا ژیاوە، لەژیانیدا سەردانی مەلا ئەبوبەکری موصەنیفی چۆری کردووە.

٢٢- باوا یادگار، یا پیر یادگار، لەدوای پیرشالیار بووەتە جێنشینی‌و، لەنزیك پیرشالیارەوە نێژراوە.

٢٣- مەلا جاروالله، زانایەکی لێهاتووی دیوەزناو بووە، لەسەردەمی خان ئەحمەد خان دا ژیاوە، لە (سەرو پیری) نێژراوە.

٢٤- پیر باوا حەیران، کوڕی (باوا وەڵیاد) ەو، گۆڕەکەی لەنێوان (دەرەویان) و (ملەمارفان)ە.

٢٥- باوا وەڵیاد، دەوترێ کە لەسەیدەکانی کەلجی‌یەو، گۆڕەکەیشی وا لە(دەرەویان).

٢٦- دەروێش دلاوەر، ناوی سەید محەمەدە، لەبەر ئازایی ناویان ناوە (دلاوەر).

٢٧- سەید پیر سمایل، لەجلەو ئاوای ئەسپەرێز نێژراوە، کەیەکێکە لەکوڕانی ئیمام ڕەزا.

٢٨- پیر باوا قاسم، گۆڕەکەی لەدێی سلێنەو، دەڵێن لەسەیدانی کەلجی‌یە.

لەپەڕاوو شوێنانی تریش، ناوی ئەم پیرانەش بەم شێوە هاتووە:

(پیر ڕۆستەم، پیر زەرێن، پیرجان، پیرداود، پیروەتیٚ، بابا حەیرانیٚ، بابا پیدۆ[٦]، پیر محەمەد (بابا مەردۆخ)[٧]، بابانەوەس = بابا نەورۆز[٨]، پیر خدری شاهۆ[٩]، بابا خاکی، کەنەوەی بابا تاهیری هەمەدانی‌یەو دوانزە کوڕی بووە کەبەدوانزە برای کەیمنە ناسراوون، لەو دوانزە -پیر خالد و قاسم و خدرو عوسمان و پیری چۆکلە.[١٠] دوور نیە، ئەمانەش لە (٩٩) پیرە بن.

صۆفی جانە، بابا سەرهەنگ، بابا ئەسکەندەر، بابا الله، بابا خوادا، کەهەر پێنجیان لەتەوێڵە ژیاون وەك (شەخص) شوێنیان هەیە لەتەوێڵە.

هەروەها ناوی پیر لەکوردستاندا زۆرە، وەك: پیرە مەگرون، پیرمام، پیری ڕەش، پیر محەمەد، پیر مەسور، پیری شەوکێڵ، پیر میکایلٚ ... تاد. لەوانەیە، ئەم پیرانەش هەر لە (٩٩) پیرەی هەورامان بن، چونکە زۆر لەپیرەکانی تر خەڵکی هەورامان نەبوون و هاتوون لەویٚ ماونەتەوە، بەڵام ڕەنگە ئەمانەیان دوایی گەڕابنەوە شوێنی خۆیان، یاخود خەڵکی هەورامان بووبن و بۆ بانگەوازی ئیسلامی چوبنە ئەم شوێنانەی تر.

- **پیرشالیاری دووەم :**

یەکیٚ لەو پیرانە پیرشالیاری دووەمە، کەهەر لەنەوەی پیرشالیاری یەکەمە[١١]، لەهەورامانی شار لەدایك بووەو ژیاوەو گۆڕەکەیشی لەوی‌یە: ناوی مستەفای کوڕی خوادایەو دەڵێن خەوی بینیوە بە پێغەمبەرەوە (د.خ) و موسڵمان بووە، هاوچەرخی شێخ عەبدولقادری گەیلانی بووە، گەیلانی لەبارەیەوە فەرمویەتی:

"إن أخي مصطفى رجل صالح"[١٢]

ئەم پیرە زانایە لەساڵی (٤٨٠ك=١٠٨٧ز)، ماریفەتی پیرشالیاری یەکەمی دەستکاری کردووەو ئەوەی نەگونجاوە لەگەڵ ئیسلامدا لای‌بردووە[١٣]. وە لەسەردەمی ئەم دائیسلام لە هەورامان دا گەشەی سەندووە.

ئەم پیر شکۆمەندە یا یەکێك بووە لە (٩٩) پیرەی هەورامان[١٤]، یاخود پیری پیرانی سەردەمی خۆی بووەو (٩٩) پیرەی هەورامانی پێگەیاند[١٥]، ڕێگا نیشاندەری زوربەی پیرانی هەورامان بووە[١٦]. بۆیە پیرەکانی تر لەشوێنانی ترەوە هاتون بۆ هەورامانی شارو سەردانی ئەم پیرشالیارەیان کردووە[١٧].

ئەم پیرانە شارەزاییەكی باشیشیان بووە، لەگیاشناسی و پزیشكی و ئەستێرەناسیو كەشناسیدا، وەگرنگییان داوەتە، ناحیەی دەروونی و ڕەوشت و، خەڵكەكەیان زۆر پابەند كردووە بەدین و ئەخلاقەوە[١٨].

**ڕۆڵی پیران لەكاروباری ڕامیاری و ئیداریدا[١٩]:**

پێش هاتنی ئیسلام، لە هەورامان دا بۆ بەڕێوەبردنی ئیش وكاری خۆیان، ئەنجومەنێكیان بووە بەناوی(مەریٚ)وە، كەچوارساڵ جارێك هەڵبژاردنی بۆكراوە.

(پاوەر=پیر) بەخەڵكی ڕاگەیاندووە، كەچوار ساڵی دەسەلاتی (ژیرلا)، واتە (شورا) تەواو بووە، دەبیٚ (ژیرلا)ی تازە هەڵبژێردرێت و، هەموو خەڵك كۆ ببنەوە، لەبەر دەرگای بینای ئەنجومەن (مەریٚ)، كە (ژیرلا)، كاروباری تێدا بەڕێوە بردووە.

(پاوەر) بەخەڵكەكەی وتووە: چەند كەسانێك، خۆیان بپاڵێون و، دیاری بكەن و، تاوەكوو خەڵك دەنگیان بۆ بدەن ... بێگومان كەسانێك خۆیان (كاندید) كردووە، كەلەماوەی ڕابردوودا، خزمەتی خەڵكیان كردبیٚو، شایستە بن، دەنگیان بۆ بدرێت، چونكە (ژیرلایی) پلەو پایەیەكی گەورە بووە، هەموو كەس نەیتوانیوە، خۆی دیاری بكات، تەنها ئەوانە نەبێت، كەبەخۆیاندا پەرمیون، ئەو پلەو پایە بەرزە بەدەست بهێنن.

ژمارەی پاڵێوراوان لەنێوان (١٦-٢٠) كەس بووە، بەپێی ژمارەی دانیشتوان. ئینجا (پاوەر) ناوی پاڵێوراوانی ناوە، یەكێك گوێز، یەكێك توو، بەڕوو، قەزوان، نۆك، بادام، هەرمیٚ، هەنجیر، و ناوی چەند میوەیەكی تر ... پاشان (پاوەر) پیٚی وتوون، لەبەرەبەیانی ڕۆژی یەكی ساڵی تازە -كەیەكەم ڕۆژی بەهار دەكات- هەموو لەبەردەم دەرگای (مەریٚ)، بۆ دەنگدان ئامادەبن، هەركەس ئەو میوەیە لەگەڵ خۆی بهێنیٚ كەدەیەویٚ كەناوی یەكێك لەپاڵێوراوەكانە، باكەسیش نەیبینیٚ. لەكاتی دیاری كراودا هەموو لەبەردەم دەرگای (مەریٚ)دا كۆببنەوە، دوو بەردیش كەپێیان وتوون (مەرد ئازما) واتە: مەردوم تاقی كەرەوە. ئەمە بۆ تاقیكردنەوەی كوڕو كچی تازە لاو، دانراون، كەقورسایی ئەو دوو بەردەش جیاواز بووە.

ڕۆژی هەڵبژاردن ئەو دوو بەردە، لەبەردەم (مەریٚ) دانراون، لەبەرچاوی جەماوەرەكەو (پاوەر)ەوە هەر كوڕێك یا كچێك توانیبێتی بەردی خۆی بەرز بكاتەوە، مافی دەنگدانی هەبووە، ئەمەش نیشانەی بلوغ و پێگەیشتن بووە. بەڵام بەردی كوڕ قورستر بووە لەبەردی كچ.

پاشان کیسەیەك کەپارچەیەکی ڕەنگاو ڕەنگ بووە، کەخۆیان دروستیان کردووە، پێیان وتووە (هەلاوە) واتە (جاو) لەبەرچاوی خەڵکەکەوە هەڵیان دووریوە.

(پاوەر) کیسەکەی گرتوەو، هەرکەس کیٚ ویستووە بۆ (ژیرلا) ئەو میوەیەی لەگەڵ خۆی هێناوەو هاوێشتویەتی‌یە ناو (هەلاوە) کەوە. پاشان (پاوەر) لەبەرچاوی جەماوەرەکەوە، هەڵیرشتووەو، ژماردویەتی، هەرکەس هەردەنگێکی هێناوە ڕایگەیاندووە، (٤-٦) کەس کەزۆرترین دەنگ بۆ (ژیرلایی) دیاری کراون، تا (٤) ساڵ ئیش وکاری خەڵکیان لەهەموو بارێکەوە هەڵسوڕاندووە.

ئەو یاسایانەی کەلەئایینی (ئاهورایی)دا، بەشێوەی نوسراو بووە، پەیڕەو کراوە، خۆیشیان لەسەر بناغەی ماریفەت، یاساو دەستوریان بۆ بەڕێوەبردنی داناوە.

بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم (ژیرلا)یە ئاماژە بەم خالآنە دەدەین:

- هەموو خەڵك پابەند بووە بەفەرمانەکانی (ژیرلا)وە، هیچ کەس بۆی نەبووە سەرپێچی بکات، چونکە سەرپێچی کردن لەدین دەرچوون بووەو، سزاش دراوە.

- بەم شێوەیە، کاروباری هەورامان بەڕێوەبراوەو، زۆرداری و خیانەت و جنایەت و دزی نەبووە، کەس نەیتوانیوە ستەم بکات و بێ فەرمانی (ژیرلا) بکات.

- (ژیرلا) زۆر گوێی داوەتە (هەژاران)و، پشت و پەنایان بووە، خۆراك و شت و مەکی، لای دەوڵەمەندەکان هێناوە، داویەتی بەقەرز بەهەژارەکان.

- لەو سەردەمە، ژنان لەدونیادا مافی دەنگدانیان نەبووە، کەچی لە هەوراماندا مافیان هەبووە.

- چونکە (پاوەر=پیر) سەرپەرشتی (ژیرلا)ی کردووە، لایەنێکی پیرۆزی وەرگرتووە، ئەو میوە وشکەیەش، دوای ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکە وەك (تەبەروك)، سەیرکراوەو، دابەش کراوە بەسەر خەڵکەکەدا، لەدوایشدا خواردنی تایبەت کراوەو، خواردویانە وەك ئاهەنگ گێڕانێکی لێهاتووە.

- دەتوانین بڵێین کەئەم (ژیرلای مەڕێ)یە بەمانای ئەمڕۆ، دیموکراسیترین جۆری هەڵبژاردن بووە، کەبەبێ فێڵ و ستەم و زۆرداری، کار بەڕێوەبراوە، کەکاتێکدا کەدونیا پڕ بووە لەستەم و زوڵم و دیکتاتۆری.

- ئێستاش لە هەورامان دا وشەی (پیر) و (مەریَ)و (ژیرلا) هەر هەیە.

**وشەی پیر:** لەدوای هاتنی ئیسلامیش، ئەم وشەی (پیر)ە هەر ماوەتەوە ئێستاش لەناو ئەهلی تەصەوف دا (پیرانی تەریقەت) بۆ شێخەکانیان بەکار دەهێنن.

بەهەورامی (مەڕ) واتە ئەشکەوت.

مەریَ: لە هەورامان دا، هەندێ شوێنمان هەیە، بەم ناوەوە وەك:

مەڕۆ مەریَ = ئەشکەوتی مەریَ .. لەدزڵی.

چەمەو مەریَ = چەمی مەریَ .. لەکەماڵا.

دەرەو مەریَ = ناوی دێیەکە لە هەورامانی عێراق.

مەریَو زاوەری = باخ و باخاتێکی دڵگیرە لەچەمی دزاوەر.

**ژیرلا:** واتە ژیرەکان، بەئەندامانی ئەنجومەن وتراوە، کەشورایان پێکهێناوە، ئێستا وشەی (ژیرلە) بەکار دەهێنرێت، کاتێك منالێك بانگ دەکەیت دەڵێیت: ژیرلەگیان بوریَ، واتە ژیرەگیان وەرە.

**ژیرلەو مەریَ:** ئەم وشەیە لە هەورامانداا، کاتێك بەکار دەهێنرێت، یەکێك قسەیەك یان کارێك بکات، چاوەڕوانی شتێکی گرنگ و باشی لێبکرێت، بەڵام کەوتەو کارێکی ناقۆڵاو نابەجێی کردو وت، وەك تەعلیق پێی دەڵێن، ئەوا (ژیرلەی مەریَ) قسەی کردو کاری ئەنجام دا، واتە کاری ژیرلەی مەریَ پەسەندو جوانە.

- ناوی پالێوراو، بۆیە بەمیوەیەکی وشك ناونراوە، چونکە خەڵکەکە نەخوێندەوار بوون، بەم شێوەیە دەنگی کەس نەفەوتاوە، کام جۆر میوە زۆر بووبێت، لەهەڵاوەکە، ئەوە ئەو پالێوراوەی ناوی ئەو میوەیە، دەنگی زیاتری هێناوە.

**کەی وە چۆن خەڵکی هەورامان ئیسلامیان پێگەیشتووە؟**

کەلاپەڕەکانی مێژوو هەڵدەدەینەوە، شتی زۆر سەیرو سەمەرەو جیاوازو ڕاست و ناڕاست دەبینین. مرۆڤی هۆشیارو هۆشمەندو زانای دەوێت ڕاست و دروستەکان جیابکاتەوە، جاری واش دەبێت مرۆڤی زیرەك و دانایش پەی بەڕاستیەکان نابات و چەواشە دەبێت.

مێژوو بەگشتی، بەتایبەت مێژووی کورد شتی زۆری تێکەڵاو بووەو ڕاستیەکان ئاوەژوو کراون، کەسانێکی لێبڕاوی دەوێت ئەم مێژووە ڕاست بکاتەوە. چەندەها گۆڕ هەن لەم کوردستانەدا ناوی صەحابەیان لێنراوە، تا

ئێستا بەچاوێکی ڕێزو پیرۆزەوە سەیر کراون، کەچی وادەردەکەوێت کەئەمە ئەصڵیان نیەو دروستکراون و گۆڕی ئەو صەحابانە نین[٢٠].

جا موسڵمان بوونی خەڵکی هەورامان، کەی بووە؟ چۆن بووە؟ بۆچوونی جیاواز هەیەو ڕەئیەکان جیاوازن، بەکورتی ڕەئیەکان دەخەینەڕوو، پاشان ئەوەی وتراوە لەسەریان دەنوسین و بۆچونی خۆشمان دەنوسین.

چوار ڕەئی هەیە:

**١- ڕەئیەك دەڵێ:**[٢١]

لەساڵی (١٨ ك)ەوە بۆ (٣١٨ ك) چەندجار سوپای ئیسلام هێرشی کردووە بۆ هەورامان و نەیتوانیوە بیگرێت، وەلە (دەربەن جەهە) لەدزڵی (١١) صەحابە شەهید بوون و ئەو دەربەندە بە(دەرەو ئەصحابا) واتە (چەمی ئەصحابە) ناسراوە. هەر ئەو سەرچاوەیە دەڵێ:

دواتر هەروامی‌یەکان بەئارەزوو مەیلی خۆیان موسڵمان بوون.

هەر لەم بارەوە سەرچاوەیەکی تریش دەڵێت[٢٢]:

لەم دواییەدا پارچە هۆنراوەیەك دۆزراوەتەوە، باسی ئەم هێرش و پەلاماردانە دەکات کەکراوەتە سەر هەورامان، هۆنراوەکە دەڵێت:

هورمزگان ڕمان ئاتران کژان ... وێشان شاردەوە، گەورە گەورەکان
زورکاری ئارەب کردنەخاپور ... گنائی پاڵە هەتا شارەزوور
شەن و کەنیکاوە دیل بشینا ... مەرد ئازاتلی وەڕووی هوینا
ڕەوشت زەردەشت مانۆ وەبی‌کەس ... بزیکانیکا (هورمزد) وەهیچ کەس

**واتە:** مزگەوتەکان ڕوخان، ئاگرەکان کوژانەوە، گەورە گەورەکانیش خۆیان شاردەوە، زۆرکاری عەرەب وێران یان کرد، هەر لێرەوە تاشارەزوور، ژن و کچیان دیل کردو پیاوە ئازاکانیش لەناو خوێنا تلانەوە، ئیتر ڕەوشتی زەردەشت بی‌کەس مایەوە، هورمزیش بەزەیی بەکەس دا نایەتەوە[٢٣].

- ئەم ڕایە بەلامانەوە لاوازەو، جێگەی پرسیارە بەم بەڵگەو شێوەیەی خوارەوە:

• سوپایەك بتوانێت ئەو هەموو دەشت و شاخ و، خێڵ و گەلە دوورو نزیکانەی دونیا بگرێت بەم هەموو هێزە زۆرو ناوچە سەختانەوە، کەچی نەتوانێ لەماوەی (٣٠٠) ساڵ دا، هەورامان بگرێ، تۆ بڵێی وەك سوپاکەی ئەسکەندەری لێ‌هاتبێ، نەیتوانیبێ هەورامان بگرێ.

• هەورامانێك خاوەنی ئەم (پیر)ە عاقڵ و دانشمەندانە بووبێت، بۆ ماوەی (٣٠٠) ساڵ، میللەت توشی شەڕ بکەن و ڕێگە چارەیەك نەدۆزنەوە بۆ ئەمە، جێگەی پرسیارە؟! چونکە پیرەکان بەدوای چارەسەری کێشەی گەلەکەیاندا گەڕاون چۆن (٣٠٠) ساڵ چارەیەك نادۆزنەوە.!

• مێژوو نوسەکان، چ کورد چ غەیری کورد، نەك پشتگیری ئەم ڕەئیە ناکەن بەڵکو ڕەدیشی دەکەنەوە، بۆ نمونە[٢٤]:

ڕۆژ بەیانی دەڵێت:

(... وادیارە، کوردەکان کەلەستەمی ساسانی، بەتەنگ هاتبوون، بوون بەڕێنمای سوپای ئیسلام و شەڕیان بۆ شاهەنشاه نەکردووەو، هەموو شارەکانیان هەر بەبێ‌شەڕو بەئاشتی داوە بەدەستەوە)

مەسعود محەمەد دەڵێ:

(کورد خۆشحاڵ بووە بەهاتنی ئیسلام، هەتا فارس و ڕۆمیان لەکۆڵ بکاتەوە).

ئەگەر لە هەورامان دا (٣٠٠) ساڵ شەڕ بووبێت و بەردەوام هێرشی بۆ بکرێت، بۆ لەپەڕاوە مێژووییەکاندا ئامارژەی بۆ نەکراوە، بڵێن، جگە لە هەورامان، کوردستان هەموو بەئاشتی موسڵمان بوون.

• لەکتێبە باوەڕپێ‌کراوەکاندا، ناوی صەحابەیەك نەهاتووە، لەخاکی کورد بەدەستی کورد کوژرابێت[٢٥]. ئەم (دەرەی ئەصحابە) وەك دۆڵی سماقوڵی لێ‌قەوماوە.. (لەدۆڵی سماقوڵی لەپارێزگای هەولێر، بەدرێژایی ئەو دۆڵە هەزاران گۆڕی لێیە، وەکو دانیشتوانی ناوچەکە دەگێڕنەوە، کەلەم دۆڵەدا شەڕێکی قورس لەنێوان ئەصحابەکان و کافران دا بووە، ژمارەیەکی زۆر لەئەصحابە کوژراوە لەم ناوچانەدا، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی لەم قسانە ناکات، ڕەنگە ئەمە ئەفسانە بێت)[٢٦].

• لەهیچ شوێنێکی مێژوو و نوسراوەکاندا نیە، کەکورد بەرەنگاری سوپای ئیسلامی کردبێت. کەسوپای ئیسلام هاتووەتە کوردستان، فارس و ڕۆم خۆیان بەرەنگاری سوپای ئیسلام یان کردووە. کوردەکان پشتگیریان نەکردوون لەهیچ مێژوویەك دا، نابینی کوردەکانی ئەم هەرێمە ڕێکەوتنێك لەگەڵ فارس و ڕۆم مۆر بکەن و دژایەتی سوپای ئیسلام بکەن[٢٧].

((شیعری هورمزگان))

دەڵێن: شیعری هورمزگان، لەسەر پێستی ئاسك، لەئەشکەوتێکی دەوروبەری سلێمانی دۆزراوەتەوەو، دوکتۆر سەعیدخانی کوردستانی بردوویەتی بۆ ئەوروپا.

... ئەم شیعرە چوار بەیتە، بێ ناوە، کەبەڕواڵەت شیعری کوردی‌یەو بەشیعری هورمزگان ناسراوە، کەدۆزراوەتەوە کەوتۆتە دەستی د.سەعیدی کوردستانی، ئەویش دەیدات بە (ملك الشعراء - بهار) و ئەویش لەکتێبی (شیعر در ایران، چاپی تاران، بێ مێژووی چاپ بوونی کتێبەکە) لەچاپ دەدریو دەبێتە سەنەدو بەڵگەیەکی پێشینەی ئەدەبی کوردی[٢٨].

ئەم شیعرە بەکۆنترین شیعر دانراوە، لەلایەن نوسەرو لێکۆڵەرەوانی کوردو فارسەوە. وەلەچەندەها پەڕاوو گۆڤارو ڕۆژنامەکان، قسەو باسی لەسەر کراوەو، بەنمونە دەیهێننەوە لەسەر زوڵم و زۆری سوپای ئیسلام، بەتایبەت لەدوای ڕاپەڕینی (١٩٩١)دا، زیاتر برەوی پێدراوە.

ئەوەتا لە (پەیامی هەورامان)دا دەڵێ:[٢٩]

ئەم چوار دێڕە شیعرە گۆرانی‌یە، ئەبێتە کۆنترین شیعری کوردی. دەبێت هەموو زاراوەکان نرخاندنیان هەبێت بۆ زمانی کوردی گۆرانی. فەرموون یەك دێڕ بێنن، هی (١٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش بێت لەکوردستانی مەزن دا.

ئەم هەڵبەستە بەگەلێ جۆر بڵاوکراوەتەوە:

- (ملك الشعراء - بهار) کەبۆ یەکەمجار، ئەم شیعرەی لە د. سەعید وەرگرتووە بەم شێوەیە بڵاوی کردوەتەوە[٣٠]:

(هرمزگان رمان اتران کژان — هوشان شاروه گوره گاوران

زور کره آرب، کرونا خاپور — گنانی پاله، بشی شارەزور

شن و کینیکان، ودیل شینا — مرد آزاتلی، روژی هوینا

بزیکانیکا، هرمز وهویچ کس — روشت زردوشتر، ماننەو بیدس)

ئەم کتێبەی (ملك الشعراء)، دەبێ پێش ساڵی (١٣١٨)ی هەتاوی چاپ بووبێ، چونکە لە (ل ١٣٠) کتێبی (سبك شناسی)دا، باسی دەکاو دەڵێ: بۆیە لێرە باسی شیعر ناکەم چونکە لەکتێبی (شیعر در ایران)دا باسم کردووە. کتێبی (سبك شناسی)یش لەبەینی ساڵی (١٣١٣-١٣١٨)دا نوسراوە[٣١].

- ئەم شیعرە، ڕەشید یاسەمی لەپەڕاوی (کرد و پیویستگی نژادی و تاریخی او)دا، ل (١٢٩)دا بەم شێوەیە نوسیویەتی[٣٢]:

اهورمزگان رمان، آنران کژان ویشان شاردەوە، گورە گورکان

زورکار آرب کردنە خاپور | گنای پالە هتا شارە زور
شن کنیکان ودیل بشینا | میرد آزا تلیو روی هوینا
روشت زرد شترە مانوەبیکس | بزیکانیکا هورمز و هیوچکس)

– عەلائەدین سجادیش لەکتێبی (مێژووی ئەدەبی کوردی)دا، ئەم شیعرەی بڵاوکردووەتەوە، کەلەکتێبەکەی ڕەشید یاسەمی وەری گرتووە، بەڵام بەڕێنوسی کوردی ئەم سەردەمە نوسیویەتی‌یەوەو، بەم شێوەیە بڵاوی کردووەتەوە:

اهورمزگان رمان، ئاتران کژان | ویشان شاردەوە گەورەی گەورەکان
زورکاری ئارەب کردنە خاپور گنای پالەیی، هەتا شارەزوور
شن و کینیکان وەدیل بشینا | میرد ئازاتلی وەروی هوینا
رەوشت زەردەشت مانوە بێکەس | بزیکانیکا هورمز وەهیو چ کەس)

هەروەها لەهەندێ کتێبی تردا، ئەم هۆنراوە بڵاوکراوەتەوە، وەك:

– مێژووی کوردو کوردستان – محەمەد مەردۆخی، و:عەبدولکەریم محەمەد سەعید – (ل ۹۳) ئاماژەی نەکردووە لە چ سەرچاوەیەکەوە وەری گرتووە، بەڵام ئەوەندە هەیە تێکەڵاوی لەگەڵ (د. سەعیدخان) هەبووەو دوور نیە لەوەوە وەری نەگرتبێ.

– پیرشالیاری زەردەشتی – محەمەد بەهائەدین– ل(۸–۹). ئەمیش سەرچاوەکەی دیاری نەکردووە، بەڵام لەکۆتایی کتێبەکەدا، نوسیویەتی، کەمێژووەکە سجادی و مێژووەکەی مەردۆخ سەرچاوەی کتێبەکەن، کەواتە لەوانەوە وەری‌گرتووە.

– تأریخ ادبیات – دکتر زبیح الله صفا.

– تأریخ نهضتهای فکری ایرانیان – عبدالرفیع حقیقت.

ئەم دوانەش لەوەی (ملك الشعراء – بهار) وەریان گرتووە.

– م. بۆرەکەیی لەمێژووەکەی‌دا ل(۳۸)دا دەڵێ: لەسەر قسەی د. سەعیدخان خۆیەوە، دەینوسێ کەلەسەرچاوەکەی خۆیەوە وەری‌گرتووە.

– د. کمال فوئاد، لەبارەی ئەم شیعرەوە دەنوسێ، ئەم شیعرە بۆ یەکەمجار لەلایەن حوزنی موکریانی‌یەوە، لەساڵی (۱۹۳۰ن) لەگۆواری زاری کرمانج دا، چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

– لەم سەردەمەی دوییدا، ئەم شیعرە لەزۆر بڵاوکراوەی تردا دەرکەوت، کەهەموویان ئامارژە بەم سەرچاوانەی پێشوو دەدەن، بەتایبەت کتێبەکەی (بەهارو یاسەمی).

م. ئەحمەد شەریفی، لەتێبینییەکانیدا لەسەر ئەم هۆنراوەیە دەڵێ:[٣٣]

(... هەتا ئێرە، هەرچی و هەرکەسێکی کە، ئەم شیعرەیان بڵاوکردوەتەوە، هیچ شك و گومانێکیان لەساختەکی و، بێبنەڕەتی ئەم هۆنراوەیە نیشان نەداوەو، گشتیان بەبەڵگەیەکی مێژوویی پێشینەی شیعری کوردییان داوەتە قەڵەم و، ڕەنگە بۆ ئەوەڵین جار، کەسێك کەگومانی لەڕەسەن بوونی ئەم شیعرەدا کردبێ دوکتۆر کەمال فوئاد بێ، کەئەویش لەوتارێکدا، ئەم ڕەئیەی خۆی دەربڕیوە.

لەم بارەوە دەبێ بێژم، کەپێش کارەساتە دڵتەزێنەکەی ساڵی (١٩٧٥)، ڕۆژێك لەتاران چوومە خزمەت زانایەکی گەورەی کوردی عێراق، کەلێرەدا بەکاك (ساڵەی) ناودەبەم، لەماڵی ئەو زانایە، خوا لێخۆش بوو سەید (صالح یوسفی)یم بینی کەئەوکات سەرۆکی یەکیەتی نوسەرانی کوردستان بوو، سەیدا صالح یوسفی بۆ چاپ کردنی ژمارە (١٣)ی گۆواری نووسەری کورد هاتبووە تاران، لەوێ بۆ هەوەڵ جار وتارەکەی دوکتۆر کەمال فوئادم بینی، کەبەچاوێکی گوماناوییەوە ڕوانی بوویە ئەم شیعرە. وتارەکەی دوکتۆر کەمال بەناوی (چۆن ئەگەینە سەرەتایەکی باوەڕپێکراو بۆ ئەدەبی کوردی) بوو، کەلە ژمارە (١٣)ی کانوونی دووەمی (١٩٧٥)ی گۆڤارە گۆڕین دا چاپ بوو. هەر ئەو کات من و کاك ساڵەو خوا لێخۆش بوو، سوارەی ئیلخانی، هەریەکە بەش بەحاڵی خۆمان بەبۆچونی جیاوازەوە وتار گەلێکمان لەم بابەتەوە نوسی و بڕیار بوو لەژمارە (١)ی خولی دووەمی نووسەری کورد دا، چاپ بکرێ، بەڵام کارەساتی دڵتەزێنی (١٩٧٥) ڕوویداو، هەموو شتێك بووە بەهیچ.

لەو وتارەی گۆڕین دا، دوکتۆر کەمال فوئاد، لەقەولی خوالێخۆش، بوو پرۆفیسۆر تەوفیق وەهبی بەگەوە دەنوسێ، کەئەم شیعرە لەلایەن، دوکتۆر سەعیدخانی کوردستانی و داماو موکریانییەوە سازکراوە.

### دوکتۆر سەعید کوردستانی کێیە؟[٣٤]

(١٢٧٩ - ١٣٥٨ك) - (١٨٦٢ - ١٩٣٩ز)

دوکتۆر سەعید کوڕی مەلا ڕەسوڵەو، باوکی لەکوردەکانی سەرسنوری تورکیایەو، لەسەرەتای سەدەی (١٣)ی کۆچی‌یەوە هاتووەتە مەریوان و پاشان چووەتە شاری سنە.

سەعید لە سنە لەدایك بووەو لەسەرەتاوە لای باوکی قورئان و عەرەبی و فارسی خوێندووە، پاشان بووەتە فەقێ لەمزگەوتی (دار الإحسان)ی شاری سنەدا دەخوێنێ.. لە (١٣)ساڵیدا بووە باوکی کۆچی دوایی کردووە، لەساڵی (١٣٠٥ ك)دا هەندێ لە(فەلەکان) بۆ پەرەپێدانی ئایینی مەسیحی هاتونەتە سنەو لەوێ نیشتەجێ دەبن، یەکێ لەقەشەکان بەناوی (کاشا یوحەنا) کەشارەزایی باشی هەبووە لەزمانەکان بەتایبەت پارسی، بەشوێن کەسێکی زیرەك و وریادا دەگەڕێت کەفێری زمانی پارسی بکات و پاشان بیکاتە مەسیحی.. یوحەنا لەماوەیەکی کەمدا، ئاشنا دەبێ بەفەقێ سەعیدو، دۆستایەتی پەیدا دەکەن و، بەوشەی جوان و ڕازاوە بەپەڕاوو کتێبی سەرنج ڕاکێش دڵی سەعید ڕادەکێشێ، پاش مشت و مڕێك سەعید دەبێت بەمەسیحی‌و، یوحەنا پێی دەڵێ:

(یا بني العزیز لقد أختارك الله وحدك من بین آلاف الناس ...) پاش ماوەیەك سەعید لەژێر فشاری خەڵکی سنەدا دەچێتە هەمەدان و تێکەڵاوی زیاتری ئەرمەنی و جولەکەو مەسیحی‌یەکان دەکات و، جلی ئەرمەنی لەبەردەکات و قژ دەهێڵێتەوەو مێزەرە سپی‌یەکەی لادەبات و مەلا سەعید دەبێت بەمیرزا سەعید. هەر لەوێ فێری زمانی E دەبێت و دەبێتە هاوکاری دوکتۆرێك، هەر لەوێ بڕیار دەدات بەتەواوی هەوڵ بدات بۆ بلاوکردنەوەی مەسیحیەت وەبڕیاریش دەدات کەهەوڵ بدات ببێتە پزیشك.

سەعید لەهەمەدان بوو بەمامۆستای فارسی منالەکانی کاشا شەمعون و، پاشان دڵی چووە سەر کچەکەی کاشاو، لەئەنجامدا لە(١٨٨٨/٦/٤ز) ژنی هێنا.

سەعید دوای (١٢) ساڵی مەسیحی بوونی، بڕیاری دا بچێت بۆ هەندەران ئەمەش بەهاوکاری مزگێنی دەران بووەو لەبەر چوار هۆ بوو:

- تاوەکو بەتەواوی ڕێڕەوی ژیانی بگۆڕێت.
- تاوەکو ژینگە بگۆڕیۆ بەچاوی خۆی خۆشگوزەرانی ئەوێ ببینێ.
- تاوەکو لەلایەنی ڕۆحی‌یەوە لەکەنیسەکانی ئەوێدا سوود وەربگرێت.
- تاوەکو خوێندنی پزیشکی بخوێنیۆ ببێتە دوکتۆر.

لە(١٨٩٣/٦/٩) گەیشتە سویدو، پاشان چووە لەندەن و، دوای دووساڵ و نیو گەڕایەوە هەمەدان و، مومارەسەی پزیشکی کردوو، پاشان چووە تاران و گەڕاوەتەوە هەمەدان و، لەساڵی (١٣٥٨ك) لەهەمەدان مردووەو لەگۆڕستانی فەلەکان نێژراوە.

دوکتۆر سەعید، لەوکاتەی کە (عیادەی پزیشکی) دەبێت، خزمەتێکی زۆری فەقیرو هەژاران دەکات و، لەپاڵ ئەوەشدا، هەموو هیوایەکی خزمەتکردنی مەسیحی دەبێت.

مەردۆخی لەبارەی دوکتۆر سەعیدەوە دەڵێ:

(کەفەلەکان هاتنە سنە، فەقێ سەعیدیان هەڵخەڵەتاندو، ئەویش چوو لەگەڵیانداو، ژنی لەوان هێناو پاش ماوەیەك بووە بەپزیشك و، هەرچەندە ڕێو ڕچەی خۆی گۆڕیوەو بووەتە فەلە، بەڵام هەستی کوردایەتی ئەو زۆرتر بووە، تەنانەت ئەو نامانەی کەبۆ من ئەینوسی کوردیيە، لەم دواییەشدا پەڕاوێکی بەکوردی لەبارەی پەرەپێدانی ئاییینی مەسیحی بەناوی (نزانی، مزگانی) بەهۆنراوە هۆنیوەتەوەو نوسخەیەکی بۆ من ناردووە).

م. صدیق بۆرەکەیی دەڵێ:

لەکۆڕێك دا لەمامۆستا موحیتی تەباتەباییم بیست وتی:

دوکتۆر سەعید لەکاتی هۆنینەوەی پەڕاوی نزانیدا، زۆربەی پەرتوکەکانی یارەسانی لەنور عەلی ئیلاهی ڕێبەری یارەسانەکان وەرگرت، بۆ ئەوەی چەشکە وێژەییان لێ وەربگرێو، گەلێ لەو وشانەش کەلەسەرەنجام و پەڕاوە ئایینیەکانی یارەسان دا هاتووە، ئەو لەپەڕاوەکەیدا بەکاری هێناوە.

دوکتۆر سەعید ، پەڕاوی (نزانی، مزگانی) سەبارەت بەئاییینی فەلە هۆنیوەتەوەو، ئەتوانین بڵێین کەپەڕاوی (ئینجیل و تەوراتی) وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و، بۆ هەر باسێك سەردێڕێکی داناوە، ئەمەش چەند دێڕێك لەو شیعرانە:

سەبارەت بەگەڕانەوەی عیسا دەڵێ:

بەڵێ ئازیزم، خاطر جەمعەنان پەی شنۆی دەنگش، تەواو سەمعەنان

بەوادەکەی وێش، مەکەرۆ وەفا عیسا هۆرگێڵو، دیسان نەسەما

لەکۆتایی بەشی پەڕاوەکەیدا دەڵێ:

ویەردن دەیسا، ئاغەگیان دێرەن تەشریف باوەرە، ئۆغرت خێرەن

هۆنراوەکانی سەعیدخان، زۆر تەڕوو پاراوو ڕەوانن، دەستێکی باڵای بووە لەهۆنینەوەی هۆنراوەداو، وشەی کوردی پەتی زۆری بەکار بردووە.

ئەحمەد شەریفی لەبارەیەوە دەڵێ:

لەوکاتەی کەلەئەوروپا دەبێ، عیسایی‌یەکان هەوڵ دەدەن بمێنێتەوە، بەڵام ئەو دەگەڕێتەوە تا خزمەتی کورد بکات و، ئەوەڵین دوکتۆر دەبێت کەلەسنەدا عیادە دەکاتەوە بەخۆڕایی خەڵك چارەسەر دەکات.

بەڵام مەلایانی سونی دەمارگری دەکەن، جگە لەئایەتوالله مەردۆخ، کەدۆستایەتی‌یەکی خۆشی لەگەڵ دوکتۆر سەعیدخان هەبووە، خەڵکی نەزان و ساویلکەی لێهان دەدەن و ماڵ و مەتەبی لێئاگر دەدەن و، کارێکی بەسەر دێنن، کورد گوتەنی مەگەر با بەدەواری شڕو، سەرما بەهەتیوی بکا. دوکتۆر سەعید، بەیارمەتی ئایەتوالله مەردۆخ لەکوشتن و بڕین ڕزگاری دەبێ‌و، شەوێك ڕادەکات و دەچێتە هەمەدان و، لەوێش مەتەب دادەنێ‌و لەسەر دەرگای مەتەبەکەو، بیمارستانەکەی دەنووسێ (هەموو کوردێك بەخۆڕایی چارەسەر دەکرێ)[٣٥] و سەرەنجام هەر لەهەمەدانیش کۆچی دوایی دەکات.

دوکتۆر سەعیدخان، کەڕەگی کوردایەتی وەجۆش دێ، بۆ ئەوەی خزمەتێکی فەرهەنگی، بەکوردان کردبێ‌و قەشەکانی مەسیحیش کارەکەی بۆ چاپ بکەن، دینی تەواوی ئینجیلی پیرۆز بەجوانترین شێوە، دەکاتە شیعری هەورامی‌و، لەتوێی کتێبێکی نزیك (٩٠٠) لاپەڕەیی‌دا، بەسەرەتایەکی خۆی و سەرەتایەکی (تەقی زادە) کەیەکێك لەپتەوە ئەدەبیەکانی فارس بووە، کتێبە گۆڕین بەناوی (مزگانی)، لەلەندەن لەساڵی (١٩٢١ز) بەچاپ دەگەیەنێ.

دوکتۆر سەعیدو تەقی‌زادە، کەپێم وایە، ئەو کات وەزیری (معارف)ی ئێرانی بووە، لەسەرەتای کتێبە گۆڕین دا، زۆر بەوردی باسی زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی دەکەن و دوکتۆر سەعید هەر بەچاپ کردنی ئەم کتێبە واز لەخزمەت بەفەرهەنگی کوردی ناهێنێ و، لەهەمەدان دافەرهەنگێکی کوردی – فارسی و ئینگلیزی دەنووسێ کەبەداخەوە، ئەم فەرهەنگە جارێ بێ سەرو شوێنەو چاپ نەکراوە، بەڵام لەوەی کەئەم کارەشی کردووە، شك و گومان نیە، چونکە من بۆ خۆم لاپەڕەیەکی ئەو فەرهەنگەم لەساڵی (١٤٥٥) هەتاوی‌دا[٣٦]، لەتاران لەکتێبخانەی (انجمن کتب مقدسە)ی مەسیحیەکان دا، بینی کەبەخەتی خودی دوکتۆر سەعیدخان بوو.

دوکتۆر سەعیدخان، چ ئەو ماوەیەی لەهەمەدان بووەو چ ماوەیەکە کە، لەتاران دا ژیاوە، نێوان خۆشی و دۆستایەتیەکی باشی لەگەڵ شاعیران و نوسەرانی تاران دا هەبووە، کەیەکێك لەوان (ملك الشعراء - بهار) بووە. وەك (ملك الشعراء) دەنوسیٚ، لەکاتی نوسینی کتێبی (شعر در ایران)دا یارمەتی لە دوکتۆر سەعیدخان دەخوازێ، هەتا بەڵگەیەکی لەبارەی شیعری کۆنی کوردەوە پیٚ بدا، جاپێم وایە (دوکتۆر سەعیدخان) ئەم شیعرەی (هورمزگان)ی داناوەو داوی‌یە بە (ملك الشعراء) بلأوی کردووەتەوە...)

## چەند سەرنج و تێبینی‌یەك لەسەر ئەم شیعرە:

بەڕێز ئەحمەد شەریفی دەڵێ[٣٧]:

(شیعری (هورمزگان) هەروەك دەبیندریٚ (قافیە)ی هەیەو (قافیە)کەشی زۆر لەشیعرەکانی کتێبی (مزگانی) دوکتۆر سەعیدخان دەچیٚ. (بەداخەوە ئێستا کتێبی مزگانی لەدەستدا نیە، هەتا نمونەیەکی لیٚ پێشکەش بکەم، با ئەمە بمێنیٚ بۆ دەرفەتێکی ترو باسێکی تێرو تەسەل لەسەر دوکتۆر سەعیدخان).

شیعری کوردی پێش ئیسلام و سەرەتای ئیسلام و ئەگەرچی ئێستا جاریٚ نمونەی‌مان لەدەست دا نین، بەڵام پێم وایە، دەبیٚ شیعری هیجایی و پەنجەیی بووبیٚ، چونکە زوربەی هەرە زۆری بەیتەکانی کوردی و شیعری گۆرانی کوردی - بەهەموو زاراوەکان - هەر شەکلی پەنجەیان هەیە، ئەی چۆن دەبیٚ شیعرێکی وەك (هورمزگان)، کەلەسەرەتای پەلاماری عەرەب بۆ کوردستان هۆنراوە، قافیەی شیعری عەرەبی هەبیٚ؟! لەلایەکی دیەوە: ئەگەر بیژین، نەخێر ئەو شیعرە ڕەسەنەو کاری ئەم سەردەمەی ئێمە نیە، چەند پرسیاری تر دێتە پێشی!.

١- ئەو پارچە پێستە ئاسکەی کەئەم شیعرەی لەسەر نوسراوە چی لیٚهاتووە؟

٢- ئەم شیعرە بە چ خەتێك لەسەر ئەو پارچە پێستە نووسراوە؟

٣- کیٚ خوێندویەتی‌یەوە؟

٤- کام پرۆفیسۆری خەت ناسی ئێرانی یان خارجی، ئەو کوردی‌یەیان زانیووە، هەتا پارچە پێستە گۆرین بخوێننەوە؟

٥- بۆ شیعرەکە قافیەی هەیەو پەنجەیی نی‌یە؟

٦- بۆ بەجیاوازی‌یەوە، لەکتێب و گۆوارەکانی کوردی‌و فارسی‌دا، چاپ بووە؟

٧- وشەی (شن) بەمانای (ژن) لەچ زمان و زاراوەیەکدایە؟ چونکە ئەم وشەیە بەئاوێستایی (غن) و بە پەهلەوی (زن) و بەهەموو شێوەو زاراوەکانی گۆرانیش هەر (ژن)ە، ئەی (شن) لەکوێ‌وە هاتووە؟

٨- وشەی (گنای یا گونای) بەمانای (گوندو دێ‌و ئاوایی) وشەیەکی کرمانجی سەرووە، لەم شیعرەدا چ دەکا؟ ئایا نیشاندەری ئەوە نیە، کەکوردی زانێکی باش و باسەواو ئاشنا لەگەڵ زاراوەی کرمانجی سەرو داینائوە!؟ چونکە بەزاراوەکانی گۆرانی دەبێتە (دەگا).

٩- وشەی (هورمزگان یا هرمزگان) بەمانای پەرستگەو ئاتەشگە، لەم شیعرەدا چۆن سازکراوە؟ چونکە ئەم وشەیە، بەم مانایە نەلەزاراوەکانی کوردی‌دا هەیەو، نەلە ئاوێستاو نەلەپەهلەوی‌دا، بەم شێوەیە وشەیەکی ئاوا نیە ئەم مانایە بدات.)

- م. عەلائەدین لەمێژووەکەیدا ل(١٢٩)دا کەباسی ئەم شیعرە دەکات دڵنیا نی‌یە لەڕاستی‌و دروستی، بەڵکو بەگومانەوە بڵاوی کردوەتەوە، دەڵێ: گوایا ئەم زمانی کوردی‌یە لەدەمەدەمی هاتنی ئیسلامەتی‌دا شعری پێ‌وتراوەو شعرەکانیش ماونەتەوە. ئەمەش بەقسە: پارچە چەرمێك لەم ساڵانەی دوایی‌دا لەئەشکەوتەکانی (جێشانە) و (هەزارمێرد)ی سولەیمانی‌دا دۆزراوەتەوە.

... ناتوانم بچمە ژێری بڵێم: بونەکەی ڕاستە یاڕاست نیە، چونکە نەخۆم ئەم پارچە چەرمەم دیوە کەئەم شعرانەی لێ‌نوسراوەتەوە، وەنەلەقسەی ڕۆژهەلاتی ناسێکیشدا بەرچاوم کەوتووە، بەڵکو تەنیا قسەیەکە لەمامۆستا ڕەشید یاسەمی لەلاپەرە (١٢٩)ی کتێبەکەیا (کورد) باسی ئەکا، ئەویش بەبێ ئەوە بیگەیەنێتەوە بەکەسێك یاسەرچاوەیەك...).

- دەربارەی ئەم هۆنراوە م. فاروق حەفید دەڵێ:[٣٨]

لەبارەی دەستنوسەکەمەوە بەناونیشانی لەبارەی پەندی پێشینانی کوردەوە، ساڵی (١٩٧٠ بۆ ١٩٧١) کەماستەرم بەدەستهێنا لەزانکۆی ناوبراو، لەوتوێژی ئەم کتێبەمدا، لەگەڵ پرۆفیسۆر -ئەندراش- لەسەر بەشێکی مێژوویی کەلەنوسراوی بەهەشتی مامۆستا عەلادین سجادیەوە، وەرم گرتبوو، ئەم دێرە هۆنراوەیە بوو کەدەڵێت:

هرمزگان رمان ئاتران کژان | ویشان شاردەوە گەورە گەورەکان ...هتد.

پرسیاری لێکردم کەئەم پارچە هەڵبەستەت لەچ سەرچاوەیەك وەرگرتووە، وتم: لەکتێبەکەی مامۆستا عەلادین سجادی‌یەوە، وتی: ئایا ئەم دۆکۆمۆندە مێژووییە لەکتێبخانەکانی جیهاندا هەیە؟ وتم: نەخێر. وتی: کەواتە ئەمە ڕاست نیەو ساختەیە.

- م. محەمەد ئەمین هەورامانی - هەرچەندە قەناعەتی فیکری هەیە کەئەم شیعرە ڕاستەو تەواوەو قسەو باسێکی لەسەر کردووە.. کەچی نازانێ سەرو بنی ئەم شیعرە لەچی‌یەوە هاتووەو، بۆکوێ چووە!؟ ئەوەتا بەم شێوەیە باسی ئەم هۆنراوەیە دەکات[٣٩].

... بەهەحاڵ، لەو دەنگ و باسانەدا کەلەناو ئەو سەرچاوانەدا هاتووە، وەها لەقەڵەم ئەدرێ، کەئەو پارچە چەرمە، لەئەشکەوتێك دا، لەناوچەی سلێمانی دۆزراوەتەوەو بەئەلف و بێ‌ی ئارامی (پالەویی، دەم) نوسراوەو براویشە بۆ ئەوروپا (لەندەن، پاریس) یان هەرجێگایەکی دیکەی ئەوێو ئەوجا، حاڵی حازر چۆنەو لەکوێیە نازانرێو منیش بەش بەحاڵی خۆم نەمتوانی سۆراخی بکەم...

لەشوێنێکی تردا دەڵێ[٤٠]:

- لەسنەدا دەنگوباسی (ماریفەت و پیرشالیاری)و، سەرگوزشتەی شەڕەکانی نێو خەڵکی هەورامان و سوپای ئیسلام و، پەخشانی کۆنی ئەو سەردەمەو، لەگەڵ دەنگ و باسی هەندێ شیعری کۆنەی سەردەمی سەرەتای هاتنی ئیسلام، بۆ ناوچەکانی شارەزوورو بناری شاخەکانی هەورامان، بەتایبەتی ئەوانەی دەنگ و باسیان لەلایەن عەلائەدین سجادی و ڕەشید یاسەمی‌یەوە (گیانداران...) بڵاوکرابونەوەو دەکەوتە بەرگوێ، بەلأم لەگەڵ هەوڵێکی زۆردا، نەتوانرا شوێنەواریان بدۆزرێتەوە!

لەسەر ئەم نوسینەی مامۆستا هەورامانی کۆمەڵێك پرسیاری تر دروست دەبن، لەوانە:

- دەڵێ: (لەو دەنگ و باسانەدا)، (وەها لەقەڵەم دەدرێ) ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەدەنگ و باسن و دڵنیا نیە لەڕاستی مەسەلەکە.

- دەڵێ: (لەئەشکەوتێکی ناوچەی سلێمانی) باشە، خۆ مامۆستا خۆی خەڵکی پارێزگای سلێمانی‌یەو تەمەنێکی گوزەراندووە، ئارەزوو تاقەتی ئەو شوێن و نوسراوانەی هەیە، بۆ لەسلێمانی‌دا نەگەڕا تاسۆراخی ئەم مەسەلەیە بکات... بەس چونکە هۆنراوەکە دژایەتی‌یەك دەکات لەگەڵ ئیسلام دا، بێ سێو دوو، وەرگیراوەو بڵاودەکرێتەوە.

– دەڵێ: (براوە بۆ ئەوروپا (لەندەن، پاریس) یان هەر جێگایەکی دیکەی ئەوێ) ئەمیش دڵنیا نیە بەتەواوی بۆ کوێ براوە.

– ئەوەتا قەباڵەکان چونکە ڕاستەو تەواوە، کەس ناتوانێ نکولی لێبکات چونکە:

– دەزانرێ لەکوێ دۆزراونەتەوەو کێ دۆزیونیەتەوەو براون بۆ کوێو ئێستا لەکوێن و، وێنەی خەتە ئەصلیەکە، لەکتێبەکاندا هەن و ناوی ئەو زانایانەی کەکەوتونەتە دەستیان...هتد هەمووی دیارەو ئاشکرایە، هەم (م. محەمەد ئەمین لەمێژووەکەی‌دا (ل ٨١-١١٣) هەم لەکتێبەکانی تردا وەڵامی هەموو هەیە، بەتایبەت (د. جەمال ڕەشید) لەکتێبی (لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری) زۆر جوان و پوخت ڕاستی‌یەکان دەخاتەڕوو.

– دەڵێ: (حاڵی حازر چۆنەو لەکوێیەو نازانرێ و منیش بەش بەحاڵی خۆم نەمتوانی سۆراخی بکەم) ئەمە هەموو گومانە لەسەر ڕاستی ئەم شیعرە.

– دەڵێ: (لەگەڵ هەوڵێکی زۆردا نەتوانرا شوێنەواریان بدۆزرێتەوە!) بۆچی بۆ قەباڵەکان شوێنەوار هەیە؟ بۆچی بۆ ئەم شیعرە شوێنەوار نیە؟ ئەوە پرسیار دروست دەکات.

بابزانین بۆچوونی (د. جەمال نەبەز) مامۆستای ئیتنۆلۆژیای گەلانی ئێران و زمان و کولتوری کورد لەزانستگەی ئازاد لەبەرلین و ئەندامی کۆڕی لێکۆڵینەوەی زانستانە لەئەڵمانیا، لەپەڕاوەکەیدا (زمانی یەکگرتووی کوردی) ل (١١١)دا چی دەڵێ لەم بارەوە لەسەر ئەم شیعرە:

(... ئەمە (٥٠) ساڵ پترە کەلەگەڵ سەرچاوەی کوردی و بێگانەدا، هەواڵێك بڵاودەکرێتەوە، بەو بۆنەیەوە کەگوایە دەروێشێك لەدەشتی شارەزوور، پارچە پێستێکی دۆزیوەتەوە، بەڕێنوسی پەهلەوی چوار دێڕ هۆنراوەی کوردی لەسەر نووسراوە کەهۆنەرەکەی گوایە ئاخ و داخی هەڵکێشاوە بۆ ئایینی زەردەشتی کەچۆن لەلایەن هێرشبەرانی عەرەبی موسڵمانەوە، لەنێوبراوەو سکاڵا لەدەست ئەو هێرشبەرانە دەکا کەچۆن ژن و کچی کوردیان بەدیل گرتووەو خوێنی خەڵکیان ڕشتووە.

ئەوی ڕاستی بێ، ئەم هۆنراوەیە هۆنراوەیەکی ساختەو دەستکردەو بەپێی زانستی زمانەوانی دەتوانین پیشانی بدەین کەکوردی‌یەکەی ناتوانێ ببێتە کوردی دەوروبەری پەیدا بوونی ئیسلام).

لەکۆتاییدا: لەڕوانگەی ئەمەی کە گەلاڵەمان کردووە دەڵێین:

ئێمە وای بۆ دەچین ئەم هۆنراوە، هۆنراوەی د. سەعیدخانی کوردستانی‌یەو ئەو خۆی دایناوەو داویەتی بە (ملك الشعراء - بهار)و، لەوانەیە مەردۆخیش هەر لەدوکتۆرەوە وەری گرتبێ، پاشان حوزنی موکریانیش دەستی کەوتبێ و بڵاوی کردبێتەوە، دوور نیە یەکەمجار حوزنی لەگۆڤاری کوردی‌دا ئەم بڵاوی کردبێتەوە. دواتر یاسەمی و سجادی و کەسانی تر خستوویانەتە پەڕاوەکانیان. بێگومان دوکتۆر دەستێکی باڵای هەبووە لەهۆنینەوەی هۆنراوە، ئەوەی کەپەڕاوی (نزانی، مزگانی) بخوێنێتەوە ئەوەی بۆ دەردەکەوێ.

**ئەمە بۆ کراوە؟**

بەو شێوەیە (ئاغای شەریفی) دەڵێ: (مورتەدی سەعیدخان) و پەیوەندی بەموژدەدەرەکانەوەو، دەمارگیری نەتەوایەتیش ڕۆڵی بینیوە.

نوسەرەکانی تریش هەرچەندە هێمای ئایینی‌یان پێوەیە، بەلام نوسراوەکانیان دژایەتی ئیسلامیان زۆر پێوە دیارەو دەمارگیری نەتەوایەتیش یان بووە، هەرچەندە نوسینەکانیان خزمەتێکی زۆری کوردیان کردووە. جارجارەش لەمەسەلە ئایینیەکاندا هەڵەی گەورەیان کردووە، بەڵکو هەندێکیان چونکە دژایەتی ئیسلام دەکەن، بێ سێ‌و دوو ئەم هۆنراوەیان وەرگرتووەو گەورەیان کردووەو بڵاویان کردوەتەوە، چونکە لەبەرژەوەندی بیروبۆچونەکەیاندا بووە.

هەشیانە بێ لێکۆڵینەوە شتەکەی بیستووەو بڵاوی کردووەتەوە، بێ ئەوەی مەبەستی دژایەتی ئیسلام بێ"[٤١]

**٢- ڕەئیەکی تر دەڵێ:**

لەسەردەمی مەئمون و هارونە ڕەشیدی عەباسی‌دا، خەڵکی هەورامان، هێمان موسڵمان نەببوون، (ساڵانە)یان بەحکومەتی عەباسیان دەدا، لەم سەردەمەدا، خانمێ فەرمانڕەوای هەورامان بووە[٤٢]. ئەو خانمە لەدەوروبەری ساڵی (٢٣٠ ك)دا ژیاوە[٤٣]. ئەمەش لەوەوە دەرکەوتووە، کەلەم دواییەدا لەناوچەکانی بێساران دا لەلایەن مەلا (قەحطان) ناوێکەوە سکەیەك دۆزراوەتەوە کەساڵی لێدانەکەی ئەو ساڵەیە، وێنەی سەری ئافرەتێکی پێوەیەو، دیوەکەی تریشی بە (ئەلف وبێ)ی عەرەبی ساڵی لێدانەکەی کە(٢٣٠ك)یە لەسەریەتی. دراوەکە لە(بورنز) دروستکراوەو هەندێ پیتی لەسەرە لەبەر ساف بوونی دراوەکە ناخوێنرێنەوە، بەڵام لەوە دەکات ناوی خانمەکە (بوران دوخت)بێ.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەخەڵکی هەورامان، تا ئەوکاتە خۆیان حوکمی خۆیان کردبێ‌و، تەنها (شاخانەی) ساڵانەیان بەدەوڵەتی بەغدا دابێ. چونکە ئەگەر وانەبوایە دەبوایە، دراوەکە دراوێکی عەرەبی بوایەو پتر لەوەش سەرانسەری مێژووی دەوڵەتی ئیسلام، تاوەکو ئەو دەمەی فەرمانڕەوایی (مەئمون)، ژنە حاکمێکی عەرەب بەناوی‌یەوە، دراوی لێ نەداوەو حاکمیش نەبووە!.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەم ژنەی ئەم دراوە، سەری ڕووتەو هیچ شتێکی لەسەردا نیە، وەئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کەئەو ژنەی ئەو دراوە، عارەب نەبووە! ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کەخەڵکی ناوچەکانی هەورامان تا ئەو دەمە ئیسلام نەبوون! یاخود ئەگەر ئیسلامیش بووبن، هەر تەنها ساڵانەیان داوە[٤٤].

ئەم بۆچوونە: جێگەی تێبینی‌یەو نزیکە لەعەقڵەوە، چونکە موسڵمانەکان مامەڵەی ئەهلی کیتابیان کردووە لەگەڵ کوردا. ئەوەتا ئیمامی عومەر فەرمویەتی: (سنوا بهم سنه أهل الکتاب) وە ئیمامی عەلیش فەرموویەتی: (فعاملوهم معاملة أهل الکتاب)[٤٥].

بەلاّم ئەوەی جێگەی تێبینی‌یە ئەوەیە:

لەسەردەمی خەلیفە عوسماندا، هیچ خاکێکی کورد نەماوە، لەژێردەستی هیچ لایەکدا بێت، هەر هەمووی کەوتووەتە دەستی موسڵمانەکان و، کوردەکان خۆیان یەکلا کردووەتەوە بۆ ئایینی ئیسلام[٤٦].

**٣- ڕەئی سێهەم دەڵێت:**

کەئایینی ئیسلام هاتە شارەزوور، خەڵکی هەورامان بەزارەکی موسڵمان بوون، لەشەڕوشۆڕ خۆیان پاراست، بەلاّم لەژێرەوە پەیڕەوی ئایینی زەردەشتیان کردووە، بەتایبەت بەشی هەورامانی ئێران. لەدواییدا لەئەنجامی تێکەڵاویان بەئارەزوو مەیلی خۆیان، لەسەردەمی پیرشالیاری دووەم و بەتایبەت تر لەسەردەمی گوشایش کوڕی پیر محەمەددا موسڵمان بوون و، ئیسلام بەتەواوی لەناویاندا گەشەی سەندووە[٤٧].

ئەم ڕایەش هەرچەندە بەڵگەی ڕۆشن نیەو، سەرچاوەکان دیار نین، بەلاّم هەرچۆن بێت، ئەمیش ڕایەکەو، لەوانەیە ڕاست بێت، پیرەکان خۆیان و خەڵکەکەیان دور خستبێتەوە لەشەڕو شۆڕ، بەلاّم ئەی وتەکانی پیرشالیار چی لێدەکەی کەدەڵێت:

هۆشت جەواتەی پیرشالیار بۆ     گۆشت جەکیاستەی زانای سیمار بۆ

لێرەدا: یا دەبێت (زانای سیمار) (مەبەستی زەردەشت) بێت، یاخود ئەگەر بەمەبەستی (محەمەد پێغەمبەر بیٚ) "د.خ" تۆ بڵێی ئەمانیش تووشی دەردی ئەهلی كیتاب هاتبن، كەلەكتێبەكانیان هاتووە كەپێغەمبەرێك دێت بەم ناوو نیشانەو ناوی ئەوەیە كەچی بەگوێیان نەكرد.

(وإذ قال عيسى ابنُ مَريَمَ يا بَني إسرائيل إنّي رسولُ اللهِ اليكُم مُصدقاً لِما بينَ يَديَّ مِنَ التوراةِ وَمُبَشراً بِرَسولٍ يأتي مِن بعدي اسمهُ أحمَد فلَمّا جاءَهم بالبيناتِ قالوا هذا سِحرٌ مُبين) الصف٦.

٤- ڕەئی چوارەم دەڵێت(٤٨):

ناوچەی شارەزوورو هەورامان، نوێنەریان چووە بۆ خزمەت پێغەمبەر - د.خ- گەڕاوەتەوە هەورامان و، كاتێك كەسوپای ئیسلام نزیك بووەتەوە، ڕێكەوتنێكیان مۆر كردووەو بەنهێنی موسڵمان بوون، دوایی دژی فارسەكان ڕاپەڕیون و، موسڵمان بوونی خۆیان ئاشكرا كردووە.

ئەم ڕایەش ڕایەكی ترەو بۆچونەو هەندێك قسەو باسی خۆی هەیەو، وەك لێكدانەوەو تەحلیلێك.

گوایا كەسوپای ئیسلام دێتە هەرێمی چیا (كوردستان)ەوە ناوی هەورامان یا ناوی گوندو ناوچەكانی نیە، لەگەڵ ئەوەی ناوی (حەڵوان و خانەقین و قەسری شیرین و شارەزوورو قرماسین (كرماشان)و دینەوەرو هەمەدان و مەهاباد و مەرگەو مەراغەو ئامێدی و هەرێمی جەزیرەو بۆتان و خورماڵ ... هتد هاتووە).

ئەمەش لەبەر ئەوە بووە كەناوی (هەرێمی شارەزوور) هاتووە، ئەم هەرێمەش فراوان بووە، ناوچەی هەورامانیش دەكەوێتە ناو هەرێمی شارەزوورەوە(٤٩). جگە لەوەش ناوجەرگەی هەرێمی شارەزوورو گەورەترین شاری (شاری زوور = گوڵ عەنبەر = خورماڵ) بووە، ئەم شارەش ئەگەر بەهەورامان دا نەنرا بێت، خۆ نزیكترین شارە لەهەورامانەوە.

كەواتە:

حاڵی ناوچەی هەورامان، لەگەڵ هەرێمی شارەزووردا بووە، هەرچەندە ناوچەكە هەندیٚ تایبەتمەندی خۆی هەبووە، هەروەها بۆیە ناوی گوندو ناوچەكە نەهاتووە، چونكە سوپای ئیسلام لەدەڤەرەكەدا شەڕو شۆڕی نەبووە، كەسوپای ئیسلام دەگاتە (جەلەولا)، پێش دەستپێكردنی شەڕ، وەفدی كورد لەشارەزوورەوە دەگاتەلای سوپای ئیسلام و پێش ئەوەی قاچ بخەنە ناو

کوردستانەوە، چەند خاڵێك مۆر دەکات، بەنهێنی فارسەکانەوە، وەك مامۆستا ئەمین زەکی باسی دەکات:

لەدەرکەوتنی ئیسلامەتیدا، هەر لەیەکەم پەیوەندییان لەگەڵ ئیسلامەکان دا تێفکرین و بینیان کەئەم ئایینە تازەیە بەتەواوی موافقی طه بع و ویژدانیانە ...لەبەر ئەوە بەئاسانی و بەرەبەرە قبوڵیان کرد[٥٠].

ئەم ڕێکەوتنە بوو بەهۆی بەرپاکردنی شۆڕشێك لەشارەزوور، کەزۆر لەمێژوونوسان، چاویان لێنوقاندووەو، باسی ناکەن. چونکە جێی شانازی و فەخری کوردە. بەنزیك بونەوەی سوپای ئیسلام، بۆ کوردستان، لەسەر ڕێکەوتنی پێشوو، لەشارەزوورو هەورامان و شاربازێڕ، ڕاپەڕینێکی جەماوەری لەدژی دام و دەزگاو مەخفەرو سەربازگەکانی فارس ڕوو دەدات و ناوچەکە پاك دەکەنەوە[٥١].

نزیکترین ناوچە، لەحەڵوان و خانەقین و جەلەولاوە، شارەزوورە... مەیلی خەڵکی زەردەشتی شارەزوور، بەلای موسڵمانەکاندایەو، بەتایبەتی کەلە ئاوێستای زەردەشت و ماریفەتی پیرشالیاردا، هێمای بۆ ئیسلام و محەمەدو ئایینی خودا کردووە...[٥٢].

دەبێ ئەوەش بڵێین: کەلەکاتی خۆیدا لەقۆناغی بانگەوازی مەککەدا، نوێنەری ئەم ناوچەیە، لەحەڵوان و جوانڕۆو شارەزوورەوە بەناوی (کابانی کوردی) گەیشتووەتە حجازو، هەواڵی ڕاست و دروستی محەمەدو -د.خ- ئایینەکەی، بۆ خەڵك هێناوەتەوە، وە (ئەبو یەحیا) مەهدی کوڕی مەیمون کوڕی جابان، یەکێك بووە لەزاناو پارێزەرانی وتەکانی پەیامبەرو گەڕاوەتەوە کوردستان و، لەسالی (١٧٢ك)ی وەفاتی کردووە[٥٣].

هەورامانێك، خاوەنی (مەرێو ژیرلاو پاوەرو ماریفەت بێ)و، ئەو هەموو پیرانەی هەبوو بێت، کەهەر یەکەیان دانشمەندێك و دانایەك بووە بۆ خۆی، ماریفەتێك لەکۆتایی بەندەکانیدا بڵێت:

هۆشت جەواتەی پیرشالیار بۆ      گۆشت جەکیاستەی (زانای سیمار) بۆ

هەورامان خاوەنی ئەمەیە بۆیە دەوترێت:

کەوابوو: ئەو بۆچوونە نزیکە کەجابان بەخاوو خێزانەوە، بەنهێنی فارسەکانەوە لەلایەن (٩٩) پیرەی هەورامان و شارەزوورەوە، نێردرابێ، بۆ هەواڵ و زانینی پەیدا بوونی پەیامبەری چاوەڕوان کراوی ناو مژدەکانی ئاوێستا[٥٤].

بەهەرحاڵ:

– ئەگەر بۆچوونی یەکەم ڕاست بێت، واتە: ماوەیەك شەڕ کراوەو، کەچی نەتوانراوە هەورامان بگرن و بەرەنگاریان کردووە، بەڵام دوایی خۆیان موسڵمان بوون.

– ئەگەر بۆچوونی دووەم ڕاست بێت، واتە: مامەڵەی (ئەهلی کیتاب) یان لەگەڵ کراوەو سەرانەو (جزیە)یان داوەو، دووایی خۆیان موسڵمان بوون.

– ئەگەر بۆچوونی سێهەم ڕاست بێت، واتە: هەر لەسەرەتاوە خۆیان بەزارەکی بەموسڵمان دەرخستووەو، کەچی لەژێرەوە لەسەر ئایینی خۆیان بوون، بەڵام دوایی کەئایینەکەیان ناسیوە، قەناعەتیان پێکردووەو موسڵمان بوون.

– ئەگەر بۆچونی چوارەم ڕاست بێت، واتە: هەر هەواڵی ئایینە تازەکەیان بیستووە نوێنەریان ناردووەو، ئەویش گەڕاوەتەوە هەورامان و ئەمانی هێناوەتە سەر ئایینی ئیسلام. وەلەکاتی هاتنی سوپای ئیسلام دا، باوەشیان بۆ کردووەتەوە.

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت:

١– هیچ ڕەئیەکیان سەد دەر سەد بەڵگەی لەپشتەوە نیە، بەڵکو نیسبی‌یە.

٢– خەڵکی هەورامان بەقەناعەتی خۆیان موسڵمان بوون و، ئایینی ئیسلامیان وەرگرتووە. هەروا بەئاسانی موسڵمان نەبوون، دوای پرس و ڕاوێژ لەنێوان خۆیاندا بەتایبەت لەناو (پیر)ەکان دا، ئینجا موسڵمان بوون.

٣– لەسەردەمی پیرشالیاری دووەمەوە، ئیسلام لە هەورامان پەرەی سەندووەو، وەلەسەردەمی گوشایشی کوڕی پیر محەمەد دا، زیاتر جێگیر بووەو سەرتاپای هەورامانی گرتووە وەو، یاوەك (تازەکەرەوە – موجەدید)ێك ڕۆڵی بینیووە.

٤– هەورامان وەك مەڵبەندێکی ئایینی ئیسلام، لەکۆتایی سەدەی چوارەم بەدواوە، ناوبانگ دەردەکات و زانای ناودارو، کەڵە پیاوی ئیسلامی لەناوچەکەدا دەردەکەون و، تیایدا کۆدەبنەوە، وەك:

– پیرشالیاری دووەم لەساڵی (٤٨٠ك = ١٠٨٧ز) ماریفەتی دەستکاری کردووەو لەساڵی (٥٦٧ك = ١١٧١ز) کۆچی دوایی کردووە.

– سەیید ئیبراهیمی حسێنی کەبە (بابا نەوەس یا بابا نەورۆز) ناسراوە، سەردەمی ژیانی لەساڵانی (٥٠٥ك – ٥٤٦ك)یەو لەساڵی (٥٢٥ك) هاتووە بۆ هەورامان[٥٥].

– پیر محەمەد (بابا مەردۆخ) لەساڵانی (٦٨٠ك – ٧٩٠ك) ژیاوەو لە (٧٧٥ك) هاتووەتە هەورامان[٥٦].

– شێخ شەهابەدینی دزاوەری، لەساڵی (٧٧٨ك) کچی خۆی داوەتە بابا مەردۆخ و لەساڵی (٨٤٢ك) لەگەڵ گوشایشی کچەزای‌دا زۆر هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام دەدەن[٥٧].

– گوشایش کوڕی پیر محەمەد لەساڵانی (٧٩٠ك – ٨٧٣ك) ژیاوەو لەساڵی (٨٤٢ك) بەدواوە ناوبانگ دەردەکات[٥٨].

– هەروەها زاناکانی تری وەك: بنەماڵەی مەلا ئیبراهیمی بیارە، مەلا سەلام و مەلا نەزیری تەوێڵە، سەییدەکانی کەلجیو سەرگەت و خانەگاو پاوەو شێخەکانی تەوێڵەو مەلاکانی خەرپانی و نۆدشەو بێساران و ڕوارو کەیمنەو پایگەلان و ژاوەرۆو ...هتد.

**ئەوەی شایانی باسە :**

مێژووی فەرمانڕەوایانی هەورامان –وەك لەشوێنی خۆیدا باسکراوە– لەسەرو کڵاوی پیرشالیاری دووەمەوە دەردەکەوێت و ڕۆشن و دیارە.

**ماوەتەوە بڵێین :**

لەناو خەڵکی هەورامان و، هەندێ پەڕاودا، باس لەوە دەکرێ کەلەسەردەمی عومەری کوڕی خەطاب دا، سوپای ئیسلام دێتە هەورامان و ... عەبدوالله ی کوڕی عومەری تێدا دەبێت، بەفەرمانی ئەو مزگەوتی خورماڵ و بیارەو پالانیاو، تەوێڵەو پاوە، دروست دەکرێن.

بۆ وەڵامی ئەمەش دەڵێین:

ئەو کتێبانەی کەئەم باسەیان تیایە، بێبەڵگەن و سەرچاوەی باوەڕ پێکراویان دیاری نەکردووە، کەئەمەیان لەکوێ هێناوە، بۆ نموونە:

– لەمێژووی کوردو کوردستانی مەردۆخی‌دا ل (١٨٧)دا هاتووە، کەعەبدوالله ی کوڕی عومەر، بەرەو شارەزوورو هەورامان هاتووە، لەشاری (پاوە) مزگەوتێك دروست دەکات ... وەك لەپێشتر وتمان ئەم کتێبە تێبینی زۆری لەسەرەو، ئەمەشی لەکوێوە هێناوە نازانرێ.

- لە (یادی مەردان و بنەماڵەی زانیاران)، مامۆستا مەلا عەبدولکەریم خۆی دەڵێ: وا مەشهورە. وەلامیش دەداتەوە کەبڕوا ناکات.

لەیادی مەردان - بەرگی ٢ ل(٣٩٩)دا دەڵێ:

(وامەشهورە لەناو خەڵکدا، کەمزگەوتی خورماڵ و بیارە، عەبدوالله ی کوڕی عومەر دروستی کردبن)، هەروەها لەبنەماڵەی زانیاران ل(٤٢١)دا دەڵێ:

... ئەوەندە دەزانین، دەڵێن مزگەوتی بیارە، عەبدوالله ی کوڕی عومەر دروستی کردووە، لەگەڵ ئەم قسانەیشدا، لەمێژوودا نەمان دیووە کەعەبدوالله فەرماندەی سوپا بووبێت. بەڵێ دەڵێن: عەبدوالله لەو سوپادا بووە کەهاتن ئەربیلیان گرت و بەرەو خۆشناوو پشدەر سەرکەوتن...

لەهەردوکیاندا، مامۆستا دەفەرموێ: ئەڵێن - خۆیشی بڕواناکات - چونکە هیچ کتێبێکی مێژوویی کۆن ئاماژەی پێنەکردووە، ئەوەش بەرەو هەولێر، هەر وتنەو بەس.

لەکتێبی (کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا) نوسینی م. حەسەن مەحمود حەمەکەریم دا، کەبەدرێژی باسی سوپای ئیسلام و ناوی سەرکردەکان دەهێنێ، هەندێکیشیان کەشتیان لەسەر هەڵبەستوون ڕەدیان دەداتەوەو، ناوی عەبدوالله ی کوڕی عومەری نەهێناوە، کەهاتبێت بۆ شارەزوور.

**لەکۆتاییدا دەڵێین:**

- بونی ئەو هەموو مزگەوت و خانەقاو چلەخانانە...
- بونی ئەو هەموو حوجرەو خوێندنگایانە...
- بونی ئەو هەموو دوختان و بەردەنوێژانە...
- بونی ئەو هەموو زاناو شێخ و سەییدانە...
- بونی ئەو هەموو فەقێو صۆفی و موریدانە...
- بونی ئەو هەمووڕەوشت و ئاکارو کارە جوانانە ...
- بونی ئەو هەموو خەڵکە دڵپاکە، دڵسۆزە خواپەرستانە...
- بونی ئەو هەموو ... ئەمانەو چەندانی تریش لەوانە، بەڵگەو نیشانەو هێمان بۆ کاریگەری ئیسلام لەسەر خەڵکی هەورامان و بۆ ئەوەی بڵێین بەڵێ...

*هەورامان مەڵبەندێکی ئایینی بووە لەکۆن و نوێدا.*

## پەراوێزەکان

[1] لە (نژاد کورد مجله مهر، سالْ ١٢، شماره ١٢، ل: ٧٧)دا هاتووەو دەڵێ:

... شوێنی جوگرافی دینی زەردەشتی کوردستانی مەزن و ئێران و ئەفغانستان و بەشێکی هندستان بووە. لەئێراندا، ئێستەش خەڵك هەن لەسەر ئەو دینە ماون. بۆ نمونە: لەستانی کرماشاندا (١٧٠٩) کەس لەساڵی (١٩٨٧ز) دا هەبوون. لەهندستان زیاتر لەهەشتا هەزار، وەلە هەموو ئێراندا هەژدە هەزار هەن... پەیامی هەورامان ل ٣٣٣.

[2] ئایینی کورد ل: ١٨، حەسەن مەحمود حەمەکەریم.

[3] دیوانی قانع، برهان قانع- چاپی یەکەم، ساڵی ١٩٧٩ ل. ٣٤٨.

[4] ماریفەت دوو مانای هەیە:

ئەگەر لەمەعریفەتی عەرەبی‌یەوە هاتبێ ئەوە واتە: زانست و زانین، ئەگەر لەماریفەتی هەورامی‌یەوە هاتبێ ئەوە: حیکمەت و نەجیبی و پیاوەتی و ئوصول و ئادابێکی جوان دەگەیەنێ.. لەهەورامی‌دا دەڵێن: (بەڕاستی ماریفەتیش ئەرمانا) واتە ئوصول و ئادابێکی جوان و پیاوەتی نواند. دوور نی‌یە وشە هەورامی‌یەکەش لەعەرەبی‌یەکەوە نەهاتبێ.

[5] دیوانی پیرشالیاری زەردەشتی ل(٦-٨) محەمەد بەهائەدین صاحب (زانای سیمار) بە زەردەشتیش لێکدراوە - دبستان المذاهب- ل١٠ نوسینی ئەحمەد کوڕی ئەبوبەکر.

[6] پیرشالیاری زەردەشتی ل(٥).

[7] بنەماڵەی زانیاران ل (١٦٧)، مێژووی مەردۆخ ل(٦، ١٩٠) لە (٦٨٠-٧٩٠ك) ژیاوەو لە (٧٧٥ك) هاتووەتە هەورامان.

[8] گۆڤاری کاروان ژ. ٣٥، ل (١٢٥).

گۆڤاری کاروان ژ. ٣٦، ل (١٣٨-١٥٠).

بنەماڵەی زانیاران ل (٣٥٨-٣٧٢)، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس.

(بابا نەوەس، سەیید ئیبراهیمی حسێنی بووە لەنێوان (٥٠٥-٥٤٦ك)دا ژیاوەو، لە (٥٢٥ك) هاتووەتە هەورامان) وشەی (بابا)ش لەلەباتی وشەی (پیر) بەکار هاتووە.

لەگۆڤاری پەرستان ژ. (٤٥)دا حەمەکەریم هەورامی دەڵێ: باوە نەورۆز پیرێکی تر بووە، لەسەردەمی پیرشالیاردا ژیاوەو دۆستی یەکتر بوون، ئەم لەسەرگەت ژیاوەو پیرشالیاریش لەشاری هەورامان.

[9] مێژووی هەورامان ل (٦٥٠-٦٥١) کورتە باسێکی دەکات.

[10] پیرشالیاری زەردەشتی ل(٨٦).

[11] پیرشالیاری زەردەشتی ل(١٢).

---

(١٢) بنەماڵەی زانیاران ل (١١٨)، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس.
(١٣) پیرشالیاری زەردەشتی ل(١٣).
(١٤) گۆڤاری پەرستان ژ. (٤٥) حەمەکەریم هەورامی.
(١٥) بنەماڵـەی زانیـاران ل (١١٨)، هـەروەها لـە ل(١٧٥)دا دەڵـێ: (٩٩ پـیر لـەژێر دەسـتی ئەمدا پێگەیشتوون، ئەم پیر شەهریارە لەنەوەی سەید عەلی عورەیضـیـیـە، کـوڕی ئیمـام جەعفـەری صـادقە). ئەمـەش بووەتـە جێگـەی تێبینـی لای زۆرێـك لەخـەڵکی کـەزۆربـەی خانەدان و کەسایەتی‌یە ئایینی‌یەکانی کورد، کەڕشتەی بنەماڵەیان نوسیوەتەوە خۆیان بردوووەتـەوە سـەر صـەحابەکان. هەرچـەند صـەحابە جێگـەی ڕێـزو شـانازین، بـەڵام تـۆ بڵێی ئەمە ڕاست بێ‌و لەئەصلی کوردو ڕەگـەزی کـورد نـەبن و ئایـا ئـەمـە دروسـت کـراو نیە!!؟.
(١٦) مێژووی هەورامان ل(٦٤٦).
(١٧) مێژووی هەورامان ل(٦٣٦-٦٥٥) بخوێنەرەوە بۆت دەردەکەوێ.
(١٨) بێگومـان لەسـەردەمی ئـایینی زەردەشـتی‌دا کۆمـەڵێك پـیر (مـاگ - مـوغ) هـەبوون وەلەسـەردەمی ئیسـلامیش داکۆمـەڵێکی تـر هـەبوون، وەئـەم وشـەی (پـیر و بابـا)یـە، تائێستا هەر ماونەتەوە.

تێبینی‌یـەکی تـر ئەوەیـە: لەبنەماڵــەی زانیـاران ل(١٧٥) لەڕشـتـەی بنەماڵــەی سـەیدەکانی کـەلجی‌دا دەڵـێ: پیرشـەهریار کـەناوی مستەفایە کـوڕی سـەید مـەعروفی کـوڕی سـەید بابیـل کـوڕی سـەید مەسعودە...) جا بـۆ ئەمـە لەشـەوی ٩\٨-٧-٢٠٠٢ لەڕووەوەری لە هەورامان، پرسیارم لەمەلا سەید جەمال مەلاکەی ڕووە وەری کـرد، وتم دەیباشە باوکی پیرشالیار بۆ لێرەدا سەید مەعروفە و کەچی لـەزۆر شـوێنی تـردا نـاوی باوا خودادایە وتی: باوا خودادا نازناویەتی.
(١٩) سودم وەرگرتووە لەم سەرچاوانە:

- هورامان- دیاردهاو یاد بودها - أحمد نظیری.
- ڕۆژنامەی یەکگرتوو ژ(٢٧٤)، بەرواری (٢٠٠٠/٢/٤).

(٢٠) ڕۆڵی مێژوونوس، مامۆستا حەسەن مەحمود حەمەکەریم لەم بـوارەدا جێگـەی ڕێـزو سوپاسـە، کـەتا ئەندازەیـەکی بـاش، توانیویـەتی هەنـدێك هەڵـەو چەواشـەکاری ڕاسـت بکاتـەوەو، ڕاستی‌یەکان بخاتـەڕوو، لەکتێبـە مێژووییەکانیـدا ، بەتایبـەت لـەکتێبی - کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا، کەتائێستا پـەردەی لەسـەر زۆر لـەو گۆڕانـە لاداوەو بەبەڵگـەو بـەوردی بـۆ مەسـەلەکان چووەو ئامادەیشـی دەربڕیـوە لەسـەر ئـەوەی هەرکەسێك کەناوی گۆڕێکی پێ بڵێ، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەو پەیجۆیی لەسەر بکات.
(٢١) سەیری نامیلکەی (هورامان دیاردهاو یاد بودها - أحمد نظیری) بکە.

[٢٢] مێژووی کوردو کوردستان ل(٩٣) محەمەد مەردۆخی کوردستانی – و: عەبدولکەریم محەمەد سەعید.
[٢٣] پیرشالیاری زەردەشتی ل(٨–٩).
[٢٤] کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا، ل(١٧٥–١٩٠) ڕەئی زۆرێك لەمێژوونوسانی لەم بارەیەوە هێناوەو سەرچاوە ئەصلییەکانیشی دیاری کردون.
[٢٥] کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا، ل(١٧٤).
[٢٦] پەنجەکان یەکتری دەشکێنن، ل(٣٠٢) نەوشیروان مستەفا.
[٢٧] کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا، ل(٦٨، ٧٦، ٧٧).
[٢٨] ڕۆژنامەی ڕزگاری، ژ(٢) چوارشەم، (١٩٩٣/١١/٣) ساڵی یەکەم، شیعری (هورمزگان و چەند تێبینییەك) نوسینی ئەحمەد شەریفی – سنە.
[٢٩] پەیامی هەورامان – هادی بەهمەنی ل(٤٠٤).
[٣٠] کتاب (شعر در ایران) ص (٣٤) چاپ تهران.
[٣١] ڕۆژنامەی ڕزگاری ژ. ٢، (١٩٩٣/١١/٣).
[٣٢] ڕۆژنامەی ڕزگاری ژ. ٢، (١٩٩٣/١١/٣) هەروەها مێژووی هەورامان –ل(٧٨) دەقی ئەوەی (سبك شناسی) بلاْوکردووەتەوە. کەیاسەمی لەوەوە وەریگرتووە.

**ڕەشید یاسەمی کێیە؟**

ناوی (غولاْم ڕەزاخان ڕەشید سولطانە بەڕەشید یاسەمی ناسراوە، شاعیرو مێژوونووس و مامۆستای دانشگای تاران بووە، لەساڵێ (١٨٩٧ز) لەکرماشان لەدایك بووە. باوکی (محەمەد وەلی خان میر پەنج) لەهۆزی (گۆران)ی کرماشانەو ناوەندی ژیانی ئەم خێڵە شارۆچکەی گەهوارە بووە.

یاسەمی سەردەمی منالی خۆی لەدامێنی چیای (داڵەهۆ) بەسەر بردووە – وادەردەکەوێت کەقەڵخانی بووبێت "نوسەر"– لەئەنجومەنی ئەدەبی دانشگای تاران بە(مەلیك و شوعەراء – بەهار) ئاشنا دەبێت.

زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی و عەرەبی زانیوە، نزیکەی (١٢) پەڕاوی داناوە، شارەزایی زۆری بووە لەزمانی پەهلەوی، چەندین نامە (رسالە)ی پەهلەوی وەرگێڕاوەتە سەر فارسی.

(یاسەمی) دوای خزمەتێکی زۆر بەنوسین و بەوانە وتنەوە لەساڵی (١٩٥١ز) لەتاران کۆچی دوایی کردووە.

بۆ زیاتر زانیاری سەیری (تأریخ مشاهیر کُرد – ج٢– بابا مردوخ روحانی – شیوا) ل(٣١٠–٣١٦)بکە.

[٣٣] ڕۆژنامەی ڕزگاری ژ. ٢، (١٩٩٣/١١/٣).
[٣٤] سەرچاوەی ئەم ژیانی دوکتۆر سەعیدە ئەمانەی خوارەوەیە:

- ڕۆژنامەی ڕزگاری ژ. ٢، (١٩٩٣/١١/٣).
- مێژووی ویژەی کوردی ب(٢) صدیق بۆرەکەیی ل(٢٤١-٢٤٦).
- تأریخ مشاهیر کرد -ج(٢) ص(٢٥٢-٢٥٥).
- طبیب من کردستان - سیرة حیاة الدکتور سعید- بقلم (جای م. رسولي و کادي هـ. الین) .. مەگەر ئەم کتێبە بخوێنریتەوە ئینجا بۆت دەردەکەوێت کەدوکتۆر سەعید، چەند لەپێناوی بوون بەمەسیحیدا ماندوو بووەو عەزیەت دراوە، وەچەند هەوڵی داوە تاوەکو مەسیحیەت بلاو بکاتەوە، وە کورد بکات بەمەسیحی.

[٣٥] وشەی (بەخۆڕایی) باش دەرنەچووە، بەلام وادەزانم ئاوا نوسرابێت (نوسەر).

[٣٦] ساڵی (١٤٥٥)ی هەتاوی هەڵەیە چونکە ئەو ساڵە هێشتا نەهاتووە لەوانەیە ساڵی (١٣٥٥)ی هەتاوی بێت کەدەکاتە ساڵی (١٩٧٧ز) کەئەمەش دەگونجێ.

[٣٧] ڕۆژنامەی ڕزگاری ژ. ٢، (١٩٩٣/١١/٣).

[٣٨] گۆڤاری خاك ژ.(٥٣) بەرواری (٢٠٠١/١١/١٠) نوسراوێکی گرنگی بەڕێز (فاروق حەفید)ی تیایە بەناوی (چەند سەدەیەك لەمەوبەر هەندێ ڕوداوی مێژوویی و وێژەیی کورد لەدەرەوەی کوردستاندا) لەسەرەتای نوسینەکەیدا دەڵێ:

ئەم ڕوداوانە لەلایەن پرۆفیسۆر (بودرو گلیگتی ئەندراش)ەوە کەیەکێك بوو لەمامۆستاکانم لەزانکۆی زانستی (ئوتڤوش لۆراند) لەبەشی لێکۆڵینەوەی ئێرانیتیك - کوردۆلۆجی ساڵی (١٩٦٤-١٩٧١) ئەو سەردەمەی خوێندکار بووم، لەهەمان زانکۆدا. ئەم شتانەی بۆ گێڕاومەتەوەو منیش بێکەم و کوڕی ئەوەندەی لەیادمدا بێت بۆتان ئەخەمە بەرچاو تاکو ئێستا نەنوسراوەو نەبیستراوە.

[٣٩] مێژووی هەورامان -محەمەد ئەمین هەورامانی ل(٧٧).

[٤٠] هەمان سەرچاوە ل(٥٩٨).

[٤١] هەر بۆ نمونە: مێژووەکەی مەردۆخی لەئەوەڵەوە تا ئەخیر چەندەها نمونەی دژایەتی ئیسلامی تیایە، بەڵکو هەندێ شتی خەتەریش دەربارەی دەڵێ: بۆ زیاتر زانیاری لەم بارەوە سەیری گۆڤاری رامان ژ.(٦٠) بەرواری (٢٠٠١/٦/٥) ل(٢٣٧-٢٣٨) هەندێ تێبینی لەسەر نوسراوە، لەوگۆڤارەدا.

هەر بۆ وێنە لەشوێنێکدا، بەشای ئێران دەڵێ:

(بەپێی بروای ئاینیمان ئێمەی شافیعی‌یەکان شاپەرستین) ئەمە قسەی ئایەتوالله یەکە کەگرنگی دەدات بەشیعری هورمزگان و لەکتێبەکەیدا بلاوی کردووەتەوە.

[٤٢] هەورامان لەدەروازەی مێژووەوە ل(٤) بابەتێکی مامۆستا محەمەد صاڵحی ئیبراهیمی (شەپۆل).

[٤٣] هارونە ڕەشید لەساڵانی (١٧٠ - ١٩٣ك) واتە لە(٧٨٦-٨٠٩ز) خەلیفە بووە.

مەئمون لەساڵانی (١٩٨-٢١٨ك) واتە لە (٨١٣-٨٣٣ن) خەلیفە بووە. بەڵام دراوەکە کەلەساڵی (٢٣٠ك) لێدراوە کەواتە لەدوای ئەو دوو خەلیفەوە لێ‌دراوە.

(٤٤) مێژووی هەورامان -محەمەد ئەمین هەورامانی ل(٩٤٥-٩٤٧).

بێگومان لەهەمان سەرچاوە دا ل(٩٤٧) دەڵێ: جگە وێنەی ئەم ئافرەتە وێنەی تری ئافرەت دۆزراوەتەوە، هی سەردەمی ئەشکانیەکانەو ناوی ئەو وێنەیەش (ئادات) بووەو نوسینەکەش بەئەلف و بێ‌ی ئارامی‌یە.

(٤٥) کورد لەناو ئایین و مێژوودا - قازی عومەر ل(١٢٠).

(٤٦) کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا، حەسەن مەحمود حەمەکەریم ل(١٩٦).

(٤٧) پیرشالیاری زەردەشتی ل(٩-١٢) محەمەد بەهائەدین.

(٤٨) بۆ زیاتر شارەزایی ئەم کتێبانە سەیر بکە:

(ئایینی کورد) ، (کابانی کوردی) و (کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا) هەرسێکیان دانراوی م. حەسەن مەحمود حەمەکەریم.

(٤٩) لە مجمع البلدان (ج٥، ل٣١٢)دا هاتووە کە: شارەزوور دەکەوێتە نێوان هەمەدان و هەولێر لەهەرێمی چیا.

(٥٠) کوردو کوردستان -محەمەد ئەمین زەکی ل(١٢٣).

(٥١) کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا، ل(٣٢-٤٠)

(٥٢) ئایینی کورد، ل(٢٤).

(٥٣) کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامی دا، ل(٣٥).

(٥٤) کابانی کوردی ل(١٦).

(٥٥) سەیری پەراوێزی ژ(٨) بکە.

(٥٦) بنەماڵەی زانیاران ل(١٦٧).

مێژووی مەردۆخ ل(١٩٠،٦).

(٥٧) مێژووی مەردۆخ، ل(١٩٠) هەروەها پیرشالیاری زەردەشتی ل(١٠).

(٥٨) مێژووی مەردۆخ، ل(١٩٠) هەروەها پیرشالیاری زەردەشتی ل(١٠) بێگومان لەبنەماڵەی زانیاران دا، ل(١١٨، ١١٩)دا هەروەها لە (بوژانەوەی مێژووی زانایانی کورد) بەرگی یەکەم ل(٢٨٥ و٢٨٦)دا لەگەڵ ئەم ڕەئیەدا نین.

# هەورامان لەبواری کۆمەڵایەتیدا

- خێڵ و خێڵایەتی
- پێکهاتەی خەڵکی هەورامان
- دووبەرەکی و شەڕی ناوخۆ
- لەتایبەتمەندییەکانی هەورامی و هەورامان
-ساڵی گرانیەکەو مەلاشەریفی بێسارانی
- ڕۆڵی ئافرەتی هەورامی لەژیاندا

# هەورامان لەبواری کۆمەڵایەتیدا

بواری کۆمەڵایەتی، بوارێکە لە بوارە گرنگەکانی ژیانی مرۆڤ، کە دەست نیشانی هەندێ جۆری ژیانی خەڵك و کۆمەڵگا دەکات .

لێرەدا دەمانەوێت بە کورتە، ئاماژە بەچەند شتێکی کۆمەڵایەتی خەڵکی ناوچەی هەورامان بکەین، لەوانە:

**خێڵ و خێڵایەتی:**

عەقڵیەتی خێڵ لەهەورامانـدا لاوازە، هەورامی یـەکان لـەدەوری خـێڵ و سەرۆك خـێڵ کۆنەبونەتـەوەو ئـەو عەقڵیەتـەیان تێکشـکاندووە، ئەمـەش دەگەڕێتەوە بۆ:

– کاریگەری ئایینی زەردەشتی و ئایینی ئیسلام، کەبەراستی پیرو زاناو شێخەکانی هـەورامان کاریگـەری پـەروەردەیی زۆریـان بـووە لەسـەر خەڵکەکـە کەبەئاشتی و تەبایی‌و برایەتی پێکەوە بژین و دوربن لەناکۆکی‌و شەڕو شۆڕ بۆ نمونە:

لەهەموو چین و توێژو خێڵێك لەڕێبازی نەقشبەندی‌دا خۆیان بینیوەتەوە ئیتر عەقڵیەتی خێلایەتی لاواز بووە.

– هەروەها لەبەر ئەوەی خەڵکی هەورامان زوو وازیان لەکۆچەری هێناوەو نیشتەجێ بوون، هەر کەسە بو خۆی بووەتە خاوەنی باخ و موڵك و ماڵ و ئەرزی خۆی و تەنانەت خاوەنی گۆرستانی خۆیشی . . .

ئیتر ئەمانە وایان کردووە کێشە کۆمەڵایەتی‌یەکان کەمتر ڕوو بدەن و کەمتر پەنا ببرێتە بەر خێڵ و سەرۆك خێڵ لەئەنجامدا خێڵ و خێڵایـەتی بۆ خـۆی لاواز بووەو خەڵکەکە خۆیان لەدەوری کۆنەکردووەتەوە. . .

– جگە لەمەش بوونی ئەنجومەنی شوراو خوێنـدن و بـواری ڕۆشنبیری و خودکەفایی ئابوریش کاریگەری خۆی بووە.

وەك وتمان لە هەورامان دا هۆزو خێڵایەتی، ناخوێنرێتەوە، ئەوەندە تیرەو ناوچە، ڕۆڵ دەبینێ لە بەیەکەوە بەستنی تاکەکاندا، خێڵ ڕۆڵـی نیە، بەڵکو لـە ناوچـەکانی تـری کوردسـتان دا، هۆزایـەتی ڕۆڵ زیـاتر دەبـینێ و، چـەند گونـدو دێیەك دەبەستێت بەیەکەوە، بۆ نمونە :

کـە دەڵـێن هـۆزی میکـایلی، یـا، ڕوغـزای، یـا، نـەوروڵی، یـا کۆکـۆیی یـا شـەمێرانی یـا، ... یـا ...ئـەوە خـەڵکی چـەند گونـدو دێهاتێـك دەگرێتـەوەو

پێکەوەیان دەبەستێت، بەڵام لە هەورامان دا هۆزێکمان نیە، سەرجەم چەند گوندولادێیەك بگرێتەوە، هەر گوندو لادێیەك بۆخۆی لەتیرە یاچەند تیرەیەك پێکهاتوە، هەندێك لە تیرەکانیش بڵاوەیان کردوە بەتایبەتی شێخ و سەیدو بەگزادەکان. بۆ نمونە :

شێخەکانی تەوێڵە، لە تیرەی ئاغە لەرانی تەوێڵەن، وەنەوەکانی شێخ عوسمان سیراجەدینی یەکەم، بە زۆر شوێندا بڵاوەیان کردوە، وەك :

تەوێڵە، بیارە، باخەکۆن، گوڵپ، بیاوێڵە، ئەحمەد ئاوا، هەڵەبجە، سلێمانی، خانەقین، هەولێر، بەغداد، لە ئێران لە سنە، دورۆ، بانە، جوانڕۆ، خانەگا، ئەمە جگەلەوەیش بەرەو سوریاو تورکیاش ڕۆیشتون. کەبشمانەوێت باس لەخەڵکی هەورامان بکەین لەڕوی تیرەوهۆزەکانیەوە، دەبێت باس لەیەکە یەکەی گوندو شارۆچکەکانی هەورامان بکەین کەلەچەند تیرەیەك پێکهاتوون، وەك چۆن لەباسی تەوێڵەدا باسمان کردون، ئەمەش لێرەدا بوارمان نیە .

ئەوەی لێرەدا شایەنی باس بێت، ئەوەیە، کە زۆر جار لەناو خەڵکی دا هەڵەیەك دەکرێت، بەهەورامیەك دەوترێت، لەچ عەشیرەت و خێڵێکی، دەوترێت عەشیرەتی هەورامی.. ئەمە هەڵەیە، چونکە هەورامی عەشیرەت و هۆز نیە، بەڵکو هەورامی کۆمەڵێك خەڵکە لەکۆمەلانی کۆمەڵگەی کوردی هەورامان زێدیانەو، زاراوەکەشیان شێوەیەکە، لە زمانی کوردی گۆرانیدا، لەچەند گوندو شارۆچکەدا، نیشتەجێن، لەژمارەیەکی زۆر تیرەو هۆز پیك دێن.

**پێکهاتەی خەڵکی هەورامان:**

خەڵکی هەورامان بەگشتی پێکهاتوون لە:

- بەگ یائاغا:

بەگزادەکانی هەورامان، فەرمانڕەوای هەورامان بوون، وەبەبۆنەی دەسەڵاتیانەوە، خۆیان بەگەورەتر زانیوە لەناو چین وتوێژەکانی کۆمەڵدا. ئەمەش بەنەمانی دەسەڵاتیان و، هۆشیار بوونەوەی خەڵکەکە، ئەم بەگەورە بوون وخۆبەزلزا نینە نەماوە. لەسەر دەمەکانیشدا یەکێ‌یازیاتر لەم بەگزادانە، بوونەتە فەرمانڕەوای پلە یەك و، بە ( سان )و (خان) ناسراون ،ئەوانی تریش بونەتە، حاکمی گوندودێهاتەکان. ئاغاکانیش هەروەك بەگزادە لەشوێنێنکی وەك تەوێڵە بوون و ڕۆڵیان بینیوە، ئەوانیش لەپێش شەڕی یەکەمی جیهانی، بەگزادەکان دەسەڵاتیان لەدەس سەندون.

- پیر یا شێخ :

ئەمیش بەهۆی ئەو پلەو پایە ڕۆحیەی کە هەیان بووە لە چینی پێشەوەی کۆمەلگاوە، بەڵکو بە چاوێکی بەرزو بەڕێزەوە سەیر کراون، لەلایەن کۆمەڵگاوە، بەتایبەت لەلایەن موریدو مەنسوب و خەلیفەکانەوە. پیرو شێخەکانی هەورامان، لە لایەن دەسەڵاتدارەکانیشەوە ڕێزیان بووەو، لە کێشە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکاندا، ڕۆڵێکی ئیصلاحیان بینیووە.

- مەلا یا زانا:

مەلاو زاناکانی هەورامان بەهۆی ئەو زانست و مەعریفەیەی کەهەیان بووەو، خەڵکیان فێر کردووەو، پێشەوایەتی مزگەوتیان بۆ کردون و، چۆن دەچن بەدەم داواکاری پرسیارو کێشەکانیانەوە لە ریزی پێشەوەی کۆمەڵدا حسابیان بۆ کراوەو ڕێژەیەکی زۆری خەڵکی هەورامان مەلان، بەتایبەت لە هەندێ ناوچەدا وەك : تەوێڵە، بیارە، نۆتشە، خەرپانی.. زاناو مەلای زۆریان بووە .

- سەید :

سەیدەکانی هەورامان لەبەر ڕشتەی بنەماڵەیی یان لەناو موسوڵماناندا ڕێزێکی تایبەتیان هەبووە، وە زۆربەشیان بوونەتە مەلا (زانا)، لەچەند گوندو شارۆچکەی هەوراماندا هەن.

ئەم چوار بنەماڵەیە (بەگ و شێخ و سەیدو مەلا ) لەریزی پێشەوەی خەڵکی هەورامان حسابیان بۆ کراوەو، بەشی _ نوخبەی کۆمەڵگەن وەك، ژمارەش کەمن و زۆرنین، ژن و ژنخوازیش لە ناو خۆیاندا زیاترەو کەمتر لە (ئۆمی)ی یا بڵێین (بۆرە پیاو = مسکێن) ژن و ژنخوازی دەکەن، وەلەیەك ژن زیاتریان هێناوە بەتایبەت بەگ و شێخەکان.

- ئۆمی یا عەوام :

ئەم چینە زۆربەی زۆری خەڵکی هەورامان پێك دێنن، لە چینی هەژارو مسکێن، لە جوتیارو کرێکارو کاسب پێك هاتون. ئەمانە ئەوسا شوێنکەوتەو پابەند بوون بە چوار بنەماڵەکەی ترەوە. لەم چینە، لەم ساڵانەی دواییدا توێژی ڕۆشنبیران و خوێندەواران پەیدا بوون ئەو شوێن کەوتنە بەو شێوەیە نەماوە.

بێگومان لەناو ئەم دوو چینەدا، چینێکی ناوەندیش هەن، بەڵام بنەماڵەیی نین، تاك، تاکن لەدێو گوندەکاندا، وەك :میرزاو کوێخاو هەندێ کەسی دەوڵەمەند.

**دووبەرەکیو شەڕی ناوخۆ:**

بەداخەوە، خەڵکی هەورامانیش، بێبەش نەبوون لەم نەخۆشیە کۆمەڵایەتیەی ناو کۆمەڵگاکەمان[1].

ناکۆکی نێوان بەگزادەکان و،شێخەکانیش لەناو خۆیاندا،لەسەر دەسەڵات وپلەو پایەبووە، زۆرجار، چینی هەژارو نەدار، بوونەتە قوربانی نێوان دووهێزی دەسەڵات. لەناو بەگزادەکان دا، خوێنێکی زۆر ڕژاوە، لەئەنجامی شەڕە ناوخۆیەکانیانەوە، بەڵام ناکۆکی نێوان شێخەکان کەمتر بووەو، نەگەیشتوەتە شەڕی خوێناوی، لەبەر ئەوەی کەئەوان چەکدار نەبوون، بەڵام بووەتە هۆی ئاوارەبوون و بەجێ هێشتنی زێدی خۆیان.

ئەم دوو بەرەکیە، لەدوای مردنی (سان و بەگ یا شێخ ) لەنێوان نەوەکانیدا، لەسەر جێگەداری باوکەکەیان، بووە .ئیتر، یا یەکیان لەناو بردووە یا ناوچەکەیان بەشکردوەو، هەریەکە، ئیعلانی دەسەڵاتی حاکمی یا شێخایەتی خۆیان کردوە، بۆ نمونە :

بەگزادەی هەورامان، یەك بەرەبوون و، یەك سانیان هەبووە، کەچی دواتر هەورامان کرا، بەدوو، سێ، چوار، بەشەوە، هەر بەشە، بەرەیەك حوکمی کردووە.

ئەوەی شایەنی باس بێت ئەم دوو بەرەکیەی هەورامان، لەناو دەسەڵاتدارەکان بووە، لەسەر دەسەڵات، نەك لەناو تیرەو ناوچەکاندا، چونکە شەڕی خێڵایەتی، وەك چۆن لەناو خێڵەکانی تری کوردا هەبوە، لەناو هەورامیەکاندا نەبووەو نیە مەگەر بەدەگمەن.

**لەتایبەتمەندیەکانی هەورامیو هەورامان:**

خاکو خەڵکی ئەم دەڤەرە، لە زۆر شتدا، تایبەتمەندیەکی خۆیان هەیە. هەندێ شتیان هەیە، تەنها لێرە هەیە، هەندێ شمەك و نەریتیش لێرە هەیە لێرەو لەوێش هەیە، بەڵام دەتوانین بڵێین :هەندێ شت هەیە تایبەت مەندیەکی ناوچەی هەورامانی وەرگرتووە: جا لەو شتانەی بڕاون بەبالای هەورامیو هەوراماندا:

- سیا چەمانە:

سۆزو خۆشەویستی و ئاهونالەی هەورامیەکانە، بەرامبەر، هەورامان و هەورامیو کێشە ناسۆریەکانی ژیان، دەری دەبڕن .

- سانی هەورامان :

هەرچەندە وشەکە لە( سلطان)ی عەرەبی‌یەوە هاتووەو، گشتی‌یە، بەڵام بەو بچوکراوەیی‌یە، بووە، وشەیەکی تایبەت و، بەمانەی فەرمانڕەوایەکی هەورامی‌یە کە فەرمانڕەوای هەورامانی کردووە.

- کڵاشی هەورامی:

پێڵاوێکی هاوینەی دەستکردی هەورامی‌یەکانە، بۆیە بەناوی ئەوانەوە ناسراوە.

- جەژنی سەربەردی کۆمسا:

جەژنی کۆمسایی، جەژنێکی تایبەتە، بەخەڵکی هەورامانی شار، کە (٤٥) ڕۆژ لەبەهار تێپەڕ دەبێت، خەڵکەکە کۆ دەبنەوە، خواردن و میوە دەبەن لەگەڵ خۆیانداو دەچنە سەر ئەو بەردە، کەلە پاڵ گۆڕەکەی پیر شالیار دایەو، لەوێ گریزەکان دەست دەکەن، بە شکاندنی ئەو بەردەو، هەریەکە نەختێك لەو بەردە وەردەگرن و دەیبەن بۆ ماڵەوە، یاخود، دەیکەنە ناو مەشکەوە، بەحساب بۆ بەرەکەت و ڕزق و ڕۆزی بوونە.

دەڵێن: ئەو بەردە هەموو ساڵێك، ئاوا دەیشکێنن و بۆ ساڵی ئایندە دیسان دەڕوێتەوەو، وەك خۆی لێ‌دێتەوە.

- پیرو پیرشالیار:

لەشوێنی تردا باسکراوە لێرە ئەمەندە دەڵێین: ئەم وشانە لە هەورامانـدا بەکارهاتوون، بۆ کەسانی زاناو پیاوانی ئاینی .

- پۆشاکی هەورامی:

پیاوی هەورامی، هەر بەپۆشاکەکەی‌دا دەناسرێتەوە، ڕانکو چۆغە لەبەر، مشکی یان کلێتە لەسەر، فەقیانەی سپی بەستوو، ئەگەر هاوین بێ، کڵاش و گۆرەوی تەنك، ئەگەر زستان بێ پێڵاوی یەمەنی‌و پوزەوانەو دەستکێش و فەرەنجی لەبەر، خۆ ئەگەر ئافرەتیش بێت:

کڵاوزەڕ لەسەر دەکات کە(فێسێکە، کڵاوێکە) قەران و لیرەو قوڵپی پێنج قەرانی، دەبەسێت و، بە (چارەوانە . گێلگێلە ) دەیڕازێنێتەوەو لە ژێر چەناگە گیری دەکات و مشکی دەکاتە، چەتفەی سەرشان و پێڵاوی کرمەکداری لە پێ دەکردوو....بەڵام ئێستا ئەمانە زۆر کەم بوونەتەوە، مەگەر لە هەندێ گوندا ئەمە مابێت .

- گوێزی هەورامان :

وەنەبێت لەشوێنی تر گوێز نەبێت، بەلاّم لە کوردستان و لەعێراق و ئێراندا، باگوێزی شوێنی تر بێت، لەگەڵ ئەوەشدا، گوێزی هەورامان، بەناوبانگە، ئەویش لەبەر چەند سیفاتێکی چاکی گوێزەکەی .

- نانی هەورامی:

نانێکە بەساج دەکرێت و ناسك و جوان و خۆش و بەتامەو، بەتایبەت ئەگەر ئافرەتی لێزان و کارامە بیکات بەئاردی سپیو بەپێز، وەبەگەرمی بیخۆی بەتەرەپیازو دۆی تازەوە، زۆر بەتام و بە چێژە.

هەروەها، هەندێ خواردەمەنی تر هەیە، زیاتر لای هەورامی ناسراوە، وەك: گێتە مەژگێ، خەپلێ، شلکینێ، کێلانێ، لەپاری،کوتە، ...هتد

- ساناڵێ:

شوێنێکی تایبەتە، لەناو باخ و ڕەزەکان، تەخت و ڕێکو پێك دەکرێت و، پاشان بە قوڕی گریکدارو بەپێز، بە هۆی (سیرە کوڵە ) وە ساف و لوس دەکرێت و بە ئەندازەی(١٥م/٢)تا (٣٠/م٢) دەبێت.ئەمەش بەکاردێت بۆ وشك کردنەوەی میوەی ناوباخ و ڕەزەکان.

- شادیانە یا وەزەبان:

ئاهەنگ و شادیو خۆشی دەربڕنێکە، هەورامییەکان، دەیگێڕن لەکاتی گەڕانەوەی کاراون و حاجیان و چاك بوونەوەی نەخۆش و، بوون بەگەورەی شوێن، وەك بوون بە سان و حاکم و ئیجازە وەرگرتنی مەلاو بوون بە شێخ و ....تا د. ئەم شادیانە زۆر جار (وەزبان )ی پێ دەڵێن واتە (گوێزەبان)، چونکە ئەوساکە شەربەت و نوقڵ و شیرینی نەبووە، لەو جۆرە بۆنانە، گوێزیان بەخشیوەتەوە لەسەر بانەکاندا کەکۆبوونەتەوە.

**خواردن و خۆراکی خەڵکی هەورامان :**

شتێکی تری ئەم خەڵکی دەقەرە، پێم باشە لێرەدا، بیخەمە ڕوو، با لەگەڵ بابەتەکەشدا، کەمێك جیاواز بێت، .... ئەمیش ئەوەیە :

خۆشترین و بەتامترین، خواردەمەنی خەڵکی هەورامان چییە؟

ئەم پرسیارەم لەگەلێك کەس کرد، هەریەکە وەلاّمێکی دایەوە ...

ـ ڕۆژێکی بەهار، لە گوێی چەم و کانیاوێکدا، لەدەوری چنورو شەوبۆدا، چایی دەمی هێنابێت (سیراج = سوێرەکە) یا کەرەو هێلکە، بەنانی هەورامییەوە لەگەڵ (پوینە = پونگە) هەبێ، بیخۆی، خۆشترین خواردنە لەبەهاردا .

- یاخود هەنگوینی هەنگی (کۆسالان یا دالانی یا هەیات) لەگەڵ کەرەی هەوارەکانی (ژیوار یا گەناو) لە چێشتەنگایەکدا، لە مەڕێی زاوەردا بیخۆی .

- نیوەڕۆیەکی هاوین، لە (ویسور )ی (نەوسود)، لەپاڵ حەوزەکەدا، دانیشتبیو، لەپەنگاکەی سەرەوە، ئاوەکە، بێتە خوارەوە، یەك قابلەمە یاپراخ، لێنرابێت، بەگەڵا، ناسکەکەی ئەویَ، پڕ بێت لە پەراسووی کەروێشکەکانی وەستا نەجبەدین، ناوەڕاستەکەشی لەکەوە کوژراوەکەی ئێوارەی لالۆ مۆمن، کەناو سکەکەشی پڕ بێت لە برنجی کوردی، پاش کولان، لەپاڵ حەوزەکە (سینییەکەی سان) پڕبکەیت لە یاپراخ، کەرەیەکی باش بکەیت بەسەر، یاپراخەکەداو، دۆکەی (لەیلێ)ش سارد کرابێتەوە بەبەفری دالانی .... دانیشی باش تێر بخۆیت و سیاچەمانەکەش بە شوێنیدا بوترێ .... ئەمە ئەگەر هەموو دنیا نەهێنێت بیێشك نیوەی دەهێنێ.

- دەمەو بەیانییەکی پاییز لە نوەیجەر، لە خەو هەڵسیت، نوێژەکەی بەیانیت بکەیت، پاشان لەبەر سەرما، بەتانیەك بپێچی بەخۆتەوە، تا ئەو سەروپێیەی کەشەو لێنراوە لەبەردەم مانگە شەودا، بۆت تێکەن و تادەتوانی بخۆی، بە شوێنیشیا، چا لە دوای چا، کاکە (سەیوانی چایچی) بۆت تێبکات، پاشان بڵێی بەکاکە (سەیوان)" ئادەی بنیشەرە، هەر پیسەو مامۆ عوسمانیت، با دەنگیت بیَو سیاچەمانەکەی واچە با کەشەکی دەنگی داوە، ملو کەیمنەو بێدرواس و هانە گەرمڵەیەرە بەهـ بەهـ، چند وەشا، ئی دیمەنەو، ئی یاگە وەشی.

- بەیانییەکی زستان هەڵسیت، یەکپارچە دنیا بەفر بێت (کەشکەك) پێگەیشتبێ وپلەگۆشتێکی باشی تیابێت، تادەتوانی لیَ ی بخۆیت، بۆدوای نیوەڕۆش، دیسان، بەفرت باش ماڵیبێت کەلەسەربان هاتیتە خوارەوە، دوای خۆگەرم کردنەوەو، وشك بوونەوە بەو(سکڵە = پشکۆ)یە گۆشت وجگەرتویَ تویَ بکەیت، بیدەیت بەسەری سکڵیئاگردانی بەرزۆ پاکەدا، پاشان، چای دیژبکەیت بەسەری دا. ئیتربزانم ماندووت ناحەسێتەوە!؟

- چەند خۆشە، کەنوێژی مزگەوت دەکەیت و، دەگەڕێیتەوە ماڵەوە، خانمی ماڵەوەش نوێژی کردووە، لەوهەویرەی کەشەو شێلاویەتی (گێتە مەژگەو گێتە چەربە = کولێرە بەکاکڵەو کولێرە چەورە)ی، ئامادە کردوە بۆهاوسەرو منداڵەکانی، کەبەچای شیرینەوە بیخۆن.

- خۆ کەبابەکەی لالۆ حسێن لەکەمالا بەنانی هەورامییەوە، لەگەڵ تەماتە ترشەکەدا هەرکاتێ بیخۆیت قەت لەبیرت ناچێتەوە.

قووڵە : بەشێکە لەباخەکانی چەمی ئاوێسەر کە لە ڕووی ئاستی شوێن و دەورو بەرەکەیەوە ، قوڵتر دێتە بەرچاو ...

شاجۆ : شای جۆگەکانی تەوێڵەیە ... چونکە لەوان پانتر و قووڵترە و درێژتریشە ... هەروەها ئەم ناولێنانە لەسەر بنەمای لێکچون بۆ زۆر شوێنی تریشی هەر ڕاستە " وەك ماوەزا[(٧)] ...ماوامی [(٨)]... لێژڵە ...[(٩)] چلانە [(١٠)] ...

وەڵامێکی پێویست بەم ڕایانە :

بۆئەم بۆچونانە ناتوانین هیچ ڕایەکیان سەد دەر سەد بسەلمێنین ،یا خود بیدەینەوەدواوە، بەڵام پاش تاوتویٚ کردنی ئەو ڕایانەی کەلەسەر ناوی ( تەوێڵە) خستمانە بەر دیدگاتان ، پێویست ئەکات ئەم چەند تێبینی‌یە ڕەچاو بکەین کە هەر بەهەمان زنجیرە بەندی ڕاکان تێبینیەکانیشتان پێش چاو دەخەین :

١. ئەم بەسەرهاتە زیاتر لەحیکایەت دەچێت ، تاواقعێکی مێژوویی ، وەك لە شوێنەوارەکاندا دەردەکەوێت ، مێژووی تەوێڵە بۆ پێش ئیسلام دەگەڕێتەوە ، پاشان ئەگەر بەڕستەیەك نەریٚی بکەین . چ بەڵگەیەك داکۆکی لێدەکات ؟ ! ..

ئەم مێژووی وێڵبوونە ئەگەر مێژوو بێت ... ، مێژوو بەناوو بەروارەوە مێژووە ، دەفتەری دیرۆکی ئەم بەروار و ناوە لای کیٚ پارێزراوە ؟ هەرچەندە ئەگەر ئەو : دووخاڵەی تیابوایە زیاتر لەعەقڵەوە نزیك دەبوو ....جگەلەمەش پێش ئەم شوێنەی ئێستای تەوێڵە،دەورو بەرەکەی ئاوەدان بووە وەك لەدواتر باسی دەکەین .ڕەنگە هەرئەو خەڵکەی ئەودەورو بەرەی بوبن هاتبن ئەم شوێنەی ئێستایان ئاوەدان کردبێتەوە نەك خەڵکی تر .

٢ـ خەڵك و خاك هەبوون و ئنجا ئەم ( تاعون ) ە بڵاوبووتەوە...ئەگەر ئەم ناوە پاش ( تاعون ) بووە ئەی پێشتر ناوی چیبووە ؟ .

ئاخۆ دکتۆر دومرگان ئەم زانیاریەی لە کوێوە هێنابیٚ؟!

٣ ـ ئەو پرسیارەی بۆ دووەم خاڵ کردمان بۆ سیٚیەمیش ڕاستە .واتە پێشتر ناوی چی بووە ؟هەروەها بێجگە لەڕای زارەکی سەرچاوەیەك نی‌یە پشت گیری لەوەبکات کە سوپای ئیسلام هاتبێتە تەوێڵە . بەڵکو ئەوەی هەیە زیاتر باس لەشارەزوور ئەکات ...

لەبەر ئەو چەند تێبینی‌یە ئێمەش ڕای چوارەممان پیٚ پەسەند ترە هەرچەندە ، ئەویش ئەگەر زۆر ورد بکرێتەوە ئەشێت بخرێتە ژێر پرسیارەوە ... هەروەها زوربەی خەڵکی تەوێڵە چ بەتەمەنە نەخوێندەوارەکان و چ توێژی ڕۆشنبیرەکان لەگەڵ ڕای چوارەمن...

**شوێنەوارەکان مێژوو دەگێڕنەوە :-**

خاك و ئاوی ئەم نشتمانە ، کتێبێکی بیٚدەنگ و مێژوویەکی سیحراوی‌یە بۆ چەندین سەدە بەر لە ئێستا ، ئەگەر زمانێکی هاوبەش هەبوایە لەنێوان خاك و ئێمەی خاکی و خەڵکدا .. ئەوکات لەغوباری مێژوویەکی دوور ... کاروانی سەرەتاییەکی تەماوی ... پنتێك بۆ یەکەمینەکانی ژیان لەم ناوچەیەدا رزگارمان ئەبوو ، ئاسان و ڕاستر ئەمان توانی لەم دیرۆکە بدوێین ، زمانمان سادەتر و لەحەقیقەتەوە

نزیکتر ئەبووین ... چونکە ئەوەی مێژوو ئەنووسێتەوە لە ئاستەنگ نزیك ئەبێتەوە . شوێنەوار ئەخوێنێتەوە مشت و ماڵی ڕابردوو ئەکات و لە پاش ماوەکان ڕامان ئەچنێتەوە ، سەرنجەکانی ئەو ساتی ڕامانەیە ئەبێتە گریمانەی مێژوو خاڵی بەسەرهاتنی زەمانی ئەو دیرۆکە ... لەوەشدا ئاسان نیە ، بوونی شوێنەوارێك بکەیتە بەڵگەیەکی ڕوون یان گەورەی سەردەمێکی دیاری کراو چونکە ئەوەی لەبەردەستدایە ( بەش ) ێکە نەك ( هەموو ) ، پارچەیەکە لە ( شوێن ) نەك ( ساتێك ) بێت لە ( زەمان ) ، بەهەموو جوریشی کاری تیٚکراوە و ئەشێت لە توانای‌دا نەبێت حاڵەتێکمان بۆ وەسف بکات کەتیایدا دروست کراوە ... یان زەمەنێکیان بۆ بگێڕێتەوە کە پیایدا گوزەراوە .

هەرچەندە تێپەڕبوونی زەمەن چاوی ئێمە لە تەڵخی نزیك و لە ڕوونی دوور، دەخاتەوە چاوی ئەو شەێنەوارەشی بۆ بینیی چەرخی خۆی لە بینایی ئێمەوە ئەوەندە بەلێڵی پیشان ئەدات ... بەلاّم بەهەموو ئەم تێبینیانەشەوە شوێنەوار هەر ئاوێنەیەکی نیشاندانی مێژووە چ بە ڕوونی بێت یان بەلێڵی ...

هەر بۆیە ئەگەر بێت و چاوێك بە ( چەمی دزاوەر و دەرەی تەرتیبا و لێژڵە و ماوامی) دا بگێڕین ... کۆمەڵە شوێنەوارێك دەبینین کەمێژووی ئاوەدان کردنەوەی ئەم شوێنانە دەگەڕێنێتەوە بۆ پێش ئیسلام ... وەك ئەو گۆڕانەی کە گوزارشت لە مێژووی بەخاك سپاردنی ئەو کۆمەڵە خەڵکە دەکەن ، کەلەو دەمانەدا ژیاون و وەك دایی بەگۆڕ سپاردنی ئەو سەردەمە لەشوێنە جیاوازەکانی تری کوردستاندا ، ئەمێستا ئێسقانەکانیان مێژوو دەگێڕنەوە ، کە بەرامبەرە لەگەڵ سەردەمی سێهەمی زاینیدا و ، ئەکاتە سەرەتای مێژووی ساسانیەکان (١١) ...

دەرەی تەرتیبا ئەوەندە شوێنەواری تیا دۆزراوەتەوە ، کە داکۆکی لەدێرین بوونی خۆی بکات ... هەروەها بوونی چەندەها ( شتی کۆن )

لەناوچەکانی ( لێژڵە و ماوامی و وەزەسوور و باخەوان ) دا بەڵگەن لەسەر دێرینی شوێنەکە ... لەحەفتاکاندا و پاشانیش لەنەوەدەکاندا خەڵکی تەوێڵە زۆر خەریکی هەڵکەندنی ئەم شوێنانە بوون ، چەندەها جەرە و کوپە و دیزە و دیوار و ئێسقانی مردوویان دۆزیوەتەوە ... لەباخەکەی ( وەستا موحەمەدی وەستا حەمە ڕەحیم ) شوێنێك دۆزراوەتەوە ، وەك ژوور وایە کەسێك سەردانی بکات دیارە ...

وەستا صادق غەندی لەم بارەیەوە وتی :-

- لە ( باخەوان ) لە باخەکەی ( دەروێش مەحیەدین ) دا لەگەڵ ( میرزای ئۆڵڵا ) دا بەشوێن پاشماوەی کۆندا ئەگەڕاین ( دووسکە ) و( پاوانە ) یەك و ( دوو مور ) و ( دەسکی شمشێرێك ) شمشێرێك مان دۆزی یەوە کە ئاسنەکەی ڕزیبوو ، هەندێکیانم دا بەلای ( صابرە فەندی سلێمانەیی ) خزممانەوە ... دوایی هەواڵم پرسی فەوتاندبوونی ...

هەروەها وتی :

- لە ( لێژڵە ) کوپەی زۆرمان دۆزی‌یەوە کە ئێسقان و کەللە سەری تێدابوو . مامۆستا ( فەخرەدین حاجی سەلیم ) سەبارەت بەشوێنەوار لەناوخودی تەوێڵەدا ئەڵێ:

- لە ( دەرەتفێ ) لەژێر دارگوێز و تووەکاندا کاتێك باخمان تازە کردەوە ، دیواری ڕێك و پێکی خانوومان دۆزیووەتەوە کە بەقسڵ دروست کرابوو ...

هەروەها ئەڵێ :

- من منداڵ بووم ، یارمەتی تازەکردنەوەی خانووەکەی ( مەحمودی نادر کۆزاد ) مان دا کە ڕووخا بوو تاسێ مەتر بناغەیان هەڵکەند هەر گڵی ڕەش بوو ، دوایی چەند گونجێکی گڵدراو دۆزرانەوە کە درێژی هەریەکەیان ( ٨٠ سم ) بوو ئەستوریشیان (٢٠ سم ) کەتیرەی گونجەکان بوو ، بەپێی بوونی شوێنەوارەکان لە ( بێدەری ) و ( دەرەی بەڵخ ) و ( حاجی بەشارەت ) کەمرۆڤ گومانی ئەوە دەبات کەلە سەردەمێکی دێریندا ئەوناوە دێ بچووك بچووك بووبن ... یا بوونی ( قەلای گاوران ) سوسەی شارستانیەتیەك بەدەرئەخات هەرچەندە درێژەی ئەو ژیارە روون نی‌یە چۆن و کەی بووە ؟ !

ئەگێن پێشینان و پیاوانی ڕیش چەرمووی ئێستاش ئەڵێن : لە(ویسورە) وە ئاوبراوە بۆ ( قەلای گاوران ) کە دوو شاخی بەرامبەر یەکن ، ئیتر چۆن براوە ؟ نازانرێت !! بە بۆشایی‌دا ئەو ئاوەیان پەڕاندووەتەوە یا بە بۆری و بەئەرزا بوە

یان بەچ میكانیزمێك ، بەڕوونی دیار نییە . یا وشەی ( قەلاَی گاوران ) خۆی هەڵگری پرسیارێك نیە !! ئایا ئەم ناوە بۆچی ! لەچییەوە هاتووە !!

بوونی ئەو شوێنەوارانە چ لە دەوروبەری تەوێڵە و چ لەناو خودی تەوێڵە خۆیدا و دۆزینەوەیان لەكاتی هەڵكەندنی ئەوشوێنانەدا ، مرۆڤ بەرەو گومانێكی فرە ڕەهەند ئەبات و فكری مرۆڤ بەچەندین پرسیار ئەوروژێنێت ، كەئاسان نییە وەلاَمیان بدرێتەوە ، گومان بەدەروازەی یەقین بگەیەنن . لەوانە : چونكە شوێنەوارەكان و ئەوشمەكانەی یان بەڵگانەی سەر مێژووی ناوچەكە گەواهی دەرن ، بلاَوو فرە چۆرن

نازانرێ ئایا كام لەم شوێنانە ، لەهەموویان كۆنترەو، یەكەم خانوو لە چ شوێنكێكیان دروست كراوە ؟ ( ماوامی ) ... ( لیژڵە) ( قوڵە ) ( وەزەسوور ) ( بەری وەروێ ) ( پێشێرە ) ( دەرزینگا ) ( باخەوان ) ( دەرەتفێ ) ( دەرەی تەرتیبا ) ( دەرەی بەڵخ ) ( بێدەری ) ( بابا سەرهەنگ ) ( حاجی بەشارەت ) یا لەشوێنی تەوێڵەی ئێستادا وەك ناوچەكانی ( چلانە ) و ( مالێدەر ) !؟

ئایا كێ ئەتوانێت ئەم بڕیارە بدات ؟ دێرین ترین شوێنی ئاوەدانی تەوێڵە كامیانە ؟ ئایا ئەو رایە تا چەند راستە ئەوشوێنە ئاوەدانانەی دەوروبەری تەوێڵە دێی بچووك بچووك بوون و لەگەڵ لەناوچوونی ئەواندا ، بەخەڵك و دانیشتوانی ئەوان ( تەوێڵە ) ئاوەدان كراوەتەوە ؟ !

یان ئەشێت ( چلانە و ) ( مالێدەر ) بۆیەكەم جار ئاوەدان كراینەوە و گۆڕستان و شوێنی لاوەكیان ئەوناوچانەی دەوروبەیان بووبێت كە ئێستا ئەو شوێنەوارانەیان تیا دۆزراوەتەوە ... بەهەرحاڵ ، لێرەدا دەخوازێت سەرنجتان بۆ چەند تێبینییەك رابكێشین : .

* ( تەوێڵە ) كۆنەو دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئیسلام .

* جگە لەو سێ ناوچەیەی ئێستا ( چلانە و مالێدەر و وەراوەر ) شوێنەواری خانوو و ، ئاسەواری ئاوەدانی لەچەندین شوێنی تەوێڵەدا هەیە ...

* لە مێژووی ناوەڕاستدا رێگای ( خۆراسان و شارەزوور ) بە تەوێڵەدا تێپەڕیوە هەرچەندە لەلایەن جوگرافی ناسەكانەوە بەراشكاوانە ناوی تەوێڵەیان نەبردووە ، بەلاَم گومان زۆر دەبرێت كەمەبەست لە ( مستشرف شهرزور ) تەوێڵە بێت [١٢] هەروەها چەند سەرچاوەیەكی تر ئەڵێن ( مستشرف شهروز ) [١٣] باشترین زەوی كۆن و نوێیە [١٤] ...

**چەند شوێنەوارێك ڕازێکی سەیر دەگێڕنەوە :-**

کاتی خۆی کۆمەڵێك لە ڕۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی هاتوون بۆ ( عێراق ) بۆ مەبەستی ( ئارکۆلۆژی . شوێنەوارناسی ) چەند بەرد و شمەکێکی تریان دۆزیوەتەوە کە بەخەتی بزماری کۆن نووسینیان لەسەر یاداشت کراوە و پاشان ئەمان کردوویانە بە ئینگلیزی و لە مۆزەخانەکانی خۆیان دا لە ( بەریتانیا ) پیشانیان داون ...

نووسەرێکی شوێنەوارناسی عەرەب بەناوی ( تقی عابد ) پاش بینین و خوێندنەوەی نووسراوەکان کە خۆیشی یەکێکە لەشارەزاکانی زمانە کۆنەکان پەیوەندی کردووە بە گۆڤاری ( العرب ) ەوە و ئاگاداری کردوون کەشتێکی وا هەیە و ئەم شوێنەوارانە ، هەڵگری کۆڕازێکی زۆرن و وەری گێڕاون بۆ سەر زمانی عەرەبی لەلایەن گۆڤاری ناوبراویشەوە سێ کەس وەك نوێنەری گۆڤارەکە دێن و پاش پەیڤین و ڕاگۆڕینەوەیەکی زۆر ، بەسێ زنجیرە ئەم بابەتە بڵاودەکەنەوە ، ئامادەییش دەردەبڕن بۆ لێکۆڵەرەوان و مێژوو نووسان و شوێنەوارناسان کە تاوتوێ و گفتوگۆی گەرم لەسەر ماك و ناوەڕۆکی بابەتەکە بکەن ... [١٥] .

جا ئەوەی پەیوەندی بە دەڤەری هەورامان و بەتایبەت تەوێڵەوە هەبێت ئاگاهی نامەیەکی لێدەخەینە پێش چاو " کە تێیدا هاتوە و ئەڵێ [١٦] :

( ... ئیبراهیم لە دەوروبەری ساڵی ١٩٥٠ پ . ز لەخێزانێکی کوردی هۆزی جاف لەتیرەی قەهرۆتایشی لە دایك بووە ...

پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر ناوی ( صەفاء ئازەر ) بووە ، گەنجێك بووە وەحی بۆ هاتووە ، خێزانەکەی کە ناوی ( سارە ) بووە و لە هۆزەکانی ( هەوارمین ) ی سەر بەشاری ( پاوە ) بووە کە دەکەوێتە سەر سنوری عێراق و ئێران .

باوکی سارە خاوەنی دەسەلات وپایە و سەرۆك هۆز بووە . ئیبراهیم خۆی و خێزانی و دایك و باوکی لەشارۆچکەیەکی بچووکی خوارووی پاوە ژیاون کە پێی دەڵێن ( تەوێڵە ) کە ئێستا لەخاکی عێراقدایە ...

لەتەمەنی ( ٢٩ ) ساڵیدا واتە : لەساڵی ١٩٢١ پ . ز دا بووە بە پێغەمبەر ، هەر بەمنداڵی زیرەك و وشیار بووە . هۆزەکەی بتیان دروست کردووە و پەرستویانە و قوربانیان بۆ کردوون . ئیبراهیم بڕیاری دا ئەم بتانە بشکێنێ ، بۆیە ڕۆژێك هەموو بتەکانی شکاند جگە لەگەورەکەیان نەبێت . باوکی کە پێی

زانی شایەتی لەسەردا ، ئیتر حوکمی سوتاندنی ( ئیبراهیم ) یان دا . بەلاَم خوا ڕزگاری کرد . خەزوری و هەندێك خزمانی ( سارە ) ی خێزانی و ( لوط ) ی برازای چونە سەرئایینەکەی و ، باوەڕیان پێ هێنا . ... تەوێڵە کەوتووەتە نێوان چوارشاخەوە [١٧] ، لەشیوێکی تەسکەوە دەچیتە ناوەوە ، هەر لەم تەوێڵەدا بوو ئیبراهیم داوای کرد لە خوا کە چۆن مردوو زیندوو دەکەیتەوە ، خوای گەورەش فەرمووی : چوار باڵندە پارچە پارچە بکە و هەر پارچەیەکیان لەسەر چیایەك دابنێ ... دوایی ئیبراهیم بەناوی خواوە بانگی کردون و زیندووبونەتەوە ... هەر لێرەش مەنجەنیقی بۆ دائەخەن.

لەئەنجامدا ڕێژەیەکی کەم باوەڕیان پێ‌هێنا و زۆرینە هەر بەبێ باوەڕی خۆیان مانەوە . ئیتر ناکۆکی کەوتە نێوانیان بۆیە تەوێڵەی بەجێ‌هێشت و خۆی و ئەوانەی باوەڕیان هێنا پێ‌ی ، هەڵهاتن بۆ ( حەران ) ی سوریە . ( هەران لە راکردوان ) هوە هاتووە ... لەم حەرانەدا ناکۆکی زۆر دەبێ لەنێوان هۆزەکانی هەرکی و مزووری و زازو مسوری و کەنعانی و هەکاری و هەق سوز ( هیکسوس).

ئیبراهیم لەم ناوچەیەدا دروشمی ( یەکتاپەرستی و برایەتی و بەرژەوەندی هاوبەش ) لەنێوانیاندا بەرز دەکاتەوە ، بەناوی هەموومان برای یەکترین ... برای هەمووان . ئیتر بە ( صەفا) یان ووتووە ( برای هەمی ) ... دوایی وشەکە گۆڕاوە و بووە بە ( ئیبراهیم )[١٨] . پاشان ئیبراهیم ( هاجەر ) دەخوازێت و ( سارە ) ش لەتەمەنی ( ٧٠ ) ساڵیدا ئیسحاقی دەبێت . ئیسحاق کچێکی دەبێت بەناوی (ڕەباقە) وە ، بەهۆی ( سارا ) وە مارەی دەکات بۆ یەکێك لەخەڵکی بیارەی خوار تەوێڵە ... هەروەها ئەڵێ :

ئیبراهیم ( ٢٠٠ ) ساڵ ژیاوە و ، ( صەفا و مەڕوە )ش بەمانای صەفا مەڕۆ، واتە:حەوت جار بانگی دەکات صەفامەڕۆ. هەروەها کتێبی ( صوحفی ئیببراهیم ) ـ فورقانە ـ بەزاراوەی سۆرانی بووە ...

بەم پێ یە بێت :

مێژووی تەوێڵە، کۆنە دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لەچوار هەزار ساڵ لەمەوبەر.

## پەراوێزەکان

[١] هەندێك ئەڵێن ئەو ناوچەیە ( پایگەلان ) بووە ، کە دێیەکە لە هەورامانی ئێران .

[٢] المرشد . مواطن . الآثار و الحضارة . طه باقر و فؤاد سفر ـ الرحلة . ٦ لا.

[٣] بۆ نموونە : بەڕێز محەمەد سان ئەحمەد ئەیووت : ( میرزا عەبدولقادری تەوێڵەیی ) یش وتویەتی ( تەوێڵە ) بە ( دەربەند تەوێڵە ) ناسراوە ...

[٤] کتێبی ( اصول اسماء المدن والمواقع الجغرافیة ) جمال بابان . بەرگی ١ ـ ل ٤٩ ئاماژەی بەم ڕایە داوە ...

[٥] تەوێڵ : ناوچەوان

[٦] ڕایەکیتریش هەیە ئەڵێ : قەڵا میرزا ، بەناوی ( قارس میرزا ) برای ( تەهماسب شا ) ناونراوە ، کە لەکاتی پەنابەر یەکەیدا بۆ شەڕ و خۆپاراستن لەم ناوچەیەدا بووە .

[٧] ماوەزا : مەئوا وەزا ... شوێنگای گوێز ... مەڵبەندی گوێز ...

[٨] ماوامی : مەئوا واما ... شوێنگای بادام .

[٩] لێژڵە : لەبەرلێژی شوێنەکە ئەوناوەی لێنراوە .

[١٠] چلانە : چل + یانە = چل یانە واتە : چل خانوو ...

[١١] گۆڤاری ( هەزرا مێرد ) ژمارە ( ١٠ ) کانونی یەکەم ١٩٩٩ . ل ١١٥ .

[١٢] گۆڤاری ( کاروان ) ژمارە ( ٧ ) ل ١٣٧ بەشی عەرەبییەکەی ، بابەتێکی مامۆستای شوێنەوارناسی کورد (عەبدولرەقیب یوسفە) ... هەرچەندە خۆشمان شەوی ١٩/١٨ ــ ١٢ــ ١٩٩٨ سەردانیمان کرد بۆ ماڵی بەڕێزیان لەسلێمانی ، لەوسەردانەشدا زیاتر جەختی لەسەر ئەوە ئەکردەوە کە ( تەوێڵە ) و ( بیارە ) لەحەوت شوێنە جوانەکانی جیهانن ..وە وتی : نیازم هەیە لە ئایندەدا نووسراوێك لەوبارەوە بنووسم ، هەورەك لە گۆڤاری کاروان ژمارە ( ٧ ) دا ئاماژەم بۆ کردووە ...

[١٣] ( مستشرف شهرزور ) واتە : ملەی شارەزوور یان ... ( زیندووی شارەزوور ) .

[١٤] ( ابن حرداذبة ) لەسەردەمی ( ١٠ ) زایینیدا لە ( مختصر کتاب البلدان ) ل (٢٢٧ و ٢٣٦ ) دا ، ( چاچی بریل ) باسیان کردووە ، لەگەڵ چەند شوێنێکیتردا ...

[١٥] ئەوان وەك سەنتەری گۆڤاری ( العرب ) ئەو ئامادەییەیان دەربڕیوە ، لەراستیدا ئێمە هەر بۆزانین چەند پەرەگرافێکی بلاودەکەینەوە ، ئەگینا ، تاچەند لەحەقیقەتەوە

نزیکە و تا چەند بەهەڵەتان و پۆی چنراوە ئێمە لێی بەرپرسیار نین ، سەرەڕای ئەوەی کە ئێمە ئەگەر لەسەر ئەم بەشەیشی تێبینییەکی کەممان لەسەری هەبێت ، ئەوا لەسەر تەواوی بابەتەکە کۆ تێبینیەکی زۆرمان هەیە . سەرەڕای ئەوەی هەر بە بەراوورد کردنی ژیانی پێغەمبەرەکان ( سەلامی خوایان لەسەر بێ ) لەگەڵ قورئاندا تێبینی دروست دەبێت ...

(١٦) ئەم نووسینە دوور و درێژە بەتایبەت لەسەر پێغەمبەران ( ئادەم ، ئیبراهیم ، نوح ، موسا ، عیسا ) درودی خوایان لەسەر بێ . هەروەها ـ بەخت نەصر ـ حامۆرابی . هابیل . خضر . هتد ) و چەند کەس و شتێکیتره . کە سەرچاوەکەی گۆڤاری ( العرب ) ژمارە ( ٩ ) ( صفحە . الهاید بارك . اراء و قراء ) بەرواری ٢٨ ، ٢٩ ، ٣٠ / ١٩٩٠/٥ وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی عەرەبی ( تەقی عابد ) ...

(١٧) ئەم ڕایەش ڕاستە بڵێین تەوێڵە دەکەوێتە نێوان چوارشاخەکەوە کە ئەوانیش :
ا . شاخی پشت بەرامبەر ( وەراوەر ) ب . شاخی پشت مالێدەر . ج . شاخی هانەکڵە وەهارە .د. شاخی قەڵای گاوران . ئەم دوانەی دوایی دەکەونە پشت چلانەوە،چەمی دەمەرەسورا، لەیەکیان جیادەکاتەوە .

(١٨) ئەم گۆرانی زمانەوانییە ، ئەوەش هەڵدەگرێت بڵێین : لە وانەیە لەوشەی ( بڕێنمی) هەورامییەوە هاتبێت واتە هەموو برای یەکین ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر ئەو لێکۆڵینەوە ڕاست بێت .

# جوگرافیای تەوێڵە

١ـ شوێنی تەوێڵە

٢ـ سنوری تەوێڵە

٣ـ بەشە سەرەکی یەکانی تەوێڵە

٤ـ دانیشتوانی تەوێڵە

٥ـ ئاو و هەوای تەوێڵە

٦ـ سەرچاوەی ئاوی تەوێڵە

٧ -جێ شوێنەکانی تەوێڵە

٨ـ سروشتی جوانی تەوێڵە

# جوگرافیای تەوێڵە

**شوێنی تەوێڵە :**

شارۆچکەیەکی ناوچەی هەورامانی لهۆنە، کەوتوەتە بەشە کوردستانی باشوور لەسەر سنووری کوردستانی ڕۆژهەڵاتە لە ڕۆژهەڵاتی باکووری عێراق. ئەم شارۆچکەیە ناحیەکەی (بیارە )[1]یە و سەربە قەزای (هەلەبجە)یە لە پارێزگای (سلێمانی)، مەودای نێوان تەوێڵە و بیارە (١٤ کم)ە بۆ خورماڵ (٣٢ کم)و بۆ هەڵەبجە (٣٥ کم)ە و بۆ سلێمانی (١٠٥ کم)ە.

مامۆستا (عەبدول ڕەقیب یوسف)سەبارەت (تەوێڵە)لەنێوان شارولادێدا دەڵێ: (هەرچەندە تەوێڵە بەلادێ دانراوە، بەڵام دەتوانین بەیەکەم لادێی کوردستانی دابنێین، لەلایەن فراوانی و جوانی و زۆری باخ و باخاتەوە. تەوێڵە لەجۆری شارەوە نزیکە تاوەکو جۆری لادێ، لەبەر ئەوە ئێمە وەك شار سەیری دەکەین و بەسەریدا دەڕۆین. دەبێ بشزانین کە جوگرافیای شار چەند پێناسەیەکی هەیە ... گرنگترینیان دیاری کردنی بەوەزیفەی پیشەیی‌یە نەك بەقەبارە )[2].

بەپێی ئەو پۆلێن کردنەی کە م.عەبدوللەغەفور لە جوگرافیای کوردستاندالـ(٢٣٨)ـ کردویەتی بۆ ئاواییەکان،تەوێڵەلەشارۆچکەگەورەکانە، ،چونکە ژمارەی دانیشتوانی زۆرە.هەروەها دکتۆر (شاکر خەصباك)سەبارەت بە ئەو ناوەندانەی کە لەشار دەچن لەپارێزگای سلێمانیدا ئەڵێ:

(هەندێك شوێن هەیە لەشار دەچن لە ڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە، وەك ئەمانەی خوارەوە[3]:

تەوێڵە لە هەڵەبجە، ژمارەی دانیشتوانی ٢٩٣١ کەسە.
بەرزنجە لە شاربازێر، ژمارەی دانیشتوانی ١٧٦٨ کەسە.
پێنجوێن لە هەڵەبجە، ژمارەی دانیشتوانی ١٤٧٣ کەسە.
بیارە لە هەڵەبجە، ژمارەی دانیشتوانی ١٤٣٢ کەسە.
هێرۆ لە پشدەر، ژمارەی دانیشتوانی ١٠٩٢ کەسە.
هەڵشۆ لە پشدەر، ژمارەی دانیشتوانی ١٠٠٦ کەسە[4].

هەروەها ئەڵێ:

(... چەند ڕواڵەت و خەسڵەتی بیناسازی هەن بۆ دیاری کردنی ناوەندە شاریەکان، لەوانە: بازاڕ، شەقام، قوتابخانە، خەستەخانە، پرۆژەی ئاوو کارەبا، شارەوانی (کەشارەوانی گرنگترین دەزگایانە)...

جا تەوێڵە لە ڕووی وەزیفەوە زیاتر وەزیفەیەکی بازرگانی هەیە.

پاشان ئەڵێ: بوونی پیشە و کارگە و دەزگای خزمەتگوزاری لەناوچەکەدا نیشانەی شاریەتی، ئەو شوێنە زیاتر دەردەخات[٥].

دواجار ئەڵێ: یەکێ لەوهۆگرنگانەی کە هەندێ شوێنی کردووە بە شێوە شاری، بریتی‌یە: لە بازاڕ، هەرچەندە هۆی تریش ڕۆڵیان بینیووە لەوگەشەکردنەدا، وەك تەوێڵە و بیارە. تەوێڵە بەگەورەترین ناوەندی شێوە شاری دادەنرێت. هەقی خۆیەتی کە گرنگی‌یەکی تایبەتی پێ بدرێت بەڵام ... لەباسی گەشەکردنیدا دەڵێ: شوێنکات (موقع)ی تەوێڵە ناگونجێ بۆ گەشەی شارێکی بازرگانی ... فاکتەری سیاسی کاریگەری هەیە لەسەری، بۆ گەشەکردنی ... کەوابوو تەنها ڕاقەیەك بۆگەشەی شاری، ژمارەی دانیشتوانی یەتی[٦].

**سنووری تەوێڵە:**

تەوێڵە لەگەڵ چەند گوند و لادێیەکدا هاو سنوورە. لەباشوورەوە (سۆسەکان)و (پالأنیا)، لەڕۆژهەڵاتەوە (شۆشمێ)و (نەوسوود)، لە باکوورەوە (دزاوەر)و (هەورامانی تەخت)، لە ڕۆژئاواوە (کەیمنە)و (بێدەرواس)و (هانە گەرمڵە)و (دەگاشێخان)، لەسێلاوە بە کوردستانی ڕۆژهەڵات دەورەدراوە.

تەوێڵە لەدامێنی سێ شاخی گەورەی[٧] بەرامبەریەکدا خۆی وەك شارۆچکەیەکی قەشەنگ و دیمەنێکی نگین، نومایش دەکات. خانووەکانی لەدامێنەوە بۆ کەمەری شاخەکان چین چین هەڵزناون و بەیناوبەین تولەڕێگەیەکی پێچاو پێچ لەیەکیان دەکاتەوە و کەلێنێکی پشوو ئامێزیان پێدەبەخشێ ...

لەنواڵەی نێوان (ماڵیدەر و وەراوەر) دەوە بازاڕ درێژ دەبێتەوە تابەبەشی باشووری چلانەکۆتایی دێت.. بازاڕەکە لەناوەڕاستی هەرسێ بەشە کەدایە، خانوو بەرەکان شێوەیەکی پەیژەیی یان وەرگرتووە، لە زۆر شوێندا، سەربانی یەکەم دەبێتە جۆرە حەوشەیەك بۆ خانووی دووەم، زۆر لەشارەکانی (بەدلیس، ماردین، پاوە، ڕوان، بێساران ... هتد)دەچێت: (عەلی سەیدۆ گەورانی)ش هەروا ئەڵێ: ... خانووەکانی تەوێڵە چین چین چوون بەگژ شاخەکاندا[٨]. مامۆستا

(شاکیر فەتاح)یش لەوەسفی شارۆچکەی تەوێڵەدا ئەڵێ: ... لەبەردەمی ئەم هەیوانەوە، (واتە: هەیوانی خانەقا)ئەستێرك و سورکێکی جوانی ڕێك و پێك هەبوو، دەوروپشتی بەتەلە بەردی تەخت و خشت تەنرابوو، لەپێش ئەم سەکۆیەوە، دە، پانزە، دار عەرعەری سی گەز بەرزی چوو بوون بەئاسماندا. ئەگەر ئێواران لەسەر ئەم ئەستێرك و سورکە دابنیشیت و تەماشای ئەو چەم و باخانەی خوارووی خانەقاکە بکەیت، لەولایشەوە سەیری خانووەکانی تەوێڵە بکەیت، کە بەقەدشاخەکەدا هەڵچوو بوون، لەگەڵ ئەم دار عەرعەرانەدا، هەرچی خەم و خەفەت هەیە لەدڵتا نامێنی"[٩].

**بەشە سەرەکیەکانی تەوێڵە:**

پێشتر ئاماژەمان بەوەکرد کەسێ شاخی گەورە گەمارۆی تەوێڵەیان داوە، هەر خۆشیان تەوێڵە دەکەن بەسێبەشی سەرەکی یەوە ... زۆربەی خانووەکانی دوو، یا، سێ نهۆمن[١٠]، ئەمەش لەبەرهەر هۆیەك بێت ئەوەی لێدەخوێنرێتەوە، کە ڕووبەری خاکەکەی کەمە، لەچاو زۆری دانیشتوانەکەیدا و، ناوچەیەکی بەردەلانە و زەویەکەی سەخت و زەحمەت و گیرە و ساناەدەست نادات بۆ خانووبەرە ... خانوو دروست کردن و باخ دانان بەردەوامە بەلام ڕەنج و ماندوو بوونێکی زۆری دەوێ ... دامێن تاقەد پاڵی ئەم شاخانە گەواڵەیەك خانوویان لەخۆگرتووە، هەر بەشێکیشیان دەبێ بەچەند گەڕەکێکەوە ... بەشەکان ئەمانەن:

**١/ مالێدەر:**

گەورەترین بەشی تەوێڵەیە، لەنێوان دووبەشەکەی تردایە، ڕوو بەقیبلەیە و خۆرەتاوە، لەوانی‌تر زەویەکەی لەبارترە، جەمسەرەکانی گەیشتوونەتە هەردوو چەمی دزاوەر و ئاوێسەر. لەوانەشە دێرین ترین بەش بێت لە ڕووی ئاوەدان کردنەوە وە، چونکە وەك ئەڵێن:

هەر یانیو وەرش نەلونە     حەکیمیش زوو زوو ملونە[١١]

کەواتە لەسەرەتاوە خانوو لەشوێنی خۆرەتاوەکەوە دروست دەکرێت.

سیمای ئەم بەشە، جوانی چینی خانووەکانی لەسەریەك، بوونی مزگەوتی گەورەی شار لەدامێنییەوە و لووتکەی شاخێك لە باکووریەوە، ڕستی چەند کەپر و دارمێو لەسەربانەکانەوە و قوقزی کەمەری شاخەکە و چڕ و پڕی ئاوەدانی‌یەکەی و شەماڵی بەرەبەیان و پەلکەزێڕینەی پاش بارانی سەر لوتکەکەی، لەدیمەنە هەرە جوان و سیحراویەکانی دەڤەرەکەن.

بێجگە لە مزگەوتی گەورە، مزگەوتی (باساکا)و (بابائەسکەندەر)یشی تیایە، لەدوای ڕاپەڕینەوە، خانووەکانی ئێرە، لە شوێنەکانی تری (چلانە و وەراوەر)زیاتر ئاوەدان کراونەتەوە ... بەتایبەتی لەهەردووبەشی (دەرەتفیٚ)و (خەمەکاوە)دا.

گەڕەکەکانی ئەمانەن:

باخچە میرا، دەرەتفیٚ، بانە گۆرە یا هاڵەکوکیا، عەلی حاجی، شاسوارا، خەمەکاوە، ماڕی حاجی تۆفیق، ماڕی مامۆستا، پەشتو بانا یا بابا ئەسکەندەر، کوجیبن.

**٢/ چلانە :**

چلانە دووەم بەشە لەگەورەیی و زۆری دانیشتوان و چڕ و پڕی خانوو پشکی تیشکی خۆر و ئاوەدانیدا.

لەبارەی وشەکەیەوە ئەڵێن:

کاتێك بۆ یەکەمجار تەوێڵە ئاوەدان کراوەتەوە لە چلانەدا نیشتە جیٚبوون، تا بوونەتە چل یانە واتە: چل ماڵ پاشان لەچل و یەکدا خانوو لە مالێدەردا کراوەتەوە، مالێدەر واتە: ماڵ لەدەرەوەی ئێرە. یا مالەناوێك لەچلانەدا چووەتە دەرەوە، یا مالە توشی دەرد(نەخۆشی) هاتووە،وتویانە ئەوە(مالەدەرد)ە ،واتە ئەوە مالەنەخۆشە.

بەڕێز مامۆستا عوسمان هەورامی لەم بارەیەوە ڕایەکی تری هەیە و ئەڵیٚ: چلانە، لەچل خانەوە هاتووە، هەموو پیتێکی (خ)بووە بە(هـ)، (چل خانە) بووە بە(چل هانە) پاشان (هـ)کەخوراوە بووە بە(چلانە)واتە لەچلەخانەوە هاتووە.

ماتابانی شەوانی پایز و، قات قاتی خانووی نهۆم بەرز و، ڕاستە ڕیٚی قەلاٚبۆزان بۆ کۆتایی هانەسووسوو، مزگەوتە خنجیلانەکانی (کاك عەلی فەیرۆز)و (فەقیٚ ئەحمەد)و (قاپی شێخ)یا (حوجرەکەی مەلا نەزیر)و قوتابخانەکەی ساڵی ١٩٢٨ و قەیسەری و گەرماوە ڕەسەنەکەی ئێرە، لە بەناوبانگترین شوێنە ئامارژەکانی چلانەن.

گەڕەکەکانیشی ئەمانەن:

دەمەرە سوورا، سەفەر، ئوسایا، مەڵلایا، تاشلاٚ، هەلاٚوەگا، سەردەگا، قەلاٚبوزان، هانە سووسوو.

٣/ وەراوەر:

نـوێترین بەشـە، کەلـەپاش دوو بەشـەکەی تـر، ئـاوەدان کرابێتـەوە و، بەرامبەرە بە چلانە و مالێدەر، نسرمە و کەمترین پشکی خۆری بەرکەوتووە و سەخت و لێژە و خانووەکانی زیاتر یەك نهۆمن و نزیکەی سەد ساڵێك دەبێت ئـاوەدان کراوەتـەوە و، ئـەڵێن یەکـەمجار (حەسـەنی حەمەحسـێن) و (صـالحی حاجی صدیق) خانوویان تیا کردووەتەوە.

گەڕەکەکانیشی ئەمانەن: پشتی خانەقا، پشتی شاجۆ، یارە، ماوەزا.

**دانیشتوانی تەوێڵە:**

بەپێ‌ی ئەو زانیاریانەی کەدەستمان کەوتوون ژمارەی دانیشتوانی تەوێڵە بەم شێوەیەیە:

* بەڕێز موحەمەد سان ئەحمەد ئەڵێ: یەکەم سەر ژمێری لە ساڵی ١٩٣٤ دا کرا، ئەو سەرژمێریە گشتی بوو بۆ هـەموو عێراق، لەوکاتـەدا فەرمانبـەرێك کە حاجی ئاغایان پێ ئەوت لەسلێمانیەوە هات بۆ تەوێڵە و سەرژمێریەکەی کـرد، ئێمە لەتەوێڵەدا زیاتر لە ٥٠٠ ماڵ بووین، کە ئەیکردە نزیکەی ٢٤٠٠ کەس.

* دکتۆر شاکر خەصباك ئەڵێ: ژمارەی دانیشتوانی تەوێڵە لەساڵی ١٩٤٧ دا ٢٩٣١ کەس بووە[١٢].

* بەڕێز جەمال بابان ئەڵێ: (٧٥٠)خانووە و (٣٢٤٨)کەسە[١٣].

* کاك ئادەم باسام (کە کاتب نفوس ی تەوێڵەیە)وتی: دانیشتوانی تەوێڵە لەکاتی ناونووسی ١٢/١٠/ ١٩٥٧ دا بەپێ‌ی تۆماری (ئەحوال مەدەنی)ناحیـەی بیارە ٤٣٨٠ کەس بووە.

* هـەردوو بەڕێزان (مامۆسـتا حسێن موحەمـەد غـەفور و مامۆستا عـەزیز جەعفەر) ئەڵێن: لە ١٧/ ١٠/ ١٩٧٧دا کە سەرژمێری لەعێراقدا کرا، هـەردووکمان پێکەوە سەرپەرشتی سەرژمێریەکەمان کرد، ژمارەی ماڵەکان (١٦١٣)ماڵ بوو کە (٥٢٧٣)کەسی دەکرد.

* بـەپێ‌ی ئـەو پـرس و ڕاوێـژەی کەلەگـەڵ شـارەزایانی سەرناسـی شارۆچـکەکەدا سـازمان کـردووە، لەبـەرهاری ١٩٨١ دا تەوێڵـە ١٨٥٠ خێـزان و نزیکەی ٧٠٠٠ کەس بووە.

* ئەمساڵیش (٢٠٠٠)دەتوانین، سەرژمێری خـەڵکی تەوێڵە بەگشتی بـەم شێوەیە بخەملێنین[١٤].

لەناوخودی شارۆچکەی تەوێڵەدا ٦٨٠ ماڵ هەیە کە ئەکاتە ٢٧٢٠ کەس

| | | |
|---|---|---|
| لەهەڵەبجەی شەهید | ۳۳۰ ماڵ هەیە کە ئەکاتە | ۱۳۲۰ کەس |
| لەهەڵەبجەی تازە | ۲۲۰ ماڵ هەیە کە ئەکاتە | ۸۸۰ کەس |
| لەشاری سلێمانی | ۱۳۰۰ ماڵ هەیە کە ئەکاتە | ۵۲۰۰ کەس |
| لەشارەکانی تر | ۳۰۰ ماڵ هەیە کە ئەکاتە | ۱۲۰۰ کەس |
| لەدەرەوەی عێراقیش | ۲۵۰ ماڵ هەیە کە ئەکاتە | ۱۰۰۰ کەس |
| کۆی گشتی: | ۳۰۸۰ ماڵ کە ئەکاتە | ۱۲,۳۲۰ کەس |

**ئاو و هەوای تەوێڵە:**

تەوێڵە هەروەك زۆربەی شوێنە جیاجیاکانی هەورامان و کوێستانەکانی کوردستان، لە زستاندا ساردە و شێدارە، بەفروبارانێکی زۆری لێدەبارێ بەگشتی هەر لەتشرینی دووەمەوە تا کۆتایی مارت ساردە و بەتایبەتیش لە نیوەی تشرینی دووەمەوە بۆ نەورۆز بەفرو باران درێژەی هەیە ... تاوەکو نیوەی مانگی ئایار باران هەر دەبارێ ... جاری وا هەیە ئەوەندە بەفر دەبارێ لەشەو و رۆژێکدا دووتا، سێجار سەربانەکان دەماڵرێن، بەڵکو کووچە و کۆڵانەکان پڕدەبنەوە، لەگەڵ سەربانەکاندا رێك دەوەستن ... یاخود ڕێی سەیارە دەگیرێ و تەنانەت سەفەرکردن بۆ شوێنێکی نزیکی وەك (بیارە)ش دەبێتە ئەستەم و تا چەند رۆژێك شار بەپاوانەی بەفر ئابلۆقە دەدرێ، وەك لەشیعرێکی میرزا عەبدولقادردا ئامارەی پێکراوە کە دواتر یاداشتی دەکەین[۱۵] ...

بەهاری تەوێڵە، لافاوو سێلاوی پێیە ... نرکە و ناڵەی هەوری لەگەڵدایە ... گوڤەندی هەڵتۆقینی قارچکی لەدڵدایە ... کڕێ وا هەیە چەمی ئاوێسەر و دزاوەر ئەکەونە شەپۆکانی شەپۆلی سێلاوێکی سوور و لافاوێکی زەرەردەر، وەك ئەو لافاوەی کە لەساڵی ۱۹۳٦، ۱۹٥۷ دا هەڵیکردووە کە دواتر لەسەری دەوەستینەوە.

هەروەها (هەرەسی بەفر)یەکێکی ترە لەدیاردە سروشتیەکانی ئەم دەڤەرە، بەتایبەت لە(هانە کلەو دەرەتاریك و خەڵەفیو...)دا جاری واهەبووە زیانی زۆری داوە لەدارودرەختی باخەکان و تووشی شکانەوەو لەڕەگەوە دەرهاتنی کردوون.

لەگەمە و گەپەکانی نێو ئاپۆرای بەفری جوان و تارای سپی شاردا چەندین دیاردەی سەرنج راکێشی هەیە، لەوانە: شەڕە تۆپەڵ، شێرە بەفرینە، خلیسکێنە، وێنەگرتن لەگەڵ کلوە باریوەکاندا و ... هتد

هەورەها لە هەندێك شوێنی تەواو سارد و پتەودا دیاردەی چاڵە بەفر خەسڵەتی هێشتنەوەی بەفری لە ئەستۆ بووە بۆ ناوەڕاستی هاوین و

فرۆشتنەوەی لەبازاڕدا ... ئەم ساردی و سەرمایەی تەوێڵە، وای كردووە مەگەر هەر زۆپای دار، ورەبەگیان ببەخشیٚ و دڵ خۆش بكات، هەر بۆیە زۆربەی ماڵەكان تا ئەم دواییەش زۆپای بەگرمە و ناڵەی داریان بەكار ئەهێنا، چونكە، هەم دار زۆرە و هەم هەرزانیشە.

بەهاری تەوێڵە باراناوییە و مانگی یەكەمی زۆر دەبارێت. خەڵكی ئەم ناوچەیە زۆرتر لە مانگی دووەمیدا بۆ گەشت و گەڕان و سەیران و سەفا دەكەونە ئەو كەژ و كێوە ڕازاوانەی كە دەوروبەری شارۆچكەكەیان كردووە بە فەرشێكی سەوزی بەهارین. چەمی ئاوێسەر پشكی شێری بەرئەكەوێت لەم گەشت و گەڕانەدا... ئەم دەربڕینە بۆ ڕەزوباخەكانیش بەپلەی دووەم هەر ڕاستە.

هاوینیشی زۆر گەرم نییە و تیشكی خۆر دانیشتوانەكەی بێزار ناكات، بەتایبەت ئەوانەی كە بۆ سەروكاری باخ و باخاتیان خۆیان تەرخان ئەكەن هەر زۆر بە خۆشی هاوینیان لیٚ ئەڕوا تەنانەت ئەوانەیشی كەلەوێدا ئەمێننەوە نا پێویستن بەپانكە و كەرەستەی فێنككەرەوە... چونكە تەوێڵە لەنێوان سیٚ شاخدایە، كەمتر هەتاو دەیگرێتەوە و بەیانیان درەنگ هەڵدیٚ و مەگەر لەچێشتەنگاو بداتە ناو بازاڕ[١٦]... پایزانیشی پڕ لە سیحری جوانی و بۆنی گەڵا و خەزانی دار و پیٚگەیشتنی بەری ،هەرە دیارترین درەختی هەورامان نە، كە گوێزە. لەمانگی یەكەمیدا ئاوو هەوا فێنكە و سەرەتای كاروانی سارد و سەرمای درێژ دەگاتە جیٚ. ئەگەر لەشوێنانی تر وەرزەكانی ساڵ دوانیان زاڵن بەسەر تەمەنی ساڵدا و زۆرترینی مانگەكان بۆ خۆیان ڕام ئەكەن كە ئەوانیش هەردوو وەرزی هاوین و زستانن و بەهار ئەبێتە پاشكۆی هاوین و پایزیش زستان قووتی دەدات ... ئەوا لەم شارۆچكە خنجیلانەشدا وەرزەكان، دوانیان زیاتر زاڵ و دیارن، بەڵام كام دووان ؟ یەكەم: زستان پایزیشی لەگەڵدایە.

دووەم: بەهار كەپشكی هاوینیشی بۆ خۆی بردووە و لەم دەڤەرە هاوینیش هەر ئەڵیٚی بەهارە.

**چاڵە بەفرەكان:**

چاڵە بەفریەوە ئەوترێت: كە شوێنێكی گونجا و دەدۆزرێتەوە و دەستكاری دەكریٚ تا زیاتر لەباربێت بۆ مانەوەی بەفرەكە لەشێوەی چاڵێكی قووڵدا و پڕدەكرێتەوە لە بەفر و كەمێك دەپەستێنرێتەوە و پاشان بە (كا)و

(خویّ)و (گەڵای دار بەڕوو)دایدە پۆشن و لە وەرزی هاویندا بەکۆڵ یا بە وڵاخ دەیهێننەوە بۆ ناو بازاڕ و دەیفرۆشن.

**لەگرنگترینی ئەو چاڵە بەفرانەش ئەمانەن:**

١) یارەی مەحمود ئاغا، لەپشتی وەراوەرەوە بووە.

٢) کەریم خادم، لەپشتی خانووەکەی وەستا ئەمینەوە لە قەڵا بۆزان بووە.

٣) عەبدوڵای هەیبە کر، لەپشتی دەرە تفیّ.

٤) ئایزەی حەبیب لەدەرە تاریک.

٥) حاجی فەرەج لە باخەکەی خۆیدا، لە چەمی ئاوێسەر، لەشانەزەرا.

٦) عەلی کەریم حەمە سەعید، لەوەراوەر لەپشتی خانووەکەی خۆیدا.

٧) ئەسکەندەری سانە، لە چەمی ئاوێسەر لە هانە کڵە لە ساڵی حەفتاکانیش هەبوو.

٨) حاجی موحەمەد (حەمە مەجە)، لە زەمینی هەیاس لەساڵی ١٩٦٨ دروستی کرد تا ساڵی ١٩٨١ هەر دایدەگرت کە ئەمە تازەترین چاڵە بەفر بوو.

**سەرچاوەی ئاوی تەوێڵە:**

ئاوی ئەم دەڤەرە ڕەنگینە، بێجگە لە باران و بەفر و تەرزە، پێك هاتووە لە کانی و کارێزەکانی ... بێگومان کانیش بەو ئاوە زوڵاڵ و ڕوون و پاکە ئەڵێن کەلەزەوی‌یەوە بەرێگای سروشتی خۆی هەڵئەقوڵیّ ...

کانیش مەرج نیە رووبا، یێك بداتە پێش خۆی، بەڵکو ئەشیّ کانی ناو دیّ دەوری سەنتەری شاربیبنیّ وەك (پلوور)ی تەوێڵە، یا دەشیّ ئاوێنەی دڵگیری دەڤەرەکە و کرانەوەی هەست و هۆش و سروور بونی دڵ بگەیەنێت، وەك (گۆران)ی شاعیر ئەڵیّ:

کانی‌یەکی ڕوونی بەرتیفەی مانگەشەو
لەبنیا بلەرزیّ مرواری زیخ و چەو
جوانترە لەلای من لەدەریای بیّ سنوور
شەپۆلی باتەبەر تیشکی ڕۆژ شڵپ و هور

کانی، یەکێکە لە هۆکارەکانی نیشتەجیّبوون، زۆربەی گوند و شارەکانی کوردستان، لە دەوری (کانی)یەکاندا گرد بوونەتەوە و پاشان گەشەیان کردووە و بوون بە گوند یا دیّ یان شار.

هەموو دیاردە سروشتی‌یەکان دوو دیون، دووڕەهەندن، (کانی)ش بەهەمان شێوە چەند جوانە، چەند بەسوودە، بیّزیان نی‌یە، بەڵکو کانی‌یەکانی

کوردستان لەگەڵ بوونی سوودەکەیاندا لە ڕووی سیاسییەوە هۆکارێك بوون بۆ پەرت پەرت بوونی کورد و دروست نەبوونی شاری گەورە.

بەشێوازی هەورامی بە (کانی)دەوترێت:(هانە)جا ئەگەر وردبینەوە لە ناوی گوند و دێهاتەکانی هەورامان ئەبینین (کانی)ئەوەندە کایەیەکی گرنگ بووە لە ناوچەکەدا تەنانەت بووەتە تایتڵ و ناونیشانی زۆرێك لەو گوندانە کە ئەویش ڕۆڵی کاریگەری کانی دەرئەخات لەبوارەکانی ژیانی ئەو گوند و ناوچانەدا وەك: (هانە گەرمڵە، هانەی دن، هانە سوورە، هانە نەوتی ... هتد )

ئەم تێبینییە نەك هەر لەهەوراماندا بەڵکو لەبەشەکانی تری کوردستانیشدا هەیە وەك:

(کانی مانگا، کانی ماسی، کانی وەتمان، کانی ماران ... هتد )[17].

کانییەکانی تەوێڵە لەگەڵ ئەوەی بەشێك لە جوانی دیمەنی سروشتی ناوچەکە پێك ئەهێنن، سازگارن، پاکن، ڕوونن، زوڵاڵن، بەتایبەت ئاوی ئاوێسەر هەر سکەریشە (هازمەیشە)واتە: باتێریش بیت کە چوویتە سەرچەمی ئاوێسەر ولێت خواردەوە، پاش ماوەیەك هەست بە برسیەتی ئەکەیت[18].

بێگومان یەکگرتنی کانی و کارێزەکان لێرە و لەوێ دەبنە هۆی دروست بوونی چەم، لەتەوێڵەش هەروایە. وەك (چەمی ئاوێسەر، چەمی دزاوەر) ئەم دووانەش لەناوەڕاستی تەوێڵەدا بەیەك دەگەن و لەگەڵ کانییەکانی خوار تەوێڵەدا (چەمی خواروو- دەرەی وارین) کەبەچەمی گەربات بەناوبانگە پێك ئەهێنن.

دەتوانین ئەم کانیانەی ناوچەی تەوێڵە بەپێی شوێنەکانیان بکەین بەچوار بەشەوە:

**١- کانییەکانی چەمی ئاوێسەر:**

- هانە چەمە - هانە دیوا - هانۆ بنۆوەزی - هانۆلاسی - هانە هەڵوچە (هانۆ شیخی) - هانۆدەشتیلی - هانە کڵە ڕیزینە

- هانە کڵە (هانۆ ئیبراهیم زەڕین) - هانۆ سێمارەواری (زەمیە)- هانۆ ماوامی (سەرچەمە)- هانۆ ئایزە بارامی - هانۆ شەکەری - هانۆ لیژڵەی . هانە کڵۆ عەبولەو قادری - هانۆ دەرەتاریکی - هانۆ ڕەحمانی (کەمەر سپی).

**٢ـ کانی‌یەکانی چەمی دزاوەر:**

چەمی دزاوەر لەکانی یەکانی (چەمی هامنۆ و چەمی مەڕیَ)پێکهاتوون کەلە دزاوەردا دەبنەوە بەیەك و دێتە خاکی تەوێڵەوە ئەم کانیانەیش لەخاکی تەویڵەوە دەڕژێنە ناویەوە:

ـ هانە مڵکشا ـ هانە کلۆ سەعەی. ـ هانە مالمین (هانۆ شێخ شابەدینی).ـ هانە قالاوا[19].

**٣/ کانی یەکانی خودی ناو ئاوایی:**

ـ هانە سوسو. ـ هانۆ قادر بەگی ( کاریز و باخچە میرای). ـ هانۆ مەڵلایا. ـ هانۆ بازاری. ـ هانۆ پلووری.ـ هانە دلین.ـ هانۆ خاڵەکەی. ـ هانۆ ماوەزای.ـ هانۆ هاڵی سەفانای. ـ هانۆ خانەقای. ـ هانۆ باخچە و مەرقەدی.

**٤/کانیەکانی چەمی خواروو(گەریات ):**

ـ هانۆ ویسورەی.ـ هانۆ وەزلیی.ـ هانۆ صۆفی حانەی.ـ هانۆ عەلی. ـ هانە قالاو ا.ـ هانە وەیسە. ـ هانۆ حاجی بەشارەتی.ـ هانۆ سەلاحەی (شەتنیَ).ـ هانۆ کافە کوڵی.ـ هانۆ وێشەی.ـ هانە وحسەی. ـ هانۆ حەمە یوسوی.ـ هانۆ بێدەریی.ـ هانە و قالە و مەجنونی.ـ هانە و ئەحمەد ڕەواسی.ـ هانە و هەسار و صۆفی.ـ هانۆ مەڵلا جەمالی.ـ هانۆ چلە خانەی. ـ هانە و ئاساوگای.ـ هانە و هەسار و حەمە سەلیمی.ـ هانە و مەڵلا صادقی.ـ هانە و وەلی.ـ هانە و حاجی بابا لەی.ـ هانە و سەعلەی.ـ هانە و حەممەدەو شەی.ـ هانە و حەمە حەسەن و خاتوونی.ـ هانە و ئەولحەی.ـ هانە و خالانی لەدەرەقازان و هەورەها چەند کانیەکی‌تریش[20].

**جیَ شوێنەکانی تەوێڵە:**

تەوێڵە بەگشتی[21] لەسیَ چیای بەرز و سیَ‌چەم و بەشە باخ پێکهاتووە، ئەشتوانین ناوی ئەم شاخ و دۆڵ و ملە و نواڵە و گرد و قەلا و جیَ شوێنانە لەناو ئەلبومی سروشتی ڕازاوە و دڵڕفێنی ئەم ناوچەیەدا یاداشت بکەین:

کەمەرەکان: (کەمەر و شتر لە ... کەمەر بەڕەزا ... کەمەر عارەبە ... کەمەر سپی ... کەمەر و سێوەی ... کەمەر خەڕاتە ... کەمەر کولیری)

قەلاکان: (قەلای باجگیرا ... قەلای گاورا ... قەلای میرزا...[22] قەلای گویج ... قەلا مسێن ... قەلای سۆفی جانە ... قەلای هەسەن ... قەلای خەسرەو...)

ملەگاکان: (ملەگای وەچە کلا ... ملە گای‌تەی ... ملەگای سونیَ ... ملەگای بینجە...ملەگای خەڵەفی...ملەگای ویسورە..)

**جێ شوێنەکانی‌تر:**

(بلچە دۆڵە ... گەرمە دۆڵە ... شینگە دۆڵە ... دۆڵ و زەباری ... زەمین و هەیاسی ... لاسە و خەزانی ... دەرەتاریك ... سەرچاڵ ... تەوەنێ ... سەرتەلان ... تاشا حسێنەشەلی ... گوزیندار ... سەیمارەوار ... لیژڵە ... ماوامی ... دەشتیلی ... قوڵە ...مابەڵمی... جامباز ... دەم و شێنای ... خەڵەفی ... ویسوورە ... وەزلیە ... خڕوکاوی...)

(دەرەقازان ... وەزە زەردە ... بێدەری ... قاقوڵی ... دەرەگای بیلا ...نسارە ... دەرەی بەڵخ ... ئاساوگا ... گەڕیات ... شەتنێ ... حاجی بەشارەت ... ڕەزی صۆفی)

(دەرەی تەرتیبا ... تەختەی وارە ... ملکشا...نسارە...سەرجۆ...)

(سەرکەل ... دەرەتفێ ... پێشێرە ... شەمبانوو ... دەرزینکا ... ڕاسا یاری ... باخەوان ... وەزە سوور ... وەرەوی..)

هەندێك لەجێ شوێنی نزیك بەتەوێڵە: کە لەخاکی ئێراندان بەلام تەوێڵەیی سەردانیان دەکەن بەمەبەستی سەیران و ڕاووگەشت و گوزار " وەك:

(هامنۆ ... مەرە ... دالانی ... بزازەرا ... گماڵێ ... کاوێنا ... کویلە ... هانۆڕیزا ... کەما جەر ... دوختانی خان .... مرۆی کرۆبانگا ... خوڕ خوڕە ... هەیات ... مارانی ... گلو ۆ هەنگی ... حەوت کەشا ... هەزارانی ... سلۆر ... هانە شیروانی ... هانە مرۆ، هانۆ خانی ... نەلکمین ... دەرەقولێ ... هانە سوارا ... هەوارە خولێنە ... نوەیجەڕ ... پلورە چەرمی ... هانۆ قاژا.. هانە سیاو ... کەلەبەری دالا ... هانە کلەی میری ... هانە قولە ... هانە دێوانە ...)

**سروشتی جوانی تەوێڵە:**

ئەدمۆندز لەپەراوی (کرد ترك عرب – ل(١٥٥)دا لەبارەی جوانی تەوێڵەوە ئەڵێ:

(... تەوێڵە نمونەی جوانترین دێیە، لەدێ گەورەکانی هەورامان، ئەو شەوەی کەلەوێ بووم، لەناو خەیمەکەی خۆم، دانیشتبووم، کاتێك کەتاریکی داهات، سەیری چرا داگیرساوەکانی ماڵە چین لەسەر چینەکانی ئەوبەری خۆمم کرد، وام دەزانی لەناوەراستی کۆشکێکی ناو هەوردام، بۆ کۆشکێکی تری ناو هەور دەڕوانم ...)

نەشئەی جوانی و سروشتی ئەفسوونگەری کەژ وکێوو خوڕەی ئاوێسەرو سێلاوی‌چەمی دزاوەرو غروبی دەم کەلی کەش و خەنینی یاڵ و کەشکۆڵی شاخ و

سۆزی کەو ونەغمەی شوان ،ئەلبومێکی تەواو سیحراوی نومایشی چاو و زهنی بینەرئەدەن....

سەکۆی سەیران و مەکۆی ژیوار ،لەهەرجێ چینێك و لەهەرکات بەرێك... لێرە زرەی گەلایەو خەزانە، لەوێ تەقەی گوێزی بارێزەی بەیانە..لێرە هاژەی لێرەوارەو، لەوێ تەقەی ڕاوکەری دەم کەلانە ...لەلایەك بەهارێك، سوورە هەلاڵە، پێشوازنەو، لە جێ یەك دەنگی شمشاڵێکی غەمگین میوانتە ... لەماڵێك هاوخوانی دیوە خانی دۆستانی و،لەخانەقاش ئاشنای سەدای زکرونزای پیرای نەقشبەندیت ... لەدیوێك چراخانی مەڵۆی گەوهەری زانیاریەو، لەدیوێکی تر چەپکێك چنوورو دەستێك ڕێوا سی پێخەناوی شەوچەرەی شەوانتە... لەچەمکێك ژینت کارێزی پشووە و لەحەسارێك جروەی ئەستێرە و باوەشێك لەتریفەی مانگ میوانتە...تەلانی چین چین وباخ و باخاتی نگین وڕەنگین ... لەگەڵ خانوی لەسەر یەك وەستاوی وەستایانەی سەرتا بەخواری مالێدەرو چلانە... پێکڕا لاپەڕەیەك لەسروشتی هەست بزوێن تۆمار ئەکەن، کەبووەتە هۆی جولانی هەست وخرۆشی چەندین نوسەرو شاعیرو بوێژو خەڵکی هەست ناسك، کەلێرەدا بەشیاوی دەزانین ئامارە بەچەند پارچەیەکی ئەدەبیوشیعری ئەو هۆنەرانە بکەین[٢٣]:

- بەڕێز(عەبدولکەریم نەقشبەندی )لەپارچە شیعری (بەگوێرەی بەتوانا)دا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| بەگوێرەی توانا، هەڵیرێژادڵ | گەوهەری شیرین ،لە سەر پەڕەی گوڵ |
| ئاوی ئاوێسەر سێبەری گەڕیات | گەڕانی بەهار ،لە دەشتی هەیات |
| هاڕەی بەفراوی ،قاسپەی کەوی | کەپری سەربانان ،نوستنی شەوی |
| گولاڵەی جوانی،شەوبۆوچنورە | پشت بە هەورامان ،ڕووی شارەزوورە |
| بەفراودێتە خوار،لەودۆڵ وشێوەی | نمونەی بەهەشت ،ئەو کەژوکێوەی |
| بەرزی مالێدەر،چین چین چلانە | ڕوو بەگەرمیان،پشتی کوێستانە |
| ئەهلیتەوێڵە،خاوەن ئەخلاقن | هەموو خزمی یەک ،بەئیتیتفاقن |
| دێیەکی گەورەو،نزیک هەزارماڵ | بەخۆشی ئەژین ، دوورن لەخەیاڵ |

هەروەها لەپارچەشیعری (جوانی تەوێڵە) دا،ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| تەوێڵەخۆشە،شاری ژیانە | هەموو خزمی یەک ،دوورلەبێگانە |
| بابێمەباسی،دیمەن تەوێڵە | کەشاعیری کورد،لەمەدحی وێڵە |
| دیمەنی جوانی،کاتێدیم بەچاو | لەبۆ جوانی، قەڵەم خستی داو |

دەستم هەڵیگرت،نامەی ئاگرین چی لە دڵما بوو،نووسیم بەیەقین
تەوێڵەخۆشە،وەتەنی منە لانەی شێرانە،قەبری‌دوژمنە
باغ وئاوی ،جوان وغەمگینە لە خۆشی‌جوانی،بەهەشتی ژینە
دەڵێم بەڕاستی،زۆر بێ‌هامتایە حەیفە تا ئێستا ،نی‌یە لە کایە
کوێسنانی خۆشە،شیرین ژیانە بەهەشتی ئێمە،تاکی جیهانە
چونکە بۆ جوانی،شاهدە مێژوو کراوەمەدحی،ئێستاش وهەم زوو
بەسەرزارماهات،چی لە دڵمابوو هەڵم ڕژاند خەم،وەهازووبەزوو
خۆشی ئەم شوێنە،(ئاوی پلورە) چۆنی باس بکەم، سەیری (ویسورە)
بەهاریان لێ هات، کچی مالێدەر پۆل پۆل ئەڕۆن، بەرەو ئاوێسەر
پۆل پـۆلی کچـــان،بەلانــزاران قاسپەقاسپی کەو،لەسەرکەمەران
پۆل پۆلی کچان،لارولەنجەی گوڵ عاشقی شەیدایە،دڵی هەزاردڵ
گولاڵەسورە،لەسەرکوڵمی یار بولبول دەخوێنێ،نیشانەی بەهار

لەهۆنراوەی (دانیشتوانی تەوێڵە)دا دەڵێت:
خاوەن صنعات و، دوکان و باخن هەموو خۆش ڕەفتار،بەرزە دەماخن
صنعات کردنیان، باخ ودوکانیان ڕەوشتیان بەرزە، لەرێی ژیانیان
گەنج و پیرهەموو، لەپیاو و لەژن یا ئاسنگەرن،یاخۆ کلاش چن
ژنیان رێس رێسن،تاکو ئێوارە پیاویان جوڵان،ئەهلی ئەم شارە
بەهاریان لێ‌هات،ئەچن بۆگەڕان بەلەنجەو بەلار، لەسەرکەمەران
قیوە قیوئەکەن،تاکوئێوارە پاشان دێنەوە،بەرەو ئەم شارە
باخی‌تەوێڵە،بەیەکجار زۆرە میوەی تیایە،لەهەموجۆرە

جگەلەمەش، هۆنراوەیەکی (١١٠) دێڕی هەیە کەبەگشتی وەصفی تەوێڵە دەکات.

ـ بەڕێز (تۆفیق هەورامانی) لەساڵی (١٩٨٢)دا کەدوورکەوتوەتەوە لەتەوێڵە، لەهۆنراوەی (سەفەری شەماڵ)دا کەبەبۆنەی چۆڵ بوونی تەوێڵەوە ئەم هۆنراوەیەی نووسیوەو ئەڵێ:

هەرچن بیاری،ئازیزەنە لام پیلانە لوە،یەکسەر سێ سەلام
سێ سەلام لوە،پێ دەرۆ بەڵخەی چاگە بنیشەرە،سیر واچە ئۆخەی
جە دەرۆبەڵخەی، ئاوێ مێرەوار ئاوەکوچەمەی،تەوەنی نازار
چاوە،دە،لابلای، مڵکەکۆ شەمی تەماشاکەرە،بەرکەرە خەمێ

ئاپێچەپێچە، ئاملەملە ... تاکەبیاوی،پێچی‌مام بلە
وەزەرە،کەل و، تەوەن چەخما خی ... بدیۆنسارەو،پەشت وچوارباخی
ئینجا ،دە،لابلای،ڕا،سوسەکانا ... سەرەچیر،بدیە،دەرەقازانا
شەماڵ ،چا لوە،ڕوو بە باجگیرا ... بدیۆ قاقوڵی،چندە دڵگیرا
بێدەریە،بدیە،ڕووبە نسارە ... شاجۆ سۆزبیەن،ئادۆرو بارە
یاوای گەڕیاتە،نەختیو بنیشەرە ... بدیۆ پەی شەتنی و،ماوای سەردەرە
ئنجا کەیاوای،ئۆهانە وێشە ... ئاویوە وەرە ،ئاخێو هورکیشە
قەزاد لە ماڵم،شەماڵی گیانی ... یەواش هورووەزە،پێچ و خمخانی
تەماشە کەرە،ناوجەرگەی بازار ... وینە، فوارە ،هەم سورە چنار
ئاوی بوەرە،چەمۆ پلوری ... یاگو پیا خاسا،ڕوومەت پڕنوری
ئنجا کوجیبن،هورووەزە سەر ... هەتا بیاوی،بابا ئەسکەندەر
بابائەسکەندەر،چاولای نەلی ... بەس لاوە بدیە،پەی ڕاو سەرکەلی
جا چاوە لوە،خەمەکاوەرە ... یەواش سەرو وێ، ئارام وەزەرە
هەتا بیاوی،ئۆوەزە قمی ... ئانە چایخانەن،چا سەرو گمی
ئامان سەدئامان،شەماڵی‌نازدار ... چیرو باخچارە،بوریوەبازار
لاییێچ کەرەوە،مەنزڵگەی‌گەنجان ... دۆران دۆرانا،دونیاکەی زەمان

هەروەها ،لەشوێنێکی تریشدا دەڵێ:

خوایا نەکوشیما،پی گشت داخاوە ... تا دەم بنیەیمێ،هانە چەماوە
هانەو کافەکوڵێ،هانەکڵەی‌وێشە ... خوایا وەسیشا،ئی گەرۆکیشە
ئینە چن ساڵن،دڵما ئەسیرا ... دەی وزیما وە،پێچی باجگیرا

- بەڕێز (فاتح عەبدولکەریم) لەناميلکەی (گەشتی بیارە)دا دەربارەی تەوێڵە دەڵێ:

(...لەناکاو دەنگی،تەوێڵەی‌سازگار ... هاتەگوێم وتی: بۆ لای من ڕێبوار
هەڤاڵی یەکن،بیارەوتەوێڵە ... ئەوێت دی منیش،بەجێ مەهێڵە
ئەمەک و وەفا،داگیری کردم ... بەرەو سەر ڕێگای،تەوێڵەی‌بردم
لە(تەپی نیعمەت)بۆ،(دەرگای شێخان) ... لەوێش بۆ(بەڵخە)،جا بۆ(سۆسەکان)
نەختێ ڕاوەستام،لەو سەر ملەیە ... ڕێگام لەبەرە،زۆرم پەلەیە
(سۆسەکان)لەمبەر،(شۆشمێ)لەوبەر ... زۆر دێی کوردستان،ئەمبەرەوبەرە
لەخواری (شۆشمێ)،(نەوسود)دیارە ... چەن با سەفا بوو،سەر(حەوزەلارە)
چەند خۆش بووئەوسا، کەئاوەدان بوو ... بووکی‌ڕازاوەی،گشت (هەورامان)بوو

خەیاڵ هەر بردمی،بەرەو ئەولاوە
(سەراو چون هەوڵی،مەسکەن چون پاوە
تائێرەبەس بێ، وتم بەخەیاڵ
گەڕامە دواوە،بەرەو(سۆسەکان)
لەم لاداری گوێز،لەولاداری گوێز
لەبەرپێ ڕووبار،لای سەرلالەزار
لای چەپ چایخانەی،(گەڕیات)ئەگەڕێ
هەتا دەگەیتە،ناوەڕستی دێ
هەتا خۆرئاوا،دەبێ لەو ناوە
لەدێ بۆناو باخ،لەناوباخ بۆدێ
لاوانی قۆز و،جوانی مشکی لار
ڕێگا ئەڤینە،هەوائەڤینە
ناوت زیندووە،گۆرانی مەزن
(اسیاچەمانە ...سیاچەمانە
دەستی چەپی چەم،دوور لەدڵداری
بەعیشقی پاکی،لیقای خوداوە
قەریحەی مەعدوم،لێرەکراوە
ئای دنیا سەیرە،دەوران دەورانە
(سەدای ئاسیاوچی، مەیۆ پەیاپەی
هەرکاتێت زانا، دەورێ وەردەوە
بەرەو ژوور بازاڕ،لەهەموو بابەت
یەکێ ئاسنگەر،یەکێ دارتاشە
یەکێ خەیاتی،چۆخە و ڕانکە
لایەک دوکانی،مشکی و قوماشە
لایێ کەبابچی،نانەوا لایێ
لایێ مزگەوت و، بانگ ومەلایە
شارەدێ یەکی،گەورەو گرانە
وەستای تەوێڵە،کارامەی هەرکار

تا گەیاندمیە،ناو شاری(پاوە)
ماچی بەهەشتەن،وەرووی دنیاوە)[٢٤]
زیاترڕێ ناکەم،نەخۆشم وبێحاڵ
داپەڕیمەخوار،بۆناو باخەکان
خەریکن ئاسمان،بگرنەئامێز
باخی بەهەشتەو،جۆگەیەوجۆبار
چەمی(تەوێڵە)،لایڕاست ڕێ ئەبڕێ
سێبەرەو هەتاو،نادا لەبەرپێ
پۆپەی دارەکان،هاوڕێی هەتاوە
پۆل پۆل نازداران، دەگرن ڕێچکەیڕێ
لەدوورو نزیک،شانەوشانی یار!
ئاسمان ئەڤینە،کوارێ؟!کوا کینە؟!
تەنهالەخۆت دێ،وەسپی خاک و ژین؛
هەورامان جێگەی سیاچەمانە)[٢٥]
خانەقای شێخەو،عیبادەتکاری
ڕوویان تێدەکرد، لە هەرزارلاوە
خەرمانی شعری، لێرە هەڵداوە[٢٦]
شەڕی ژیان و،مانو نەمانە
ئای سیاو خاڵی یەن،نۆبەتەن سەدەی
ئێمەیچ چون یاران،پێچامان کەردەوە)[٢٧]
هەریەک خەریکی ،جۆری کەسابەت
یەکێ خەریکی ،گیوە و کڵاشە
یەکێ خەریکی ،بێشکە و لانکە
لایە کەوش دروو،لایەک سەرتاشە
ماسی (دزاوەر)،ئەکڕێ کابرایە
نوێژ و دەستنوێژ و ،ساتی خودایە
بۆهەرلائەڕۆی،هەر ڕەنج کێشانە
بێهاوتان لەگشت،خاکی کوردەوار

بازارم جیٚ هیٚشت،ڕووەوائاوێسەر) بەدرێژایی ڕێ ،هەردارو سێبەر
هەتاگەیشتمە، پانتای بن شاخ شاخی هەورامان، لای سەر بەرپیٚ باخ
لەشەش حەوت لاوە،قوڵپی کانی یە دەڵیٚی سەرچاوەی ،زیندەگانی یە

- بەرێز(م.عوسمان هەورامی)ش"لەپارچە شیعری(خەزان و ئاوێسەری)دا، ئەڵی"[28]:

دیسان ئاوێسەر،زەبوون وزەردەن جەدووری یاران ،خەزانش کەردەن
چەمەران یاران،گێلاٚوە جەنۆ سەیران کەراوە،جەسەرچەمەو کۆ
ئاوەدان بۆوە،بەهەشتیبەرین نوش کەراوە نوش،سەرچەمەی شیرین
چەرخی چەخماخە،هورچەرخیۆ هەمدیس سەرنگون بانیٚ،بەدانی نەگریس
هەزاران چەمان،وێنەی ئاوێسەر شادی شان پەخشان،بونە سەرانسەر
دیسان جەنۆوە،دەستەی دڵبەران بەیاوە سەردا، پەیگەشت وسەیران
مەنۆ ئاوێسەر،بەوێنەی جاران بۆ بە سەرچەمەو،دیدەیوەهاران
ژیوای دوبارە،دەس پەنە کەرۆ گرد کەس مەراقش،وەباد بدەرۆ
دوور جە نەیار و،کسپەو خەم و وەی وەشتەرین وەشین ،ژیوای سەرنەوەی

- مامۆستا (گۆران)ی شاعیریش، لەشیعری(گەشتی هەورامان) دا وەسفێکی جوانی گشتگیری هەورامان دەکات و، ئەمەش چەند کۆپلە شیعرێکیەتی[29]:

**دیمەنی ڕێگاوبان:**

کۆمەڵەشاخێک،سەخت و گەردن کەش ئاسمانی شینی،گرتۆتە باوەش
سەرپۆشی لوتکەی،بەفری زۆر سپی بە دارستان ڕەش ،ناودۆڵی کپی
جۆگەی ئاوەکان،تیایا قەتیس ماو هەرئەڕۆن ناگەن،پێچی شاخ تەواو
هاوارو هاژەی،کەف چڕینی چەم بۆ تەنیایی شەو،لایە لایەی خەم!
توولە ڕێی باریک،توونوتوون پشکن ڕێبوار ئەخاتە،ئەندێشەی بیٚ بن..
ناوڕێگا تەق تەق،لاڕیٚ بەردی زل کە هێشتا گەردون،پیٚی نەداوە تل
گا سەرەو ژوورە،گا سەرەو خوارە تاڵی و شیرینی، دنیای ڕێبوارە

**ڕێگای ناو باخ:**

پێش ئەوەی بگەی،بەئاواتی دێ ئەکشێتە ناوباخ،توولە ماری ڕێ
شنەی سێبەری،داری گوێزوتوو ئەسرێئارەقی،ڕێبواری ماندوو
تەسکینی ڕێگای،باخەو باخیوێڵ (مانوو نەبی)یە،لەم کێڵ بۆ ئەو کێڵ!

- سەلامون عەلەیک،مامەی بن دارگوێز سەلامی مانوو،لەپیری بێهێز!..
- مەرحەبا سەرچاو،بەچکەی کاکوڵقیت سموٚرەی سەردار،ڕوٚڵەی زرنگ و زیت!..
ئەرۆی هەر ئەرۆی،تەلانەو تەلان... ئەمجا ئەگەیتە،پێچی بەرمالان

**دێ:**

کام بەر بەرۆچکەی،زۆر با سەفایە چەشنی دڵی شاد،دێیە ئاوایە!
خانوی بەگزادە،لەسای درەختا ئارامی بووکە، لەکۆشی بەختا
خانوی ئەهالیش،زۆریان دوو نهۆم هەندێ قنج وقیت،هەندێ لار وکۆم..
یەک لەسەر یەکتر،بەرەولووتکەی کێو بۆ ئاسمان ئەچن،وەک پێ پلیکەی دێو!
لەدێدا کام جێت،گەورە بەرچاو کەوت:ماڵی ئاغایە و، خانەقاو مزگەوت...!

**بەیان:**

(اللەاکبر)،مەلا بانگدانە تاریک ولێڵی ،بەری بەیانە
مانگی بەجێماو، لەسەفەری شەو زەردە لەترسی ،قاسپە قاسپی کەو!
ئەستێرەی مەغریب،وەک قەترەی ئەمەل کز کز ئەتکێتە ناو، بەفری سەرکەل!
لەڕێی ئەوبەری ،شاخ دەنگی زەنگ دێ لەشوێنی ڕاوکەر، تەقەی تفەنگ دێ!
هەرسیحری ڕووتە ،سروشت ئێستاکە! وا بەتەواوی، دنیا ڕووناکە
لەدرەخت ئەدا ،شنەی بای سەحەر جم و جووڵەتی، چەشنی سەودای سەر
لەسەر جۆگەی ئاش، قاز و مراوی چاوەڕێی ڕۆژن، هەڵبێنێ چاوی
بەڵام تا خوڵقی، نەکا چێشتەنگاو نایەتە ناو دێ،پرشنکی هەتاو!...

**مزگەوت:**

بنچینەی مزگەوت، نیشتوٚتە ناوچەم ڕوو بەرەو قیبلە، پشت لە جەهەننەم!
مزگەوتی کاتی ،چێشتەنگاوی چۆڵ: وەک مردوو کفنی ،بێدەنگی بەکۆڵ !
سوورە چناری ،لق و پۆپ درێژ سێبەر ئەکا بۆ، خەوی بەردەنوێژ!
جارجار ئیمامی ،تەنیا گۆشەی حەوز: سەر سنگ ماچ ئەکا،ڕیشی بە وەنەوز!
کەسێک بانگ ئەدا، ئەشڵەقێنێ گۆم ئیمام هەڵدەستێ: داربەدەست پشت کۆم!
تا تەواوئی بێ،(اللە ا کبر) پەنگ ئەخواتەوە،لافاوی نوێژکەر...
نوێژ بەتاڵئەبێ،جەماعەت بڵاو چەن پیرێک ئەبن، بەخڵتەی لافاو:
سوچێک گەرمئەکەن،بەڕازی جوانی ئاخ بەبائەدەن،بۆ دنیای فانی!...

**ژن:**

ژنی هەورامان: سەرتاپا خشڵ سەرچاوەی بۆنی،مێخەک وسمڵ
تا بڵێی تەرپۆش،ئاڵ و والاجل بەژن وبالاجوان،بەدەن نەرم وشل!

نێونیگای خەندەی،ئەستێرەی‌ئەمەل نەغمەی‌گفتوگۆی، وەک جریوەی‌مەل!

ژینی بەهاری،عەشق وجوانی جیلوەگای حوسنی:ڕێی باخ وکانی!...

**گۆرانی:**

عەشقی‌ئێوارەی،سەرە ڕێی‌کانی بەر ئەداتە چەم،کڵپەی گۆرانی

ڕۆژ ئاوا ئەبێ،چەم تاریک دایە دەنگی (کنا لەیل)،هەر دوایی نایە...

مانگ بە تریفەی،ناو دێ ئەکا کەیل هێشتا هەرگەرمە،ناڵەی (کنا لەیل...!)

(سیاچەمانە...سیاچەمانە...) بەهەشتی عەشقە،ئەم هەورامانە!

ئەوەندەی دار و، بەردی هەورامان ڕەحمەت لەژنی، بەژن وبالا جوان!

(سیاچەمانە...سیاچەمانە...) هەورامان جێگای، سیاچەمانە!...

ـ هۆنراوە فۆلکلۆری‌یەکان: ئەوهۆنراوانەی بەسروشتی تەوێڵەدا وتراون زۆرن لەوانە:

هەناسەی سەردم، دەروون زیاوە (گەرپات)ەش سوچنا ،نیشت (خانەقا)وە

تەرمەکیم بەردێ، (هاڵی‌صەفانا) گۆری و گولانی، یاسینم وانا

تەرمەکیم بەردی،بە(وەراوەرا) هەرکەس دڵسۆزا، ماڵۆ وەسەرا

یانیوت کەردەن ،ئینا(مالێدەر) ئاگادارت بوو،خوای (بانیسەر)

هەوار باشکەرد،پەی(ئاوێسەر)ای بێ وەفا نەبی،مێل کونە کەری

ماڵ جە(مالێدەر)،دوس جە (چلانە) نە پای بەرم هەن،نە نیشتەی یانە[٣٠]

کەم بۆ کەم بچۆ،بە(گەرپات)ەدا صەیاد نەمەنەن، جەولاتەدا

ئەگەرحەز کەری ،وەشی قیاری لوە (گەرپاتە) ،یا (دەرەوچنار)ای

صەباحی ساڵحان، گەردو بەیانی بلمێ(دەرەرە) ،سەرو خەزانی

(کوجیبن)سەختا ،ئامۆشۆی نەکەی وەشا ڕێی(کارێز)،گەرپرس بەمن کەی

یاخوا(نەڵکمین)،هور کنێو جەبن بەڵکو بەربیۆ، نوری دڵەکەی من

ئاخ من(گەرپات)ە، گوزەرێم کەردێ سەرەم دیار و،(تەوێڵی) بەردێ

(دەرەو زاوەر)ای، یاخوا بۆ ئاوا بەڵکو بەرگتۆ، شاو چەمەسیاوا

خوایا لەوکەلە، بم خەیتۆ وەبان بم خەیتۆ مابەین،(بەڵخە و سۆسەکان)

ئانە کێن ماچو،(تەوێڵی) وڵات خاکش نوقڵینی و، کەش و کوش نەبات

ساحبی وهورستا، هەساری وێڵی وەشڵەییم بەڕوەکە و،(دەرەوتەوێڵی)

سوورە هەڵاڵە و، بەرز و ئاکەشا (هۆرامان) گردش، سەرانسەرەوەشا

پشتەوەی

بەرامبەر

لێژڵە

٢٠٠٣/٥/١

پشتەوەی

مالێدەر

٢٠٠٣/٩/١٠

پشتەوەی

چلانە لوتکەی

قەلاّمیرزا

٢٠٠٣/٥/١

پاییزی
تەوێڵە
بەشێك
لەماڵێدەر
١٩٧٦/٢/٥

مەرکەزەکەی
تەوێڵەو
بەشێك
لەچلانە
١٩٧٦/٩/٣

زستانی
تەوێڵە
بەشێك
لەچلانەو
بەرامبەر
١٩٧٧/٢/٩

زستانی تەوێڵە - بەرامبەر ١٩٧٧/٢/٩

ئاوێسەر – زستانەو بەفر سپی دەکاتەوە ...... ١٩٧٦/١/٢٩

کەسەکان: ڕاوەستاوەکان لەڕاستەوە بۆ چەپ: شەریف حەمەڕەیم – ئەنوەر ئەبوبەکر – صەباح حەمەکەریم – ناصر حاجی بابا – عەبدوڕەزاق عەبدوڕەحمان - حەمەصاڵح تۆفیق - حەمەشەریف صابر – نەجمەدین مەحیەدین.

سەردار حەمەخان – دانیشتووە ...... نوری قادر فەتاح – لە پشتەوەیە.

## پەراوێزەکان

[١] تاوەکو ساڵی ١٩٧٠ ( تەوێڵە ) و ( بیارە ) ش سەربەناحیەی ( خورماڵ ) بوون ، دوایی جیاکرانەوە ( بیارە ) بوویە ناحیە و ( تەوێڵە ) خرایە سەر بیارە .

[٢] گۆڤاری کاروان ژ ٧ ل ١٢٣ .

[٣] ئەمە بەگوێرەی ئامار بەندی ساڵی ١٩٤٧ بووە .

[٤] د. شاکر خصباك لەکتێبی ( الاکراد . دراسة جغرافية اثنوغرافية ) لە ( المراکز شبه المدنية في لواء السليمانية ) ل ٢١٢.

[٥] لە هەمان سەرچاوەی رابردوودا ، بەشی ( صفات ووظيفة مراکز المدينة ) ل ٢١٧

[٦] هەمان سەرچاوەی ڕابردوو ل ٢٢٦

[٧] شاخەکانی پشتی ( مالێدەر و وەراوەر و چلانەن) ... بەلاّم ئەمەی سێهەمیان دووبەشە و قەڵای گاوران بەشێك و ( هانە کڵەوەهارە ) بەشەکەی تری پێکدەهێنێت .

[٨] لە( عەممانەوە بۆ ئامێدی ) گەشتێك بە کوردستانی باشووردا ... عەلی سەیدۆ گەورانی نووسیویەتیو طالب بەرزنجی کردویە بەکوردی، ل ٦٦. نووسەر لەساڵەکانی (سی)دا گەشتێکی بەکوردستانی باشووردا کردووە و هەندێك شتی تۆمار کردوە .

[٩] شاکیر فەتاح لە ( گەشتی هەڵەبجە و هەورامان ) دا کەلەگەڵ ( ئیسماعیل عەلی ) ناوێکدا کەلەبەرواری ٢١ /١٩٣٣/٨ دا دەچێتە تەوێڵە ئەمەی سەبارەت بەتەوێڵە یاداشت کردووە .ل ٣١

[١٠] سەرچاوەی ڕابردوو ئەڵێ : تەوێڵە ( ٦٠٠ ) ماڵ بووە ، نزیکەی ( ٥٠ ) خانووی سێ نهۆمی تیابوو .

[١١] ئەمە وەکو پەندێك لەناوچەکەدا بلاّوە واتە : هەر ماڵێك خۆر نەیگرێتەوە، حەکیم و پزیشك زوو زوو ڕێ یان لێ ئەکەوێت .چونکە خەڵکەکەی تووشی نەخۆشی دەبن .

[١٢] الاکراد . د . شاکر خصباك ، ل ٢١٢.

[١٣] اصول اسماء المدن والمواقع الجغرافية ، ج ١ ، جمال بابان ، لا ٢٤٩ . لەم کتێبەدا ساڵی سەر ژمێریەکە نەهاتووە بەلاّم کتێبەکە ساڵی ١٩٧٦ دانراوە .

[١٤] بۆ ئەم سەرژمێریە ، پاش وەرگرتنی ڕای کەسانی شارەزاو ڕیش سپی ، شوێنە جیاجیاکان و، پرسیار کردن لەکەسانی ئاگادار، ڕێژەی ماڵەکانمان بەنزیك کردنەوە داناوە، ژمارەی کەسەکانیش بۆ هەر خێزانێك (٤) کەس دانراوەو بەشێوەی گشتی پاش ئەوەی هەر(٥٠) ماڵ لەشوێنێك ناونوسمان کردبن ئەو ڕێژەیەی بەدەستەوە داوە.

(١٥) تەنانەت لەساڵەکانی ١٩٥٩ و ١٩٧٤ و ١٩٩١ دا ئەوەندە بەفر باریوە کەدار و درەختێکی زۆر لق و پۆپەکانیان شکاوە و چەندین باخ تووشی زەرەرو زیان بوون بەوهۆیەوە ... هەربۆیە زۆرجار لەکاتی بارینی بەفری وشك و زۆردا ، خاوەن باخەکان ، درەختەکان ڕادەوەشێنن بۆئەوەی بەفرەکەی لەسەر بوەرێت و لق و چڵەکانی قورس نەبن و بشکێنەوە .

(١٦) گۆرانی شاعیر جوان تەعبیری لەم حاڵەتەی تەوێڵە کردووە کە ئەڵێ :

لەسەر جۆگەی ئاش قاز و مراوی     چاوەڕێی ڕۆژن هەڵبێنێ چاوی
بەڵام تا خوڵقی نەکا چێشتەنگاو     نایەتە ناو دێ پرشنگی هەتاو

(١٧) سوود وەرگیراوە لەبابەتێکی بەڕێز ( فەرەج عەلی ) بەناوی ( هەندێ زانیاری دەربارەی کانیەکانی کوردستان ) کەلە گۆڤاری ( کاروان ) ژ : ١٦ ی ١٩٨٣ دا ل ٦٧ بلاوکراوەتەوە .

(١٨) شاکیر فەتتاحیش لە گەشتی هەڵەبجە و هەوراماندا ل ٣٨ دانی بەمەدا ناوە .

(١٩) ئەم دووانەی دوایی لە ( دزاوەر ) ن بەڵام بەزۆری تەوێڵەیی سوودی لێوەردەگرن . بۆیە نووسیومانن.

(٢٠) ئەم کانیانە بەقەد پاڵی شاخەکانەوەن بەڵام زیاتر لەبەشی خوارەوەی تەوێڵەن بۆیە لەم بەشەدا یاداشتمان کردن.

(٢١) ئەم یەکەیە تایبەتە بەجێ شوێنەکانی وەك شاخ و دۆڵ و نراڵە و قەڵاو ملە و ... هتد ، هەروەها لە ( العراق الشمالی ) نووسەر : د . شاکر خصباك ، ل ٢٢٨ دا هاتووە کە بەرزی چیاکانی هەورامان ( ٢٥٤٨ ) مەترە . لەچیابەرزەکانیش وەك : کۆسالان ، شاهۆ ، ( تەخت یا کەژی سپی ) ، قەڵا میرزا ، قەڵای گویج ، ملەگای بینجە .

(٢٢) دەڵێن :ناوی (قەڵامیرزا)،ناوی(قاس میرزای تەهماسب)ەوە،هاتووە،(قاس میرزا)، برای (شا تەهماسب)ە، یاخود لەوانەیە،(قاس میرزا) ئەم شاخانەی کردبێت، بەقەڵای خۆی، کاتێك کەلەگەڵ براکەی، لە ساڵی(٥٤٢ك)تێك دەچێت.

(٢٣) ئەم شاعیرانە،لە شوێنەکانی تر دا،بە سەرمان کردونەتەوە.

(٢٤) ئەم بەیتە هەرچەند،وەك فۆلکلۆری لێ هاتووە بەڵام لەڕاستیدا هۆنراوەی میرزا عەبدولقادری پاوەیە.

(٢٥) یەکێکە لە بەیتەکانی گۆرانی شاعیر کەلە(گەشتی هەورامان)دا وتوویەتی.

(٢٦) (مەعدوم)،نازناوی(سەید عەبدوڕەحیمی مەولەوی)یە.

(٢٧) ئەم دوو بەیتە هی (مەولەوی)یە.

[٢٨] بڕوانە گۆڤاری هەڵەبجە ژمارە(٣ـ٤)ساڵی یەکەم(١٩٩٩) کە شاعیر لەبەرواری (١٩٨٩/١١/١)دا نووسیویەتی.

[٢٩] نالێین مامۆستاگۆران ،ئەم وەسفەی بەتەواوی لەسەر تەوێڵەیە، بەلام، بەدووریشی نازانین،چونکە لەویٚ ژیاوەو وەسفەکەش لەگەڵ، تەوێڵەدا دەگونجیٚ ودواتر وەك بیرەوەریەك، لەگەڵ گەشتەکەی‌دا تۆماری کردووە... سەیری‌دیوانەکەی بکە. محەمەدی مەلاکەریم ـ ل(١٢٧.١٣٤).

[٣٠] ئەڵێن: ئەم بەیتە هی(مەولەوی)شاعرە،بەلام ئێمە بەڵگەیەکی گومان بڕمان لەسەری دەست نەکەوت.

# هونەری ئاوەدانکردنەوە لەتەوێڵە

ڕێ خۆشکردنێك

یەکەم ـ د یواربەند ( پێکهاتەکانی د یوار ):

١ـ دیمەك

٢ـ مرۆڵە

٣ـ نێلەمل

٤ ـ بالاشمە

٥ـ دەروازەو دەلاقە

٦ـ ڕاگیرەو کۆڵەکە

دووەم ـ بان و بنمیچ

١ـ کاریتە( حەماڵ )

٢ـ داری دارەڕا

٣ـ تەختەبەند( خێزرە ):

أـ تەختە بەند

ب ـ چناربەند

ج ـ خێزرە

٤ـ سوواندە( سوانە ):

أـ زەوەن

ب ـ سەرزەوەن

ج ـ تاپیر( گەلابەرد )

ء ـ تەن و شتیکە

٥ـ دێلە ( دووێڵ )

٦ـ داگرتنی سەربان :

أ ـ تۆپەڵ بەند

ب ـ تەخت کردن

ج ـ ڕژاك پێوەکردن

سێهەم ـ جوانکاری و وردەکاری تر

١ـ ساوین :

قۆناغی یەکەم :ماڵەکێشان

قۆناغی دووەم :ئەوەڵ ساو

قۆناغی سێیەم :هێلەساو

قۆناغی چوارەم :ڕەقەساو

٢ـ کە پری هاوینە

٣ـ وشکە کەڵەك

٤ـ شێوازی کەلەگی

٥ـ هەیوان

٦ـ بەرهەیوان

٧ـ پشت هەیوان

٨ـ بالاخانە

٩ـکۆمانج

# هونەری ئاوەدان کردنەوەلە تەوێڵە

**ڕێ خۆشکردنێك:** لەسەردەمانێکی گەلێك دێریندا وتراوە: ڕێگای هەزاران میل بە هەنگاوێك دەست پێ دەکات ... بەهەمان شێوەش چیایش هەر ئەوەی مشتێ خاك و دوومشت کوچ و بەردە ... جا ئەگەر بەو ڕووبینایەوە بڕوانینە دەستی ئاوەدان کردنەوە و باڵە نومای جوانکاری و خانووی دڵگیر و نموونەی کار ڕەنگینی و زیرەکی وەستا و خانە خوێکانی تەوێڵە، خانووی سێ نهۆمی پڕ لە ئاڵەتکاری، پەنجەرەی داری پڕ لەئاوێنەی مینابەند[1] ئەوکات هەست ئەکەین کە ئەم ڕووباری ژیارە لەسەرەتادا لە چەند کانییەکی بچوکەوە سەرچاوەی گرتووە، چونکە خودی ژیان خۆی کەلە کەرەستەکانی ژیان گەورەتر و گرنگترە، مرۆڤ تا ئەزمونی نەکردبوو گەورەیی ژینی بۆ دەر نەکەوتبوو، بەهەمان پێوەر کەرەستەکان و پێداویستیەکانی ژیانیش، ئەزموون کردن پەرەیان پێ ئەدات و سادەیی بە گرنگی پێدان ئەسپێرێ و هەڵە بە ڕاستکردنەوە جوان ئەکات و سەرما بە گەرما دەگۆڕێ و، دیواری بێ نازی وشکە کەڵەك بەچینی دیواری ئەستوور و تۆکمەی خزمەتکراو بەچەندین کەرەستەی پێشکەوتوو دەگۆڕێتەوە.

لێرەوە دەگەینە ئەوەی کە بڵێین ئاوەدان کردنەوەی هەرجێ شوێنێك لە سەردوو ڕەهەند بیناکراوە: ئاو، بۆ ژیان و بۆ بەردەوامی بە ژیان پێویست بە کارکردن دەکات و ڕەوتی بەردەوامی ژیانیش جوانی و پێشکەوتن دەخوازێت ... بەتایبەت شوێنێك وەك (تەوێڵە) کە خاوەنی بەفر و باران و باوبۆران و زریان و سێلاوێکی زەبەندە، دەخوازێت لەئەوەی کە نیازی بە گوزەراندنی ژیانی ئێرە هەیە دەبێ خەمی پاییز و زستانی پڕ لەسەرما و جەفای بخوات، ئەم سروشتە تایبەتە، دەبێتە پاڵنەرێکی سەرەکی بۆ بیرکردنەوە لە ژیانێك کە کەرەستەکانی لە زوقم و سەرما و باوبۆرانێ کە بەرێوەیە گەورەتر بێت ... ئەم خەیاڵە دیوارێك بەرهەم دەهێنێت قورسایی بەفرێکی زەبەند و زەبەلاح نەیخوسێنێتەوە ... هەر ئەم تایبەتمەندییەیە کە هونەرێکی ڕەنگین لە کۆمەڵە خانوویەکی چین چین دا بە گرۆیەك لەکەرەستەی گەرم و بەخزمەتدا نومایش بکات ... نووسەرێکی بەویژدانی وەك شاکیر فەتاح لە گەشتەکەیدا بۆ هەڵەبجە و هەورامان، لەوەسفی خانووبەرەی هەوراماندا نووسیویەتی: جێ و بانیان زۆر پێشکەوتووە[2]. کە بێگومان باکگراوندی ئەم پێشکەوتنە سروشتێکی بە خەسڵەت و تایبەتمەندە بەناوچەکەوە کە جیاوازە لەناوچەکانیتر ... هەر بۆیە لە هونەری ئاوەدان

کردنەوە و جۆری خانوو بەرەدا لەنێوان شارۆچکەیەکی وەك (تەوێڵە) و شوێنێکی تری وەك گەرمیاندا بەراورد بکەیت زۆر جیاوازی تێبینی دەکەیت.

لەم ڕێ خۆشکردنەوە دەمانەوێت بەرە و دەروازەی خانووبەرە جوان و نگین و سەنگین و میوان پەروەرەکانی ئەم شارۆچکەیە بڕۆین و وردو درشتی پێکهاتەکانیان وشە چن بکەین[٣].

بابزانین خانووبەرەی تەوێڵەو پێکهاتەو هونەری ئاوەدان کردنەوەی چۆنە؟

**یەکەم ـ دیوار بەند ( پێکهاتەکانی دیوار ):**

بناغە و دیوار لەخانووبەرەی تەوێڵەدا زۆرتریان هەر بڵێین بەتەواوی پشت ئەستورە بەبەردی چاك و پتەووتۆکمە لەلایەك و خاکی گریکدار و لیقی زیخاوی بە قوڕکراو لەلایەکی تر و کۆمەڵە تایبەتمەندیەکی‌تر کە سروشتی ناوچەکە دەیخوازێت و لە دروستکردن و هەڵچنینی دیواردا دەگیرێنەبەر، کە ئەمانەی خوارەوەن:

**١ ـ دیمەك:**

لەتەوێڵەدا دیمەك بەو پارچە دارە تاشراوو ڕێك کراوە دەوترێت کە بەشێك لەپێکهاتەی دیواری خانووەکانی پێکهێناوە چ لەڕووکاری دەرەوە و چ لەناوەوەدا، کە درێژیەکەی بەگوێرەی درێژی و کورتی دیوارەکە دەگۆڕێت، لەمەترێکەوە بۆ دوومەتر ... هەروەك بەرزیەکەی خۆی ئەدات لە (٢٠ سم) و پانیەکەشی (٣٠ سم) ێك دەبێت ... ئەو دارەشی کەڵی دروست دەکرێت زیاتر (داری گوێز و تووی زڕە) و هەندێك جار لەداری میوەی وەك (قەیسی) یش دروست دەکرێت. کەلەڕووی جۆرەوە زۆرباشە، بەڵام لەبەرئەوەی کەمتر دەست دەکەوێت، ڕووکاری دەرەوەی دیوارەکان زۆرتر بەدیمەکی تووی زڕ و ڕووکاری ناوەوەش بەهی دارگوێز دەڕازێنرێنەوە ... ئەمەش لەبەرئەوەیە کە توو زیاتر بەرگەی باران و ببەفر و سەرماو گەرما دەگرێت و ئەگەر لە دیوی دەرەوەبێ، لەدارگوێز باشتر بەرگە دەگرێت بەڵام دیوی ناوەوە لەبەر ئەوەی سواغ دەدرێت و ئەرکی کەمترە ئەگەر هی دارگوێزیشی بۆ بەکار بهێنرێت، بێ مەڵامەتە.

کاتێك لەلایەن دارتاشی شارەزاوە لەقەدی دارەکان ئەم دیمەکانە بەشێوەیەکی جوان دەتاشرێن، تامەترێك دیوار بەرزدەکرێتەوە ئینجا دیمەکەکان بەکاردەهێنرێن، کاتێکیش کە دیمەك بەکار دەبرێت سەرجەمی ئەو ڕیزە دیمەك بەند ناکرێت، بەڵکو دیمەکێك دادەنرێت و نزیکەی مەترێك ئەم لاو ئەولای چۆڵە، ئینجا دیمەکێکی تر دادەنرێت، کەنێوانیان بەبەرد دەگیرێت و لەسەر

دیمەکەکانیش بەرد دا ئەنرێت، مەگەر (٣٠ سم) یێکی بکەوێتە سەر دیمەکی ژێرەوە، یان بکەوێتە ژێر دیمەکی سەرەوە، ئەمە لە گۆشەکاندا جەمسەری دیمەکەکان ئەنیشنە سەریەك ... بەرزی هەر دیوارێك کاریگەری هەیە لە ڕێژەی ڕیزی دیمەکەکاندا، بەڵام بەشێوەی گشتی لەدیوارێکدا (٢ تا ٣ ڕیز) دیمەك بەرکاردەبرێت کەسەرەڕای بوونی شێوەیەکی جوان و رازاوە لە داڕشتنی دیوارەکەدا، لەڕووی تۆکمەیی پارچەکانی دیوارەکەشەوە ڕۆڵی پشتوێنێکی گرۆبەندی بەهێز دەبینێت بۆ پێکەوە گرێدان و یەکگرتنی سەرجەمی دیوارەکە بەتایبەت بۆ کاتی باوبۆران و بوومە لەرزە[٤] هەر ئەمەشە وای کردووە کە هەندێك لە خانووەکانی تەوێڵە پارێزگاری بەدێرینی مێژووی خۆیانەوە بکەن ... ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دیمەك بەس لەتەوێڵەدا بەکارهاتووە بەڵکو لەشوێنەکانی تری ناوچەی هەورامان و پێنجوێن و ماوەت دا بەکاربراوە بەڵام بۆ جۆر و شێوازی بەکارهێنانەکەی لەتەوێڵە زیاتر بەرچاو دەکەوێت و وردە کاری زیاتری لەگەڵ بەکارهێنراوە و هەر چوار دیووە درێژەکەی و دوودیوەکورتەکەی کە شێوەیەکی شەش پاڵووی گرتووە دەستی وەستای بەرکەوتووە.

٢ ـ مرۆڵە :

لەقەد و لقی ئەستوور و پتەوی دارتوو، ئینجا دارگوێز دروست دەکرێت ... لە ڕووی بەرزیەوە لەدیمەك باریك ترە و لەهەرچوارلاوە ناتاشرێت، لەحاڵەتی ئاساییدا درێژیەکەی بەئەندازەی پانی دیوارەکە بێت باشە، بەڵام کاتێك بۆ دیواری پشتەوە یاخود دیوارێك کە پاڵیدابێت بەشاخێکەوە بەکاربهێنرێت دەبێت ئەندازەیەك درێژتر بێت لەپانی دیوارەکە، بۆ ئەوەی بچەقێتە ناو خاکەکەوە و بەمەش دیوارەکە خۆگرتر و پتەوتر دادەمەزرێت.

مرۆڵە بە پێچەوانەی دیمەکیشەوە لەقۆناغە سەرەتاییەکانی بناغەدانان و بنچینە و بونیاد و چینەکانی بەراییدا بەکاردەهێنرێت و بنەمای دیواری پێ بەهێز دەکرێت و، ئاسایشە لەپاڵ یەکدا ڕیز بکرێن بەڵکو باشتریشە نێوانیان کەم بێت، قوریش لە دەوری مرۆڵە بەکار نەهێنرێت باشە، بۆ ئەوەی دووربێت لە ڕزین و پوان، هەرچەند لەتوانادابێت بەبەرد سەنگ چن بکرێت باشترە.

مرۆڵە لەدیمەك کەمتر بەکارهێنراوە، سەرەڕای ئەوەی لەکاتی بەکارهێنانیشیدا ڕێژەی لەدیمەکی بەکار براو کەمترە ... بۆ نموونە:

خانووەکەی قادر بەگ ٢٠٠٠ مرۆڵە و ٥٠٠٠ دیمەکی تیا بەکار هێنرابوو، کە ٣٦٠٠ دیمەکی لەڕووکاری دەرەوە دا بوون ... ئەمە کە نموونەی جوانترین و

باشترین خانووی تەوێڵەبووە، کەشارەوانی تەوێڵە پاشتر بڕیاری هەڵوەشانەوەی داوە و خراوەتە سەر شەقام و بازاڕەکەی..

نموونەیەکی تر: خانووەکەی موحەمەدی سان ئەحمەد کە ڕووبەری گشتی (٨٦٢ م٢) بوو، ٥٠٠ مرۆڵە و ٢٠٠٠ دیمەکی بۆ بەکارهێنرابوو، کە ١٦٠٠ دیمەکی لەدیوی دەرەوەدابوون و یەکێك لەهەرە خانووە نموونەییەکان بوو لە چۆڵ کردنەکەی تەوێڵەدا ڕووخا ... مرۆڵەش لەشوێنەکانی‌تری هەورامان و پێنجوێن و ماوەتدا بەکارهێنراوە.

**٣ ـ نێڵە مل:**

بەوکاریتەیە دەوترێت کەلەدیمەکی ئاسایی درێژ تر و پانتر و ئەستوور ترە و دەخرێتە سەردەرگا و پەنجەرە و تاق، کە توانای ڕاگیرکردنی قورسایی نیمچەدیوارێکی هەبێت، وەك تاقی نێوەندی ماڵ، یاخود سەردەرگاکان کە نیمچەدیوارێك بەردوو قوڕیان هەڵئەچنرێت.

**٤ ـ بالأشمە:**

لەناوچەی ئەردەلأندا بەوە ئەڵێن بالأشمەیان باڵیشمە، دارێکە کەلە دوولای تاقدا دادەنرێت، بۆ ئەوەی دارەکانی سەری تاقەکە، سەرەکانیان بخرێنە سەر ئەو[5]. (هەژار موکریانی)ش ئەڵێ: (بالأشمە داری دیرەگی سەرتاقەی دیوارە، کە داری تری بەسەردا ڕایەڵ دەکەن[6] ... بەلأم جۆری بەکارهێنانی ئەم بالأشمەیە لەخانووبەرەی تەوێڵەدا جیاوازە ... لێرە دیمەکێکی بچووکە بەئەندازەی پانی دیوارەکەیە و بۆ پایە و کونج و گۆشەی هۆدە بەکار دەهێنرێت ... یاخود دەخرێتە سەردیمەکی ناوە وە ودەرەوە بەڕادەی دیوارەکە دەبڕرێتەوەو دروست دەکرێت، بەرزیشی بەقەدەر چینی دیواربێت. بۆ پێکهاتەی سەردەرگا و پەنجەرەش بەکار دەهێنرێت بۆ ئەوەی نێڵە مل بخرێتە سەری.

**٥ ـ دەروازە و دەلاقە:**

یەکێکی‌تر لەبەرهەمە بەنرخەکانی داری گوێز و توو لەبواری خانووبەرەدا، بەکارهێنانی قەدی ئەستوور و داهێنراووچاك کراوو دروستکراوی ئەوانە بۆ دەروازە و دەرگا و پەنجەرە و دەلاقە. لەلایەن وەستایانی شارەزای ناوچەکەوە ... کە بەگوێرەی گەورەیی و بچووکی خانووەکان و ئارەزوو ویستی خاوەن ماڵەکانەوە، نەخشبەندیان تیاکراوە و سەلیقە و وردەکاری لەداهێنانی جۆر و شێوەیاندا بەکارهاتووە. شێوەی ئاسایی دەروازەکان دووتارێکی گەورەی نەخشداربوون و، هەرچی دەرگاشە بەهی نێوەند و مەدخەل و هۆدە و ژوورەکان

وتراوە، کەلەسەر شێوەی یەك تاکی و سادەتر دروست کراوە ... هەروەها دەروازەکان بە (کلیل و کلۆم) داخراوون کەلە (هەنار) دروست دەکران و جاران لەتەوێڵە بەرکا ئەهێنرا، یاخود بە قوفڵی لوولە کە ئاسنگەرەکانی تەوێڵە دروستیان دەکرد کە ئەم قوفڵە لەدیوی دەرەوە دائەخرا بەلام لە دیووی ناوەوە بەشێوەی (پیم) تەختەی لاکێشەیی ئەستووریان بۆ دەتاشی و چەپ و ڕاست لەپشتەوەی دەروازەکانیان قاییم دەکرد و لەکاتی داخستندا، بەشێوەی کۆکردنەوە (+) تێهەڵکێشی یەك ئەبوون و لەناوەندی دەروازەکاندا قاییم ئەوەستان کە هەتا (پیم) ەکان نەکرانایەتەوە ئاسان نەبوو کەسێك بتوانێ بە ژوور کەوێت.

هەروەها لەجۆری پەنجەرەکانیشدا دووسێ شێوە بە دیارکەوتوون، هەم لە ڕووی پێکهاتنەوە هەرەم لەشێوازدا ... بۆ نموونە لەپێکهاتندا بێجگە لەداری گوێز و توو هی تریش بەکاربراوە و تووڵێ لێ دروست کراوە بۆ دیوی دەرەوەی پەنجەرەکان، یاخوود هەندێك جار پیشە کەتێکەڵ کراوە لەنێوان دارتاشی و ئاسنگەری دا، واتە: پێکهاتە سەرەکیەکانی پەنجەرەکە لە داردروست کراون بەلام تووڵە ناوکێشەکانی بەشی دەرەوە ئاسن بوون بەشێوەی لوولەکی باریك ناوکێشی هەرسێ سکەی سەرەکی بەشی سەرەوە و ستوونی نێوەند و بەشی خوارەوە بوون ... یاخود ئامرازی داخستنی پەنجەرەکان بە جۆرە نێر و مایەك دروست دەکران کەلەشێوەی گیرەیەکدا دەبوون و لەئاسنی تایبەتی باریك نەخش دەکران. لە ڕووی شێوەیشەوە وەك پێشتر ئاماژەمان پێ‌دا ئارەزووی خاوەن ماڵ و ڕێککەوتەی خانووەکە و توانای وەستاکە ڕۆڵیان هەبووە لە نەخشاندنیدا، هاوڕێ لەگەڵ ئەوەشدا توانای ماددی ڕۆڵی هەبووە لەگەورە و بچووکی چوارچێوەی پەنجەرەکاندا ... بەلام بەشێوەی گشتی پەنجەرەی شێوە لاکێشەی لەدرێژی وەستاوی هلالی بلاوبووە و، تا ئێستاش شوێنەواری ماوە ... ئەگێن جۆری تری وردەی وەکو چوار گۆشە و لاکێشەی ئاسایی بۆ دالان و هۆدەکانی نێوەند بەکار هێنراوە، کەمتر لە ڕووکاری پێشەوەی خانووەکەوە دیاربوون، بەڵکو زیاتر کەوتوونەتە لاتەنیشتەکان پەنجەرەکانی بەشی پێشەوە بێجگە لەچوارچێوە و تەختە بەندیەکەی گرنگی بەجۆری شووشە و ڕەنگ و شێوازەکەیشی دراوە و جۆری عەنتیکەیان لێ بەرهەم هێناوە.

**٦ ـ ڕاگیرە و کۆڵەکە:**

هەیوانــە بەرچــاو ڕوون و ئاســۆفراوانەکان، ڕاگــیرە و کۆڵەکــەیان بــۆ بەکارهێنراوە، چ لەڕووی باشتر و تۆکمە ڕاگیرکردنی کاریتەکەوەبووبێت، یاخود بۆ زیاتر جوانکردن و شێوە پیشاندانێکی فەنتازیایانەوە بووبێت ...لەخانەقا و مزگــەوت و دیوەخانەکانیشــدا پایــە و ســتون و کۆڵەکــەش وەك ڕاگــیرە و نەخشبەندێکی جوان خۆی نومایش داوە، وەکو کۆڵەکەکانی خانەقا و مزگەوتی گەورە ... بەشێوەی گشتی ئەم ڕاگیر و ستونانە لەداری گوێز و چنار بەرهەم دەهێنرێن پاش سفتوسۆ و ڕێك و جوان کردن ... وەستاکانی تەوێڵە بێجگە لە بەکارهێنانی نەخش و هێڵکاری و نیگاری جوان بۆ بەشی سەرەوەی پایە و کۆڵەکەکان، بۆ بنکە و بونیادی ژێرەوە شیان (خەڵووزی دار و خوێ) یان بەکارهێناوە بۆ ئەوەی لەڕزین و پوان پارێزراوبن.

**دووەم ـ بان و بنمیچ:**

بێگومان پاش ئەوەی دیوار و پێداویستیەکانی ئاستی دیوار تەواو دەبن، باس دێتە سەر (سەربان) یان (داڕەڕا) و (بنمیچ) و کەرەستەکانی بەشی سەرەوەی خانوو ... کە ئەمەشیان بۆ خۆی هەم پێداویستی و هەم جوانکاری و ئەزموون و هونەری خۆی هەیە ... کە ئەکرێ بەخاڵ لێیان بدوێین:

**١ ـ کاریتە (حەماڵ):**

بۆ دیوەخان و هەیوانی بەرفراوان و خانەقا و مزگەوتەکان بەکار دەهێنرێت کەداری داڕەڕاکان ناگەنەوە و کورتن و مەترسیڕمان و

تەپین ئەکرێ، لەم کاتەدا بە پێچەوانەی داڕەڕاوە، کاریتە دەخرێ و لەسەر ئاستی درێژی دا ئەنرێ و دارەکانی تری دەخرێتە سەر ئەم دارە درێژ و ئەستوورە، ڕۆڵی حەماڵێك دەبینێ و هەڵگری سەری دارەکانی ترە و لەئەندازیاری نوێی ئێستا هاوشێوەی (جسر) ە و کۆڵەکە و ڕاگیرە لەناوەڕاستیدا بۆ لەنگەر گرتنی دا ئەنرێ و سەرەکانیشی ئەخرێتە سەر دیوارەکانی ڕاست و چەپ ... جاری واش هەیە ئەم کاریتەیەش هێشتا ناگاتەوە و مەودای سەربانەکە زیارترە، بۆیە بەشێوازی نێروما (نێر و مێ) دوو کاریتە بەیەکەوە دەبەستن و بەپێچەوانەی ئاستییەکەمەوە سەرەکانیان دا ئەدرێن و تەوق ئەکرێن و کۆڵەکەیەك بۆ لەنگەر گرتنیان و بۆ ئەوەی جیا نەبنەوە بەکاردەهێنرێت و ئیتر کەم کەس هەستی پێدەکات کە ئەم حەماڵە لەدوو کاریتە دروست کراوە ...

٢ ـ داری دارەڕا:
ئەو دارانەن کە بۆ سەرگرتن و بانی ژوورەکان و هیتر بەکار دەهێنرێن، کەلەسەر ئاستی پانی دادەنرێن و نزیکەی سێ مەترێك دەبن. داری چنار باشترین جۆر و بەکارهێنراوترینیانە، چونکە لەلایەك جوان و ڕێکە، لەکاتێکدا کە دیارترین بەشی سەربانە کەبەبەردەوامی لەدانیشتوانی خانووەکەوە بە شەوو بەڕۆژ دیاربێت، لەلایەکیتریشەوە جێگای ئەوەیە پشتی پێ ببەستریٚ چونکە لەبارو بێ گرفتە بۆ دارەڕا ... بەتایبەت ئەگەر لەپاڵ یەکدا بەپڕی ڕیز بکرێن ئەوە لە هەردوو ڕووی (جوانی) و (چاکی) یەوە بەهایان تەواو نابێت. لەکاتێکدا کە پانی ژوورەکان (٣ م) بێت، ئەبێ ئەوان درێژیان نیومەترێکی زیاتر بێت، بۆ ئەوەی لەهەردوو سەرەوە چنارەکان بەتێری بکەونە سەر دیوارەکە و لەو ڕووەوە ترسی خزین و کەوتنی لەپڕیان نەبێت.
جاری واش هەیە لەبری دار چنار (باهوو) بەکاردەهێنرێت، هەرچەندە (باهوو) لەفەرهەنگی کوردیدا[٧] بۆ هەمان مەبەستی (داری دارەڕا) بەکاردەهێنریٚ، بەلاٚم لەتەوێڵە تایبەتمەندیەك هەیە، لەنێوان ئەم دووانەدا، ئەویش ئەوەیە ئەگەر دارەڕا بە داری (توویان گوێز یان قەیسی و ... هتد) بکرێت، پاش تەشویٚ کاری و سفت و سوٚکردنی ئەوا پیٚی دەوترێت (باهوو) کە شێوازی بەکارهێنانی هەروەکو چنار وایە، بەلاٚم ئەوەندە هەیە ئەم ئەبێت لەقەدی ئەستوور بەشێوەی شەش پاڵوو بتاشریٚ و بەشی سەرەوەی زۆرێك و تەخت بێت و ئەگەر زۆر پڕیش نەبن وەك چنار، ئاساییە، ئەگین هیچ جیاوازیەکی نییە.
٣ ـ تەختە بەند " یان خێزرە:
بەگوێرەی ئاستی ماددی و توانای خاوەن ماڵ لەدوای دارەڕا بەیەکێك لەم سیانە بۆشایی دارەڕا کەدا دەپۆشن " یا لەیەکێك زیاتر یان بەکار دەهێنرێت:
ا ـ تەختە بەند: کەلە قەد و لقی دار توو و هیتر بە ئەستوری (٥ سم) و درێژی بەئەندازەی دارەڕاکان یاخود باهووەکان دەبڕێنەوە و، بەبزمار لەپاڵ یەکدا دادەکوترێن و کونبڕی بۆشاییەکان دەکەن.
ب ـ چنار بەند: ئەمیش وەك تەختە بەند بەکار دەهێنریٚ و بەڕیز و ڕێك لەپاڵ یەکدا، بە پێچەوانەی ئاستی دارەڕاکانەوە، بە ئەستووری مەچەکێك ببن باشە و، لەدرێژیشدا نێوان سیٚدار پڕبکەنەوە، واتە ناوەڕاستی چنارەکان دەکەونە سەر دارێك، سەری چەپ و ڕاستیشیان دەکەوێتە سەر دوودار ...

ج ـ خێزره: لە ڕووی ماددیيەوە (خێزره) لە دووانەكەی ڕابردوو كەم ئەرك ترە و لە ڕووی جوانیشەوە لەدوای ئەوانەوە دێت، هەر بۆیە بۆ ژووی میوان یاخود دانیشتنی خانە خوێ (تەختە بەند) یان (چنار بەند) بەكار دەهێنرێ و بۆ دالآن و ژووری چێشت لێنان و هیتر (خێزره) بەكاردەهێنرێت ...

بۆ بەكارهێنانی زیاتر لە (چناربەند) ئەچێت، بەڵام بە جیاوازی ئەوەی ئەم باریك و بچوك ترە و لە دار بەڕوو، توو، گوێز، و لقی وشكی داریتریش بەكاردەهێنرێت، بەپڕی لەپاڵ یەكدا ئەنرێن و بۆشایی دارەڕاكەی پێ دەتەنرێت.

**٤ ـ سوواندە (سوانە):**

سوواندە، گوێسووانەی سەربان، كەلە هەندێ شوێن گورگەی دارەڕاشی پێ ئەڵێن، لەتەوێڵە (پاسا) ی پێدەوترێت، پێكهاتەیەكی پڕ وردەكارييە و لەكەم شوێنی تر ئەو گرنگیەی پێ ئەدرێت كەلەتەوێڵە هەیەتی، كە ئەمیش چەند مراز و كەرەسەیەكی پێویستی هەیە كە ئەمانەن:

ا ــ زەوەن: یەكەم هەنگاوی سوانەیە كەلەدوای تەواوبوونی دیوارەوە دەستی پێ دەكرێت، كە ئەویش پێكهاتەیەكە لەبەژنی دارانەوەك دیمەك دەتاشرێ لەدوا چینی دیواردا و لەگۆشەكاندا دادەنرێت، بەدوان نیشانەیەكی كۆكردنەوە دروست دەكەن و بەتێهەڵكێشراوی ڕاست و چەپ دەكرێن و لەهەردوو ڕووكاری گۆشەی بنمیچەكەوە بۆ دەرەوە درێژ بوون ... كە ئەم دابەشكردنە دوو جەمسەرە و چەندیان لەدەرەوە دیارە، ئەوەندەشیان لە ڕووبەری ناوەوەدا هەیە بۆ پارسەنگ دانەوەی پەستانی سەریان.

ب ــ سەر زەوەن: ئەو دارانەیە كە وەكو دەنكی شانە بەڕێكی دەخرێنە سەرزەوەن و دیوار و ئەم سەر و ئەوسەری زەوەنەكان بەسێ چوار ڕیزدادەپۆشن، كەبزمار كوت ئەكرێن بۆ ئەوەی بەهێز و تۆكمەبن، چونكە خۆیان باریك و درێژن.

ج ـ تاپیر (گەلآ بەرد): بەردی باریك و تەنكە كە لەتەوێڵە (تاپیر) ی پێ دەوترێت و لەهەندێ شوێنیتر (پانە بەرد) یاخود (گەلآ بەرد) یان (تەلەبەرد) یشی پێ دەڵێن، دوای ڕیزی سەرزەوەنەكان ئینجا لەپاڵ یەكدا بەشێوەیەكی ئەندازەیی جوان بە دەورەیەكی تەواو دادەنرێن لەسەرانسەری گوێسە بانەكەدا، كە ڕۆڵی پاراستنی سەرزەوەنەكان هەیە و گلدانەوەی بەشێكی پەستانی گوێسەبانەكانیان هەیە، سەرەڕای بوونی جوانیەكی نەخش دارانەی بنمیچەكان.

د ـ تەن و شتی كە: بێجگە لەتەختە و بەرد وەكو لەسێ خاڵی ڕابردوودا ئامارەمان پێدا كە بەچەند جۆرێك بەكار دەبرێت و، لەپتەوكردنی سوانە و

گوێسەبانەکاندا، تەنی کەش بەکار دەهێنرێت وەکو: تەنەکە جا یا ڕەنگا و ڕەنگ یاخوود پارچە لەوح بەپانی (٢٥ سم) و بەدرێژایی گوێسەبانەکە دەوردەکاتەوە و سەری دیاری ئەم تەنانەنە بەشێوەی سێ گۆشە موزەخرەفکراوە و لەدوورەوە شێوەیەکی ئەندازەی جوانی هەیە و لەنزیکیشەوە تێبینی ڕۆڵی پاراستنی بەشێك لەدیوی دەرەوەی دیوارەکانی لەئەستۆ گرتووە، کە دەیان پارێزێت لەشۆردنەوەی باران و بەهەدەر چوونی گڵ و قوڕەکەیان، بەشی دواوەشیان بەسەر زەوەن و سەر زەوەنەکاندا، بە بزمار قایم دەکرێت، کە ترسی کەوتن و بەربوونەوەی نەبێت.

**٥ ـ دێڵە یاخود دوویڵ:**

لەناوچەی ئەردەڵان پێی ئەڵێن (دوویڵ) و لەتەوێڵەش (دێڵە) ئەوبەردەی بۆی بەرکاردەهێنن (تاسپوکڵە) ی پێ دەڵێن کە ئەمەیان سەرجەمی گوێسەبانە و خودی سەربانەکەش هەمووی دەگرێتەوە و وەکو سەنگ چن بکرێت ئاوا تەواوی سەر خێزرە و تەختە بەند و سوانە هەمووی بەبەردی پانکۆڵەی لەپەدەست ئاسایی ئەتەنرێت و بۆشایی نێوان هەموو کەرەستەکانی ڕابردوو بەم دێلانە پڕدەکرێتەوە چونکە ئەوەی گرنگ بێت ئەمەیە " کە قۆناغی قوڕکاری و تۆپەڵکاری کەلەدوای ئەم دێلانەوە دەست پێدەکات، ئەبێ بونیادەکی ئەم دێلانەبێت و بەهیچ شێوەیەك نابێ قوڕ بەرتەختە بەند و زەوەنەکان بکەوێت ئەگین ئەڕزێن و ئەپوێن.

**٦ ـ داگرتنی سەربان:**

قۆناغی داگرتن (ئەرەگرتەی) دوا قۆناغی تەدارەکدانی بەشی سەرەوەی خانووە، چونکە لە دوای داگرتن شتێکیتر نامێنێ لەم بەشەدا بکرێت و بوونی وەك پێویستیەك خۆی سەپاندبێت، بەڵکو ئەوەی دوایی جێبەجێدەکرێت، ئەوەندەی فەنتازیا و جوانکاری بە پێویستی نییە کە دواتر باسیان دەکەین، بەڵام لەداگرتن و تەخت و پتەوکردنی سەرباندا چەند هەنگاوێك پێویستن " کە سەرجەمیان لەپاش قۆناغی دێڵەوە دەست پێدەکەن کە ئەمانەن:

ا ـ تۆپەڵ بەند: خاك و گڵێکی گریکدار، دەکرێت بەقوڕ و لەگەڵ (کا) دا دەشێلرێت و بەسەر دێڵەکەدا تۆپەڵبەند (گوندەڵبان) دەکرێت یەك لەپاڵ یەکدا دەدرێت بەسەر دێڵەکەدا تا تەواوی سەربانەکە، تەنها ڕەنگی قوڕ و تۆپەڵە قوڕ دەنوێنێت ... کە ئەم تۆپەڵبەندە بەجوانی جێبەجێکرا، ئەگەری دڵۆپەکردنی ئەوبانە کەم دەبێتەوە، پاش تەواو بوونی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەجێ دەهێڵرێت بۆ

ئەوەی لەوشك بوونەوەی دڵنیا بن، ئینجا قۆناغی دووەمی داگرتن پەیڕە و دەکرێت.

ب . تەخت کردن:گڵ دەڕژێنرێت بەسەربانەکەدا و نم نم ئاوڕشێنیش دەکرێت و هەندێك جار (کا) یشی لەگەڵ تێکەڵ دەکرێت، کەسەرجەمی بانەکە تەواو گڵڕێژکرا، ئینجا بەخەستی ئاوڕشێن دەکریّ و باگردێنێکی بەردین، جوان، جوان، دەگێڕدرێت بەسەری‌دا تاتەواوی بەرز و نزمیەکانی تەخت دەبن و ڕێك و پتەو دەبێت.

ج - ڕژاك پێوەکردن: ڕژاك بەبەردی ناسك و ڕزیوو دەڵێن یاخود بەبەردێك کە هەڵبوەرێت، هەندێك جار پێشی ئەڵێن: بەردە مردە[٨] ... لەبێ‌توانایی و بیّ هێزیدا وەك مردوو وایە و بەئاسانی هەڵدەوەرێنرێت و تواز تواز دەبێت، شوێنی کە وەزیخ دەگرێتەوە هەروەك ڕەنگیشی شینە سەربان لەدرز ردن دەپارێزێت و ناهێڵیّ گڵەکەی بەهۆی باران بارینەوە زایە ببیّ و بەگوێسە بانە و بلووسکدا[٩] لەدەست بچێت و لەگەڵ ئاوو باراندا بڕوات. هەروەها سوودێکی تریشی ئەوەیە کە سەربانێك ڕژاکی پێوەکرابێت گێرانی بەباگردێن[١٠] ئاسانە، چونکە ئەم توازە بچووکانە ناهێڵن شەختە و تێسکەی باران سەربانەکە هەڵتەکێنیّ، بەڵکو لە لیق بوون و بیّ گریکیش دەیپارێزن و ناهێڵن قوڕەکەی بەباگردێنەوە بنووسیّ و قورسی بکات.

ئەم هەنگاوی ڕژاك پێوەکردنە لەگەڵ ئاوەڕشێنی چاك و گێڕانێکی تەواودا جیّ‌بەجیّ دەکرێت و وادەبیّ کەبەباشی بپەستێنرێتەوە.

هەر دوا بەدوای ئەمە سوورانەکانیش ئاوڕشێن دەکرێن و بەگەلاّکوتك (گلارکۆ)[١١] دەکوترێن تا خاك و گڵ و ڕژاکەکەی خۆی بگریّ و هەڵنەوەریّ ... هەندێك جار ئەم کردارە لەگەڵ بانگێڕان دا (بانوش)[١٢] دەیکات، یاخوود منالاّن کە ناتوانن باگردێن بگێڕن ئەمە ئەکەن و زۆرجاریش بۆ یارمەتی کوڕیان مێرد، دایك یاخود خێزان و خوشك ئەم کارەدەکەن.

**سێهەم ـ جوانکاری و وردەکاری تر :**

ئەم بەشە لەماڵدا زۆرشت و جۆر و شێوە دەگرێتە خۆی، سەلیقە و وردەکاری تاکەکان و ئارەزوو و حەزی جیاواز، جوانکاری جیاواز، بەرهەم دەهێنێت، بەلاّم بەشێوەی گشتی بۆ جوانکاری ماڵ، چەندین هەنگا و دەگرینە بەر " هەندێکیان تایبەت بەزەوق و سەلیقە و، ووردەکاری ئافرەت و کەیبانوی

ماڵە وەك (ساوین، جوانکاری ناوخۆ، ڕازاندنەوەی سەکۆ و تاق، ڕێکخستنی تەدارەکی یەخدان و مشتوومالی تر)

وەهەندێکی تایبەتە بەلایەنی ماددی و بار و دەسەلاتی خانە خوێوە وەك: (دروست کردنی خانووی چەند نهۆم، بوونی هەیوان، بەرهەیوان، پشت هەیوان، باڵە خانە، کۆمانج، کەپری هاوینە و هی‌تر) کە لێرەدا تیشك دەخەینە سەر هەندێکیان.

١ ـ ساوین: پاش ئەوەی خانوو تەواو دروست دەکرێ و ئیشی وەستا و کرێکاری نامێنێ جا (ساوین)[١٣] دەست پێ دەکرێ، کە بەم چوار قۆناغەدا تێ دەپەڕێت:

قۆناغی یەکەم: ماڵەکێشان:

ئافرەتان و ژنانی کوچە و گەرەك یا خزم و خوێش پێکەوە کۆدەبنەوە و بەگەلکاری لە هەر جێیەك گلێ و خۆڵی لێ بێت ئەیهێنن و بەبێژنگێکی درشت ئەیبێژن و ئەوەی هەیبێ (کا) ی تێکەڵ ئەکا و ئەو خێزانانەشی نەداربن (خۆڵەمێش)ی زۆپای پاییز و زستانی پارساڵی کۆکراوەی تێکەڵ ئەکەن و بەئاو، جوان ئەیشێلن و دووتا سێ ڕۆژ دایئەنێن، تا تەواو ئەترشێ، بۆ ئەوەی پتەوو گریکداربێت، پاشان بەدەست هەڵی ئەسوون لەکون و کەلەبەر و درزوو بەرزوو نزمیەکانی دیوارەکە و، جوان بەدەست ماڵەی ئەکێشن ... کەتەواو بوو ئینجا بۆ ماوەی هەفتەیەك بەجێی دەهێڵن تاوشك ئەبێتەوە.

قۆناغی دووەم: ئەوەڵ ساو:

چەند ئافرەتێك پێکەوە کۆئەبنەوە و خۆڵی سپی و جوان، لەکوێ هەبێ ئەیهێنن و بەبێژنگ یا بەهێڵەکی ورد ئەیبێژن. لەتەوێڵە زۆرتر خاکی (گلێجانە)[١٤] بەپەسەند ئەزانرێ و بەکار ئەهێنرێ بۆ ئەم مەبەستە، چونکە هەم جوانە و هەم سپی و وردە.. خودی وشەکەش هەر لەوەوە هاتووە. گلێجانەکان زۆرن بەتایبەت خاکی ئەو (گلێجانە)یە کە دەکەوێتە سەر ڕێگای (ڕاسایەرێ) دەبێژرێ و گلەبێژراوەکە بەکوڵ یان بەبارگیر دەهێنرێتەوە بۆ دێ، جالە ناوتەشت و قازاندا قورێکی لیتی تەڕ کە دەشوبهێ بەهەویری محەلەبی بۆ دەگیرێتەوە (ئافرەتێك بەدەست هەڵی ئەسوێ لە دیوارەکە و ژنێکی تریش بەدوایا و بەسیرەکۆ[١٥] یەکی پڕە شت ساوینێکی درشت دەست پێ ئەکات بۆ ئەوەی وشك نەبێتەوە. کەبەم ساوینە ئەوترێ (ئەوەڵ ساو)

قۆناغی سێیەم: هێڵە ساو:

دوای (ئەوەڵ ساو) ژنێکی تر بەسیرەکۆیەکی ناوەند، هەر خێرا و بەدوای ئەودا درزەکان دەسوڕیٚ و هەربەم جۆرە دووجار سەرجەمی دیوارەکە،یا پەڵە پەڵە، یا بەیەکەوە دەساوویٚ، ئەگەر لەهەرجی وشك بووبێتەوە بەدەست نمەیەك ئاوی لیٚ دەپرژێنریٚ بۆ ئەوەی جوان پرۆسەکە جیٚ بەجیٚ بکریٚ.

قۆناغی چوارەم: ڕەقەساو:

هەر بەهەمان سیرەکۆ نێوەندەکە کە لەوەی سەرەتا بچووکتر و ڕێك ترە ئەم جارەش سەرجەمی دیوارەکە بۆ چوارهەمین جار دەساویٚ کەبەم جارەیان ئیتر دیوارەکە دەبێتە شووشە ئەوەندە ساف و لووس و جوان دەنووێنیٚ..

کەبەم ساوینە دوایی ئەوتریٚ (ڕەقە ساو) چونکە دیوارەکە لە نەرمی و تەڕیەکە کەوتووە و هێواش هێواش بەرەو ڕەقی و خەریکە بۆ دوا جاریش درز بڕ دەبێت.

**٢ ـ کەپری هاوینە:**

کەبەرە و هاوین بووینەوە سەربانەکانی تەوێڵە کەپری لیٚ دەبەستن، کە پریش بەوە دەڵێن: قامیشی وشك (نەیجە) لەپاڵ یەکتردا وەکو چیغ دەتەنرێت کە پیٚی دەوترێت (تەیمان) کەلە چیغیش جواتر و پڕ وردەکاری ترە، چونکە هەم قامیشەکانی باریکترن و هەم چینەکەشی ووردەکاری زیاترە. لەهەر چوار گۆشەکەیەوە کۆڵەکە دائەنرێت و وەك ژوورێکی هاوینەی لیٚدێت ... سەرەکەشی بەدار و پاشان بەگەڵاٚی دار بە ڕوو (هەژگ) دادەپۆشرێت بۆ ئەوەی سێبەرێکی چڕ و پڕ دروست بکات، سێبەری هیچ گەڵاٚیەك وەك سێبەری گەڵاٚی (دار بەڕوو) خۆش و فێنك و تەندروست نیٚیە. قامیش لەخودی (تەوێڵە) دا نیٚیە، تەنها لە (سۆڵە) بەشی خوارووی (شوانگێڵ) کە دەکەوێتە باشوری تەوێڵە وە دەست دەکەوێت، بۆیە خەڵکی بۆ کڕینی دەچن بۆ گۆشەی سیروان و لەویٚ ئەیهێنن.

ئەوانەی کە زیاتر بەوڵاٚخەکانیان دەچوون بۆ (نەیجە) قامیش هێنان و، زۆر دیاربوون، (فائق فەتحوڵڵاٚ) ناسراو ترینیان بوو.

ساوین بۆ جوانکردن و بەڕەونەق کردنی سەربان و تەختانی کە پرەکە دەکریٚ و تنانەت ئەوانەشی کەلە هاویندا لەتەوێڵە نامێننەوە و دەچنە ناوباخەکانیان لەویٚ یا کەپر یا (کێڵ) دەبێتە نشیانگایان.

### ٣ ـ وشکە کەڵەك:

بەدیوارێك ئەڵێن، کە بەبەرد یاخود بەبەرد و دیمەك بەتەنها دروست بکرێ و، ئاو بە کارنەهاتبێ لەچنینی دیوارەکەدا ... بۆیە دیوارەکە (کەڵەکە) وشکە چونکە، کە ئاو بەکار نەهات واتە: نەقوڕ و نەچیمەنتۆ و نەگەچ نەگیراوەتەوە و بەکار نەهاتووە بۆ هەڵچنینی ئەودیوارە.

خانووی تەوێڵە لەدێرین زەماندا لەوشکەکەڵەك دروست کراوە، بەلاّم لەچەرخی نوێدا وەبەرهێنانی وشکە کەڵەك زۆر کەم بۆتەوە ... لەشوێنانی تری وەك هەورامانی شار، سەروپیری، کەمالاّ، ڕووە وەری، پاڵنگان، بیارە ... هتد، تا ئێستاش لێی سوودمەند ئەبن ... لەتەوێڵەدا جوانترینی ئەم جۆرە کارە، (مزگەوتی باساکا) و خانووەکەی (محەمەدی سان ئەحمەد) ە کەوەستا حەمە ئەمین لەساڵی ١٩٥٢ دا دروستی کردوون[١٦] ...

بەکارهێنانی وشکە کەڵەك ئێستا زیاتر بۆ دانانی باخ و دروست کردنی تەلاّن سوودی لێ وەردەگیرێت، یاخود بۆ ژووری هاوینەی ناوباخ (کیلێ ـ کەوێڵ) بەکاردەهێنرێت. وەك زەمەن کاتێکی زۆر بەسەر شێوازی وشکە کەڵەکدا تێ پەڕیوە و مێژووی ئەم جۆرە دیوارە دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەها ساڵ لەمەوپێش ... پاشان مرۆڤ فێر بووە (قوڕ) بەکاربهێنێت لەبیناسازی بەردا، ئەم بیناسازی‌یە لە کوردستانی تورکیاش (بۆتان، طورێ، قەرتەمین) داباوە و هەیە، کەبەکارهێنانی قوڕەکە شێوازێك وەردەگرێت کە دیوارە بەردەکە دیارنامێنێت، کە ئەمەیان لەناوچەی تەوێڵەدا بەکار نایبێت، لەبەر ئەوەی بەفر و بارانی زۆرە و نەگونجاوە بۆ سروشتی ناوچەکە ... سەرەڕای ئەوەی کەبینای وشکە کەڵەك بەهێزترە و بەرگەزیاتر دەگرێ لەبینای بەردی قوڕین

### ٤ ـ شێوازی کەلەگی:

لەکوردەواریدا (کەلەگی) بەو هۆدە دەوترێت کەلەتەنیشت هەیوانەوەیە بۆ دانیشتن و نان خواردن بەکاردێت[١٧] .. بەلاّم شێوازی کەلەگی (السدلی) لەئاوەدان کردنەوە و خانوو بەرەی تەوێڵەدا پێشکەوتوو تر و نەخشین ترە، چونکە پێك هاتووە لەهەیوانێك و دوو ژوور لەملاو لەولاوە[١٨] ..

ئەم شێوازی خانوو بەرەیە کە بەناوبانگە بە مۆدێلی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست لەسەردەمی زایینی (مەسیحیەت) یەوە دەرکەوتووە و برەوی سەندووە، هەرچەندە هونەری ئاوەدانکردنەوەی (هلنسی) کاریگەری هەبووە لە سەری ...

جا ئەم فۆرمە جوانە لەخانووبەرەی تەوێڵەدا زۆر سەنج ڕاکێش و جێ‌نیگابووە بۆ گەشتیاران و خەڵکی دەرەوەی ناوچەکە[١٩] ...

جاوەك ئەڵێن: لە (گوڵ) یان پرسی: بۆ واجوانی ؟! وتی: باخەوانەکەم مەردە. بەهەمان شێوە، جوانی ڕوو و فۆرم و شێوازی خانووبەرەی تەوێڵەش ئەگەڕێتەوە بۆ وەستا بەنناکانی، کەشارەزاییەکی زۆر و لێهاتنێکی تەواویان هەبووە لە هەڵچنین و ڕەنگ ڕشتن و بەڕەونەق کردنی خانوو بەرە و ڕەسم و سیمای ناوچەکەدا ... وەستا دیار و بەنابانگەکانی شاری سلێمانی گەواهی ئەم لێهاتن و شارەزاییەی وەستاکانی تەوێڵە ئەدەن لەنموونەی دەست ڕەنگینیان، وەك وەستا محەمەد ئەمین عەبدوڵلا و وەستا سەید صادق[٢٠].

**٥ـ هەیوان:**

لەکوردە واریدا (هەیوان) بەوژورە دەوترێت کەلە حەوشەوە بە پێپلیکە سەرئەکەویت بۆی، دووسێ کۆڵەکەی لەژێردایە و هۆدە بەدەور و پشتیەوە دەبێت[٢١] بەڵام لەتەوێڵە جۆرە جیاوازیەك بەدی ئەکرێت، چونکە خانووەکانی زیاتر دوونهۆمن و هەیوان دەکەوێتە ناوەڕاستەوە و ڕێگاکەشی لەدواوەیا (لە دالآنەوە) یە چونکە دەرگای نهۆمی دووەم بەزۆری لەلاوەیان لەدواوەیە، سەر بەخۆوو جیایە لەگەڵ خوارەوە.

خاڵی جیاوازی لەهەیوانی تەوێڵە و شار و شارۆچکەکانی تری کوردستاندا نموونەی شارەکانی سلێمانی و کۆیە و هەولێر و کەرکوك و شوێنانی تردا ئەوەیە کە ڕێگا و پێشینەی هەیوانەکە دەکەوێتە بەشی دواوە و لەبەشی پێشەوەی ڕێگای چوونە ژوورەوەی نی‌یە.

هەندێك لەهەیوانەکانی ئەم ناوچەیە موحاجەرەی جوان و پڕنەخشیان هەیە، و هەیوانەکانیش ڕۆڵی حەوشە دەبینن، چونکە لەبەر سەختی و کەمی زەوی و، حەوشەیان نی‌یە.بۆیە ئەگەر ئەرکی حەوشە نەبینێت، بێگومان ئەبێ لەبری ژوورێك ڕۆڵی هەبێت ... هەر بۆیە ئەرکی موحاجەرەکانیشیان لەگەڵ هەیوانی شوێنانی‌تر جیاواز دەبێت و ئەگەر موحەجەرەی هەیوانی شارەکان و شوێنە گەورە و جیاوازەکانی کوردستان زیاتر لەبەر جوانی و بۆ فەنتاز یاو ڕازاندنەوەبێ، ئەوا موحاجەرەی هەیوانی تەوێڵە، بێجگە لەولایەنە، ئەرکی سەرەکی دروستکردنی شورا و پاراستنی پەرچەمیماڵەکەیە و هۆکاری بوونی پێویستی‌یە، نەك تەنها خۆشگوزەرانی و ڕازاندنەوە.

گـەورەیی هەیوانـەکان هەنـدێ جـار گەیشـتۆتە (٦) مـەتر ... هەرچـەندە لەمێژووی دێرینـدا کەمتر هـەیوان وەك دیاردەیـەك دەرکەوتووە، لەبەرنەبوونی و ڕەوشی ئەمنی، بەلاّم لەم دواییانەدا زیاتر دەرکەوتووە و، گەیشتووەتە ڕادەیـەك کەم ماڵ هەبووە هەیوانی نەبێت.

**٦ ـ بەرهەیوان:**

لەتەوێڵە (تارمە) لەخانووی یەك نهۆمدانیـیە، بەلاّم ئەگەر خانووەکە دوو نهـۆم بـوو، ئـەوا لەبـەردەم هـەیوانی نهـۆمی دووەمـەوە داری نهـۆمی یەکـەم بەئەنـدازەی مـەترێك یـا زیـاتر تـەجاوز ئـەکرێن (هەنـدێك جـار لەژێریشـەوە کۆڵەکەیان بۆ بەکاردەهێنرێت، بـۆ زیـاتر ڕاگیرکردنیـان) و دەکرێنـە بەرهـەیوان، ئەمەش لەبری تارمەیە و هەندێکیش هەر بەو جۆرە ناوزەدی دەکەن، هەرچەندە (تارمـە) نـاوێکی نوێـیە لـەڕووی بەکارهێنانـەوە لـەناو کوردەواریـدا، بـەلاّم وەك هونەری ئاوەدان کردنەوە مێژوویەکی هەیە و لەلای گەلانی تریش بلاّوە.

**٧ـ پشت هەیوان:** ئەو هۆدەیەیە کە زیاتر بۆ چێشت لێنان و، قاپ و قاچاخ پارێزی بەکاردەهێنرێت و، دەکەوێتە پشت هەیوانەوە و کەمتر لەتەوێڵە هەبووە.

**٨ ـ بالاّخانـە:** پێشـی دووەم نهۆمی خـانووە، کەلەسـەر کۆلاّنـە، ئەمـەیش زیـاتر لـەخانووی داراو دەسـەلاّت دارەکانـدا هـەبووە، وەك بالاّخانەکـەی شـێخ حسامەددین و قادر بەگ و ... هتد ...

**٩ ـ کۆمـانج:** لەهـەورەبان دەچـێت بـەلاّم سـادەتر دێتـە بەرچـاو، ئـەویش لەبەرئـەوەی کەرەسـتەکانی: تەختـە و دار و تەنەکـە و چـینکۆیە ... لەناوەنـدی خانووەکەوە بە پێپلیکە یاخود بە پەیـژە بـۆی سـەر ئەکـەویت و لـە (کۆمانج) ەوە دەچیتە ناوەندی سەربانەکە هەر بۆیە، کۆمانج، بەرگرە لەهاتنە خـوارەوەی بـاران و باو و گێژەڵۆکە، بۆ ناو خانووەکە.

## تەوێڵە – باخچەمیرا – پاییزی ١٩٧٧

تەوێڵە - بەهاری ٢٠٠٤

## پەراوێزەکان

[١] بڕوانە ( گەشتی هەڵەبجە و هەورامان ) ی شاکیر فەتاح . ل ٣٤ بەکەمێك دەستکاری ڕووکاری داڕشتنیەوە لەوەسفی خانووەکەی ( قادر بەگی جافرسان ) دا .

[٢] هەمان سەرچاوەی ڕابردوو . ل ٧ .

[٣] بۆ باسکردنی پێکهاتەکانی خانووبەرەی تەوێڵە سوود لەدیمانەیەك وەرگیراوە کە بە تایبەت بۆ ئەم بەشە لەگەڵ بەڕێز ( وەستا ڕەشاد تەوێڵەیی ) دا سازمان کردووە ، کە خۆی دارتاشێکی بەناوبانگی تەوێڵەیە ... هەروەها :سودێکی زۆرمان لەهەردوو بابەتی :

ا ـ ( کورتەیەك دەربارەی گرنگترین کەرەستەی خانوو بەرە لەناوچەی هەوراماندا ) نووسینی : ( عوسمان محمد هەورامی ـ گۆڤاری کەلەپوری کورد ـ ژـ ە ئەیلوولی ١٩٩٤.

ب ـ طراز المعماري و الزخارف في طويله . عبدالرقيب يوسف ـ گۆڤاری . کاروان ژ. ٧ ـ نیسانی ١٩٨٣ ل ١٢٣ ـ ١٢٨ .

[٤] لەسەردەمی ڕابردوودا بۆ پتەوکردنی دیوار تەنها دیمەکیان بەهێندنەگرتووە بەڵکو گرنگیان بەجۆری بەردە بەکارهێنراوەکەشداوە ، بۆ نموونە : لەخانووەکەی قادر بەگ دا جۆرە بەردێك بەکار براوە کەوێنەی کەمە و تەنها لەدەرەی بەڵخ و پشتی حەساردا هەبووە ، کە بەردێکی شینی نەرمە و لە کوورەدا دەسووتێنرێت و ئینجا بەکاردەهێنرێت ... کە ئێستا بلۆك و بەردی سەنگین جێگای ئەوانیان گرتووەتەوە .

[٥] کوردستان / گیوی موکریانی / چاپی یەکەم / ١٩٩٩ / هەولێر ل ٥٩، بالأشمە .

[٦] هەنبانە بۆرینە / هەژار موکریانی / بەرگی یەك / ل ٤٥ .

[٧] بۆ وشەی (باهوو ) بڕوانە هەردوو فەرهەنگی ( کوردستان ) ل ٦٤ و ( هەنبانە بۆرینە ) بەرگی یەك ل ٤٨ .

[٨] هەمان سەرچاوەی ڕابردوو ل ٤٩٥ .

[٩] پلووسك : بەوئاو ڕێژە دەوترێت کە ئاوی سەربان لەخاڵی ئەودا خڕ دەبێتەوە و ئەویش دوو جۆری هەیە ... ئەگەر ماڵ و شوێنی هەستیاری لێوە نزیك نەبێ بەرهەڵایە و بەڕێگەی خوڕەم ئەڕژێت ... خۆ ئەگەر نا ئەوا بەتەنەکە لوولەکێکی درێژی بۆ

دروست دەکرێ ، بۆ ئەوەی ئاوەکە نەڕژێتە جێیەك کە ئازار بەهەستی کەس بگەیەنێت.

[10] باگردێن : لوولەکێکی یەك مەتریە ، لەتەوێڵە لەبەردی چەمەکان دروست دەکرا لەلایەن وەستای‌تایبەتی خۆیەوە وەك وەستا خەلیل ( خەزووری جافری لاوە ) و ، وەستا حەبیبوڵلا باوکی مامۆستا جەمال بێداری شاعیرەوە ، بەگشتی لەزوربەی دێ و گوندی کوردستاندا هەیە و جۆر و شێوەی خۆی و دەسکەکەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر دەگۆڕێت و تەنانەت ماددە خاوەکەشی لەبەردەوە دەگۆڕێ بۆ چیمەنتۆ و شتی‌تریش .

[11] گلارکۆ : ئامێری کوتانەوەی گوێسەبانە ، بۆ جل و خوری شتن یش بەکاردێت ، لەتەختەی تۆکمە و خۆگر دروست دەکرێت و درێژیەکەی نیو مەتردەبێ و پانیەکەشی ( ٢٠ سم ) ێك ، ئەستووریشی بەگوێرەی پێویست و زۆرترینیان ( ٣ سم ) ێك دەبن گرنگ ئەوەیە هێندە قورسایی هەبێت کە کاریگەری لەسەر گوێسە بانەکان بەجێ بهێڵێت.

[12] بانوش : بانگێڕ ... کە زۆرتر بەوکەسانە دەوترێت کە بەرامبەر بەکرێ‌یەك لەکاتی پێویستدا سەربانەکە بگێڕێت

[13] بۆ ئەم بەشی ( ساوین ) ە ، زۆرتر سوودمان لەو وتوێژە وەرگرتووە کەلە خاتوو ( عەتیە مەحمود مستەفا ) داسازمان کرد ، سەبارەت بەم چەمکە ، کە خۆی یەکێکە لەئافرەتە شارەزاکانی ئەم بوارەی تەوێڵە .

[14] گڵنجانە لەدوو واتاوە نزیکە :

١ ـ گڵ + جان ( کۆی پەری ، پەریان ) = کەمانای گڵی بێ‌وێنە دەگەیەنێ ، چونکە لەلای خەڵك واباوە بەشتێك ئەوترێ هی پەریانە کەلەلای مرۆڤ نایاب و دەگمەن بێت .

٢ . گڵی جان : گڵ + جان ( گیان ) کە ئەشێت بەتێپەڕبوونی زەمەن پیتەکان داخورابن و گۆڕانیان بەسەردا هاتبێ = ڕۆحی گڵ کە ئەمەشیان دیسان وشەیەکی بلاوە بۆ نایابی و بەرزی شتێك ئەوترێ ، ئەمە ڕۆحی ئەوشتەیە . بەهەر حاڵ هەرکام لەم واتایانە لەراستی وشەکەوە نزیك بن هەر خزمەت بەو ناوەرۆکە دەکەن کە تا ئەمڕۆش لە ساوینی ماڵاندا بەکاردەبرێ .

[١٥] سیرەکۆ : لەتەوێڵە پیێ دەوترێت ( سیرەکۆڵە ) هەرچەندە پاشگری ( ڵە) بۆ بچوك کردنەوەیە بەڵام ( سیرەکۆ ) بەوبەردە خز و لووس و قورسانەی چەم و چۆم ئەوترێت کە بۆ پرۆسەی ( سلوین ) بەکاردەهێنریێ و هێندەی هەسان لووسە . کە دووقەبارەی هەیە و بۆ ساووینی ماڵ و تەختانی ژوور و سارای وشك کردن ( ساناڵێ ) و بەر بەرۆچکە و سەربانی خەوتن بەکاردێت.

[١٦] لەکاتی چۆڵکردنی تەوێڵەدا هەردووکیان ( مزگەوتەکە ) ش و ( خانووە ) ە کەش رووخان ئێستا بەجۆری تر دروست کراونەتەوە .

[١٧] شاری سلێمانی / ئەکرەمی مەحمودی صاڵحی رەشە / بەرگی دووەم / چاپی دووەم ل ٥١٢ .

[١٨] ئەم شێوازە بەناوبانگترین شێوازی ( کەلەگی ) یە و واباوە کەوێنەیەکە لەسەر شێوەی جەنگ دارێژراوە ، نێوان کە ( هەیوان ) ە کەیە سنگی جەنگە و سەرکرایەتی تێدایە و لەهەردوولای راست و چەپەوە هێزی پشتگیری هەیە و پشتیوانی ناوەند ئەکەن .

ساسانیەکان بەم شێوازی خانووەیان وتووە ( سهدلی ) ، سەدلی لەزمانی عەرەبیدا گۆڕاوە و بووەتە ( سدیر ) ، بڕوانە : گۆڤاری ( کاروان ) ژمارە ( ٢ ) ت ٢/ ١٩٨٢ ل ١٦ . بابەتێکی مامۆستا ( عبدالرقیب یوسف ) ە .

[١٩] نووسەری گەورە ( شاکیر فەتاح ) لەگەشتەکەیدا بۆ تەوێڵە نوووسیوویەتی :

ــ پیاو بەراستی کەبەراودی لادێکانی شارباژێر و هەورامان ئەکات ، سەری سوڕئەمێنی ، ئەم خانوانە لەشاریشدا کەم وێنەیان هەیە ، زۆریان بەبەردی رەنگاو رەنگی شاخەکە و وشکە کەڵەك دروست کراون ... ل ٣٤ .

[٢٠] وەستا بەرێز و دیارەکانی سلێمانی وەك : وەستا عەلی و وەستا حەسەنی فاتمە غەزالی و وەستا مەعروفی درێژ و وەستا عەلی وەستا حەبیب ، دان ئەنێن بەوەستاکانی تەوێڵە لە بیناسازی دا . بڕوانە : گۆڤاری کاروان ژمارە : (٧) ل ١٢٨ .

[٢١] شاری سلێمانی / بەرگی دووەم / ل ٥١٢ .

# شارەوانی تەوێڵە

- سەرەتا
- دامەزراندنی کەی بووە؟ سەرۆکەکانی کێ بوون؟
- مێژووی بینای شارەوانی
- کارمەند و کرێکارەکانی شارەوانی
- کورتەیەك لەژیانی ڕەئیس
- بەرید و بەداله
- جادە ڕاکێشان بۆ تەوێڵە
- پڕۆژەی ئاو و ئاوەڕۆ و کارەبا
- فەرمانبەرەکانی کارەبا
- فەرمانبەرەکانی ئاو و ئاوەڕۆ
- بۆیەکە مجار
- پەراوێزەکان

# شارەوانی تەوێڵە

**سەرەتا:**

بوونی شارەوانی بەڵگەیە لەسەر بوونی کایەیەکی ڕێکخستن،لەبواری ئیداری و فەرمانداری، لەسەرجەم مەوداکانی پرۆژە خزمەتگوزاری و پیشکەوتووەکانی، تایبەت بە جەماوەر،وەك: جۆری خانووبەرە و رایەڵی ئاوو کارەبا و، پرۆژەی شەقام و بونیادنان و لوولەکێشی و ئاوەڕۆ و ... هتد[1].

**- دامەزراندنی کەی بووە؟ سەرۆکەکانی کێ بوون؟**

لەسەرەتای ساڵی (١٩٣٥)دا شارەوانی تەوێڵە دامەزراوە، لەسەرەتاوە (میرزا عەبدولقادر) بەوەکالەت بووبە بەڕێوەبەری،بەڵام پاش ماوەیەك داخراو، سەرلەنوێ بەشێوەیەکی ڕەسمی دامەزرایەوە، یەکەم سەرۆکی شارەوانی تەوێڵە، بەڕێز (محەمەد سان ئەحمەد) بووە کەلە (١/١١/ ١٩٤١) دا دەست بەکاربووە ... هەروەها مامۆستا (بابا حاجی) بووە بە (کاتب) ی شارەوانی تاساڵی(١٩٤٣).

لەساڵی (١٩٥٨) دا بەڕێز (محەمەد سان ئەحمەد) فەصلْ کراوە و، پاشان بەڕێز مەلا نووری هەڵەبجەیی بووە بە سەرۆك شارەوانی، تا سەرەتای (١٩٦٣) لەوساڵەدا ئیدی شۆڕش دەستی پێکردووە و،بەڕێز (نوری حەمەی نانەوا)، کە ئەمیش هەڵەبجەیی بووە،کراوە بەسەرۆکی شارەوانی تاساڵی(١٩٦٤).

لەساڵی (١٩٦٤) دا جارێکی‌تر،بەڕێز (محەمەد سان ئەحمەد) کراوەتەوە بەسەرۆکی شارەوانی تاوەکو کۆتایی(١٩٧٥).

ئینجا(شێخ محسن تاوگۆزی) کراوە بە سەرۆك، بۆ ماوەی ساڵێك و،پاشان ئەونقلْ کراوە، ... دواتر بەڕێز(مەلا جەمیل عەبدولئەحەد) بووە بەوەکیل و،پاشان (هادی محەمەد سان ئەحمەد) جێی گرتووەتەوە، تاساڵی (١٩٨١)کە تەوێڵە چۆڵ بووە.

لە دوای ڕاپەڕینیشەوە، بەرەبەرە ،فەرمانگە و دەزگاکان گەڕانەوە تەوێڵە و، بەڕێز (هادی محەمەد سان ئەحمەد) کرایەوە بەسەرۆك شارەوانی و،دوای ئەویش بەڕێز (دڵسۆز) ی برای بوو بە سەرۆك،تا هەڵبژاردنی شارەوانییەکانی (٣/٢/ ٢٠٠٠) کە بەهەڵبژاردن دووبارە بەڕێز (دڵسۆز محەمەد سان ئەحمەد) کرایەوە بەسەرۆکی شارەوانی.

ئێستاش،[2] بەڕێوەبەرایەتی شارەوانیو، ڕەگەزنامەو ئاسایش و پۆلیس و کشت و کاڵ و نەخۆشخانە و خوێندنگاکان گەڕاونەتەوە وبەردەوامن لەسەرئیش و کارەکانی خۆیان.

**مێژووی بارەگای شارەوانی :**

یەکەم بارەگای شارەوانی تەوێڵە، ماڵی(عەزیزحەمەئەمین)بووە، ئەو کەل و پەلەی کڕابوو بۆ ناو ئەم بینایە،لەئێرانەوە بە (١٥) دینار هێنرابوو.

پاشان، یەکەم بینایەك کە بۆ شارەوانی دروستکرا،بینای زیارەتان بوو، کە لەساڵی (١٩٤٨) دروست کران. وەستاکەی وەستا(حەمە ئەمین)بوو. ئەم بینایە دووبەش بوو:

بەشی لای چەپی: ژێرەکەی کانی یەك بوو، بەناوی (هانەومەلاّیا) واتە (کانی مەلایان)، لەسەرئەم کانی یە بینایەك دروستکرا،کەپێکهاتبوولە دوو ژوورو هەیوانێك و، ئەمە کرا بەبارەگای شارەوانی.

لەساڵی (١٩٥٢) لەسەرئەم بینایە دووژوورو هەیوانی تر دروستکراو، ئیتر دەوامی شارەوانی لەم قاتی سسیّ وە بوو، وەدەشیڕوانی یە بازارەکەی تەوێڵە. قاتی دووەمەکەشی کەسەرکانی یەکەی دەکرد کرا بەبنکەی تەندروستیو، پاشان درا بەکریّ بۆچایخانەی (تاهری کا کەلە).

بەشی لای ڕاستی: لەساڵی (١٩٥٢)شدا ئەم بەشەش دروستکرا، ئەمیش دووقات بوو، قاتی یەکەمی لەسیّ دوکان پێکهاتبوو، ئەمانیش دران بە(مەلاعارف و مەلائەحمەد و حاجی عەبدوڕەحمان) [٣] لەسەرئەم دوکانانەش دوو ژوور و هەیوانێکی تر دروستکراو کران بەیانەی میوان(دارالضیافة) بۆ میوانانی حکومی.

لەشۆڕشی ئەیلول دا ئەم بینایە وەك بارەگایەکی حزبیش سودی لیّ وەرگیراوە. لەدوای ڕاپەڕینیشەوە تائێستا کەسا لێ (٢٠٠٣)یەئەم بینایە دروست نەکراوەتەوە،چونکەپێشترلەشەڕی عێراق وئێران دا روخابو ئێستا شارەوانی تەوێڵە لەخانوەکەی (تەحسین حەمەئیمام) دەوام دەکات.

**کارمەند و کرێکارەکانی شارەوانی :** [٤]

١. نادر حەمە ئەمین ئەسکەندەر (فەرا ش)
٢. عارف حەمەحسێن. (چاوش)
٣. حەمە صالح وەیسی. (کاتب)

٤. عەلی حەمە حسێن. (چاوش)
٥. کاکەبرا نادر. (کاتب)
٦ . مەحیەدین حەمە سەعید قادر. (کاتب)
٧ . هادی محەمەد سان ئەحمەد. (کارمەند)
٨ . دڵسۆز محەمەد سان ئەحمەد. (ئەمین صندوق)
٩ . محەمەد جەعفەر حەمە صاڵح. (کاتب)
١٠ . عەبدورەحمان عەبدولحەمید. (کرێکار)
١١ . میرزا حەمە ئەمین مەنگوری. (ئەمین صندوق)
١٢ . ئیبراهیم ئەکرەم. (چاودێر)
١٣ . حەمە صالح مەحمود. (کارمەند)
١٤ . جەعفەر عەبدوڵڵا. (کارمەند)
١٥ . حەمەصادق حەمە حەسەن. (شۆفێر)
١٦ . محەمەد حاجی حەمە رەحیم. (فەرمانبەری کەشناسی).
١٧ . سەعید میرزا عەبدولقادر (فەرمانبەری کەشناسی).
١٨ . ماجد محەمەد حاجی حەمەرەحیم. (فەرمانبەری کەشناسی).

**کورتەیەك لە ژیانی رەئیس:**

محەمەد سان ئەحمەد (رەئیس)

ناوی (محمد سان ئەحمەد)ە لەبنەماڵەی ئاغەلەرانەو، سان ئەحمەدی باوکی ناودارێکی تەوێڵە بووە. لەساڵی(١٩١٤) لەشارۆچکەی تەوێڵە لەدایك بووە. لە (١٩٢٨/١٠/٢٤) چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی لەتەوێڵەو چونکە پێشتر قورئانی خوێندووە، یەکسەر لە پۆلیدووەم دا دانراوەو، تاپۆلی شەشی سەرەتایی ئەوکاتەی خوێندووە، بەهۆی خوێندنەوەو زیرەکی خۆیەوە، خوێندەوارێکی لێهاتوو و باشی لێ دەرچووە.

رەئیس لەگەڵ حزبی هیواو پارتیدیموکراتی کوردستان دا ئیشی کردووە، لە سەردەمی مەلیکیدا لەگەڵ کوتلەی (حامدبەگ) بووە کەسەر بە(نوری سەعید) بووە. کەلەوکاتەدا کوتلەی (ئەحمەدبەگی حەمەصالح بەگیجاف)یش بووە کەسەر بە صاڵح جەبر بووە.

بەهۆی پلەو پایەی بنەماڵەیی و باوکی یەوە، وە بەهۆی کەسایەتی و توانای خۆیەوە، لە ساڵی(١٩٤١) کرا بەسەرۆکی شارەوانی تەوێڵە. لەدوای شۆڕشی (١٤)ی تەموز لە ساڵی (١٩٥٨) لە سەرۆکی شارەوانی لابرا، تاوەکو لە ساڵی(١٩٦٤) جارێکی تر کرایەوە بە سەرۆک، تاوەکو نسکۆی (١٩٧٥)، لەکۆتایی ئەوساڵەدا گوازرایەوە بۆ (دهۆك)، ماوەیەك لەوێ مایەوە، تا لەکۆتایی ساڵی (١٩٧٦) دا،خۆی خانەنشین کردو هاتەوە بۆ تەوێڵە.

ڕەئیس ... پیاوێکی خزمەتگوزارو تێکۆشەرو بە وەفاو نیشتمانپەروەرە، ڕاستوێژ وجەسور ڕاشکاو (صەریح)و ئازایە،هەڵوێستەکانی هەمیشە لەخزمەتی گەل و نیشتیمانەکەی دابوون، هاندەری قوتابیان بووە بۆ زیاتر خوێندن هەوڵی زۆری داوە بۆئەوەی لێپرسراوانی میری سەردانی ناوچەکە بکەن، تاوەکو زیاتر بێن بەدەمی ناوچەکەوە.

ئەم بەڕێزە لەسەرۆکایەتی یەکەی دا ڕۆڵی خۆی بینیووە، لەخزمەتکردنی پرۆژەکانی ئاوو کارەبا ونەخۆشخانەوجوانکردنی شارۆچکەکەدا لەمەسەلەی ڕانەگوێزانەوەی تەوێڵە لەساڵی (١٩٧٨)دا، لەگەڵ چەند کەسایەتی یەکی تری تەوێڵەیی دا، هەڵوێستێکی جوامێرانەو کۆڵنەدەرانەی هەبووە، کە لەشوێنی خۆی دا باسمانکردووە.

لەساڵەکانیئەم دواییەشدا، بەتایبەت لە کاتی ئاوارەیی تەوێڵەیی دا، هەمیشە لەبوارە کۆمەڵایەتی یەکاندا ئامادەبووەو،داوای لەهاوڵاتیان ئەوە بووە کە خۆڕاگرو نیشتمانپەروەربن و، پابەندبن بەڕەوشتە جوانەکانی کوردەواری یەوەو، هاوکاری قوتابی یان وهەژاران بکەن.

دڵسۆز محەمەد سان ئەحمەد - سەرۆکی شارەوانی

ڕەئیس... لەژیانی دا تووشی گرتن وناڕەحەتی و دەردیسەری زۆریش هاتووە ... ئێستاش کە ساڵی(٢٠٠٣)یە لە سلێمانی دانیشتووە، لە ژیانی دا سێ ژنی هێناوە، خاوەنی چەند کوڕو کچەو دوان لە کوڕەکانی، هەر لەشارەوانی تەوێڵەدا، خزمەتی یان کردووە، ئەوانیش بەڕێزان (هادی ودڵسۆز)ن... هادی لە دوای ڕاپەڕینەوە سەرۆکایەتی شارەوانی تەوێڵەی کردووە تا ساڵی (١٩٩٦)، لەوکاتەوە چووە بۆ ئەمریکا، دوای ئەو (دڵسۆز)ی برای بوو بەسەرۆکی شارەوانی، لە هەڵبژاردنی شارەوانی (٢٠٠٠/٢/٣) یش، هەر ئەو بەسەرۆکی شارەوانی هەڵبژێرایەوە.

**بەرید و بەداڵە:**

بەرید و بەدالەش رۆڵێکی گرنگ دەبینن لەناوچەدا بۆ ئاسان کردنی کارەکان ...هەر بەکردنەوەی شارەوانی لەتەوێڵەدا، زۆر هەوڵ درا کە ئەم بەشە خزمەت گوزاریە بکرێتەوە، تا لەساڵی (١٩٥٨)دا دامەزرا (عابد ئەحمەد قادر) بوو بەمەئمور بەدالەی تەوێڵەو، توفیق زاوای وەستا حەمە ئەمین کرایە کارمەندی، تاوەکوو لەسەردەمی شۆرشدا (١٩٦٢) ئەم دائیرەیەش وەك دائرە حکومی یەکانی تر، داخراوکێشرایەوە بۆ لای حکومەت، تاوەکو ساڵی (١٩٧٠)، بەلاّم لەسەردەمی شۆرشدا، پارتی بۆ کاری حزب ئوتێلەکەی حاجی جەزای کردە دائرەی لاسلکی و، جهازی بۆ داناو، چەند کەسانێکی لەسەر دانرا لەوانە (ئدریس حاجی عەبدوڵلاّ، یوسف حاجی موحەمەد، حەمە لەتیف حاجی حەمەرەحیم، حەمەی لاسلکی ناسراوە بە عەریف موحەمەد هەڵەبجەیی).

لەساڵی (١٩٧٠)وە، لە لایەن میری یەوە جارێکی تر ئەم دەزگایەی کردەوەو، تۆفیق هەڵەبجەیی گەڕایەوەو مەئموریەتی بەدالەکەی پێسپررایەوە.

لەبەهاری(١٩٧٥) دا، خەتی تەلەفۆنی بۆ دانراو، چەند ماڵ و دوکان و دەزگایەك خەتیان بۆ راکێشرا، لەکارمەندەکانی ئەم دائیرەیەش، لەساڵەکانی (١٩٧٦) بۆ (١٩٨١) ئەم بەرێزانە بوون: (١) یوسف حاجی موحەمەد. (٢) عەبدولخالق قادر. (٣) تۆفیق سان ئەحمەد. (٤) نادر عەزیز. (٥) حەمە صالح تۆفیق. (٦) سەرکەوت حاجی عزەت.

**جادە راکێشان بۆ تەوێڵە:** [٥]

لەساڵی (١٩٣٦) دا خەڵکی تەوێڵە هەوڵێکی زۆر دەدەن بۆئەوەی جادە بێتە تەوێڵە" قائمقامی هەڵەبجەو موتەسەڕیفی سلێمانی رازیدەبن و موافەقەت دەکەن، بەلاّم (تەها هاشم)کە سەرۆکی سوپای عێراقی دەبێت، رازی نابێت و، ناهێڵێ لەبەرئەوەی تەوێڵە کەلەسەر سنور بووە.

پاشان چەند جاری تر هەوڵیاندا" بەلاّم هەر نەگەیشتنە ئەنجام، تا لەبەهاری ساڵی (١٩٥٥) کەبەرێز (موحەمەدی سان ئەحمەد) سەرۆکی شارەوانی تەوێڵە دەبێت، لەگەڵ ئەم پیاو ماقولاّنەی خوارەوە" دەڕۆن بۆ بەغداد بۆ لای (سەعید قەزاز) کەلەوکاتەدا وەزیری ناوخۆی عێراق دەبێت:

(مەلا عەبدولئەحەد، عەلی عەبدول رەحیم، حاجی بابا حاجی محەمەد، حاجی جەزا مەولود، حاجی عەبدول رەحمان حەمە رەحیم ـ ملکی، حاجی عەلی حاجی صادق.)

پاش گفت و گۆیەك، لەئەنجامدا بەڵێنیان پێدەدا و دەڵێ: (بەشەرەفم ئەبێ ساڵێکیتر بەئوتومبێل بێم بۆ تەوێڵە).

دوای ماوەیەك بەواسیطەی سەعید قەزاز ئەمری جادەی تەوێڵە دەرچوو، درایە قۆنترات بە(١٦) هەزار دینار، بە(غەنی شاڵی_بەڵێندەر)، لە هاوینی ساڵی (١٩٥٥) دەستکرا بەچاك کردنی، تامانگی (١٠)ی هەمان ساڵ. لەکۆتایی هاوینی ساڵی (١٩٥٦)دا جادەی تەوێڵە چاك کراو تەواو بوو. ئیتر تەوێڵە بەسترا بە هەڵەبجە و خورماڵەوە.

لە ساڵی(١٩٥٦) بۆیەکەم جار ئۆتۆمبێلێکی جۆری پاصی تەختە هاتە تەوێڵە" کەشۆفێرەکەی (مەحیەدین حەسەن . مەحەڕابە) بوو، بۆ دووەم جاریش ئۆتۆمبێلەکەی (صاڵح تاتە) بوو.[٦] ئەم جادەیە قیرتاو نەکرا، هەر تەنها خۆڵبوو، تا لەساڵی (١٩٧٦)دا قیرتاو کرا، لەبەهاری ساڵی(١٩٦٦) لەسەردەمی عەبدولوەهاب ئەتروشیدا، کە حوکمی تەوێڵەی دەکرد، فەرماندەی هێزی خەبات بوو، بەخەڵکی تەوێڵە، جادەی نێوان شۆشمێ و تەوێڵەش چاك کرا، بەم شێوە دوو پایەگای عێراق و ئێران بەستران بەیەکەوە.

لەهاوینی ساڵی(١٩٧٤) پردی گەڕیاتیش بەچیمەنتۆ چاك کراو، لەبەهاری ساڵی(١٩٨١)دا ،جادەی نێوان تەوێڵە و دزاوەری ئێران ،چاك کراو، ئێستاش کەکۆتایی ساڵی (٢٠٠٣)یە ئەو جادانە هەر ئەوانەی ئەوکاتەن، خەریکە ئێستا دەستکاری دەکرێن و بڕیار دراوە هەم پان بکرێن و هەم قیرتاو بکرێن.

**تێبینی**: پێش ئەوەی جادە بێنن بۆ تەوێڵە ئەم سایەقە تەوێڵەییانە لەنێوان سلێمانی و هەڵەبجە شۆفێر بوون:

قالەی صاڵح تاتە. لەنێوان سلێمانی و هەڵەبجە لۆری پێ بووە.

حسێن صاڵح تاتە. لەنێوان سلێمانی و هەڵەبجە پاصی پێ بووە.

حەسەن صاڵح تاتە. لەنێوان سلێمانی و هەڵەبجە قەمەرەی پێ بووە.

عومەری شەمعە. لەنێوان سلێمانی و هەڵەبجە پاصی پێ بووە.

عەلی شەمعە. لەنێوان سلێمانی وهەڵەبجە پاصیپێ بووە[٧]

**پرۆژەی ئاو وئاوەڕوو کارەبا:**

سەرەتا دەڵێین: پێش ئەوەی باسی کارەبا بکەین ،دەبێ خەڵکی چیان داگیرساند بێ بۆ روناك کردنەوە" بێگۆمان چرایان بەکار هێناوە، کە لەمپاو دیوار کوو فانۆس و لۆکس یان پێ دەڵێن ،بەڵام پێش ئەمانە چی بووە؟

هەرناوچەیەك لەوانە یە شتێکی بووبێت ،خەڵکی تەوێڵە لەباتی چرا چراوگەیان بەکارهێناوە.

چراو گەچی‌یە ؟

دووجۆرە: جۆرێکیان گیایەکە نزیکەی نیومەتر لەئەرز بەرز دەبێتەوەو، گوڵێك دەکات و بەرێکی هەیە وشك دەبێتەوە و پێوەی دەمێنێتەوە لە نۆك گەورەترە لە (شوتکیلە) دەچێت.

جۆری دووەمیان: خەڵفی بەڕوو، دووساڵە دەبڕن، بەئەندازەی نیومەترێك، سەرەکەی وەك سەری سیواك دەکوترێت و شیتەڵ دەکرێتەوە، لەتاقی سەربان و سەر کەپرو قەدی درەختێك بەچەپك دادەنرێت، تا وشك دەبێتەوەو لە کاتی پێویست دا بەکاریان هێناوە.

ئەم چراو گەیە وەك چرایەك بەکارهاتووە و درەنگ کوژراوەتەوە بەتایبەت دووەمیان باشتربووە.

بەڕێز محەمەدی سان ئەحمەد دەڵێ [8] : لەکۆتایی مانگی (٨/ ١٩٥٦)دا (عومەر عەلی) موتەصەرفی ئەوکاتەی سلێمانی بانگی کردم و پێی وتم: نهێنی‌یەك هەیە، پێت دەڵێم، تەنها خۆت بزانی ئەویش ئەوەیە: کە نزیکەی مانگێکی‌تر، وەلی عەهدی مەلیك (عەبدولئیلا) سەردانی تەوێڵە دەکات جا هەر لەئێستاوە تا ئەوکاتە تەرتیباتی خۆتان بکەن و ئەندازیارێکی بەتواناشت دەدەمێ، بیبە لەگەڵ خۆتدا باهەندێ نەخشەت بۆ دابڕێژێ بۆ خانو بەرەکەت و... وە لحاصل جێگای حەوانەوەی بۆچاك بکەن... هەروەها کاك محەمەد دەڵێ:

ئەو ئەندازیارە هات بۆ تەوێڵە ئەمانەمان کرد:

- خانووەکەی خۆم ئەو پلیکانانەی سەرجادەی بۆ چاك کران، چونکە لەوەو پێش تەنها ڕێگای پشت مزگەوتیان هەبوو، ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە وەلی عەهد لەم ڕێگە ئاسانەوە، سەرکەوێت بۆ خانوەکە.
- کارەبای سەفەریان داناو ڕایان کێشا بۆ هەموو ژوورەکان.
- لە(هانەی دلین) لەپشتی حەوز بەلولە ،ئاویان هێنا بۆ خانوەکەی خۆم و بۆ بینای بەلەدیەو، بۆ ناو بازاڕ فوارەیەکیان دامەزراند.
- حەمامێکی سەفەریان هێنا بۆ ناو خانووەکە.

بەم شێوە بۆ ماوەی مانگێ خۆمان ئامادە کرد، تا رۆژێکیان خەبەریان دایێ کە بەیانی (١٩٥٦/٩/٢٦) جەنابی (عەبدولئیلا) خۆیی‌و چەند یاوەرێك دێن بۆ تەوێلە.

ئەو رۆژە لەتەوێڵە کەس نەچوو بۆ دەرەوەو بۆئیش و کار، هەموو سەربانی خانووەکانیان رازاندبویەوە بەمەوج و لێفەو فەرش وگوڵی جوان جوان، یەکپارچە دیواری خانوەکان داپۆشرابوون ،ە ژنان و منالاَن لەسەربانان کۆریان بەستبوو بەتایبەت ئەو سەربانانەی نزیك بازاڕ وەك سەربانی خانوی سەعدی بەگ و قاپی و دوکانەکانی بازار...تاد.

پلیکانەی خانوەکەی خۆم پڕفەرشکرابوو، خەڵك لەبازاڕ ئەمبەروئەوبەر وەستابوون، بۆ پێشوازی هەندێك لەپیاو ماقولاَن هاتن بۆ خوار تەوێڵە هەموو گوندو شارۆچکەکانی نێوان تەوێڵەو عەربەت، لەسەر جادە وەستابووون، بۆ ئەم پێشوازی یە.

(وەلی عەهد) هات لەباجگیرا لەلایەن تەوێڵەییەوە، پێشوازی لێکراو، کەبەرەو خانەقا هات چەند قوتابیەك چەپکەگوڵیان پێشکەش کرد... لە ناو بازاردا خەڵك ئاپۆڕەی بەستبوو، باباحاجی شعرێکی بەعەرەبی بەسەردا خوێندەوەو، وتاری بەخێرهاتن خوێنرایەوەو، ئەویش سوپاسی ئەو پێشوازی‌یە گەرمەی کردن و بەرەو شوێنی حەوانەوەی کەخانوەکەی بەڕێز (ڕەئیس) بوو کەوتەڕێ. بەڵێ ئەوشەوە لەوێمایەوەو،پۆلیس و سەرباز هەر چوار دەوری تەوێڵەیان گرتبوو.

بۆ بەیانیەکەی چوو بۆ ئاوێسەر، کەئەو باخانەی بینی زۆر سەری سوڕما بوو، دڵخۆش بوو لەناو چەمەوە لە(هانە سوسو)ەوە رۆیشت و لە(سەرکەل)ەوە گەڕایەوە، هەرکە هاتەوە بۆ ناوشارۆچکە، بروسکەی بۆهات کە دەبێ خێرا بگەڕێتەوەو ئیتر ڕۆژی دووەم گەرایەوە..

داواکاری خەڵکی تەوێڵە: لە(عەبدولئیلا) پرۆژەی ئاووکارەبا بوو، لەگەڵ چەند شتێکی تر، هەر لەوێ بەڵێنی پێ دان ....

هەروەها ڕەئیس وتی:

دوای دوومانگ خەبەر هات بەشوێنم دا چووم بۆ بەغدا بۆ مەسەلەی ئاوو کارەبا کە موافەقەتی بۆ دەرچوو وتیان: دەست بکە بە موعامله بۆی.. هەر لەوێ لەشەریکەیەکی هۆڵەندی دومەکینەی (١٠٠)ی گەورەو یەکێکی (٥٠)ی بچوکی بۆ دەرچوو. موعامەلەی خۆیم بۆکردو، دوایی ئیش وکاری سلێمانیشم بۆ تەواو کرد. ئەوەی شایەنی باس بێت: (نوری سەعید و عومەر عەلی) ڕۆڵێکی باشیان بینی بۆهێنانی ئەودوو پڕۆژەیە.

دوایش، لیژنەیەك هات بۆکەشفی ئاوەکەو،ئەویش دەستی پێکرد.

بینای کارەبا کە لەپشتی حەوز بوو، درا بەقۆنتەرات بە حەمە صالحی عەبدول حەکیم...، پرۆژەی ئاوەکەش یەك تانکی گەورەی بۆ کرا، لەپشتی مالێدەر، لەبابا ئەسکەندەر، کە ئاوی هانە کڵە لەچەمی ئاوێسەرەوە هێنایان ر بەبۆری دابەش کرا بەسەر خانوەکاندا.

بەم شێوەیە لە کۆتایی ساڵی(١٩٥٧)دا هەردوو پرۆژەکە تەواو بوون.

لەساڵی (١٩٧٦) یش تەنکی یەکی تری بۆ دانرا لە قەدپاڵی شاخی بەشی وەراوەر لە پشتی حەوز بە (موضەخخە) ئاوەکەی بۆ سەر دەخرێت.

لەساڵی (١٩٧١) یش خەتی کارەبای گشتی بۆ هات و بەسترا بە کارەبای سلێمانیەوە ... هەرکاتێ کارەبای خەتی گشتی نەبوایە کارەباکەی خودی خۆی دەکەوتەوەکار، واتە: لەوە بەدوا وەك یەدەك . ئیحتیاط . بەکاردەهێنرا.

ئەم سێ مەکینەیە لە (١٩٥٧) تاوەکوو کیمیاویەکەی هەڵەبجە، هەر لە تەوێڵەدا بوون، لەوکاتەوە ئێران بردنی بۆ خۆی.

لەدوای ڕاپەڕینەوە لەساڵی (١٩٩٣) بەڕێز مام جەلال مۆلیدەیەکی تەرخان کرد بۆ تەوێڵە، لەساڵی (١٩٩٩) ئەو مۆلیدەیەیاندا بە سۆسەکان و مۆلیدەیەکی گەورەتریان بۆ دانا (250 kUU) کە(١١٥٠) ئەمپێرە لەئێوارەوە بۆ (١٢)ی شەو کارەبای هەیە ،هەروەها ،چەند مۆلیدەیەکی تری ئەهلیشی تیایە.

لەساڵی (٢٠٠٠) یشدا ئاوەڕۆی سندوقی تەوێڵە . بۆچەمەکانی دروست کرا کە(١٠٧٠) کم درێژەو بڕی (١٥٨) هەزار دۆلاری بۆ تەرخان کراوە.

لەفەرمانبەرەکانی کارەباش:

١. عەزەی وەستا عەلی (مردوە)

٢ . زۆراب عەزیز –حانە – (مردووە)
٣. صدیق ئاغە جافر (مردوە)
٤. حەمە لەتیف وەلی (خانە نشینە لەهەڵەبجە یە)
٥. عابد ئەکرەم (لە کیمیاویەکە دا مردوە)
٦. فەتاح مەحمود . فەتاحی خەرامان .(مردوە)
٧. عەلی محەمەد عەبولە (مردووە)
٨ . محەمەد کەریم (لەسلێمانیە)
٩ . محەمەدحاجی محەمەد . حەمەڕەق (مردوە)
١٠ . عەبدولقادر ئەبوبەکر . عەبدلی عەبولە.(لەسلێمانیە)
١١ . جەزا حاج عەبدوڕەحمان (لەسلێمانیە)
١٢. صابر مەحمود مستەفا (لەسلێمانیە)
١٣. باقی حاجی محەمەد عەزیز هەڵەبجەیی (لەسلێمانی‌یە)
١٤. صابر ئەحمەد بابا لە (لەتەوێڵەیە)
١٥. بابا ناجی (لەتەوێڵەیە)
١٦. کەمال حەمە سەعید (لەتەوێڵەیە)
١٧. پەروێز رەحمان (لەهەڵەبجە مردوە)
١٨. حەمە جەعفەر رەحمان (لەسلێمانی یە)
١٩ـ حافز عەلی عەبدولرەحیم (معاون ملاحظ)ە لەساڵی(١٩٧٦)ەوە بووە لێپرسراوی کارەباکە. ئێستاش لەسلێمانی‌یە.
٢٠ . حەمە رەحیم مەحمود (لەتەوێڵەیە)

**تێبینی**: لە ژمارە (١)ەوە بۆ ژمارە (٩)وە یەکەم وەجبەن کەدامەزراون، لەژمارە (٩)شەوە بۆ ژمارە(١٤) لە سەردەمی شۆڕش دا دامەزراون، کەلەوکاتەدا دەزگاکان کێشراونەتەوە، فەرمانبەرەکان هاتوونەتە هەڵەبجە، ئیترئەمان دانراون، لە جێگەکەی ئەوانەی پێشوو. لە ژمارە(١٤) شەوە بۆکۆتایی‌لە دوای ساڵی(١٩٧٥)ەوە دامەزراون.

**فەرمانبەرەکانی ئاو و ئاوەڕۆ:**

١. کاکە میرزا عەبدولقادر (مردوە)
٢. ڕەحمان فەتاح ڕۆستەم (لە تەوێڵە خانەنشینە)
٣. فەتاح بیارەیی (مردوە)
٤. عەباس حەمەمراد (لە سلێمانی‌یە)

٥. حەمەحسێن وەستا عەلی (مردوە)
٦. عەبدولواحد گەریم حەمەسەعید (مردوە)
٧. عەباس فەتاح ڕۆستەم (مردوە)
٨. فائق نادر عەبدولحەکیم (مردوە)
٩. حەمە ڕەئوف عەزیز خوا کەرەم (لەتەوێڵەیە)
١٠. عەبدولوەهاب عەزیز (مردوە)
١١. ئیبراهیم ڕەحمان سەعید (لەهەڵەبجەیە)
١٢. جمشێر فارس عەبدوالله (لەهەڵەبجەیە)
١٣. موختار مەحمود یارە (لەئەمریکایە)
١٤. حەمەڕەئوف حاجی ئامانەالله (لەتەوێڵەیە)
١٥. فەریح ئیمام حەمەسور (لەهەڵەبجەی تازەیە)
١٦. فاتح فەرەج حەمەئەمین (لەهەڵەبجەی تازەیە)
١٧. عەبدولواحد حاجی عەبدوالله (مردوە)
١٨. ڕەئوف عەلی حەمەباقی (لەتەوێڵەیە)
١٩. مەحیەدین ئەبوبەکر ئەکرەم (لەتەوێڵەیە)
٢٠. حەمەحسێن بابا (لەتەوێڵەیە)
٢١. عزەت سەلیم (لە تەوێڵەیە)
٢٢. زۆراب جەعفەر بابالە (لەتەوێڵەیە)
٢٣. عوسمان مراد عەبدوالله (لەتەوێڵەیە)

پرۆژەی ئاوی تەوێڵە - ٢٠٠٢/٢/١

بێگومان...ئەم پرۆژانەی کەباسمان کردن بەدام و دەزگاو کارمەندەکانەوە، هەموو سەر بە شارەوانین...

ئێستا کە ساڵی (٢٠٠٣) یە، شارەوانی تەوێڵە، لە(٥٥)کارمەند پێکهاتووە، سەرۆکی شارەوانی . دڵسۆز محەمەد سان ئەحمەدە هەرچەندە ماوەیەکە، لەبەر بارودۆخی ڕامیاری لەتەوێڵە نییە... لەساڵی(٢٠٠٠)یشەوە، ئەنجومەنێکی (٤) کەسی هەیە کە ئەمانەن:

(بورهان عەلی كوێخا عەبدوالله،كەریم محەمەد كەریم ،ڕۆستەم مستەفا فەرەج، نهاد عوسمان حەمەكەریم)،وە هەروەها (شیروان حەمە كەریم حەمەئەمین) ژمێریاری شارەوانی‌یە.

**تێبینی**/ لەكاتێكدا ئەم پەڕاوە لەژێر چاپدا بوو هەندێ پرۆژە دەرچوو بۆ تەوێڵەو دەستی پێكرا، وەلە ڕۆژنامەی كوردستانی نوێ‌دا ژ (٣٢٥٠) بەرواری (٢٠٠٣/١٢/٢١) بەم شێوەیە باسی ئەم پرۆژانە دەكات و دەنوسێ:

١- جادە بردن بۆ ئاوێسەر بەدرێژایی (٣) كم بەبودجەی (١١٥) هەزار دۆلار، لەگەڵ قەرەبوو كردنەوەی ئەو باخانەی كەزەرەرمەند بوون بەبودجەیەكی تایبەتی. بڕیارە بۆ ساڵی ئایندەش تەواو ببێت.

٢- ڕاكێشانی جادەی بەرامبەر لەناو تەوێڵەدا بەدرێژایی (٥٧٠)م بەبڕی (٢٤) هەزار دۆلار.

٣-ڕاكێشانی جادەی قەڵابۆزان لەلایەن شارەوانی تەوێڵەوە بەشێوەی ڕاستەوخۆ بەبڕی (١٤,٦٢٠) دۆلار.

٤- ڕاكێشانی تۆڕی ئاوی خواردنەوە بۆ گەڕەكی دەرەتفێ لەلایەن شارەوانیەوە بەشێوەی ڕاستەوخۆ بەبڕی (١٦,٩٩٤) دۆلار.

٥- ڕاكێشانی ئاوی خواردنەوە لەتەوێڵەوە بۆ سۆسەكان بەدرێژایی (٣ كم) بودجەكەی ڕێكخراوێكی ئەمریكی دابینیكردووە، هاووڵاتیان بەهاوكاری لەگەڵ شارەوانی جێ‌بەجێیان كردووە.

٦- تازەكردنەوەی نەخۆشخانەیەك كەبودجەكەی لەلایەن ڕێكخراوێكی ئەمریكی‌یەوە دابینكراوە.

سەبارەت بەپرۆژەكانی داهاتووش بەڕێز سەرۆكی شارەوانی تەوێڵە پێ‌ی ڕاگەیاندین كەچەند پرۆژەیەكمان بڕیارە لەداهاتوودا بەئەنجام بگەیەنرێ لەوانە:

- ئاوەڕۆی صندوقی (١٥٠٠) مەتر.
- قیرتاوكردنی جادەی ناوبازاڕی تەوێڵە.
- قیرتاوكردنی جادەی هاوینەهەواری ئاوێسەر.
- دروستكردنی (٣٠٠٠) مەتر ئاوەڕۆی فەرعی لەشارۆچكەی تەوێڵە.
- دروستكردنی دوو جادە بۆ گەڕەكەكانی تەوێڵە.
- دروستكردنی دیواری ڕاگر بۆ (٥) كۆڵانی تەوێڵە.
- دروستكردنی قادرمە بۆ كۆڵانەكانی تەوێڵە.
- نوێكردنەوەی تۆڕی ئاوی تەوێڵە.

- دروستکردنی بینای شارەوانی.
- لێدانی بیری ئیرتیوازی لەئاوێسەر.
- درێژکردنەوەی جادەی بەرامبەر بۆ پشتی خانەقا.
- چاککردنەوەی شۆستەی بازاڕی تەوێڵە.
- دروستکردنی یاریگەی منداڵان لە تەوێڵە.
- دروستکردنی بینای پۆستەو گەیاندن.

**بۆیەکەمجار:**

پێمان باشە ئاماژە بە هەندێ شت بکەین کە بۆ یەکەمجار، لەتەوێڵە کرابێتەوە یا بۆ تەوێڵە هێنرابێت ...بەڵام بە نسبەت ئەمانەی خوارەوە، پێویست ناکات دوبارەیان بکەینەوە ،چونکە لە شوێنی خۆیاندا بەدرێژی باسکراون:

(مزگەوت، خانەقا، قەیسەری، گەرماو، خان، گەراج، قوتابخانە، شارەوانی، جادە، پرۆژەکانی ئاو و کارەبا، بنکەی تەندروستی، نەخشەی نۆباو،...تاد.) هەروەها پیشەکانیش لە شوێنی خۆیاندا باسکراون. بۆیە ئەمانە پێویست دەزانین، کە ئاماژەیان پێ دەکەین:

- لە ساڵی(١٩٣٧)دا. گرامافۆن . کە سندوقی ئاوازەیان پێ وتوە،هێنراوەتە تەوێڵە، لەلایەن، حاجی حەسەن حەمەحسێن و، پاشان لە لایەن، نادر حەمەئەمینەوە دانەیکی تر کڕاوە بۆچاپخانەکەی لەپشتی حەوز.

- لە ساڵی(١٩٤٥) دائرەی مەعارف،ڕادیۆیەکی ناردوە، بۆ قوتابخانەی سەرەتایی تەوێڵە،تا گوێ بگرن بۆ دەنگ و باسی شەڕی دووەمی جیهانی، ئەم ڕادیۆ بەباتری تەڕ ئیشی کردوە، بەماتۆڕەکەی (کەریم کابان) کەئەوکاتە لەتەوێڵە پۆلیس بووە، با تریەیان شەحن کردووەتەوە.

- لەساڵی(١٩٤٩)شدا، وەستا سەید سادق عەلی مەولود ڕادیۆیەکی لەلای، حەمەد بەگی دزاوەری کریوە بە دوو دینارو نیو، وەهێناویەتی بۆ تەوێڵە. ئەم ڕادیۆ وێنەی کەویان کردبوو پێوەو،ئەمیش بەباتری تەڕ ئیشی کردوە،پاشان حاجی حەمەئیمام و ئەنوەری قادریش یەکی ڕادیۆیەکیان کڕیوە.

- چرای (فانۆس) لە ساڵی(١٩٢٨)، حاجیحەسەن حەمە حسێن، هێناویەتی بۆ تەوێڵە.

- یەکەم (ئۆتۆمبێل) باریهێنابێ بۆ تەوێڵە،لە ساڵی (١٩٥٦) بووە شۆفێرەکەی حەمەڕابە دەبێت،بارەکەشی هی حاجی ئەوڕەحمانی حاجی حەمەی حامد دەبێ.

- یەکەم (چرای لەمپا) لەئەسفەهانەوە،ئەکرەم حسێن ئەکرەم،هێناویەتی.
- یەکەم (چرای دیوارکۆی ئەمریکی)،حاجی جافری ئەکرەم و محەمەدی وەستا حەمەڕەحیم هێناویانە.
- یەکەم (لۆکس) حاجی قادری حەماییز،هێناویەتی.
- (تەسجیل)لەسەرەتای شەستەکانەوە(سەسید جافر و طاهری کاکەلە) کڕیویانە بۆ چایخانەکانیان.
- یەکەمجار (تەلەفزیۆن) عوسمانی صۆفی حەمەکەریم، لەساڵی (١٩٧٦) هێناویەتی بۆتەوێڵە.
- (سەتەلایت) لەساڵی (١٩٩٨)سامی سەیدجافر، کڕیویەتی بۆ چایخانەکەی.
- (تەماتە) بۆیەکەمجار لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، نەصرەدین – باوکی حەمەسەلیمەکوێر، کە سەربازبووە لەسوپای‌عوسمانی، لەوکاتەدا لەئەستەمبوڵەوە تۆوی تەماتە دەهێنێت بۆ تەوێڵەو دەیچێنێت و، پاشان زۆر دەبێت و بڵاودەبێتەوە.

---

## پەراوێزەکان

(١) بۆ ئەم بەشە سودێکی زۆر لەزانیاریەکانی بەڕێزکاك محەمەدسان ئەحمەد وەرگیراوە.

(٢) مەبەست ئەم ساڵی ٢٠٠٣.

(٣) دوکانەکەی حاجی مەلا عارف چەند دەستاو دەستێکی کردووە ئینجا بووە بەهی ئەو، هەروەها ئەوەی حاجی مەلا ئەحمەد پێشتر هی حاجی عەبدولمەجیدی مەلا حەمە حسێن بووە، بەڵام دوکانەکەی حاجی عەبدولڕەحمان هەر هی خۆی بووە.

(٤) ئەم کرێکار وکارمەندانە لەگەڵ ئەوانەی دەزگاکانی ئاو وکارەبادا،جارجارە لە سەردەمی شۆڕش دا تێکەڵاوی لەنێوانیاندا روویداوە.

(٥) سوودلەم بەڕێزانە وەرگیراوە:محەمەدسان ئەحمەد،مامۆستا حسێن محەمەد، مامۆستا عەلی قادر، مامۆستا مەحمود عەبدوڕەحیم.

(٦) لە ساڵی(١٩١٩) دا لە سەردەمی‌مێجەرسۆن یەکەم ئۆتۆمبێل دێتە سلێمانی ،هەروەها لەساڵی(١٩٢٢)دا حامدبەگ بۆ یەکەمجار،ئۆتۆبێل دێنێتە هەڵەبجە.

(٧) کتێبی شاری سلێمانی - ل (٥٠٥)

(٨) ئەو کاتە سەرۆکی شارەوانی تەوێڵە بووە.

# تەوێڵە لە ڕووی ئابووری و گوزەرانەوە

- ئابووری بەگشتی و ئابووری تەوێڵە بەتایبەتی

یەکەم: پیشە و پیشەسازی

- گرنگترین پیشە و پیشەسازیەکانی تەوێڵە

١- کلاش دروست کردن و چنین
٢- پێڵاو دروست کردن
٣- جۆلایی
٤- جاجمکردن
٥- هەلاجی
٦- ئاسنگەری و چەخماخ سازی
٧- دارتاشی
٨- وەستا دیواری - بەنایی -
٩- ڕستن و چنین
١٠- لێفە درووبی
١١- سەرتاشی و دەلاکی.
١٢- دروومانی - بەرگ درووریی.
١٣- شۆفێری
١٤- دەلاڵەکان
١٥- وێنەگری

دووەم: کشتوکاڵ و باخداری

- سەرەتا
- کشتوکاڵ لەتەوێڵەدا
- باخداری
- گرنگترین جۆری درەختی تەوێڵە
- سەرچاوەی ئاوی باخەکان
- گژوگیا و جۆرەکانی
- قەدەغە
- کێڵ - کەوێڵ -

سێهەم: ئاژەڵداری و ڕاوکردن

- ئاژەڵداری
- ڕاوکردن

چوارەم: بازرگانی و کاسپی کردن

١- کاروانچی‌یەکان
٢- وردە واڵە فرۆشەکان
٣- نانەوا خانەکان
٤- قەصابەکان
٥- جگەرخانە و کەبابخانەکان
٦- چێشتخانەکان
٧- ئاشەکان
٨- حەمامەکان
٩- نوتێلەکان
١٠- قەیسەریەکان
١١- چایخانەکان
١٢- خانەکان
١٣- دوکانەکان بەگشتی

پێنجەم: فەرمانبەری حکومی

# تەوێڵە لەڕووی ئابووری و گوزەرانەوە

## ئابووری بەگشتی و ئابووری تەوێڵە بەتایبەتی:

باری ئابووری لەگرنگترین کۆڵەکەکانی کۆمەڵگایە بۆ ژیان و پێش کەوتنی ... بەڵکو هەموو بارەکانی تری کۆمەڵ بەستراون بەژێر خانی کۆمەڵگاوە. ناوچەی هەورامانیش بەگشتی و تەوێڵەیش بەتایبەتی باری ئابووری کاریگەری خۆی هەبووە لەسەری

باری ئابووری تەوێڵە تایبەتمەندی خۆی هەیە بۆیە دەتوانین ئاماژە بەم خاڵانەی خوارەوە بکەین:

- باری ئابووری تەوێڵە نەبووەتە هۆی دروستکردنی دووچین لەناو کۆمەڵدا، بەو شێوەیە هەستی پێ ناکرێت کەلە تەوێڵەدا چینێك هەبێت بەناوی ئاغا و بەگ و شێخ لەئاستێکی بەرزدا بژێت و بەزوڵم و زۆر و ستەم گەیشتبنە ئەو ئاستە و لەخوارەوەش چینێکی‌تر بەناوی چینی هەژارو کرێکار و جوتیار و پرۆلیتار چەوسێنرا بنەوە و ستەمیان لێ کرابێت و ئێستایش نقەی بێت.
- باری ئابوری تەوێڵە لەسەریەك شت نەوەستاوە، واتە: تەنها لەسەر کشتوکاڵ و باخ و باخات، یا ئاژەڵداری، یا بازرگانی، یا پیشەسازی ... بەڵکو لەسەر هەموویان وەستاوە ئەمەش خاڵێکی ئیجابیە. چونکە:

ئەگەر کەسێك یەکێکیانی نەبووبێت و نەیتوانی بێت، ئەوا لەوی تردا خۆی ببینیوەتەوە توانیویەتی بژێوی خۆی دابین بکات - لادێ‌ی وا هەیە تەنها شوێنی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری‌یە ئەگەر کەسێك نەتوانێ یازەوقی لەوئیشە نەبێت ژیانی نارەحەت دەبێ چونکە ئیشی تری نیە هەروەها ئەگەر تەنها لەسەریەك شت وەستابێ وەك کشتوکاڵ خۆ ئەگەر لەوساڵەدا باران نەبوو یا تەرزە یا سەرما لێ‌ی بدات ئەوا ئەو ناوچەیە بەتەواوی زیانی لێ دەکەوێ و ژیانیان سەخت دەبێ ... جگە لەمەش ئەگەر باری ئابووری ناوچەیەك لەسەریەك شت بوەستێت لەوانەیە دەسەلاتداری وەخت، بتوانێت دەست بگرێت بەسەری‌دا و ئەوانی‌تر ناچار بکات چۆك دابدەن لەبەردەمی دا و ببنە کرێکار و جوتیاری چەوساوە و کۆیلە.

- زۆری مەعاش خۆ - لەچاو خۆی دا - و پیشەی دەستی لەتەوێڵەدا لەپاڵ ئیشی‌تردا، بوەتە هۆی ئەوە کە تەوێڵەیی بەهیچ شێوەیەك پەکی نەکەوێت ... هەربۆیە لەکاتی بێ‌بەرهەمی باخ و باخات یا ئاوارەیی ئەم چەند ساڵەی دوایی

١٩٨١ ـ ١٩٩١ دا تەوێڵەیی یەکی نەکەوتووەیا سواڵ بکات یاخود خیانەت بەرامبەر بەگەل و نیشتمان بکات بەرامبەر بەمادە.

دەکرێت بڵێین:

هەورامان گشتی و تەوێڵە بەتایبەتی توانیویەتی جۆرە خۆبژێویەک بۆ خۆی دابین بکات. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر هوشیاری و زیرەکی و لێهاتوویی خەڵکەکەی.

باری ئابوری تەوێڵە پێکهاتووە لەو شتانەی کە گوزەرانی ژیانی خەڵکی تەوێڵەی لەسەرەکە:

پیشەکان و باخداری و ئاژەڵداری و بازرگانی و فەرمانبەری دەگرێتەوە.

**یەکەم: پیشە و پیشەسازی**

بوونیپیشەسازی لەهەر ناوچەیەکدا نیشانەی پێشکەوتن و مەدەنیەتی ئەو ناوچەیەیە.

تەوێڵە بەشی خۆی پیشە و پیشەسازی تیادایە لەوانەیە لەچاو ناوچەکانی تری کوردستاندا پشکی شێری بەرکەوتبێ، چونکە کەم دەڤەر هەیە لە کوردستاندا ئاوەها پیشەی دەستی یەکانی تێدا بێت، بەو چاکی و جوانی‌یە ... هەر لەکلاش و شاڵ و چەقۆ و دارتاشی و چنین ...

شێخ یوسفی کوری شێخ عەبدول ڕەحمان کە لەنەوەی شاە نعمە تولڵای وەلیە دەڵێ:

(... وڵات کە کارو پیشەی تیانەبوو ئەبێ بەهۆی بێدەسەلاتی و سووکی خەڵکەکەی. پیشەی جل و بەرگ و، دروست کردنی کەل و پەلی جەنگ، بۆشانازی کردن و زاڵبوونە.. پیشەی جوتیاری بۆ مانەوەیە. پیشەی بازرگانی بۆ دەسەلاتداری‌یە.باخەوانی بۆ ژیانی خۆش و کامەرانی‌یە تێکگرای گەل پێویستیان بەم ئیشانە هەیە. بەر لەهەموو ئەمانە پێویستیان بەزانست و خوێندەورای یە، چونکە بەبێ زانست و خوێندەواری هیچ دەستگیر نابێ ...)[1]

لەتەوێڵەدا لەگەڵ ئەوەی کەمەڵبەندێکی زانست و خوێندەواریش بووە . بەشی خۆی ئەم پیشانەی بوون.

ئەدمۆنز دەڵێ: زوربەی خەڵکی تەوێڵە پیشەسازن، کارامەن لەپیشەی دەستی دا، سەرەڕای گرنگی دانیان بەباخداری. لەباسی گرنگی کلاشی تەوێڵەدا دەڵێ: لە کوردستاندا بەناوبانگە ... هەروەها لە باسی پیشەکانی تردا دەڵێ:

ئاسنگەر و دارتاش و پێلاّ و درووجۆلاّ و دوکاندار و بازرگانی زۆری تێدایە ... بەتایبەتی بازرگانی بنێشت و گوێز و توو[٢]

عەلی سەیدۆ گەورانی دەڵێ:

دانیشتوانی تەوێڵە لەدروست کردنی والاّ ـ چۆغە ـ بۆ جل و بەرگ زۆر کارامەن، زۆر وریان بۆ فێر بوونی شت[٣]

ـ شاکر فەتاح یش لەم بارەیەوە دەڵێ:

کلاّشی قۆندەرە ئاسا، پۆتینی دەزووی نایاب، چەقۆی یەجگار ناسك و جوان، داردەستی زۆر ڕەنگین کەوچك و شەکردانی چاك لە (تەوێڵە) دروست دەکرێت. خوا زیرەکی یەکی گەورەی پێ بەخشیون ...[٤]

پێشینانمان وا دەگێڕنەوە کە:

شێخ (عوسمان سراجەدین) ی یەکەم ڕۆڵێکی گەورەی بووە لە کۆکردنەوەی وەستای پیشەکاندا، کاتێك کەسەردانیان کردووە یا خۆیان ماونەتەوە بەبۆنەی شێخەوە یاخود هانی داون بۆمانەوە.

پیشەکان هەریەکەیان لەناوچەیەکی‌ترەوە هێنراون بۆ تەوێڵە ،بۆ نمونە: دارتا...شی ...زیاتر وەستا عەبدول ڕەحمان . باوکی وەستا عەبدواللە و عەبدوڕەحیم . لە دزاوەرەوە هاتوون.بازرگانی زیاتر تایفەی حاجی صادق لەخانەگاوە تایفەی علیان لە سلێمانیەوە هاتوون. دەلاکی و جەراحی تایفەی وەستا حەمە ئەمین لەپاوە وە هاتوون. سەید ئەحمەدی لە هەورامانی ئەو دیوە هاتوون تەوێڵەیش ڕۆیشتوون بۆ شوێنی تر،بەلاّم بەزۆری گەڕاونەتەوە ، وەك ئەم وەستایانە:

ـ وەستا ڕۆستەم حەکیم . کەچووە بۆ پێنجوێن لەوێ ئاسنگەری کردووە.

ـ وەستا وەسیم عوەض. کەچووە بۆناوچەی شلێرو سیاگوێز بۆ جۆلاّیی.

ـ وەستا مەحمود مستەفا ـ کە کلاّشکەر بووە چووە بۆ ناوچەی سرۆچك لەپەرخ و بیوەك دانیشتووە.

ـ وەستا ئەحمەد حەمە سەلیم کە چەند ساڵێك لەسێوسێنان مایەوە و ئاسنگەر بوو.

ـ وەستا عەلی کەبەفەقێ عەلی ناسراوە . جۆلاّ . بووە، هەر لەوێ مردووە ئێستاش خێزانەکەی (عالیە غەفور) لەدێی (تاتان) ە لەپێنجوێن.

ـ وەستا عەلی هەیبەکر لە دەوری پێنجوێن جۆلاّ بووە

- وەستا عەبدولعەزیز حەمە ڕەشید . جۆلاَبووە و چووە بۆ دارۆغان
- وەستا عەبدولکەریم رەحیم جۆلاَبووە و چووە بۆ سیامێوە
- وەستا عەبدوالڵەی صەلاحە جۆلاَبووە و چووە بۆ پێنجوێن
- وەستا عەبدولحەکیم محەمەد جۆلاَبووە و چووە بۆ بناوەسوتە.
- هەروەها زۆرێکی تریش.

بەرێز مامۆستا (عوسمان حەمە صاڵح هەورامی) دەڵێ:
(کاتێك کە (عومەر عەلی) پارێزگاری سلێمانی بوو لە سەردانێکی‌دا بۆ تەوێڵە دیبووی کە خەڵکەکەی هەریەکە بەرەنجی شانی خۆی دەژی و بە پیشەیەکەوە خەریکن وتبووی:

ئەم خەڵکە لەبەرئەوە هەریەکە بەپیشەیەکەوە خەریکن قەد پەکیان ناکەوێ و دەتوانن بەباشی گوزەران بکەن و کومسایی خۆیان بدەن و پێویستی یان بەکەس نیە.

بۆیە لەنیوەی پەنجاکاندا لەسلێمانی پیشانگایەکی ئیشی میللی کوردی کردەوە، گەورەترین بەشی تەرخان کرد بوو بۆ ئیشی میللی هەورامان). لە ساڵی (١٩٥٥) دا پیشەساز و وەستاکان لەتەوێڵە ژمارەیان بەم شێوەیەی خوارەوە بووە:

| پیشە | ژمارەی کەسەکان |
|---|---|
| دارتاشی و جۆرەکانی | ١٠ |
| جۆلاَیی و جۆرەکان | ٤٠ |
| بەرگدروویی و پیشەی پۆشاکی | ٦٠ |
| ئاسنگەری و پیشەی ئامێری | ٥٠ |
| گەیاندن (المواصلات) | ٥٠ |
| بازرگانی | ١٠٠ |
| پیشەی و پێلاَو | ٦٠ |
| پیشەکانی تر | ٢٠٠ |
| کۆی هەمووی | ٥٧٠ (٥) (٦) |

**لەگرنگترین پیشەسازیەکانی تەوێڵە:**

**١ ـ کڵاش دروست کردن و چنین:** (٧)

کڵاش ـ یەکێکە لەسەرچاوەکانی ئابوری خەڵکی تەوێڵە بەگشتی، بەڵکو باشترین پاڵپشتە بۆ شکست نەهێنانی ئابوری تاکەکەسی.

ـ یەکێکە لەو بەرهەمە سەرەکیانەی کەهێمای دەست ڕەنگینی کوردی پێوە دیارە لەهەموو جیهاندا.

ـ یەکێکیشە لەو فۆلکلۆرە نایابەی کورد کەماوە تەوە و بەردەوام و برەویشی زیاتر پێدەدرێت.

ئەو پێڵاوە ڕەسەنە کوردی یە یە کەلە دێر زەمانەوە لەناوچەی هەورامان بەتایبەت لە (تەوێڵە و نۆدشە و، ناو) دروست دەکرێت، لەهیچ شوێنێکی تر نەبینراوە بەو شێوە کڵاش دروست بکرێت و بەرهەم بهێنرێت واتە: باشترین و جوانترین کڵاش، کڵاشی تەوێڵەیە(٨) ئەم پیشەیەش لەهەموو پیشەکانی تر زیاتر هەیە. ئەمڕۆ خەریکە خەڵکانی دەورو بەری هەورامانیش فێری دەبن و سودی لێ وەردەگرن.

کڵاش لەسەرتاوە بۆ ئێستا گۆڕانکاری زۆری بەسەردا هاتووە، لە جۆری شێوە و، ڕەنگ و، جۆری دروست کردنی و، جوانی و، باشی و، جۆری چنین و، هەروەها هەندێ لەو کەل و پەلەی کەبەکاری دێنن.

کڵاش هەر لەسەرەتاوە بۆ کۆتایی و ئامادەکردنی بۆ بازاڕ بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت ئینجا دەخرێتە نا بازاڕەوە ...

**مێژووی دروستکردنی کڵاش:**

مێژووی دروستکردنی کڵاش بەتەواوی نازانرێت، بەڵام ئەوەی تا ئێستا دەستمان کەوتووە ئەوەیە کە:

جوتێک کڵاشی پیرشالیاری هەورامان هەیە کە تا ئێستاش لە خانووەکەیدایە لەشاری هەورامانی تەخت لە کوردستانی ئێران، کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ (٩٥٠) تا (١٠٠٠) هەزار ساڵ پێش ئێستا لەنزرگەکەی پیرشالیار خۆی دا، هەروەکو شاهدێکی مێژوویی ماوە.

دەنگ هەیە کە ئەم کڵاشە وەستای بەناوبانگی کڵاش، وەستا (قەلەندەر) ناوێك دروستی کردبێت.

دەڵێن:

کلاش چنین بۆیەکەمجار لەدێی (ناو) و (هەجیج) و (نۆدشەوە) چنراوە و دوایی هاتووە تە تەوێڵە. دەڵێن یەکەم کەس کلاش دروست کردنی هێنابێ بۆ تەوێڵە پیاوێك بووە ناوی (بابا خاڵە)[٩].

دەگێڕنەوە:

فەتەی شوکرە، وەستایەکی باش بووە لەدروست کردنی بنەو چنیندا،کاتی خۆی،ئەو جۆری چنینی تازە و جوانی داهێناوە.

**تایبەتمەندیەکانی کلاش:**

کلاش پێلاوێکی هاوینەیە و لەوشکانیدا لەپێدەکرێت و فێنکی خۆشی یەك دەدات بە لەش بەتایبەت (پێ).لەتایبەتمەندییەکانیشی:

- بۆ جوانی.
- بۆ گورج و گۆلی.
- بۆ پاك و خاوێنی.
- بۆ نەهێشتنی بۆنی پێ چاکترین پێلاوە.
- بۆ ڕاکردن، باشترین پێلاوە.
- بۆ ڕۆیشتن کەماندوو نەبیت.
- بۆ ئەم نەخۆشی یانەش باشە:
- بۆ هەندێ لەنەخۆشی چاو.
- بۆ (فطر یات) ی کەرووی پێ.
- بۆ مێخەکەی بنی پێ.
- بۆ هەناسە توندی و تەنگە نەفەسی.
- بۆ نەخۆشی فە قەڕات لەبەرتەختی بنەکەی.

**کەرەسەکانی کلاش:**

ئەو شتانەی کلاشیان لێ دروست دەکرێت ئەمانەن:

- پێکەنە - تیرە (دواڵ) - پاژنە ولوتی کلاش (پاش و پێشی کلاش) - پەرگەما - بزمار - کەتیرە.

ئەو ئامێرانەی کەبەکار دێن بۆ دروست کردنی کلاش ئەمانەن:

- کۆتە- دەقاق - مشتە - لاکێش - قەد گیر- دواڵکێش - گازن - پەڕۆیی دواڵکێش - درۆش - بەردە هەسان - کلۆ درۆش - قالب و پشت قالب - چەقۆ - پلابیس - دواڵگیر - بەزو بەزدان - چر مرزە.

**ئامێرەکانی کلاش چنین.**

ئەو ئامێرانەی کە بۆ کلاش چنین بەکاردێن ئەمانەی خوارەوەن:

- دەزوو - تەبەنە - پەرگەماڵ.

**جۆرەکانی کلاش:**

بەگشتی کلاش دوو جۆرە:

- کلاشی پەرۆ - کەژێرەکەی پەرۆیە
- کلاشی قەڵتاخ - کە ژێرەکەی چەرم و لاستیکە وەك قۆنەرە و پێڵاوی تر.

باشترین کلاش:

**باشترین کلاش ئەوەیە کە ئەم سیفاتانەی تیابێت:**

١ - پەرۆکەی خامی تازە بێت.

٢ - ڕەنگەکەی - هەرچەندە بەئارەزوو حەزە - بەلام جوانترین ڕەنگی کلاش ئەوەیە: کە سەرەکەی بەدەزوویەکی سپی چنرا بێت و ژێرەکەشی پەرۆی سپی و شینی بۆبەکار هاتبیٚ.

٣ - وەستای چاك پێکەنەکەی گرتبێت و ئەندازە کەی ڕێك و پێك بێت.

٤ . وەستای کلاشەکە، جوان و ڕەق کلاشەکەی دروست کردبێت و کەتیرە و بزماری وەك پێویست لێدابێت و مشتەکۆی چاکی کردبێت و تیرەکەی مەحکەم کردبێت.

٥ - پەرگەماکەی جوان و باش نرا بێت لەمووی چاك.

٦ - وەستای چاك چنیبێتی.

- لەچنینەکەیدا - دەزووی چاك و سپی بۆ بەکار هاتبێت.
- بن پەرگەکەی پڕو جوان بێت.
- دەورەکەی تەقەڵەکانی نە زۆر پڕو نەزۆر شاش بن بەپێی پێویست.
- چینەکەی ڕەق بێت.
- سارا چنەکەی ورد و ڕەق و، دۆڵ نەبێت.
- دەمگەڕەکانی سفت و گرژ و چڕبن.
- شیرازەکەی پڕ و جوان و پەرگەماکەی دەرنەکەوێت.

**بەناوبانگرتین وەستای کلاش دروستکردن:**

١ - وەستا عوێدەی حەمە لەطیف: زۆر جار کلاشی شەش تیرەی دروست کردوە بۆ ماوەی چوار تا پێنج ساڵ بەرگەی گرتووە.

٢ـ فەتەی شوکرە: وەستای بنە و چنینن بووە، چینی تازە و جوانیدا هێناوە، شیرازەی ناوە وەشی چنیووە.

٣ ـ حاجی محەمەدی حەمالە: وەستای کلاش و کەوشیش بووە.

٤ ـ مارفەی فەتحوڵڵا: ئەمیش وەستای کلاش و کەوش بووە، خۆیشی چەرمی کەوشەکانی دروست کردوە.

٥ ــ وەستا قادری سەید ئەحمەد: وەستایەکی بەناوبانگ بووە، توانیویەتی (دە) تا (پانزە) جووت لەرۆژێکدا دروست بکات، هیچ وەستایەك وەك ئەم وەستایە نەوەکانی شوێن کەوتووی نەبوون، کە زۆربەیان ئێستا خەریکی کلاشن.

ئەم وەستایە شەش کوڕی بووە، چواریان بەردەوام ئەم ئیشەیان کردوە کە ئەمانەن:

أ ـ وەستا محەمەدی وەستا قادر ـ ناوداری سەردەمی خۆی بووە، لە دوای خۆی چوار کوری بووە کە جگە لە حاجی عابد کە قەصابی کردوە، سیانەکەی تری ئەم ئیشەیان کردوە کە ئەمانەن:

وەستا صابری وەستا ئەحمەد

ــ حاجی ئەحمەد، کەوەستایەی چاك بووە، لە سلێمانی کۆچی دوایی کردوە. کورەکانی ئەمیش مەهدی و صدیق و سەعدی و سابق و عادل و نامق و صابر و عەدنان جگە لە ناجح هەموویان لەسلێمانی خەریکی ئەم پیشەیەن و دوکانیان هەیە لە گەرەکی صابونکەران کلاشکەری باشن و ناودارن.

ـ حاجی مەحمود، ئێستا لەسلێمانیە و یەکێك لە کوڕەکانی (وەصفی) لەسلێمانیە و دوکانی هەیە، خەریکی ئەم پیشەیەیە.

ــ حاجی مەجید و کورەکانی (فائق و فاروق و ئارام) هەموویان لە سلێمانین و وەستای چاك و باشن.

ب ــ وەستا حەمە صاڵح وەستا قادر. خۆی وەستایەکی باش بووە، لەدوای خۆیشی دوو کوڕی بووە، بەڵام تەنها وەستا محەمەد ئیشی کردوە کەوەستایەکی زیرەك و خوێندەوارێکی و ریایە، ئێستا پیربووە و توانای ئیشی نەماوە، کورەزایەکی لەسلێمانیە ئەم ئیشە دەکات بەناوی (مەریوان عەبدول واحد).

ج ـ وەستا عەلی وەستا قادر وەستایەکی ناودار بووە، لەدوای خۆی هەردوو کورەکەی ئەم ئیشەیان کردووە:

ـ وەستا حاجی حەمە ڕەحیم کە ئەمیش هەردوو کوری (مەحیەدین و فەخرەدین) لەسلێمانین ئەم ئیشە دەکەن.

ـ وەستا ڕەشید کەلەتەوێڵەیە و، لەگەڵ هەردوو کورەکەی دا (فاروق) و (فەریق)خەریکی ئەم پیشەیەن.

ـ وەستا صادق وەستا قادر.

ئەمیش چوار کوری بووە، تەنها وەستا وەهاب ئەم ئیشەی کردوە ئێستاش دوای ئەوەی لوغم لێ‌ی‌دا پەکی کەوتووە لەماڵەوەیە.

عەبدوڕەحمانی کوریشی (مام ئەولە) کەرەسەی کلاش دەکڕێت و دەفرۆشێت، بەڵام کورەکانی ئەم (شاهۆ و یاسین) ئەم ئیشە دەکەن.

٦ ـ وەستا سلێمان نادر کوزاد. وەستایەکی باش و دەست ڕەنگین بووە، هونەریانە کلاشی دروست کردوە.

٧ـ وەستا حاجی ئەبوبەکر عەلی (١٩١٤ ـ ١٩٨٢) وەستایەکی لێهاتوو بووە، لەسەردەمی خۆی‌دا، یەکێك بووە لەو وەستایانەی کەپێشکەوتنی داوە بەکلاش، وەك ئەوەی پاش و پێشی کلاش لەچەك دروستکراوە، ئەو گۆڕیویەتی بەکێرەگا. کلاشی ئەبوبەکری بەناوی ئەمەوە ناونراون.

حاجی ئەبوبەکری کلاشکەر

کوڕەکانیشی (ئەنورە و فەیرۆز) خەریکی ئەم ئیشەن.

٨ ـ وەستا قادر غەفور: لەدوای خۆی عابدی کوری کەلە بەغدایە خەریکی ئەم کارەیە.

٩ ـ حسێن لاوە ـ مردووە.

١٠ ـ عارف ڕەسوڵ ـ مردووە.

١١ـ ڕەسوڵ جوانە ـ مردووە.

١٢ ـ حاجی حەمە زەریف، لەدوای خۆی هەرچوار کورەکەی خەریکی ئەم پیشەیە بوون ئێستایش دوانیان (ئەحمەد و موسا) لەهەڵەبجەن ئەم کارە دەکەن.

١٣ ـ وەستا خواکەرەم حەمە سەعید: مردوە، لە دوای خۆیشی یەکێك لە کورەکانی (بارام) کەلە هەڵەبجەیە ئەم ئیشە دەکات.

١٤ ـ حاجی حەمە عەزیز محەمەد.لەتەوێڵەیە ماوەیەکەناتوانێ ئەم ئیشە بکات، بەڵام محەمەدی کوڕی و کورەزاکانی ئەم کارەدەکەن

١٥ ـ بابا و ئەیوبی برای، کوڕانی حەمە حەسەن خاتونە لەهەڵەبجەن.

١٦ ـ جەلال مستەفا لەسلێمانیە.

١٧ ـ هیوا حەمەکەریم لەهەڵەبجەیە.

١٨ ـ حەمزە حەمە عارف موئمن لەهەڵەبجەیە.

١٩ ـ عیزەدین و نەجمەدین کورانی فارس فەرەج لەسلێمانین.

٢٠ ـ عەبدولرەزاق حەمە کەریم لەسلێمانیە[١٠].

**پێکەنە گێرەکان:**

ـ حاجی ئامانەڵڵا بابا ئێستاش حەمە رەئوفی کوری خەریکی ئەم پیشەیە لەتەوێڵەیە.

ـ حاجی بابا حاجی محەمەد ـ مردووە.

ـ حاجی ئەحمەد حاجی محەمەد ـ مردووە.

ـ عەبدولاّی حاجی مارف ـ مردووە.

ـ حەمە عارف موئمن ـ ئێستا موئمنی کوری لەهەڵەبجە ئەم ئیشە دەکات

ـ حەبیب محەمەد حەبیب عوسمانی کوری لەتەوێڵەیە ئەم ئیشە دەکات

ـ صابر خاڵە عەبدوالله ـ مردووە.

ـ مەحمود عەلی محەمەد ـ مردووە.

ـ عابد موئمن لەهەڵەبجەی تازەیە.

ـ عەبدولڕەحیم حەمە رەشید و صابری برای لەتەوێڵەن.

ـ عەبدوالله حەمە یوسف،لەسلێمانییە.

ـ فارس فەرەج یەعقوب، لە سلێمانیە و بەردەوامە لەسەر ئەم کارە.

ـ هەروەها چەندانەیەکیتر بوون و هەن ....

**کلاّش چنە ناودارەکاناودارەکانی ئەسا:**

ـ کاکە سور زۆراب ـ عەبدولکەریم زۆراب ـ فەرەجوڵلاّی حەمل ـ تەلعەت خواجە ئەحمەد (خوشکی حاجی جەزا) ـ عاصمە حاجی حەمە رەحیم ـ محەمەد حاجی حەمە رەحیم ـ مەلا کامیل مەلا عەبدولقاردر ـ کەریم خواجە ئەحمەد ـ

حەمە یوسف نادر ـ ئەڵلاك شاوەیس ـ مەلا جەمال مەلا ئەحمەد ـ مەلا ئیسماعیل مەلا عەبدوالله ـ عەزیز فەتاح.....

**ئەمانەش لەم سەردەمەدا کلاش چنی چاکن:**

ـ صابر وەهاب ـ هادی حاجی حسێن ـ بابا ناجی ـ ئادەم کەریم ـ فەیصەڵ جەمە سەعید ـ عەبدوالله ئەڵلاك ـ نەصرەدین ئەڵلاك

ـ مەحیەدین ئەڵلاك ـ عیزەت ڕۆستەم ـ جەلال ڕۆستەم ـ مەلا عەبدولباقی مەلا محەمەد ـ جەبار مەلائیسماعیل ـ حەمەعارف مەحمود حەمەیوسف ـ هادی مەلا ئیسماعیل ـ ئەیوب مەلا حەمەئەمین عەبدوالله ـ مەجید فەتاح ـ عومەر فەتاح ـ داود حاج عەبدولڕەحمان

ـ حەبیبە وەستا محەمەد، ژنی کاکەی میرزا عەبدولقادر ـ فاطمە حبیب، ژنی ڕەحمانی سەعید ـ زۆرێکی تریش..

**کلاش کڕ و کلاش فرۆشەکانی تەوێڵە:**

ئەو تەوێڵەییانەی کە بەزۆری خەریکی کلاش کرین بوون لەوەستاکان و کۆیان دەکردەوە و دەیان هێنان بۆ سلێمانی بۆ فرۆشتن ئەمانە بوون:

ـ حاجی حەمەی حاجیلە ـ فەتەی ڕەحلە ـ عەلی نەجیبە فەندی ـ مستەفای عوەز ـ حاجی شەفیع عەلی محەمەد ئێستاش کورێکی (داود)، خەریکی ئەم کارەیە ـ حاجی ئەورەحمانی حاجی محەمەد ـ حاجی عەبدوالڵەی ئوسمانە، ئێستا کورەکانی (بورهان و عوسمان و رافع) ئەم کارە دەکەن لەسلێمانی ـ(حاجی حەمەشەریف حاجی قادر ـ فەتحوڵڵا مستەفا ـ نەجیب ئۆڵقادر ـ طالب محمود

ـ حەمە ڕەشید عابد . ئەمانەئێستا لەسلێمانی ئەم کارەدەکەن) ،هەروەها زۆر کەسیتر لەتەوێڵە و هەڵەبجە و لەسلیمانیخەریکی کڕین و فرۆشتنی ئەم کارەن.

ئەو دوکاندارانەش کەلە سلێمانی کلاشی تەوێڵەیان دەکڕی و دەفرۆشت، زۆرجار خۆیان دەهاتن راستەوخۆ لەتەوێڵە دەیانکڕین . ئەمانەی خوارەوە بوون:

ـ حەمە رەشید ئایشێ، کە دوکانی لەناو بازاڕدابوو بەرامبەر کەبابخانەی حەمە ئەمین قجول.

ـ حەمەی گوڵێ، دوکانەکەی لە حەوزە ووشکە بوو.

ـ حەمە صالح بۆ سکانی، دوکانەکەی سەروی حەوزەکەی ناوبازارە، بەرامبەر قەیسەری نەقیب

- مەلاحەمە ئەمین بانەیی، لەکۆڵانی مەزاد خانەکە دوکانی هەبوو.
- عارفە سوور، لە نزیك مەزاد خانەکەبوو.
- عەبدواللە حاجی مەحیەدینی لەیلیٚ لەبەرامبەرحەوزەکەی ناوبازاڕ بوو.
- صالح میسری لەخوار حەوزەکەی ناو بازاڕەوەبوو.
- هەندێکیتر[11] ...

**نرخی کلاش:**

نرخی کلاش لەساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر جیاوازی هەیە:

جوتیٚ کلاش لەساڵانی سیەکاندا (١٠٠ . ١٥٠) فلس

لەپەنجاکاندا (١ ـ ٢) دینار بووە.

لەحەفتاکاندا (٥ . ١٠) دینار بووە.

لەهەشتاکاندا (١٥ ـ ٢٠) دینار بووە.

لەساڵی نەوەد (٦٠ ـ ٩٠) دینار بووە.

لەساڵی ١٩٩٥ (٥٠٠ . ٨٠٠) دینار بووە.

لەساڵی ٢٠٠٠ (٢٥٠ ـ ٤٠٠) دینار بووە.

**٢ـ پێلاو دروستکردن:**

وەك وتمان کلاش لەوشکانی دا لەپیٚ دەکرێت، ئیتر خەڵکی تەوێڵە وەنەبیٚ دەستیان نەبوو بیٚ لەپێلاو دروست کردندا بۆ زستانە.

لە تەوێڵە پیشەی پێلاو دروون گرنگیەکی خۆی هەبووە، شان بەشانی کلاش بووە، تەنها ئەوەندە هەیە، کلاش لەم سەردەمەی دواییدا هەرمایەوە و برەوی پیٚدرا، بەلام پێلاو دروست کردن وازی لیٚهێنرا بەبۆنەی بەدیلیەوە بووکە (قۆندەرەیە).

تەوێڵەیی توانیویانە پێداویستی خۆیان لەپێلاوی زستانەدا دابین بکەن، ئەویش بەدوست کردنی پێلاوی هەمە جۆر و چاك.

پێلاو چەند جۆرێك بوون، بەلام بەگشتی دوو جۆر بوون:

پێلاوی پیاوانە و پێلاوی ژنانە.

پێلاوی پیاوانەش سیٚ جۆر بوون:

یەمەنی، زەهاوی، یەك پارچەیی[12].

ژنانەیش دوو جۆر بوون:

کرمکەدار، قولاخدار

ژنانە سوربوون و پیاوانەش ڕەش بوون.

گەنج و منالانیش ڕەش و سوریان لەپێ کردووە.

ئەم جۆرە پێڵاوانەش تا ساڵەکانی ١٩٧٠ هەبوون و بەکار دەهاتن و دروست دەکران بەتایبەت پیاوە پیرەکان لەپێیان دەکردن.

لەوەستاناودارەکان کە پێڵاو دروست کردووە:

- حاجی حەمە صاڵح و محەمەدی برای - عەلی قادر - صادق قادر- حاجی محەمەدی حەماله - مارفی فەتحوڵڵا - عەزەی مارفه - حەمە شەریف هەجیجی - حاجی عەلی حسێن - حاجی عوسمان و خەلیفە عومەر و عەبوله و حاجی جافر (کە برابوون).

- محەمەدی ڕۆستەم - حاجی ئامانەڵڵا بابالە - ئەولعەزیزعەلی کە تاساڵەکانی حەفتاکانیش بەردەوام بوو.......... هتد ... [١٣]

**تێبینی:** لەم سەردەمانەی دواییدا کە پێڵا و دوورین نەماوە، بەڵام قۆندرە و قەڵتاخ دروست کردن هەبوو، کە ئەم دوو وەستایە بەناو بانگن لەم بوارەدا:

- کەریم حەمە گاوان - مردووە.

- حاجی حەیبەڵڵا کەوەستایەکی باشە و لەسلێمانیە و بەردەوامە لەسەر ئەم کارە.

**٣- جۆلایی:**

جۆلا: هەموو ئەو وەستایانە دەگرێتەوە کەشاڵ (ڕانگ و چۆغە) و بەرماڵ و پۆپەشمین و جاجم و مەوج و گلێم دروست دەکەن.

تەوێڵە، جۆلای زۆر بووە، تەنانەت چوون بۆ شوێنانی تری کوردستان.

لەگرنگترین جۆلا ناودارەکانی ئەوسا ئەمانە بوون:

- حەمە لەتیف تەیفور- مستەفا (باوکی صۆفی وەهاب) و، صۆفی وەهاب خۆیشی وەستایەکی چاك بووە - فەجەی حەمە ئەمین

- عەبدوڵلەی ئەحمەد (باوکی مراد) - حەکیم مەولود (باوکی عەبدول) - کەرەم محەمەد - حاجی حەمە یوسف بابا- حەمەی بابا

- وەهاب عەلی محەمەد.

**لەجۆلا ناودارەکانی ئێستایش ئەمانەن:**

- حاجی وەسیم و (ئادەم و سامی) کوری لەسلێمانین - حسێن فەرەج لە سلێمانیە - فەریح ئیسماعیل حسێن لە هەڵەبجەی شەهیدە - فاتح و کەرەمی برای یەکەمیان لە هەڵەبجەی تازەیە و دووەم لەتەوێڵە - عەبدوڵلە ی صۆفی وەهاب.

چەند خاڵێك لەسەر ئەم ئیشە:

ـ جۆلاکان لەم دوایی یەدا زیاتر شاڵ دروست دەکەن چونکە لە شتەکانی‌تر زیاتر برەوی هەیە و ئەوانی تر کەم تر بەکار دەهێنرێن بۆ نموونە:

ئەوسا ـ گلێم ـ زۆر تر بەکار دەهات کە ژنان شتیان تێ دەکرد و دەیاندابە کۆڵیان دا کە بۆ ناوباخەکان دەرۆیشتن هەروەها بۆشتی‌تر بەکاریان دەهێنا.

ئێستا ئەمە نەماوە لەبەر ئەوە خەڵك پێویستیان پێ نیە، هەر لەبەر ئەمە لە دواتر دا تەنها باسی شاڵ دەکەین.

ـ بەرهەمی جۆلایی تەوێڵە هێنراوە بۆ سلێمانی و دەوروبەری، بۆیە مەرەز و خوری تەوێڵە و هەورامان، بەشی نەکردووە و تەوێڵەیی چوون بۆ هەمەدان و موصڵ و گەرمیان و شارەزوور بۆهێنانی وە چەند کەسانێك خەریکی کاسپی ئەمەبوون و بەمەوە خەریك بوون لەوانە:

ـ حەمە صاڵح عەبدولحەکیم کە چونکە هەر خەریکی ئەمە بوو ناویان نابوو (خوری) ـ عەبالەی حەمە ڕەشید ـ مستەفا موئمن (باوکی ئیدریس و یونس).

٤ـ (جاجمکردن):

جاجم: ژنان خوری دەرێسن و گلۆلەی دەکەن و بەحەوت جۆر ڕەنگی دەکەن، لەدواییدا شوێنێکی تەخت، مێخی بۆدادەکوتن و دەیچنن و بەئەندازەی (٢٥ سم) پاشان بەئەندازەی درێژی لێف دەیدرون بەیەکەوە، شێوەیەکی چوار گۆشەی وەردەگرت و بۆ دیوی دەرەوەی لێف بەکاری دەهێنن، جوان و گەرم و مەحکەمیشە، دیوی ناوەوەیشی بەزۆری خامی سوری بۆ بەکار دەهێنن، ناوەکەیشی خوری تێدەکەن.

**لەجاجم کەرەکان:**

- مینا عەبدوڵڵە، ژنی حاجی ئەبوبەکری حاجی حەسەن
- پەیرزاد عەبدوڵڵە، ژنی عەلی سێلە.
- مریەم مەلا ڕەشید، ژنی حەمە عەزیز گۆپە.
- مەحبوب ئایزە غەفورە، ژنی صادق.
- شیرین حەمل، ژنی تۆفیق شەریف.
- سوەیبە ئەحمەد وەهاب، ژنی کەرەم جۆلا.
- فەرخی شەریف، ژنی ئەحمەد وەهاب.

**شاڵ**[14].

لەگرنگترین بەرهەمەکانی جۆلاّ ـ شاڵە ـ زوربەی ئەوانەی کەشاڵ دروست دەکەن، ساڵی سەرهەڵدانی ئەم پیشەیەدەگەڕێننەوەبۆ

ساڵی (٧٢٨) زاینی و دەڵێن: یەکەم کەس کەلەو ساڵەدا ئەم پیشە دەست کردەی دەست پێکردووە ناوی (عەباسی کەیومەرث) بووە و ئەم وەستایە لەدێ(ناو) ی سەر بە ناوچەی هەورامان ئێران دانیشتووە، پاشان بەرە بەرە پەرەی سەندووە ئێستایش بەدەست کردێکی بەنرخ و جوان و گرانبەها دادەنرێت.

چۆنیەتی دروست کردنی:

١ ـ موی بزن دەبڕێتەوە ئینجا ئافرەتان ئەم مووە بەهۆی (تەشی) یەوە دەڕێسن و دەیکەن بە (بەن = ڕێس).

٢ ـ ئەم بەنە ڕایەڵ دەکرێت واتە پێوانەی تایبەت بەمرۆڤێك وەردەگرن) ئەمەیش دەبرێتە لای جۆلاّ، جۆلاّش بەنەکە دەتەنێ و دەیکات بەجۆرێك لە قوماش.

٣ ـ قوماشەکە بەئاو جوان دەشۆردرێت و دەقی دەکەن،واتە: کۆت دەدرێت ئەویش بەشێوەی دوو دەق یا سێ یا چوار دەق دەبێت.

٤ ـ ئەم کۆت دانە لەسەر تەختەیەکی بچوك کە(١٥ ـ ٢٠) سم درێژە و (٥ ـ ١٠) سم پانە و لەدار گوێز دروست کراوە هەڵ دەپێچرێت.

لەپاش ئەمە بۆ ماوەی (٤٥) خولەك دەخرێتە ناومەنجەڵی تایبەتی و دەیکوڵێنن، بۆیە ئەم تەختەیە لەدار گوێز دروست دەکرێت چونکە بەرگەی (کولاّن) دەگرێت.

٥ ـ دوای ئەوە دەخرێتە بەرهەوا، تاوشك بێتەوە، ئیتر ئامادەی دوورین دەبێت.

**جۆرەکانی شاڵ:**

یەکەم: ئەوانەی لەمەرەزی سروشتی ـ واتە لەموی بزن ـ دروست دەکرێن:

ـ خورمایی (کاڵ یا تۆخ).

ـ ڕەش.

ـ سپی.

ـ شینکی یا خۆڵەمێشی.

ـ زەردێکی (کاڵ یا مەیلەوخاکی).

دووەم: ئەوانەی لە خوری مەڕ دروست دەکرێن:
- ئەوانەی بەتوێکڵە گوێز ڕەنگ دەکرێن، ئیتر یا قاوەیی یازەردێکی کاڵ دەردەچێت.
- ئەوانەی بەرەنگ و گیا ڕەنگ دەکرێن، ئیتر یا سەوزێکی کاڵ یا سور یارەش دەردەچێت.
- خوری رەش و سپی بەهۆی (شەی، شانەی) تایبەتی تێکەڵ دەکرێت و ڕەنگی خۆڵەمێشی دەردەچێت.

ئەو ئامێرانەی لەدروست کردنی شاڵدا بەکاردێن:
- برینك - وەکو مەقەست وایە بۆ بڕینەوەی برینەکە بەکاردێت.
- شەی - جۆرەیشانەیەکە - پارچە تەختەیەکە لەدارگوێز دروست کراوە، چەند تەلێکی بەشێوەی ستونی کەنزیکەی (٧٠ - ٨٠) تەل دەبن و بەهۆی چەرمەوە لەژێرەوە ڕاگیرکراوە، بۆ ئەوەی تەلەکە لەیەکتر نەترازێن و بەتوندی بمێنێتەوە بۆ تێکەڵاو کردنی خوی یا مەرەز بەرکادێت بۆ نموونە:
مەرەزی ڕەش لەگەڵ سپی تێکەڵ دەکەن و ڕەنگی شینکی لێ‌دەردەچێت.
یا سورێکی تۆخ و زەرد و تێکەڵ دەکرێت سورێکی کاڵ یا خورمایی لێ دەردەچێت.
- تەشی: بۆڕێسانی خوری یا مەرەز بەکاردێت.
- دوك یا خەڕەك: بەنەکە هەڵ دەکاتەوە لە داری گوێز و بەن و چەرم و تەل دروست دەکرێت.
- لولەك: برتییە لەپارچە قامیشێك کەبەنەکەی لەسەر هەڵ دەکرێت.
- مەکۆ: برتیە لەپارچە دارێك کەلەدار گوێز یا قەزوان دروست دەکرێت و لەشێوەی بەلەم دایە و لوولەکەکە دەخرێتە ناو مەکۆکە و بە پارچە تەلێك ڕاگیر دەکرێت و کاری تەنینی مەرەز یا خوری ئەنجام دەدات.
- دانە یا شانە لەقامیش و دەزوو دروست دەکرێت دەکەیت و ئیشی تەنین دەبینێت.
- دەفە: لەدار گوێز یا دار قەزوان دروست دەکرێت و بۆ چنینی مەرەزەکە بەکاردێت.
- پاتەتە: لەپارچە تەختەیەك دروست دەکرێت و ئیشی بەرزی و نزمی تەنین دەکات.

**٥ـ هەلاجی:**

هەلاجی ئەوەیە کەبەرگن (جۆرەمووییەکە) دەهێنرێت پاش ئەوەی بڵاودەکرێتەوە و ئاو دەوەشێنرێت و باش دەکوترێتەوە و دەیساون، لەئەنجامدا دەیکەنە (کوڵە باڵ ـ فەرەنجی) یا (کەرەك) و (لباد ـ نمەد) و (پەستەك).

هەلاج جگە لەمانە لۆکە و خوری ناو دۆشەك و پشتی و لێفە، بەئامێری تایبەتی خۆی دەکاتەوە.

لەهەلاجەکان: ـ غەفور خەسرەو . باوکی کاکلە ـ فەرەجو ڵلاً خالید ـ فەجە خاڵە ـ فەتحوڵلاً مەحیەدین محەمەد، فەتەلە دینە ـ حەمە خان وەیس ـ حەمە صاڵح حەمە سەعید ـ حاجی یوسف حەمە سەعید ـ حەمە ئەمین حەمە سەعید ـ حەمە حسێن حەمە سەعید ـ ئیمام حەمە سوور ـ عەبدولحامید حسێن ـ هەروەها گەلێکی‌تر.

**٦ـ ئاسنگەری و چەخماخسازی:**

ئاسنگەری: مەبەست لەو ئیشانەیە کە بەئاسن و تەنەکە دروست دەکرێن وەك: (چەقۆ، قەڵەمبڕ، تەور، تەورداس، زەنگن، خاکەناز، نوێڵ، پیك، پەنجەرە، دەرگا، قفڵ، کلیل، زۆپا، بۆریە زۆپا، مەقاش، کۆمانج، ناڵ، تفەنگ ...)

ئەمانە هەموو لەتەوێڵە دروست کراون و، داهاتێکی گرنگیش بوون لەتەوێڵە دا، چونکە کۆمەڵێکی زۆر لەخەڵکی تەوێڵە لەسەر ئەم ئیشە ژیاون ئێستایش هەندێك خەریکی ئەم ئیشەن و، توانیویانە پێداویستی خۆیان دابین بکەن و، بەرهەمیشی بنێرنە دەرەوە.

بەناوبانگترین ئاسنگەر و چەخماخسازەکانی تەوێڵە ئەمانەن:

١ ـ عەبدولمەجید کە چوار کوڕی بووە:

اـ حاجی محەمەد: وەستایەکی باش بووە و منداڵەکانی خۆی فێرکردووە کە ئەمانە بوون: عەبدوالله کە بەعەبولە ناسراوە ئێستا عەبدولی کوری لەسلێمانیە، لە کارێزە وشك دوکانی هەیە و چەقۆ دروست دەکات.

ـ جەعفەر لە چەقۆ دروستکردندا شارەزایی باسی هەبووە.

ـ عەبدوڕەحمان لەم دواییەدا وازی لە ئاسنگەری هێنا و کاسپی دەکرد لە ٨/٦/ ١٩٩٢ لەسلێمانی کۆچی دوایی کرد.

ـ محەمەد (بەحەمە رەق ناسراوە) وەستای چەقۆ بوو، ئێستایش لە کورەکانی عەباس ئەم ئیشە دەکات و لەسلێمانیە.

ـ عابد ئێستا کاسپی تر دەکات.

- سەعید لەکارێزە وشکە لەسلێمانی چەقۆ دروست دەکات.
- داود لەهەڵەبجەی تازەیە چەقۆ دروست دەکات.
- ناصر وازی هێناوە لەم ئیشە و چایخانەی هەیە.
- حەمە ڕەئووف عزیز کە کچەزای حاجی محەمەدە ئێستا لەتەوێڵە چەقۆ دروست دەکات.

ب ـ عەبدولکەریم: زیاتر کەوچك و مەقاش و چەقۆی دروست کردوە، لە کوڕەکانی تەنها حەمە غەریب ئەم ئیشە دەکات ئێستا لەسلێمانیە و ئاسنگەری دەکات.

ج ـ عەبدولحەمید: وەستای چەقۆ بووە ئێستا خالدی کوری ماوە و لەگەڵ بەختیاری کوریدا ئەم ئیشە دەکەن لەهەڵەبجەی شەهید.

د ـ عەبدولخالق: کە چەقۆ دروستکەرێکی زۆر چاکبووە ئێستاش یونسی کوری لەسلێمانیە و لەنزیك مزگەوتی خانەقا دوکانی هەیە، جوانترین و چاکترین چەقۆ دروست دەکات.

وەستا رۆستەمی ئاسنگەرو حاجی عەبدورەحمان حاجی محەممەدو کاروان و ئەمیری کوری ... ۱۹۸۳

٢ ـ حەکیم خەسرەو:

وەستایەکی چاك بووە لە دوای خۆی هەردوو کوری ئاسنگەر بوون: ڕۆستەم لەهەڵەبجە لە ١٩٨٧/٨/١٦ کۆچی دوایی کرد، حەمە سەعیدی کوریشی ئاسنگەر بووە هەردوکیان تالە ژیاندا بوون هەر ئەم ئیشەیان دەکرد.

ـ صادق: لەکۆتایی حەفتاکاندا مردووە ئادەمی کوریشی ئەم ئیشە دەکات لەتەوێڵەیە.

٣ ـ نادر: کە وەستا یەکی ناوداربووە، کە دوو کوری بووە لەم ئیشەدا کارامە بوون:

ـ حەمە ڕەحیم: شتی نایابی دروست کردووە، لەدوای خۆی محەمەدی کوری ئاسنگەرێکی چاك بووە بەتایبەت لە چەقۆ و قفڵ و کلیل و تەور دروست کردندا لە ٢٣ /١٩٩٩/١ لەسلێمانی کۆچی دوایی کرد. لەدوای ئەمیش تەنها (فەخرە دین) ی کوری خەریکی ئەم ئیشەیە کە لەهەڵەبجەی شەهیدە.

ـ حەمە کەریم: لەپاش خۆی عوسمانی کوری ئەم ئیشەی دەکرد بە ئیشی تەنەکە وە خەریك بوو لەدوای ئەمیش صابری کوری ئەم پیشەیەی دەکرد کە هاتە هەڵەبجە دەرگاو پەنجەرەی دروست دەکرد بەداخەوە لەشەری کوەیت ـ عێراقدا بەدیلگیراو لەئەنجامدا گەیشتە هۆڵەندا لەساڵی ١٩٩٩ کۆچیدوایی کرد.

٤ ـ حاجی خدر کەلە چەقۆ و قەڵەمبڕدا کارامە بوو، قەڵەمبڕی وای دروست دەکرد، کەس نەی دەزانی نەبیکاتەوە نەدای خات لە تەمەنی نزیکەی ١٠٠ ساڵیدا لەسەرەتای هەشتاکاندا مردووە.

٥ ـ حەسەن ئیبراهیم: چەقۆ دروست کەر بوو، ئێستایش فەخرە دینی کوری لەهەڵەبجەی شەهید هەمان ئیش دەکات.

٦ ـ حەمە عەلی مستەفا، مردووە زیاتر چەقۆی دروست دەکرد.

٧ ـ فەتحوڵلاّ صادق: زیاتر تەور و تەورداس و زەنگن و چەقۆ و ناڵ و ئەمانەی دروست دەکرد، ئێستاش هەر سێ کوری (مەحیەدین و صادق و ئەیوب) ئەم ئیشە دەکەن.

٨ ـ حەمە حسێن کوری ئەحمەد، وەستایەکی ناودار و کارابووە، لە دوای خۆی هەرسێ کوری ئەم کارەیان کردووە کە ئەمانەن:

ا ـ ئەسکەندەر، وەستایەکی زۆر بلیمەت بوو ئەمیش لەدوای خۆی سێ کوری ئەم کارەیان کردووە.

ـ حاجی بیلال ئێستا پیربووە ناتوانێ ئیش بکات لەسلێمانیە.

ـ حەمە رەحیم لەهەڵەبجەی تازەیە و ئەم ئیشە دەکات.

ـ جەلال لەتەوێڵەیە ئەم ئیشە دەکات.

ئەم وەستایانە زیاتر خەریکی ناڵ و ناڵبەندین.

ب ـ عەلی ـ لەدوای خۆی عەزیز و حەمەحسێنی کوری ئەم ئیشەیان کردووە، عەزیزی کوری وەستایەکی ژیر و وریابووە،پاش چەند ساڵێك بووە فەرمانبەری کارەبای تەوێڵە و، دواتر نەقڵکارا بۆ هەڵەوبجە و لەوێ مایەوە، خزمەتێکی چاك و دڵسۆزانەی کرد تا لە کیمیاویەکەی هەڵەبجەدا شەهید بوو.

هەروەها (حەمە حسێن) یش کەلەم دواییەدا مردوە، تفەنگ و ساچمەی دروست دەکرد.

ج ـ وەستا حەمە یوسف و کوڕەکانی (ئیسماعیل و هادی):
ئیسماعیل، چەقۆو قەڵەمبری نایابی دروست دەکرد.هادی کە بەمام هادی بەناوبانگە ئێستا ئەم ئیشە ناکات. بەڵام هەردوکیان لەدروست کردنی تاپڕ و ساچمە و شتی لەوبابەتەدا دەستێکی باڵایان بووە.
٩ ـ حەمە سەلیم: لە دوای خۆی دوو کوری بووە ئەم ئیشەیان کردووە:
ـ وەستا محەمەد، کە چەقۆ و تفەنگی دروست کردوە کورەکانیشی عەباس حەمە غەریب و حەمە سەلیم وەستای چالاك بوون.
ـ وەستا ئەحمەد، کە چەند ساڵێك لەسێوسێنان بوو، لەم دواییەدا لەسلێمانی بوو کەوەستایەکی چەقۆ دروست کەری چاك بوو
١٠ ـ جامی کە ئاسنگەرێکی چاك بووە، بەڵکو لەتفەنگ دروست کردندا کارامە بووە، ڕەحمانی کوریشی زۆر شارەزا بووە لەم ئیشەدا
١١ ـ صادق غەندی: زیاتر بەکاری تەنەکەچی‌یەوە خەریك بووە، لەهێڵەك و قۆری و زۆپا و ژێر زۆپا و پەرمێز دروستکردندا دەستی هەبوو. وەستایەکی زۆر ئارەزا و وریابوو لەتەمەنی نزیك (١٠٠) ساڵیدا مردوە.لەکورەکانی (بەهرۆز و عادل) ئێستا ئەم کارەدەکەن.
١٢ ـ عزەت ئەحمەد ئیسحاق: زیاتر بەکاری تەنەکەچیەوە خەریك بوون.
١٣ ـ حاجی عەزیز حەمە ئەمین. لەتفەنگ دروست کردن دا شارەزایی زۆری هەبوو.
هەروەها کۆمەڵێکی تریش بوون لەم کارەدا ئیشیان کردوە.

**٧ـ دارتاشی:**

دارتاشی یەکێکە لەو پیشانەی کە کۆمەڵگا پێویستیەتی، لەتەوێڵەشدا ئەم پیشەیە بەشی خۆی بووە و پێداویستی خەڵکەکەی تەواو کردوە بگرە زیاتریش ... بوونی کەرەسە و وەستای چاك لەتەوێڵەدا بووە هۆی ئەوە ئەم پیشەیە رۆژ بە رۆژ بەرە و پێشەوە بڕوات.
کەرەسەکانی دارتاشی کەبریتی یە لە: تەختەودار، لەتەوێڵە زۆربووە، چونکە تەختەودارەکە لەدارگوێز و دارچنار و داری توو، ئەوانە بووە، ئەم دارانەیش لەتەوێڵەدا زۆرن و هەن.
دارتاشەکانی تەوێڵە ئەم شتانەی خوارەوەیان دروست کردووە:
دەرگا، پەنجەرە، دیمەك، مرۆڵە، زەوەند، تەختە بەند، کوڵەکە، پنە، تیرۆك، دەسکی خاکە ناز، زەنگن، تەور، پیك، چەکوش، صندوق، رەنە، کلیل، کلۆم،

شەو زەن، دوك، تەشی، شەی، شانە، شەکردان، کەوچك، کەوگیر (کەکەوچکێکی گەورەیە) کەوچکی دۆ،کوچەڵە، قاپی ئاو، دەوری، مێز و کورسی، (میزراح، خولیرە) وەسائلی جۆلایی، قەڵتاخ، ڕەفە، هتد)

**دارتاشەکانی تەوێڵە:**

- عەبدول ڕەحمان: کەوەستایەکی باش بووە کورەکانیشی کە ئەمانەی خوارەوەبوون دارتاش بوون:

عەبدوالله: کە مردوە کورێکی هەیە بەناوی بەشیر کە ئەمیش دارتاشە لەهەڵەبجە.

عەبدول ڕەحیم: کە ئەمیش هەرسێ کوری دارتاش بوون کە بریتین لەوەستا (ئەحمەد و مەحمود و حەمە حسێن) کەلەم دواییە لەسلێمانی مردن.

- وەستا قادر ئەمیش دوو کوری بوون:

ئەحمەد کەدارتاشێکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە، ئێستا ئیبراهیمی کوری دارتاشە.

عەبدوالله کەشارەزا و داهێنەربووە لەکارەکەی‌دا، کۆڵەکەکانی مزگەوتی گەورەی تەوێڵە ئەودایناون کە زۆر بەژیرانە دایناون، ئەم وەستایە کورێکی بووە بەناوی مەحمودەوە ئەمیش دارتاش بووە.

- حەمەی کوێخا ئێستاش کورەکانی:

وەستا ڕەشاد کە شارەزایەکی چاکە، بەشێوەی هاوچەرخ ئیش دەکات لەسلێمانیە و بەناو بانگە.

وەستا سابق ئەمیش هەروەها لەسلێمانیە دارتاشێکی باشە.

- عەلی وەیس و کورەکانی.

وەستایەکی بەناوبانگ بووە، کورەکانیش (عابد و مەقصود و صابر و صدیق) ئەم ئیشەیان کردوە و دەیکەن.

ئەم بنەماڵە لەسەرەتای پەنجاکانەوە، هاتنە هەڵەبجە و لەوێ لەسەر ئەم ئیشە بەردەوام بوون.

- مارف مارف.

ئەم وەستایە لەداهێنان و دار بڕینی دیمەك و دار و مرۆڵە و کۆڵەکە و ... ئەوانە زۆر بەتوانا و شارەزا بووە.

**٨ـ وەستا دیواریی (بەنایی)[١٥]:**

مەبەست لەوئیشەیە کەوەستاکان بۆ خانووکردن دەیکەن. ئەو وەستایانەی کەلە بیناسازی‌دا دەستیان بووە لەتەوێڵەدا ئەمانەی خوارەوە گرنگترینیان بوون:

ـ حەمە ئەمین عەبدوالڵە: کەوەستایەکی زۆر بەناوبانگ بووە لە هەوراماندا نەك هەر لەتەوێڵە بەڵکو چەند بینا و خانوی تری دروست کردوە لە غەیری تەوێڵەدا وەك خانووە جوانەکەی حەمە ڕەشید بەگ و جەعفەر سوڵتان لەپاوە و خانوەکەی کەریم سان لە خانەگا و نەوسود[١٦] ئەم وەستایە لە دەوروبەری ١٩٥٨ کۆچی دوایی کردووە.

دوای خۆی هەرسێ کورەکەی وەستای چاك بوون:

وەستا تۆفیق لەساڵی ١٩٧٥ دا مردوە.وەستا غەریب لەتەوێڵەیە وەستا ناصر لە هەڵەبجەی شەهیدە.

ـ قاسم مارف ئاغا ـ میرزا عەبدوالله ئەبوبەکر ـ حاجی یوسف حەمە سەعید ـ موئمن عەبدولحامد ـ کەریم خادم و ئەمینی کوری.

ـ ڕەحمان جامی و لەدوای خۆیشی هەردوو کوڕی نامەوەش و حەمە ئەمین ـ موئمن ناسراوە بە (مومنە گوڵە) ئێستاش ستاری کوڕی لەتەوێڵە وەستایە.

ـ سەید صادق عەلی مەولود وە ستایەکی زۆر ژیر و کارامەیە ئێستا لە سلێمانیە تەمەنی نزیك (٨٥) ساڵە.

ـ عەینەدین عەبدوالله لەهەڵەبجەی شەهیدە ـ ئەبوبەکر حەمە سەعید لەسلێمانیەوە وەستایەکی ناودار بووە.

ـ دیاری عەبدولقادر ئەبوبەکر لە تەوێڵەیە۔ نوری عەلی لەتەوێڵەیە ـ حەمە سەعید زۆراب خالد لەتەوێڵەیە.

**٩ـ ڕستن و چنین:**

قۆناغێکە دەزوو مەرەز و موو دەڕێسرێت و ئامادە دەکرێت بۆ قۆناغی چنین واتە ڕستن هەنگاوی یەکەمی چنینە.

**چنین:**

چنین دووبەشە:

ـ چنینی دەستی کە ئەمانە دەگرێتەوە:

(کلاش، گۆرەوی، پوزەوانە، دەست کێش، کڵاو، کلێتە، لفکە، ملپێچ)، (بەردەقانی - بەرزەقانی)، (مەکدان - خوێدان)، کیف قورئان،... هتد.
- چنین بەئامێر، واتە: جۆلایی وەك: شاڵ، مەوج، پۆپەشیمین، بەرماڵ، گلێم،... هتد.
ئەم چنینە لە شوێنی خۆیدا باس کراوە.
ئەوسا زوربەی ئافرەتی تەوێڵە لە (ڕستن و چنین) شتێکیان لێ زانیوە بەلاّم دیارە کارامەیان بووە.
چنینی دەستی:
ئەم پیشەیە ئافرەت کردویەتی، جگە لە کلاش کە پیاویش چنیویەتی
گرنگترین ئافرەتە بەناو بانگەکانی (چنین) ی دەستی - جگە لە کلاش - ئەمانە بوون:
- خاتوو خورشید مەلا عیصام، ژنی مەلا حەسەن - حلێما مەلا نظام - خاتوو ڕەحمەی مەلاحەیبەڵلاّ، ژنی مەلا عەبدول ئەحەد
- سەبیحە قادر مەعروف - پیرۆزی فەتاح، ژنی عەبدولحەکیم جۆلاّ - ئامینە عەباس عەلی،ژنی حاجی عەبدول رەحمان حاجی محەمەد
- سەلما مەحمود، خوشکی جافرە مەمول - فا طمە عەبدوالله - ئامینە فەرەج یەعقوب - نازدار حەمە رەضا، ژنی فایق ڕەسول
- نارنج قادر غەفور، لەهەڵەبجەیە ژنی مەحمود محەمەد - عەطیە مەحمود مستەفا، ژنی حەمە عارف موئمن کەلەسلێمانیە، ئێستایش خەریکی ئەم کارەیە
هەروەها هەندێ ئافرەت خەریکی گرتنەوە و مێخەکبەند و دەسترازە و پێچەنەگیر بوون و هەن، لەوانە:
- ئافتاب وەهاب، ژنی حاجی مەحیەدین لە مێخەکبەند کارایە و، لەتەوێڵەیە - جەنەت حاجی ئەبوبەکر حاجی حەسەن، ژنی حاجی محەمەد حامد، لەسلێمانیە - سەلما مەحمود لە زۆر شتا دەستی ژیر بووە - ڕەعنای صەلاّحە ژنی ئەسکەندەرسانە- عەطیەمەحمود مستەفا - رەعنا ئەحمەد، ژنی وەهابی ئەلە- گوڵباغ ژنی حاجی عەبولە ئەم ژنە دەستێکی کارامەشی هەبوو لەدروست کردنی بەرکڵاو پرچکەدا.
- هەورەها چەندانی‌تر..

**١٠ـ لێفە درووێی:**

ئەم کارە یەکێکە لە پێداویستیەکانی ژیان بۆیە بەشی خۆی گرنگی پێدراوە و لەگرنگترین لێفە دروەکان:

ـ کەریم خادم ـ حەمە شەریف خادم ـ فائق عەزیز عوسمان ـ ئەمین کەنعان داود.

ـ محەمەد ئەحمەد. لێفەدورێکی بەناوبانگ بووە، ئەو ڕۆژەی کە ئیشی بکردایە بۆ ئەوماڵە دەبوایە خزمەتێکی چاکیان بکردایە، ئەگین ئیشی نەدەکرد. هەمیشە ڕۆنی خۆماڵی ئەخوارد.

ـ حەمە ڕەحیم حەمە شەریف لەسلێمانیە و ئێستایش ئەم کارە دەکات ـ زینەت عەلی ژنی کەنعان فەتحوڵڵا.

ـ حسمت کەریم عەلی ژنی حەمە ڕەحیم حەمە شەریف لەسلێمانیە ـ لەطیف حەمە بڕوا لەهەڵەبجەیە، جار جارە ئەم ئیشە دەکات.

ـ هەروەها هەندێکی تر ....

**١١ـ سەرتاشی و دەلاکی:**

ئەمەش بۆ خۆی پیشەیەکە هەموو کەس لێ نازانێ پێویستی بە فێربوون و مومارەسە هەیە

بەناوبانگترین سەرتاشەکانی تەوێڵە ئەمانە بوون:

ـ جەعفەر عەزیز: کە وەستایەکی چاك و ناودار بووە، لەتەوێڵەدا، لە دوای خۆشی هەردوو کوری عەبدولرەحمان و صدیق سەرتاش بوون. عەبدول رەحمان جگە لەوەی کەسەرتاش بوو، دەستی پزیشکیشی هەبوو، پیاوێکی بەرێز و زۆر موسڵمان بوو

– لەدوای صدیقیش، وەستا فەرەجی کوری لەسەر ئەم پیشەیە بەردەوام بوو، وە ئێستا لەسلێمانیە.

ـ حەمە باقی: ئەمیش جگە لەسەرتاشی دەستی پزیشکی هەبووە، لە دوای خۆیشی کورەکانی حەمە سەلیم و عەلی سەرتاش بوون.

ـ کەمال محەمەد، سەرتاشێکی زۆر چاك بوو ئەوسا زوربەی مامۆستا و فەرمانبەران لەلای ئەم سەریان چاك دەکرد لەم دواییەش لەسلێمانی دوکانی هەبوو.

- حەمە سەلیم محەمەد غەفور: ئێستایش لەتەوێڵە دوكانی هەیە، كورەكەیشی (غەفار) وەستایەكی باشە و لەسلێمانی دوكانی سەرتاشخانەی هەیە، ئەوسایش زۆرێك لەگەنجەكان بۆ لای ئەم دەچوون سەریان چاك بكەن.

- نەصرە دین ئیبراهیم: لەكیمیاویەكەدا شەهید بوو.

- عوسمان عارەب: لەسەربازیدا فێری ئەم پیشەیە بوو كە خانە نشینكرا هاتەوە تەوێڵە، سەرتاشخانەیەكی دانا - لە ١٩٩٨/٨/٧ لەسلێمانی كۆچی دوایی كرد.

- سەركەوت حەمە حسێن، كە گەنجێكی تازە پێگەیشتووە ئێستا لەتەوێڵە سەرتاشخانەی هەیە.

- هەروەها چەند كەسێكی تر هەن لەسلێمانی سەرتاشخانەیان هەیە.

**١٢- دروومانی (بەرگدروویی):**

بەرگدروویی: پیشەیەكی پاك و خاوێنە و بایەخی خۆی هەیە لە كۆمەڵگادا كە گرنگترین وەستاكانی ئەم كارە لەتەوێڵەدا:

- ئیسحاق كەناسراو بو بەشای بەرگدرووەكان ،هەروەهاحەمەلەتیفی كوڕی ،جگەلەمەش كوڕەكانی تری یەك لەدوای یەك بەرگدرووی و لێفەدروویی یان كردووە كەئەمانەبوون:

یوسف، عوسمان، محەمەد، لەتیف، محەمەد (حەمەبڕوا)، دەروێش لەتیف.

- تۆفیق سەعید ئاغە - حامید حەمە لاو سەعید ئاغە- كەریم ڕەشید سەعید ئاغە- جەعفەر حەمە صاڵح - مەحمود حەمە صاڵح

- مستەفا حەمە ڕەزا خالد و صەبوری كوری، هەردوكیان وەستای چاك بوون لەم دواییەدا هاتنە سلێمانی بەڕووداوی سەیارە هەردوكیان كۆچی دواییان كرد.

- كوێخا حەمە سەلیم حەمە رەزا خالد كەوەستایەكی ناوداربووە، لەتەوێڵە كۆچیدوایی كرد، ئێستایش شێرزادی كوری ئەم ئیشە دەكات، لەسلێمانیە و هەموو جۆرە پۆشاكێك دە دوورێت.

- حاجی كاكەبرا عەبدوالله- سلێمان ئەحمەد - عەلی جەعفەر - فەتحوڵلا سلێمان - حاجی عەبدورەحمان ئەحمەد، - یونس حاجی یوسف - ئیدریس حاجی محەمەد حەمە كەریم كە بەرگدرویەكی بەناو بانگە بە تایبەت بۆشال دوورین. ئێستا لەسلێمانیەئەم ئیشە دەكات

- محەمەد عەبدوالله حاجی نادر کە ئێستا لەسلێمانیە و بەردەوامە لەسەر ئەم کارە- حەمە ڕەئوف حاجی کامیل لە تەوێڵە ئەم ئیشە دەکات - جەوهەر حاجی محەمەد، ئێستا ئەم ئیشە ناکات - نەصرەدین حاجی یوسف، لەهەڵەبجە تازەیە - جەمال حاجی عارف لەسلێمانیە - فەخرە دین خوا کەرەم لەسلێمانیە - عیسا عەبدولرەحمان لەهەڵەبجەی شەهیدە - نەزمی فارس لەسلێمانیە - مەولود فارس لەسلێمانیە - ئەنوەر حەمە کەریم لەسلێمانیە - غەفار مەحمود لەهەڵەبجەی شەهیدە - عەبدولڕەزاق عەبدولرەحمان ئێستا وازی لەم ئیشە هێناوە - مستەفا عەبدوالله، لەهەڵەبجەی شەهیدە - شیروان ئەڵلا کەرەم، لەهەڵەبجەی شەهیدە - بەختیار حەمە کەریم، لەسلێمانیە.

- عەدنان ئیسماعیل لەتەوێڵەیە - ئاشتی ئەڵلا کەرەم لەتەوێڵە یە- طالب مستەفا لەپاوەیە - شاهۆ ئیسماعیل، لەسلێمانیە.

- ئیبراهیم عەبدوالله، لەسلێمانیە.

لەو ئافرەتانەیش کە لە تەوێڵە دابەرگدرووبوون:

- حسمەت کەریم ژنی حەمە رەحیم حەمە شەریف لەسلێمانیە.

- کۆفە تۆفیق، ژنی عەبدولحە کیم لەتەوێڵەیە.

- مەحبوبە، ژنی مەحمود حەمە صالح

- بەدریە تۆفیق، ژنی ئیدریس حاجی محەمەد، کە بەرگدروویەکی زۆرچاك و شارەزایە، ئێستا لەسلێمانیە.

- نازیمە حاجی محەمەد کە بەرگدروریەکی باشە و لەتەوێڵەیە.

**١٣- شۆفێری:**

پیشەیەکی تازەیە لەتەوێڵەدا لەچاوپیشەکانی تردا، لە ساڵەکانی نیوەی پەنجاکان دا کە جادە هاتە تەوێڵەئەم ئیشەش برەوی پەیدا کرد، شۆفێریش بووە پیشەیەك.

ئەو شۆفێرانەی تا ساڵی - ١٩٨١ لەخەتی تەوێڵەدا شۆفێریان کردووە زۆر بوون هەندێکیان مردوون لەوانە:

- مەحیەدین حەسەن کەبەمەحە ڕابە ناسراوە، حەمە صاڵح حەمە ڕەزا کە بەصاڵح چەقۆ ناسراوە. ئەنوەر صاڵح تاتە، حسێن صاڵح تاتە، محەمەد حەمە صاڵح کەلەکیمیاوی یەکەدا شەهید بووە. داود حەمە سەلیم، کامیل عەبدوالله، عیزەت ڕەحیم، دڵشاد کەریم یارە، یادگار حەمە عەلی مستەفا، مەعروف ئەحمەد

حاجی محەمەد، طاهر حەبیب، حەمە صالح مەحمود، صەلاح حەمە ڕەحیم، غازی قادر حسێن، ...

ئەمانەش شۆفێری ئەو خەتە بوون ئێستا لەسلێمانین:

- قادر صالح تاتە، حەسەن صالح تاتە، عومەری شەمعە عەلی شەمعە [١٧]، عەلی پلاتین، ئەکرەم عەبدوالله، فەرەج مەولود وفەرهاد، ئیسماعیل کەبەسمەپیکۆڵ ناسراوە، جەبار ئەحمەد، سەعید صالح حکمەت حەمە ئەمین، عوسکان حاجی عەبدوڕەحمان، ستار هەیاس، صابر عەبدوالله شەمسەدین، شمشێر عیزەت حەمە سەعید، عەزیز سەعید حەمە یوسف، ڕەزا حەمە صالح چەقۆ، ...

ئەمانەش لەهەڵەبجەن:

- عەبدوالله عەلی عەبدوالله، محەمەد ڕەحمان، عەبدول حەمە بڕوا، بابا حەمە حەسەن، سوبحان حەمە حەسەن، مستەفا حەمە سەلیم، ...

ئەمانەی خوارەوەش لەتەوێڵەن:

بەهجەت عەلی عەبدوالله، سامی عەلی عەبدوالله بەختیار کوێخا نەزهەت، صەباح حسێن لاوە، ئەنورە عەبدولخالق محەمەد، سەعدون حەمە ئەمین، ...

**چەند تێبینیەك:**

١- مەرج نیە ئەم ناوانەی کەناومان بردن ئێستا هەموو ئەم ئیشە بکەن.

٢- شۆفێری تری تەوێڵەیی هەن لە شوێنی تر شۆفێر بوون ناومان نەهێناون.

٣- شۆفێری تر غەیری تەوێڵەیش هەن لەو خەتە ئیشیان کردووە.

٤ - شۆفێری تر هەن لەوخەتە بوون بەڵام ئێستا لەوشوێنانەی ناومان بردن لەوێ نین وەك صەباح مەحمود حەمە یوسف لەپاوەیە، جەبار حسێن لاوە دیلە لەئێران ...

**١٤- دەلاڵەکان:**

- غەریب مەولود فەرهاد - مردووە.
- فائق ڕەسوڵ جوامێر - مردووە.
- حەمە صالح قادر وەلی، ئێستا چووەتە تەمەنەوە و لەسلێمانیە.

**١٥- وێنەگری:**

مێژووی وێنەگری لەتەوێڵەدا کۆن نیە، دەتوانین ئاماژە بەچەند کەسانێك بکرێن کەلەم کارەدا ئیشیان کردبێ.

- نەجمەدین مەحیەدین حەمە سور.

پێش ئەوەی وێنەگر بێت، وێنەکێش و خۆش نووس بووە، دواتر دوکانێکی بۆ وێنەگری دانا لەساڵی ١٩٧٢ەوە ئێستایش لەهەڵەبجەی تازەیە و مامۆستایە و بەردەوامە لەخۆش نووسیدا.

- حەمە صاڵح مەحمود حەمە صاڵح.

ماوەیەکی کەم دوکانی وێنەگری هەبوو بەڵام گرنگ ئەوەیە لەم کارەدا ناوی خۆی تۆمارکردووە.

- دڵشاد حاجی عەبدوالله هۆمەر و فوئادی برای، یەکەمیان ئێستا لەسلێمانیە و دووەمیان لە سویدە، هەردوکیان کۆمەڵێك وێنەی تەوێڵەیان بەجوانی گرتووە وەك یادگارێك ماونەتەوە.

- عەبدوالله حاجی محەمەد

لەساڵی ١٩٧٤ بۆ ١٩٨٠ وێنەگربوو، هەنگاوێکی باشتری ناوە و کۆمەڵێك
- مەناظری - جوانی سەیرانگاکانی تەوێڵەی گرت.

**دووەم: کشتوکاڵ و باخداری:**

سەرەتا: پێویستە بۆ ئەم باسە دووخاڵ ئاماژە پێ بکەین:

أ- خاك و زەوی تەوێڵە:

وەك لەپێشترەوە وتومانە، خاك و زەوی هەورامان بەگشتی، سەخت و دژوار و بەردەلانی‌یە و شاخ و چیای بەرز، بەرزی تیایە. دەشت و تەختانی کەمی هەیە و زەوی تەوێڵەش بەشێکە لەمە، بگرە ئەگەر لەهەندێ شوێنی هەوراماندا کەمێك دەشت و تەپۆڵکە هەبێ، لەتەوێڵەدا ئەوەش نیە، بەڵکو زەویەکەی لەسێ چیای گەورە و دۆڵ و چەمەکانیان پێك هاتووە، کەبەردەلانی سەخت و دژوارەو، زەوی وزاری کەمە.

دکتۆر شاکر خەصباك دەڵێ:

... لەبەر نەبوونی ئەرزی گونجاو بۆ کشتو کاڵ پەنایان بردووەتە بەر بەش بەش (واتە تەلان تەلان) کردنی ئەرزەکە..)[١٨]

شاکر فەتاحیش دەربارەی ئەم تەلانانەی تەوێڵە دەڵێ:

... ئەو رێك و پێکی‌یەی لەدروست کردنی ئەم سەکۆیانە (تەلانانە) دا دیومە، لە (لوبنان) یشدا، بەو هەموو شارەزایی‌یەوە کە هەیانە نەم دیووە ...).

هەروەها ئەدمۆنسیش باسی ئەم تەلانانە دەکات[١٩].

ب ـ ئاوو هەواکەی:

سەرچاوەی ئاوی تەوێڵە بریتی‌یە لەو ئاوی باران و بەفرەی کە دەبارێت دوایی کە بەشێوەی کانیاو لەژێر زەوی دێتە دەرەوە سوودی لێ وەردەگیرێ .. واتە: سەرچاوەکەی کانیەکانە.

وێنەی تەلاّن لەزستان دا - ١ / ٢ / ٢٠٠٢

بەلاّم ئەوەندە هەیە ئەم ئاوی کانیانە تا دەگاتە سەر باخەکان ماندوبونێکی زۆری دەوێت و چەندەها بەرد و کەندەلاّن دێتە بەردەم.

لەم ساڵانەی دوایی‌دا کە ئاو کەم بوو و شکەساڵ بوو بە (٤٥٠٠) مەتر سۆندە ئینجا ئاوی کانیەکەی ئاوێسەر گەیشتووەتە باخەکانی نزیك ئاوایی.

هەواکەشی ـ ڕەشەبای کەمە و، باران و بەفرێکی زۆری لێ دەبارێت، سەرماو سۆڵەی زۆرە، تەرزەی لەبەهاراندا هەیە، وشکە زوقمی کەمە ... زۆر جار سەرماو تەرزەی بەهاران زیانێکی زۆر دەدات لەبەرهەمی باخەکان.

**کشتوکاڵ لە تەوێڵەدا:**

تەوێڵەیەك، خاك و زەوی و ئاو و هەوای ئاوابێت، دەبێت ئەو کشتوکاڵەی لەدەشتەکاندا دەکرێت، لێرەکەم بکرێت بەڵکو شتی تر بکرێت.

دانەوێڵە لەتەوێڵەدا کەم ناکرێت ـ جگە لەساڵەکانی حەفتاکان حاجی محەمەد کەبە(حەمە مەجە) ناسراوە لەزەمینی هەیاسدا جۆنۆکی کرد، سەوزەش بەهەمان شێوە، مەگەر کەسێك لەحەوشەو باخەکەی بەشی خۆی بکات.

کەوابوو: دانەوێڵە و سەوزە لەتەوێڵەدا کەم دەکرێت، مەبەست لە کشتوکاڵ: بریتیە لە باخداری و گژوگیای سروشتی.

**باخداری تەوێڵە :**

ناوچەی هەورامان بەگشتی و تەوێڵە بەتایبەتی، پڕە لە باخی بەردار و درەختی بەكەڵك. خەڵكی ئەم دەڤەرە، لە بواری باخدا نان و بەرهەم هێنانیدا، پسپۆڕی و ئەزمونی تایبەتمەندی خۆیان هەیە[٢٠] ....

باخەكانی تەوێڵە دەكرێن بەسێ بەشەوە:

١ ـ باخی چەمی ئاوێسەر:

باخەكانی ئاوێسەر هەر لە (هانە سوسو) ەوە دەست پێدەكەن بۆ (شانە زەرا) لەوێشەوە بەلای راستدا بۆ باخەوان وهانەكڵە و ماوامی و وەزەسوور و قوڵە تا دەگاتە سەرچاوەی ئاوێسەر، هەروەها لەشانە زەراوە بەلای چەپدا چەمێكیتر هەیە كە بەچەمی (دەرە تاریك) بەناوبانگە، ئەویش تا دەچێتە سەر سەرچاوەكەی، پڕە لەباخ و درەخت.

٢ ـ باخی چەمی دزاوەر:

هەر لەپشتی حەوزەوە دەست پێدەكات، بۆ هانە مڵكشا و، لەلای راستەوە، خوارەوەی خەڵەفیـیە لەلای چەپەوەدەرەی و پاشان دەگەینە ـ • ـ هانەكڵەی سەعە ـ لەوێوە بۆ سنوری ئێران، ئەوەی شایانی باسە باخەكانی تەوێڵە دەچنە سنوری خاكی ئێرانەوە، وەك باخی (حاجی كامیل و حاجی سەلیم و حەمە صالحی وەیسی و حاجی عەبدوالله).

٣ ـ باخی چەمی گەریات:

ئەم باخە هەر لەخانەقاوە دەست پیدەكات و بۆ گەریات و، بەشی رۆژهەڵاتی وێشە و قەڵامسێن و قاقوڵی... بەناوچەمیشدا دەڕوات بۆ دەرە قازان، واتە: تا خوار دێی سۆسەكانیش باخەكانی تەوێڵە دێن. لەم بەری چەمیش لەئاسا وگاوە بۆ بێدەری و لەگەڵ باخەكانی سۆسەكاندا تێكەڵاو دەبن. بەشی سەرەوەش هەر لەخانەقاوە جۆگەیەك جیادەبێتەوە كە بە جۆگەی صۆفی بەناوبانگە دەچێت بۆ دەرەی بەڵخ.

**گرنگترین جۆری درەختی تەوێڵە**

١ ـ دار گوێز.

٢ ـ دار توو.

٣ـ دار مێو.

٤ـ داری هەڵوژە.

٥ـ داری بەهێ.

٦ـ داری هەنار.

٧ـ داری هەنجیر.

٨ـ داری قەیسی.

٩ـ داری هەرمێ.

١٠ . داری سێو.

١١- داری قۆخ.
١٢ - داری چنار.
١٣ - سورە چنار (پەلك).
١٤ - بی.
١٥ - بەڕوو.
١٦ - گۆیژ.
١٧ - قەزوان.
١٨ - تایر (تایلە).
١٩ - چوالە.
٢٠- سنجەی (سنجاق).
٢١- هەڵوژەی قادری (هەرو).
٢٢- گوڵنار.
٢٣ - کێکف (کەکەو).
٢٤ - تەنگەز.
٢٥ - هەنگەون.
٢٦ - تەڕینە.
٢٧ - شروە.
٢٨ - بەلاڵوك.

چەند تێبینیەك:

١ - داری مێو لەناو باخەکانیشدا هەیە بەڵام زیاتر دەیمیە.

٢- بەڕوو، گۆیژ، قەزوان، چوالە، بەلاڵوك و کێکف لەناو باخەکاندا زۆر بەدەگمەن هەن، چونکە دێمین و بەشاخەکانەوەن.

٣ - لەم ساڵانەی دواییدا خەریکە گرنگی دەدرێت بەهەندێ جۆری تر، لەوانە، گێلاس، هاڵو باڵو، بستە.

٤ - لەناو ئەو هەموو درەختانەدا، زیاتر بایەخ دراوە بەداری گوێز و توو مێوو ... لەبەر ئەوەی ئەم دارانە گرنگیان پێ دراوە وای بە باش دەزانین کە کورتەیەك لەسەریان بنوسین.

**دار گوێز:**

... لەوناوچانەدا گوێز دەنێژرێت، کەئاویان زۆر بێت، کەم شوێن هەیە لەجیهاندا وەك کوردستان گوێزی تێدابڕوێ بەتایبەت لەناوچە فێنکەکان و ئەو شوێنانەی کەمتر با دەیانگرێتەوە، وەك هەورامان دارگوێزی وایان هەیە (٥٠ - ٦٠) هەزار گوێز دەگرێ ...)[٢١].

ئەم دارە لەتەوێڵە زۆر گرنگی پێدراوە [٢٢] لەهەر سێ چەم دا دارگوێز زۆرە. دار گوێز دارێکی گەورە و فراوانە پەل و پۆی زۆرە و بەرز دەبێتەوە بۆ (١٠ - ٢٠) مەترێك بەتایبەت ئەوانەی ناوچەمەکان زۆرتر بەرز دەبنەوە ...

تەمەنی دارگوێز بۆ سەد ساڵ زیاتر دەبێت. گوێز بەتۆ و واتە بە (گوێز) خۆی دەچێنرێت، پاشان گەورە دەبێت و دەبێتە نەمام و دەگوێزرێتەوە بۆ شوێنی خۆی.

ئـەو شـوێنانەی کـە گـوێزی زۆری تیابێـت و گـەورەبن پـێ‌ی دەوترێـت، (ماوەزا) کەتەلاَنێکی گەورەیە لەناو چەمەکاندا.

گـوێز جـۆری زۆرە، بێ‌توێکـڵ و گـوێزە کـوێرە و گـوێزی سـادە و گـوێزی کاکڵـە (وەزەمـەژگی). گـوێزی بـێ توێکـڵ واتـە: توێکڵکـەی زۆر ناسـکە و وەك پەردەیـەك وایـە. گـوێزە کـوێرەش، واتـە: گوێزێکـە کاکڵەکـەی زۆر بەزەحمـەت دەردێت بەلاَم بە زۆری کاکڵەکەی جوان و سپی‌یە. گوێزی سادەش توێکڵەکەی نەناسکە و نەکوێرە.

گـوێزی کاکڵـە واتـە گوێزێکـە کاکڵەکـەی چـاك و بـاش و سـپی‌یە. گـوێز هەرکات کاکڵەکەی بەیـەك پارچە دەرهـات لەتوێکڵەکەی پـێ‌ی دەڵـێن (کەڵـەباب).

گوێز لەسەرەتای پایزدا پێ‌دەگات و دەوەشێنرێت شەنیەر ـ واتـە: ئەو کەسەی دەتوانێت سەرکەوێت بەسەر دار گوێزدا و بەشەنە ـ کەدارێکی درێـژی باریکە ـ گوێزەکان دەتەکێنێت.

شەنیەرەکانی ئەوسای تەوێڵە زۆر بوون لەوانە:

ـ عەبدوالله صادق ـ مەحمود فەرهاد ـ عەلی سەید ئەحمەد ـ مەحمود حاجی حەمە یوسف ـ قادر مەعروف ـ فەرەج بابا لە.

بابا سـەید ئەحمـەد ـ مـەحمود حـەکیم ـ حەمـە مـراد یعقـوب ـ محەمـەد عەبدوالله میرزا...

ئـەم دوانـەی‌دوایی (حەمـە مـراد و محەمـەد) لەئـەنجامی گـوێز تەکاندنـدا لەسەر دار گوێز گەوتونەتە خوارەوە و مردوون.

لەم سەردەمەشدا ئەمانە شەنیەری چاکن:

ـ وەهاب صادق ـ عوسمان قادر وەلی ـ خواکەرەم حاجی ئەبوبەکر ـ عومەر سەعید ـ هۆشمەند عەبدوالله ـ جەبار مەلا ئیسماعیل

ـ جەلال رۆستەم ـ لەتیف فەتاح ـ نوری فەتاح ـ حەیدەر مەجید...

رۆژی گـوێز تەکانـدن گـەلکاری بـۆ دەکرێـت بـۆ کۆکردنـەوەی گوێزەکـان. هەنـدێ گـوێز هـەن بنەکـەیان زۆر سـەختە و بـەردەلاَن یا پوشـە و درکـی تیایـە، کۆکردنەوەی گوێزەکانیان ماندوبوونی دەوێت، تاکو کۆدەکردێنەوە.

دوای ئەوەی گوێزەکان لەبن دارێکدا کۆ دەکرێنـەوە، توێکڵـە سـەوزەکەیان لێ‌دەکرێتەوەو پاشان بەکۆڵ یا بەولاَخ دەهێنرێنەوە ماڵەوە دەخرێنە بەر هەتاو.

خاوەن گوێز ... گوێزەکانی یا هەر بە گوێزی دەفرۆشێت یاخود گوێزەکان بەگـەلکاری دەشـکێنن و کاکڵـە کـە دەردەهێـنن و دەیخەنـە بـەر هـەتاو بـۆ وشـك

بوونەوە. پاشان دەبرێنە بازاڕ بۆ فرۆشتن یا لە تەوێڵە یا لەشوێنانیتر وەك سلێمانی، بەغدا و موسڵ یاخود بۆ ئێران دەنێررێت.

ئەوسا چەند کاسپێك هەبوون، لەتەوێڵە کاکڵەیەکی زۆری تەوێڵە و لادێکانی یان دەکڕی و دەیانکردە ناو صندوقی تایبەتییەوە و بە گوونی صندوقەکەیان دادەپۆشی و بە لۆری باریان دەکرد بۆ بەغدا.

ئەو تەوێڵەییانەی ئەم کاسپییەیان دەکرد زۆر بوون لەوانە:

- باقی حاجی حەسەن - حاجی صادق کوێخا محەمەد - عەبدولرەحیم عەلی

- حاجی محەمەد فەتحوڵلا - حەمە حسێن حاجی فەرەج - عابد حاجی محەمەد - مستەفا حاجی فەرەج - حاجی حەمە ئەمین حاجی ڕەشید- سلێمان عوسمان - حاجی مستەفا موئمن

- حاجی عەبدوالله نەصرەدین - حاجی شەفیع عەلی محەمەد - حاجی ئەڵڵا کەرەم حاجی تۆفیق - حاجی مەحیەدین حەمە یوسف

- حاجی مستەفا حاجی حەمە صاڵح - حاجی مستەفا حاجی قادر- حاجی عەلی عەبدوالله - حاجی عەلی حاجی صادق - حاجی عەبدولڕەحمان حاجی محەمەد حامد...

ئەو کەسانەی لە بەغدا ئەم کاکڵەیان وەردەگرت و دەیان فرۆشت زۆر بوون کە ئەمانە ناوی هەندێکیانە:

عەبدولرەحیم فەیلی، مامی، حاجی فەهد، جاسمە بچکۆل، جەمیل غەنی، جاسم نەریمان، حاجی عەلی جان، عەلی ماڵەڵلا، قاسم عەرەب.

جار جارە ئەم بازرگانانەی بەغدا، دەهاتنە تەوێڵە خۆیان ڕاستەو خۆ ئەم بەروبوومەیان دەکڕی.

گرنگترین باخێك کە گوێزی زۆر و باشی هەبێت:

- باخی سەرچاوەکەی ئاوێسەر کە باخی شێخ ئەحمەد و (ئەسکەندەر و تۆفیق) ی سان ئەحمەد.

- باخی حاجی حەمە مراد لەچەمی ئاوێسەر.

- باخی محەمەدی حاجی حەمە رەحیم لەچەمی ئاوێسەر.

- باخی حاجی عەزیز حەبیب لەچەمی ئاوێسەر.

- باخی حاجی سەلیم لەچەمی ئاوێسەر.

- باخی حاجی مستەفای حاجی قادر لە چەمی دزاوەر.

- باخی حاجی ئەبوبەکر حاجی حەسەن لەچەمی دزاوەر.

- باخی حاجی عەبدوالله حەمە حسێن لەچەمی دزاوەر.
- باخی حاجی محەمەد حاجیلە لەچەمی دزاوەر.
- باخی حاجی حسێن مستەفا لەچەمی دزاوەر.
- باخی حاجی تۆفیق نادر لە چەمی دزاوەر.
- باخی حاجی محەمەد خڕە لەچەمی گەڕیات.
- باخی حاجی بابا لە مارف لەچەمی گەڕیات.
- باخی عەبدولرەحیم عەلی لەچەمی گەڕیات.
- باخی عابدی حاجی محەمەد لەچەمی گەڕیات.
- باخی حاجی حەمە یوسف و محەمەدی برای لەدەرەقازان.

سوودەکانی گوێز:

گوێز سوودی زۆرە و سەرچاوەیەکی ئابوری گرنگە لەتەوێڵەدا، سوود لەزۆر شتی وەردەگیررێت وەك:

- دارەکەی:

داری گوێز سوودی زۆرە و بۆ زۆرشت سوودی لێ وەردەگیررێ، لەوانە: بۆ داری خانوو، خێزرە، تەختەی بەندی ژوور، دیمەك و مرۆڵە و کۆڵەکە و دەرگا و پەنجەرە و پنە و تیرۆك و وەسائلی تری دارتاشی و شتیتر. هەروەها چڵەو شکەکانیشی بۆ سوتاندن سوودی لێ وەردەگیررێت.

- توێکڵەکەی:

مەبەست لەچەند توێکڵێکی‌یەتی وەك:

توێکڵی دارەکە: توێکڵی ئەو دار گوێزانەی کە نەمامن لەپیشەسازیدا سوودیان لێ وەردەگیرێت بۆ ڕەنگ..و سوتاندن.

توێکڵی خودی گوێزەکە: ڕەقەکەی: توێکڵێکی ڕەقی تەختەیی‌یە، کاکڵی گوێزەکەی داپۆشیوە و، پاراستویەتی، بۆ سوتاندن بەکەڵکە.

توێکڵە سەوزەکەی: توێکڵێکی سەوزی ئەستوورە توێکڵە ڕەقەکەی گوێزەکەی داپۆشیووە لە پیشەسازی‌دا بەکاردێت و باشترین جۆری رەنگی لێ دروست دەکرێت، هەروەها بۆ دروست کردنی (سوراو) بەکاردێت.

- کاکڵە (مەژگە) کەی بۆ خواردن بەکار دێت کە سودێکی زۆری هەیە، چونکە چەوریەکی زۆری تیایە، گەرمایی دەدات بە مرۆڤ و، بۆ مێشك باشە و کاریگەری هەیە لەسەر زیرەکی ... وەك دەرمان بۆ زۆر نەخۆشی بەکاردێت.

کاکڵە بەفەریکەیی کە (کاردە وەژەی) پێ دەڵێن، دەخورێت، هەروەها دوای ئەوەی باش پێگەیشت بەتەنهایا سوێراو دەکرێت و دەخورێت. بۆ ناو هەندێ چێشتیش بەکاردێ، وەك ترخێنە، ناوگیپە، بریانیو سەر برنج و ...هتد.

کاکڵە وەك شەو چەرەیەك لەگەڵ مێوژ و توو و قەزوان، دەخورێت، هەروەها بەنانەوە لەگەڵ چایدا دەخورێت بەتایبەت بۆ بەیانیان زۆر باشە.

هەروەها لە کاکڵە (گێتە مەژ گە) دروست دەکرێت و دەخورێت کە زۆر خۆشە و کەبەبەرچایییەوە دەخورێت یاخود دەبرێت بۆ سەفەر بۆ ناوباخ لەکاتی ئیش کردندا دەیخۆن.

گێتە مەژ گە:

وەك کولێرە و لەواشە وایە، دوو جۆرە:

کاکڵە، باش دەکوترێت و پاشان لەکاتی نان دروست کرندا کاکڵەکە دەکرێتە ناو هەویرەوە کەو ودەخرێتە سەرساج و دەبرژێنرێت بەمەیان دەوترێت ((گێتە مەژگی ناودار)).

جۆری دووەمیان:

هەویری تایبەتی بۆ دەشێلرێت و دوایی کاکڵە هاڕاوەکەی دەکرێت بەسەریدا، بەکەوچکێك چەند خەتێکی وەك خەتی کوێرە لێدەدرێت، زەردە چەوەش لەگەڵ کاکڵە هاڕاوەکەدا بەکار دێت.

هەروەها کاکڵە دەکرێت بە (لەپارە و کوتە) کەلە شوێنیتر دا باس کراوە، ئەگەر سالانە خوا بیدات بەخاوەن باخەکان و، سەرما و تەرزە، زیان نەگەیەنێت بەباخەکان، خەڵکێکی زۆر سوود وەردەگرن لە گوێز، لەخاوەن باخەوە بۆ کڕیار و فرۆشیارەکان، لەهەموو بەرهەمەکانی تری باخەکانی تەوێڵەش بە نرخترە و سوودی زۆر ترە.

پێکهاتەی خۆراکی گوێز[٢٣]:

کاکڵە گوێز پێکهاتووە لە: پرۆتین، چەوری، شەکر و ڤیتامینەکان، کالیسیۆم، فۆسفۆر، ئاسن، مەنگەنیز، گۆگرد، ئاو، قسڵ، مس، پۆتاسیۆم، ...هتد. یەك فنجان کاکڵە گوێزی وشك (٦٥٠) کالۆری وزەدەدات.

سوودی کاکڵە گوێز چییە بۆ لەش ؟

- گوێز لەبەرئەوەی (ڤیتامین A) ی تیایە، ئەبێتە هۆی بەهێزکردنی چاوو لوت و دەم و موو نینۆك.

- بەهۆی بوونی (ڤیتامین B) یەوە مێشك بەهێز ئەکات و بێحاڵی و ترس و سستی و تەپەی دڵ چارە دەکات.
- لەبەرئەوەی مسی تیایە دژی نەخۆشی شێر پەنجەیە.
- دوو جۆر چەوری گرنگی تیایە بەناوی (لینۆ لسیرە) و (ئەلفە لینۆ لنسیرە) ئەم دوو جۆرە چەوری‌یە بۆ لەش زۆر گرنگن، چونکە لەش توانای دروست کردنی (لینۆلسیرە) ڕێژەی سکۆلیسترۆل - لەخوێندتا دادەبەزێنێت.
- چونکە مادەی کالیسیۆم و فۆسفۆری تیادایە بەباشی کار لەلەش ئەکات و بۆ سووتان و ڕێکخستنی چالاکی‌یەکانی ماسولکەکان و مێشك پێویستە.
- بەهۆی بوونی (ڤیتامین C) یەوە کەتیایدایە، بۆ بەهێزکردنی لەش و ڕێگری سەرمابوون و هەلأمەت بەکەڵکە.
- ئەگەر (٤٧) گرام کاکڵە گوێز، لەگەڵ (٤٧) گرام هەنجیری وشك بکوتین و پێکەوە بیانخۆین، بۆ یارمەتی هەرس کردن زۆر باشە
- بۆ نەخۆشی شەکرە و سیل زۆر باشە.
- ئیلتهاب ڕادەوەستێنێت.
- ئیفلیجی، ئازاری (داء الملوك) و، پشت یەشە و، شەقیقە و، کوڵینج و، ئازاری تر لائەبات، بۆ ئەمەیش دەبێت گوێزی تازە لەگەڵ ئاودا بشێلرێت و بنرێت لە شوێنی ئازارەکە.
- بۆ بەهێزکردنی مێشك و نەستی (لا شعور) باشە، بۆ پیر و بەساڵا چووەکان، زۆر بەکەڵکە، بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ هەنجیر و کشمیش بخورێت.
- خواردنی‌کاکڵە گوێز و کشمیش و هەنجیر، بۆ گەدە زۆر بەسوودە.
- دەرمانە، بۆ مایە سیری، کاتێك کەبەپێستەکەیەوە ئەبرژێنرێت و، پاشان لەگەڵ ئاودا تێکەڵ ئەکرێت و، لێ ئەنرێت.
- مرەبای گوێز بەهەنگوین ئەبێتە هۆی قەڵەوی زۆرو گەدە بەهێز دەکات و، سك و ورگ نەرم رائەگرێت.
- خواردنی شیر و گوێز و خورما، بۆ گورچیلە و جوان بوونی پێستی روخسار، بەکەڵکە، (بڕی حۆراکەکە ئەبێت ٤٥ تا ٩٠ مسقاڵ بێت) ئاگاداربیت زیاد خواردنی، بەردی گورچیلە دروست دەکات.

هەروەها ژنانی شیردەر، ئەتوانن بڕێکی یەکسان لەگوێز و بستە و فندق و بادام و نۆك پێکەوە بکوتن و هەموو ڕۆژێك بەیانیان بڕێکی لێ بخۆن ئەمە جگە

لەوەی شیرەکەیان بەتام تر دەکات و، زۆریشی دەکات و، کاردەکاتە سەر گەورەبوونی منداڵەکەشیان.

- ئەگەر لاواز و وشك بوویتەوە، ئەتوانیت بەهۆی ئەم خواردنانەوە قەڵە و ببیت، بەیانیان میوەی شیرینی وەك ترێ، کشمیش، خورما، هەنجیر، توو، بخۆ، پاشان نان و گوێز و هەنگوین بخۆ.
- مەرهەمی کەتیرەی دار گوێز برینی کۆن و هەوکرد و، تیمار ئەکات.
- هەروەها کەمێك لەو کەتیرەیە، بکرێتە سەر ئەو دانانەی کلۆر بوون، هەم ئازارەکەی ئەشکێنێت و هەم ناشهێڵێت بئاوسێت و هەوبکات.
- ڕۆنی گوێز زۆر شیفا بەخشە:
- بیدە لەلەشی ئەو منداڵانەی تووشی ئێسکە نەرمە و کەم خوێنی بوون زۆر باشە.
- ئەگەر شەوانە (٥٠ تا ٦٠) گرام ڕۆنی گوێز بخورێ کرمی شیریتی لا ئەبات ئەکرێت ڕۆنەکە لەگەڵ پەتای کولاَودا بخورێ.
- بۆ زەلاَتە زۆر خۆشە.
- هەڵسوونی لەسەر، بۆ مووەکان باشە.
- بۆ چارەسەرکردنی قلیشانی پێست و هەڵوەرینی مووباشە.
. هەروەها بۆ زۆر شتی تر.

نرخی گوێز:

لەساڵەکانی پێش حەفتاکاندا هەزاری گوێز بە (٢٥٠) فلس کەمتربوو، بەلاَم لە حەفتاکاندا بەرزبویەوە بۆ سەراوی (٢٥٠) فلس تا دینارێك رۆیشت لەهەشتاکاندا لەدینارێکەوە بۆ پێنج دینار رۆیشت.

لەساڵەکانی (١٩٩٢ ــ ١٩٩٦) هەزاردانە گوێز گەیشتە (٤٠٠) دینارێك لەوەو بەدوا دابەزی. ئەم ساڵ (٢٠٠٠) بە (٢٥٠ . ٣٠٠) دینار بوو.

جوانی دارگوێز: هەندێك لە شاعیران لەجوانی دیمەنی دارگوێز دا، هۆنراوەیان بۆ هاتووە، لەوانە (شێخ ئەمین نەقشبەندی ناسراو بەبێوەی) لە هۆنراوەیەکیدا لەبارەی دارگوێزەوە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| دار گوێزی پیری چەن ساڵە | واخۆی داوەتە ئەو پاڵە |
| تازە پاژەرەژ کردووە | خەمی دەروون لابردووە |
| ئەنازێ بەسایە و بەری | بەداری جوان وەک پەیکەری |
| هەماری ماڵە کوردانە | هەم خاوەن بەرە هەم جوانە |

ئەوە لەوەرزی بەهاران لەقەد پاڵان و بناران
ڕازێنەری دۆڵ و شاخە گەورە درەختی ناوباخە
ئاوی چەم پاوانەی زیوە لەقاچی دارگوێز ئاڵیوە[٢٤]

**دار توو:**

- خۆشترین میوەیە لەجیهاندا لە وڵاتانی بێگانەدا زۆر کەمە، زۆرترین دارە لە کوردستاندا[٢٥]

لە هەورامان بەتایبەت لەتەوێڵەدا، گرنگی‌یەکی زۆری پێ‌دراوە. داری توو، دارێکی گەورەیە بەڵام ناگاتە داری گوێز تەمەنیشی لەداری گوێزکەمترە. توو بەتۆو دەبێت و پاشان دەبێتە نەمام دەگوازرێتەوە بۆ شوێنی خۆی. توو لەتەوێڵەدا لەسەرەتای هاوینەوە پێ‌دەگات تا کۆتایی هاوین هەیە و ئەمێنێ.

- توو جۆری زۆرە، لەوانە:
- تووە بێ پێشە (بێ ناوك): تووی‌یەکی زۆر خۆش و بەتامە بەڵام بچوکە.
- تووە تارانی: تووی‌یەکی دەنگ گەورەو خۆش و شیرینە تۆوێکی گەورەی هەیە.
- تووە بەغدایی: تووی‌یەکی چاك و بەتامە و ناوکی بچوکە بەڵام دەنکەکەی گەورەیە.
- تووە ئەسفەهانی: تووەکەی زۆر جوان و گەورە و شیرینە.
- تووە خاڵۆیی: تووی سادەیە کەمێك شیرینە تا درەنگێ دەمێنێ.
- تووە کومەرەیی: دەنکی ئاسایی و شیرینە.
- تووە وردە: دەنکەکان بچوکن.
- تووە شامی: توەکەی شیرینی کەمە.
- تووە پایزە: لەسەرەتای پایزدا هەیە.
- تووە زڕە: کەسێ جۆرە، جۆرێکیان بەری نیە، دوو جۆرەکەی تر بەریان هەیە، بەرەکەیان باش نیە، جۆرێکیان تووەکەی سورە و کەمێك ترشە.

جۆرەکەی تریان تووەکە سپی‌یە و، کەمێك وردە، شیرین نیە، هەردوکیان لەهەموراماندا زیاتر بۆ ئاژەڵ بەکاردێن. تووە زڕە بەهەرسێ جۆریان پێوەبەند دەکرێن.

- شاتوو: ئەم تووە لەهەموو تووەکانی‌تر خۆش تر و بەتام ترە بەتەری و بەوشکی دەخورێت، شەربەتی خۆشی لێ‌دەکرێت. ئەم تووە کەمترە مەگەر لەباخێکدا تووی‌یەك دوودار تووبێت.

ئەو باخانەی کە داری تووویان زۆرە، لەوانە:

باخەکانی چەمی ئاوێسەر:

- باخی حاجی سەید محەمەد- باخی حاجی ئایزەی حەبیب لە لێژڵە- باخی ئایزەی فاتە لە شەمبانوو- باخی محەمەد حاجی حەمە ڕەحیم لەماوامی - باخی حەمەی کوێخا - باخی حاجی فەرەج - باخی مەلا نیزامە دین - باخی مەلا عەبدول ئەحەد- باخی حاجی محەمەد حاجی صادق - محەمەدی ڕۆستەمە...

باخەکانی چەمی دزاوەر:

- باخی حاجی حامد- باخی حاجی حەمەزەریف - باخی عەبدولرەحیم مەحمود. باخی حاجی مستەفا حاجی قادر- باخیعەبدولحامید - باخی فەرەج حەمە ئەمین - باخی حاجی تۆفیق نادر - باخی وەیسی ئەحمەد - باخی وەیسی ڕۆستم - باخی حەمە باقی غەفور

باخەکانی چەمی خوارەوە:

- باخی هۆمەر و حەمەی برای لە شەتنێ - باخی صادق حەکیم - باخی حاجی خدر - باخی عەبدوالله گوڵە - باخی وەلی حەمە لەتیف لە قاقوڵی - باخی ناجی مستەفا لە قاقوڵی - باخی قادر مەجنون لە (بێدەری) - باخی حاجی بابا لە (دەرەگای بیلا) - باخی حاجی حەمە ڕەحیم لەتیف لە (هاڵە کۆ) - باخی عومەر حەکیم لە (هاڵە کۆ)...

سوودەکانی دارتوو:

دارەکەی - داری توو چونکە درەنگ ئەپوێت و بەرگەی باران و سەرماو گەرما دەگرێت، بۆ دارەرای خانوو، بۆ خێزرە بۆ دیمەك و مرۆڵە و بۆ دەرگا و پەنجەرە و کورسی و وەسائلی دارتاشی و هتد، بەکاردێت. هەروەها بۆ سوتاندن گەڵای دارتوو بۆ خواردنی ئاژەڵ زۆرشە، هەروەها لەهاویندا سوود لە سێبەرەکەی وەردەگرێت.

بەری توو:

توو لەباخ کۆدەکرێتەوە و وشك دەکرێتەوە بە کوڵ یا بە ولاخ یا بەئۆتۆمبێل دەهێنرێتەوە بۆ بازار یا ماڵ، بەکیلۆ یا بەمەن یا بە تەغار دەفرۆشرێت (تەغارێك ٣٠ مەنە، کە دەکاتە ١١٢ کیلۆ) ئەو توووە بەفەردە باردەکرێت و دەبرێت بۆ سلێمانی و بە غدا

ئەوسا بەکاروان - توو دەبرا بۆ شارە زوور و گەرمیان و ماهی دەشت و، دراوە بەگەنم و جۆ و دانەوێڵە و کەشك و ڕۆنی خۆمانە ... هتد

توو لەکوردەواری بۆ زۆر نەخۆشی بەکاردێت لەوانە:

ـ پیاڵەیەك لەتوو لەگەڵ دوو پەرداخ ئاودا تێکەڵاو بکە و بیکەرە قۆریەکەوە و کولێکی بدە و، پاشان لەسەر ئاگر دایگرە، تا سارد دەبێتەوە پێش نانی بەیانی بەنیو سەعات، یەك پەرداخ لەو ئاوی تووە بخۆ، ئەمە بۆ ماوەی (٤٠) رۆژ بەردەوام بە بۆ نەخۆشییەکانی گەدە زۆرباشە.

ـ توو خۆی بەتەنها دەکوترێت و کەمێك ئاوی دەپرژێنێت دوایی وەك تۆبەڵە هەویری لێ دێت و بیخەیتە سەر(دومەڵ) زوتر پێدەگات.

ـ هەروەها بۆ شتیتر.

توو خواردنێکی زۆر بەکەڵکە[٢٦]:

توو یا ئەو خواردنەی کە ئاوێتەی توون و لەبەرهەمی توو دروست دەکرێن، لەتەوێڵە و ناوچەی هەوراماندا ئەمانەی خوارەوەن:

١ ـ بەری توو: توو خواردنێکە بەتەڕی و بەوشکی دەخورێت، شیرینە و بەتامە (.. خۆراکێکە کە هەندێك لەبەشەکانی خواردەمەنی تێدایە و بەدرێژایی رۆژگارێکی دوورو درێژ، شان بەشانی گەنم و جۆو دانەوێڵەی تر، خواردنی سەرەکی ئەم ناوچەیەبووە ... دنیا دیدەکان پشتاو پشت بۆمان دەگێڕنەوە، هەرکاتێك گرانی گەورە داکەوتبێ، ئەم ناوچەیە لەگرانیو قاتیوقڕانی بەدوور بووە ...

یەکەم بەرو دووەم بەری توو، بۆ خواردنی مرۆڤ ناشێن، چونکە تووەکە بەئاستەم شیرینە ... دوای وشکردنەوە لەبەر خۆر، هەڵدەگیرێت و، بۆ زستان دەدرێت بە ئاژەڵ و ڕەشە ولاخ و، ولاخی بەرزە.

لەدووەم بەر بەدواوە، بەدە رۆژ جارێك ئێواران دارەوانی باش و شارەزا، سەر دەکەوێتە سەر دارتووەکان، بەشوك و لەسەر خۆ ڕاوەشاندنی لق و پۆپەکان. تووی گەیوو و کۆ دەبێتەوەلە بن دار توەکان، کە بەباشی گسك دراوە و پاك کراوەتەوە ... بۆسبەینێ بەیانی ژنان و کیژان بەڕیز و لەسەر چیچکان، هەر لەبەرەوە، دەنك دەنك تووەکان دەچنەوە، کەسەبەتە و قولێەی گەورە پڕبوون، دەیانبەنە شوێنی تایبەتی و خۆشکراو و هێلەسا و کراو، کەپێی دەڵێن (سانالی). لەوێ تووەکە بۆ ووشککردنەوە لەبەر خۆر هەڵدەخەن ... پاشان هەر بەدوو رۆژ جارێك دەکرێت، تووە بلاوکراوەکە، دەستێکی تیوەردەدرێت و ئەم دیو ئەو دیو دەکرێت، بەم چەشنە حەوت تاهەشت ڕۆژ لەبەر خۆر دەمێنێتەوە تاپاش وشك دەبێت ... پاشان دەهێنرێتەوە بۆ ئاوایی ... دوای ئەوەی

لەسەربانی خاوێن و هێلە ساوكراو بلاوەكرێتەوە و بۆماوەی یەك رۆژ خۆرلێی دەدات، ئینجا دەكرێتە گوێنی و فەردەی خاوێنەوە و، هەڵدە گیرێت و تاچەند ساڵێكیش خراپ نابێت.

شایانی باسە، كە خەڵكی ئەم ناوچەیە، بەتایبەتی بەیانیان زوو دەچن بۆ تەڕە توو خواردن، بەدەگمەن لەكاتی تردا تەڕە توو دەخۆن، چونكە زۆر قورسەو، پلەی گەرمای لە شیش زۆر بەرز دەكاتەوە ...

٢ ـ سەكلە توو (سەكلەتفی): وشكە توو لەدۆلا دەكوترێت و بەهێڵەك والا بێژ دەكرێت، پاشان نمێك ئاو لە ئاردە تووەكە دەپرژێنرێت، ئینجا بە پەستاوتن توند لەهەمانەدا دادەگیرێت و بۆ وەرزی زستان هەڵدەگیرێت ئەوسا كەبەشەكر شكێن دەشكێنرێت و پارچە پارچەی لێ دەكرێتەوە ...

٣ ـ لەپارە: تووە وشكە و كاكڵەی گوێزی خاوێن و پوخت، پێكەوە لە دۆڵدا باش باش دەكوترێت، نمێك ئاو لە كوتراوە دەپرژێنرێت، لەگەڵ گوتاندا كوتراوەكە ئەم دیوو و ئەودیوو دەكرێت، تاكو باش باش یەك دەگرێت و دەبێتە شیرینیەكی زۆر توند و پتە و چەور زۆر بەتام و چێژ ... هەركەس ئەوەندەی ژێر پیاڵەیەكی لێ بخوات تاكوو ئێوارە هەست بەبرسێتی ناكات.

٤ـ كوتە: ئەم خواردنەنایابە لە قەزوانی ناسك و شین و تووی وشك دروست دەكرێت لەپێشەوە، تووە وشكە كە لەناو دۆڵدا دەكوترێت و دەكرێتە ناو تەشتێكەوە ... ئینجا باش، باش قەزوانەكە دەكوترێت ... دوای ئەوە تووە كوتراوەكە دەكرێت بەسەر قەزوانەكەدا و، دووبارە هەردووكیان پێكەوە لەناو دۆڵدا بەدەسكە دوڵ زۆر چاك دەكوترێتەوە، نمێك ئاویش لەكوتراوەكە دەپرژێنرێت و جوان جوان ئەم دیو و ئەو دیویشی پێ دەكرێت بۆ ئەوەی زۆرباش بچێتەوە یەك و پتەوبێت ... بەم جۆرە خواردنێكی زۆر باش و بەكەڵكی، زۆر پتە و شیرین و چەور و زۆر بەتام و چێژ و خۆش بۆت دێتە بەرهەم.

٥ ـ خۆشاو: تووی وشك دەكرێتە دەفرێكی خاوێنەوە و، بەئەندازەی پێویست ئاوی تێ دەكرێت، دوای سێ رۆژ بەشێوەیەكی زۆر خاوێن و باش تووە خوساوەكە دەگوشرێت و دەپاڵێورێت و ئاوەگیراوەكە تێكەڵ بەخۆشاوی میوەكانی تر دەكرێت و، تام و چێژەكەی خۆشتر دەكات.

٦ ـ دۆشاو: بەگوێرەی پێویستی یەك پێوانە تووی وشك و جوان، لەگەڵ دوو پێوانە ئاوی پاكدا، دەكرێتە مەنجەڵی خاوێنەوە و ماوەی سێ كاتژمێر

لەسەر ئاگرەکە دەمێنێتەوە بەیناو بەین بەکەوگیر و چەمچە تێك دەدرێن، ... ئینجا بەنانەشان یان بەهەر شتێکی‌تری گونجاو، تووەکە دەپاڵێورێت بۆ جاری دووەم تووەە کولاوەکە کەمێك دەکولێنرێتەوە و دەپاڵێورێتەوە و ئاوەکەی دەچۆڕێتەوە ... بەم چەشنە دۆشاوێکی خاوێن و بەتام و چێژ، وە بەرهەم دێت و دەکەوێتە مەشکە و شووشە و دەفری تایبەتەوە و هەڵدەگیرێت.

٧ ـ کولێرە بەدۆشاو: گونکە هەویر پان دەکرێتەوە و دەکرێتە ناو دۆشاوی تووی قوڵ بە قوڵەوە، دوای کەمێك ئەم دیو و ئەودیو پێکردن، جوان جوان سوور دەبێتەوە و دەردەهێنرێتەوە و بەرگەم و گوڕی گەلێك بە تامتر و بەچێژ ترە و تاماوەیەکی زۆر چێژەکەی لە بن ددانا دەمێنێتەوە.

٨ ـ دۆشاو و ڕۆن: ڕۆن و دۆشا و تێکەڵ دەکرێت و بەنانەوە دەخورێن، خۆ ئەگەر ڕۆنەکەی خۆماڵی بێت بەراستی خواردنێکی زۆر بەچێژترو بەکەڵکترو بەهێز تری لێدەر دەچێت.

٩ ـ بۆ خۆشکردنی چێشتی کاردو (خازی). دۆشاوی توو، یاریدە دەرێکی زۆر باشە و گەلێك خۆشتر و بەچێژتری دەکات.

١٠ ـ حەڵوای توو: تووی وشك لەدۆڵدا دەکوترێت و جوان جوان والابێژدەکرێت و، توویەکی پوخت و جوانی لێ دەگیرێت.. ڕۆنی خۆماڵی یان ڕۆنەکەرە، لەتاوەدا، داخ دەکرێت و کەم کەم ئاردە توو دەکرێتە ناو ڕۆنەکەوە، کەوچکی تێ وەردەدرێت و کە زۆر خەست بووە وە کەمێکیش ئاوی تێ دەکرێت و بەکەوچك ئەم دیوو ئەم دیوی پێ دەکرێت و باش باش دەشێلرێت، تاکو حەڵوایەکی زۆر خۆش و باش و نایابی لێ دەردەچێت.

١١ ـ لەوشکە توو، چکلێتی باش و نایابیش دروست دەکرێت ... هەروەها پسکیت و شیرینی لێ دروست دەکرێت

**داری تریّ ـ دار مێو:**

دارمێو دووجۆرە:

مێوی بەراو: ئەو دارمێوە یە کە ئاوی دەدرێت و وەك باقی درەختەکانی‌تر لەناو باخەکاندایە خۆی هەڵ دەواسێت بەیەکێك لەدارەکانی توو یا گوێز، هەڵوژە ...

لەتەوێڵەدا تەلانی وانیە کە هەر دارمێوی تیا بێت و بەس، بەڵکو تێکەلاو کراوە لەگەڵ درەختەکانی‌تر. بەری ئەمە زیاتر لە تەوێڵەدا بۆ خاوەن باخ خۆی دەبێت و بۆ فرۆشتن کەمتر هەیە.

مێوی دێم: بریتیی‌یە لەو دار مێوەی کە جگە لەئاوی باران ئاوی تری نادرێت ئەمە بە قەد پاڵی شاخەکانەوەیە بەمە دەوترێت ڕەزەدێم.

ڕەزە دێمەکان:

ڕەزە دێمەکان بریتین لەمانەی خوارەوە:

١ ـ ڕەزەکانی شوانگێڵ.

٢ـ ڕەزەکانی دەرە قازان

٣ ـ ڕەزەکانی قاقوڵی

٤ـ ڕەزەکانی سۆفی جانە

٥ ـ ڕەزەکانی وەزڵی

٦ـ ڕەزەکانی ویسورە

٧ـ ڕەزەکانی بێدەری

٨ ـ ڕەزەکانی بلچە دۆڵ

٩ـ ڕەزەکانی زەمینی هەیاس

١٠. ڕەزەکانی هانە کلەوەهارە

١١ـ ڕەزەکانی لاسی خەزان

١٢ـ ڕەزەکانی ڕاسایاریێ

١٣ ـ ڕەزەکانی قەدەغەی کۆرە

١٤ـ ڕەزەکانی دەرەتاریک

١٥ ـ ڕەزەکانی لیژڵە

١٦ـ ڕەزەکانی پشتی هانە کلە

١٧ـ ڕەزەکانی پشتی ماڵیدەر

١٨ـ ڕەزەکانی دەمی شێنا

١٩ـ ڕەزەکانی نسارەی چەمی دزاوەر

٢٠ ـ ڕەزەکانی خەڵەفی.

تێبینی: تریێی تەوێڵە بە گشتی باش و بەتامە، بەلام:

ـ تریێی ڕەزی شوانگێڵ زوو پیێدەگات و تریێکەی شیرینە و دەنکە تریێکەی وردە.

ـ تریێی ڕەزەکانی هانە کلە و زەمینی هەیاس درەنگ پیێدەگات و دەنکی گەورەیە و مزرە و خۆشە و ئاودارە، بۆ ترشیات و شەربەت زۆر چاکە.

جۆرەکانی تریێ لەتەوێڵە:

تریێ بەگشتی دوو جۆرە: تریێ ڕەشە و، تریێ سپی، زیاتر تریێی ڕەزە دێمەکان تریێ ڕەشەیە.

تریێی سپی جۆری زۆرە لەوانە:

ـ سادانی (سەعیانی): دەنکی قەڵە وە و ئاودارە.

ـ دۆشاوی (کەزایی): دەنکی درێژ و شیرینە بۆ دۆشاو بەکار دێت.

ـ دەرە بۆڵێ: کەمێك مەیلە و سوور و ڕەشە و بەتامیشە.

ـ سەرە قوڵە: کەمێك سور دەبێت.

ـ شلێێ: وردە وەك هەڵمات خرە.

ـ کشمیشی: بچوك و بیێناوکە.

- یاقوتی: دەنکی بچوکە و زوو پیٚدەگات و تۆووی هەیە.
- لەقلەق: دەنکی گەورەیە درەنگ پیٚدەگات.
- سنەیی: ترێیەکە ڕەش دەبێت و شیرین و بەتامە.
- زەردەڵیٚ: گەورەنیە و زەردباو و شیرینە.
- چیچیلیٚ: دەنکی بچووك و پڕە.
- بۆڵەقمیٚ: دەنکی گەورەیە.
- کوردە کوشیٚ: دەنکی درێژە و درەنگ پێدەگات.
- هوشەپەڕیٚ: هێشوەکەی پڕە.
- هەروەها ...

ڕەزەیم لەتەوێڵەدا زەحمەتی زۆرە، چونکە شوێنەکەی سەختە، بەکرێکار دەکێڵرێت، بۆ هێنانەوەی ترێکەشی بۆ ناو بازاڕ وماڵەوە بەسەبەتە، یابە کۆڵ یا بە وڵاخ دەهێنرێتەوە، ئەمەیش نارەحەتە و، ماندو بوونی زۆری دەویٚ، بۆیە بە زۆری دەکرێت بە مێوژ.

**مێوژ:**

ترێ کە دەڕنرێتەوە و کۆدەکرێتەوە، لە شوێنی تایبەت، دەخرێتە بەر هەتاو، یاخود هێشووە ترێکە هەڵدەکێشرێت بەو ئاوەوە کەلەناو مەنجەڵێك دایە لەسەر ئاگرە، وردە وردە ئاگری دەکرێت و خۆڵەمێشی تیا کراوە، ئەمەیارمەتی ترێکە دەدات زووتر وشك ببێت ئیتر دوایی دەهێنرێت دووسیٚ ڕۆژجارێك ئەم دیوو ئەو دیوو، دەکرێت تاباش وشك دەبێت، پاشان (چیلکە . ساق) ە کانی لیٚ لادەبرێت و پاك دەکرێت. دواتر دەکرێتە گونیەوە و دەفرۆشرێت.

ئەوسا خەڵکی تەوێڵە ترێ و مێوژیان بردوە بۆ گەرمیان و شارەزوور و، لەولاوە بۆ کرماشان و هەمەدان براوە و داویانە بە دانەوێڵە و وەسائلی تر- لەساڵەکانی پەنجاکان بەدواوە دەهێنرا بۆ سلێمانی و بەغدا ئەوەی جێگەی باس کردن بێت ئەوەیە:

ئەم سیٚ خواردنە (گوێز و توو و مێوژ) لەکاتی گرانی ڕۆڵێکی گرنگیان بینیوە بۆ خەڵکی هەورامان بەگشتی و تەوێڵە بەتایبەتی، چونکە مرۆڤ بۆ ماوەیەکی زۆر دەتوانیٚ بەم سیٚ خواردنە بژی، لەکاتی برسیەتیشدا مرۆڤ تێر دەبێت و درەنگ برسی دەبێت. ئەوسا خەڵکی تەوێڵە و هەورامان بەبەرهەمی باخەکان بەتایبەت ئەم سیٚ بەرهەمە خۆراك و پێداویستی تریان کڕیووە.

لەسەردەمانی پێش ئەوەی (موجەمیدە و سەلاجە) بێتە تەوێڵەوە، خەڵکی تەوێڵە میوەکانیان بەم شێوە هەڵدەگرت بۆ پایز و زستان و بەڵکو بۆ بەهاریش. بۆ نموونە:

ترێ بەهێشوو بەساقەکەیەوە لە ژووردا هەڵیان دەواسی یا لەسەر گەلاّیدار بەروو لە ژووری کەناردا دایان دەنا، وە یا هەر لە باخ

و رەزەکاندا لەناو ئەرزدا چاڵیان هەڵ ئەکەن بۆی، گەلاّی دار بەڕوو یان، ئەکردە بن و ئەم لا و لای و پریان دەکرد لە ترێ و دایان دەپۆشی، لەکاتی پێویستدا دەچوون دەریان دەهێنایەوە، وەك میوەیەکی تازە وابوو. هەروەها (هەنار و بەهێ و هەرمێ) ش بەهەمان شێوە یان لێ دەکرد.

**سەرچاوەی ئاوی باخەکان:**

سەرچاوەی ئاوی ئەم باخانە ـ جگە لەباران ـ بریتی‌یە لەو کانی و کارێزانەی تەوێڵە و دەوروبەری ئەو ئاوە بەهیچ شێوەیەك بەزایە ناڕوات، بەڵکو سودی لێ وەرگیراوە و باخ و باخانێکی زۆری لەبەردەم دایە.

سەرچاوەی ئاوەکان بەگشتی دەکرێن بەسێ‌بەشەوە:

**- سەرچاوەی ئاوی باخەکانی ئاوێسەر:**

بریتی‌یە لە ئاوی سەرچاوەکانی ئاوێسەر و ئاوی هانە کڵە. ئەم ئاوە لەبەر ئەوەی باخێکی زۆر لەبەردەمیایەتی هەندێ ساڵیش ئاو کەم بووە کێشەی دروست کردووە لەنێوان خاوەن باخەکاندا، بۆیە لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی قادر بەگدا لە کۆتایی بیستەکاندا[٢٧] لیژنەیەکی لەپیاو ماقوڵانی تەوێڵە پێك هێناوە[٢٨]، ئەو ئاوەی دابەش کردووە هەرباخێك ماوەیەکیان بۆ داناوە بۆ نۆرە ئاوی، ئیتر هەرکاتێکی بەرکەوتوە، شەو یا رۆژ لەوکاتەدا باخەکەی ئاوداوە ئەمەش بەپێی:

- زۆری و کەمی ڕووبەری باخەکە.
- جۆری خاکەکە حیساب کراوە، فشە و تەختە، خڕە و سەختە.
- نماوی ئەرزەکە و نزیکی لەکانی‌یەوە. یاخوود باخی وا هەیە لە ـ وەرە قاقە . یە واتە: هەتاوی زۆری لێ دەکەوێ و دوورە لەسەرچاوەکەوە، وەك (گلێجانێ و دەرە تفێ).
- دووری و نزیکی و ناسراویش لە لیژنە و دەسەلاّتدارەوە . کەمێك ـ دەوری بووە، هەر بۆیە وەك (حەمە لەتیف سەیفور) نۆباوەکەی کەم بووە سکالاّی خۆی بەشیعرێك دەباتە بارەگای قادر بەگ کەباس لەوەدەکات کە جیاوازی و

ناسراوی و دیاری بردن و ... ئەم جۆرە شتانە بوون، بەڵام ئەم چونکە پیاوێکی فەقیر بووە، ماوەی نۆباوەکەی (١,٣٠) سەعات و نیوێك دەبێت کەبە حیسابی (حەمە لەتیف) کەمە.. لەئەنجامدا قادر بەگ دووسەعاتی بۆ زیاد دەکات دەبێتە (٣,٣٠) سێ سەعات و نیوو:

حەمە لەتیف لەشیعرەکەی دا دەڵێ[٢٩]:

| | |
|---|---|
| (ئەحمەد) حاکما و، (سە ...) حەکەما | هەرکەس چایش نەبو،نۆباوش کەما |
| توکەی کە للێو قەن، یا گیراونکی و چای | تانوباویت بۆ، پیسە هامسای |
| ئەمن بامیە، چەنی گوشت گاوی | ئەتو گەرەکتا، بەمراد بیاوی |
| هەسەرەم نەبی، بارە لوبارو | پیسە (قاتەڵە) ی،ئاویت پێ بارو |
| (دێوانە) ی پۆکەی، نۆباوش خاسا | کەسەرەش یاوا، کەرینەو ماسا |
| (ئەحمەد) ی فەقیر، کونەکڵاودەڕ | کی کەردەن وەکیل، بەشکەرو بەشدەر |
| سەفیر کەسیوا، لانەخوا بۆ | بێ قەوم و عەشرەت، بێ ئەقرەبابۆ |
| مەعلوما (ئەحمەد)، صاحب ئەقرەبان | (کورە) و (کەموڵە) و(ئەڵڵاک) و (لەمان) |
| (عەزە) و (عیوەض) و،(بابالە) و (یاقۆ) | (قوڵە) مەشاوا، بەش بڕیان (بەڵکۆ) |
| (ئۆلقادر)پۆکەی،بەمراد یاوا | (حەسەن) قەن و چان،(سەلیم)پلاوا |
| داد و فەقیرا، ئینا دەس و تۆ | توچی قەبوڵتا، نۆباو پیسە بۆ |
| ئیسە (صاحیبا)، بدیە پەی دەمیم | نۆ باوم بیەن،بەهەڵس و چەمیم |

چەند تێبینی یەك لەسەر ئەم نۆباوە:

- وەختی خۆی لەبەرکەمی ئاوەکە و زۆری باخەکان کێشە زۆر دروست بوە بۆ باخەوانەکان، بەم دابەش کردنە ئەو کێشەیە نەماوە.ئەدمۆندس،لەم بارەوەڕەئی ئەندازیارێك دەردەبڕێت،کە لەهەورامی یەکان زیاتر،ناتوانێت بەشێوەیەکی ئەندازیاری ئەوجۆگایانەباشتر بکات.هەروەها،دەڵێ: ئاوەکە لەنێوان خاوەن باخەکان دا،بە سەعات لەهەفتەدا بەشکراوە،هەموو کەسێك مافی خۆی زانراوەو،دیاری کراوە، لەبەر ئەوەبەهیچ شێوەیەك، کێشەیان،لەم بارەوە نیە[٣٠].
- لەڕاستی دا حیساباتی باش کراوە بۆ دانانی ماوەی نۆباوەکە.
- دەتوانرێت بوترێت داد پەروەردانە بووە ئەو جیاوازیەش کەم بووە.
- ئەگەر جیاوازیەکەش بووبێت وەك ئەوەی (حەمە لەتیف) هەر چۆن بێت جەنابی قادر بەگ گوێی گرتووە بۆی، چووە بەدەم سکاڵاکەیەوە.
- ئازایی و جورئەتی (حەمە لەتیف) دەردەکەوێت.

- ئەم جۆرە ڕەخنە کۆمەڵایەتی‌یانە کۆمەڵگا بەرە و پێشەوە دەبەن.

ئەمەش بەدرێژی لیستی ئەو نۆباوەیە کەلەوکاتەدا کراوە و، دوایی لە (٣٠/ ٧/١٩٦٤) دا لیژنەیەکی تر پێکهێنراوە ئەم لیستەیان بە پوختی و ڕێك و پێکی - بێ گۆرانکاری . نووسیوەتەوە و هەموو ئیمزایان کردووە بەرێز (یوسف حاجی محەمەد) کراوە بەمیراوی ئاوەکە و سەرپەرشتی کردووە. ئەم لیژنەیە تەئکید کردنەوە بووە لەسەر بەردەوام بوون لەسەر کاری لیژنەی پێشوو ڕەزامەندیان دەرخستووە، چونکە هەندێ لەباخەکان فرۆشراون و یا خاوەنەکانیان مردوون و بەر نەوەکانیان کەوتوون.

ئەمەش ناوی جۆگە و باخ و خاوەن باخ و کاتی نۆباوەکەیە:

**نۆباوی باخەکانی ئاوێسەر[٣١] :**

تەرتیبی ئەم دامەزراندنی ئاوە، لەجۆگەی ماوامی یەوە، لەبەیانی ڕۆژی دوو شەممەوە، دەست پێ دەکات، پاشان جۆگەگانی تر دێن تاسەرەی ئەم دێتەوە...بەم شێوەیەی خوارەوە نۆباوی چەمی ئاوێسەر دابەش دەکرێت:

**یەکەم: جۆگەی ماوامی...** لەبەیانی دووشەممەوە،دەست پێ دەکات.

١- بەیانی دووشەممە سەعات لەسەردەستە، سەرەتای نۆبەئاوی، حاجی قوربانی و مەلاعەبدەو مەحمودی عەبدوڕەحیمە.تاسێ سەعات و نیو، لەدەستە بڕوات، واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە (٣،٣٠)سێ سەعات و نیو...محەمەد عەبدوڕەحیم ئیمزای کردووە وەك خاوەن باخ لەباتی خاوەن باخەکانی تریش.

٢- سێ سەعات و نیو، لەدەستەڕۆیی،نۆبەئاوی مەلامحەمەد و حاجیلە و باباڵەی یوسفە، تاحەوت سەعات و نیو لەدەستەبڕوات، واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٤)چوار سەعات...مەلا عارف ئیمزای کردووە،وەك خاوەن باخ.

٣- حەوت سەعات و نیو، لەڕۆژی دوو شەممە ڕۆیی،نۆبەئاوی وەستا محەمەدی وەستاقادرە،تاسەعات دەونیولەڕۆژی دووشەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣)سێ سەعات... مەحمودی وەستا محەمەد ئیمزای کردووە.

٤- سەعات لەدەو نیوی ڕۆژی دووشەممەوە، نۆبەئاوی باخی مەلا عەبدوڵڵەی مەریوانی‌بە، تا دوو سەعات و نیو لەشەوی سێ شەممە بڕوات. کەواتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤)چوار سەعات...حاجی کاکەبرا ئیمزای کردووە.

٥ـ دووسەعات ونیو لەشەوی سێ شەممە ڕۆیی، نۆبەئاوی کوڕانی وەستا نادرە (وەستا محەمەد ڕەحیم و وەستا محەمەد کەریم)، تاسەعات یازدەونیو لەشەوی سێ شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٩) نۆ سەعات ... محەمەدی وەستا حەمەڕەحیم ئیمزای کردووە.

٦ـ شەوی سێ شەممە نیوسەعاتی بمێنێ بۆدەستە نۆبەئاوی کوڕانی ئەسکەندەرە، تا سێ سەعات ونیو لەڕۆژی سێ شەممە بڕوات.

کەواتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤)چوار سەعات...ڕەشید حەمەئەمین ئیمزای کردووە.

٧ـ سێ سەعات و نیو لەڕۆژی سێ شەممە ڕۆیی،نۆبەئاوی کەرەی بابایە، تاوەکو پێنج سەعات و نیو لەڕۆژی سێ شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە (٢) دوو سەعات... مستەفای کەرە ئیمزای کردووە.

٨ـ پێنج سەعات وەنیو لەڕۆژی سێ شەممە ڕۆیی، نۆبە ئاوی محەمەد ئەمینی صۆفی سلێمانە، تا سەعات حەوت لەڕۆژی سێ شەممە. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(١,٣٠)یەك سەعات و نیو...ڕەشید حەمەئەمین ئیمزای کردووە.

٩ـ سەعات لەحەوتی ڕۆژی سێ شەممەوە،نۆبەئاوی فەرەجی یاقۆیە تاسەعات نۆ یەك چارەك کەم لەڕۆژیسێ شەممەبڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(١,٤٥)دووسەعات یەك چارەك کەم.

١٠ـ سەعات لەنۆ یەك چارەك کەم، لەڕۆژیسێ شەممە،نۆبەئاوی قالەی وەلیە، تا دە سەعات ونیو لەڕۆژی سێ شەممە بڕوات واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(١,٤٥)دووسەعات یەك چارەك کەم.

١١ـ سەعات دەونیوی ڕۆژی سێ شەممە، نۆبەئاوی عەبدوڵڵەی میرزایە، تاشەش سەعات و نیو لەشەوی چوارشەممەبڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە (٨) هەشت سەعات.

١٢ـ شەش سەعات و نیو لەشەوی چوارشەممە ڕۆیی، نۆبەئاوی فەتحەی خودادایە، تادە سەعات و نیولەشەوی چوارشەممەبڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤)چوارسەعات.

١٣ـ دەسەعات و نیو لەشەوی چوارشەممەڕۆیی،نۆبەئاوی ئەحمەدی وەهابە، تاسێ سەعات لەڕۆژی چوارشەممەبڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤,٣٠)چوارسەعات ونیو.

١٤ـ سێ سەعات لەڕۆژی چوارشەممە ڕۆیی، نۆبەئاوی مەلا بەکر و گیجانە، تا شەش سەعات ونیولەڕۆژی چوارشەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٣,٣٠)سێ سەعات ونیو.

١٥ـ شەش سەعات ونیو لەڕۆژی چوارشەممە بڕوات،نۆبەئاوی مەلا محەمەدە، تادەسەعات ونیو لەڕۆژی چوارشەممەبڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٤)چوارسەعات.

١٦ـ سەعات لەدەونیوی ڕۆژی چوارشەممەوە، نۆبەئاوی مستەفا مورادە تانیو سەعات لەدەستەبڕوات بۆشەوی پێنج شەممە. واتە نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٢) دووسەعات... مەهدی عەزیز وەك خاوەن باخ ئیمزای کردووە.

١٧ـ نیوسەعات لەشەوی پێنج شەممەڕۆیی، نۆبەئاوی کوڕانی حەمەباقی عەزیز دەلاکە، تادوو سەعات و نیو لەشەوی پێنج شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٢) سەعات.

١٨ـ دوو سەعات ونیو لەشەوی پێنج شەممە بڕوات، نۆبەئاوی بارام وەهابە تاشەش سەعات و نیو لەشەوی پێنج شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە (٤)چوارسەعات.

١٩ـ شەش سەعات ونیو لەشەوی پێنج شەممەڕۆیی، نۆبەئاوی کوڕانی لوتفەیە، تانۆسەعات لەشەوی پێنج شەممەبڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٢,٣٠)دووسەعات ونیو.

٢٠ـ لەسەعات نۆی شەوی پێنج شەممەوە،نۆبەئاوی کوڕی فەتحەیە، تادەسەعات ونیو لەشەوی پێنج شەممەبڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(١,٣٠)یەك سەعات ونیو.

٢١ـ لەسەعات دەونیوی شەوی پێنج شەممەوە،نۆبەئاوی فەرەجوالڵەی خالد ئاغایە، تایەك سەعات و نیو لەڕۆژی پێنج شەممەبڕوات.ئەم ئاوە لەجۆگەی قوڵە هەڵ دەکرێ،پاشماوەی ئەو ئاوەش لەسەرچاوگ هەڵ ئەکرێ تاکۆتایی دێت. کەواتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣) سێ سەعات لەگەڵ پاشماوەی ئاو... مەهدی عەزیز وەك خاوەن باخ ئیمزای کردووە.

**بەم شێوەیە ئاوی جۆگەی ماوامی تەواوبوو.**

دووەم: **جۆگـەی قوڵـە** ـ عـەینی ئـاوی سەرچـاوگەی گەورە ـلەڕۆژی پێنج شـەممەوە دەسـت پـێ دەکـات، دەبـێ بشـزانین لێـرەدا ئـاوی هانـەدێواو ئـاوی حەصار،لەم جۆگەیە تەرکە.

١ـ یـەك سـەعات ونیولـەڕۆژیپێنج شـەممەڕۆیی،نۆبەئاوی عـەزەی مارفـە، جۆگەی قوڵە تاتەلانی شێخ حسامەدین، ئەمەش تا پێنج سـەعات و نیولە ڕۆژی پێنج شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە (٤) چوار سەعات.

ـ لێرەوە باسـی جۆگـەی قوڵـە نیـە، باس لـەئاوی حەصـار و هانـە دێوانـە ئەکەین، (ئەمە جوملەی موعتەریزەیە).

٢ـ سـەعات لەیـەك ونیـوی ڕۆژی پێـنج شـەممەوە،نۆبـە ئـاوی شـێخی حسامەدینە، تا سەعات دەی هەمان ڕۆژ.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لـە (٨,٣٠) هەشت سەعات ونیو...ئەسکەندەر سان ئەحمەد ئیمزای کردووە.

٣ـ لـە سـەعات دەی ڕۆژی پێنج شـەممەوە،نۆبە ئـاوی بـاخی هەیبـەکری شڵەیە، تا دووسەعات ونیـو لەشـەوی هـەینی بڕوات.واتـە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٤,٣٠) چوار سەعات و نیو...ئەسکەندەر سان ئەحمەد ئیمزای کردووە.

٤ـ دوو سەعات ونیولە شەوی هەینی بـروات.نۆبەئاوی عـەزیزی بابایـە،تا سەعات حەوت لەشەوی هـەینی بڕوات.واتـە: نۆباوەکـەی بریتـی یـە: لە(٤,٣٠) چوار سەعات ونیو.

٥ـ لەسـەعاتی حـەوتی شـەوی هەینی،تاسـەعات یـازدەونیوی شـەو، نۆبەئاوی حامدو سـان ئەحمـەدە.واتـە: نۆباوەکەی بریتـی یـە: لە(٤,٣٠) چوار سەعات ونیو...ئەسکەندەر سان ئەحمەدیش ئیمزای کردووە.

٦ـ لەکۆتایی سەعات یازدەونیوی شەوی هـەینی یەوە،دائەخرێ بۆباخچە میرا کەباخی قادربەگە.

ـ لێرەوەئەمە باسێکی ترە،باس لەئاوی هانەکڵەی شەکەرێ دەکەین.

٧ـ سەعات لەیەك و نیوی ڕۆژی پێنج شەممەوە،نۆبەئاوی ماوەزای شێخ حیسامەدین و حـاجی قوربـانی و حـاجی حەمەیوسفە، تاسـێ سـەعات لـەڕۆژ بڕوات واتـە: نۆباوەکەی بریتـی یـە: لە(١,٣٠)یـەك سـەعات ونیـو. ئەسـکەندەر سان ئەحمەد ئیمزای کردووە.

٨ـ ئاوی هانە کڵەی شەکەرێ، لەسەعات سێ،ڕۆژی پێنج شەممەوە، نۆ بـەئاوی مـاوەزای حامد،وەسـان ئەحـمـەد، وەمـەحمودی عەبـدوڕەحیم، وەمـەلا

عەبدەیە، تاسەعات دەی ڕۆژی پێنج شەممە.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٧) حەوت سەعات ...ئەسکەندەرسان ئەحمەد ئیمزای کردووە.

- دووبارە، بێینەوە سەر باسی جۆگەی قوڵە کەلە پێشەوە باسی کرا.

٩- لە سەعات پێنج ونیوی ڕۆژی پێنج شەممەوە، نۆبە ئاوی عەبدولحەکیم و عەبدولقادرە، تا سەعات دەی ڕۆژ. واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٤,٣٠) چوار سەعات ونیو...حەیدەر عەبدولحەکیم ئیمزای کردووە.

١٠- لە سەعات دەی ڕۆژی پێچنج شەممەوە، نۆبە ئاوی کوڕانی مەحمودی بابایە، تا سێ سەعات لە شەوی هەینی بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٥) پێنج سەعات.

١١- سێ سەعات لە شەوی هەینی بڕوا، نۆبە ئاوی باخی یاقۆیە، تا سەعات هەشتی شەوی هەینی. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٥) پێنج سەعات.

١٢- لە سەعات هەشتی شەوی هەینی یەوە، نۆبە ئاوی عەزیزی باباو حەمە حسێن شوانە، تا جومعاو دائەخرێ بۆ باخچە میرا، باخی قادر بەگ. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,٣٠)سێ سەعات ونیو.

١٣- لە کۆتایی شەوی هەینی یەوە، نۆبە ئاوی باخچە میرایە، تا دە سەعات ونیو لە ڕۆژی هەینی بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(١١)یازدە سەعات.

**سێهەم: جۆگەی گلێجانە:** لە ڕۆژی هەینی یەوە دەست پێ دەکات.

١- ڕۆژی هەینی سەعات لە دەونیو، ئاوی عۆدەی مارفەو سەید فەتحەیە، تادوو سەعات یەك چارەك کەم، لە شەوی شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,١٥)سێ سەعات ویەك چارەك.

٢- شەوی شەممە سەعات دوو یەك چارەك کەم، نۆبە ئاوی باخی محەمەد ئاغایە، تا هەشت سەعات لەشەوی شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە (٦,١٥) شەش سەعات و یەك چارەك.

٣- لە سەعات هەشتی شەوی شەممەوە، نۆبە ئاوی سلێمانی وەیسی و عەوبدوڵڵەی میرزاو حەمەیوسف ڕێحانەیە، تا سەعات یازدەی شەوی شەممە. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣)سێ سەعات.

٤ـ لە سەعات یازدەی شەوی شەممەوە، نۆیە ئاوی باخی یوسوڵەیە،تا دووسەعات ونیو لە ڕۆژی شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەكەی بریتی یە: لە(٣,٣٠)سێ سەعات ونیو.

٥ـ دووسەعات ونیو لە ڕۆژی شەممە ڕۆیی، نۆبە ئاوی بلەگلەو حاجی حەمە یوسویە، تاسەعات شەش. واتە: نۆباوەكەی بریتی یە: لە (٣,٣٠)سێ سەعات ونیو.

٦ـ شەش سەعات لە ڕۆژی شەممە ڕۆیی، نۆبە ئاوی كوڕانی حەبیبەیە، تا چوار سەعات ونیو لە شەوی یەك شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەكەی بریتی یە: لە(١٠,٣٠)دە سەعات ونیو.

٧ـ چوار سەعات ونیو لە شەوی یەك شەممە ڕۆیی، نۆبە ئاوی اللەوەیسی ڕەحمانە، تا سەعات شەشی هەمان شەو.واتە: نۆباوەكەی بریتی یە: لە(١,٣٠) یەك سەعات ونیو.

٨ـ سەعات شەش لە شەوی یەك شەممەوە،نۆبە ئاوی باخی سەید فەتحەیە، تاسەعات یازدەو نیو لە شەوی یەك شەممەبڕوات.واتە: نۆباوەكەی بریتی یە: لە(٥,٣٠)پێنج سەعات ونیو.

٩ـ لە سەعات یازدە و نیوی شەوی یەك شەممەوە،نۆبە ئاوی محەمەد ئەمینی عەزیز ئاغایە،تا دوو سەعات لە ڕۆژی یەك شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەكەی بریتی‌یە: لە (٢,٣٠)دووسەعات و نیو.

١٠ ـ ڕۆژی یەك شەممە دووسەعات لە دەستە بڕوا،نۆبە ئاوی باخی ڕەحمانی بلەیە، تا پێنج سەعات لەڕۆژی یەك شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەكەی بریتی یە: لە (٣)سێ سەعات.

١١ـ سەعات پێنج لە ڕۆژی یەك شەممەوە،نۆبە ئاوی باخی حەملەی مەجیە، تا سەعات هەشت یەك چارەك كەم.واتە: نۆباوەكەی بریتی‌یە: لە(٢,٤٥) دوو سەعات و سێ چارەك... محەمەد ڕۆستەم ئیمزای كردووە.

١٢ـ سەعات هەشت یەك چارەك كەم لەڕۆژی یەك شەممەوە،نۆبە ئاوی باخی حاجی عەبدولوەهابە،تا یازدە سەعات و نیولەڕۆژی یەك شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەكەی بریتی‌یە: لە(٣,٤٥)چوار سەعات یەك چارەك كەم.

١٣ـ ڕۆژی یەك شەممە سەعات لە یازدەو نیو،نۆبەئاوی باخی حاجی محەمەدە، تا سێ‌سەعات یەك چارەك كەم لە شەوی دووشەممە بڕوات.واتە:

نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,١٥)سیٚ‌سەعات ویەك چارەك...حاجی بابا حاجی محەمەد ئیمزای کردووە.

١٤ـ سیٚ سەعات یەك چارەك کەم لەشەوی دوو شەممە ڕۆیی،نۆبە ئاوی ڕەحمان مستەفایە،تا سەعات شەش یەك چارەك کەم.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٣) سیٚ سەعات... مودەڕیسی تەوێڵە ئیمزای کردووە.

١٥ـ شەوی دووشەممەسەعات شەش یەك چارەك کەم،نۆبە ئاوی باخی کوڕەی کەریمە،تا نیو سەعات لەدەستە بڕوا لە ڕۆژی‌دووشەممە.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٦,٤٥)حەوت سەعات یەك چارەك کەم.

١٦ـ ڕۆژی دووشەممە نیو سەعات لە دەستەبڕوات،نۆبە ئاوی باخی مەلا عەبدوالله‌یە، تایەك سەعات ونیو لە دەستە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(١) یەك سەعات.هەروەها،پاشماوەی‌ئاویشی هەیە تالە جۆگەی‌جانبازهەڵ ئەکریٚ.

**چوارەم: جوگەی جانباز**...لە ڕۆژی دووشەممەوە دەست پیٚ دەکات.

١ـ ڕۆژی دووشەممە یەك سەعات ونیو لە دەستە بڕوا، نۆبە ئاوی باخی قالە کەڕو نالەو قەدەمی ژنی مەحمودە، تا پیٚنج سەعات ویەك چارەك لە ڕۆژی دووشەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,٤٥) چوار سەعات یەك چارەك کەم...مەحیەدین محەمەد وەك خاوەن باخی ئیٚستا ئیمزای کردووە.

٢ـ سەعات پیٚنج وە یەك چارەك لەڕۆژی دووشەممە بڕوا، نۆبە ئاوی کوڕانی مەلا عەبدولکەریمە،تا سەعات نۆ یەك چارەك کەم.واتە: : نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٣,٣٠) سیٚ سەعات و نیو.

٣ـ ڕۆژی دووشەممە سەعات نۆو یەك چارەك کەم بڕوا، نۆبە ئاوی باخی حاجی حەمەیوسفە، تا سیٚ‌سەعات وەیەك چارەك لە شەوی سیٚ شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٦,٣٠) شەش سەعات ونیو...فاضل حەمە صاڵح ئیمزای کردووە.

٤ـ سیٚ سەعات ویەك چارەك لە شەوی سیٚ شەممە ڕۆیی، نۆبە ئاوی باخی مەلا عابدە، تا حەوت سەعات وەیەك چارەك لە شەوی سیٚ شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤) چوار سەعات. یەك سەعاتی بۆ عەبدولحەمیدە.

٥- شەوی سێشەممە سەعات حەوت وەیەك چارەك، نۆبە ئاوی فەتەی ڕۆستەم وخودادای مەمەو ڕەحمانی مارفە، تا سەعات نۆو یەك چارەك.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٢) دوو سەعات.

٦- شەوی سێ شەممە سەعات نۆو چارەك، نۆبە ئاوی صادقی مستەفایە، تا دەسەعات ونیو لەشەوی سێشەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(١,١٥) یەك سەعات ویەك چارەك. هەروەها پاشماوەی ئاویش هەیە تا دائەخرێ.

**پێنجەم: جوگەی داڵیتان**...لە شەوی سێ شەممەوە دەست پێ دەکات.

١- شەوی سێ شەممە سەعات دەو نیو بڕوات، نۆبە ئاوی باخی مەلا عەبدەیە، تا یەك سەعات ونیو لەڕۆژی سێشەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٣) سێ سەعات.

٢- یەك سەعات ونیو لە ڕۆژی سێ شەممە بڕوات،نۆبە ئاوی باخی عمرەیە لەگەڵ مزگەوت،تا سێسەعات وە یەك چارەك لە ڕۆژی سێشەممە،بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(١,٤٥) یەك سەعات وسێ چارەك... مەهدی عەزیز ئیمزای کردووە.

٣- ڕۆژی سێ شەممەسەعات سێو یەك چارەك،نۆبە ئاوی فەرەج کوڕی حەمە حسێنە، تا سەعات حەوت لەڕۆژی سێ شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٣,٤٥)چوارسەعات یەك چارەك کەم.حەمەحسێن حاجی فەرەج ئیمزای کردووە.

٤- سەعات لەحەوتی ڕۆژی سێ شەممەوە،نۆبەئاوی باخی کوێخا محەمەد ئەمینە، تا سەعات دەو چارەکی ڕۆژی سێشەممە.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,١٥) سێ سەعات ویەك چارەك.

٥- ڕۆژی سێ شەممە لەسەعات دەو یەك چارەك، نۆبەئاوی کوڕانی فەتاح مەجەو حەکیم خەسرەوە،تایەك چارەك لەشەوی چوارشەممەبڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٢)دووسەعات.

٦- شەوی چوارشەممە یەك چارەك لەدەستەبڕوا،نۆبەئاوی باخی مەلا نظامە، تاسەعات چواری شەوی چوارشەممە.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,٤٥) چوارسەعات یەك چارەك کەم.

٧- لەسەعات چواری شەوی چوارشەممەوە،نۆبەئاوی سلێمانی وەیسی‌یە، تاسەعات شەش و چارەك لەشەوی چوارشەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی

یە: لە(٢,١٥) دوو سەعات و یەك چارەك.هەروەها پاشماوەی ئاویش...جەعفەر حەمەصاڵح ئیمزای کردووە.

٨ـ سەعات شەش وەیەك چارەك لەشەوی چوارشەممە بڕوا، نۆبەئاوی کوڕانی مەلاعەبدوڵڵەی مەلاجەلیلە،تاسەعات هەشت وەیەك چارەك لەشەوی چوارشەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٢)دوو سەعات.

**شەشەم: جۆگەی شەمبانو**...لەشەوی چوارشەممەوە دەست پێ دەکات.

١ـ شەوی چوارشەممە سەعات هەشت ویەك چارەك، نۆبەئاوی ئایزەی فاتەیە، تایەك چارەك لەدەستەبڕوات لەشەوی چوارشەممە.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٤)چوارسەعات.عەزیز فاتە وەك خاوەن باخ ئیمزای کردووە.

٢ـ سەعات یەك چارەك لەدەستەبڕوا لە ڕۆژی چوارشەممە،نۆبەئاوی باخی ئەحمە دەشەل و ڕۆستەم حەکیم و حەمە حسێنی شانازە، تاچوارسەعات و یەك چارەکی ڕۆژی چوارشەممە.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤)چوار سەعات.

٣ـ لەسەعات چوارو چارەکی ڕۆژی چوارشەممەوە،نۆبە ئاوی باخی وەستا حەمەڕەحیم و کەریمی کۆرەیە، تاسەعات هەشت و چارەکی ڕۆژی چوارشەممە. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤)چوار سەعات...محەمەدی وەستا حەمەڕەحیم ئیمزای کردووە.

٤ـ لەسەعات هەشت و چارەکی ڕۆژی چوار شەممەوە،نۆبە ئاوی کوڕانی هەیبەکر و کوڕانی حەمەعەزیزی خضرالیایە،تا سەعات سێ چارەك لەشەوی پێنج شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤,٣٠) چوارسەعات ونیو.

٥ـ شەوی پێنج شەممە سێ چارەك لەدەستە بڕوات.نۆبەئاوی باخی کوێخا محەمەد ئەمین و کوڕانی حاجی حەمەکەریمە،تا سێ سەعات و نیو لەشەوی پێنج شەممەبڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٢,٤٥)سێ سەعات یەك چارەك کەم... محەمەد حاجی حەمە ڕەحیم ئیمزای کردووە.

٦ـ سێ سەعات و نیو لەشەوی پێنج شەممەڕۆیی، نۆبەئاوی باخی حاجی حەمەڕەحیمە، تا سەعات دێتەسەر دەستە بەیانی پێنج شەممە. واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٨,٣٠) هەشت سەعات ونیو...محەمەد حاجی حەمەڕەحیم وەك خاوەن باخ ئیمزای کردووە.

**حەوتەم: جۆگەی شانە زەرا...** لەڕۆژی پێنج شەممەوە دەست پێ دەکات.

١- ڕۆژی پێنج شەممە سەعات لەسەر دەستە،نۆبەئاوی محەمەد ئەمین قادره، تاچوارسەعات و نیو لەڕۆژی پێنج شەممەبڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٤,٣٠) چوارسەعات ونیو.

٢- چوار سەعات ونیو لەڕۆژی پێنج شەممە بڕوا، نۆبە ئاوی باخی حەمەحسێن مستەفاو میرزا عەبدولقادره،تانۆسەعات ونیولە ڕۆژی پێنج شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٥) پێنج سەعات.

**هەشتەم: جۆگەی باخچەمیرا...** لەڕۆژی پێنج شەمەوە دەست پێ دەکات.

١- لە سەعات نۆو نیوی ڕۆژی پێنج شەمەوە،نۆبەئاوی باخی حاجی صادق و فەتاح مەجیدە،تادووسەعات یەك چارەك کەم لەشەوی هەینی بڕوا. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤) چوار سەعات.

٢- سەعات دوو یەك چارەك کەم لەشەوی هەینی یەوە، نۆبەئاوی کوڕانی کۆزاد ومەلا بەکرو حەمەخانە، تاشەش سەعات وەیەك چارەك لەشەوی هەینی بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤,٣٠) چوارسەعات ونیو.

٣- سەعات شەش وەیەك چارەك لەشەوی هەینی ڕۆیی، نۆبەئاوی باخچە میرایە، تاپێنج سەعات وەیەك چارەك لەڕۆژی هەینی بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(١١) یازدە سەعات.

**نۆهەم: جۆگەی دێ ـ مالێدەر...** لەڕۆژی هەینی یەوە دەست پێ دەکات.

١- ڕۆژی هەینی لە سەعات پێنج و چارەکەوە، نۆبەئاوی باخی قوربانی‌یە، تاهەشت سەعات و نیو لەڕۆژی هەینی بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,١٥) سێ سەعات و یەك چارەك.

٢- لەسەعات هەشت و نیوی ڕۆژی هەینی یەوە،نۆبە ئاوی باخی مەلا عەبدولئەحەدە، تا نیو سەعات لە شەوی شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤)چوار سەعات.

٣- شەوی شەممە سەعات لە دەستە ڕۆیی، نۆبە ئاوی حسێنی وەیسی‌یە، تا سێ سەعات لە شەوی شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٢,٣٠) دوو سەعات ونیو.

٤- شەوی شەممە لە سەعات سێ‌وە، نۆبە ئاوی فەتەی ڕۆستەمە، تا شەش سەعات و سێ‌چارەك لە شەوی شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی‌یە: لە(٣,٤٥) چوار سەعات یەك چارەك کەم.

٥ـ شەوی شەممە سەعات حەوت یەك چارەك کەم، نۆبە ئاوی باخی خوداداو محەمەدی حاجی محەمەدرەحیم ومیرزا عەبدولقادرە، تا سەعات دە. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,١٥) سێ سەعات ویەك چارەك.

٦ـ لە شەوی شەممە سەعات دەوە، نۆبە ئاوی صادق مستەفا وە کوڕانی حەمە سەعیدە،تا یەك سەعات ونیو لەدەستە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,٣٠) سێ سەعات ونیو.

٧ـ ڕۆژی شەممە یەك سەعات وەنیو لە دەستە ڕۆیی، نۆبە ئاوی ڕەحمان مارف و حاجی صادقە، تا پێنج سەعات وەنیو لە ڕۆژی شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤) چوار سەعات.

٨ـ ڕۆژی شەممە سەعات پێنج ونیو، نۆبە ئاوی کوڕانی حەمە یوسف جانبەخشە، تا نۆ سەعات ونیو لە ڕۆژی شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٤) چوار سەعات.

٩ـ لەسەعات نۆو نیوی ڕۆژی شەممەوە، نۆبە ئاوی باخی عیوەز مارفە، تا سەعات دێتە سەردەستە.واتە: نۆباوەکەی بریتییە: لە(٢,٣٠) دووسەعات و نیو.

١٠ـ شەوی یەك شەممە سەعات لەسەر دەستە، نۆبە ئاوی کوڕانی حەمە لەتیفە، تا سێ سەعات ونیو لە شەوی یەك شەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,٣٠) سێسەعات ونیو.

١١ـ شەوی یەك شەممە لە سەعات سێو نیوەوە، نۆبە ئاوی باخی وەستا حەمە صاڵحە، تا سەعات حەوتی شوەی یەك شەممە.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,٣٠) سێ سەعات ونیو.

١٢ـ لە سەعات حەوتی شەوی یەك شەممەوە، نۆبە ئاوی کوڕانی محەمەدیوسف و وەستا محەمەدە، تا سێسەعات ویەك چارەك کەم لە ڕۆژی یەك شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٧,٤٥) هەشت سەعات یەك چارەك کەم... حاجی سەلیم ئیمزای کردووە.

١٣ـ سەعات سێ یەك چارەك کەم لەڕۆژی شەممەوە، نۆبە ئاوی کوڕانی مەحمودی بابالەیە تا سەعات دەو یەك چارەك لە ڕۆژی یەك شەممە بڕوات.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە (٧,٣٠) حەوت سەعات ونیو.

١٤ـ سەعات دەو یەك چارەك لە ڕۆژی یەك شەممە بڕوا، نۆبە ئاوی مەلا محەمەدو زلێخاو یەك تەلانی بابالەیە تا یەك چارەك لە شەوی دووشەممە بڕوات.

واتــە: نۆباوەکــەی بریتــی یــە: لــە(٢) دووســەعات... حــاجی ســەلیم ئیمــزای کردووە.

١٥- شەوی دووشەممە یەك چارەك لە دەستە بڕوا، نۆبە ئاوی باخی میرزا عەبدولقادرە، تا چوار سەعات یەك چارەك کەم لە شەوی دووشەممە بڕوات. واتــە: نۆباوەکــەی بریتــی یــە: لە(٣,٣٠) سێ سەعات ونیـو... حـاجی سـەلیم ئیمزای کردووە.

١٦- سەعات چوار یەك چارەك کەم لەشەوی دووشەمەڕۆیی،نۆبەئاوی باخی کەرەم حسێنە،تاحەوت سەعات وەیەك چارەك لەشەوی دووشەممە بڕوات. واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٣,٣٠) سێ سەعات ونیو...حاجی عەلی حسێن ئیمزای کردووە.

١٧- شەوی دووشەممە سەعات حەوت وەیەك چارەك ڕۆیی،نۆبە ئاوی الله کەرەم حەملەیە تا سەعات دە یەك چارەك کەم لەشەوی دوو شەممەبڕوا.واتە: نۆباوەکەی بریتی یە: لە(٢,٣٠)دووسەعات ونیو.

١٨- شـەوی دووشـەممە سـەعات دە یـەك چـارەك کـەم ڕۆیی،نۆبـەئاوی حەسـەن اللەکـەرەم وەسـەعیدی قوتـەر و کوڕیحەمەسـادقە، تـا سـەعات دێتـە سەردەستە. واتـە: نۆباوەکەی بریتـی یـە: لە(٢,١٥)دوو سەعات ویەك چارەك، هەروەها پاشماوەی ئەو ئاوەی کەلەجۆگەی ماوامی هەڵئەکرێ.

**دەهــەم: ئــاوی هانەکلـەی ئیـبراهیم زەڕیـن**...لەڕۆژی دووشـەمەوە دەست پێدەکات.

١- باخی ئازیزە غـەفورەوحاجی عـەلی کوڕی حسێن، نۆباوەکـەیان (١٦) شازدە سەعاتە.

٢- باخی سەید فەتحە عیبارەتەبەحاجی صەلاحە، نۆباوەکەی (١٢)دوازدە سەعاتە.

٣- باخی قەدەمی ژنی مەحمودە،نۆباوەکەی (٧) سەعاتە.

٤- باخی حـاجی حەمەیوسف و حەمەحسێن یوسف،نۆباوەکەیان (١١) یازدە سەعاتە.

٥- باخی مەلا عەبدولمەجید،نۆباوەکەیان (١٢)دوازدە سەعاتە.

٦- ماوەزای حاجی حەمەیوسف و حەکیم حاجی قوربانی، نۆباوەکەیان (١٠) دەسەعاتە.

٧- دووبارە ماوەزای حاجی حەمەیوسف و مزگەوت، نۆباوەکەیان (١٠) دە سەعاتە.

**ئاوی جومعا و بۆ باخەکانی سەربە ئاوی هانە کڵە:**

- لەسەعات (١١,٣٠) بۆ باخی حاجی عەلی حسێن وە ئازیزە غەفورە تا سەعات (٢,٣٠).
- وە لە سەعات (٢,٣٠) بۆ باخی حاجی سەید (طه ها) وە شەفیع ئەلە تا سەعات (٤,٣٠).
- وە لەسەعات (٤,٣٠) بۆ باخی دەروێش مەحیەدین وە فایق حەمە صاڵح تا سەعات (٦,٣٠).
- وەلەسەعات (٦,٣٠) باخی عابد نادر وە ئەحمەد حاجی بابا لە وەحاجی حامد تا سەعات (١٠).
- وە لە (١٠) بۆ باخی مزگەوت وە عەبدوالله عوسمانە تا سەعات (١١).

بۆ ئاگاداری برایانی بەڕێز[٣٢]:

تکایە لەهەموو لایەك ئەکەین کە بەپێ‌ی ئەم دابەش کردنە بجوڵێنەوە، وە هەرکەسێك گوێ بەم بەشکردنە نەدا وەبەپێچەوانەوە بجوڵێتەوە ئەدرێت بەدادگا بۆ سزادانی، وە دیسان تکاتان لێ ئەکەین کە کەس خۆی تووشی سزا نەکات.

میراوی چەمی ئاوێسەر
یوسف حاجی محەمەد
١٩٦٦/٥/٢٦

**پێڕستی جۆگەکان**

| ز | ناوی جۆگە | ڕۆژ | سەعات |
|---|---|---|---|
| ١ | جۆگەی ماوامی | دووشەممە | لەسەردەستە |
| ٢ | جۆگەی قوڵە | پێنج شەممە | ١,٣٠ |
| ٣ | جۆگەی گڵێجانە | جومعە | ١٠,٣٠ |
| ٤ | جۆگەی جانباز | دووشەممە | ١,٣٠ |
| ٥ | جۆگەی داڵیتان | شەوی سێ شەممە | ١٠,٣٠ |
| ٦ | جۆگەی شەمبانو | شەوی چوارشەممە | ٨,١٥ |
| ٧ | جۆگەی شانەزەرا | پێنج شەممە | لەسەردەستە |
| ٨ | جۆگەی باخچە میرا | پێنج شەممە | ٩,٣٠ |
| ٩ | جۆگەی دێ ماڵیدەر | جومعە | ٥,١٥ |
| ١٠ | جۆگەی هانە کڵە | دووشەممە | |

«٤٦»

هانەکلەی ابراهیم زەرینی

| ت | روژی دوو سەمە | دقیقە و ساعات | اضافەی فاوەدن باغ |
| --- | --- | --- | --- |
| ١ | باغی آزیزه غفور و حاجی علی کوری حسین شازده سه عات | ١٦ ر — شازده سعات | |
| ٢ | باغی سید فتحه عبارەت بە حاجی صلاحه دوازده سه عات | ١٢ ر — دوازده سعات | |
| ٣ | باغی قەدەمی آزنی محمود هەوت سه عات | ٧ ر — هەوت سعات | |
| ٤ | باغی حاجی حمه یوسف و حمه حسین یوسف یازده سه عات | ١١ ر — یازده سعات | |
| ٥ | باغی ملا عبدالمجید دوازده سه عات | ١٢ ر — دوازده سعات | |
| ٦ | ماوه زای حاجی حمه یوسف وه حکیم حاجی قوربانی ده سه عات | ١٠ ر — ده سعات | |

«٤٧»

هانەکلەی ابراهیم زەرینی

| ت | | دقیقە و ساعات | اضافەی فاوەدن باغ |
| --- | --- | --- | --- |
| ٧ | أیضاً ماوه زای حاجی حمه یوسف وه فرزگه ورت ده سه عات | ١٠ ر — ده سعات | |

دەستخەتی ئەو دەفتەرەی کەلەساڵی ١٩٦٤ دا تازە کراوەتەوە بۆ نۆباوی ئاوی ئاوێسەر

ئەم تێبینیەی خوارەوە لەودەفتەرەی کەلەساڵی (١٩٦٤)دا نوسراوەتەوە هەیەبۆیە ئێمەش بەباشمان زانی لێرەدا بینوسین:

- لەپاش ئەوەی کە ئەم تەرتیبی نۆبە ئاوی چەمی ئاوێسەرە گوێزرایەوە ناو ئەم دەفتەرە لجنەیەك پێك هات لە پێش حضوری مەلا صاحیبا هەردوکیان مقابلەکران بەبێ غەڵەط وە بریاریاندا لەسەری - و لجنەکەش ئەم خاوەن باخانەی خوارەوەن.

وە ئەگەر خیلاف بوو أصل حساب ئەکرێت ١٩٦٤/٧/٣٠

١- مەلا صاحب - مدرس طوێڵە.

٢- مەهدی عەزیز.

٣- حاجی مەحمود مصطەفا.

٤- ئیسماعیل مەلا بەکر.

٥- محەمەد حاجی محەمەد ڕەحیم.

٦- محەمەد عەبدو ڕەحیم مەحمود.

٧- حاجی عەلی حسێن.

٨- فائق حاجی حەمە صاڵح

٩- ئەسکەندەر سان ئەحمەد.

ئەم خاوەن باخانە لە رۆژی ٣٠/ تەموز /١٩٦٤ بریاریان لەسەری دا.

والسلام

**سە رچاوەی ئاوی باخەکانی چەمی دزاوەر:**

ئاوی ئەم باخانە سەرچاوەکەی هەر دوو چەمی هامنۆ و مەرە - چەمی هامنۆ لە ڕۆژهەلاتی دزاوەرەوەیە تا دێتە خوار دێی دزاروەر. هەرکانی دێتە سەر. چەمی مەریش کە دەکەوێتە رۆژئاوای دێی دزاوەرەوە هەر لەسەرەوەتا دێتە خوار، کانی دێتە سەر، هەردوکیان لە خوار ئاوایی، یەکەوە لەسەر سنوری (تەوێڵە - عێراق) و (دزاوەر - ئێران) دا یەك دەگرنەوە و دەبنەیەك چەم، لەخاکی تەوێڵەدا. ئیتر لەوێوە تا دێتە ناوەراستی بازاڕی تەوێڵە هەم کانی دێتە سەر هەم جۆگەی لێ هەڵدەبەستن بۆ باخەکان.

ئاوی ئەم چەمە لەزستان و بەرهاردا تەواو زۆرە و لافاوێکی زۆری لێ هەڵدەستێ. لەبەردەم مزگەوتی گەورەی تەوێڵە دا لەگەڵ چەمی ئاوێسەردا یەك دەگرنەوە و دەبنەوە بەیەك چەم و بەناو بازاڕی تەوێڵەدا بەرە و خوار بۆ لای خانەقا و گەریات دەڕوات.

**نۆباوی باخەکانی چەمی دزاوەر:**

ئاوی ئەم چەمەش لیژنەی تایبەتی ،بۆ تەرتیب کراوەو،ئاوە کە بە ڕێکو پێکی دابەش کراوە،دۆکۆمێنتەکەوەك لەدواتردا باس کراوە.

لەمانگی ڕەبیعی یەکەم ،ساڵی(١٣٤٦ ك)، بەرامبەر بە ساڵی(١٩٢٧ ن)،بە دەستنوسی میرزا ئۆلقادری تەوێڵەیی بووە، بەزمانی فارسی نوسراوەتەوەو، لەلایەن بەڕێز حاجی اللەکەرەم حاجیتۆفیق . وە،وەرگیراوەو پارێزگاری کراوە، لە(٢٥/ ٧ /٢٠٠٠) بەڕێز: مامۆستا محەمەد عەبدوڕەحیم مەحمود- لەفارسییەوە وەری گێڕاوەتە کوردیو بەڕێنوسی کوردی، ئەم سەردەمە نوسیویەتیەوەو، لەدەفتەرێکدا پارێزراوە.

ئێمەش، کاتێك زانیمان،ئەم نوسراوە لای کێیە، لەشەوی (٢٠٠٢/١٢/١٦)، چوینە خزمەتی بەڕێزو کەسایەتی ناسراوی تەوێڵە- حاجی اللەکەرەم . سەرەڕای وەلأمدانەوەی چەند پرسیارێك لە سەرتەوێڵەو خەڵکەکەی، ئەم دەفتەرو نوسراوەکۆنەی کەباسی ئەم نۆباوانەی چەمی دزاوەردەکەن داینێ و ئێمەش وەك،پێویست سودمان لێوەرگرت و والێرەدا بڵاوی دەکەینەوە.زۆر سوپاس و ڕێزمان هەیە بۆ جەنابی حاجیاللەکەرەم بۆئەوهاوکاری کردن و هاندانەی کەبۆئەم کارە کردی لەگەڵماندا،نمونەیان زیاتربێت.

وێنەی نوسخە ئەصلیەکەی نۆباوی چەمی دزاوەر

ئەوەی شایەنی باس بێت لێرەدا ئەمەی خوارەوەیە:

ـ دەقەفارسی یەکەی چەند وشەیەکی دڕاوە ناخوێنرێتەوە، بەلأم لەڕستەکەدا ماناکەی دەردەکەوێت.

ـ کوردی یەکەی مامۆستا محەمەدمان وەك، سەرچاوەیەك سود لێ وەرگرت نەك هەر وەك،خۆی نقڵی بکەین.بێگومان ئەمەش لەبەرئەوە بوو کەسەرچاوە ئەصڵی یە فارسی یەکە مان لەلا بوو، وە وامان بەباش زانی.

ماموستا محەمەد عەبدورەحیم، لەپێشەکی یەکەیدا دەڵێت: ئەم دابەشکردنەی ئاوی چەمی دزاوەر، کەنوسراوەتەوە، بەدەست نوسێکی زۆر پیرۆز وەبە زمانی فارسی، وەلەبەر ئەوە ئەوکاغەزە کۆن بووبوو،بەپێویستمان زانی کە جارێکی تر بنوسرێتەوە، لەسەر لاپەڕەو وەرەقی تازە،بۆئەوەی کەڵکی لێ وەربگیرێت، لەچەند ساڵیکی تری داهاتوو دا، وەبەهیچ گۆڕینێك وەهەر وەکو خۆی بەکوردی داڕێژرایەوە.

ئەم نوسراوەکەدابەشکردنی ئاوی چەمی دزاوەرە، لای برای دڵسۆز- حاجی اللەکەرەم حاجیتۆفیق - بوو، وەبەئەمانەت پارێزگاری کردبوو،وێنەی هەرزۆربێت.

من کە(محەمەدعەبدورەحیم مەحمود)ئەودەستنوسە فارسیەم وەرگێڕاوە، بەزمانی کوردی، ئەم ئیشە وەئەم وەرگێڕانە بەئەرکێکی زۆر پیرۆزم زانی و خستمە سەر ئەستۆی خۆم ، چونکە بەپێویستم زانی هەتاوەکو،خەڵکی تەوێڵەی بەشەرەف بەتایبەتی خاوەن باخەکانی چەمی دزاوەر،سود و کەڵکی لێ وەربگرن، لەپاشەڕۆژی دوایدا. ئیتر ئومێدەوارم کە جێگای ڕەزامەندی هەموان بێت.

والسلام علیکم

دڵسۆزی هەموان

محەمەد عەبدورەحیم مەحمود تەوێڵەیی

(٢٢-٢٥/٧/٢٠٠٠)

ئەمەی خوارەوە پێشەکی دەقی فارسی یەکەیە بەکوردی:

بسم اللەالرحمن الرحیم

بەئامادە بوونی خاوەن باخەکانی چەمی دزاوەر،لە تەوێڵەوەبەشاهدی و بەخەتی میرزا عەبدولقادر محەمەد یوسف،ئەمەیخوارەوە نوسراوە:

بەنیازی ڕەزامەندی خوا، لەساڵی (١٣٤٦ك)یەك هەزار و سێ سەدوچل وشەشیکۆچی ،مانگی ڕەبیعی مەولود ، بەپێی فەرمانی جەنابی قادربەگ - شعاع الممالك ــ بەمەبەستی ئاسایشی میللەت و لابردنی ناکۆکی، و بەسەرپەرشتی جەنابی عەبدولغەفاربەگ فەرماندەی چەنگ، وەکۆمەڵێك لەخاوەن خبرە، ئاوی چەمی دزاوەر دابەشکرا، لەنێوان خاوەن باخەکانیتەوێڵەدا.

چەند شەوانە و ڕۆژ، زەحمەتمان کێشاوە،وەك لەخوارەوە دەردەکەوێ، هەمووڵا هەقی دراوەتێ، بەبێ‌لادان و مەیلدان بەلایەك دا، ئاوە کە دابەشکراوەو هەر باخێ بەئەندازەی خۆی، بەش ونۆبەو ڕۆژو سەعاتی خۆی، بۆ دیاری کراوەو ڕازی بووە پێی.دوای ئەمەهەر کەسێك سەر پێچی بکات،لەم دابەشکردنەو، ڕازی نەبێت پێی، ئەوە بەر لەعنەتی هەمیشەیی خوایی بکەوێت و، وەدەشکەوێتە بەر لۆمەوتانەی خەڵکیو، وە دەشکەوێتە بەر سزای سیاسەتی حکومەتی وەختەوە.

**جۆگەی‌یەکەم:**

ئەم جۆگە بەسەرجۆ بەناوبانگە،کەدەکەوێتەژێر ڕێگەی‌دزاوەرەوە،بەم جۆرەش ئاوەکە دابەشکراوە بەسەر باخەکان دا: -

١-باخی حەملەخانم: -

سەرلە بەیانی ڕۆژی شەممە(طلوعی فەجر)تایەك سەعات ونیو لەدەستە بڕوات، کەبریتی‌یە: لە سێ‌سەعات و نیو،هەقی نۆباوی‌حەملە.

٢-دووبارەباخی حەملەو حاجی‌عەزیزو بابالەی حەملە: -

ڕۆژی‌شەممەدوای‌سەعات یەك ونیو،دوو سەعات ونیو،هەقی ئەو سێ پارچە باخەیە، واتە: تادەبێتە سەعات چوار.

٣-باخی سەلیمەکەڕەوباخی بابالەی‌یوسف: -

ڕۆژی شەممەلەسەعات چواری سەر لەبەیانی،هەتاوەکووسەعات شەش، کەبریتی یەلەدوو سەعات ماوەکەی،هەقی‌ئەودوو پارچەیەیە بەیەکەوە.

٤-حەسەن اللەکەرەم: -

ڕۆژی شەممەلەسەعات،شەشەوە،تا سەعات نۆ،کەبریتی‌یە: لە سێ سەعات، نۆبە ئاوی ئەوباخەیە.

٥-باخی ئیمام حەمە سور،وە باخی منالآنی سێلە خالد: -

ڕۆژی شەممەلە سەعات نۆوە،تا سەعات یانزەونیو ،کەبریتی‌یە: لەدوو سەعات و نیو هەقی‌ئەوان.

٦-دووبارە باخی حەسەن اللەکەرەم،وە باخی ئەحمەدەگوشی،وە باخی قالە کەڕ، وەباخی نالەی صاڵحە: -

لەسەعات یانزەو نیوڕۆژی شەممە،هەتا سەعات دوو ونیوی‌شەوی یەك شەممە، نۆبەئاوی ئەوباخانەیە،کەهەمووی بریتی‌یە: لەسێ‌سەعات.

٧- دوو بارە باخی حەسەن اللەکەرەم و منالآنی سێلە: -

بووە، مەلا مارفی مەلا عەبدوڵڵای مەریوانی دەڵێ : من لەوکاتەدا گەنج بووم چەند ڕۆژێك چووم لەگەڵیاندا.

[٢٩] ئەم شیعرانەمان لەوەستا محەمەدی حاجی حەمە صاڵح وەرگرتووە، بەڵام لەلای مەلا عەبدولکەریمی مەلا ئەحمەدی قازی بەم شێوەیە بوو.

قادربەگ ئەتۆ،بدیە پەی دەمیم　　نۆباوم بیەن، بەهەڵس وچەمیم

موڵکم زەردبیەن، تەژنەوئاویشا　　چەمەو ئاوێسەر،هەم وەرواوێشا

(م...)هەرگزیر، تاتەش هەرگزیر　　کەی ڕەوا بیەن،گزیر بۆ وەزیر

(سەید) مێزەرەش،شاڵێ سۆزەنە　　بنۆ درەخنیش،سەرجەم حۆزەنە

(کورە) و (کەموڵە)،(باباڵە)و(یاقۆ)　　مەست ئاوا(قوڵە)،بەش بڕیان (بەڵکۆ)

لالۆ و لالۆزان،مەتیەو مەتیەزان　　ئاوێسەر بدیـــە،تـادەرە قـازان

نۆباوشا خاسا، پـیان وئازان　　..............................

نۆباو و(دێوانە)ی،ئەپۆکەی خاسا　　ئەوەڵش کەرینەو،ئاخرش ماســا

(عەزە)ن و(عیوەن)،(سەلیم)،(حەماڵە)　　(شەمبانو)وەنە،خاسا(باباڵـــە)

هەروەها،ئەم شیعرانەی خوارەوەش لەوەستا محەمەد و دەروێش لەتیفی وەستا محەمەدو مەلا عەبدولکەریمی مەلا ئەحمەدی قازییەوە،وەرم گرتووە:

دەگێڕنەوە موسا ناوێك لەو سەردەمەدا، تەتەری عوسمانلی بووە،سمێڵ زلێك بووە، بەزۆر بەخەڵکی تەوێڵە ئاو دەباتبۆ ڕەبایەیەکی ئەو کاتەی عوسمالی یەنان کەبە سەر شاخی پشتی مالێدەرەوە بووە.جا موسا لەسەر ڕێگەی ئاو بەرەکاندا دەوەستێو کوتەکێکی بە دەستەوە دەبێت،هەر کەسێك لەوێوە کە ئاوی بردوەدەبوایە سەلامێکیشی بکردایە بۆ موسای قوماندار، ئەگینا کوتەکێکی بەر کەوتووە ... جادەڵێن: حەمەلەتیف کوتەکێکی بەرکەوتووە، بۆیە دەچێت بۆلای گەورەی سەربازەکانی ئەو کاتەو ئەم شیعرە دەڵێت کە شکاتی موسا دەکات:

سمێڵی موساوە سەد لیرەی لەك　　من قەد نەمدیووە، زەفتیەو کوتەك

ئاغە بنوارە، من چەندە زلـم　　کونە یەکیان ناوە،بۆ تەقەی ملـم

کەوشی نوێژیم، پڕبووە قـوڕاو　　هۆشم نەماوە،لێی بکەم ســلاو

مەر مەنێ برنج، بۆم بکەی پـلاو　　تاهۆشم بێ تۆ، لێی بکەم سـلاو

---

زەفتیە-عەسکەر-پۆلیس　　لەك-پارەیە　　بۆتەقە-پشت مل

(٣٠) كردوترك وعرب سى. جى.ادموندز. ترجمة جرجيس فتح الله ص.

(٣١) دەقی نووسینەكە هەموو وەك خۆی نووسراوەتەوە،تەنها هەندێ لە ڕێنووسەكەی گۆڕاوەتە سەر ڕێنووسی هاوچەرخ، ئەو كەسانەش كەئیمزایان كردووەلەوكاتەدا خاوەنی ئەوباخانە بوون. هەرچەندە لەباسی نۆباوەكەدا هەندێكی‌یان ناویان نی‌یە.

(٣٢) بەڕێز یوسفی حاجی‌محەمەد دەڵێ: لەدەفتەرەكەدا باسی ئاوی(هانەكڵە) نەبووە.ئەمەی ئێستا كەلەم دەفتەرەدانووسراوەتەوە،لیژنەكەی ئەم دواییە ئەمەی تەرتیب كردووە.

(٣٣) بەڕێز مەلا عەبدولكەریمی مەلا ئەحمەدی‌قازی دەڵێ:

بیستومەكە لەسەردەمی (خان ئەحمەدخان)دا،ئەم جۆگە هەڵكەنراوە. هەروەها م.هۆشمەن دەڵێ: جۆگەی قوڵەش لەچەمی ئاوێسەر لەسەردەمی خان ئەحمەدخان هەڵكەنراوە لەو كاتەدا،حسێن لهۆنی میرزای بووە،باوكی یاقووەسور ئاوەدانی كردووەتوە.

(٣٤) هەروەها ناوبراو(مەلا عەبدولكەریم)دەڵێ: صۆفی.... مەبەست لە صۆفی ئەحمەدە كەبابا گەورەی ئێمە بووە،ئەو بردوویەتی‌یەوە،گوایا ئەم صۆفی ئەحمەدە لە سەڵوەت ئاوای سنەوە هاتووە بۆ تەوێڵە

(٣٥) ڕاوكردن بنەمای ئابوری نیە لەتەوێڵەدا،بەڵام لەبەر سێ هۆ لێرەدا نووسیمان:

أ. لەبەرئەوەی ڕاوكردن، واتە: ڕاوی ئاژەڵ، ویستمان لەبەشی ئاژەڵداری جیای نەكەینەوە.

ب. ڕاوكردن،بۆ ڕاوچی كەمێك جێگەی ئابوری دەگرێت.

ج. لە هەندێ شوێن دەبێتە بنەمای ئابوری.

(٣٦) العراق الشمالی. د.شاكر خصباك ل٣١٠.

(٣٧) الاكراد - دراسة جغرافية اثنوغرافية - د.شاكر خصباك ل -٢٢٦.

(٣٨) لە(عەممانەوە بۆ ئامێدی) گەشتێك بەكوردستانی باشووردا - عەلی سەیدۆ گەورانی

(٣٩) لەسەر قسەی حاجی سەید محەمەد كە خۆی ئەمەی بۆ گێڕامەوە.

(٤٠) لە وەستا محەمەدی حاجی حەمە صالح ئەم زانیاریەم وەرگرت دەربارەی هەردو حەمامەكە.

(٤١) گۆڤاری كاروان ژ- ٧- ل -١٢٨.

[٤٢] هەمان سەرچاوەی پێشو هەمان لاپەڕەش.

[٤٣] شاری سلێمانی - ئەکرەم مەحمود صالح ڕەشە - ل (   )

[٤٤] کەمان - لەهەندێ ناوچە - لبیان - ی پێدەڵێن، وەك هێڵەك وایە بۆئەوەی نەچەقن بەکاری دەهێن و پێی دەخەنەسەر.

[٤٥] شاکرفەتاح لەکتێبی (گەشتی هەڵەبجەو هەورامان)ە کەی دا - ل (٣٦،٢٤)دا کەلە (١٩٣٣/٨/٢١)دا گەشتەکەی کردوە دەڵێ ئەمانەلە تەوێڵەدابوون...

قەیسەری یەك، سێ چوار چایخانە، چەند دوکانێکی تر، دوو سێ سەر شۆرك (حەمام)، خانەقایەك و دوو مزگەوتی زۆرنایاب، حوجرە یەك و خوێندنگایەکی چوار پۆلی و کڵاش درو، چەقۆ کەر ،ئاسنگەر ، دارتاشی یەجگار هونەرمەند لەتەوێڵەدا هەبوون، ڕەنگە نزیکەی (١٥)مەکینەی بەرگ دورینم تیاژماردبێ...

[٤٦] بێگومان لەساڵەکانی ئەیلول دا، تەوێڵە بنکەو بارەگایەگی شۆڕشی زۆرتیابوو، ئەمەش بۆخۆی کاری گەری هەبووە.

[٤٧] لەشوێنی خۆیاندا باسی ئەوانەکراوە، کە مەعاش خۆری میری بوون وەك مامۆستا یان و کارمەندان و ...

# تەوێڵە لەرووی ئاینیەوە

- تەوێڵە مەڵبەندی خواناسان بووە.

* هێمای ئیسلامەتی لە تەوێڵە دا.

* مزگەوتەکانی تەوێڵە

- مزگەوتی گەورە
- مزگەوتی باساکا
- مزگەوتی کاك عەلی فەیرۆز
- مزگەوتی بابا ئەسکەندەر
- مزگەوتی فەقێ ئەحمەد
- حوجرەکەی مەلانەزیر یا قاپی شێخ
- خانەقای تەوێڵە

* وەقفەکان

* شەخصەکان

* چلەخانەکان

* بنەماڵە ناودارە ئاینییەکان

- بنەماڵەی شێخان

= شێخ عوسمان سراجەدین

- شێخ محەمەد بەهائەدین
- شێخ عەلیحیسامەدین
- شێخ ئەحمەد

= شێخ عەبدولڕەحمان ئەبولوەفا

= شێخ عومەر ضیائەدین

- شێخ نەجمەدین
- شێخ عەلائەدین
- شێخ عوسمان سراجەدینی دووەم
- شێخ ئەحمەد شەمسەدین

* بنەماڵەی سەیدەکان

- سەید فەتحول موبین (سەیفەتحە)
- حاجی سەیدتەها
- مامۆستا سەیدعەبدولڕەحمان
- مامۆستا سەیدعەبدولخالق
- حاجیسەید محەمەد
- مامۆستا سەیدڕەشاد

* بنەماڵەی زانایان (مەلایان)

* بنەماڵەی مەلانەزیری گەورە

- مەلانەزیری گەورە
- مەلاصاحب

* بنەماڵەی مەلا سەلام

- مەلایاسین
- مەلاعەبدواللەی مالێدەر

* بنەماڵەی مەلامەحمود

- مەلاعەبدواللەی چلانە

* بنەماڵەی مەلاحەکیم

- مەلاحامد
- بنەماڵەی مەلا شێخ عەلی
- مەلاشێخ حەیدەر

* مەلا عەبدواللەی مەریوانیو نەوەکانی

- محەمەدی مەعروف ناسراو بە مەلامارف

* کوڕی یوسف داود تەوێڵەیی

* بنەماڵەی مەلاصادقی تەوێڵە

* فەقێ عەلی

# تەوێڵە لەڕووی ئاینییەوە

لەپێشتردا باسی هەورامانمان کرد لەڕووی ئایینەوە، تەوێڵە وەك ناوچەیەکی هەورامان ئەو باس و خواسانە دەیگرێتەوە. تەنها ئەوەندە هەیە لەشارۆچکەو گوندەکانی دەوروبەری تەوێڵەدا شوێنەواری ئاتەشگا هەیە وەك: پاوەو خانەگاو هەورامانی شار و بیارەو...هتد. کەئەم ئاتەشگایانە ڕەمز وهێمان بۆ ئاینی زەردەشتی کەلەو ناوچەیەدا پەیڕەوی کراوە، بەلاّم- شوێنەواری ئاتەشگا- لەتەوێڵەدا نیە.

هەروەها، لەتەوێڵە یەك شوێن هەیە بە (قەلاّی گاوران)بەناوبانگە، جائەم وشەیەش دوومانا هەڵدەگرێ:

مامۆستا حەمەئەمین هەورامانی لەزاری زمانی کوردی ل(٣٦)دا دەڵێ:

(لەناوچەکانی کوردستان دا، (گاور- گەبر) ناوزۆرە، چونکە هەر لەدێرزەمانەوە ئەم ناوە چەسپاوە بەسەر ناموسڵمان دا، واتە: لەسەرەتای هاتنی دینی ئیسلامیدا بۆ ناوچەکانی کوردستان، ئەمەش هەندێ لەوانەن:

دەگا و گاورا، لەدەگاشێخان، بیرەوگاورا و قەلاّو گاورا، لەهەورامانی تەخت) واتە:

بەم جۆرەبێت گاور، ناموسڵمان.. کافر، دەگەیەنێ کەلەوانەیە لەوشەی (کافر)ەوە هاتبێ.

مانایەکی تریش هەڵدەگرێ، کەزۆرجار لەباتی (مەسیحی) بەکاردەهێنرێت و تایبەت دەکرێت بەوانەوە.

بەهەرحاڵ ئەم ناوە... قەلاّی گاوران.. یاتایبەتە بۆ (مەسیحیەت) یابەگشتی بۆ کافران بەکار هاتووە. ئیتر ئەم کافرانە! مەسیحین یا زەردەشتی یاخود... نازانرێ!!

ئەو شوێنەوارانەش، کەلەدەرەی (تەرتیباو لیژڵەو ماوامی)دا، هەن بەڵگەیەکی وانادەن بەدەستەوە کەدەگەڕێنەوە بۆ چ سەردەم و ئاینێك.

ئایا ناشتنی ئەم مردوانە بەپێی ئاینی زەردەشتی بووە یاخود ئاینی تر بووە! لەڕاستیدا کەسێکیوا شوێنەوارناس نەگەڕاوە لەم ناوچەیەدا تاوەکوو گۆشەیەکی مێژووی ئاینی ئەم ناوچەیە دەربخات بۆمان کەلەڕاستیدا پێویست دەکات کەلیژنەیەکی تایبەت هەڵسێت بەتاوتوێ کردنی ئەم شوێنەوارانەی کوردستان، تاوەکو هەندێك لەڕاستییەکانی مێژوو یەکالاّ بکەنەوە بۆمان و بیانخەنە ڕوو.

**تەوێڵە مەڵبەندی خواناسان بووە:**

وەك دەردەکەوێ تەوێڵە هەرلەکۆنەوە مەڵبەندێکی گرنگی (عارفان)بووە، ئەوەتا یەکێ لەزانایان، تەوێڵەی بە (موطن العارفین) ناوبردووە.[1] واتە مێژوویەکی ئیسلامی هەیەو لەزووەوە جێگەی خواناسان بووە.

هەربۆیە لەم سەردەمەی دوایش دا کۆمەڵێك زاناو پیاوچاکی تری تیاهەڵکەوت کەبەهۆیانەوە، بوو بەناوەندێکی زانست و تەصەوف و پەروەردەی ئیسلامی. وای لێهات لەهەموو لایەکەوە ڕوویان تێکرد، تەنانەت لەهندستان و تورکیا و ئێران و سوریا و بەغدا و بەشەکانی تری کوردستان وەك سنە و هەولێر و گەرمیان و ..هتد.

هەرئەم زانا و شێخ و پیا و چاکانە بوون، لەتەوێڵەوە چوونەتە بیارە و دوو ڕووەو... خوێندگا و خانەقای وایان داناو کردەوە کەبوونە... ئەزهەرێك بۆ کوردستان، بەڵکو کاریگەری خۆیان هەبووە لەسەر ڕابوونی ئیسلامی بەگشتی لەکوردستان دا.

هەرئەم خوێندنگا و مەڵبەندە پەروەردە ڕۆحیانەی تەوێڵە و بیارە و خەرپانیو عەبابەیلە و پریس بوون، وایان کرد کەهەڵەبجە ببێتە شارێکی ئیسلام پەروەر و کۆمەڵە ئیسلامییەکان لەهەڵەبجەدا سەرهەڵبدەن.[2]

*** هێمای ئیسلامەتی لەتەوێڵەدا:**

بێگومان کەبمانەوێت دینداری و موسڵمانیەتی خەڵکی تەوێڵە بزانین، دەبێت باس لەپیرو بابا و شێخ و سەیدو مەلا و فەقێکان بکەین... دەبێت باس لەمزگەوت و خانەقا و حوجرە و چلەخانەکان بکەین... دەبێت باس لەژیانی کۆمەلایەتیو ڕامیاریو مێژووییو ئەدەب و هونەری بکەین...

لەمێژووی ژیانی ناودارو پیاوچاکەکانی.. لەمێژووی دروستکردنی پەرستگاکانیو.. لە لێکۆڵینەوە لەڕەوشت و هەڵس و کەوت و خواپەرستی خەڵکەکە و کۆنیو زۆری مزگەوت و خانەقا و حوجرەکانیش شتێکیترە، ئەمانە هەموو ئینجا باری ئاینی ناوچەکە دەردەخەن. بۆ ئەم هێمایەش دەڵێن:

بوونی ئەو هەموو پیر و بابا و زانا و شێخ و سەیدانە لەدەڤەرەکە، بوونی ئەو مزگەوت و خانەقا و حوجرە و بەردەنوێژانە..، وەقف (تەرخان)کردنی ئەو دارگوێزانە بۆ مزگەوت و خانەقا و حوجرە و جومعە و میوانانە..، بوونی ڕەوشت و ئیجابیاتی کۆمەلایەتیو گوزەرانی ژیانێکی ئاسودە لەدەڤەرەکە...، کۆڕیو زیکری خانەقا و جمەی فەقێی حوجرە و ئالودەیی خەڵکەکە بەمزگەوت

و..هتد. ئەمانە بەڵگەو هێمایەکی دیار و ئاشکران لەسەر دینداریو ئاینپەروەریو موسڵمانیەتی خەڵکی تەوێڵە.[٣] بۆیە بەپێویستی دەزانین ئاماژە بەمانەی خوارەوە بکەین:

### * مزگەوتەکانی تەوێڵە :

مزگەوتی گەورە- جامعە.

مێژووی ئەم مزگەوتە بەتەواوی نازانین، هەرچەندە لەدەمی پیاوە بەتەمەنەکانەوە دەبیسترێ کە (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) دروستی کردوە، بەڵام بەڵگەیەکی وامان دەست ناکەوێت بۆڕاستیو سەلماندنی ئەمە[٤] ئێمە هەرئەوەندە دەڵێین مێژووی ئەم مزگەوتە کۆنەو دەگەڕێتەوە بۆسەرەتای گەیشتنی ئیسلام بەناوچەکە..دواتر (قادربەگ) سەر لەنوێ تێکیدەدات و[٥] دروستی دەکاتەوە.

وەستای دروستکردنەوەی ئەم مزگەوتە (وەستا حەمەئەمینی وەستا عەبدوالله) بووە، بۆ تەختە بەندو کۆڵەکەکانیشی وەستا (عەبدوڵڵەی دارتاش) بووە.

ڕووبەری حەرەمی ئەم مزگەوتە (١٧×١٧) مەتر بووە، لەلای ڕاستیەوە مەدخەلێکی گەرەی هەبوو(٤×١٧) مەتر بوو ئەم مەدخەلە هەم لەجێگەی نوێژ کردن و هەم لەکونجێکەوە داری سوتەمەنیان بۆ مزگەوتەکە تیا دادەنا... ئەرزی ئەم مەدخەلە و سەقفەکەیو سەقفی حەرەمی مزگەوتەکە هەموو تەختە بەندێکی جوان و ڕێك و پێك کرابوو.

مزگەوتی گەورە - لەلایەن یەکگرتووی ئیسلامی کوردەوە دروست کراوەتەوە

ناو حەرەمی مزگەوتەکە (٢٠) کۆڵەکەی بۆ بەکار هاتبوو کەوەستا عەبدوڵڵا بۆ ژێری کۆڵەکەکان خەڵوزی بەکار هێنا بوون بۆ ئەوەی نەپوێن و نەزڕێن.

دوو دەرگای هەبوو یەکێکیان لە (کوجیبن)دەچویتە ناو مەدخەلەکەوە دەروازەیەکی گەورەبوو.. دەرگاکەی تر لەبەشی پێشەوەی مەدخەلەکە بەچەند پلیکانەیەکی تەختە بەند دادەبەزایتە خوارەوە بۆلای دوو حەوز. حەوزی لای ڕاست ڕووبەرەکەی (٢/٤٥×٥/٥٠) مەتر بوو ئەوەی لای چەپ(٧×٢/٥٠)مەتر بوو. ئاوی ئەم دوو حەوزە لەناو خۆیاندا هەڵئەقولاً. لەساڵەکانی حەفتاکانیش دەستکاری ئەم حەوزانەیان کردو لەهانەی دەلینەوە بە بۆری ئاویان بۆ هێنان. ئاوی ئەم حەوزانە کەسەرژێریان دەکرد دەچوو بۆ ئاودەستخانەکان..

هەرلەپشتی حەوزەکانەوە وەك دوو هەیوان، ئەرزەکەی تەختە بەند کرابوو بەئەندازەی ڕووبەری حەوزەکان بۆ نوێژکردن. کۆڵەکەکانیشیان بەشێوەیەکی زۆر جوان وەك ئەستێرە نەخش کرابوون ئەم تەختە بەندە هەم بۆ هاوین فێنك بوو هەم بۆ زستانیش سارد نەبوو، دوای نیوەڕۆی هاوینان کۆڕی سەرئەم تەختە نوێژانە خۆش بوو.

دوو ڕیز ئاودەستخانەی هەبوون، ڕیزێکیان لەسەرچەمی ئاوێسەر بوون ژمارەیان (١٠)بوون ئەمانە هەرلەسەردەمی قادربەگدا دروستکرابوون، بەڵام ڕیزەکەی تریان لەسەرچەمی دزاوەر بوون (٨) ئاودەستخانە بوون، لەساڵەکانی کۆتایی پەنجاکان دروستکران، دوو (غوسڵخانە)ش لەپاڵیان بوون لەلای ڕاستی ئەم دوو غوسڵخانەشەوە دوکانێکی بچکۆلە هەبوو کە بەدوکانی (تەحسینی حەمە ئیمام) ناسراوە. هەرلەلای چەپی ئەم ئاودەستخانانەوە لەڕووی جادەکەوە سێ دووکان هەبوون کەسەر بەمزگەوت بوون درابوون بەکرێ بە (حەمەسەعید ڕۆستەم، حاجی مەحمود محەمەد قادر، نادر حەمەئەمین)

لەنزیك ئاوەکەی (پلور)یش جێگەی مردوو شۆر هەبوو. لەلای چەپی ئەم مزگەوتەوە، خوێندنگایەك (حوجرە- مەدرەسە)یەکیش هەبوو ئەم خوێندگایە دوایی دروستکراوە، لەسەردەمی مەلاصاحب دا گرنگییەکی زۆری پێدراوە، بەڵکو بووە بەیەکێك لەخوێندگا گرنگەکانی کوردستان، ڕۆژ بەڕۆژ برەوی پەیدا دەکرد تانیوەی حەفتاکان فەقێی لێ نەبڕاوە، بەڵکو سەردەمی وابووە ژمارەی فەقێکان (٧٠)فەقێبوون. ئەم مزگەوتە پێنج فەرزە قەرەباڵغ بوو بەتایبەت بەڕۆژ.

بەدرێژایی مێژووی ئەم مزگەوتە، نوێژی هەینی هەرلەم مزگەوتەدا کراوە، جگە لەهەندێ کات نەبێ کەلەخانەقاش کراوە.

متوەلی ئەم مزگەوتە لەسەردەمی قادربەگدا- حاجی حەمەڕەحیم و حاجی حەمەکەریم بوون، پاشان مەلاحەیبەاللە و حاجی نادر و حاجی بابالە و

حاجیمستەفای حاجی قادر و حاجی بابای حاجی محەمەد و حاجی حەمەمراد و حاجی ڕەحمان فەتحوالله بوون. ئەم مزگەوتە لەچۆڵ کردنەکەدا ڕووخاو هیچی بەسەریەکەوە نەما جگە لەهەندێ دیواری نەبێ.

دروستکردنەوەی ئەم مزگەوتە لەدوای ڕاپەڕین.

خەڵکی تەوێڵە هەرلەڕەوەکەدا بەنایلۆن و گەلاّ کەپرێکیان دروست کرد و کردیانـەوە بەجێگـەی نوێـژ. لـەهاوینی (١٩٩٢) کەوتنـەوە خـۆ، نزیکـەی (١٠٠)هـەزار دیناریـان کـۆکردەوەو دەسـتیان کـرد بەدروسـتکردنەوەی، تـوانرا هەیکەلێکی مزگەوتەکە بەوپارە دروست بکەن بۆ ماوەی چەند ساڵێك نوێژی تیاکرا. هەرلـەدوای ڕاپەڕینیشـەوە هـەوڵ دراوە کەڕێخراوە ئیسلامییەکان ئـەم مزگەوتـە دروسـت بکەنـەوە، بەتایبـەت ماميۆسـتایان (سـەید عەبـدوڕەحمان و مەلاعوزەیر و مەلا لوقمان، عەبدوڕەزاقی حاجی ئەوڕەحمان) زۆر هەوڵیان داوە. لەئەنجامدا لەلایەن یەکگرتووی ئیسلامی کوردەوە ئەرکی دروستکردنەوەی گرتە ئەسـتۆ، چـونکە بناغەکـەی بـاش نـەبوو، ئـەوەی کەدروسـتکرابوو ناچـار ڕوخێنرایەوەو جارێکیتر هەرلەبناغەوە لەهاوینی (١٩٩٧)ەوە بەردی بناغەی بۆ دانراو لەماوەی ساڵێکدا تەواو بوو. ئەوەی شایەنی باس بێت: جەماوەرەکەش بەمادیو مەعنەوی کۆمەکیو هاوکاری ڕابیتەیان کرد.

لەڕۆژنامـەی یـەکگرتوو ژمـارە(٢٠٢) بـەرواری (١٩٩٨/٨/٢٨ز) لەسـەر دروستکردنی ئەم مزگەوتە نوسیویەتی:

(ڕابیتـەی ئیسـلامی کـورد مزگـەوتی گـەورەی تەوێڵـە دروسـت دەکـات، لـەدامێنی کەژەگـەردن کەشاکانی هـەورامانی هەمیشە ڕەنگین و، لەناوجەرگەی تەوێڵـەی دڵـرفێن و دێـرین.. ڕۆژی (١٩٩٨/٧/٣١)و پـاش تێپـەڕبوونی سـاڵێك بەسەرئیش و کاری بەردەوام بەئامادە بوونی بەڕێز پرۆفیسۆر د. عەلی قەرەداغی سـەرۆکی ڕابیتـەی ئیسـلامی کـوردو لێپرسـراوانی دەزگاکـانی حکومـەت و نوێنەرانی حزب و لایەنە سیاسییەکان و شێخانی تەریقەت و زانایـانی ئاینیو پیاوماقوڵ و جـەماوەری تەوێڵـە و هـەورامان .. پـرۆژەی (مزگـەوتی گـەورەی تەوێڵە) لەئاهەنگێکی خۆش و ڕازاوەدا کرایەوە..

شایانی باسە پرۆژەی ئەم مزگەوتە بڕی (٤٠/٠٠٠) چل هەزار دۆلاری تیا صەرف کراوەو برای ئەندازیار (ڕوشدی تۆفیق) سەرپەرشتیاری کردووە.

ڕووبەری حەرەمی مزگەتەکە(٢٢,٥×١٧,٥)م/٢ە٥ بالکۆنێکی بۆ دروستکراوە بۆپێنج فەرزە و شوێنی نوێژی خوشکان بەڕووبەری (٢٢,٥×٧)م/٢ هەروەها هەیوانێکی هاوینە بەڕووبەری (٢٢,٥×٥)م/٢

جگە لەمانەش چوارمنارەی جوانی هەیە، کەهەریەکەیان (١٠)م لەسەقفی مزگەوتەکەوە، بەرزن و گومەزیەکی جوانیش کەتیرەکەی (٧)م ەوە بەرزیەکەی (٩,٥)م ە، کەهێندەی ترمزگەوتەکەی ڕازاندوەتەوە. جیّ باسە: جەماوەری خواناسی تەوێڵەش، هاوکاری (ڕابیتەی ئیسلامی کورد)یان کردووە، لەئەنجامدانی پڕۆژەکەدا...

پیرۆزبیّ لەتەوێڵە و هەورامان.. ئاوەدان بیّ کوردستانی ئازیزمان...)

لەکاتی کردنەوەی مزگەوتەکەداو، پێش خوێندنەوەی وتارەکان، م. عادل شاسواری کەئاهەنگەکەی دەبرد بەڕێوە.. ئەم هۆنراوەیەی خۆی خوێندەوە، پێمان باشە لێرەدا بینوسین:

تەوێڵی جوان، دڵگیرو شیرین — سەرکەشی ڕەنگین، کۆتینی خەنین

ئارۆتەوێڵی، یاگ و عارفا — جەژنۆ عومرو وێش، دەنگ مدۆکەشا

وەش ئامای کەرۆ، جەمیمانەکا — بەزوان و حاڵ و، یاگ و سوجدەگا

ئارو ڕابیتە، بیەن بە میمان — منش ویربیاو، کەرداش ئاوەدان

جاجەئارۆوە، تەماشا کەرە — دەی سوجدەو شوکری، پەی خوای‌بەرە

لەبەهاری (٢٠٠٢)دا، (١١)دوکان لەحەوشەی مزگەوتەکەدا دروستکرایەوە، بەپارەی خاوەن دوکانەکان، کەهەندێکیان زووتر هەر هەبوون. ئەم دوکانانە، (٦)یان لەڕیزێکدا لەسەرجادەکەی کەدەچێت بۆ پشتی حەوز، (٥)کەی تریان دەڕواننە ناو بازاڕەکەوە.

**پێش نوێژ و وتار خوێنەکانی ئەم مزگەوتە:**

بەتەواوی ناتوانین یەکەم مەلای ئەم مزگەوتە دیاری بکەین، بەڵام ئەوەندە دەتوانین بڵێین کە: بنەماڵەی (مەلایاسین و مەلانەزیر) ڕۆڵیان زۆر بووە، هەروەها ماوەیەك مەلاجەلیلی مەلامەحمود، پێش نوێژ و وتاربێژی بووە، پاشان نزیکەی (٤٠)ساڵیش مەلاعەبدەی مەلایاسین لەم مزگەوتە بووە، ماوەیەکی کەمیش مەلائەحمەدی قازی لێبووە... لەدوای تەعمیرکدرنەوەی مزگەوتەکەش، لەلایەن (قادربەگ)ەوە، زۆری پیّناچیّ، مەلاصاحب دەبێت بەپێش نوێژو وتاربێژی تاساڵی(١٩٧٠) پاشان ئەم مامۆستایانەی تربوون:

- مەلامحەمەدی عەبدوسەمیع قەرەداغی.. لەساڵی (١٩٧٠)بۆ بەهاری (١٩٧٤).
- مەلافەرەج هەڵەبجەیی.. لەبەهاری (١٩٧٤)بۆ بەهاری (١٩٧٥).
- دیسان مەلامحەمەد عەبدوسەمیع لەبەهاری (١٩٧٥)بۆ پایزی(١٩٧٨).
- مەلاعەبدوڕەحمان تەها فەتحولموبین.. لەپایزی (١٩٧٨)بۆ بەهاری (١٩٨١). لەدوای راپەڕینیشەوە:
- بۆ ماوەی ساڵێك م. مەلاعوزەیر و مەلاعەبدولقادر و چەند گەنجێك پێش نوێژ و وتاربێژ بوون، تاوەکو بەشێوەیەکی ڕەسمی لە (١٩٩٣/١١/١٣)ەوە،م. مەلالوقمان ئیسماعیل بەڵخەیی، بوو بەمەلای ئەم مزگەوتەو، ئاهەنگێکی قەشەنگی بۆ کراو، ئەویش توانی ڕۆڵێکی باش ببینێت و جەماوەرێکی زۆر لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە و چەند فەقێیەکیش ڕابگرێت، بەڵام ئەمیش لەبەر هەندێ هۆی سیاسی لە(١٩٩٩/١٠/١٢) خۆی نقڵی سلێمانی کردو، ئێستاش پێش نوێژ و وتاربێژی مزگەوتی موفتی‌یە لەسلێمانی.

لەساڵی (١٩٩٩)شەوە (مەلافاروق محەمەد حەمەعەزیز)بوو بەمەلای ئەم مزگەوتە تاوەکو نزیکەی ساڵێك، دواتر مەلا ئەرسەلان چەمچەماڵی بوو تاوەکو ئێستا کەسەرەتای ساڵی(٢٠٠٣)یە.

**سەنەدێکی مێژوویی:**

کاتێك کە قادربەگ ئەم مزگەوتەی دروست کردوەتەوەو گەورەی کردوە لەسەربەردێکی مەڕمەڕ کەوەختی خۆی خرابووە دیواری مزگەوتەکەوەو نوسێنرابوو پێیەوە کەمێژووی دروستکردنی مزگەوتەکەی لەسەر بوو کەساڵی (١٣٤٨ك)بووە، بەرامبەر بەساڵی(١٩٢٩ز) هۆنراوەکە لە شعری میرزاعەبدولقادرە، مەلائەحمەدی قازی بەخەتە خۆشەکەی لەسەر بەردەکە نوسیویەتی، ئەو وەستایەش کەنووسینەکەی هەڵکۆڵیوە خەڵکی هەورامانی تەخت بووە بەناوی وەستا محەمەد سەعید. هۆنراوەکە مەدحێکی جوانی قادربەگی تیایەو وەصفێکی زۆری مزگەوتەکەو ئاو و هەواو سروشتی تەوێڵە دەکات.

ئەم نوسراوی سەر بەردە سەنەدێکی مێژوویی گرنگەو لەدوای ڕاپەڕینەوە لەلایەن(نورەدین مستەفا)[٦] وە پارێزراوە،وەپێویستە خەڵکیتەوێڵە ئاگاداری ئەم بەردە بن بەتایبەت متەوەلی مزگەوت، چونکە ئەمە سەنەدە، مێژووە، شوێنەوارە.

دەقی نوسراوی سەرئەم بەردە، بەم شێوەیەیەو تەقریبەن ماناکەشی ئەمە دەگەیەنێت:

ناظم: میرزاعەبدوالقادر اوستا: محمد سعید

قصر فردوس است، یاعرش است هم چرخ برین
کس ندیدەست ببیند، خاك و اب هم چنین
جامعِ اظهر یقین اینست، ای اهل صلاة
رَحمةُ اللهِ علی القوم، جمع الداخلین
چشمەء چون زمزم کوهش صفا بطحاصفت
طالبان راغبان دین، هم جمع اند ازئین
بانیش بحری خدا، نقش چنین انداخته
مسجد یعنی در این است، مایەء دنیا و دین
ان شجاع الملك قادربگ مالك شدبما
تیزی فکرش ببین، قوه بازوببین
چونکه تعمیرات این مسجد، با اوکشته تمام
دست گیرش در دو دنیا، یاشفیع المذنبین
طالبم در بحرابجد، غوطة در تاریخ را
جستجو کردم بگفتش، (وادخلوها خالدین)

واتە:

– ئەم مزگەوتە یادەبێت قەصری فیردەوس بێت یاعەرشی خوایە، لەم چەرخەی ئێمەدا ئەوەندە جوانە کەس نەیدیوە شتی ئاوا، بابێت ببینێ خاك و ئاوەکەشی.

– جامعەی ئەزهەر بەڕاستی ئەمەیە، ئەی ئەهلی نوێژکەران، ڕەحمەتی خوا لەسەر ئەو قەومە هەمووی بێت کەدەچنە ناوی

– کانیاوەکەی وەك زەمزەمەو، کێوەکەی وەك کێوی صەفاو، (بەطحاء) صیفەتە- بەطحاء = بەدەربەنێکی گەورەی ئاودار دەڵێن کەوردە چەوو لمی تیابێت. قوتابیان و ئارەزوو

وێنەی سەنەدەکەی مزگەوتی گەورە

مەندانی ئاین لەم مزگەوتە و لەم شوێنەدا کۆدەبنەوە

- دروست کەری ئەم مزگەوتە، دەریایەکی خوایی‌یە کەتوانیویەتی نەخشێکی وادابڕێژێ، واتا مزگەوتێك ئاوابێت سەرمایەیە بۆ دونیا و قیامەت.

- شجاع الملك- نازناوی قادربەگ بووە، ئەم (شجاع الملك)ە کەقادربەگە، خودا داویەتی بەئێمە و بووە بەگەورەمان ببینن چەند بیرێکی تیژ و هێز و بازوویەکی هەیە

- چونکە تەعمیراتی ئەم مزگەتە لەسەر ئەرکی ئەم تەواو بووە.

- دەستی بگریت لەهەردوو دونیا، ئەی تکاکاری گوناهکاران.

- داواکارم لەدەریای خودا بەم زوانەو لەم کاتەدا دانەپۆشرێت و نەمرێت.

- بەگوتەو فەرمانی ئەو جولاّمەوەو ئەرکەکانم جێ‌بەجێ‌کردن دەی خوایە ئیتر بیخەرە بەهەشتەوە.

- واژەی (وادخلوها خالدین) مێژوی دروستکردنەکەیە بەئەبجەدی حیسابی بکەین ساڵی (١٣٤٨ك)دەکات.

**مزگەوتی باساکا:**

مێژووی دروستکردنی نازانین دەگەڕێتەوە بۆکەی، بەڵام زۆربەی خەڵکی تەوێڵە دەڵێن دووەم مزگەوتە لە تەوێڵە دروستکراوە. بۆ ناوەکەشی کەلەچی‌یەوە هاتووە سێ ڕیوایەت هەیە:

هەندێك دەڵێن: صۆفی‌محەمەد باساکی لەگەڵ چەند باساکی‌یەکی تر لە تەوێڵە کاسپی دەکەن و قازانجێکی زۆر دەکەن ئەوان ئەم مزگەوتە دەکەنەوە و دەناسرێت بە (مزگی باساکی‌یەکا) واتە: مزگەوتی باساکی‌یەکان دوایی وشەکە دەبێتە (مزگی باساکا).

هەندێکی تردەڵێن:

وەستای دروستکردنی ئەم مزگەوتەیا خەڵکی گوندی (باساك)ی لای بەرزنجە بووە، یاناوی باساك بووە و خەڵکی شوێنی تر بووەو ئیتر بەناوی وەستا باساکەوە ناونراوە.

- بەڵام وادیارە ئەم ڕایە ڕاست بێ کەدەڵێت:

دووبرا بەناوی (عەلی صادق و محەمەد صادق)خەڵکی باساك بوون بۆ خوێندن هاتونەتە، تەوێڵە و باوکیان دەوڵەمەند بووە، پاش تەواوکردنی خوێندن لەپاداشتی ئەوە هەم خەڵکی تەوێڵە باش بوون لەگەڵیان و هەم لەتەوێڵە خوێندنیان تەواو کردوە باوکیان (صۆفی صادق یامام صادق)یان پێ وتووە

بڕیار دەدات لەتەوێڵە مزگەوتێك دروست بکات و ئیتر بەناوی مزگەوتی باساکی‌یەکان ناسراوە و دوایی بووە بەباساکا.

هەروەها دەڵێن: مەلاعەبدوڕەحمانی یەکەم - بنەماڵەی مەلاسەلام سەیر بکە- دەرسی بەم دوو برایە وتووەتەوە، ئەو هاندەرێکی باش بووە بۆ کردنەوەی ئەم مزگەوتە و ئەویش بەناوی ئەوانەوە ناوی ناوە. ئەم مزگەوتە لەگەڕەکی (خەمەکاوە)یە لەمالێدەر، ڕوو بەقیبلەیەو لەدیوارەکەی‌دا بەردی قورس و گەورە بەکار هاتووە کەمرۆڤ سەری سوڕ دەمێنێ کەچۆن ئەم بەردانە بەکارهاتوون. ئەم مزگەوتە لەشەڕی عێراق و ئێران دا زۆربەی ڕووخاوە، بەلاّم لەساڵی (١٩٩٣)دا خەڵکی تەوێڵە بەتایبەت گەڕەك بەسەرپەرشتی سەعدی حاجی‌ئەحمەد، لەسەر شێوەی خۆی دروستیان کردەوە، لەلایەن ڕابیتەی ئیسلامیشەوە پڕۆژەی ئاوەکەی بۆ ڕاکێشان و لەبەرواری (١٩٩٣/١١/٣) کرایەوەو ئاهەنگێکی خنجیلانەشی بۆ کرا. ئەم مزگەوتە ڕووبەری حەرەمەکەی (١٢×٧)م بەپلیکانە دەچیتە سەرەوە و حەوزێکی تیایە (٦) بەرمیل ئاو دەگرێ (٦) ئاودەستخانەو مردوو شۆرێکی تیایە، لەژێر مزگەوتەکەدا دوکانێکی هەیە ئەوسا نانەواخانە بوو. ئەو مامۆستایانەی لەم مزگەوتەدا پێش نوێژیان کردوە دەڵێن: لەسەرەتاوە شێخ شەهابەدینی دزاوەری هەم بۆ کردنەوەی‌و هەم وەك مەلایەك دەوری باشی بووە لەم مزگەوتەدا.

هەروەها بنەماڵەی مەلاعەبدوڵڵەی مالێدەر، باو باپیری‌و خۆیشی‌و مەلاعەبدولحەمیدی کوڕیشی مەلای ئەم مزگەوتە بوون لەساڵەکانی حەفتاکان بەدواوە هەردوو مامۆستا (سەید عەبدوڕەحمان سەید تەهاو سەید ڕەشاد سەید محەمەد) ئیمامی ئەم مزگەوتە بوون.

لەدوای ڕاپەڕینیشەوە مامۆستای ڕەسمی نەبووە ئەو گەنجانەی گەڕەك پێش نوێژیان کردووە. متووەلی‌یەکانی ئەم مزگەوتەش زۆر بوون لەوانە:

- ئەحمەدی ئیسحاق
- محەمەدی کوێخا حەمەئەمین
- حاجی قادر حەمەعەزیز
- حاجی حەمەشەریف حاجی قادر
- حاجی مستەفا حاجی قادر
- حاجی بابا حاجی محەمەد
- غەفور محەمەد
- سەعدی حاجی ئەحمەد

خادمەکانیشی ئەمانە بوون:

- ڕەحیم وەیسی
- حەمەسەلیم ئێرانی
- ئەبوبەکر حەمەڕەحیم

**مزگەوتی کاك عەلی فەیرۆز:**

ئەم مزگەوتە کەوتووەتە بەشی سەرەوەی چلانە، وەك دەڵێن: جێگەکەی ئەوسا دووسێ چڵ تووی گەورەی تیابووە، وەئێستاش دانەیەکیان ماوە، هەروەها بن تووەکان (پاچەڵگا)[7] بووەو، بەشی سەرەوەشی شوێنی وەرە گەل- گەلە بێری بووە.

بەهاوکاری خەڵکی تەوێڵە بەتایبەت ئەهلی گەڕەك لەبەهاری (١٩٥٨)دا دەستکرا بەدورستکردنیو لەسەرەتای ساڵی (١٩٥٩)دا تەواو کرا، ئەوانەی زیاتر سەرپەرشتیان دەکرد حاجی عەبدوڵڵای حسێن و حاجی عەبدەڕەحمانی حاجی محەمەد و حاجی ئەبوبەکری کەریم خادم بوون، وەستاکەی وەستا عەبدوڵڵای کەیمنە بوو،

کارەباکەشی مەلاجەمیل بۆی دامەزراند.

ڕووبەری حەرەمی ئەم مزگەوتە (٩×٨)م چوار کوڵەکەی تیایە هەیوانێکی بچکۆلەی هەیەو حەوزێکی تیایە (٤) ئاودەستخانە و یەکێکیان غوسڵخانەیە، لەساڵی (١٩٧٣)لەبەرامبەریەوە (٤) ئاودەستخانەی تری بۆ کرایەوە.

لەشەڕی عێراق و ئێران دا زۆربەی ڕووخاو لەساڵی (١٩٩٣)دا ئەهلی تەوێڵە و گەڕەك دەستیان کردەوە بەدروستکردنەوەی، بەڵام لەساڵی (٢٠٠٢) بەدواوە بەتەواوی کرایەوەو نوێژی تیا کراوە.

لەناو خەڵکی تەوێڵەدا ئەم مزگەوتە، بەمزگەوتی (کاکڵە پیرۆز)بەناوبانگە کەگوایە ئەم ناوە لەناوی کەسێکەوە هاتووە کەناوی کاك عەلی پیرۆز یاکاك عەلی فەیرۆز یاخود کاکە نەورۆز بووە، بۆیە ئەم مزگەوتەشیان بەم ناوەوە ناو ناوە، چونکە لەلای ڕاستی دەرگای دەرەوە کەبچیتە ژوورەوە لەکۆڵانەکە شەخصێك هەیە کەگوایە نشنیگەی ئەو پیاوە چاکە بووە، بەڵام مێژووی ئەم کاك عەلی فەیرۆزە، ونەو هیچی لێ نازانین. تەنها ئەوەندە دەڵێن: کە خەڵکی شارەزوور بووە بۆ خوێندن هاتووەتە تەوێڵە. پێش نوێژەکانی ئەم مزگەوتە، بۆ یەکەم جار مامۆستا مەلاعەبدولئەحەد بووە، ئەم مامۆستایە لەوەوپێش مەلایەتی مزگەوتی نەکردوە هەر منالی لەماڵەوە فێری قورئان کردووە، ماوەیەکیش مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بووە، تالە پایزی ساڵی(١٩٦٢) لەبەرە بەیانێکدا بەنەخۆشی‌یەکی کتوپڕ کۆچی دوایی دەکات.

پاشان بۆ ماوەیەکی کەم حاجی سەید تەها بووە ئیمامی، دوای ئەوە مامۆستا مەلاجەمیل کوڕی مەلاعەبدولئەحەد بوو بەئیمامی ئەم مزگەوتە تاوەکو ساڵی (١٩٨١). لەسەردەمی مامۆستا مەلاجەمیل دا ئەم مزگەوتە خوێندنگایەك بووە بۆ فێربوونی قورئان، منالانی تەوێڵە دەستە دەستە فێری قورئان ئەبوون و خەتمیان دەکرد بەتایبەت لەساڵەکانی (١٩٦٣- ١٩٧٠) بەبەردەوامی (٢٠- ٣٠) قوتابی هەبوون. مامۆستا جگە لەقورئان کتێبی تری وەك (معراجنامە و مەولودنامە و ئاسمان و زەمین)ی پیّدەوتن ئەم کتێبانە هاوکاریەکی باشی قوتابیانی دەکردن بۆ ڕێنوسی کوردی‌و زمانی کوردی.

**موجەوەرەکانی ئەم مزگەوتە:**

عەبدوڵڵا حەمەکەریم تابەهاری ١٩٦٤، لە(١٩٦٧/٤/١)وە حەمەعەزیز فەتاح بووە، پاشان لەحەفتاکان ئەسکەندەر ئەبوبەکر بووە، دوای ئەو هەر وەستا نادر حەکیم کەدراوسێی مزگەوتەکە بوو خزمەتی دەکرد.

**مزگەوتی بابا ئەسکەندەر:**

شوێنی ئەم مزگەوتە ئەوسا کەلاوەیەك بوو پێیان دەووت (کەلاوۆبەقا)، ئەم مزگەوتە کەوتوەتە ناوەڕاستی بەشی مالێدەر، لەهاوینی سالی (١٩٦٠) دروستکراوە، لەلایەن خەڵکی تەوێڵە و ئەهلی گەڕەکەوە، ئەوانەی زیاتر هاوکاریان کردوە حاجی حەسەن اللەکەرەم و حاجی حەمەعەلی کۆزاد و حاجی سەلیم بوون. حەرەمی ئەم مزگەوتە گەورەنیە (٧×٨)م دوو دەرگای هەیە لەسەرەوەو لەخوارەوە دەچیتە ناویەوە، بەردەمەکەی هەیوانێکی (٨×٢/٥) هەیە، کەدەڕوانێتە ناو بازاڕی تەوێڵە و حەوزێك و (٤) ئاودەستخانە و غوسڵخانەیەکی

مزگەوتی بابا ئەسکەندەر ٢٠٠٣/٩/٢٠

هەیە. یەکەم مەلای ئەم مزگەوتە، مامۆستا بابا حاجی بووە، زۆری تیایدا نەمایەوە تووشی نەخۆشیەك بوو لە (١٩٦١/٧/٥) کۆچی دوایی کرد پاشان مامۆستا مەلاعەبدوڕەحمانی مەلاجەلیل بوو بەئیمامی تاوەکو سالی (١٩٨١).[٨] ئەوەی شایەنی باس بێت مامۆستاش چەند قوتابیەکی فێری قورئان خوێندن کردن. ئەم مزگەوتەش لەدوای ڕاپەڕین لەسالی (١٩٩٣) دروستکرایەوە لەلایەن خەڵکی تەوێڵە بەگشتیو ئەهلی گەڕەك و بەهاوکاری یەکگرتووی ئیسلامی کورد.

لەسەرەتاوە چەند گەنجێکی گەڕەك پێش نوێژیان بۆ نوێژکەران دەکرد، بەلام ئێستا مامۆستا مەلاسەید عەبدولخالق بووەتە پێش نوێژ.

ناوی مزگەوتەکەش لەدواتردا باسی لێوە دەکەین.

متولی ئەم مزگەوتە- حاجی حەسەن بوو، پاشان حاجی ئەبوبەکری کوڕی، لەم دواییەش دیاری عەبدولی حاجی ئەبوبەکر بووە.

**مزگەوتی فەقێ ئەحمەد:**

مێژووی دروستکردنی ئەم مزگەوتە دەگەڕێتەوە بۆچلەخانەکەی فەقێ ئەحمەدی غەزایی، بۆیە مزگەوتی خەڵوەخانەشی پێ‌دەڵێن. سەید عەبدوصەمەدی توداری لە (نورالانوار)دا نووسیویەتی:[9] لە (قاموس الانساب)ی شێخ ڕەزادا نوسراوە:

فەقێ ئەحمەدێکی کورتە باڵای بەناوبانگ بە (گردە)، هاتە قوتابخانەکەی ئێمە و بەزمانی عەرەبی قسەی ئەکرد و ئەیوت: من لەسەیدەکانی بەغدا و لەنەوەی شێخ عەبدوڕەئوفی کوڕی شێخ نیعمەتوڵڵای وەلیم، ماوەیەك لای ئێمە مایەوە و پاشان چوو بۆ (تەوێڵە )ی (هەورامان )و لەتەوێڵە نیشتەجێ بوو و، پاشان ماوەیەك ناوبانگی بە (غەزایی) دەرکرد. ئیتر نازانم ژنی هێناوە یانا؟ هەروەها سەید عەبدوصەمەد ئەڵێ:

بۆم روون بووەتەوە کەئەو فەقێ ئەحمەدە ژنی هێناوە و نەوەی لێکەوتووەتەوەو هەرلە تەوێڵەش کۆچی دوایی کردووە.[10]

وەلەسەفەری حیجازدا لەشاری بەغدا چوومە بنج و بنەوانی قسەکەی ئەو فەقێ ئەحمەدەو، بۆم دەرکەوت ئەو فەقێ ئەحمەدە کوڕی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ عەبدولئەحەدی کوڕی شێخ عەبدواحیدی کوڕی شێخ مەحمودی کوڕی شێخ عەبدولصەمەدی کوڕی شێخ عەلی کوڕی شێخ عەبدوڕەئوفی کوڕی شێخ شاە نیعمەتوڵڵای وەلی کوڕی شێخ زەکەریای کاکۆ زەکەریایە. هەروەها لەیادی مەردان دا هاتووە و دەڵێ:[11]

ئەم فەقێ ئەحمەدەیش هەربەمناڵی بەغدای بەجێ‌هێشتووەو بۆخوێندن ڕووی کردوەتە کوردستان و لەگەڵ مزگەوتدا خوێندوویەتی، تاسەرەنجام لەتەوێڵە سەقام گیر بووە و ژنی هێناوە. لەبەر ئەوەی کەپیاوێکی زۆر چاك و لەخواترس بووە و گەڵ جار خۆی ون کردووە و پاش ماوەیەك هاتووەتەوە، لەتەوێڵە مەشهور بووە بە (فەقێ ئەحمەدی غەزایی) بەو باوەڕەوە کەوا لە (رجال الغیب)ەو لەماوەکانی ون بوونیا بۆ غەزا ئەچێ لەناو سوپای موسڵمانان‌دا.

کەواتە فەقێ ئەحمەد زۆر شوێن گەڕاوە و لەئەنجام دا گەیشتووتە تەوێڵە و لێرە ماوەتەوە و چلەخانەیەکی بووەو، گۆڕستانەکەشی والە خوارەوەی تەوێڵە، لەگەریات، شەخصێك هەیە بە شەخصەکەی فەقێ ئەحمەدی غەزایی ناسراوە.[12]

ئەم چلەخانەیە تائەم دوایی‌یە ماوەتەوە پاشان بووە کەلاوەیەك، تالەساڵی (١٩٦٨) ئەهلی گەڕەك و خەڵکی تەوێڵە بەتایبەت حاجی جەزا و حاجی بابالە.. هەڵسان بەدروستکردنی مزگەوتێك لەم کەلاوەیەدا، وەهەر بەمزگەوتی فەقێ ئەحمەد ناسراو، وە هەر حاجی بابالەی مارف متووەلی بوو، ماموستا سەید ڕەشاد کرا بەئیمامی، دوایی ماموستا مەلاڕەشاد چوو بۆ مزگەوتی باساکاو ماموستا مەلاصاڵحی زاوای ماموستا مەلاصاحب بوویە ئیمامی تاساڵی(١٩٨١).

ئەم مزگەوتە لەکاتی چۆڵ بوونی تەوێڵە، سەقفەکەی ڕووخاوە و دیوارەکانی چونکە بەچیمەنتۆ دروستکراون نەڕووخاون. بەڵام هێشتا مزگەوتەکە دروست نەکراوەتەوە.

**حوجرەکەی مەلانەزیر یاقاپی شێخ:**

ئەم حوجرەیە دەکەوێتە بەشی چلانەوە، پێینی گەڕەکی مەلایان، وەختی خۆی لەلایەن صۆفی ئەحمەدی باپیرە گەورەی مەلانەزیرەوە دروستکراوەو، دوایی بەحوجرەکەی مەلانەزیرو قاپی شێخ ناسراوە.

ئەم مزگەوتە وەختی خۆی لەدووبەش پێکهاتووە بەشی پیاوان، بەشی ئافرەتان، بەشی پیاوان بۆ دەرس خوێندنی پیاوان بوو، دووەمیشیان بۆ کچان و ئافرەتان، قورئانیان تیادەخوێند لەلایەن خێزان و کچی مەلاکانەوە پێیان وتراوە.

دوو چلەخانەشی تیابووە... وەك پیاوە بەتەمەنەکان دەگێڕنەوە[١٣] کەلەهانە سوسوەوە بەگونج (واتە بۆری قوڕ) ئاویان بۆ هێناوە.

لەسەردەمی مەلانەزیدا، گرنگی‌یەکی زۆری پێ دراوە و بووەتە خوێندنگایەکی گەورە و کاتێك شێخ عوسمان سراجەدین دێتەوە تەوێڵە، لەم حوجرەوە دەست دەکات بەئیرشادو، دەیکاتە ناوەندێکی کۆڕی زانست و زیکر و لەلایەن (سەید قوتبەدین) باپیرەی سەی فەتحەوە سەرپەرشتی دەکرێت.[١٤]

واتە... مزگەوت بووە، خوێندنگا و بووە، خانەقا و چلەخانەش بووە.

جەنابی شێخ هەرلەم قاپیە گیانی دەردەچێت و لەسەر وەسیەتی خۆی دەیبەن بۆ باخچەکەی خۆی، کەدوایی شێخ بەهائەدینی کوڕی خانەقایەکی تیا دروست کرد. پاشان قاپی بوو بەجێگەی میوان و موریدەکانی شێخ و، دواتریش چەند خانەوادەیەکی تیابوو، وەك وەستا عەبدوڵلا و وەستا بەشیری کوڕیو، خانەوادەی خودادای مەمەو صۆفی‌حەمە صاڵح و ڕابەشەل.

لەهەشتاکاندا ئەمیش وەك باقی خانوەکانی تری تەوێڵە ڕووخاو شوێنەوارێکی وای نەماوە و بووەتە کەلاوەیەك و جارێ دروست نەکراوەتەوە.

**خانەقای تەوێڵە :**[١٥]

خانەقای تەوێڵە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی خانوەکانی تەوێڵە لەلای ڕۆژهەلاتی چەمی خوارەوەدایە. ئەم خانەقایە جوانترین خانەقای کوردەواری بووە، بەشێوەی هونەری کوردی ڕەسەن دروستکراوە. کەلە(١٧)ژوور و مزگەوتێك و هەیوانێك و چلەخانەیەك و گومەزێگی شێخ سراجەدین پێکهاتبوو.

ئەوقاف وەختی خۆی بەشی سەرەوەی ڕووخاندووە، کەبریتی بووە لە (حەرەم)و (گەرماوێك)، لەشوێنی ئەودا بینایەکی تازەی دروستکردووە. ئەم بەشە زۆر جوان بووە، زۆرکەس دەڵێن بەداخەوە شتیوا دروست ناکرێتەوە.

بەشەکەی تری لەچەند ژوورێك پێکهاتبوو کەلەبەردەمی هەندێکیان هەیوان بوو. ژوورێکیش لەسەر(مەدخەل) سەرەکیەوە بوو، ئەم ژوورانە بۆ صۆفیو مورید و فەقێو میوان بوون و ئەوان سودیان لێوەرگرتوون.

مزگەوتەکەش لەسەر شێوەی کوردەواری دروستکراوە، درێژیەکەی (١٥) هەنگاوەو پانیەکەی (١٠)هەنگاوە، گومەزی نەبوو ەبەڵکو سەقفەکەی تەختە بەندبوو، (٦)کۆڵەکەی دارین و گەورە و جوانی هەبوو کەلە کەم شوێنی کوردستان دا، کۆڵەکەی ئاوا بووبێت، پێوانەی هەندێکیان کراوە کەتیرەکەیان (١,٥)مەتر بوو. لەقەبارەدا نزیك بوون لەیەکەوە، هەریەکێك لەو کۆڵەکانە تاجێکی دارین بەسەریانەوە بووە درێژیەکەیان لەمەترێك زیاتر بووە، وەدەور و بەریان

پێنج پێچەو مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دروستکردنی مزگەوتەکە. بەڵام کاتێک کەشێخ حیسامەدین سەقفی مزگەوتەکەی بەرزکردەوە لەژێر هەموو کۆڵەکەیەکدا بنکە (قاعدە)یەکی دارینی دانا. لەهەیوانەکە (٨)کۆڵەکە هەبوو کەهەریەکەیان تاجێکی بەسەرەوە بوو،بەڵام لەتاجی کۆڵەکەکانی مزگەوتەکە بچوکتر بوون.

هەیوانی مزگەوت و خانەقاکە دەکەوێتە لایڕاستەوە، کەدرێژیەکەی (٢٧) هەنگاوە. سێ‌داری گەورە خراونەتە سەرکۆڵەکەکان کە (حەماڵ)یان پێ‌دەڵێن سەری دارەکانی تری خراوەتە سەر.

لەسەرەتای هەیوانەکەوە، ژوورێکی بچوك هەیە وەك چلەخانە وایە لەوێوە دەچیتە هەیوانەکە، کەمەدخەلی مزگەوتەکەیە، لەکۆتایی‌دا ژوورێکی بچوك هەیە بە(چلەخانەی شێخ عەبدوڕەحمان) بەناوبانگە کەکوڕی شێخ سراجەدین بووە. لەکۆتایی هەیوانەکەش لەبەشی خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە دەرگای گومەزیەکەی شێخ سراجەدینە.

**گومەزیەکەی سراجەدین:**

ئەم گومەزیە لەناوەوە زۆر سەرنجی تەماشاکەر ڕادەکێشێ‌ بۆ خۆی، ئەوەندە بەشێوەیەکی ئەندازەیی جوان دروستکراوە. گومەزیەکەی ناوەند بەشێوەیەکی چوار گۆشەیی‌یە، واتە: بنکەیەکی چوار گۆشەیی هەیە. بەرزیەکەی (٧م)ە لەهەرلایەکەوە نیوگومەزی هەیە، لەهەرگۆشەیەکی گومەزیەکەوە کۆڵەکەیەك هەیە کەزەخرەفەیەکی جوانی لەسەرە، بەشی پێشەوەی کراوەیەو ئاوێنە بەند (عروسی)ێکی لەسەرە، کەبەجوانترین شێوەیە. مامۆستا عەبدوڕەقیب یوسف، لەوەصفی ئەم گومەزەیەدا دەڵێ‌:

زەخرەفە و نەخش و نیگارو ئاوێنە بەندی ئەم گومەزیە، زۆر نایاب و جوان و دەگمەنە، لەشوێنانی تر، وەك سلێمانی و هەولێر و کۆیەو، کەرکوك دا، ئالەم شێوە و جۆرەم نەبینیووە. ئاوێنە بەندەکەی زۆر وردەکاری تیابووە، چێوەکەی لەتەختە دروستکراوە، بەهەندەسەیەکی، زۆر جوان، لەسەر شێوەی ئەستێرەیە، لەناوەوە شوشەی ڕەنگاوڕەنگی بچوکی تیابوو، بەرزیەکەشی (٣/٢٦م)و پانیەکەشی (٣م)، بەرزی هەرچێوە، تەختەیەك، لەسەرپارچە شوشەکە، (٤ملم)ە ئەوڕێگە و شێوەیەی کەلەسەری دروستکراوە لەسلێمانی پێ‌ی دەوترێت (قاخمە). لەیەك لای دیاری کراو (حەقلی موعەیەن)دا، (٧٦) پارچە شوشەی قەبارە جیاوازی تیابووە. دەڵێن:

دوو هونەرمەند بەشدار بوون لەدروستکردنی ئەم هونەرەدا، یەکێکیان بەناوی (جان وەیس)ی سنەییو، ئەوی تریان بەناوی (شوکروالله)ی هەمەدانیو هەردوکیشیان موریدی شێخ سراجەدین بوون.

درێژی گۆڕستانەکە لەناوەوە (٩م) کەمێك زیاترە، پانیەکەشی (٦م)ە قەبری شێخ سراجەدین و شێخ بەهائەدینی کوڕی تیایە، هەردووکیان لەناو صندوقێکی گەورەدان و، قەبری شێخ ئەحمەدی کوڕیو شێخ جەعفەر و، شێخ محەمەدی کوڕی شێخ حیسامەدینی تیایە. وادیارە جۆری ئەم گومەزیە یالەسنە یالەشوێنی تری ئێرانەوە هاتبێت.

هەرلەسەر ئەم شێوە گومەزیە (حەمامی حاجی باقیو حەمامی حاجی حەسەن) دروستکراون لەکەرکوك، لەژێر قەڵاوە ڕووی خوارووی ڕۆژهەڵاتەوە. وەستاکانی کەرکوك دەڵێن:

ئەم دوو حەمامە لەلایەن وەستا ئیسماعیل، ناوێکەوە دروستکراون، لەپێش (٧٠)ساڵ لەمەوبەر، واتە لەدەوروبەری (١٩٠٠ن)لەوانەیە ئەم ئەندازیار و هونەرمەندە، کوردە (ئیسماعیل سنەیی)بووبێت لەو سەردەمەدا، لەکوردستانی خوارودا بووە و هەڵساوە بەکاری ئەندازەییو هونەری. لەهەولێریش دا، کەکۆشکی مەلائەفەندی لەباداوە وماڵی شێخ جەمیل ئەفەندی لەقەڵادا، دروستی کردوون و نەخشی کێشاون. هەروەها دەرگای قەڵای هەولێریشی دروستکردووە و براکەی (عەلی ئەکبەر) یارمەتی داوە بەتایبەت لەهونەری نەخش و نیگارەکەیدا.

**چلەخانە یا مۆزەخانەیەکی بچوك:**

ئەم خەڵوەگایە بەخەڵوەگای (شێخ عەبدوڕەحمان ئەبولوەفا)بە ناوبانگە، لەبەشی پێشەوەی کۆتایی هەیوانەکەیە، لەژوورێکی بچکۆلەی (٨م٢)پێکهاتووە، بەشی سەرەوە و خوارەوەی کراوەیەو، دوو ئاوێنە بەندی تیابوو. دیواری ڕۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوای بەهەندەسەیەکی جوان نەخش کرابوو، لەدیوارەکەی ڕۆژهەڵاتدا تاقێکی تیابوو بەهەمان شێوە لەبەرامبەریشەوە ئاگردانێکی (مغەیری)ێکی بووە کەدرێژیەکەی (١٠٦سم)کەنەخش و نیگارێکی جوانیان پێوە بووە، بەوێنەی بولبول و گوڵ نەخشێنراوە، لەسەر ئاگردانەکە (بیلۆ- بوخاری)یەك بووە کەلەمحراب دەچێت کەلە سلێمانی لەم جۆرە زۆرە. لەسەر ئەویش (موجەسەمێك) هەبوو وادیارە کەجێگای (چرا) بووبێت.

ئەم خەڵوەتگایە لەناوەوە کراوە بەدوو بەش(نهۆم)، نێوانیان سەقفێکی تەختەیە و نەخشێنراوە و بەرزی نهۆمی خوارەوە(٢١٨سم). بەڕاستی ئەم خەڵوەتگایە ئەوەندە نەخش و نیگاری جوان و وردوو قەشەنگی تیایە کەسەرنجی تەماشاکەر ڕادەکێشێ، کەهەر لەم خەڵوەتگا بچکۆلەدا (٢٢٦) وێنەی بولبولی تیایە، کەئەمەش بەڵگەن لەسەر بەهرەمەندیو لێهاتوویی ئەو هونەرمەندە.

**مێژووی دروستکردنی ئەم خانەقایە:**

شێخ عوسمان لەدوا ساڵەکانی ژیانیا لەساڵی (١٢٧٢)ك لەو باخچەیەدا کەدەکەوێتە داوێنی تەوێڵەوە ( کەبەمیرات لەباوکییەوە بۆی ماوەتەوە- یا ڕەسوڵ ئاغای مامی پێی بەخشیووە) خانەقایەکی بچوك و سادەی دروستکردووە و[16] لەدوای خۆیشی شێخ محەمەد بەهائەدین کوڕە گەورەی ئەم خانەقایەی گەورە کردوە و دووساڵیشی پێچووە ئینجا تەواو بووە.[17]

سێ نوسراو (سێ تابلۆ)لەم خانەقایەدا هەیە: **یەکێکیان** لەسەر تابلۆیەکی بەردیە، لەسەر دیواری دەرەوەی مزگەوتی خانەقاکەیە لەنزیك دەرگای گومەزیەکەوەیە کە دەکەوێتە هەیوانەکەوە. نوسراوەکە بریتییە لەشیعرێك کەمێژووی (١٢٨٤ك = ١٨٦٧ز)ی لەسەر نوسراوە.

**نوسراوێکی تریان:** لەسەر تاجێکی ستونی دارینە کەنەخش کراوە لەنزیك دەرگای سەرەکی خانەقاکەوەیە.

نوسراوەکە کراوە بەچوار بەشەوە لەدوو بەشی بچوکدا لەڕاست و چەپەوە (٨٥)و (١٢) نوسراوە کەساڵی دروستکردنەکەیە (١٢٨٥)ه لەبەشی سەرەوەو خوارەوەش ئەم بەیتە شعرەش نوسراوە..

بهاء الدین ثانی پیر امجد

ولی عهد سراج الدین محمد

مێژووی ئەم دروستکردنە کەدەکاتە ساڵی (١٢٨٥)ك واتە ساڵی (١٨٦٨ز) زاینی دەکات.

**نوسراوی سێهەم:**

ئەمیش لەسەر کوڵەکەیەکی دارینە و تاجێکی بەسەرەوەیە هەروەك کوڵەکەی پێشو کراوە بەچوار بەشەوە لەدوو بەشی بچوکدا، لەلای ڕاستەوە نوسراوە (عمل محمد)لەلای چەپەوە نوسراوە (علی)واتە (محمدعلی)دروستی کردووە. ئەم نوسینەش زۆر بەورد و جوان نوسراوە. نوسراوەکەی تریش لەسەرەوەو خوارەوەیە ئەمەیە:

بوالبهاشد تکیەء دین

قدس الله سره امین

لەوانەیە ئەم (محمد علی)یە لەگەڵ (جان وەیس)و (شکرالله)دا بەشدار بوو بێت لەدروستکردنی ئاوێنە بەندەکەشدا.

**چەند تێبینییەك:**

مامۆستا عەبدوڕەقیب یوسف دەڵێ:

١- لەڕۆژانی(١٨، ١٩٨٠/٧/١٩) سەردانی تەوێڵەم کردوو ئەم شوێنە گرنگانەم بینیو بۆم دەرکەوت کە:

ئەم خانەقای تەوێڵەیە جوانترین خانەقای کوردستانی گەورەیەو یەکێکە لەئاسارەکانی کوردستان، نابێ دەستکاری بکرێ، بەبێ ئاگاداری لیژنە، بۆیە لە (١٩٨٠/٧/٣٠) بەژمارە (٢١٩٤٤) ڕاپۆرتێکم پێشکەش بەدەزگای شوێنەوار کرد، تیایدا گرنگی ئەم تەکیەم باس کردووە، کەوێنەی کەمە لەهونەری کوردەواریدا، بۆیە: داوام کرد لەئەمانەتی گشتی ئەوقاف لەهەولێر و ئەوقافی سلێمانی کەشێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ محەمەدی شێخ حیسامەدین ئاگادار بکەنەوە کەنابێت ئەم خانەقایە بڕوخێنرێت و تێکیبدات.

٢- لەبەرواری (١٩٨١/٢/١٠)ژمارە (١٢٠) بەڕاپۆرتێك بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری پارێزگای سلێمانیم ئاگادار کردەوە کەبەبێ ئاگاداری لیژنەی تایبەت نابێت ئەو تەکیەی تەوێڵە دەستکاری بکرێت.[١٨]

٣- لەبەرواری (١٩٨١/٢/١٦)بەژمارە (٣٢٤) بەڕێوەبەرایەتی گشتیو مۆزەخانەی ناوچەی باکور، کیتابی دەرکردووە بۆ پشتگیری دائیرەی شوێنەوار

بۆ ئەوقاف کەئەبێ ئەم بیانەی تەکیەی تەوێڵە، لەژێر چاودێری دائیرەی شوێنەواردا بێت.

٤- لەبەرواری (١٩٩٣/٨/٣) بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری سلێمانی نوسراوێکی ئاڕاستەی ئەوقافی سلێمانی کردووە تیادا دەڵێ: ئەبێ تەعمیراتی تەکیەی تەوێڵە لەژێر چاودێری کۆمەڵەی شوێنەواردا بێت و داوای وەستای ئیش کردنی خانەقاکەی کردووە.

٥- لە (١٩٩٣/١٠/٢٥)کەزانیم خانەقاکەی تەوێڵە تەعمیر ناکرێت بەڵکو دەیڕوخێنن و سەرلەنوێ چاکی دەکەنەوە، بەبێ ئەوەی لیژنەی تایبەت ئاگادار بکرێتەوە، زۆر بێتاقەت بووم، بۆیە نامەیەکی دڵسۆزانەم ئاڕاستەی جەنابی شێخ عوسمان کرد سەبارەت بەناڕەزایی دەربڕین بۆ ڕوخاندنی ئەو خانەقا دانسقەیە. شێخیش وەڵامی دامەوە و، ماوەیەك ئیشی ئەم خانەقایە وەستا، بەڵام پاشان دەستی پێکردەوە.

٦- لەئەنجامدا: خانەقاکە ڕوخێنرا و، بۆ جارێکیتر دروستکرایەوە بەڵام: بەداخەوە ئەو شوێنەوارە نایابە دەگمەنە نەپارێزرا و، بەتایبەت ئاوێنە بەندو نەخش و نیگارەکانی، دیارنین و نازانرێ چی لێهات. ئێمەش دەڵێین: بێگومان دروستکردنەوەی ئەم خانەقایە بەهەوڵی خەڵکی تەوێڵە بووە، بەتایبەت بەڕێزان (شێخ صەفائەدین و محەمەدی سان ئەحمەدو حاجی بابای حاجی محەمەد و حاجی نەزیف باباحاجیو..) ئەمان هەوڵیان دا بۆ دروستکردنەوەی، بۆ ئەمەش هەڵسان بەنوسینی نامەیەك بۆ جەنابی شێخ عوسمان، ئەویش وەڵامی دانەوە کەئامادەم لەسەر ئەرکی خۆم ئەو خانەقایە دروست بکەمەوە، بۆیە لە (٥/زولجەی/١٤١٢)ك بەرامبەر بە (١٩٩٢/٦/٦) دەست بەدروستکردنەوەی کرا.

جاهەردوولا، لەئەنجامی دڵسۆزیان ئەمەیان کردووە، بەڵام خانەقایەك بەم شێوە و نەخش و نیگارەوە کەدەگمەن بێت لەهەموو کوردستان دا، پاراستنی ئەو ئاوێنە بەندو نوسراوانەو ئەو هونەرە قەشەنگە و ئەو تەختە بەندە نایابە زۆر پێویست بوو. دەکرا تەعمیر کرایەو ئەو هونەرەش بپارێزرایە.

**وەقفەکان- (تەرخانکراوەکان):**

(وەقف) لەشەرعدا بریتییە لەڕاگرتنی ماڵێك کەقابیلی ئەوەبێ قازانجی لێبکرێ، لەگەڵ مانەوەی عەینەکەیدا. وەمەبەست لەڕاگرتنەکەی خەرج کردنی بەرهەمەکەی بێ بۆ مەبەستێکی مەباح. بەڵگەو دەلیلی (وەقف)لەشەرعدا بریتیە لەم ئایەتە (لَن تَنالوا البِرّ حَتّی تُنفِقوا مِمّا تُحِبون) واتە: ناگەن بەخێری تەواو

تالەڕێگەی خوادا خەرج نەکەن هەندێك لەو ماڵەتان کەخۆشتان ئەوێ. وەئەو فەرموودەیە کەپێغەمبەر (ص) فەرموویەتی:

(إذا ماتَ ابنُ آدم إنقَطعَ عَملهُ إلا عن ثلاث: صَدقة جارية أوعلم ينتفع به، أو وَلَد صالح يدعو له). یەعنی: کەئادەمیزاد مرد، ئەو کردەوانەی ئەبڕێنەوە، کەئەبن بەهۆی پاداشتی باش بۆی، مەگەر لەسێ ڕێگەوە: حەسەناتێکی نەبڕاوە، یازانستێك کەجێی هێشتبێ لەسەر لاپەڕەی کتێب یالە سنگی خوێندەوارانا، یامنداڵێکی بیر و باوەڕ باش و کردەوە پاك کەبۆی بپاڕێتەوە لەخوا، ئەم سێ شتە وەك کردەوەی نەفسی خۆی وان. مەبەستیش لەصەدەقەی نەبڕاوە (وەقف)ە. وەك (وەقف)کردنی باخێك بۆ مزگەوتێك یاخوێندنگایەك یاڕێبواران و هەژاران...هتد.[١٩]

تەوێڵەییش وەك موسڵمان هەڵسان بەوەقف- تەرخان- کردنی زۆرێك لەباخ و باخاتەکانیان لەڕێگەی خوادا، تاوەکو بەرئەو ئایەت و فەرموودەیە بکەون، کەئەمەش نیشانەو بەڵگەیە لەسەر چاکەو چاکە خوازیو بەخشندەیی‌و موسڵمانیەتی وەقفکەرەکان.

ئەو وەقفانەش کەوەقف کراون لەتەوێڵە بەزۆری داری گوێزن- ئەشگونجێ لەتەلاَنێکدا بەزۆری گوێزبن و داری تری تیابێت- ئەمەش لەلایەکەوە لەدارەکانی‌تر بەنرخ ترەو، وەکۆکردنەوەی بەرهەمەکەش ئاسانە. خاوەن باخ ئەودارە یائەو تەلاَنە کەلەباخەکەیدایە وەقفکراوە وەك باخەکەی خۆی خزمەتی‌دەکات و متوەلی مزگەوت لەگەڵ مەلاو چەند کەسانێکی ئەهلی‌مزگەوت بەرهەمی ئەو دارانە دەفرۆشن و بەزۆری لەمەزادی ئاشکرادا دەیدەن بەئیجار.

جائەم وەقفانە بۆ مزگەوتن یامەلای مزگەوت یافەقێ‌و مەدرەسەی مزگەوت یا بۆ نانی میوان، کەگوێزەکان فرۆشراون بۆ مەصروفی میوان، صەرف کراون یالەئێوارە و شەوی جومعەدا بەخشراونەتەوە.

**ئەوەی ئێمە بزانین سەرجەم ئەم وەقفانە بەم شێوەن:**

(١١) تەختە - واتە تەلاَنی گەورە- و (٦٢) تەلاَن و (١٣٠) چڵ دارگوێزن، بەم جۆرەش بەخشراون بەشوێنەکان:

ئەوتەلاَن و دارگوێزانەی کەوەقف کران بۆمزگەوتی گەورە ئەمانەن:

(٣) تەلاَن لەچەمی ئاوێسەر لەباخی ئەشکەوتی شەلکە.

(٣) تەلاَن لە چەمی ئاوێسەر لەباخی هەیبەکرە.

(١) تەلاَن لەچەمی ئاوێسەر لەباخی ئیبراهیم زەڕین لەهانەکڵە.

(٢) تەلاّن لەچەمی باخەکانی خوارەوە لەباخی مەجنون لەگەریات.
(٩) تەلاّن لەچەمی باخەکانی خوارەوە لەباخی ئاوێسەر لەدەروێش دادا.
(١) تەلاّن لەچەمی باخەکانی خوارەوە لەدەرە قازان.
(١) تەلاّن کە (٥)چڵ دارگوێزی تیایە لەچەمی باخەکانی خوارەوە لەشەمێ پشت پردەکە.
(١) تەختە (یەك تەلاّنی گەورە) لەچەمی باخەکانی خوارەوە لەبەردەم پردەکە لەگەریات
(١) تەختە لەچەمی باخەکانیخوارەوە لەسارا گێڵ.
(٢) تەختە لەچەمی باخەکانی خوارەوە لەتەختەی ڕابە لەگەڕیات.
(٣) تەلاّن لەچەمی باخەکانی خوارەوە لەماوەزای کەرەم
(١٥) تەختە لەچەمی باخەکانی خوارەوە لەشەخەڵگا لەباخی خاتو شەمسیە.
(٣) تەختە لەچەمی باخەکانی خوارەوە لەگەموٚت.
(١) تەختەی گەورە لەچەمی باخەکانی خوارەوە لەبەامبەر گەموٚت.
(٢) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەبەرامبەر ئەشکەوتی شەلکە لەباخی فائقی ئەشکە.
(٢) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەهانە کڵە.
(١) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەباخی مەلا نظامەدین.
(١) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەباخی منالاّنی عابدی حەمە یوسف.
(٢) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەباخی حاجی فەتاح
(٢) چڵ لەچەمی دزاوەر لەباخی ماوەزا- لەپشت خەستەخانە لەناو ئاوایی.
(١) چڵ لەچەمی دزاوەر لەدەرەی تەرتیبا لەباخی مستەفا کەریم پەروەر.
(١) چڵ لەچەمی خوارەوە لەبێدەری لەباخی قالەی مەجنون.
(٥) چڵ لەچەمی خوارەوە لەکاگیری لەباخی حاجی ئایزە.
(٦) چڵ لەچەمی خوارەوە لەبێدەری لەبەردەم باخی مەحمود فەرهاد.
(١) چڵ لەچەمی خوارەوە لەبێداری لەنزیك باخی نوری خودادا.
(١) چڵ لەچەمی خوارەوە لەباخی حەمە کوٚچەری.

**ئەوتەلاّن و دارگوێزانەی کەوەقف کراون بۆ مزگەوتی باساکا:**

(٣) تەختەی گەورە لەچەمی خوارەوە لەوەزە زەرد.

(٤) تەلاّن لەچەمیدزاوەر لەماوەزای مەجنون سەروو(هانە کلّەی سەعە)

(٤) چلّ لەچەمی دزاوەر لەهانە ملّکشا لەباخی حاجی تۆفیق

(٣) تەلاّن لەچەمیدزاوەر لەهانە کلّەی سەعە.

(١) چلّ لەچەمی دزاوەر لەدەرەی تەرتیبا لەباخی مستەفا کەریم پەروەر

(٣) چلّ لە دزاوەر لەبنجۆ لەباخی حاجیسەلیم حەمەکەریم

(١) چلّ لەچەمی دزاوەر لەهانە ملّکشا بەردەم باخی عەبولە

(٥) چلّ لەچەمی ئاوێسەر لەباخی حاجی فەتاح

(١) چلّ لەچەمی ئاوێسەر لەدەرە تفیّ

(١) تەلاّن لەچەمی دزاوەر لەباخی حاجی حەمەڕەق بۆ مەلای مزگەوتی باساکا

**ئەو تەلاّن و دارگوێزانەی کەوەقف کراون بۆ مزگەوتی بابا ئەسکەندەر:**

(٣) چلّ لەچەمی دزاوەر لە(هانەملّکشا) لەباخیسانە

(١) چلّ لە چەمی دزاوەر لە (سەرجۆ) لەباخی وەیسی ئەحمەد.

(٢) چلّ بەتەلاّنەوە لەچەمی خوارەوە لەباخی قاراغە

(٤) چلّ لەچەمی خوارەوە لەباخی عەبدولی عەلی

(١) چلّ لەچەمی خوارەوە لەباخی حاجی ئەولەی نەصە لەدەرە قازان.

(١) چلّ لەچەمیخوارەوە لەماوە زاسان لەباخی کەریمە.

(١) لەچەمی خوارەوە لەدەرە قازان لەباخی ئەبوبەکری کوزاد.

(١) چلّ لەچەمیخوارەوە لەدەرە قازان

(٢) چلّ لەچەمی خوارەوە لەگەریات لەتەختەی بەرگەمیّ.

(١) چلّ لەچەمی خوارەوە لەباخی فاتیّی وەستا صدیق لەدەرە قازان.

(١) چلّ لەچەمی خوارەوە لەدەرە قازان لەباخی حاجی جافر.

(٧) چلّ لەچەمی دزاوەر لەباخی محەمەدی حاجی سەلیم.

(١) چلّ لەچەمی دزاوەر لەهانە کلّەی سەعە لەباخی ئەولحامدی حسێن.

(١) چلّ لەچەمی دزاوەر لەباخی حاجی کامیل حەسەن.

(١) چلّ لەچەمی دزاوەر لەباخی حاجی حەمەزەریف.

(١) چلّ لەچەمی دزاوەر لەباخی مام ئۆلحامد.

(٢) چلّ لەچەمی ئاوێسەر لەدەرە تفیّ باخیبابای سێلە.

(٢) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەبنجۆی جۆگەی دێ لەباخی عەلی قادر
(١) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەماوامی باخی عوسمانی قالە وەلی
(٣) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەڕەزی ئەحمەد لەباخی وەستا حەمەڕەحیم
(٣) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەدەرەتفێ لەباخی حاجی سەلیم
(١) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەهانە سوسو لەباخی حاجی حەمەعەلی کوزاد
(٢) چڵ لەچەمی دزاوەر لەباخی حاجی حەسەن اللەکەرەم بۆ جومعانەی مزگەوت
(١) چڵ لەچەمی دزاوەر لەتەختەی مەحمودە لەباخی حاجی حەسەن اللەکەرەم بۆ جومعانەی مزگەوت

**ئەو تەلاَن و دارگوێزانەی کەوەقف کراون بۆ مزگەوتی کاك عەلی فەیرۆز:**

(١) تەلاَن لەچەمی ئاوێسەر لەلێژەڵە.
(٥) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەباخی حاجی فەتاح.
(٢) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لە شەمبانو لەباخی حاجی ئایزە.
(٣) چڵ لەچەمی ئاوێسە لەڕەزی ئەحمەد لەباخی وەستا حەمەڕەحیم.
(٥) چڵ لەچەمی خوارەوە لەبەرامبەر تەلاَنە گەورە.
(١) چڵ لەچەمی خوارەوە لەگەڕیات لەباغی قاراغە.

**ئەوتەلاَن و دارگوێزانەی کە وەقف کراون بۆ مزگەوتی فەقێ ئەحمەد:**

(١) چڵ لەچەمی خوارەوە لەباخی عابدی حاجیمحەمەد.
(١) چڵ لەچەمی خوارەوە لەشێخە ممەدی.
(١) چڵ لەچەمی خوارەوە لەگەڕیات لەباخی قاراغە
(٢) چڵ لەچەمی خوارەوە لەدەرە قازان لەباخی حاجی ئەولەی نەصە بۆ مەلای مزگەوتی فەقێ ئەحمەد.

**ئەودارو تەلاَنەی کەوەقف کراون بۆ خانەقا:**[٢١]

(٥) تەلاَن لەچەمی خوارەوە لەدەروێش دادا بۆ خانەقای تەوێڵە.
(٤) تەلاَن لەچەمی خوارەوە لەوەزە زەرد بۆ خانەقای بیارە
(١) تەلاَن (٥) چڵ دارگوێزی تیایە لە شێخە ممەدی بۆ خانەقای بیارە.

**ئەو تەلاَن و دارگوێزانە کەوەقف کراون بۆ نانی میوان و جومعانەی مزگەتی گەورە:**

(١) تەلاَن لەچەمی خوارەوە لەبنجۆ لەبەرامبەر باخی قاراغە بۆ نانی میوانی مزگەوت.
(١) چڵ لەچەمی خوارەوە لەماوە زاسان بۆ نانی میوانی مزگەوتی گەورە.

(٤) چڵ لەچەمی خوارەوە لەشەخەڵگالەو(١٥) تەلاًنەی باخی خاتوو شەمسیە بۆنانی میوانی مزگەوتی گەورە.
(٣) چڵ لەچەمی خوارەوە لەبنجۆی کابەرەرێ بۆ نانی میوانی مزگەوتی گەورە.
(٦) چڵ لەچەمی خوارەوە لەماوەزای پالأنیا بۆ نانی میوانیمزگەوتی گەورە.
(١) تەلأن لەچەمی ئاوێسەر لەباخی عەلی قادر بۆ نانی میوانی مزگەوتی گەورە.
(٣) تەلأن لەچەمی ئاوێسەر لەدەرەگای هۆمەرە لەباخی صابری کاکەلە بۆ نانی میوانی مزگەوتی گەورە.
(١) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەهانە سوسو لەباخی حاجی مستەفا بۆ نانی میوانی مزگەوتی گەورە.
(١) چڵ لەچەمی ئاوێسەر لەماوامی لەباخی وەستا حەمەڕەحیم بۆ نانی میوانی مزگەوتی گەرورە.

**ئەمانەی خوارەوەش بۆ جومعانە وەقف کراون بۆ مزگەوتی گەورە:**

(٣) چڵ لەچەمیدزاوەر لە دووتەلأنی بچوکدایە لەخەمەکاوەیەك لەنزیك ماڵەکان.
(٢) چڵ لەچەمی دزاوەر لەهانە ملکشا لەباخی حاجی حامد.
(١) چڵ لەچەمی دزاوەر لەنسارە لەباخی سەعید.
(١) چڵ لەچەمی دزاوەر لەلاوگا لەباخی حاجی فەرەج.
(١) چڵ لەچەمی دزاوەر لەهانە ملکشا لەباخی حەمەحسێن.

**تێبینی:**

هەندێك لەم گوێزانەی مزگەوتی گەورە وەقفی مەدرەسەکەو فەقێکانی مزگەوت بوون، بەلأم ئێستا چونکە مەدرەسەکە فەقێی نیە دراونەتەوە مزگەوت.

**شەخصەكان:**

لەتەوێڵەش وەك ناوچەكانی تری كوردستان كۆمەڵێك شەخص و نشینگە هەن بەچاوی ڕێزو پیرۆزەوە سەیریان دەكرێت. ڕێزگرتنی زانا و پیا و چاكان شتێكی چاكە و باشە بەڵام زۆر جار زیادەڕەوی تیاكراوە نابێت ئەم ڕێزە لەسنوری شەرع دەرچێت..

مێژووی ژیانی هەندێك لەم شەخصانە دیارنییەو هەر ناوەكەیان هەیە و شتێكی وامان بۆ ساغ نەبوەتەوە، ئیتریا نەوەیان لێ نەكەوتووەتەوە مردون و ڕشتە (شجرە)یان نەنوسراوەتەوە یاخود كەسایەتییە ناودارە ئاینییەكانی تەوێڵە لەزانایان و شێخان و سەیدەكان مێژووی ژیانیان ڕۆشنەو لەشوێنی خۆیدا ئاماژەمان پێ كردون.

لەدەمی مامۆستا (عەبدولكەریمی مەلائەحمەدی قازی)یەوە وەرم گرتووە كەئەویش لەباوكییەوە بیستویەتیكە:

(بابا ئەسكەندەر و باباخوادا و بابا سەرهەنگ و باباالله و بابا زەردەڵە برا بوون..)

لەكتێبی بنەماڵەی زانیارانی مامۆستا مەلاعەبدولكەریمی مودەڕیسیش دا ل (٣٧٩)دا هاتووە كە:

(بابا زەردەڵە ناوی شێردڵە و گۆڕەكەی لەپشتی دێی ئەحمەئاواوەیە)وەلە (ل ٣٦٥)یش دا دەڵێ:

(شێردڵ لەگەڵ چواریتردا.. بیلال و محەمەد و حەسەن و حسێن)دا كوڕی سەید ئیبراهیمی حسێنن كەدایكیان ناوی عەنبەرە و مێژووی مارەكردنی ئەم ژنە لەساڵی (٥٣٠ك)بووە. هەروەها لەهەمان سەرچاوەدا س (ل ٣٨٨)دا دەڵێت: سەیدئیبراهیم بە بابا نەوس ناسراوە. دوورنیە ئەمەڕاست نەبێت كەوەك چۆن باوكیان بەبابانەوس ناسراوە و شێردڵ بەبابا زەردەڵە. لەوانەیە بابا ئەسكەندەرو بابا سەرهەنگ و باباالله و بابا خواداش نازنا و بووبن بۆ چوار براكەی تر. دەڵێن ئەم پیرانە لەهەرشوێنێ مردبن لەوێ نێژراون.

**شەخصەكان لەتەوێڵە ئەمانەن:**

ئێمە لەسەر ئەم شەخصانە ئەمەمان دەست كەوتووەو لێرەدا بڵاوی دەكەینەوە بەهیوای ئەوەی لەئایندەدا كەسیتر شتی زیاتری دەست كەوێت تاباشتر بیان ناسین و شتیان لەسەر بڵاو بكرێتەوە.

– باباسەرهەنگ: لەهەردووپەڕاوی (مێژووی‌ویێژەی‌کورد)– ب ١– ل(٦٢– ٦٥) و (پەیامی هەورامان– ل (٤٢٠– ٤٢٦)دا باسی ئەم بابایە ئاوا هاتووە:

(..کوڕی ئیبراهیمی دەوانی‌یە = دەوان یادەودان ناوی گوندێکە بەرامبەر گوندی شێخانی هەورامانە، ڕووباری سیروان لەنێوانیاندایە– بەپێی یاداشتی دەست نووسی– کاکار دایی– لەساڵی (٣٢٤ک=٩٣٦ز) لەدەوروبەری کێوی شاهۆ لەدایك بووە وەکو لەم هۆنراوەدا دەڵێ:

وەسەنەی سێصەد بیست و چوارهجری

هاتف نـــام ئەو جە شاهۆ چـــڕی

بابـــا ســـەرهەنگ بەیـــەکێ لەپێشـــەوا ســـەرەکی‌یەکانی دینـــی یارەســـان دادەنرێت کەئەم پێنجەن:

ا– باڵوڵی دامەزرێنـەر بـەباڵوڵی (ماهی یادانا یا دێوانە) ناسـراوە سـاڵی مردنی بە (٨٣٤ز)دانراوە

ب– بابا سەرهەنگی دەوانی

ح– شاخۆشێنی لوڕستانی (١٠١٥ز– ١٠٧٤ز)

د– سەید ئیراهیمی بابا نەوسی سەرگەت (١٠٨٤– ١١٤٨ز)

ە– ســوڵتان ئیســحاق (ســوڵتانی ســاق)ی بــەرزنجی (١٢٨٧– ١٣٨٧ز) بە(سان سەهاك)یش ناسراوە. لەبەرزنجەوە دێتە (شێخان)ی هەورامان نیشتەجێ دەبـێ. هەریـەکێك لـەم پێشـەوایانە کۆمـەڵێك یاوەریـان پێگەیانـدووە،(بابـا سەرهەنگ) ئەمانەی پێگەیاندوون:

(بابا رتاف، بابا قەڵەم، بابا ڕۆم، بابا خونکار، بابا نەوا، بابا ڕەنج، بابا قەیسەری هەورامی، بابا گەرچەکی هەورامی، بابا سرنجی کەلاّتی، بابا ئیبراهیم، بابـا سەبورە، بابـا ئەحمەد، دایە تـەورێزی هـەورامی) لەسـەرەنجام دا هـاتووە: کـەبابا قەیســەر ماوەیـەك لەتەوێڵـە بـووە پاشـان چـوەتە دێی دەودان. ئـەوە ئـەگونجێ ئەو ناوانە هێماو ڕەمزبن بۆ ئەوە، ئەو ئەندامانە بەلای ناحەزانەوە نەناسرێن.

بـەپێی پـەڕاوی سـەرەنجام، بابـا سـەرهەنگ لـەئاخر و ئۆخری سـەدەی چـوارەم لەتەوێڵـەی هــەورامان دا لــەجیهان دەرچــووە، ئارامگاکــەی ئێســتا لەتەوێڵەیە. لەبابا سەرهەنگەوە، هەندێ هۆنراوە ماوەتەوە کەگەلێ بـەرزو ناسـکن هۆنراوەکـانی ئـەوو یـارانی لەپەڕاوێکـدا بـەناوی (دەورەی بابـا ســەرهەنگ) کۆکرانەتەوەو هێشتا چاپ نەدراوە. ئەمەش چەند نمونەیەك لەهۆنراوەکانی:

پەی ئامانتان، پەی ئامانتان گرد ئامادە بان، پەی ئامانتان

ئەز مەڵهەم مەنیە و نەزامانتان مەڕەسم وەحەق ئیمامانتان.

لەدووبەیتی‌تردا دەڵێ:

سەرهەنگ دەودان، سەرهەنگ دەودان ئەز کەناممەن، سەرهەنگ دەودان

چەنی‌ئێرمانان مەگێڵم هەردان مەکۆشم پەرێ ئایین کوردان

بابا سەرهەنگ لەسەردەمی دەروێشی‌یەکەی ئەم هۆنراوەی وتووە:

ها یاگەم چۆڵەن، ها یاگەم چۆڵەن وە وێنەی فەرهاد، هایاگەم چۆڵەن

لاڵم نەباڵەن، پۆستم نەکوڵەن هامدەمم کۆفەن، یاران نەهۆڵەن..!

لەدامێنی خوارەوەی تەوێڵە بەشی‌لای ڕاستی= گۆڕستانێکی گەورە هەیە، چونکە ئارامگەی (باوا سەرهەنگ) لەوێ‌یە ئەو گۆڕستانەش بەناوی (قەبرستانی باوا سەرهەنگ) ناسراوە.

ئەوەی شایەنی باس بێت:

لەلای خەڵکی تەوێڵە ئەم (بابا) یانەی تەوێڵە بەموسڵمان ناسراون و نەبیستراوە لەپێشینانەوە کەلەسەر دینی (یارەسان) بوبن.

- فەقێ ئەحمەدی غەزالی.. لەشوێنی‌خۆی‌دا کەمێك لەسەر ژیانی باسمان کردووە، گۆڕەکەی لەگەڕیاتەو مزگەوتێکیش بەو ناوەوە هەیە کەوەختی خۆی چلەخانە بووە.

- حاجی بەرەشارەت: گۆڕەکەی لەقەبرستانی باوا سەرهەنگە بەڵکو بەشێك لەو گۆڕستانە بەحاجی بەشارەت ناسراوە کەسەرەتای گۆڕستانەکە کەوتووە بەرەو دۆڵەکە.

- بابا ئەسکەندەر: مزگەوتێك لەتەوێڵەدا هەیە بەم ناوەوە لەپشتی مزگەوتەکەوە شەخصێك هەیە( گۆڕێك هەیە) بەگۆڕی بابا ئەسکەندەر ناسراوە.

- بابا خوادا: نشینگەکەی لەپشتی خەمەکاوەوەیە لەمالێدەر لەپشت ماڵی‌سانەوە.

- باباالله: نشینگەکەی لەهانە سوسووە. ئەوسا شوێنێك هەبوو لەنزیك پردەکە ئێستا تێکدراوەو بووەتە ڕێگا.

- کاکڵە پیرۆز: دەڵێن لەئەصڵدا ناوی کاك عەلی فەیرۆز یاپیرۆزە، نشینگەیەك هەیە لەچلانە و لەپاڵیدا مزگەوتێك بەم ناوەوە هەیە.

- صـوّفی‌جانه: لـەدامێنی خـوارووی ڕۆژهـەلاتی تەوێڵەدایـە بەقـەدباڵی شاخێکەوە، شوێنێکی خۆش و دڵگیرە، دەڵێن: ئەمە نشینگەی ئەم صۆفی‌یە بووە، وەناویشی (جانوالله)یە.
- هاڵی صەفانا.. ناوی شێخ عەلی صەفایە و گۆڕەکەی لەپێینی گەڕەکی دەمەرە سورایە.
- پیرو وەزە زەردی: لەدەرە قازاندایە لەباخەکانی تەوێڵە و سۆسەکاندایە.
- پیرو وەزە سوری: لەنێوان هانەکڵە و ئاوێسەردایە.
- شـێخە ممـەدی: لـەدەرە قازاندایـە لـەناو باخـەکانی صـاڵحی ئەحمـەدی مەحمود.
- شێخ شابەدین (شێخ شەهابەدین)

لەچەمی دزاوەرە لەسـەر سنوری تەوێڵە و دزاوەر، کەوتووەتـە نـاو خـاکی دزاوەرەوە، چـونکە شـێخ شـەهابەدیینەکان لەمێـژوودا زۆر بـوون شـتێکی وا کەجێگەی قەناعەت بێ و سەرچاوەکەی گومانی تیا نەبێت دەستمان نەکەوتووە، ئایا ئەمە شێخ شەهابەدینی کاکۆزە کەریایە کەلەساڵی (١٠٠٣- ١٠٧٢ک)ژیـاوە. یـاخود سـەی شـەهابەدینی شـارەزوور بـووە هاتووەتـە هەورامانـەوە کەلـەنێوان ساڵانی (٦٥٩- ٧٤٨ک)دا ژیاوە.

لەپەڕاوی (نـورو بەصری) مەلامستەفای سەرگەتی- ل (٣٢)دا هـاتووە وە دەڵێت: (..مامۆستای پیرشالیار ناوی شێخ شەهابەدین بووە، دانیشتووی دێی دزاوەر، کەدێیەکـە کەوتووەتـە خـاکی ئێرانـەوە نزیـك (تەوێڵـە)، وە پیرشـالیار لەخزمـەتی شـێخ شـەهابەدین، تەریقـەت وەرئـەگریْو کچێکی‌خۆی پـێ‌داوە نـاوی ساراخاتوون بووە، وە پیرشالیار ژنێکی تری بووە بەناوی شـەهبارە خـاتوون، وە شێخ شەهابەدین لەخزمەتی شێخ عەبدولقادردا بە بەهرەی تەریقـەت گەیشتووە. شێخ شەهاب لەدزاوەر کۆچی دوایی کردووەو گۆڕەکەی لەوێ‌یە..)

ئەم سەرچاوە ساڵی ژیانی شێخ شەهابی دیـاری نەکردووە، بەڵام پێشتر لەباسی پیرشـالیاردا کەباسـی دەکـات دەڵـێ لـەنێوان سـاڵانی (٥٣٥ك- ٦١٠ك)دا ژیاوە.

لـە (مێـژووی کـورد و کوردسـتانی- محەمـەد مـەردۆخی کوردسـتانی‌دا ل (١٩٠)دا دەڵێ:

(..بابـا مـەردۆخ کـەبابا گـەورەی شـێخ محەمـەدی مەردۆخی‌یـە، لەسـاڵی (٧٧٥ك)دا هاتووەتـە هـەورامان و سـاڵی (٧٧٨)ك کچـی شـێخ شـەهابەدینی

دزاوەری هێناوە و لە هەورامان دا جێگیر بووە. ساڵی(٨٤٢)ك بەهاوکاری شێخ شەهابەدین دەستی بەڕاگەیاندنی قورئان و بڵاو کردنەوەی ئیسلام کردوە، بەڵام مەبەستی بەتەواوی نەهاتووەتە دی‌و لەدنیا دەرچووە و مەولانا گوشایشی کوڕی بابا مەردۆخ جێگای گرتووەتەوە..) ئەمەش دووشتی جیاوازە... ؟؟!

**چلەخانەکان ( خەڵوەخانەکان ):**

کاتێك کەگۆشەگیری لەنێوان موسڵمانان دا سەری هەڵدا، بەواتایەکی‌تر (تەصەوف) بووە بەڕێبازێك، شێخ و موریدەکان کاتێکی تایبەتیان هەڵبژارد بۆ (خواپەرستی‌و پاککردنەوەی دەرونەکان) جا دەچونە شوێنێکی تایبەتەوە بەتەنهایی بۆ ماوەی چل ڕۆژ خواردنێکی سوك و کەمیان دەخوارد، چونکە تەوێڵەش لەزووەوە ڕێبازی نەقشبەندی تیابووە بەتایبەت لەسەردەمی شێخ عوسمان سراجەدینی یەکەم، بۆیە چەند چلەخانەیەکی تیابووە کەئەمانەن:

- چلەخانەی صۆفی ئەحمەد و صۆفی مەحمودی کوڕی، کەدوایی بەحوجرەکەی مەلانەزیر و قاپی‌شێخ ناسرا. کەلەوە و پێش باسمان کرد.
- چلەخانەی فەقێ ئەحمەدی غەزایی دوایی ڕووخاو بووە کەلاوە و پاشان مزگەوتێکی تیا کرایەوە بەناوی مزگەوتی فەقێ ئەحمەدی غەزایی.
- چلەخانەی خانەقا.. لەشوێنی خۆی باس کراوە.
- چلەخانەی مەلانەزیری گەورە لەدەرەی بەڵخ.
- چلەخانەی حاجی مەحیەدینی کوڕی مەلانەزیر، ئەمیش هەر لەپشت چلەخانەکەی باوکی‌یەوە لەدەرەی بەڵخ ئەمانە ئێستا شوێنەواریان ماوە.

## بنەماڵە ناودارە ئاینیەکان:

لـە تەوێڵـەدا کۆمـەڵێك کەسـایەتی نـاودار هـەن کەخزمـەتێکی فراوانیـان بەئاینی ئیسلام کـردوە و ڕۆڵێکـی بـێ ئەندازەیان بینیوە نـەك هەر لەناوچەکەدا بەڵکو لەدەرەوەی کوردستانیش دا دەنرخێنرێن.

ڕۆڵـی ئەمانـە لەناوچـەکەدا زۆر بـووە، پێویستە ئـەو ڕۆڵـەیان فـەرامۆش نـەکرێت، ئەگـەر پەڕاوێك لەسەر ئەم ناوچەیە دابنرێت خزمـەتی ئەم ناودارانـە تۆمـار نـەکات و ژیانیـان بەسـەر نەکاتـەوە، وادەزانـین ئـەو پـەڕاوە کـەم و کـوڕی هەیـەو تـەواو دەرناچـێت، بۆیـە جێگـەی خۆیـەتی کـە لاپـەڕەی ژیانیـان هەڵبدەینەوەو سودو پەند لە ژیانیان وەربگرین.

**بنەماڵە ئاینی‌یەکانی تەوێڵە دەکرێن بەسێ بەشەوە:**

بنەماڵەی شێخان، بنەماڵەی سەیدەکان، بنەماڵەی زانایان.

بەپێی توانـاو بـوار هـەوڵ دەدەیـن ئـەم سـێ بنەماڵەیـە بەسـەر بکەینـەوەو کەمێك لەسەر ژیانیان بنوسین.

### بنەماڵەی شێخان[٢٢] :

م.س.لازاریف لە کێشەی کورد (ب– ١ل– ٤٧)دا دەڵێ:

شـێخەکانی هـەورامان و شـەمدینان، نـاوێکی باشـیان بـۆ خۆیـان پەیـدا کردبـوو، سەریشـیان بـۆ هـیچ یـەکێك لـەو حکومەتانـە شـۆڕ نەئـەکرد و تـەواو سەربەخۆ بوون.

واسیلی‌نیکیتین لەکوردو کوردستان دا(ل٦٢١)و.خالیدی حیسامی) دەڵێ:

بنەماڵـەی شـێخ عوسمـان لـە تەوێڵـەو بیـارەدا دانیشـتون کـە زۆر خـاوەن دەسەلات و دەست ڕۆییون. کوڕەزاکانی شێخ عوسمان (نەجمەدین و، عەلائـەدین و، عـەلی حیسـامەدین) ئـەمرۆ لەگـەورە پیـاوانی نـاو ئـەو بنەماڵەیـەن و عێلاتـی موکری‌و مامەش و مەنگور لە قسەیان دەرناچن....)

هەروەها مینۆرسکی (ل١٠٩و– حەمەسەعید حەمەکەریم)باسی گرنگی ئەم شێخانەی هەورامانی کردوەو نوسیویە: (ئەم شێخانە ڕێزێکی سەیریان هەیە، نـەك تـەنها لـەلای کوردەکـان، بـەڵکو تەنانـەت خـەڵکی لەئاسـیای ناوەڕاسـت و لەولاتی ئێمەشەوە دێن بۆ لایان و دەچنە تەکیەکانیان).

الفضل بالعلم والأدب ولا بالأصل والنسب
بنەماڵەی شێخان
عثمان سراج الدين
حكيم
معروف
محمد بهاءالدين
عمر ضياءالدين
عبدالرحمن - أبوالوفاء
أحمد شمس الدين
عثمان
راغب
معتصم
محمد
عبدالله
شمس الدين
كاوه
سلام
علي حسام الدين
صادق
مظهر
جعفر
محمد - كاكەشێخ
صفاءالدين
حمەأمين كاردۆخی
محمود
حمەرشيد
عطا
مصطفى
جلال
محمود
عدنان
فؤاد
فاروق
جميل
كمال
جمال
كريم
أحمد
عادل
علي
كوسار
لقمان
عرفان
عبدالرحمن
تاج الدين
جمال الدين
حسن
حبيب
عبدالله
هيدايەت
محمد
عطاءالله
سعيد
محي الدين
أنور
علاءالدين
سعدالدين
نظام الدين
نجم الدين
جميل
كامل
ثاقب
زين لدين
حيدر
محمود
كاكەأحمد
عين الدين
سيف الدين
محمد صاحب
محمد عثمان
كمال الدين
محمد
نورالدين
عبدالحميد
مظهر
ثابت
أمين
نوري
محمد
مختار
زاهيد
عزالدين
مولانا خالد
عثمان
جمال الدين
عبدالملك
ناصح
عبدالرووف
مادح

لە بڵاوکراوەی ڕۆڤار- ژ(١٢) دا کەتایبەتە بە(مەولانا خالیدی نەقشبەندی- نمەی وەجدو مۆمی نیوەشەو ل١٣ دەلێ: مەولانا لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا نوێنەرایەتی باڵی ڕیفۆرمخوازی نێو بزوتنەوەی نەقشبەندی دەکرد، ئەم باڵە بیست ساڵ پاش مردنی، بەشێوەیەکی دیار لەشێخانی ناوچەی هەورامان دا بەرجەستە بوو.

لە(ژیانی کوردەواری)دا ل- ٢٠٤ کە(تۆمابوا) نوسیویەتیو ئاواز زەنگەنە لەفەرەنسیەوە کردویەتی بە عەرەبیو حەمەسەعید حەمەکەریم لەعەرەبیەوە کردویەتی بەکوردی..دەڵێ:

(..ئەمرۆ شێخەکانی نەقشبەندی زۆرترو دەستەڵاتیان لەشێخەکانی قادری زیاترەو ئەتوانین بڵێین لەهەموویان دەسەڵات دارتر: شێخەکانی شەمسەدین و نەهری و بەرزان و شێخەکانی تەوێڵەن.

## شێخ عوسمان سراجەدین

(١١٩٥- ١٢٨٣ك) = (١٧٨١ - ١٨٦٧)ز

ئەم زاتە لەتەوێڵە لەدایك بووەو ناوی عوسمانەو نازناوی (سراجەدین)ە،[٢٣] کوڕی خالد ئاغای کوڕی عەبدوللە ئاغای کوڕی سەید محەمەدی کوڕی سەید دەروێشی کوڕی سەید مەعروفی کوڕی سەید جومعەی کوڕی سەید زاهیری نەعێمی‌یە، کەدانیشتووی چیای حەمرین بووە.

محەمەد دەروێش لەچیای حەمرینەوە ڕووەو هەورامان هاتووە و لەتەوێڵەدا نیشتەجێ بووە و نەوەی لێکەوتووەتەوە ئەمانە لەتەوێڵەدا ڕێزیان لێگیراوە و بەئاغا ناسراون و بونەتە موختاری تەوێڵە .

دایکی شێخ عوسمان ناوی حەلیمەی کچی فەقێ ئەبوبەکری تەوێڵەیی‌یە کەبەفەقێ (هەی‌بەکر)ناسراوەو ئەچێتەوە سەر فەقێ ئەحمەدی غەزایی کەئەمیش لەنەوەی شێخ ئەبولحەسەنی شازلی‌یە. واتە شێخ عوسمان لەباوکەوە لەنەوەی ئیمام حسەینەو لەدایکەوە لەنەوەی ئیمام حەسەنەو بەم شێوە تان و پۆ سەیدن. بەڵام ئەم بنەماڵە تائێستا داوای سەیدیان نەکردووە.

ئەم بەڕێزە هەر بەمناڵی لەتەوێڵە دەستی کردووە بەخوێندن و پاشان چووەتە بیارەو خەرپانیو خورماڵ. لەتەمەنی (٢٥)ساڵیدا چووەتە بەغدا و لەمزگەوتی (شێخ عەبدولقادری گەیلانی)دا دامەزراوە و خەریکی (عیلم و زیکر و فکرو تەقوا) بووە. لەتەمەنی (٣١) ساڵیدا دەبێ لەساڵی (١٢٢٦)ك لەبەغدا

بەخزمەت مەولانا خالیدی نەقشبەندی دەگات و تەریقەتی لێوەردەگرێ. پێش تر شێخ عوسمان لەسەردەمی لاویەتی‌دا، مەولانای بینیوە کەسەردانی تەوێڵە و بیارە و خورماڵی کردووە.

لەهەردوو ساڵی (١٢٢٧، ١٢٢٨)دا کەمەولانا دەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، شێخ عوسمانیش لەگەڵیدا دەگەڕێتەوە، هەردوو ساڵەکە لەژێر چاودێری مەولانادا دەبێت، تاساڵی (١٢٢٨ك)لەتەمەنی (٣٣) ساڵیدا ئیجازەی خەلافەت وەردەگرێ. بەم جۆرە شێخ عوسمان یەکەم کەس دەبێت کەمەولانا ئیجازەی خەلافەتی دابێتێ.

لەساڵەکانی (١٢٢٨بۆ ١٢٣٦ ك) شێخ عوسمان بەزۆری لەخزمەتی مەولانادا دەبێت چ لەبەغدا و چ لەسلێمانی‌و دەبێتە جێگەی متمانەی مەولانا و، خەلیفەیەکی پایە بەرزی مەقام بووە. لەساڵی (١٢٣٦ك) کەمەولانا سلێمانی بەجێ دێڵێ شێخ عوسمان دەگەڕێتەوە بۆ تەوێڵە و دەست دەکات بەڕێنمونی کردنی خەڵکی ئەو دەڤەرە.

لەناوچەی هەورامان و باباندا، مەولانا خەلیفەیەکی لەشێخ عوسمان شایانتر و لێهاتو و تری نەبووە. لەبەر ئەوە لەهەموولایەکەوە خەڵك ڕوویان تێکردوەو، هەمیشە خانەقای تەوێڵە پڕبووە لەمورید و مەنسوب، کەلەزۆر لای کوردستان و وڵاتانی ئیسلامی‌یەوە هاتوون.

ئیتر شێخ عوسمان لەساڵی (١٢٣٦ بۆ ١٢٨٣ك) جگە لەدوو ساڵ نەبێ کەهاتووە بۆ سلێمانی، هەرلە هەورامان دەبێ‌و خەریکی ئیرشاد بووە.

لەساڵی (١٢٥٤ك) لەسەر داوای ئەحمەد پاشای کوڕی سلێمان پاشای بابان، شێخ عوسمان دێتە خانەقای مەولانا، لەسلێمانی، بۆ ئیرشادی موسڵمانان، لەجاران زۆرتر خەڵك ڕوو دەکاتە خانەقاو وەکو بڵێی دەوری ئیرشادی مەولانا لەخانەقا تازە دەبێتەوە.

شێخ عوسمان، خەلیفە و مەنسوبی زۆر بووە، جەنابی مامۆستا مەلاعەبدولکەریم لەیادی مەردان بەرگی دووەم دا لەلاپەڕە (٢١- ٢٦)ناوی (٩٤) خەلیفەی تۆمارکردووە، هەروەها لەلاپەڕە (٢٦- ٢٨)دا ناوی (٣٣)مەنسوبیشی تۆمار کردووە، جگە لەمەش دۆستی زۆری بووە و سەردانی کردون، بەتایبەت دۆستەکانی لەسنە و جوانڕۆ و ڕەوانسەر و دەگاشێخانی مەریوان و کۆیسنجق و کەرکوك و بەغدا زۆر بوون. لەگەڵ شێخ عەبدوڕەحمان تاڵەبانی کەمەشهورە بە (خالص) پەیوەندی بەهێز بووە.

شێخ عوسمان جگە لەسەردان، بۆلای دۆست و مورید و مەنسوبەکانی بەنامەش بەسەری کردونەتەوە و ئامۆژگاری جوانی کردون (١٠)وەصیەتی جوانی بۆ مورید و مەنسوبەکانی نوسیووە، نامەکانیشی بەپارچە شیعری جوان ڕازاندوەتەوە، هەروەها لەلایەن مەولاناو خەلیفە و دۆستەکانیشیەوە نامەی زۆری بۆ هاتووە.

دەستخەتە ئەصلیەکەی نامەکەی شێخ

نامەیەکی شێخ عوسمانمان دەست کەوتووە کەبە فارسی نوسراوە و بۆ یەکێ لەموریدەکانی خۆی نوسیووە بەناوی (شێخ حسێن)ەوە، لەنامەکەدا داوای (٢٥)قەران قەرز دەکات و لەلای خۆی دەست ناکەوێت و زۆر پێویستی پێیەتی. وەداوا دەکات کەبەصۆفی (ڕەیحان)دا بۆی بنێرێ‌و ئەویش لەگەڵ کاروانەکەی صۆفی عەلی ڕەزا بگەڕێتەوە، کۆتایی نامەکەش مۆر و ئیمزای شێخ عوسمانی پێوەیە.

شێخ لەئەدەب و نوسین دا دەستیهەبووە:

- پەڕاوێکی هەیە بەناوی فەرائض- دوو دەست نوسی هەیە بەناوی (ریاض المشتاقین)و (رسالة وضع و استعمارة)
- هەروەها پەڕاوێزی بۆ (رسالة الشاه صدیق الهراتی)ی شێخ عەبدولقادری گەیلانی دایناوە.

شێخ عوسمان لەتەمەنی (٣٣) ساڵیدا ژنی هێناوە و (١٧) کچ و (٦) کوڕ (٨) برای بووە کەئەمە ناوەکانیانە:

(مستەفا، قاسم، ئەحمەد، مەعروف، حسێن، عەبدواللە، مەحمود، ڕەسوڵ هەر بەمناڵی مردووە).

کوڕەکانی ئەمانە بوون:

- عەبدولحەکیم- هەربەمناڵی مردووە.
- مەعروف- (١٢٥١- ١٢٧٧)ك ژنی‌هێناوەو نەچوەتە تەریقەتەوە لەتەمەنی (٢٦)ساڵیدا مردووە.
- محەمەد بەهائەدین (١٢٥٢- ١٢٩٨)ك
- عەبدوڕەحمان ئەبولوەفا (١٢٥٣- ١٢٨٥)ك
- عومەر زیائەدین (١٢٥٥- ١٣١٨)ك
- ئەحمەد شەمسەدین (١٢٦٦- ١٣٧٠)ك

هەرچوار لەدوایی‌دا باسیان دەکەین لەگەڵ هەندێ لەنەوەکانیشیان.

شێخ لەدوا ساڵەکانی ژیانیا خۆی توشی نەخۆشی ئیفلیجی بووە، بۆیە کاروبار و ڕێ نمونی موسڵمانەکانی زیاتر داوە دەستی هەردوو کوڕە گەورەکانی، محەمەد بەهائەدین و عەبدوڕەحمان ئەبولوەفا. لەنیوە شەوی سێشەمەی (١٣/شەشەلانی، ١٢٨٣ك) لەتەمەنی (٨٨)ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات، لەدوای (٥٥)ساڵ ئیرشاد کردنی موسڵمانان. هەرلە باخچەکەی خۆی‌دا نزیك بەخانەقاکەی بەخاك دەسپێرێ.

ئەوەی جێگەی باسە:

شێخەکانی هەورامان لەنەوەی ئەم شێخ عوسمانەن و ئەوانی تر دەچنەوە سەر ئەم بەڕێزە. ئەمیش لەتیرەی ئاغالەرن کەلە تەوێڵە دەژین و لەدوای ئەمیش گەورەترین کوڕی کەمحەمەد بەهائەدین بوو، بوە جێگری. گەلێ لەئەدیب و شاعیرانی سەردەمی خۆی شعریان لەسەرکۆچی دوایی شێخ سراجەدین نوسیوە، لەوانە:

قەسیدەیەکی فارسی مەلاحامیدی بێسارانی‌یە، کەکاتب و خەلیفەی شێخ خۆی بووە، لەگەڵ قەسیدە عەرەبی‌یەکەی مەولەوی:[٢٦]

ئەمەش هەندێك لەقەصیدەکەی مەلاحامیدە کەدەڵێ:

امشب کەجهان یکسر پرنالەو فریاد است
عالم همە درهم شد تاباز چەغم زاد است

اشوب قیامەت خاست یازمزمەء توحید
کە حضرت شیخ ما در حلقەء ارشاد است

نەان و نەاین باشد کان پادشە معنی
اهنگ سفر فرمود، عزمش عدم اباد است

.. نصف شب سەشنبە، ثالث عشر شوال

این واقعەء عظمی، وین هائله رخ داد است

در فکرشدم کاندر تاریخ چەبنویسم

ناگاه خرد گفتا قطب راه ارشاد است[٢٧]

تاریخ ظهور، نیز چون (مظهر گل) باشد[٢٨]

پس سن شریف او هشت ازپی هشتاد است

مەولەویش لەقەصیدەکەی‌دا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| لاحت کمشکاة بها مصباحٌ | وذلكَ المصباحُ فی زُجاجةٍ |
| نعم بها سراج الدین المصطفی | ضیاء أهل الشرع والطریقةِ |
| ... ظاهرُهُ شرعٌ وورعٌ أکملُ | باطنهُ حقیقة الحقیقةِ |
| أمَرَ بالمعروفِ جداً ونَهی | عَن کلِّ منکرٍ وَکلِّ بدعَةِ.. |
| .. فانفَجَرَت میاهُهُ فقد جرت | بِکلِ عبر وَبِکل شرعةِ |
| فَسَقَت الزرعُ الی أن إستوی | وبَعدما اضطرَبَتْ وَسَقَتِ |
| أهدأ اضطرابُ بَحرِ الواحدِ[٢٩] | بِذا بَدا تأریخُ عام الهجرةِ.. |
| .. لقد أصاب قلبنا مُصیبةُ | ألسنُ کُلٍ فی أداءِ کَلّتِ.. |

مەلاعەبدولکەریم مەلائەحمەدی قازی لەوەسفی سراجەدین دا دەڵێ:

شێخی تەوێڵە سراجەدین بووە

بزرگی وەها هیچ کەس نەیدیووە

لەناو کوردانا بەناو بانگ بووە

لەڕێی تەریقەت گەلێ بێباک بووە

لەناوپیاوچاکان مەعلوم ئەولیایە

لەناو عالمان گەورەی عولەمایە

لەناوشێخان دا سەرکردەیانە

لەڕیز پیاوان، پێش هەموویانە

تەریقە ئەوە نەقشبەندیە

مەعلومە ڕاستە هیچ کەمی نیە

## شێخ محەمەد بەهائەدین کوڕی شێخ عوسمان سراجەدین

**( ١٢٥٢ - ١٢٩٨ ك ) = ( ١٨١٨ - ١٨٧٢ ز )**

لە (٨) ڕەبیعی دووەم ساڵی (١٢٥٢ك) لە تەوێڵە لەدیك بووە، دایکی ناوی خاتوو خورشیدە و لەبەگزادەکانی ماواتە، لەناوچەی شارباژێر. قورئانی لەتەوێڵە لای مەلا مەحمودی دشەیی خوێندوە پاش ئەوە لای مەلاحامیدی کاتبی باوکی خوێندنی نەحو صەرفی خوێندوە، لەخزمەت باوکیدا، تەریقەتی وەرگرتووە و ئیجازەی ئیرشادی دراوەتێ. دوای باوکی لەگەڵ عەبدوڕەحمانی برای دەبنە جێگری.

خانەقای تەوێڵە لەسەردەمی شێخ محەمەد بەهائەدین دا جمەی هاتووە، ڕێکەوتووە لەشەوێکدا ئەڵقەی خەتمە ئەوەندە زۆر بووە حەفتا خەلیفە هەستاون بۆ (توجهات)و بەجێ هێنانی ئادابی تەریقەت.[٣٠]

گەلێ زانایانی کورد عەرەب و تورك، لەخانەقادا، لەخزمەتیدا کۆبونەتەوە، بەتایبەت مەلائەحمەدی نۆدشەیی، سەید عەبدوڕەحیمی مەولەوی‌و مەلاحامیدی کاتب و مەلاعەلی تاڵشی‌و شێخ عەبدوڕەحمانی قەرەداغی‌و حاجی شێخ ئەمینی خاڵ.[٣١]

لەساڵی (١٢٩٠ك)چووە بۆ حەج و لەم سەفەرەدا حاجی مەلائەحمەدی نۆدشە و چەند کەسی دیکەی لەگەڵ خۆیدا بردووە، پاشان چووە بۆ دانشگای ئەزهەر لەمیصر و لەوێوە بۆ شام و لەشامەوە گەڕاوەتەوە سلێمانی‌و هاتووەتەوە تەوێڵە. ئەم سەفەرەی نۆ مانگی خایاندووە. مەولەوی لەکاتی پێشوازی‌دا ئەم شیعرانەی گوتووە:

ئاینەی کامڵ! ئازیزەکەی فەرد!
فیدای ئامات بۆ، صەفاییت ئاوەرد
خەیلێن، گەرد، پات، نەدیدەم دووربی
یانەی چەم وێران، تەمام خاپووربی.[٣٢]

شێخ بەهائەدین، جگە لەخەلیفە و مەنسوبەکانی باوکی، خۆیشی چەند خەلیفە و مەنسوبێکی پێگەیاندووە، وەك: شێخ عەبدوڕەحمان قەرەداغی - باوکی شێخ عومەری قەرەداغی، کەبە (ئیبن قەرەداغی) بەناوبانگە، هەروەها حاجی شێخ ئەمینی خاڵ، مەلا محەمەدی مەحمودی شاعیر.

شێخ نامەی زۆری نوسیوە، بۆ موریدو دۆستەکانی، چونکە دەستی نوسین و شیعریشی بووە و، نامەکانی گاریگەری خۆیان بووە و،[٣٣] لەگەڵ شێخ

عوبەیدواڵڵەی شەمزینیو موئەید دەولەی حاكمی ئەردەڵاندا نامەی گۆڕیوەتەوە.
نازناوی شیعریشی- ئەبولبەهاء- بووە.

ئەبولبەهاء- لەكۆتایی ژیانیدا، تووشی سەرئێشە بووە و، زۆر ناڕەحەتی كردووە، لەتەمەنی (٤٦) ساڵیدا، لەڕۆژی هەینی، بەرواری (٥- ڕەبیعی یەكەمی- ١٢٩٨ك) لەگوڵپ كۆچی دوایی كردوەو، براوەتەوە تەوێڵە و لەپاڵ باوكیدا، بەخاك سپێرراوە. ماوەی ئیرشادی (١٤)ساڵ بووە[٣٤] لەدوای خۆی پێنج كوری لێ بەجێماوە:

شێخ عەلی حیسامەدین، شێخ صادق،[٣٥] شێخ مەزهەر، شێخ جەعفەر، شێخ محەمەد ناسراوە بەكاكە شێخ. شێخ عەلی حیسامەدین لەدیارترین نەوەیەتی وەك لەدواتر باسی دەكەین.

ڕوداوێك لەنێوان شێخ بەهائەدین و فەرهاد میرزای مامی ناصرەدین شای قاجاردا:

مامۆستا مەلاعەبدولكەریمی مودەڕیس لەیادی مەردان دا ل (٨١)دەڵێ: لەشێخ بابا ڕەسولی شێخ عارفی دۆڵاشی مەریوانم بیست و وتی: بیستومە لەساڵی (١٢٨٦)ی هیجری‌دا، فەرهاد میرزای مافی ناصرەدین شای قاجاڕ بەلەشكرێكی زۆرەوە، دێ بۆ هەورامان تابەگزادەكانی هەورامان ڕام بكا بۆ دەوڵەتی ئێران.

بەگزادەی هەورامانی لهۆن و هەورامانی ئەودیویش ترسیان لێ ئەنیشێو پەنا ئەبەنە بەر شێخ محەمەد بەهائەدین كەبڕوا بۆلای فەرهاد میرزا كەلەدێی (هەجمنە) ئەبێ تكای لێبكا دەس بەرداریان بێو پێی بلێ هەرچیمان لێداوا ئەكا بۆی ئەیكەین بەومەرجەی بەلەشكرەوە نەیەتە سەرمان، چونكە توانای بەرگە گرتنمان نیەو میللەتەكەیش فەقیر و هەژارە.

شێخیش ئەڕوا و لەڕێدا لە(دەرگا شێخان)دا ئەبەزێ ئەڵێ بابەر لەوەی بڕۆم چاوم پێ بكەوێ، نامەیەكی بۆ بنوسم، بزانم ئەڵێ چیو بیری لەگەڵ هەورامان و هەورامی‌دا چۆنە؟ نامەیەكی بۆ ئەنوسێ لەنامەكەیا ئامۆژگاری ئەكا كەدەس بەرداری لەشكر ناردنە سەر هەورامان ببێ باخوێنی موسڵمانان بەناهەق نەڕژێ. كەنامە ئەگاتە دەستی فەرهاد میرزا زۆر توڕە ئەبێو وەڵامی شێخ ئەنوسێتەوە و دەس بەڕوویەوە ئەنێ، لەسەرەتای نامەكەیشیەوە ئەم بەیتە ئەنوسێ:

ماشێخ و زاهد نمی شناسیم　　　یاجام بادە، یاڕوی ساقی

کەوەڵامەکەی فەرهاد میرزا بەشێخ ئەگا، ئەمیش دوو کەلیمەی تری بۆ ئەنوسیٚ و ئەم بەیتە لەسەرەتای نامەکەیەوە ئەنوسیٚ:

ماميرو سلطان نمی شناسیم　　　یاعدل و احسان، یاقهر باقی

ئیتر لەدەگا شێخانەوە ئەگەڕێتەوە بۆ هەورامان بۆ شوێنی خۆی.

مەسەلەکەیش درێژە ئەکێشیٚ و سەرەنجام ئەکێشێتەوە بۆ جەنگ لەنێوان لەشکری فەرهاد میرزاو عەشایری هەوراماندا. هەورامی‌یەکان (شەبی‌خوون) ئەدەن بەسەر سوپای فەرهاد میرزاداو ئەیانشکێنن و ناچاری هەڵهاتنیان ئەکەن، تەنانەت فەرهاد میرزا خۆی بەزەحمەت لەملەی (بلچە سووره)وە لەسەر هەژگ بەسەر بەفردا ڕایان کێشاوە تالەدەست تفەنگچی هەورامی ڕزگاریان کردووە. فەرهاد میرزا خۆی باسی ئەم ڕووداوەی لە (منشآت)ە کەیدا نووسیووە، نووسیویشیە:

فليس الفرارُ اليومَ عاراً عَلى الفتى

إذا كان معلوماً شُجاعةُ امسهِ

هەلاتن نابێتە شورەیی بۆ کەسێك، کەئازایی ئەو کەسە لەڕۆژی پێشوو دوێنیٚدا زانرابێت.

## شێخ عەلی حیسامەدین:

(١٨٦٢-١٩٤٠ز)

لەشەوی (٢٤)ی صەفەری / ١٢٧٨ لەتەوێڵە لەدایك بووە و، ناوی دایکی تەیبەی کچی شێخ عەبدوڕەحمانی بێلەنگەیە لەقەزای هەڵەبجە. تاقانەی دایکی‌و کوڕەگەورە و ڕێزداری باوکی بووە. دوو ژنی هێناوە، خاتوو شکۆفە و خاتوو خورشید.(٣٦)

شێخ عەلی لە تەوێڵە قورئان و هەندیٚ لەوردە کتێبەکانی نەحو صەرفی خوێندوە، پاشان تەریقەتی وەرگرتووە.لەدوای باوکی ئەم بەجێگری لەتەوێڵە دانراوە و، شێخ عومەر ضیائەدینی مامیشی هاتوەتە بیارەو، شێخ ئەحمەدی مامیشی لەئەحمەد ئاواو زەڵم دانیشتووە.

شێخ حیسامەدین زۆر خۆشی ڕابواردووەو، حەزی لەئاوەدانکردنەوە کردوە، لەزۆر شوێندا باخ و باخات و خانوبەرەی بووە و ئاوەدانی کردوەتەوە وەك: تەوێڵە، کراویە دۆڵ، هانە نەوتیٚ، نوێن، باخەکۆن، تەپەکەل، چەمی زەڵم، خورماڵ، شوێنی تایبەتی گەرمیان و کوێستانیشی بووە.(٣٧)

لەخزمەتی شێخ ئەحمەدی مامیدا، پەروەردە بووە و سلوکی کردوە و پێگەیووە، پیاوێکی بەڕێز و خاوەن پایە و شکۆ بووە، لەڕووی کۆمەڵایەتی‌یەوە، کەم وێنە بووە، زۆر قسەزان و زمان پاراوو بەئیدارە بووە، لەخەت و پەخشان نوسیندا تاقانەی سەردەمی خۆی بووە، کوردیو فارسیو عەرەبیو تورکی‌چاك زانیوە. لەبارەی پۆشاك و بەرگەوە، پاك و خاوێن و ناسك بووە.

شێخ حیسامەدین لەبەر چەند هۆیەك ماڵ دەگوازێتەوە بۆ باخەکۆن، کەباخەکۆن لەوەوپێش باخ و باخاتێك بووە، ماڵێ یا دوو ماڵی تیابووە، کەشێخ چوە ئەوێ ئاوەدان کراوەتەوە و خانوو خانەقای تیاکراوەتەوە.

(.. شێخ حیسامەدین کەسایەتی‌یەکی ناودار بووە، پەیوەندی لەگەڵ شای ئێران (ڕەزاشا)و شای عێراق (مەلیك فەیصەڵی یەکەم)و لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی (سوڵتان عەبدولحەمید)و (شا ژنی ئینگلیز)و سەرۆکی ڕوسیا (ستالین) هەبووە، دەوترێ کەئاڵ و گۆڕی نامەی لەگەڵ ئەوانەدا بووەو ئەو نامانەش لای شێخ موعتەصەمن و هەڵی گرتوون[٣٨]

دەڵێن: شێخ حیسامەدین حەزی لەتێکەڵاوی پادشایان و سەردانی دەسەڵاتداران نەبووە، بەڵام ئەوان هاتوون بۆلایو نامەیان بۆ نوسیووە، لەوانەی کەسەردانیان کردووە:

مەلیك فەیصەڵی یەکەم پادشای عێراق لەساڵی(١٩٢٥)دا، ڕەزاشای ئێران، شێخ مەحمودی مەلیکی کوردستان.. لەسەردانەکەی مەلیك فەیصەڵدا شاندێکی لەگەڵدا دەبن کەپێك هاتبوون لە- یاسین هاشمی- سەرۆکی مەجلیسی نوواب، سەید محەمەد سەدر- سەرۆکی مەجلیسی ئەعیان، نوری سەعید- وەزیری بەرگری، عەبدولموحسین سەعدون- سەرۆك وەزیران... لەپێشوازیەکەدا، شێخ عوسمان حیسامەدین و شێخ حەبیبوڵڵەو کۆمەڵێکی زۆر لەو جەماوەرە دەبن. دەماودەم بیستراوە کەشێخ لەژورەکەی خۆی نەهاتووەتە دەرەوەو مەلیك چووەتە ژوورەکە، لەوێ شێخ پێشوازی لێکردووەو یەکتریان بینیووە.[٣٩]

دەگێڕنەوە: مەلیك فەیصەڵ ویستوویەتی مەعاشی بۆ ببڕێتەوە بەڵام شێخ قەبوڵی نەکردووە. هەروەها دەگێڕنەوە: کەئینگلیز (٣٠٠) ڕوپیە مانگانەی بۆ بڕیوەتەوەو ئەویشی قبوڵ نەکردووە.[٤٠]

لەمێژووی هەورامان دا –ل (٤٥١– ٤٥٤)دا هاتووە و دەڵێ:

چەند ژمارەیەکی گۆڤاری ساڵنامەی دونیا کەبەفارسی لەئێران دەرچوون، شتی زۆریان لەسەر شێخ حیسامەدین بڵاو کردوەتەوە، لەژمارە (١٨)، ل (١٧٠–١٧١)دا، نوسەرێك بەناوی (عەبدولحسێن ئاورنگ)، (شێخ و لمەلیك)ەوە، وتارێ لەبارەی یاداشتی (ڕەزمارا)و (شێخ حیسامەدین)ەوە، نوسیووە و خەستەکەی بەم جۆرەی خوارەوەی، دەگێڕێتەوە:

مـن کەنماینـدەی ئەنجومـەنی نوێنـەران بـووم و لەبەرئـەوەی کـەبۆ چـەند کۆبونەوەیەکی ئەنجومەن، لەبەر نەخۆشی نەم توانی‌بوو ئامادەی کۆبونەوەکان ببم، (ڕەزمارا)هـات و سـەری لێدام، هـەروەك لـەوەو پێشتریش ئامۆشۆی مـن و هەندێ لەنوێنەرانی دیکەی دەکرد.

کەهاتنە سەر گفتوگۆی لەبارەی چۆنیەتی ئەنجومەن و هەڵس و کەوتیـەوە (ڕەزمـارا) هەناسـەیەکی، دوورو درێـژی دوکـەڵاوی، هەڵمـژیو وتـی: سـاڵی (١٣٠٩)ئێرانی ڕۆژی، من سەروانێ بووم، لەکوردستان داو، بەهۆی هەندێ کاری (ئەرتەش=لەشکر)ەوە، چووم بۆ هەورامان و چوومە تەوێڵەو ئالەوێ‌دا، بۆ نانی نیوەڕۆو، نانی ئێوارە مامەوەو هەروەك چەندان کەس ناسراوو نەناس، دەچوونە ئەوێو بەبێ چەنیو چۆنی، نانیان دەخوارد و دەنوستن!

پاشان بەخزمەتی شێخ گەیشتم و کەوتینە، گفتوگۆ کردن و پاشان ئەو بەوردی لەدەم چاوم و چۆنیەتی گفتوگۆم، وردبوویەوەو ئەوجا پـیێ وتم: (تـۆ لەماوەی بیست ساڵی دیکەدا دەبی بەسەرۆك وەزیران)!!

بەهـەرحاڵ، مـن بـیرم لەوگوتەیـەی، شـێخی حیسـامەدین زۆر کـردەوە، لەوماوەیەدا، ساڵان (١٣٢٥)دا بۆ چەندان، جار بۆ کوردستان گەڕاومەتەوە، بەڵام سەرم لەشێخی حیسامەدین نەداوەو، لەئەنجامدا، ئەوەبوو شێخ وەفاتی کردو منیش ئەوەندەی پێنەچوو بووم بەسەرۆك وەزیران!)

– شێخ حیسـامەدین، وەك کەسـایەتی‌یەکی ئاینی لەناوچەکەدا، ڕۆڵێکـی کاریگەری بینیووە لەکۆکردنەوەی جەماوەر بۆ بەرگری لە کوردستان لەهێرشـی ڕوسـەکان لەناوچـەی سەردەشـت و دەوروبـەری– وەك لەشـوێنی تـردا باسـی ئەمەدەکەین.

- شێخ گەڵێ مزگەوتی کردووەتەوە وەك مزگەوتی: نوێن، خورماڵ، هەباسئاوا، مزگەوتی(عەلی حیسامەدین) لەسەقز.
- شێخ حیسامەدین ئەو ماوەی کەهاتە باخەکۆن بەهاوینان ئەگەر نەهاتایەتەوە بۆ تەوێڵە، ئەوە هاوینەکەی دەچوو بۆ هاوینە هەواری کراویە دۆڵ ئەوڕێگای کراویە دۆڵی کردەوە کەڕێگایە کەلە (باخەکۆن)و (گەچێنە)وە دەست پێ‌دەکات بەقەدباڵی ئەوشاخانەدا لابەلاو کەمێك بەرز دەبێتەوە بەسەرچەند کانیەکی جوان و ئاوی سازگاردا دێت. ئەگەر بەسەر کەژی سپیەوە سەیری ئەوڕێگا بکەی زۆر باش تەرتیب کراوە و هەڵبژێراوە، دەچیتە (شرام)و (مارانی)و (هانە سوارا)و (نەڵکمین)و (کویلە)و (بزازەرا)و (کەلەتەنگە)و تاوەکو دەگاتە (کراویە دۆڵ).
- کەشکۆڵە بێ‌وێنەکەی لەبەشی (فەرهەنگ و ڕۆشنبیری لەهەورامان)دا باسمان کردووە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەدەب دۆستی‌و خوێندەواری‌و کتێبخانەکەی شێخ حیسامەدین.
- شێخ کۆتایی ژیانی لەباخەکۆن بەسەر برد، تاوەکو لەشەوی سێ‌شەممە (٢٧) زی‌الحەجە/ ١٣٥٨ك بەرامبەر شوباتی ساڵی (١٩٤٠) کۆچی دوایی کردو هەرلەوێش بەخاك سپێرراوە. شێخ حیسامەدین چوار کوڕی بووە بەناوی (محەمەد و عوسمان و موعتەصەم و ڕاغب) شێخ محەمەد کەکوڕە گەورەی بووە لەدوای باوکی بووە جێنشین، بەڵام زۆری نەبرد چووە ئێران و ئیتر ژیانی لە ئێران بەسەربردو لە (١٩٧١/٣/١٩)کۆچی دوای کردو تەرمەکەیان هێناوەتەوە بۆ تەوێڵەو لەوێ بەخاك سپێرراوە.

شێخ محەمەد منداڵی زۆری بووە، ناودار ترینیان (شێخ ئەحمەد)بووە، پێش ئەوەی باوکی بچێتە ئێران ئەم بووە جێگەدار و کەباوکیشی لەعێراق دا نەما ئەم زیاتر دەرکەت و سەرپەرشتی خانەقا و مورید و صۆفی‌یەکانی هەورامانی عێراقی کرد.

## شێخ ئەحمەد[٤١]:

(١٩٢٢- ١٩٨٩/١٠/٥ز)

کوڕی شێخ محەمەدی شێخ حیسامەدینە لەساڵی (١٩٢٢)ز لەگوڵپ لەدایک بووە. قورئـان و وردە کتێبـەکانی لای مەلاخالیـدی مـوفتیزادە لەباخـەکۆن و پاشان لای مەلا محەمەدی قادر مەرزی، لەخانەگا خوێندووە.

ژیـانی لـەگوڵپ و تەوێڵـە و هەڵەبجـە بەسـەر بـردووە، لەهـەر شـوێنێ دانیشـتبێ سەرپەرشـتی خانـەقای تەوێڵـە و باخـەکۆنی کـردووە، لەسـاڵی پەنجاکانـدا هاتووەتـە هەڵەبجە و خانەقایـەکی کردوەتـەوە، ئیتر هـەر لەهەڵبجە بـووە، جارجـارەش بـۆ سەرپەرشـتی خانەقاکـەی تەوێڵـە بەتایبـەت لـەهاوینان چوەتەوە تەوێڵە.

ئـەو کاتانـەی کەچـووەتەوە بـۆ تەوێڵـە، خانـەقای تەوێڵـە جمـەی دەهـات لـــەدەروێش و صـــۆفیو موریـــد و مەنســوبەکانی نەقشــبەندی، بەتایبــەت لەئێرانەوە زۆر دەهاتن بۆ تەوێڵە.

شـێخ ئەحمـەد لەهەڵەبجـە مایـەوە تالـە کیمیابارانەکـەی، هەڵەبجـە چـووە ئێران، چوویە شاری سنە لـەوێ مایەوە و خــەڵکێکی زۆر لـــەدەوری کۆبویـــەوە، بەتایبـــەت موریـــد و مەنســـوبەکانی بنەماڵەکەیان.

لەســـاڵی (١٩٨٩)تووشـــی نەخۆشیەك هات بردیانە تاران لەئەنجامدا لەشـەوی ٥شـەمە سـەعات١/٣٠ی شـەو بـەرواری (١٩٨٩/١٠/٥)ز بەرامبـەر (٤\١٣) ڕەبیعـی یەکـەم سـاڵی (١٤١٠)کۆچـی لەتاران کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ شاری سنە، لەگۆڕستانی شێخ محەمەد باقر بەخاك سپێررا، ئەو ڕۆژە لەسنە بازاڕو دوکان هەموو داخراو خەڵکەکە بەشداریان کـرد لەبـەخاك سپاردنی تەرمەکـەیدا، بـە (هـەلی کۆپتـەر) وێنەی (مەڕاسیمە)کە لەلایەن کۆماری ئیسلامیەوە گیرا.

ئەوەی شایەنی باس بێت:

شێخ ئەحمەد پیاوێکی خواناس بوو، توانی لەژیانیدا بەسەربەرزی بژی‌و پاڵی نەداوە بەدەسەڵاتدارانەوە، کەزۆرجار هاتوونەتە لای بۆ هەندێ مەسائل کەچی ڕەفزی کردووە، هەروەها ئەو ماوەیە، مووی ڕیشی پێغەمبەری (ص) (محاسینی شریف)ی پاراستووە، کەزۆر هەوڵ دراوە بۆ دزین و کڕینی‌و بەزۆر لێسەندنی.

شێخ ئەحمەد سێ ژنی هێناوە:

- مریەمی کچی شێخ موعتەصەم کەعەبدوڕەحمان و سارای لێبووە.
- حەدەخان کچی شێخ عوسمان سراجەدینی دووەم کە: جوان و تاراو عیرفان و لوقمان و کۆساری لێبووە.
- بەدیعەخان کچی عیزەت بەگی جاف کە عەلی و عادلی لێبووە.

لەسەر وەسیەتی شێخ ئەحمەد لەدوای خۆی شێخ عەلی کوڕی کرایەوە جێنشینی‌و ئێستا لەسەر خانەقاکەی هەڵەبجەیە.

## شێخ عەبدوڕەحمان ئەبولوەفا

(٥/موحەڕەمی/١٢٥٣- ١٢٨٥ )ك= ( ١٨٣٧- ١٨٦٨ز)

ئەم شێخە کوڕی شێخ عوسمان سراجەدینە، دایکی برازای مەولانا خالید بووە. لەخزمەتی مەلا مەحمودی دشەو مەلائەحمەدی نۆدشەو مەلاحامیدی کاتب و سەید عەبدوڕەحیمی مەولەوی‌دا خوێندویەتی‌و، لەخزمەتی باوکیدا سلوکی کردوە و، بوو بەخەلیفە و، ئیجازەی ئیرشادی وەرگرتووە.

لەساڵی (١٢٧١ك)دا، باوکی دەینێرێت بۆ سنە، بۆ ئامۆژگاری کردنی ئەمانوڵڵاخان والی سنە، کەبەغولام شاخان ناسراوە، کەویستوویەتی خەڵکی شاری سنە بانگ بکا بۆ بوون بەشیعە، لەم سەفەرەدا مەلائەحمەدی نۆدشە و مەولەوی‌و گەلێ لەزانایانی لەگەڵ دا دەبێ.

لەدوای باوکی، لەگەڵ شێخ محەمەد بەهائەدینی برا گەورەی‌دا، بوون بەوەلی عەهدی باوکیان، دوای ماوەیەکی کەم، دەچێتە گوڵپ و پاشان چووەتە بەغدا و لەمزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی‌دا ئیرشادی کردووە.

زۆر بەڕێز و خاوەن پایە بووە و، گەلێ لەزانایان تەمەسوکیان پێوە کردوە، والی بەغدا زۆرجار زیارەتی کردووە.

پاش نزیکەی ساڵێك چووە بۆ حەج کەگەڕاوەتەوە زۆری نەبردووە، نەخۆش کەوتووەو سێ ساڵ دوای باوکی، واتە لەساڵی (١٢٨٥ك)دا کۆچی‌دوایی کردووەو لەگۆڕستانی گەیلانی بەخاك سپێرراوە.

لەدوای خۆی تەنها (تاجەدین)ی کوڕی بەجێماوە کەپیاوێکی چاك و لەخواترس بووە، ئەمیش (جەماله دین)ی تاقانەی لێ بەجێماوە.

حاجی شێخ عەبدوڕەحمان پیاوێکی خاوەن عیبادەت و لەخواترس بووە لەبەغدا خەڵکی زۆر لەدەوری کۆبونەتەوە، هەروەها ناوبرا و نوسەر و شاعیر بووە، دیوانێکی نایابی هەیە، بەڵام بەداخەوە شیعرەکانی بەزۆری فارسین لەیادی مەردان دا بەرگی یەکەم (ل ١٠٥بۆ ١٤٩)هەندێك شیعری بڵاوکراوەتەوە.

## شێخ عومەر ضیائەدین کوڕی شێخ عوسمان سراجەدین

(٢٦/جەمادی یەکەم/١٢٥٥- ٢٢/شەوالی/١٣١٨)ك = (١٨٣٩- ١٩٠٠)ز

ئەم بەڕێزە لەبیارە لەدایك دەبێ‌و، لەخانەقای تەوێڵە دەستی کردوە بەخوێندن، دوایی بۆ خوێندن، چووەتە کەرکوك. لەخزمەتی باوکیدا تەمەسوکی کردوە و تەریقەتی وەرگرتووە و، لەژێر دەستی برا گەورەکەی (محەمەد بەهائەدین)دا، تەواو پێگەیشتووە، لەساڵی (١٢٩٤)ك ئیجازەی خەلافەتی دراوەتی[٤٢] هەرچەندە ئیجازەی وەرگرتووە، بەڵام لەخزمەتی کاکیدا وەك موریدێك ماوەتەوە، تالەساڵی (١٣٠١)دا، دێتە بیارە و لەوێ خەریکی ئیرشاد دەبێ شێخ عومەر سەردانی چەند شوێنێکی کردووە، وەك: بەغدا و کەربەلاو نەجەف و... لەزۆر شوێندا، خانەقا و مزگەوتی کردوەتەوە لەوانە:

لەساڵی (١٣٠١)لەخانەقین، خانەقا و حوجرە و، خانویەك بۆ موتەوەلی دەکاتەوە.

لەساڵی.(١٣٠٣)لە (قزلڕەبات=سەعدیە) خانەقایەك دروست دەکات.

لەساڵی (١٣٠٦)لە کفری خانەقایەك دەکاتەوە.

لەساڵی (١٣١٢)هەر لەکفری مزگەوتێك دەکاتەوە کەسوڵتان عەبدولحەمید یارمەتی داوە، بۆیە بەناوی سوڵتانەوە ناونراوە.

لەدەوربەری ساڵی (١٣١٠) لەبیاوێڵە خانەقایەك و حوجرەیەك دەکاتەوە.

لەدەوربەری ساڵی (١٣١٤) لەسەردەشت خانەقایەکی تر دروست دەکات.

لەساڵی (١٣٠٧) خانەقای بیارە دروست دەکات، لەوەوپێش لەمزگەوتی بیارەدا ئیرشادی کردوە.. لەبەرامبەر خانەقاکەوە، خانوو بۆ خۆیو، بۆ مامۆستا شێخ حەیدەرومەلای گەورە و بۆ فەقێو میوان و موریدەکانی دروست دەکات.

شێخ لەگەڵ دروست کردنی ئەم خانەقایانەشدا، هەوڵی داوە، حوجرەش لەپاڵیاندا بۆ زۆریان دروست بکات و مەلاو خەلیفەشی بۆ دابین کردون، تاوەکو شەریعەت و تەریقەت بەیەکەوە شان بەشانی یەك بن.

لەساڵی(١٣٠٣)دا ناردویەتی بەشوێن مەلاعەبدولقادری مودەڕیس-کانیکەوەیی بازیانیدا، کەلەلای (ئەمین ئەسادات) بووە، لە(کوچك چەرمو)بۆ ئەوەی ببێتە مودەڕیسی خوێندگاکەی بیارەوە بووەو داشمەزراوەو زیاد لە(١٠٠) قوتابی لەبیارەدا، کۆبونەتەوە، کەهەریەکەیان بوونەتە زاناو پێشەوای بەناوبانگ لە کوردستاندا.[٤٣]

مامۆستامەلا عەبدولکەریم لەبارەی ئەم خوێندگاوە دەڵێ: بەکورتی:

خوێندنگای بیارە دیمەنێکی بچکۆلانەی (جامع لئەزهەر)ی میصر بووە لەکوردستانداو، شانی داوەلەشانی ئەو، لەبڵاوکردنەوەی زانست و لەخواترسیدا، بنکەیەکی تیشکدەر و ڕوناککەرەوەی وڵات بووە، ئێستەیش هەرکەس، لەم وڵاتەدا، زانابێو خزمەتی دین بکا بێگومان پەیوەندی- نزیك یادوری- بەو خوێندگاوە هەیە.[٤٤]

هەروەها شێخ هەوڵی داوە کتێبخانەیەك لەبیارەدا بکاتەوە و کتێبی نایاب و دانسقەی بۆ پەیدا کردوە.[٤٥]

شێخ عومەر زۆر ڕێزی زانا و فەقێی گرتووە، بەڵکو فەزڵی داوە بەسەر خەلیفە و موریدەکانیدا.

دەگێڕنەوە:

- - کەکتێبی بەدیاری بۆ هاتبێ سوجدەی شوکری بردوە.

- کەبیستویەتی چەند فەقێیەك بەڕێوەن، نزیك بوونەتەوە دێن بۆ بیارە بخوێنن، خۆی دەگۆڕی، تا نەیناسنەوە، کۆڵەکانیانی بۆ هەڵئەگرتن تائەی گەیاندنە خوێندنگاکە.

- شێخ (ضیائەدین) ڕازی نەبووە کەدەوڵەتی عوسمانیو قاجارپیەکان مەعاشی بۆ ببڕنەوە... ئەوەتا (ناصرەدین شای قاجاڕی) نامەیەکی دوورو درێژی بۆ دەنوسێ کەئامادەی خۆی دەردەخات ئەگەر شێخ قبوڵ بکات باموچەو مەصرەفی خانەقا مانگانە ڕەوانە بکات، شێخ بەم شێوە وەڵام دەداتەوە:

ما ابروی فقرو قناعت نمی بریم

باپادشاه بگوئید که روزی مقراست

واتە: ئێمە ئابڕوی هەژاری و قەناعەت نابەین بەپاشا بڵێن کەڕۆزی بڕایەوە هەرلەو قەناعەتەوە کەشیعری (کولاهی عیزەت) دەنوسێ..[٤٦]

– شێخ عومەر: گەلێ خەلیفە و مەنسوبی چاکی پێگەیاندووە کەلە (یادی مەردان)دا، ب– ٢، ل (٢٧٣)دا ناوی (٤١) خەلیفەی هاتووە.

– شێخ، زاناو زانست دۆست بووە و خزمەتکاری زانایان بووە، خەتخۆش و نوسەرو ئەدیب و شاعیر بووە، هۆنراوەکانی بەزمانی عەرەبیو فارسیو کوردی بەهەرد و شێوە (هەورامیو سۆرانی)هەیە، نازناوی شیعریشی (فەوزی)یە.

سێ نامیلکەی نوسیووە بەم ناوانە:

– لطائف جهت دفع اشکال مسلمانان، اداب الابرار الکرام، لطائف الخمسة، هەروەها نامەی زۆریشی نوسیووە بۆ سوڵتان عەبدولحەمید و شای قاجاڕ و فەرمانڕەواکانی بەغدا و هەورامان، جگە لەمەش بۆ خەلیفە و مەنسوب و مورید و دۆست و کوڕەکانی.[٤٧]

شێخ عومەر ضیائەدین لەتەمەنی (٦٣)ساڵیدا لەبیارە کۆچی دوای کردووە و هەرلەوێش بەخاك سپێرراوە. شێخ نۆ کوڕ و چوار کچی بوون: کوڕەکانی: مەحیەدین، عەلائەدین، نەجمەدین، سەعدەدین، نزامەدین، ئەنوەر، جەمیل، کامیل، تائب.

کچەکانیشی ئەمانە بوون:

عەدەخان، فاتمەخان، سەنیەجان، عەتیەخان.[٤٨]

لەهۆنراوەکانی:[٤٩]

قیبلەم وەردەنم... قیبلەم وەردەنم — جەوساوە ژاراو دوریت وەردەنم

چەنیدڵ و گیان، شەرتێ کەردەنم — مەیل نەدەو وەکەس، تاڕۆی مەردەنم

لەبارەی زیکری خواوە ئەڵێ:

چونکە زیکری تۆن، مایەی حەیاتم — وەشیو شادیو شەوق، مایەی نیشاتم

جەمەماتەدا، باتۆم جەیاد بۆ — جەو عالەمەدا، دڵ وەتۆ شادبۆ

لەبارەی تەوحیدەوە دەڵێ:

فەقیهی مەدرەسەی، تەوحیدم ئیمڕۆ — فەریدی دائیرەی، تەفریدم ئیمڕۆ

لەشوێنێکی تریش دا دەڵێ:

کولاهی صیحەتم ناوێ، کەعیللەت تاجی زیللەتمە

کەوای عیزەزەت لەبەرناکەم، کەقیللەت بەرگی ڕەحمەتمە
لەعەیش و نۆشی حەیوانی، ئەمن چیبکەم کەئینسانم
خەیاڵی بیٚبەقا، بۆچی، کەزیکری‌یا خیللەتمە قەتعەن
بەشەرئەصڵەن نەبووناوی، مەلەک ڕیٚگەی نەبوقەتحەن
لەعەرشی وەحدە تا وابوو، کەڕەحمەت جیٚی مەحەببەتمە
عیبادەت بۆکەسیٚچاکە گوروفتاری تەبیعەت بیٚ
کەمن مەفتونی جانانم، چەباکی دەردو عبللەتمە
ئەگەر دولبەر بلاویٚنی، هەمموودەردو بەلاٚخۆشە
خوداناکەردە مەیلی‌نا، چەفەرقی سوقم و صیحەتمە
کەدیم خویٚن جاریە ئەمڕۆ، لەجەرگ و دلٚ وەکوسیلاب
وتم ئەم شاهیدە کافی حیساباتی قیاماتمە
مەلیٚ (فەوزی)لەفەهمی خۆت مەکە کەفکری بەتالٚ هەرگیز
ئەوەی تۆ تیٚدەگەی، چاوم، ئیشاراتی لە خیللەتمە

* * *

وەشانازاری، لاونا دلاٚن — چەوەخت خەزان، چەفەصلٚ گولاٚن
دلاٚن وەششان، جەنازارانەن — وەشی ڕەنگی‌گولاٚن، نمەو وارانەن
بولبول ناڵەشان، خەیلیٚوەسۆزەن — نیگای نازاران، چاک دلٚ دۆزەن
ئەو وەشی‌و ئەوڕەنگ،ئیٚد ناڵەی سەحەر — گردین بان وەفیدای نیم نیگای دڵبەر
قیناتم، قوتم، زیندەگیم، شادیم — وەشیم، وەش کەیفیم، جەژن و ئازادیم
ئەوسان کەئازیز لاونۆمەوە — وەنیم نیگای ناز تاونۆمەوە
ئەودەم ئارەزووم کامڵەن یەقین — فانی بۆجەلام، جەمع ئافیلین
تەنیای تاک مانۆ، پاسە ئەوسابیٚ — غەیر پیٚسەی ئەوسا، عەدەم ماوابیٚ

گەلیٚهۆنراوەی فارسیشی‌هەیە، لەهۆنراوەیەکی‌دا بەم شیٚوە دەست پیٚدەکا:

نەطالبم بەجاەو جلال و منال و مال — نەشایقم بەزیور وزلف و بەخط و خال

لەهۆنراوەیەکی تردا دەلیٚ:

رسم عاشق بود وفاکردن — جان بەصدق و صفا فدا کردن
جان و دل، عقل و هوش صبرو خرد — همە را در رضا فدا کردن

گەلیٚ هۆنراوەی عەرەبیشی نوسیووە لەیەکیٚکیان دا دەلیٚ:

أنا مذنبٌ، أنا خاطئٌ، أنا عاصي — هو راحم، هو غافر، هو كافي
قابلتُ منه، ثلاثةٌ بثلاثةٍ — إذ غالبَتْ أوصافهُ أوصافي

نامەیەکی دەستخەتی شێخ عومەرمان لایە بەهۆنراوە، ناردویەتی بۆ مەلا عەبدوالله ی جەلی زادەی کۆیەو ئەویش هەر بەهۆنراوە وەڵامی شێخی داوەتەوە، ئێمەش لێرەدا وای بەباش ئەزانین هەندێك لەو دوو نامەیە بلاو بکەینەوە:

(دەمێکە کاغەزت نایەتەلامان — عەجەب سستی لەپەیغام و سەلامان
جەلی دەبێ دایم، جلوەی دیاربێ — لەناو گێژاوی شەط بێ، یاکەنار بێ
عومەر عومرێکە، بۆ تۆ انتظارە — لەشەوقی تۆ وەکو ئاو بێ قەرارە
چ انصافێکە گاهێ ناوی نابەی — چ فکرێکت هەیە، بێ باکی تاکەی
حەیاتی من بەیادی تۆ مەنووطە — نەوازش چاوەکەم لایق بەخوتە
دەبوو بۆ خاتری، تەفریحی یاران — بکەی سەیرو صەفا، وەقتی بەهاران
ببینی شارەزووری، سەوزو سور — بچیتە کێوی هەورامانی پڕ نور...)

وەڵامی حاجی عەبدوالله ی کۆیەش ئەمەیە:

(جەلی ئیسمم خەفی ڕەسمم دووڕەنگی — مثالی مەسئەلەی کافورو زەنگی
سوهای بێچارە قوربان چۆن دیارە — لەوەقتی شەعشەعەی شمس النهارە
عومەر عومرێکە گەر مەیلی بەلامە — ئیتر بۆچ مەرکەزی دەردو بەڵامە
هەموو عومرم بەپاییز چوو لەهیجران — بەهاری هیچ نەدی لەوگەشت و سەیران
بەقوربان شارەزوری چۆن ببینم — زەڕو زۆرم نیە شەقاو هەڵێنم
لەجێگای کێوی هەورامانی پڕ نوور — لەسەر کۆهی غەمان کەوتم وەدور
ئەگەر لوطفت هەبێ پێ ڕادەکێشم — لەقافڵەی ( ... ) باهەردەم لەپێشم
ئەو ڕۆژەی ئەتۆم دیوە لەبەغدا — ملم داوە بەحەق والله وبالله...)

## شێخ نەجمەدین شێخ عومەر

(١٢٨٠- ٩/ موحەڕەمی/١٣٣٧)ك = (١٨٦٣- ١٩١٩)ز

وتمان شێخ عومەر نۆ کوڕی بووە، لەناو ئەمانەد، دوو کوڕیان، سلوکیان کردووە و بوون بەخەلیفە، نەجمەدین و عەلائەدین. ئەم دوو برا لەدایکەوە جیاوازن، دایکی نەجمەدین کچی مەحمودبەگی ساحێب قەرانی سلێمانیە، بەڵام دایکی عەلائەدین ئامۆزای شێخ عومەر ضیائەدین خۆی بووە.

نەجمەدین لەتەوێڵە لەدایك دەبێ‌و، قورئان و کتێبەکانی نەحو و صەرف و فیقهی خوێندوە و، لەتەمەنی (١٢)ساڵیدا لەخزمەتی شێخ بەهائەدینی مامیدا سلوکی کردووەو تەریقەتی وەرگرتووە، پاشان لەخزمەتی باوکیدا بووە، تا ئیجازەی خەلیفایەتی وەرگرتووە پاش کۆچی دوایی باوکی بووە، بەجێگەنشینی و لەخانەقای بیارەدا ئیرشادی کردووە و، مورید و مەنسوبەکانی باوکی گوێڕایەڵی بوون، پیاوێکی لەخواترس و زاهد بووە، زۆر حەزی لەکۆڕی زانست و علومە ئیسلامیەکان بووە، خزمەتی خوێندگاکەی بیارەی باش کردوە. دەڵێن: تا مەجلیسی عولەمای بەرز وەستابایە و موتاڵای کتێبی گەورە خواناسانی دەست بکەوتایە شتی تری نەدەکرد. هەروەها ڕازی نەبووە دەوڵەتی عوسمانی مانگانە بڕێتەوە بۆ خانەقا، وتویەتی: خوا پەك ناخات و نامانەوێت.

لە بیارە کۆچی دوایی کردوەو هەر لەوێ بەخاك سپێردراوە.(١١)کوڕی بووە. [٥٠] بەڵام لەدوای خۆی (٩) کوڕی بەجێ ماوە، گەورەترینیان شێخ نورەدینە کەلەجێی باوکی دانیشتووە.[٥١]

شێخ نەجمەدین شاعیر و خۆشنوس بووە و نازناوی شیعری (کەوکەب)ەو شیعرو نامەی جوانی هەبووە، بەڵام بەداخەوە کوردیەکانمان دەست نەکەوتن[٥٢] هەروەها لەبەرگری کردن لەهێرشی ڕوسەکان، ڕۆڵێکی کاریگەری بینیوە وەك لەبەشی ڕامیاریدا باسی دەکەین.

## شێخ عەلائەدین شێخ عومەر[٥٣]
(١٨٦٣-١٩٥٤ز)

لە (٢١/ڕەبیعی یەکەمی/١٢٨٠ ك لەتەوێڵە لەدایك بووە، قورئان و نەحو صەرف و فیقهی تاسیوطی خوێندووە، لەلای مامی (شێخ بەهائەدین)سلوکی کردووە و لەخزمەتی باوکیدا ئیجازەی تەریقەتی وەرگرتووە، لەساڵی (١٣٠٨ك)نوریجان خانمی کچی میرزا عەبدوللە خانی کوڕی شێخ محەمەد صادقی وەزیری مارە کردووە، کەخەڵکی سەولاوایە لەناوچەی سنە، لەدەوروبەری ساڵی (١٣١٢)دا بەفەرمانی باوکی لەبیارە ماڵی گواستوەتەوە بۆ (سەفی ئاوا) لەناوچەی جوانڕۆ، لەم دێیەدا چوار پێنج ساڵ ماوەتەوە و ئیرشادی کردووە، لەم دێیەدا، لەساڵی (١٣١٤)دا شێخ عوسمان و لەساڵی (١٣١٥)شدا شێخ خالیدی بووە لەنوریجان خانم، پاشان هاتوەتەوە بیارە، تاوەکو دوای کۆچی دوایی باوکی لە (١٣١٨)دەچێتە دەرەشیش و دوایش دەچێت بۆ سەولاوای لای مەریوان. پاشان چووەتە (دووڕووە) لەوێ خانەقایەك و چەند خانوو خوێندنگایەکی گەورەی کردووەتەوە،

مەلامحەمەدی شێخ قادری ڕەشەدێی مەریوانی بۆ هێناوە و قوتابی زۆری بۆ کۆکردەوە و ئیتر (دووڕووە)بوەتە مەڵبەندێکی (ئیرشاد و عیلم)و خزمەتی ئیسلامی کردووە.

لەساڵی (١٣٣٩)دا هاتووەتەوە بیارە،خانەقاکەی باوکی، چونکە شێخ نەجمەدین و نورەدینی کوڕیشێخ نەجمەدین و مەلاقادری گەورەیش هەرسێکیان کۆچیان کردووەو بیارە چۆڵ بوو بوو.

شێخ لەم ماوەیەدا، گرنگیەکی زۆریدا، بەحوجرەو خانەقاکەی بیارە، لەبەرئەوە، بەبەردەوامی، چەندمەلایەکی هێنا، بۆبیارە، لەوانە: مەلاحسێنی کوڕی مەلاقادری گەورە، شێخ باباڕەسوڵ بێدەنی، مەلائەحمەدی ڕەش، مەلاتەها بالیسانی، پاش ئەم زانایانە، لەساڵی (١٣٤٧)مامۆستا مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس دەبێتە مەلای خانەقای بیارە، بۆماوەی (٢٤) ساڵ لەوێ دەمێنێتەوە...

لەم ماوەیەدا بیارە نزیکەی (١٠٠) فەقێی بووە، فەقێی تورك و عەرەب و تالشیشی تیابووە.. دانیشگایەك بووە بۆ خۆی، زانا گەورەکانی کوردستان دەستە دەستە لەهاتوو چۆی بیارەدا بوون و سەردانی بیارەیان دەکرد. گەلێ زانای ناودار لەم مەدرەسەدا ئیجارەیان وەرگرتووە.. لەوانە: حاجی سەید بابا شێخ کاژاوی، مامۆستای دێی ئەڵمانە، حاجی مەلاباقر مامۆستای باڵەك، مەلاعەبدوڵڵەی نەقشبەندی، شێخ عەبدولوەهاب و شێخ صدیقی نێرگزەجاڕو شێخ محەمەد سەعید نەوەی مەولەوی، شێخ عومەری کوڕی شێخ محەمەد قەرەداغی، مەلاعارفی پێنچوێن، مەلاقادری گەلاڵی، شێخ کاکە مەلا سەردەشتی، سەید حیسامەیدنی سەقزیو گەلێ زانا و مامۆستای تر..

شێخ عەلائەدین دوو بەرهەمی چاپ کراوی هەیە کەبریتی‌یە لە دوو نامە:

یەکەمیان (القول الحقیقە) وتەی ڕاستی، بەزمانی کوردیو عەرەبیو فارسییە، ساڵی (١٩٣٥)ز چاپ کراوە، نامەکە بریتی‌یە لەبەرپەرچدانەوەی ئەو کەسانەی بەناوی خاوەن ڕێبازەوە زیادەڕۆیی دەکەن و کاری نابەجێ ئەنجام دەدەن. نامەکەی بەڕێنووسی کۆن نوسراوە، لێرە هەندێکی دەخەینە بەرچاو، بەڕێنووسی نوێ بێدەسکاری، لەشوێنێکدا دەڵێ:

بەعزێ لەجەهەلەی صوّفی پەیدا بوون بۆ خاتری جەلبی ئەماڵی دنیەی شەخسیو جەمع کردنەوەی پارە و ماڵی دنیا بەهەموو قووەتێك بەناوی تەریقەی نەقشیەوە یاقادریەوە مەشغوڵی فریودانی عەوامی ناسن و دامەزراندی ئادابی غەیرە مەشروعن) هەروەها دەڵێت: (بەعزێکیان ئەمر بەلێدانی خەنجەر لەخۆیان و ئاور خواردن و مارگرتن دەکەن و بەعزێکیان بەناو مەخلوقدا دەگەڕێن بەناوی ئیمانەوە بەخانەقا و تەکیە وەماڵ و پارە لەمیللەتی بێچارە وەردەگرن).

ئەم نامەیە زۆر گرنگە و تەصەوفێکی پاك و بێگەرد پێشان دەدات لەکتێبخانەی ئەوقاف، بەهەرسێ زمانەکە پارێزراوە، حسێن ڕەمەزان خالدی ڕاڤەیەکی جوانی کردوە.

دووەمیان: نامەی (طب القلوب)پزیشکی دلآن بەزمانی عەرەبی نوسراوە و ساڵی (١٩٨٩)شێخ ئەمینی کوڕی ئامادەی کردوەو لەچاپی داوە، ناوەڕۆکەکەی بریتی‌یە لەڕێنمایی کردنی کاروباری ئاینی بۆ موسڵمانان...)

شێخ عەلائەدین پیاوێکی خوانـاس و لەخواترس بووە، پیاوێکی کۆمەڵایەتی موصلح بووە، دەستی حەکیمیشی بووە. ڕۆڵیی گرنگیشی بینیووە

لەبەرگری کردن لەڕوسەکان و ئینگلیزەکان و هەڵوێستی نیشتیمانپەروەری زۆری هەیەو[٥٤] پاڵپشتی شۆڕشەکەی رەشید عالی گەیلانی بووە.

لەژیانیدا سەفەری زۆری کردووە بۆ ناوچەکانی کوردستان و شام و، چەند جارێکیش بۆ بەغدا و، لەبەغدا یاسین هاشمی- سەرۆك وەزیرانی عێراق و مەلیك فەیصەڵی بینیون. نامە گۆڕینەوەشی بووە لەگەڵ شەمسەدین عەبدولحەق ئەفغانی وەزیری مەعاریفی پاکستان و هەروەها مەلیك غازی مەلیکی عێراق.

شێخ عەلائەدین لەمانگی ڕەجەبی ساڵی (١٣٧٣ك)کۆچی دوایی کردووەو لەبیارە بەخاك دەسپێرڕێ. نەوەکانیشی: (١٠) کوڕو (١٣) کچ بوون.

دیارترین کوڕی شێخ عوسمان و مەولانا خالید بوون. لەدوای خۆیشی، شێخ عوسمان بووە جێگەداری، ئەم سێ کچەشی ئێستا لەژیاندان.. حەپسەخان لەڕەشتە، ئەدیبەخان لەبەغدایە، سەلماخانیش لەسلێمانیە.

کۆتایی ئەم باسە بەمە دەهێنین: ئەمە نامەیەکی جەنابی شێخ عەلائەدینە لەسەرەتای پەنجاکانەوە نوسیویەتی بۆ کوێخا حەمە سەلیمی حەمەڕەزای تەوێڵەیی ئێمەش بڵاوی دەکەینەوە، بەڵام بەڕێنوسی ئێستا.

خادم محاسن شريف نبوية
وطريقة نقشي وقادري
علاءالدين

بسم الله

موحیب و عەزیزو ئیرادەت ئەز کاك محەمەد سەلیم موختاری طەوێڵە دوعای خەیرو سەعادەت و تەوفیقات بۆ ئەکەم ئەوا نۆ دینار پارەم بەپیاوی خۆما بۆ ڕەوانە کردی موحیبەت ئەکەیت ئەو نۆ دینارە بەگەندم ئەدەیت و بۆمان ڕەوانە بکەرەوە باعثی دوعای خەیری فوقەڕایە، وصلى الله على سيدنا محمد وآله

## شێخ عوسمان سراجەدینی دووەم[٥٥]:

**صەفەری/١٣١٤- /١٤١٨)ك = (١٨٩٤- ١٩٩٧/١/٣٠)ز**

ناوی محەمەد عوسمانەو نازناوی سراجەدینی دووەمە. کوڕی شێخ عەلائەدینە. لەدێی سەفی ئاوای جوانڕۆ لەدایك بووە، لەبیارە دەستی کردووە بەخوێندن، پاشتر لەخزمەت مامۆستا مەلاحسێنی (طاهر بوغی)دا بڕوانامەی زانستی وەردەگرێت.

لەخزمەت باوکیدا، سلوکی کردوەو پێگەیشتووەو مۆڵەتی ئیرشادی وەرگرتووە. لەتەمەنی (١٥- ١٦) ساڵیدا، و واتە پێش ساڵی (١٣٣١ك) جیهادی لەدژی سوپای داگیرکەری ڕوسیا، لەکەلی (سەوڵەتاوای)نێوان هەردوو شاری (سنە و قوروە)ی کوردستانی ئێران ئەنجام داوە.

پاش کۆچی دوایی باوکی، لەساڵی (١٩٥٤ز)دا لەسەر وەسیەتی باوکیو موریدان و زانایان، بووە بەجێگەنشینی باوکی. لەم ماوەیەدا گرنگیەکی زۆری داوە بەخانەقا و خوێندنگای بیارە.- لەساڵی (١٩٥٩ز)دا لەبەر چەند هۆیەك بیارەی بەجێهێشت و چووە بۆ (دووڕووە) لەوێ هەروەك بیارە، بگرە زیاتر گرنگیدا بەخانەقا و خوێندنگا و مزگەوتەکەی.....ئیتر (دووڕووە) بووە مەڵبەندێکی تەریقەی نەقشبەندی، لەهەموو لایەکەوە چ بۆ خوێندن و چ بۆ تەریقەت جمەی دەهات...تاله بەرواری (١٩٧٩/٩/١٣ز) لەدوای ئەوەی شۆڕشی

ئیسلامی لەئێران رووی‌دا لەڕێگەی تەوێڵەوە هاتەوە بیارە. ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی مێژوویی بوو، بۆ ئەو دەڤەرە، کە چ حەشاماتێك بوو، لە خەڵکی ناوچەکە و دەوروبەرو هەموو کاربەدەستان و مورید و مەنسوبان هاتبون بۆ پێشوازی..

شێخ لەبیارە مایەوە، لەهەموو لایەکەوە سەردان دەکرا، تاوەکو بەهۆی شەڕی سەر سنوری نێوان، عێراق و ئێران، بارودۆخی ناوچەکە تێك چوو، شێخ بیارەی بەجێهێشت بەرەو بەغدا ڕۆیشت. پاش چەند ساڵێك بەرەو سوریاو تورکیا و ئەردەن و سعودیە و ولاتانی ئیسلامی‌و ئەورووپی‌و...ڕۆیشت، لەئەنجامدا لەساڵی (۱۹۹۳) لەئەستەمبوڵ نیشتەجێ بوو، ... خانەقای شێخ لەئەستەمبوڵ دا لەدوای ڕاپەڕینەوە بوو بەجێگەی کۆچکەرانی کورد و خەڵکانی تری ئاوارەو غەریب..بەڕاستی کاروانسەراو پردێك بوو بۆ لێقەوماوانی کۆچەر لەنێوان کوردوستان و ئەورووپادا.

شێخ لەئەستەمبوڵ ژیاو تەمەنێکی زۆری بەسەربرد تالەبەیانی ڕۆژی پێنج شەمە (۱۹۹۷/۱/۳۰) کۆچی دوایی دەکات، لەبەر فشاری موریدانی تورکیا لەخودی خانەقاکەی ئەستەمبوڵ بەخاك دەسپێررێ.

هاوکات لەگەڵ کۆچی شێخ عوسماندا، شێخ مەولانای برای لەسنە بە (۸) سەعات بەرلەکۆچی ئەو، کۆچی دوایی دەکات، پاش چەند رۆژێك جەمالەدینی کوڕە گەورەیشی ئەویش لەسنە کۆچ دەکات، هەردوکیان دەهێننەوە بۆ (دووڕووە) بەخاکیان دەسپێرن. لەکوڕکانی: عەبدولمەلیك، ناصح، عەبدوڕەئوف، مادح، چەند کچێکیشی هەیە.

ئەم شێخە بەڕێزە: لەدوای خۆی کەسی دانەناوە بەجێگەدارو جێنشینی خۆی‌و لەدیوانی ئەدەبیاتا ئاماژەی بۆ ئەمە کردوە.[٥٦]

شێخ عوسمان توانیویەتی بازنەی ئیرشادی خۆی بەرفراوان بکات و موریدو مەنسوبێکی زۆر پەیدا بکات لەولاتانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات...بەڕاستی توانی تەریقەتی نەقشبەندی زیندو بکاتەوەو برەوی زیاتری پێبدات و، بەڵکو توانی ژمارەی موریدانی زیاتر لە (۱۰)ملیۆن مورید پێبگەێنێت کەلەتەواوی دنیادا بلاوبونەتەوە.

- چەندەها خوێندنگەو مەڵبەندی تەریقەتی، لەشوێنە جیاجیاکانی کوردوستان و ولاتان کردەوە.

- پەیوەندیەکی زۆریشی لەگەڵ پاشاو سەرۆك و ناودارو کەسایەتی جیهانی هەبووە.

- لەڕووی دانایی‌و حەکیمی‌و پزیشکیەوە دکتۆرێکی زۆر لێهاتوو بووە، زۆرێک لەڕۆژنامەو گۆڤارەکان لەسەریان نوسیوە، لەوانە ڕۆژنامەی (الحیاة)ی لەندەنی ساڵی (١٩٩٥).
- هەرچوار زمانی کوردی‌و فاسی‌و عەرەبی‌و تورکی زانیوەو قسەو نوسینی پێکردوە.
- لەزانستەکانی- تەفسیرو عەقیدە و تەسەوف- دا دانراوی هەیەو لەچاپ دراوە.
- لەڕووی ئەدەبەوە زۆر ئەدەب دۆست بووە، دوو دیوانی نایابی هەیە بەناوی (چەپکە گوڵێ لەگوڵزاری عوسمانی) ئەوی تریشی (دیوانی حەزرەتی شێخ محەمەد عوسمان سراجەدین نەقشبەندی)، هەردوکیان لەلایەن م.عەبدوللە مستەفا صالح (فەنایی)یەوە ئامادەو چاپی کردون).
- گەلێك لەهۆنراوەی لەگەڵ شاعیران و دۆستاندا گۆڕیوەتەوە وەك: مامۆستا مەلاعەبدوالکەریمی مودەڕیس، قانع، ناری، شاهۆ، شێخ ئەحمەدی شاکەلی ...هتد، هۆنراوەکانیشی بەهەورامی‌و سۆرانی‌و فارسی نوسیونی.
وتمان گەلێك هونراوەی هەیە لەوانە - لەجەژنە پیرۆزەیەکدا بۆ مامۆستا مەلا عەبدوالکەریمی مودەڕیس دەنوسێ و دەڵێ:

یاکەریم دەخیل کەریمم خۆش بێ	لەهەموو جەژنا وەک گوڵی گەش بێ
جەژنت پیرۆزبێ هەتاهەتایە	بۆ تەفسیری جوان پڕ ئایەو مایە

دواتر دەڵێ:

دانامەی زانای ڕموزی قورئان	عەللامەی دەهرو نابغەی زەمان

چەپکە گوڵێ ل(٢٢)

لەنامەیەکی‌دا بۆ شێخ مەحمودی مەلیك دەڵێ:

(بەئەندازەی خولوصی قەلبی گوریان	بەقەد ئاهی دەرونی ساردی کوردان
بەقەد حەرڕی صەمومی دەشتی بەغدا	بەقەد بەفراوی شاخ و داخی کوێستان
سەلامی پڕ لەئیخلاصم لەتۆ بێ	کەتۆی بۆدەردی سەختی سینە دەرمان..!

چەپکە گوڵێ- ل (٢٣)

لەسەفەری مەدینەی منەوەرە ئەم هۆنراوەیەی داناوە:

..شوکرەن نزیکەن دڵشاد بۆ وەدۆس	دۆس چ دۆس، چەنی خوداوەند مەئنوس
شوکرەن یاوانی، وەمەدینە شاد	شاری پڕجەنور، بورکانی ئەنوار

چەپکە گوڵێ- ل ١٦٩

لەهۆنراوەیەکی‌دا کەبۆشێخ مەولانای برای نوسیوەدەڵێ:

تاکەی بناڵۆ لەدەری دوری	تاکەی وەدیدار نەدۆم سەبوری

دووریت ژارمارگەستەن مەزاقم
شەوان ئالودەی دەردی فیراقم
ناڵەم چون ناڵەی تاق تاقەن نەتاق
پایانش نیادەردەکەی فیراق
فیراقت وەدەرد فیراق بەرباد بۆ
وەی شێوەی شیرین من دڵم شاد بۆ..!
دیوانی شێخ ل (٤١)

## شێخ ئەحمەد شەمسەدین کوڕی شێخ عوسمان سراجەدین یەکەم[٥٧]

(١٨٥٠ - ١٨٨٩ز)

لە (٦/جەمادی‌یەکەم/ ١٢٦٦ ك لەوکاتەی کەشێخ عوسمان لەبیارەدا بووە، ئەم لەوێ لەدایك دەبێ، دایکی ناوی (نورشەرەف)ە لەکچە ئاغاکانی پشدەرە لەتیرەی میراو دەلی. قورئان و نەحو و صەرف و هەندێ لەکتێبە شەرعیەکانی خوێندووە و لای مەولەویش عەقائدی خوێندووە. دوایی گەلێ پەراوێزی لەسەر عەقیدەی مەرضیەی مەولەوی نوسیووە. لەئوصولی دین دا دەستێکی بالای بووە.

لەسەردەمی باوکیدا چوەتە تەریقەتەوە و مۆڵەتی خەلافەتی داوەتێ، بەلام لەژێر دەستی (شێخ بەهائەدین)ی برای‌دا، پەروەردە کراوە.

شێخ ئەحمەد زۆر گرنگی داوە بەسونەتەکانی پێغەمبەر (ص)، تەنانەت لەسەفەری حەج و ئەستەمبوڵیش دا شەو نوێژی تەرك نەکردوە، گەلێك موریدو مەنسوب و خەلیفەی بووە، یەکێ لەو خەلیفانەی شێخ عەبدورەحمانی کەرکوکی‌یە کەپیاوێکی زاناو خاوەن پایە بووە.

شێخ لەدوای مردنی شێخ (بەهائەدین)ی کاکی لەتەوێڵەوە، دەگوازێتەوە بۆ ئەحمەد ئاوای زەڵم، لەوێ ئیرشادی کردوە تالە (٢٥ سەفەری /١٣٠٧ك) کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی دەبرێتەوە بۆ خانەقای تەوێڵەو لەنزیك باوکی‌یەوە بەخاك دەسپێررێ. لەدوای خۆی (٤)کوڕی منالی لێ‌بەجێ دەمێنێ بەناوی:

هیدایەت، عەبدوالله، حەبیب، حەسەن.هەر چواریان دوایی پێدەگەن و هەریەکەیان لەشوێنێك نیشتەجێ دەبن.[٥٨]

شێخ شەمسەدین چووە بۆ حەج و سەردانی ئەستەنبوڵی کردووە، لەسەردانەکەی ئەستەنبوڵی‌دا (مەحاسینی شەریف)ی هێناوە، بۆ هەورامان، بۆیە ئەم باسی مەحاسینە لەژیاننامەی ئەم بەڕێزە تۆمار دەکەین.

**مووی پیرۆزی پێغەمبەر (د.خ)[٥٩]:**

پێغەمبەر (ص، حەوت شتی پیرۆزی -متبركات السبعە- ی لەپاش خۆی بەجێماوە کە ئەمانە بوون: (مێزەرەکەی، عەمامەکەی، شمشێرەکەی، عەباکەی، کراسەکەی، دانی موبارەکی، مووی ڕیشی).

ئەمانە تاسەردەمی ئەمەوی‌و عەباسیەکان لەمەککەدا پارێزراو بوون. پاش ئەوەی خەلافەت دەکەوێتە دەستی عوسمانیەکان، هاتن ئەم حەوت شتەیان گواستەوە بۆ ئەستەمبوڵ کەیەکێکیان ئەم مووە پیرۆزانە بوون.

شێخ ئەحمەد شەمسەدین، لەدەور و بەری ساڵی (١٢٩٩)دا سەفەرێك دەکات بۆ ئەستانبوڵ و ماوەیەك دەمێنێتەوە لەو ماوەیەدا سوڵتانی عەبدولحەمید، دەیناسێ‌و زۆر ڕێزی لێدەگرێت، کە گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان، قورئانێك و حەوت تاڵ مووی ڕیشی پیرۆزی پێغەمبەر (ص)بەخەڵات پێ بەخشیوە.[٦٠]

شێخ ئەحمەد کەدەگەڕێتەوە، مووەکان دەهێنێت بۆ ئەحمەدئاوا، پاش ماوەیەك نەخۆش دەکەوێت، جاچونکە ئەحمەدئاوا دێیەکی بچوك دەبێ‌و مناڵەکانیشی بچوك دەبن، لەبەر ئەوەی ئەم مووانەش نەفەوتێن، هەردوو برازای بانگ دەکات. کەیەکێکیان شێخ حسامەدینە کەجێگەداری یەکەمەو چوار تاڵیانی دەداتێ کەلەمەرقەدەکەی تەوێڵە دایان بنێت، ئەوی تریشیان شێخ نەجمەدینە لە بیارە، کەسێ تاڵیشیان دەدات بەو بۆ مەرقەدەکەی بیارە.

ئەم مووانە هەر لەو کاتەوە تاوەك و چۆڵکردنی بیارە و تەوێڵە هەرلەیّ ماونەتەوەو پارێزراون. لەساڵەکانی (١٩٨١ز) بەدواوە ئەوانەی تەوێڵە لای شێخ ئەحمەد بوون –پێشتر باسمان کردن –لە هەڵەبجەو لەکیمیایەکەشدا بردنی بۆ ئێران و پاراستنی، لەدوای ڕاپەڕینەوە هێنرانەوە بۆ هەڵەبجەو لە ١٩٩٧/٨/٣دا، بەڕێو ڕەسمێکی شکۆدارو شایانەوە بەهەزاران کەس لەسلێمانیو هەڵەبجەو کەلارو گەرمیان و دەڤەری هەورامانەوە بەشداریان تیاکردو برانەوە بۆ تەوێڵە و لەمەرقەد دانرانەوە.

ئەوانەی بیارەش لای بەڕێز (شێخ عوسمانی دووەم) پارێزراو بوون و مانگێك پێش ئەوانەی تەوێڵە برانەوە بۆ بیارە. ئەم مووە پیرۆزانە بە (مەحاسینی شەریف) ناسراون، لەشوشەی بچوکدان و شوشەکەش لەصندوقێکی پۆڵاین

ئەو صندوقە مووی مەحاسینی شەریفی تیایە- شەرەفی ئەو وەرگرتنە درایە دەست بەڕێز مامۆستا مەلا غەفور- ٣/٨/١٩٩٧

دایەو لەو کاتەوە کراوە بەعادەت هەرکاتێك بێبارانیەك ببێت یا هەراو موصیبەتێك ڕووبدات صندوقی مەحاسین لەشوێنی خۆیەوە ئەهێننە دەرەوەو مەلاو فەقێ و خەڵکی، نوێژە بارانەو صەڵاواتی مونجیە یاقەصیدەی بوردیە بەدەوردا، دەخوێنن لەخوا ئەپاڕێنەوە کەبۆ خاتری ئەم مووە پیرۆزانە ئەو بێبارانیە یا ئەو بەڵاو موسیبەتە هەڵبگرێت.

## بنەماڵەی سەیدەکانی تەوێڵە[٦١]:

سەیدەکانی تەوێڵە، بنەماڵیەکی ترن لە تەوێڵەدا کە خزمەتی موسوڵمانان و ئاینی ئیسلامیان کردووە. بونەتە هۆی بەرزکردنەوەی ناحیەی ڕۆحی و ئاسودەیی دەرونی و لایەنی زانستی. بەتایبەت خەڵکی زۆریان فێری قورئان خوێندن کردووە.

ئەم بنەماڵە لەلایەن خەڵکی تەوێڵە و دەوروبەریەوە ڕێزێکی زۆریان لێ گیراوە و هەیە، بەبۆنەی ئەو خزمەت و ڕۆڵەی کەبویانە لە ناوچەکە.

بێگومان سەیدەکانی تەوێڵە دەچنەوە سەر سەیدەکانی کەلجی، مامۆستا مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس دەڵێ:

سەیدەکانی کەلجیش دەڕۆنەوە سەر سەید مستەفای بەناوبانگ بە (پیر شەهریار) کە لەهەورامانی تەختدا دانیشتووە و، وایش باوە کەلە خەلیفەکانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی‌یەو، شێخ عەبدول قادر دەربارەی فەرموویەتی: (ان اخي مصطفى رجل صالح)

ئەم شێخ مستەفایە، ئیرشادی موسڵمانانی کردووە و، نەوەدونۆ پیرە لەسەردەستی ئەمدا پێگەیشتوون. ئەم پیر شەهریارە لەنەوەی سەید عەلی (عریَضی)کوڕی ئیمام جەعفەری صادق. خ.

لەشەجەرەی یەکێ لەخانەدانە سەیدەکانی کەلجی بەم شێوەیە هاتووە:[٦٢]

| ز | ناو |
|---|---|
| ١ | عەلی کوڕی ئەبی تالب |
| ٢ | حسێن |
| ٣ | عەلی (زين العابدين) |
| ٤ | محەمەد باقر |
| ٥ | جەعفەر صادق |
| ٦ | عەلی (عەلی العريضی) |
| ٧ | ئەحمەد |
| ٨ | حسێن |
| ٩ | محەمەد |
| ١٠ | محەمەد |
| ١١ | فضل الله |
| ١٢ | سلێمان |

| ١٣ | مەسعود |
|---|---|
| ١٤ | بابل |
| ١٥ | مەعروف |
| ١٦ | مستەفا (پیرشالیار) |
| ١٧ | ڕۆستەم (پیرڕۆستەم) |
| ١٨ | ئاقە |
| ١٩ | نبیج |
| ٢٠ | صاڵح |
| ٢١ | تاهر |
| ٢٢ | بائیل |
| ٢٣ | ولیاس |
| ٢٤ | پیلیاسا |
| ٢٥ | قاسم |
| ٢٦ | عەلی (ناسراوە بەسەید عەلی نوێن) |
| ٢٧ | مەحمود |
| ٢٨ | ئەحمەد |
| ٢٩ | قطب الدین– لەکەلجی‌یەوە هاتووە بۆ تەوێڵە |
| ٣٠ | محەمەد ئەمین (زاوای شێخ سراجەدین بووە) |
| ٣١ | فەتح الموبین |

سەید (فەتحول موبین)ناسراوە بەسەی فەتحە:

سەید (فەتحول موبین)کوڕی سەید (محەمەد ئەمین)کوڕی سەید (قوطبەدین)ی کەلجی‌یە. کە ئەڕواتەوە سەرسەید (مستەفا)ی بەناوبانگ بە پیرشالیار[٦٣].

سەید (قوتبەدین)لەکەلجی‌یەوە هاتووەتە، تەوێڵە و، لەوێ نیشتەجێ بووە و ڕێزێکی زۆری لێ گیراوە و لەساڵی (١٢٩٢ك)دا کۆچی دوایی کردووە و.[٦٤] کوڕێکی بووە، بەناوی سەید (محەمەد ئەمین)، چونکە پیاوێکی زۆر خواناس بووە، شێخ عوسمان سراجەدینی یەکەم، کچێکی خۆی (خاتوو عەمەرێ)ی داوەتێ. سەید قوتبەدین و سەید محەمەد ئەمینی کوڕی، هەردوکیان خەلیفەی شێخ عوسمان بوون[٦٥].

سەی فەتحە، لەدەوروبەری ساڵی (١٨٦٠ز)لە تەوێڵە لەدایك دەبێ‌و، لەخزمەت زاناکانی ئەو کاتەی تەوێڵە، قورئان و هەندێك لەکتێبەکان دەخوێنێ، پیاو چاکێکی موسڵمان و خاوەن کەسایەتی‌و ڕێزێکی تایبەتی بووە لەناو دەڤەرەکەدا.

لەساڵی (١٣٦٦ك- ١٩٤٧ز)لە تەوێڵە کۆچی دوایی کردووە و هەرلە تەوێڵە لەپاڵ گۆڕی سەید حەمەئەمینی باوکی‌و سەید قوتبەدینی باپیری‌دا لەگۆڕستانی بابا سەرهەنگ نێژراوە.

سەید فەتحە دووژنی هێناوە:

- خاتوو خەدیجە، خەڵکی پاوە بووە و منداڵی نەبووە.
- خاتوو ئامینەی کچی مەلا غیاسەدین، خوشکی مەلا حەبیبەاللە.
- هەروەها شەش کچ و پێنج کوڕی بووە. کچەکانی ئەمانەن:
- ڕەعنا- ژنی مەلاقادری مەلای گەورەی بیارە بووە.
- حەبیبە- ژنی شێخ ئەحمەدی شێخ قادری هەڵەبجە بووە.
- کافیە و فاتمە و عایشە شویان نەکردوە و مردوون.

کوڕەکانیشی لەڕشتەکەدا ئاماژەمان پێ کردون و، دوانیان سەید تەها و سەید محەمەد ناودار بوون و نەوەیان هەیە و بۆیە باسیان دەکەین.

**حاجی سەید تەها:**

سەید تەها کوڕە گەورەی سەید فەتحەیە، لەساڵی (١٩٠٦) [٦٦] لە تەوێڵە لەدایك دەبێ، لای باوکی خوێندویەتیو پاشان بۆ خوێندن هاتووەتە بیارە هەرچەندە خوێندەواری زۆری نەبووە، بەڵام خواناسێکی ناودار بووە و هەمیشە لەخزمەتی قورئاندا بووە، منداڵ و گەنجێکی زۆری فێری قورئان کردووە لەساڵی (١٩٦٥)لە تەوێڵە کۆچی دوای دەکات و هەرلەوێ نێژراوە. چوارژنی هێناوە کەئەمانە بوون:

حاجی سەید تەها

- عەتیە کچی شێخ مەزهەری شێخ محەمەد بەهائەدین.
- خاتوون کچی حاجی صادق- یەك کچی لێبووە بەناوی (مریەم)کە ئێستا ماوە و شوی کردووە بە مەلاکەمال ی مەلا عەبدولواحید.
- ڕۆحیزاد کە خەڵکی کەلجییە، یەك کوڕی لێ بووە بەناوی سەید حەمەئەمین کەلەساڵی (١٩٩١)دا لەسنە کۆچی دوایی کرد.
- صەدریەی کچی سەید محەمەدی کەلجی، ئەم منداڵانەی لێ بووە:
- عەبدوڕەحمان، عەبدولخالق، هەروەها ئەحمەدو بەهادینیشی بووە هەربەمناڵی مردوون.
- عاصمەی شوی کردوە بەسەید مەحمودی بەرزنجی.
- صەبیحە شوی کردوە بەسەید مەحمودی سەرگەتی.

**مامۆستا سەید عەبدولڕەحمان:**

مامۆستا سەید عەبدولڕەحمان

لەساڵی (١٩٥٠) لە تەوێڵە لەدایك بووە، هەرلەوێ، قوتابخانەی سەرەتایی تەواو کردووە، لەپاڵ قوتابخانەشدا لەلای باوکیو مەلامەجیدی کوڕی مەلا (صەلاحەدین)وە قورئان دەخوێنێ. لەساڵی (١٩٦٣)دا دەچێتە حوجرە و، لای ئەم بەڕێزانە دەرس دەخوێنێ:

- لە تەوێڵە لای مەلا صاحب.
- لە سلێمانی لەمزگەوتی خومخانە لای م. سەید مەلاعارف.

- لەسەرگەت لای م. شێخ صدیق شێخ ئیسماعیل.
- لەخورماڵ لەلای مەلا محەمەد بەهائەدین.

پاشان لەساڵی (١٩٦٧) دەچێتە پەیمانگای ئیسلامی لەهەڵەبجە، لە (١٩٧٢)دا پەیمانگا تەواو دەکات و دەگەڕێتەوە تەوێڵە، لای حاجی م. مەلا صاحب مۆڵەتی زانستی شەرعی دەدرێتی‌و دەبێتە ئیمامی مزگەوتی باساکا لە تەوێڵە.

- لەساڵی (١٩٧٦) بەڕەسمی دەبێتە ئیمامی مزگەوتی (مۆرتکە) لەناوچەی بازیان.

لەساڵی (١٩٧٨) بڕوانامەی (خطابە) لەهەولێر وەردەگرێ‌و، دەبێتە ئیمام و خەتیبی تەوێڵە، هەتا بەهاری ساڵی (١٩٨١)کە تەوێڵە چۆڵ دەبێت، پاشان کەهاتووەتە سلێمانی، بووەتە مەلای‌مزگەوتی (حاجی عەبدوڕەحمان بۆ سکانی)، لەساڵی (١٩٨٢)دا خۆی نقڵ دەکات بۆ مزگەوتی (سەیوانی دووەم) لەسلێمانی.

- لەساڵی (١٩٨٦)دا دەچێتە ئێران و لەسنە دەبێتە ئیمامی مزگەوتی (هەسەن ئاوا)، تاوەکو لەساڵی (١٩٩٣)دا دەگەڕێتەوە سلێمانی‌و لەمزگەوتی (سەیووانی دووەم) دادەمەزرێتەوە.

حاجی سەید عەبدوڕەحمان خاوەنی پێنج کچ و پێنج کوڕە.

ئەوەی شایەنی باسە: جەنابی مامۆستا، لەو شوێنانەی کەبووە، ڕۆڵێکی باشی بینیووە بۆ هۆشیار کردنەوەی خەڵکی لەبانگەوازی ئیسلامی بەتایبەت لەناو توێژی لاوان دا. هەروەها مامۆستا دەستی نوسینی هەیەو تائێستا دوو کتێبی چاپ کردووە بەناوی (نوێژ و پێویستی‌یەکانی)، (بگە بەکاروان) نوسینی شەهید عەبدوالله عەزام وەرگێڕانی مامۆستای ناو براو.

**مامۆستا سەید عەبدولخالق:**

مامۆستا سەید عەبدولخالق

لە تەوێڵە لەدایك بووە لەساڵی (١٩٦٤)دا،و سەرەتایی‌و ناوەندی هەرلەوێ تەواو کردوە، پاشان هاتووەتە سلێمانی قوتابخانەی ئامادەیی پیشەسازی بەشی کارەبای تەواو کردوە، لەشەڕی عێراق و ئێراندا چووەتە ئێران و لەماوەی شەش ساڵدا خوێندنی زانستی شەرعی لەچەند شوێنێکی کوردستانی ئێران خوێندووە، پاشان مۆڵەتی مەلایەتی لەهەڵەبجە لای جەنابی مامۆستا

سەید نەجمەدین وەرگرتووە، چەند ساڵێك لەمزگەوتی تەوێڵەیی‌یەکان لەهەڵەبجەی تازە مەلابوو، لەساڵی (٢٠٠٠) چووەتەوە بۆ تەوێڵە و بوە بە مەلای مزگەوتی باساکاو دواتر مزگەوتی بابا ئەسکەندەر.

مامۆستاسەید: مەلایەکی زیرەك و بێ‌دەنگ و هێمن و لەسەرخۆیەو حەزدەکات خزمەتی کۆمەڵگا و دەورو بەرەکەی بکات.

**حاجی سەید محەمەد:**

حاجی سەید محەمەدو سەید رەشادی کوڕی
مزگەوتی گەورەی تەوێڵە - ٥ / ٦ / ١٩٧٦

سەید محەمەد لەساڵی (١٩١٠)لە تەوێڵە لەدایك بووە، قورئانی لای باوکی خوێندووە، کتێبی ڕۆڵە بزانیو (کەلامی مەلا حامیدی) خوێندووە. لەتەمەنی منداڵی‌دا تووشی نەخۆشی ئاوڵە بووە و، هەردوو چاوی کوێر بووە، ئیتر نەیتوانیووە بخوێنێ پیاوێکی خواناس و ڕێزدار بووە لەناوچەی هەورامان و گەرمیان و شارەزوور دا.

دەنگ خۆش بوو، موناجاتێکی بەسۆزی هەبوو لەشەوانی جومعە و بۆنەکاندا لەمزگەوتی گەورەی تەوێڵە دەیکرد، خەڵکی بەدڵ گوێیان بۆ دەگرت.

دووجار حەجی کردوە، جاری یەکەم لە (١٩٥٦)دا بووە، جاری دووەم لەساڵی (١٩٧٧)دا لەگەڵ خاتوو شەمسیەی خێزانیو سەید ڕەشادی کوڕی‌دا بووە. دووژنی هێناوە:

حەبیبە عەبدوڕەحمان خەڵکی یەخشی بووە تەنها کوڕێکی لێ بووە بەناوی ڕەئوف بەمناڵی مردووە.

- شەمسیە (الله وەیس) ئەم مناڵانەی لێ بووە:
- عەبدواللە و ئەحمەد هەر بەمناڵی مردوون.
- سەید ڕەشاد.
- حومەیرا شوی کردوە بەمەلا نافعەدین.
- حولەیما شوی کردوە بە شێخ حەیدەری سەرگەتی.
- مەعصومە شوی کردووە بەسەید عەتای کەلجی.

- ئافتاب شوی کردوە بە جەزای مەلانەجمەدین یەخشی (مردوە)
- نایافت شوی کردوە بە شێخ محەمەد شێخ صدیق سەرگەتی.

حاجی سەید کۆتایی ژیانی لە سلێمانی بردە سەر، لەشەوی (٢٠٠٠/١/٢٠) شەوی پێنج شەمە سەعات ٣/٣٠ کۆچی دوایی کردو، لەسەر وەسیەتی خۆی برایەوە بۆ تەوێڵە، لەنزیك باوك و باپیریەوە بەخاك سپێررا.

ئەوەی شایەنی باس بێت:

بەشدار بوونی ئەو هەموو خەڵکەی هەورامان و سلێمانی لەمەڕاسیمی بەخاك سپاردن و پرسەکەی‌دا، نیشانەی ڕێز و وەفاداری جەماوەرەکە بوو بۆ ئەم خواناسە بەڕێزە و بۆ ئەم بنەماڵەیە.

**مامۆستا سەید ڕەشاد:**

لەساڵی (١٩٥٢)لە تەوێڵە لەدایك بووە، لەقوتابخانە تایەکی ناوەندی خوێندووە، لە حوجرەش هەر بەمناڵی قورئانی خوێندووە و، پاشان وازی لەقوتابخانە هێناوە، بەردەوام بووە لەحوجرە، لەلای مامۆستا مەلاصاحب دەخوێنێ تا لەساڵی (١٩٧٣)مۆڵەتی زانستی شەرعی وەردەگرێت.

لەو کاتانەی کەفەقێ بوو، ئیمامی مزگەوتی فەقێ ئەحمەد بوو لە تەوێڵە. پاشان بوو بەئیمامی

مزگەوتی باساکا تالە (١٩٧٨/٣/١٦)بەڕەسمی لەو مزگەوتەدا دامەزراوە، خزمەتێکی باشی ئەو خەڵکی گەڕەکەی کرد، تالە بەهاری (١٩٨١)کە تەوێڵە چۆڵ کرا، هاتە سلێمانی‌و دواتر لەئۆردوگای باریکە بووە مەلای مزگەوتی ئەوێ. لەساڵی (١٩٩٤) گەڕایەوە بۆ سلێمانی‌و بوو بەمەلای مزگەوتی سەید حەسەن.

ئەوەی شایەنی باسە:

مامۆستا مەلاسەید ڕەشاد لەناو ناسراوان دا بەنموونەی کوڕی باش و دڵسۆزو بەوەفا بەرامبەر بەباوك ناسراوە، هەر بەمناڵی لەخزمەتی باوکی‌دا بووە و خزمەتی کردووە تائەو ڕۆژەی باوکی کۆچی دوایی کردووە.

مامۆستا: پیاوێکی پاك و دڵسۆزو هێمن و لەسەرخۆیە، دەنگ خۆش و خۆشنوسە.

## بنەماڵەی زانایان:

یەکێکی تر لەو بنەماڵە ئاینییانەی تەوێڵە... بنەماڵەی زانایانە، کەبەڕاستی جێگەی شانازی خەڵکەکەن... چونکە توانیویانە خزمەتێکی گەورەی تەوێڵە و دەڤەری هەورامان و کوردستان بکەن.

ڕۆڵی زانایانمان لەبانگەوازی ئیسلامی و خوێندەواریو ڕۆشنبیریو فێرکردنی زانستە ئیسلامی یەکان دا، کەم نەبووە و، بوونەتە هۆی بەرەو پێش بردنی ناوچەکە، لەو هەموو بوارانەدا. بوونی ئەو هەموو ڕۆشنبیر و خوێندەوار و مامۆستایانەی کەلە تەوێڵەدا بوون، یەکێك لەهۆکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هەموو زانا بەڕێزانە، وەك لەبەشی خوێندن وخوێندەواریدا کەمێك ئاماژە بەمە دەکەین.

بنەماڵەی زانایانی تەوێڵە بریتین لەم بنەمالآنەی خوارەوە: کەبەپێی توانا کەمێك لەسەر زانا ناودارەکانیان دەڕۆین.

- بنەماڵەی مەلانەزیری گەورە.
- بنەماڵەی مەلاسەلام.
- بنەماڵەی مەلامەحمود.
- بنەماڵەی مەلاحەکیم.
- بنەماڵەی مەلاشێخ عەلی.
- مەلاعەبدوالڵەی مەریوانیو نەوەکانی.
- کوڕی یوسف داود تەوێڵەیی.
- بنەماڵەی مەلاصادقی تەوێڵەیی.
- فەقێ عەلی.

إن معرفة النسب للعبرة لا للإفتخار والأعتزاز - ومن لم يرفعه حسبه لا ينقصهُ نسبه
بنەماڵەی مەلا نەزیری گەورە (٦٧)
حاجی محی‌الدین
مەلا نجم الدین
محی‌الدین (بابا حاجی)
عبدالأحد
نظام الدین
زین الدین
جمیل - مردووه
جمیل
محمد - مردووه
نافع الدین
أحمد
محمد - مردووه
رؤوف - مردووه
عطوف
نظیف
أشرف
هوشیار
معروف
عبداللطیف
أمجد
جلال
عبدالله - مردووه
شهاب - مردووه
عیصام الدین
علاء الدین
حبیب الله
أحمد - مردووه
مصطفی - مردووه
محمد
فائق
عبدالقادر - مردووه
ظاهر - مردووه
محمد جلال
حسن
محسن
طالب - مردووه
حمەعلی
عثمان
عبدالمتین
عبدالحکیم - مردووه
عبدالله - لەسنە ژیاوە، نەوەکانیشی لەوێن
سعدی
عبدالله
أمین
نذیر
علی
أحمد
سعدی
غیاث الدین
صلاح الدین
سعد الدین - لەعێراق ژیاوە
عبدالحمید - لەشەرکان ژیاوە
عبدالواحد
صلاح الدین - مردووه
صلاح الدین - مردووه
عبدالمجید
عبدالخالق
صلاح الدین
محمد - مردووه
کمال
بهاء الدین
سیف الدین
نصر الدین
فاتح
أحمد
محمد
معین الدین
أحمد
حمەأمین
محمد
فرید
عبدالکریم
کمال - مردووه
جمال - مردووه
عبدالمنعم
محمد ظاهر - مردووه
عزالدین - لەپێنجوێن ژیاوە
حبیب الله
هیوا
فاتح
خالد
زاهد
عابد
نذیری بچوک
عارف
عابد
حافظ
صاحب
کمال
نذیر
أسعد
خالد
نجیب - مردووه
لقمان
زبیر
نعمان
عزیز
مسعود
سیف الدین
محمد - مردووه
عبدالکریم - مردووه

**مەلانەزیری گەورە ( ١٧٨٦- ١٨٧٨ز)(٦٨) :**

حاجی مەلانەزیر کوڕی صۆفی محەمەد موئمین کوڕی صۆفی مەحمود کوڕی‌صۆفی ئیبراهیم کوڕی صۆفی ئەحمەدی سەوڵەتئاوای سنەیە. لەسەردەمی خان ئەحمەدخان(٦٩)دا صۆفی ئەحمەد لەسەوڵەتئاواوە هاتووە بۆ تەوێڵە.

ئەم بەڕێزە لە تەوێڵە و دەوروبەری دەست دەکات بەخوێندن، تالەئەنجام دا لەلای مەلا قاسمی شەرەکان مۆڵەتی مەلایەتی وەردەگرێت.

دووژنی هێناوە:(٧٠) لەیەکەمیان کەکچێکی تەوێڵەیی دەبێت یەك کوڕی دەبێت بەناوی (مەحیەدین)، پاشان شێخ عوسمان سراجەدین کەدیویەتی مەلانەزیر پیاوێکی چاك و لەخواترسە عائیشەی کچی بۆ مارە دەکات، هەموو منداڵەکانی تری لەم عایشەن.

لەگەڵ (مەحیەدین)ی کوڕی‌دا سەفەری حەج دەکەن و لەمەدینە گەیشتووە بەخزمەتی شێخ مەزهەری بوخارایی قادری‌و چووەتە تەریقەتەکەیەوە. وەهەر لەگەڵ مەحیەدین کوڕی‌دا، دەچێت بۆ بوخارا بۆ لای دەروێش محەمەد کەبە شاصاحب بەناوبانگەو، ئەبێتە خەلیفەی.

حاجی مەلانەزیر پیاوێکی زاناو لەخواترس و بەناوبانگ بووە، خەتی زۆر خۆش بووە، (احیاء علوم الدین)ی ئیمامی غەزالی نووسیوەتەوە.

حەوت کوڕ و دوو کچی بووە و کچەکانی- گوڵێ شووی کردووە بەمەلا یاسین تەوێڵەیی، شیرینیش شووی کردووە بەشێخ عەبدەڕەحمانی مازیبن لەناحیەی ژاوەرۆ، وەگەڵێ لەشێخەکانی مازیبن لەنەوەی ئەم ئافرەتەن، شێخ محەمەدی مازیبن کەبەناو بانگە لەو بنەماڵیەیە.

حاجی مەلانەزیر لەتەوێڵە مردووەو لەگۆڕستانی باوا سەرهەنگ نێژرراوە.

**حاجی مامۆستا مەلاصاحب(٧١) ( ١٨٩٨- ١٩٧٧ز):**

حاجی مامۆستا مەلا صاحب

لە تەوێڵە لەدایك بووە، منداڵ بووە باوکی کەمەلا نەزیری بچوك بووە مردووە، ئەمیش کوڕی مەلا نەزیری گەورەیە.

لە تەوێڵە دەستی بەخوێندنی قورئان کردوە، لەتەمەنی (١٢)ساڵیدا چووە (دووڕووە) بۆ خوێندن، تصریفی زنجانی لەوێ لای مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس خوێندووە، پاشان هاتوەتەوە تەوێڵەو، چووە بۆ بیارەو هەڵەبجەو

سلێمانیو قەرەداغ بۆ خوێندن، لەقەرەداغ لای زانای پایەبەرز، شێخ نەجیب و شێخ مستەفای کوڕی ئەمێنێتەوە، لەلای هەردووکیان دەرس دەخوێنێ، لەئەنجام دا شێخ نەجیب ئیجازەی مەلایەتی دەداتێ...

لەسەرەتاوە لە (قزلرەبات- سەعدیە)دەبێتە مەلای ئەوێ، دوایی دێتەوە سلێمانی، لە (خانقای مەولانا)ئیمام و مودەڕیس بووە، پاشان لەساڵی (١٣٥٢ك= ١٩٣٣ز) دەگەڕێتەوە تەوێڵە و دەبێتە ئیمام و مودەڕیس و خەتیبی تەوێڵە.

ماموٚستا مەلا صاحب نزیکەی (٤٠) ساڵ پێش نوێژ و ماموستاو وتار خوێنی مزگەوتی گەورەی تەوێڵە بوو. هەرلەو کاتەدا کەلە مزگەوتی مەولانادا بووە، لەسلێمانی فەقێی بووە، کەدێتەوە بۆ تەوێڵە، خوێندنگای تەوێڵە برەوی زیاتر پێدەدرێت، لەهەموو شوێنێکەوە فەقێی بۆ دێت، کەجاری وابووە زیاتر لە (٥٠) فەقێی بوون، کەسانی وەك:

ماموستا ئەحمەدی موفتی زادە و مەلا عەبدوللە هەجیج و شێخ محەمەد نەجیب بەرزنجی و مەلا قادری قادری پاوە و مەلا ئەحمەد سەعدوللەی نعمەتی دزاوەری، فەقێی ئەو بوون. موڵەتی مەلایەتی بەزۆرێك داوە لەوانە:

- مەلا ئەحمەدی بۆکان، مەلا مستەفای ئەڵمانە کەبەمحەمەد شەریف بەناوبانگە و لەئابلاخە لە سلێمانی، مەلا سەلامی هەجیج، مەلا حەبیبی تاوێرە، مەلا حەبیبی ناو، مەلا شەمسەدینی سەرپێزی، مەلا ئەحمەد سەعدوللەی نیعمەتی دزاوەری کەلە دانیشگای تارانە، مەلا سەید عەبدولرەحمان تەوێڵەیی، مەلا سەید ڕەشادی تەوێڵەیی، مەلا صاڵحی صۆفی حەمەئەمینی زاوای... هتد.

حاجی مەلا صاحب:

چوار ژنی هێناوە بەناوی (بەگیج و عائیشە و مەلیعە و ناهیە) هەرسێ ژنی یەکەمی پێش مردنی خۆی مردون تەنها ناهیە خاتون ئێستا ماوە و لەهەڵەبجەی تازەیە.

سێ کوڕو سێ کچی بووە: کوڕەکانی محەمەدو سەیفەدین و عەبدولکەریم، ئێستا تەنها سەیفەدین یان ماوە. کچەکانیشی: سەعادەت، عالیە، بەدیعە، هەرسێکیان شویان کردووە و ماون.

ماموٚستا لەساڵی (١٩٧١)دا خۆی خانەنشین کردووە و لەساڵی (١٩٧٦)ەوە هاتە هەڵەبجە دانیشت تالە (١٩٧٧/٧/٩)کۆچی دوایی کردو تەرمەکەی لەهەڵەبجەوە برایەوە تەوێڵە و لەگۆڕستانی (باوا سەرهەنگ) لەپاڵ خاتو مەلیعەی نەجیبە فەندی خێزانیا بەخاك سپێررا.

**مامۆستا مەلا حافیظ** (١٩٠٠ – ١٩٦٨/٣/١٣)

مامۆستا مەلا حافیظ کوڕی مەلا نەزیری بچوکەو لەتەوێڵە لەدایك بووە، لەخزمەتی باوکیو زانایانی ئەو سەردەمەی تەوێڵە دەست بەخوێندنی قورئان و کتێبە سەرەتاییە ئایینیەکان دەکات، دواتر لەگەڵ حاجی مامۆستای تەوێڵەدا دەچن بۆ دەوروبەری مەریوان و سنە، بۆ خویندن و ماوەیەك لەخزمەتی مەلا ئەحمەدی موفتی سنەدا دەمیننەوەو، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ تەوێڵە، پاش دوو سێ ساڵ بەرەو سۆڵەی قەرەداغ و گوندی عەلی پەکان و مەحمود قەجەرو سۆڵاوا دەڕوات و دەبێتە مەلای ئەو گوندانە، بەتایبەت لەسۆڵاوای ناوچەی هۆرێن و شێخان دەمێنێتەوە.

مامۆستا مەلا حافیظ

شێخ قادری شێخ موسلیم کە کەسایەتی‌یەکی ئایینی و کۆمەلایەتی ناوچەکە بووە، زۆر لێی ڕازی دەبێت و خاتوو ڕەعنای کچی لێ مارە دەکات و حەمیدەو محەمەد نەجیبی لێ دەبێت، لەتەمەنی حەوت ڕۆژی محەمەد نەجیب دا ڕەعناخان کۆچی دوایی دەکات شێخ قادری خەزوری کچێکی تری خۆی ئەداتی بەناوی عصمەت، ئەویش ئەوەندەی پێ ناچێ کۆچی دوایی دەکات ئیتر مامۆستا زۆر دڵگران و بێ تاقەت ئەبێت، بۆیە لەوێوە دەچێتە خانەقین و ماوەی ساڵێکیش لەوێ دەبێتە مەلا.

لەساڵی (١٩٤٧) دوای (١٧) ساڵ غەریبی و دوری لەخزم و کەس و کارو دوو منالی بێ دایك، بڕیاری گەڕانەوە دەدات و دێتەوە زێدەکەی، تەوێڵەی خۆشەویست.

ئەو ماوەیەی لەتەوێڵە بووە هاوکاری مەلا صاحب ی برا گەورەی کردووە لەکاری مەلایەتی‌داو، خەریکی وتنەوەی قورئان بووە بەمناڵان و، وانەی فارسیشی وتووەتەوە، خەتیشی زۆر خۆش بووە، هەروەها ماوەیەکیش بووەتە مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی لەسۆسەکان.

پاش گەڕانەوەی بۆ تەوێڵە لەساڵی (١٩٤٨) خاتوو مەلیعەی مەلا نیزامی ئامۆزای دەهێنێ. لەساڵی (١٩٦٧) توشی نەخۆشی دەبێت و لە (١٩٦٨/٣/١٣) کۆچی دوایی دەکات و، لەنزیك مەلا نەزیری باوکیدا، لەباوا سەرهەنگ بەخاك دەسپێرری.

منالەکانیشی ئەمانەن:

حەمیدەخان- خێزانی مەلا خالیدی ئامۆزایەتی، محەمەد نەجیب – کارمەندە، مەلا لوقمان – مەلایە لەشاری سنە، نوعمان – کارمەندە، مەلا زوبێر – مەلایە لەشاری سنە، مەلا عوزێر – دواتر باسی دەکەین، رەبیعە خان – خێزانی زاهدی شێخ عیزەدینە، کەخوشکەزای باوکی‌یەتی، مەسعود – کاسبە.

**حاجی مامۆستا مەلا عوزێر:**

مامۆستا مەلا عوزێر کوڕی مەلا حافیظی کوڕی مەلا نەزیرە، لەساڵی (١٩٥٧) لە تەوێڵە لەدایك بووە. سەرەتای خوێندنی لەخزمەت باوکیدا بووە، تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی هەر لە تەوێڵە خوێندووە، پاشان دێتە هەڵەبجەو لەقوتابخانەی سەرەتایی ئایینی دەخوێنێو تادەگاتە پۆلی سێ‌ی ناوەندی ئیسلامی، لەو کاتەدا دەبرێ بۆ سەربازی‌و، هەر لەسەربازی‌دا تاقیکردنەوەی دەرەکی (امتحان خارجي) سێ‌ی ناوەندی دەدات و دەردەچێ.

مامۆستا مەلا عوزێر

ئەوەی شایەنی باسە: مامۆستا، شان بەشانی خوێندنی لەقوتابخانە لەحوجرەکانی تەوێڵەو گوڵپ و سەرگەت و هەڵەبجەش خوێندوویەتی.

مامۆستا مەلا عوزێر، دوای ئەوەی سەربازی تەواو دەکات، دەچێتەوە پەیمانگای ئیسلامی و پۆلی چوارو پێنج تەواو دەکات، دوو بارە بانگ دەکرێتەوە بۆ سەربازی یەدەك و (احتياط)، دیسان لەسەربازی تاقیکردنەوەی دەرەکی پۆلی شەشەمی پەیمانگای ئیسلامی دەدات و دەردەچێت و، پاشان دەچێتە کۆلێژی شەریعەی ئیسلامی لەبەغداو سێ ساڵ بەردەوام دەبێت و بەهۆی ئەوەی ناچێت بۆ (جەیش شەعبی) فەصڵ کراوە.

شایەنی وتنە ئەو سێ ساڵەی لەکۆلێژ بووە لەبەغدا، پێش نوێژی مزگەوتی (السليمانية)ش بووە.

دوای فەصڵ بوونی لەکۆلێژ دەگەڕێتەوە سلێمانی و دەبێتە پێش نوێژی مزگەوتی (سەید حەسەن). دوای ساڵێك پاش لێبوردن لەزانکۆ وەرگیراوەتەوەو دەست دەکاتەوە بەخوێندن و لەئەنجامدا لەساڵی (١٩٨٨-١٩٨٩) بەکالۆریۆس لەشەریعە بەدەست دەهێنێو دەگەڕێتەوە مزگەوتی (سەید حەسەن)

لەسلێمانی، وەدەشبێتە وتاربێژی مزگەوتی تاسڵوجە. پاشان دەبێتە وتاربێژی مزگەوتی حاجی فەرەجی سوسیٚ لەشێخ مەحیەدین. لەمانگی (٦/١٩٩١) یشەوە دەکرێت بەوتاربێژی مزگەوتی حاجی عوسمانی عەلاف لەگەڕەکی زەرگەتە لەسلێمانی، وەتا ئێستاش هەر لەویٚ بەردەوامە.

مامۆستا مەلا عوزێر، مامۆستایەکی لێهاتووەو کاریگەری خۆی هەیەو توانیویەتی لەناو کۆمەڵگادا جێگەی خۆی بکاتەوەو، وتارەکانی جێگەی ڕەزامەندی خەڵکەو جەماوەرێکی زۆری لەدەور کۆ بووەتەوە، لەو پێناوەش دا تووشی کێشەو گرتن و ناڕەحەتی بووە، بەڵام کوڵی پیٚنەدراوەو هەر بەردەوامە لەگەیاندنی ئایینی ئیسلام بەکۆمەڵگا.

حاجی مامۆستا: خێزانی هەیەو حاجی نەرمین خانی کچی مەلا نافعەدینی خاڵۆی هاوسەریەتیو، هاوکارێکی باش بووە بۆیو زۆر دڵسۆزە بۆ یارمەتیدانی لەبانگەوازی ئیسلامیدا. سیٚ کوڕو دوو کچیشی هەیە: بەنان، ڕابەر، ڕێبین، ڕەیان، محەمەد.

## رشتەی بنەماڵەی مەلا سەلام

**مەلا یاسین[٧٢] :**

مەلا یاسین کوڕی مەلا عەبدوالڕەحمانە و، دەچێتەوە سەر مەلا سەلام[٧٣]، هەر لەمەلا سەلامەوە تا مەلا یاسین و دواتریش نەوەکانی ئەو، لە تەوێڵەدا مەلایەتیان کردووە و لەخزمەتی ئاینی ئیسلامدا بوون.

وا دەرئەکەوێت کە مەلا یاسین لەدەور و بەری ساڵی (١٨٠٠ز)لە تەوێڵە لەدایك بووە، هەر لە تەوێڵە و دەوروبەری خوێندویەتی دوا پلەی خوێندنی (موستەعیدی) لەلای مەلا عەبدوڵڵەی خەرپانی بووە، لەکاتی خوێندنیدا لەخەرپانی هاوڕێی مەلا یوسفی تەشاری‌و مەلا محەمەدی زەهاوی کەموفتی عێراق بووە- تا مەلا یاسین ئامادە بوبێت مەلا محەمەدی زەهاوی دەرسی بە

فەقێی خۆی نەوتوەتەوە - مەلا خدری (نالی شاعیر) بووە، هەریەکەیان بونەتە زانایەکی ناودار.

مەلا یاسین لای مەلا عەبدوڵڵەی خەرپانی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە زانایەکی سەردەمی خۆی بووە و، خاوەن ڕێز و پلەو پایە بووە لە ناوچەکەدا.

مەلا یاسین خاتو گوڵەی کچی مەلا نەزیری هێناوە کەکچەزای شێخ عوسمان سراجەدین بووە، دوو کوڕی بووە، مەلا عەبدوالباقیو مەلا عەبدوالله کەبە مەلا عەبدە ناسراوە(٧٤). وەك دەڵێن: لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

**مەلا عەبدە:**

لە تەوێڵە لەدایك بووە لەساڵی (١٨٣٨ز)لای باوکی و زاناکانی ئەو کاتە لە تەوێڵە خوێندویەتی، پیاوێکی خواناس و لەخوا ترس بووە، خزمەتی خەڵکی زۆر کردووە دەڵێن: نزیکەی چل ساڵ ئیمام و خەتیبی تەوێڵە بووە، مەلایەکی زۆر چاك بووە و لە شەرعدا زۆر زانا بووە و، کتێبی (بەهجە)ی ئین ولوەردی لەبەر بووە کەچەند هەزار بەیتە.

لەتەمەنی (٩٧)ساڵیدا لە ساڵی (١٩٣٥ز)کۆچی دوایی دەکات و هەر لە تەوێڵە بەخاك سپێرراوە.(٧٥) مەلا عەبدە: دوو کچی بووە، عائیشە شوی کردووە بە سەید عوسمان بەرزنجیو ئاسماء شوی کردووە بە مەلا حەکیمی برای مەلا عارف، هەروەها حەوت کوڕیشی بووە، لەنەوەی یەکێکیان کە (عەبدوالقادر)ە، مەلا کامیلی بووە ئەویش کوڕێکی هەیە بەناوی مەلا عەبدوالقادر.

**مامۆستا مەلا عەبدوالقادر مەلا کامیل:**

لە (١٩٥٦/٧/٥) لەتەوێڵە لەدایکبووە، لەخزمەت باوکیدا، دەست بەخوێندن دەکات، تا لەساڵی ١٩٧٢ دەبێتە قوتابی پەیمانگای ئیسلامی لەهەڵەبجە، هاوکات لەحوجرەش لای بەڕێزان: م. مەلا عوسمان پریسیو، م.عەبدولعەزیز پارەزانیو، م.سەید نەجمەدین دەخوێنیو ماوەیەکیش بۆ خوێندن دەچێتە بەغدا بۆ خزمەتی م.مەلا عەبدولکەریمی بیارە، لەکۆتاییدا لەلای م.مەلا حەمەئەمین کانی سانان، مۆڵەتی زانستە شەرعییەکان وەردەگریو، دەبێتە مەلا.

پاش تەواوکردنی خوێندن لەساڵی ١٩٧٦دا تەعین دەکریۆ دەبێتە مامۆستای ئەم مزگەوت و شوێنانە:

- مزگەوتی خەرقەش لەگوندی گورگەدەر لەشارباژێر- ١٩٧٦.
- مزگەوتی حاجی مستەفای یارەیسی لەتەپی سەفا -١٩٧٩.
- مزگەوتی هانەی دلین لەتەوێڵە - ١٩٨٠.
- مزگەوتی عەنەبی کۆن لەعەنەب - ١٩٨٢.
- مزگەوتی حەمزە لەهەڵەبجە - ١٩٨٥.
- لەکیمیابارانەکەی هەڵەبجەشدا دەچێتە ئێران و دواتر دەگەڕێتەوە سلێمانی و لەمزگەوتی سەید حەسەن لەصابونکەران دەبێتە پێش نوێژو لەهەمان کاتدا دەبێتە وتاربێژی مزگەوتی مەولەوی -١٩٨٩.
- لەساڵی ١٩٩٠ یش دەبێتە پێش نوێژی مزگەوتی سەیوانی یەکەم لەسلێمانی، ئێستاش پێش نوێژو وتاربێژی ئەم مزگەوتەیەو، ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لەو گەڕەکەداو، توانیویەتی کاریگەری هەبێت لەسەر جەماوەرەکەی. هەروەها لەناو هەورامی‌یەکانیش و تەوێڵەیی‌یەکان بەتایبەتی ڕۆڵ و ڕێزی خۆی هەیە.

ئەوەی شایەنی باسە مامۆستا لەساڵی ١٩٧٦ خێزان پێکدەهێنیۆ ئێستا خاوەنی چوار کوڕو دوو کچە.

### مەلا عەبدوالڵەی مالێدەر(٧٦):

ئەمیش وەك لەڕشتەی بنەماڵەکەدا هاتووە دەچێتەوە سەر مەلا سەلام، چونکە مەلا عەبدولصەمەدی باوکی، برای مەلا یاسینە کوڕی مەلا عەبدولڕەحمانی بچوکن.

مەلا عەبدولا لە تەوێڵە لەدەورو بەری ساڵی (١٨٤٠) لەدایك بووە، لای باوکیو مەلاکانی تەوێڵە خوێندویەتی، دوایی هاتووەتە سلێمانی لە مزگەوتی گەورە خوێندویەتی.

ماوەیەکی زۆر مەلای مزگەوتی باساکا بووە لە تەوێڵە. مەلایەکی خواناس و شەرعزان بووە، لەقەزاوەتدا زۆر زیرەك و ئازاو دادپەروەر بووە، لەنزیکی ساڵی (١٩٢٦)دا کۆچی دوایی کردووە، دوو کچ و دوو کوڕی بووە، کچەکانی: کافیە و صەفیە، کوڕەکانی: عەبدولمەجید و عەبدولحەمید. عەبدولمەجید کوڕی نەبووە تەنها کچێکی بووە بەناوی عائیشە شوی کردووە بە حاجی حەمەعەلی کوزاد.

مـەلا عەبدوالحەمیـد: لـە سـاڵی (١٣١٧ك =١٨٩٩ز)لـە تەوێڵـە لـەدایك بووە.[٧٧] مەلایـەکی چاك بووە لـەدوای باوکی بووە بەمـەلای مزگـەوتی باسـاکا، لەدەفتەری یادەوەریەکانی مامۆستا محەمەد عەبدوالڕەحیم دا کورتەیەك لـەژیانی مامۆسـتا نوسـرابوەوە وەصـفێکی زۆری ئـەم زانـا بـەڕێزەی تیایـە لـە کۆتاییەکەیدا دەڵێت:

لەشـەوی (١١/١٢- ٨/١٩٦٦) لـەدەرە قـازان لەسـەربانی کێڵەکـەی خۆیـدا کەوتوەتـە خـوارەوەو ئـازارێکی زۆری پێگەیشـت، دوای سـێ ڕۆژ لەبـەرواری (١٥/٨/١٩٦٦)دا کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا مەلا عەبدوالحەمید: شەش کوڕو پێنج کچی بووە.

**مەلا عەبدواللەی چلانە:**

کوڕی مەلا جەلیل کوڕی مەلا مەحمودی کوڕی کوێخا شێرزادە، مەلا مەحمود مەنسوبێکی پایە بەرزی شێخ عوسمانی سیراجەدین بووە.[٧٩]

مەلا جەلیلیش زانایەکی ناودار بووە، چەند ساڵێک پێش نوێژو وتار خوێنی مزگەوتی گەورەی تەوێڵە بووە.

مەلاعەبدوڵڵای چلانە.. مەلایەکی خواناس و زانابووە، لەساڵی (١٨٦٨ز) لەتەوێڵە لەدایك بووەو، لەلای مەلاجەلیلی باوکی دەستی کردوە بەخوێندن. پاشان لەلای گەلێ لەزاناکانی تەوێڵە خوێندویەتی..

ئەم مامۆستایە زیاتر بەدەرس وتنەوەی قورئانەوە خۆی خەریك کردووە، دەرسی بەمنالانی خۆیو مانالانی تری ناوچەکە وتووەتەوەو خەتی زۆرخۆش بووە لەدەورو بەری ساڵی (١٨٩٥ز)دا قورئانێکی بەخەتی خۆی نووسیوەتەوە ئێستا لەلای مامۆستا مەحیەدین حاجی سەلیمە.

مامۆستا لەساڵی (١٩٣١ز)لە تەوێڵە کۆچی دوایی کردووەو چوار کوڕی بووە:

- ئیبراهیم.. زوومردووە.
- مەلا عەبدوڕەحمان- لەساڵی (١٩١٠) لەتەوێڵە لەدایك دەبیٚو لەساڵی (١٩٦١)لەدوای باباحاجی بووەبەئیمامی مزگەوتی بابا ئەسکەندەر تاساڵی (١٩٨١) پاشان لەسلێمانی ژیاوە تالە (١٩٩٣/٦/٦)دا لەسلێمانی کۆچی دوایی کردو تەرمەکەی برایەوە تەوێڵە.
- مەلا حەمەئەمین.. لەدایك بووی (١٩١٧)یەو خانە نشینەو لەسلێمانیە.
- مەلائیسماعیل.. لەدایك بووی (١٩٢٥)لە (٢٠٠٠/٧/٤)لەسلێمانی کۆچی دوایی کرد. پیاوێکی زۆرموسڵمان و پاك بوو زۆرلەخزمەتی قورئاندا بووە.

## رشتەی بنەماڵەی مەلا حەكیمی گەورە

### مەلا حامدی كوڕی مەلا حەكیم:

مەلاحامد كوڕی مەلاحەكیمی گەورەیە، مەلاحەكیم زانایەكی سەردەمی خۆی بووە لەسەردەمی بابانیەكاندا لەقەلا چوالان ژیاوە، چۆن هاتووە بۆ قەڵاچوالان و ئیشی چیبووە بۆمان دەرنەكەوت، بەڵام لەوانەیە لەناو بابانیەكان دا پلەو پایەیەكی بوبێت و وەك زانایەك بانگهێشت كرابێت...

مەلاحامدی كوڕیشی زانایەكی زیرەك و وریابووە، شارەزای باشی هەبووەلە (فقه)دا بۆماوەیەك لەسلێمانی قازی بابانییەكان بووە.

لەدەوروبەری ساڵی (١٨٩٠ز)دا دەگەڕێتەوە، تەوێڵە دەبێتە ئیمام و مودەڕیسی مزگەوتی باساكا لە تەوێڵە. چونكە خەتی خۆش بووە (٩) قورئانی نوسیوەتەوە.

لەپەڕاوی- بوژانەوەی مێژووی زانایانی كورد- لەڕێگەی دەستخەتەكانەوە .. دانراوی محەمەد عەلی قەرەداغی- بەرگی دووەم- چاپی یەكەم ساڵی (١٩٩٩ز)لاپەرە (١٩)دا، هاتووە:

(لە (دارصدام للمخطوطات) ژمارە (٢١١٩٤) قورئانێكی پیرۆزی هەیە، كەحامیدی كوڕی عەبدولحەكیم لەمەدرەسەی باساكی (لە تەوێڵە )، لەبەرخاتری وەستا محەمەد حسەینی كوڕی وەستا ئەحمەدی ئاسنگەر، ساڵی (١٣١٤) نوسیویەتیەوە. لەسەردەمی فەرمانڕەوای وەسمان پاشای كوڕی حەمەپاشای جافدا لەقەزای گوڵعەنبەر، لەزستانی ئەو ساڵەدا تەرزە ئەو ناوچەی كوتا، یەك مەن گەنم بە بیست و هەشت پارە بوو!)

لەکوڕە ناودارەکانی: (مەلا محەمەد) بووە کەمەلایەکی چاك و زانابووە زۆرلەخزمەتی قورئان دا بووەو ئەمیش خەتی خۆش بووە. لەکوڕەکانی ئەمیش (مەلاعەلی) کوڕی بووەتە مەلاو پێش نوێژی گوندی گرێزەی شارەزوور، لەدوای ئەمیش مەلاعوسمانی کوڕی، ئێستا وتار بێژی ئەم گوندەیە.

**بنەماڵەی مەلا شێخ عەلی [٨١]:**

شێخ عەلی، یەکەم خەلیفەی شێخ عوسمان سراجەدینی یەکەم بووە، لە تەوێڵە لەدایك بووەو هەرلەوێش مردووە، بەشێخ عەلیە کۆڵە ناسراو بووە، وەك باسی دەکەن، پیاوێکی زۆرخواناس و لەخواترس بووە، خوێندەوارێکی باش و زۆرزیرەك و دانشمەند بووە.

دەڵێن: شێخ عوسمان زۆری خۆش ویستووەو جێگەی پرس و ڕاوێژی بووە، وەك نوێنەریش ناردویەتی بەولاولادا.

مەولەوی ئەم چەند شیعرەی لەلاوەندنەوەومێژووی وەفاتیدا و تووە:

گوم بی چون خورشید، ئەونە پڕتەودا
گوم بی ئەهل عیلم، نەشوڵەی ئەودا

نارمەکەرد وەسەر، دڵ سازانەدا
نادر بی جەناو، هام ڕازانەدا

بنویس وە هووناو، دڵ نەپەڕەی جەرگ
(نادر شێخ عەلی)، پەی تەء ریخ مەرگ

واتە:

- شێخ عەلی وەك خۆر گوم بوو لەتیشکی خۆیا، وەئەهلی عیلمیش کەوەك ئەستێرە وان لەتاریکایی گومڕاییدا، لەشەوقی ڕۆژی ئەوا گوم بوون.

- ئاگری بەرئەدایە دڵی ئەو پیاوانەی خوا کەدڵی خەڵك ڕێك ئەخەن وەلەناو هاوڕێیانیدا هاوتای نەبووە.

- لەمێژووی مردنیا بەخوێناوی دڵ لەپەڕەی جەرگم بنووسە (نادر شێخ عەلی) کەبەپیتی ئەبجەد ئەکاتە (١٢٧٥ك). کە دەکاتە (١٨٥٨)زاینی.

لەڕوانگەی ئەم شیعرەوە دەردەکەوێ کە شێخ عەلی مەلایەکی زاناو ناودارو، کاریگەری بووە لەدەوروبەرەکەیدا.

شێخ عەلی سێ کوڕی هەبووە، لێرەدا بەباشی دەزانین باسی شێخ حەیدەری کوڕی بکەین چونکە شێخ حەیدەر مەلاو زانایەکی بەناو بانگ بووە پێویست بەوەدەکات لەسەری بڕۆین.

مەلا شێخ حەیدەر شێخ عەلی [٨٢]:

زانایەکی بەناو بانگ و فەقیهێکی ناودارو زاهیدێکی تەواو بووە، لەگەڵ ئەوەشدا یەکێك بووە لەخەلیفەکانی شێخ عوسمان سراجەدین لەنزیکی ساڵی (١١٦٥ك) [٨٣] لە تەوێڵە لەدایك بووە لەماڵێکی ئاینپەروەردا پەروەردە بووەو هەرلەوێش دەستی کردووە بەقورئان خوێندن و کتێبە وردەکانی عەقاید، پاشان بەردەوام بوە لەسەر زانستە شەرعی‌یەکان و هەرلە تەوێڵەش زانستە عەقلی‌و نەقلی‌یەکانی خوێندووەو مۆڵەتی مەلایەتی وەرگرتووە.

ئەم زانا زاهدە گەورەیە نەچووە ناودنیاو ژنی نەهێناوەو خۆی تەعین نەکرد... لەماڵی خۆی‌دا مایەوە لەسەر نەفەقەی خۆی ژیاوە، لەڕێی خوادا وانەی بەخەڵکی دەوتەوە بەتایبەت وانەی (فقە و ئوصولْ فقە)، لەدوای وانەکانی، خۆی بەقورئان خوێندنەوەو نوسین و موتالەعەو زیکرەوە خەریك دەکرد.

خۆش نوسێکی گرنگ و بەناوبانگ بووە، زۆربەی سەنەدو ئیجازە نامەکانی سەردەمی خۆی، ئەو دەیانوسیْ بۆ نموونە: لەبەر خۆشنوسی‌یەکەی سەیری بنەماڵەی زانیاران (ل ٢٨) بکە چۆن وەصفی دەکات کەمۆڵەتنامەی شێخ مستەفای شێخ مەحمودی موفتی ئەودەینوسیْ.

هەروەها بەدەست و خەتە جوانەکەی کتێبی (الفضیلة)ی مەولەوی‌و (محاسن الغرر فی شمایل البشر)ی مەلا مەحمودی جەیشانی نووسیوەتەوە کەهەردووکیان هۆنراوەن.

وابەناو بانگە کەلەژیانیدا پارویەکی حەرامی نەخواردووەو غەیبەتی نەکردووەو زۆربەپاکی‌و پیرۆزی‌و دڵ سافانەوە ژیاوە.

شێخ حەیدەری زانا، مەرجەعی چارەسەری کێشە فقهیەکان بووە، وەختی زۆری بەقورئان خوێندنەوە بردوەتە سەر.

بەم شێوە لە تەوێڵە بەردەوام بووە، تاکۆچی دوایی شێخ محەمەد بەهائەدین، پاشان هاتە بیارەو، سەردەمی شێخ عومەر زیائەدین و شێخ نەجمەدینیشی بەڕێ کرد، تالەسەر دەمی شێخ عەلائەدین دا لەساڵی (١٣٥٣ك) لەبیارە کۆچی دوایی کردووەو هەرلەوێ لە (ملەگای چنار)بەخاك سپێررا.

**مەلا عەبدوللەی مەریوانی[٨٤]:**

مەلاعەبدوللە خەڵکی مەریوانەو خێزانیشی خەڵکی (ولەژێر)ی لای مەریوانە. لەساڵی )(١٨٧١)زلەدایك بووەو لەساڵی (١٩٣٨ز)لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە. مناڵەکانی (محەمەد مەعروف= مارف، محەمەد، عارف، زەینەدین، توبا، بەدیعە). مەلا عەبدوللە، مەلایەکی زۆر زیرەك و ورياوشاعيرو قسەنەستەق دەبێت. ژیانی بەزۆری لە تەوێڵە بردوەتە سەر.

ماوەیەکی کەم ئیمام و خەتیبی مزگەوتی گەورەی تەوێڵە بووە، ماوەیەکیش کاتبی شێخ حیسامەدین دەبیٚو، سەردەمێکیش قازی دیواخانی قادربەگ بووە.

کەشکۆڵێکی شیعری هەیە کەلەساڵی (١٩٢٩) زۆربەی نوسیوەتەوە، ئێستالای- محەمەد مەعروفی کوڕیەتی.

مەلا عەبدوللە بەینی زۆرخۆش بووە لەگەڵ پیرەمێردا، بەڵکو ئەم مەولەوی وەك شاعیر دەناسێنیٚ بەپیرەمێردو، لەئەنجامدا پیرەمێرد زۆر لەشیعرەکانی دەکات بەسۆرانی.

لەکۆتایی سیەکاندا ماڵی هاتووەتە، سلێمانیو پاشان چووە لەبەغدا دامەزراوە، لەسەردەمی مەلیك فەیصەڵ دا (١٠٠) ڕوپیە مەعاشی بۆبڕاوەتەوە، دواتر گەڕاوەتەوە سلێمانی.

لەکوڕە ناودارەکانی (محەمەد مەعروفە)کەناسراوە بەمەلا مارف لەساڵی (١٩٠٥) لە تەوێڵە لەدایك بووە، لایباوکی نەحوصەرف و شەرع و فارسی دەخوێنیٚ، لەساڵی (١٩٢٨)کەگۆران مامۆستای قوتابخانەی تەوێڵە بووە، لای ئەو حیسابی خوێندووەو ئەمیش فارسی بەو وتووەتەوەو هاوکاری مامۆستا گۆرانیشی کردووە لەوتنەوەی وانەی عەرەبیدا بەقوتابیان. لەساڵی (١٩٣٢) لەقوتابخانەی تەوێڵە تەعین بووە، مەعاشی ئەوکاتەی مانگی یەك دینار بووە، دوای ساڵێك وازی لیٚهێناوە.

مامۆستا مەلا مارف - ٢٥ / ٥ / ٢٠٠٠

لەساڵی (١٩٣٣) لەسلێمانی بە (مەئمور مەخزەن) تەعین بووە، لەساڵی (١٩٣٤) بووەتە سەرۆکی شارەوانی چوارتا، مانگیبە (٦)دینار... ئێستا خانەنشینەو پیربووە لەماڵەوەیە...

مامۆستا مارف دەستی شیعری هەیە شیعرێکی جوانی نووسیووەو گرتوویەتی‌یە شووشەو بردوویەتی‌یەوە بۆخانەقای تەوێڵە کەئەمە شیعرەکەیە:

بازاست دوچشم بەتمنای تەویلە
دارم چو بدل الفت مولای تەویلە
قبریست پرازنور، کی‌از عرش نیامد
امد بەتماشاگاە مرقد مولای تەویلە

واتە:

هەردووچاوم کراوەتەوە بەگەورەیی‌و سەرکەتوویی تەوێڵە.
چونکە بەدڵ ئولفەتم گرتووە بەمەولای تەوێڵە.
(قەبری ئەو مەولایە) قەبرێکە پڕە لەڕوناکی، کێ هەیە لەعەرشەوە، نەهاتبێ؟!
هاتووە، بۆتەماشای مەرقەدی مەولای تەوێڵە.
لەمامۆستا مەلامارفم پرسی پیاوەناودارەکانی ئەوسای تەوێڵە کێبوون؟

وتی:

مەلابەکر، وەستا نادر، میرزا ئۆلقادر و چەندانی‌تر.
خەڵکەکەی چۆنە بەلاتەوە؟وتی:
عاقڵن، زیرەکن، زانستخوازن..
لەگرانیەکەدا تەوێڵە چۆن بوو؟ وتی:
تەوێڵە لەهەموو شوێنێ باشتربوو، بەهۆی بوونی گوێزو توو و مێوژەوە، هەرچەندە لەوساڵەشدا بەروبووم کەم بوو، هەروەها بەهۆی نان بدەیی شێخەکانەوە.
قادربەگ وەك فەرمانڕەوای تەوێڵە چۆن بوو بەلاتەوە؟ وتی:
دادپەروەربوو، سامی هەبوو، لەنگەری ناوچەکەی گرتبوو.
شێخ حیسامەدین چۆنە بەلاتەوە، وەك شێخێك؟ وتی:
لەوەگەورەترە من هەڵیسەنگێنم.
چۆن هاتنە تەوێڵە؟ وتی:
لەسەر داوای شێخ حیسامەدین هاتین.
لەکۆتایدا وتی:
بنەماڵەکەمان، چاکەو خزمەتی، مەحمود پاشای جاف و جافرسان و شێخ حیسامەدینی لەبیر ناچێتەوە، کەبۆمان زۆرباش بوون.

**کوڕی یوسف داود تەوێڵەیی:**

(لەیادی مەردان- ل (١٦٠) مامۆستامەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس دەربارەی کتێبخانەی خوێندنگای بیارەدا، باس لەچەندەها کتێبی نایاب دەکات کەلەو خوێندگایەدا بوون لەوانە:

تەفسیری بەیضاوی، توحفەی ئینوحەجەر لەچوار بەرگدا، (سراج الطالبین)ی مەلائەبوبەکری موصەنیف، مەکتوباتی ئیمامی ڕەبانی... پاشان دەڵێت:

دوودانە (ئوستورلاب)یش هەبوو، کەیەکێکیان، وەستایەکی تەوێڵەیی دروستیکردبوو، نوسخەیەکی زۆرنایاب و کۆنی زیجی ئولووغ بێگ بەشێوەیەکی یەجگار زۆرجوان و هونەرمەندانە نووسرابووەوە... هەروەها گەڵێ کتێبی تر هەبوون کەئێستا ناویانم لەیادنییە.)

کەوتمە پرسیارکردن کەئەم وەستا تەوێڵەییە دەبێت کێبێت، تاڕێگەم کەوتەلای مامۆستا سەید عەبدوڕەحمان سوجادی.. لەئەنجامی گفتوگۆیەك دا، مامۆستاباسی لەکتێبێکی دەستخەتی کرد کەهەیەتی بەناوی (علم الافلاك).

- کتێبەکەمان سەیرکردووسیٚ ڕۆژێکیش خواستم... دوایی بۆم دەرکەوت ئەم کتێبە بەنرخەو نایابە، لەئەصڵدا چوارنامیلکەن و کراونەتەوە بەیەك، دانەرەکەیان دەرنەکەوت کێیە، بەلام لەیەکێکیاندا ناوی مەلائەبوبەکری موصەنیف هەیەو هەروەها پەراوێزەکانی لەزۆرشوێن دا ناوی حەسەن چۆری لێنوسراوە، [٨٥] جارجارەش لەسەرپەراوێزەکان ساڵی نوسینەکەش نوسراوە وەك لە ل (٢٣)دا ساڵی (١٣١٧)ك نوسراوە.

- لە- ل (١- ٤٣)باسی لەچەند (باب)ێك پێکهاتووە.

- لە- ل (٤٤- ١٠٦)باسێکی- ئوسطورلاب) دەکات.

- لە- ل (١٠٧- ١٨١)باسی حسابات دەکات- چوارکردەکان، کەرتەکان، ڕەگ، ڕووبەرو چێوەو شێوە ئەندازەییەکان.

- لە- ل (٢٨٧)دا ساڵی (١٣٣٢ ك ڕۆژی= ١٣٧٢ ك مانگی) لەسەر نوسراوە کەئەم کتێبە لەوکاتە تەواو بووە.

- لە -ل (٢٨٨- ٣٢١)کۆمەڵێك وێنەو نەخشەو پەراوێزو چەند تێبنیو سەرنج نووسراون.

- هەروەها لە- ل (٢٩٠)وێنەی ئوسطور لابێك هەیە لەناویدا نوسراوە ئەم ئوسطورلا بەدەستکردنی (کوڕی یوسف داود تەوێڵەیی‌یە بەرواری مانگی موحەڕڕەم ساڵی (١٢٤١ك)لەسەر نوسراوە).

ئەم ئوسطور لابەزۆرگرنگ و بەنرخ و زیرەکانەو ژیرانە دروست کراوە، زۆربەشێوەیەکی هونەریو زانستیانە کێشراوە.

- ئەم کوڕی یوسف تەوێڵەیی‌یە، هەر ئەو وەستا تەوێڵەیی‌یەیە کەجەنابی ماموستا مەلا عەبدولکەریم باسی‌کردووە، لەلایەکی تریشەوە دەبێ ئەوەش بزانین کەسەید حەسەنی چۆڕی لەپەڕاوێزەکەدا باس لەم ئوسطور لابەدەکات، وەئەمیش زۆر لەبیارەو تەوێڵە ژیاوەو دۆستی نزیکی شێخ عومەر ضیائەدین بووە.

لەدوای ماوەیەك لەلای کاك شێرزادی کوێخا حەمە سەلیم نامەیەکم دەست کەوت کەدەسخەتی شێخ عەلائەدینەو بۆ کوێخا حەمە سەلیمی تەوێڵەیی نووسیووە، نامەکە فارسی‌یەو ناوەرۆکەکەی ئەمەیە: دوای سڵاوو ڕێز داوا لەکوێخا دەکات کەئەو ئوسطورلابەی کەلەلایەتی بینێرێ بۆ خوێندنگای بیارە چونکە لەوێ سودی لێوەردەگرن و نرخەکەشی هەرچەند بێ شێخ ئامادەیە پارەکەی بۆ بنێرێ.

پرسیارم لەکاکە شێرزاد کرد، نازانی باوکت ئەم ئوسطورلابەی لەکوێ دەستکەوتووە وتی: (حاجی‌یەکی ئێرانی لەحیجازەوە هێناویەتی و هەدیەی باوکمی کردووەو ئەویش ناردویەتی بۆ شێخ، ئەمەش لەساڵەکانی سەرەتای پەنجاکان بووە...) لەوانەیە ئەو دوو ئوسطورلابەی کە م. مەلا عەبدولکەریم باسیان دەکات و لەپێشەوە ئامارەمان بۆ کرد ئەمە یەکێکیان بێت و ئەوی تریان ئەوەی تەوێڵەیی‌یەکە بێت کەدروستی کردووە.

ئێستاش دەڵێن:

ئاخۆ دەستکردو نوسراوی تری ئەم زاناو وەستا بەڕێزە لەچ شوێنێکی تر ببێت.

ئەمەش وێنەی ئەو ئوسطور لابەوچەند وێنەیەکی ئەو کتێبە نایابەبەنرخە. هەروەها وێنەی نامەکەی شێخ عەلائەدین کەبۆ کوێخا حەمە سەلیمی نوسیووە.

**بنەماڵەی مەلاصادقی تەوێڵە**[٨٦]:

ئەم بەڕێزە، لە تەوێڵە لەدایك بووەو هەرلەوێ دەستی‌كردووە بەخوێندن، پاشان بۆخوێندن دەچێتە نۆدشەو خورماڵ، دوایی لەساڵی (١٢٤٧ك = ١٨٣١ز) لەگەڵ مەلا ئەحمەدی نۆدشی كەهەردوكیان موستەعید بوون دێنە لای‌مەلا عەبدوڵڵەی خەرپانی، جاوەختێك لە هەڵەبجە لەمزگەوتی جامعە لای مەلاعەبدوڵڵەی خەرپانی دەخوێنێ، لەوكاتەدا، موستەعید بووەو مەولەوی لای ئەم مەلا صادقە (كەمال)ی خوێندوە.

وەك لەدەمی ڕیش سپیانی تەوێڵەوە بیستوومانە، ئەم مەلا صادقە، خوێندەوارێكی باش و زاناو ناوداربووە، واش دەردەكەوێ ئەمە ڕاست بێ، چونكە: هەركەسێك لەهەرلایەكەوە، ویستبێتی خوێندنێكی شیاوی باش بخوێنێ، ڕۆیشتووە بۆخزمەتی شێخ عەبدوڵڵەی خەرپانی‌و مەلاجەلالی خورماڵ و مەلائیبراهیمی بیارە. ئەم سیانە لەنزیكی یەكیشەوە بوون و ماوەی نێوان خوێندنگاكانیان دوورنەبوون لەیەكەوە. ئەم پیاوانە هەرسێكیان لەزانا گەورەكانی چەرخی خۆیان بوون بەتایبەت لەزانستەكانی. بەلاغەو فیقە و ئوصولی فیقە و ئوصولی كەلام دا.

كەواتە: مەلاصادق فەقێ‌یەكی لێهاتوو و زیرەك و بووە، بۆیە چووەتە لای مەلا عەبدوڵڵە، تاوەكو خوێندنێكی باش بەدەست بهێنێ، هەروەها كەوانەشی بەمەولەوی وتبێتەوە، واتە: بەتواناو زیرەك بووە.

بەداخەوە مێژووی ژیانی‌و بەسەرهاتی لەمە زیاترمان دەست نەكەوت، تاباشتر بەخوێنەرانی ئاشنابكەین بەڵام لەوانەیە لەنێوان ساڵانی (١٨١٢-١٨٥٠ز) ژیابێت. ئەمەش لەڕوانگەی ژیانی مەلا ئەحمەدی نۆدشی‌یەوە كەهاوڕێ بوون و، هەروەها دەڵێن تەمەنی زۆر نەبووە.

لەبارەی نەوەكانیشی‌یەوە ئەمەمان بۆساغ بووەتەوە: مەلاصادق كوڕێكی بووە بەناوی سەلیم ئەمیش دووكوڕی بووە:حسێن و حەسەن.

مەلاحسێن: لە هەورامان و دەوروبەری خوێندن تەواودەكات و دەبێتە مەلاو ماوەیەكیش قازی تەوێڵە بووە، هەرلە تەوێڵە ژیاوەو، كچێك و چواركوڕی بووە، كچەكەی ناوی حەبیبە بووە شووی ی‌كردووە بەمەلا عەبدولواحدی حاجی صەلاحەدین. كوڕەكانیشی ئەمانە بوون:

ئەحمەدو مستەفا- ئەم دوانە زوومردون، كوڕی سێهەمی صدیق بووە، پیاوێكی زۆردیندارو لەخواترس بووە، ژنی نەهێناوەو چووە بۆحەج چەند

ساڵێك لەوێ ماوەتەوە، دوایی دەگەڕێتەوە بۆ تەوێڵە. بۆجاری دووەم دەچێتەوە بۆمەککەو لەوێ ماوەتەوە تاکۆچی دوایی دەکات. لەدوای خۆی پارەیەکی زۆری لێبەجێ‌ماوە، لەسەر وەسیەتی خۆی، هاوڕێکانی، پارەکە وەردەگرن تاکاروانی حاجیان دێن و حاجیانی تەوێڵەیی دەیهێننەوە بۆ خانەقای تەوێڵە.

کوڕی چوارەمی مەلاحسێن، (صادق)ی ناوبووەو کەمێکی خوێندووە، بەلام بەمەلا صادق ناسراوەو لەساڵی (١٩٥٧)دا، لە تەوێڵە کۆچی دوایی دەکات و کوڕی نەبووە، بەلام چوارکچی لێ بەجێ‌ماوە بەناوی (صەفیە- خێزانی حاجی مستەفای حاجی مەلاصالح، فاتمە- خێزانی عەبدوللەی شوکرە، عالیە- خێزانی سەید بەکری بەڵخەیی، صەبریە- خێزانی عوسمانی حەمەی هاژە).

مەلا حەسەن:

دوای ئەوەی مەلایەتی تەواودەکات، خۆی بەوانە وتنەوە وەخەریك کردووە، لە تەوێڵە کۆچی دوایی کردووەو، لەدوای خۆی دووکچ و دووکوڕی لێبەجێ‌ماوە، کچەکانی عەیناو هەمینە بوون، کوڕەکانیشی: (سەعیدو سەلیم) بوون.

سەعید: خوێندەواری کەم بووە، چووە بۆکەرکوك و لەوێ ژیاوە، لەنیوەی حەفتاکاندا کۆچی‌دوایی کردووەو هەرلەوێش نێژراوە، چوارکوڕو پێنج کچی بووە.

کوڕەکانی (مەهدی و حەسەن و حسێن و ئەحمەد)ئەمانیش ئێستاوان لەکەرکوك.

سەلیم: لەدەوروبەری ساڵی (١٩٠٠ز) لەتەوێڵە لەدایك بووە، خوێندنی مەلایەتی لە تەوێڵەو پاوەو سنەو سەنغورو بیارە تەواو کردووە، لەلایەن مەلا قادری گەورەوە مۆڵەتی مەلایەتی پێ‌دراوە.

لەسەرەتاوە بووە بەمەلای شۆشمێ‌و دواتر بووە بەمەلای تاوێرە. کاتێك کەلە تاوێرە بووە، عوسمانی بەگی صاڵح بەگی فەتاح بەگ دەچێت بەشوێنیداو هێناویەتی بۆبەڵخەو دەبێتە مەلای بەڵخە.

لە تەوێڵە ژنێکی هێناوە بەناوی (پیرۆز محەمەد سلێمان) لەم ژنە چوارکچ و کوڕێکی هەیە بەناوی (سەلمە، سەڵتە، مەدینە، نەزیرە) کوڕەکەشی بەناوی (حسێن)ەوە یە کەئێستا لەسلێمانی‌یە.

لەبەڵخەش، خەدیجەی عوسمان بەگ دەهێنێ لەمیش دوو کوڕی دەبێت، بەناوی مستەفاو بەهائەدین، مستەفا مردووە بەهائەدینش ئێستا لە سلێمانیە.

ئیترمەلا سەلیم هەر لەبەڵخە نیشتەجێ بووە، تالەساڵی (١٩٥٥ن) لەوێ کۆچی دوایی کردووە بۆیە بەمەلا سەلیمی بەڵخە ناسراوە.

مەلاسەلیم، پێش نوێژو وتاربێژی بەڵخە بووە، دووساڵیش وەك (وەکیل موعەلیم)مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بەڵخە بووە. خەدیجەخانی خێزانی دەگێڕێتەوە کە: زۆرجار مەلا صاحب و شێخ حیسامەدین بۆڕاوێژکردن لەپرسیاری فیقهی‌دا دەیان نارد بەدوای‌دا. هەروەها دەڵێ:

لەگەڵ مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس دا، لیژنەبوون بۆدیاری کردنی سنوری نێوان ئێران و عێراق. وەك باسیشی دەکەن زۆرشارەزا بووە، بەفیقە و نەحو، لەگەڵ ئەوەشدا جێگەی متمانەو باوەڕ پێکراوی خەڵك بووە.

**فەقێ عەلی**[٨٧]:

زۆر لەژیانی نازانین، ئەوندە هەیە دەڵێن: لەسەردەمی شێخ سراجەدین و مەلانەزیردا ژیاوەو ئەصڵی لەنۆدشەوە هاتووە بۆ تەوێڵە، خوێندەواری کەمی خوێندووە، بەڵام خۆی زیرەك و خواناسێکی لەخواترس بووە.

فەقێ عەلی دووکوڕو چوارکچی‌بووە:

دووکوڕەکەی: جامی‌و شەمسەدین بوون. جامی خێزانی پێکهاناوە، بەڵام منداڵی نەبووە، بەڵام شەمسەدین، پێنج کوڕو دووکچی بووە، بەم شێوەی خوارەوە:

- حەسەن- باوکی حەمەعەزیزو حەمەحسێن، کەلەم دواییەدا لەباموك- نزیك هەڵەبجە ژیانیان بەسەربردووە، حەسەن لە چلەکاندا مردووە.

چوارکوڕەکەی تریشی:

- ئەحمەدو حەمەکەریم و عەبدوللەی‌و حەمەعەلی- ن. دووکچەکەشی مەجێ‌و خەجێ‌بوون. خەجێ ژنی مەلا عەبدولخالقی مەلاحامد بووە.

چوار کچەکەی فەقێ عەلی شویان کردووە بە: حاجی مەحیەدین و مەلا جەلال و مەلا حامدو مەلا جەلیل.

## پەراوێزەکان

(۱) - گۆڤاری خەزان- یادی هەڵەبجە (۲۰۰۰/۳/۱٦- هەروەها دەڵێن لە (معجم البلدانی) یاقوتی‌جەمەوی ئەمەهاتووە.

(۲) وەك لەوتارێکی بەڕێز صەلاحەدین محەمەد بەهائەدین- ئەمینداری گشتی یەکگرتووی ئیسلامی لە کوردستان دا، لەبەرواری ۱۹۹٦/٦/۲دا هاتووە.

(۳) - لەورد بوونەوە لەبەشەکانی تری ئەم کتێبە تائەندازەیەك بۆت دەردەکەوێت کەدینداری لەم شوێنە چۆنە، بۆیە لێرەدا ئاماژە بەهەندێ شتی‌تر دەدەین

(٤) - لەبەشی- سەربوردێکی هەورامان دا.. ئاماژەمان بەم باسەداوە.

(٥) - لەسەرقسەی خەڵکی تەوێڵە بەتایبەت وەستا محەمەد حاجی حەمە صاڵح... هەروەها مەلامارفی مەلاعەبدوڵڵای مەریوانی‌و وەستا صادق غەندی دەڵێن:

لەکاتی تێکدانی مزگەوتەکەدا قەبرێکی درێژ بووە کەکەللە سەرێکی تیابووە مێخێکی پێوە بوو.

(٦) - پاراستنی ئەم بەردە لەلایەن بەڕێز (نورەدین مستەفا نەجیبەوە- جێگەی ڕێزو سوپاسە، بۆساغ کردنەوەو مانای وشەکان بەهاوکاری وەستا محەمەد حاجی حەمە صاڵح و کاك نورەدینەوەبوو کەهەردوکیان سوپاسیان دەکەین.

(۷) - پاچەڵگا: واتە شوێنی دەزگای جۆلا، کەچەند جۆلایەك لەهاوین دا لەم شوێنەدا جۆلاییان کردوە وەك: ئەلەی زۆراب و وەهاب و شەفیعی کوڕی، نادر حەکیم و عەبدولحەکیمی برای، حەمەیوسف باباو عەزیزخواکەرەم و حەمەخان و حەمەئەمینی برای.

(۸) ماموستا مەلا عەبدوڕەحمان لەسلێمانی لە (۱۹۹۳/٦/٦)کۆچی دوایی کرد.

(۹) - چمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان- ل ۳۱- چەند لاپەڕەیەکە لەکتێبی (نوار الانواری (سەید عەبدولصمدی توداری) کەلە (۱۰۹۹)ی هیجرەتدا نووسیوویە.

محەمەدی مەلاکەریم وەری گێڕاوەتەسەر کوردی.

هەروەها سەیری بنەماڵەی زانیاران- ل ۱۱٤- مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس.

(۱۰) - (فەقێ ئەبوبەکر)ی تەوێڵەیی کەبە (فەقێ هەیبەکر)ناسراوە ئەچێتەوە سەر ئەم (فەقێ ئەحمەدەی غەزایی بەغدایی)یە. دایکی شێخ عوسمان سراجەدینی یەکەم کەناوی (حەلیمە)یەکچی ئەم فەقێ ئەبوبەکرەیە.. یادی مەردان- بەرگی دووهەم مەلاکەریمی مودەڕیس.... ل۷

(۱۱) - یادی مەردان- ل (۸) بەرگی دووهەم مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس.

(۱۲) - واباوە کەئەم شەخصە لەرزوتای گرتووەتە خۆی.

(۱۳) وەك حاجی بابا، وەستا محەمەد حاجی حەمە صاڵح، حاجی سەید محەمەد.

(۱٤) - لەحاجی سەید محەمەد سەید فەتحەوە بیستوومە.

(١٥) - گۆڤاری کاروان- ژ- ٧- ل (١٢٥، ١٢٦، ١٢٧)نوسراوێکی مامۆستا عەبد ڕەقیب بەناوی (تکیه طویله وزخارفها).

(١٦) - یادی مەردان- بەرگی (٢)ل ٢٨- مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس.

(١٧) - لەبنەماڵەی زانیاران- م. مەلاعەبدولکەریم دا ل (٣٩٧، ٤٠٤)دا ئاماژە بۆئەوە دەکات کەهەر شێخ محەمەد بەهائەدین خۆی ئەم خانەقایەی دروست کرد بۆیە دەڵێین لەوانەیە:

شێخ عوسمان لەسەردەمی خۆیدا خانەقایەکی زۆرسادەو شتێکی بچوکی دروست کردبێت، بەڵام لەسەردەمی شێخ بەهائەدین دا ڕوخێنرابێت و جارێکی تر دروستکرابێتەوەو گەورە کرابێت.

(١٨) - لەڕۆشنبیری نویٰ ژ (١٠٥)کەلەپوری بەڵگەنامەییدا ئەمە بلاو کراوەتەوە.

(١٩) - شەریعەتی ئیسلام- مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ب- ٢ ل (٣٢٠- ٣٣٨)

(٢٠)- بۆ سەرچاوەی ئەم وەقفانەی تەوێڵە سودم وەرگرتووە لەم بەڕێزانە:

حاجی ڕەحمان فەتاح، جەلال ڕۆستەم، خواکەرەم حاجی ئەبوبەکر، نورەدین مستەفا م. مەلا لوقمان ئیمام و خەطیبی مزگەوتی گەورەی تەوێڵە، قائیمەیەك لەوەقفی مزگەوتی بابا ئەسکەندەر کەلەلای اللەکەرەمی حاجی ئەبوبەکر بووە، ئەم هەموو مەعلوماتە لەلایەن ئاشتی اللەکەرەمەوە کۆکراوەتەوە زۆرسوپاسی دەکەم.

(٢١) - لەگۆڤاری کاروان (ژ- ٧- ل- ١٢٨)داهاتووە:

وەقفنامەیەك بەخەت و ئیمزای شێخ بەهائەدین هەیە بەبەرواری ساڵی (١٢٩٠ك)، ئەوباخ و زەویو ئاش و کانیانەی کەوەقف کراون بۆخانەقا لە تەوێڵە و بیارەو خوشیار لەشارەزوورو بەڵخە... نوسخەی ئەم وەقفنامەیە لەلای شێخ ئەحمەد بووە. هەروەها وەقفی خانەقا زۆرەو ئەو وەقفنامەیەمان دەست نەکەوت تابلاوی بکەینەوە

(٢٢) - بۆژیانی ئەم شێخانە سودێکی زۆرم وەرگرتووە لەهەرسێ بەرگی (یادی مەردان، بنەماڵەی زانیاران، علماؤنا في خدمة العلم والدین) دانراوی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، وەپەیامی هەورامانی- هادی ڕەشید بەهمەنیو، هەروەها هەندێ سەرچاوەی تریش.

(٢٣) - مەلا عەبدولکەریم دەڵێ لەباوکمەوە (مەلائەمەدی قازی)م بیستووە کەوتویەتی: ئەم نازناوە شاعەبدوڵلای دەهلەوی لێی ناوە کەلەسەر پەڕاوێزی ئەو قورئانەدا نوسیویەتی بۆی کەبۆی ناردووە لەگەڵ نامەیەکدا.

(٢٤)- یادی مەردان بەرگی- ٢ (ل ٤٣- ٥٦)هەندێ لەنامەکانی نوسراونەتەوە.

(٢٥) - یادی مەردان (ل ٥٦- ٧٣)وەصیەتەکانی تیایە.

(٢٦) - یادی مەردان- ب- ٢ ل ٣٦- ٤٣.

(٢٧) - بەحیسابی پیتەکانی ئەبجەدی ئەکاتە (١٢٨٣ ك).

(٢٨) – بەحیسابی پیتەکانی ئەبجەدی ئەکاتە (١١٩٥ك).
واتە لەساڵی ١١٩٥ کۆچی لەدایك بووەو لەساڵی ١٢٨٣کۆچی دوایی کردووە لەتەمەنی (٨٨)ساڵیدا.
(٢٩) بەحسابی پیتەکانی ئەبجەدی ئەکاتە (١٢٨٣) کەساڵی کۆچی دوایی شێخە.
(٣٠) – بنەماڵەی زانیاران ل ٤٠٤، یادی مەردان– ب– ٢ل– ٧٧.
(٣١) بنەماڵەی زانیاران ل ٤٠٤، یادی مەردان– ب– ٢ل– ٧٧.
(٣٢) – مەبەستی مەولەوی لەوشەی (کامڵ)عوسمانی سراجەدینەو محەمەد بەهائەدین بەئاوێنەی باوکی داناوە. (یانەی چەم)یش حوجرەی کەناری چەمی تەوێڵەیە لەخانەقادا، یاخود مەبەستی کاسەی چاوی خۆیەتی.. بنەماڵەی زانیاران (ل– ٤٠٥). هەروەها سەیری هەمان کتێبی بەردەست بکە شعری شاعیران ئەم شعرە بەتەواوی نوسراوە.
(٣٣) یادی مەردان (ل ٩٥– ٩٨– ب– ٢).
(٣٤) باخچەی بۆنخۆشان– ل ٢٢٣.
(٣٥) – ئەم شێخ صادقە وتوویەتی:
دەهەزار شیعری مەولەوی‌و صەیدی‌و نیزامی‌و شاعیرانی‌ترم لەبەرە. یادی مەردان (ب– ٢، ل– ٨٤).
(٣٦) – لەبنەماڵەی زانیاران (ل ٨٥)دا مامۆستا مەلا عەبدولکەریم دەڵێ:
ئەم دووانە لەسەر قسەی حاجی سەید محەمەد سەید فەتحەی تەوێڵەیی، خێزانی شێخ محەمەد بەهائەدین بوون، بەڵام من (عەبدورەزاق– نوسەر) لەدەمی حاجی سەید محەمەدم بیستووە کەئەمە بەهەڵە نوسراوە، وتومە خێزانی شێخ حیسامەدینن نەك خێزانی شێخ بەهائەدین.
(٣٧) – یادی مەردان (ب– ٢،ل– ٨٤)، بنەماڵەی زانیاران (ل ٤١٣).
(٣٨) – مێژووی هەورامان– محەمەد ئەمین هەورامانی– ل (٤٥١، ٥٣٨).
(٣٩) – گۆڤاری گوڵان– ژ (٣٩٢) بەرواری (٢٠٠٢/٧/٢٥).. هەروەها وێنەیەکی ئەوسەردانەی مەلیك فەیصەڵی پیشان داوە، بەڵام وێنەکە کاڵ دەرچووەو ئەصڵیەکەمان دەست نەکەوت.
(٤٠) – گەشتی هەڵەبجەو هەورامان– شاکر فەتاح– ل (٣٩) لەکتێبی (کردو ترك و عرب) دانراوی ئەدمۆندز– وەرگێرانی بۆعەرەبی جەرجیس فەتحوللە– ص (٧٧) هاتووە:
بەناوبانگ ترین شێخی نەقشبەندی سیانن: سەید ئەحمەدی خانەقا لەکەرکوك، شێخ حیسامەدین و شێخ عەلائەدین لە هەورامان.. پاشان دەڵێ: ئەم دوانەی هەورامان لایەنگریان لەئێران زۆرترە تا لەعێراق.)

(٤١) - بۆژیانی ئەم زاتە سودم لەشێخ عەلی کوڕی شێخ ئەحمەدو حاجی باوەمرادی موریدی وەرگرتووە
(٤٢) - یادی مەردان- ب- ٢- ،ل- ١٥٣.
(٤٣) - یادی مەردان- ب- ٢، ل- ١٥٩ ناوی هەندێك لەوزانایانە نوسراون.
(٤٤) - بنەماڵەی زانیاران -ل ٤٠٩.
(٤٥) - یادی مەردان ب- ٢، ل ١٦٠ ناوی هەندێك لەوکتێبانە نوسراون.
(٤٦) گەوهەری حەقیقەت- بەرگی یەکەم- موحسین موفتی.. ل ٢١٤.
(٤٧) یادی مەردان بەرگی (٢) ل ٢١٢- ٢٧٣ هەندێك لەنامەکانی تیایە.
(٤٨) یادی مەردان- بەرگی(٢) ل ١٥٤.
(٤٩) یادی مەردان- بەرگی (٢) ل ١٦٦ هەندێك لەشیعرەکانی بلاو کراونەتەوە. نامەو وەلامەکەی شێخ عومەرو مەلا عەبدوالله ی جەلی، لەبەڕێز م. نەبەز کەمالەوە دەستم کەتووە .. زۆر سوپاسی دەکەم.
(٥٠) - یادی مەردان- بەرگی (٢) ل ٢٨٥ هەروەها بنەماڵەی زانیاران ل (٤١٤)و گەوهەری حەقیقەت- بەرگی یەکەم- ل (٢١٤)
(٥١) گۆڤاری ڕۆشنبیری نویٚ ژ ١٤٥ ساڵی ٢٠٠٠، ل ٢٢.
(٥٢) - یادی مەردان ب ٢ ل ٢٨٧- ٣٠٧ شیعرو نامەکانی بەعەرەبیو فارسی هەن.
(٥٣) سەیری ئەم سەرچاوانە بکە یادی مەردان ب- ٢ ل ٣٠٨، بنەماڵەی زانیاران ل ٤١٦ هەروەها کوردستانی نویٚ ژمارە (٢٣٢٦، ٢٠٠٠/١٢/١١، ٢٣٣١، ٢٠٠١/١٢/١٧)، ڕۆشنبیری نویٚ ژ ١٤٥ ساڵی ٢٠٠٠. نامەکەمان لەبەڕێز شێرزادی کوڕی کوێخا حەمە سەلیمەوە دەست کەوتووە.. زۆر سوپاسی دەکەین.
(٥٤) بۆ زانیاری زیاتر سەیری - ڕۆژنامەی یەکگرتوو ژ ١٩٩٧/٧/٢٥/١٤٧، الاتحاد/٢٦٧، ١٩٩٨/٥/١٦، ٢٧٨، ١٩٩٨/٨/١.
(٥٥) - جگە لەهەرسیٚ کتێبی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس بەناوی (یادی مەردان- ب- ٢، بنەماڵەی زانیاران، علماؤنا في خدمة العلم و الدين) سودم وەرگرتووە، هەروەها لەمەقابەلەیەکی شێخ حەسەنی موفتی کەلە ساڵڕۆژی کۆچی شێخ عوسمان دا نوسیویەتی لە کوردستانی نویٚ بلاو کراوەتەوە لە ژ ١٥٤٧ بەرواری ١٩٩٨/٢/٢٠وهەندێکیتر سودم وەرگرتووە.
(٥٦) - لەبلاو کراوەیەکی مامۆستا مەلا حەمەئەمین کانیسانان- مودەڕیسی خانەقای بیارەدا ئەمەهەیە کەلە (١٤ی زیلحەجەی ساڵی (١٤١٧ك)دا بلاوی کردوەتەوە.
(٥٧) مێژووی ئەم ناودارە، جیاوازی هەیە لەکتێبەکان دا، بەلام ئێمە ئەمە بەڕاست دەزانین.

(٥٨) – یادی مەردان –ب– ١، ل– ٢٧٧ سەیربکە، لەمێژووی هەوراماندا، م. هەورامانی لە ل (١١٤٨)دا باسی عەبدوللەی کوڕی دەکات کەشاعیر بووەو ناوی (عەبدی)بووە.
(٥٩) سەرچاوە: بنەماڵەی زانیاران ل ٢٧٧، علماؤنا ص ٨١، کوردستانی‌نوێ ژ. ١٤٥٠بەرواری ١٩٩٨/٨/١٧ کەمقابەلەیەکی شێخ عەلی شێخ ئەحمەدە، هەروەها هەندێ کەسایەتی دەڤەرەکەش.
(٦٠) – دەگێڕنەوە: کەسوڵتان دانی ئێشاوە، ئەمیش دۆعایەکی بەسەردا دەخوێنێ‌و چاك دەبێتەوە، دوای (١٠) ڕۆژ شێخ ئەحمەد بانگ دەکات سوپاسی دەکات و دەڵێ حەزدەکەم داوای شتێکم لێبکەی پێت ببەخشم، ئەویش داوای ئەم مووە پیرۆزانەی لێدەکات و پیێ دەبەخشێ.
(٦١) – بۆئەم بنەماڵەیە جگە لەبنەماڵەی زانیاران سودم وەرگرتووە لەهەندێ لەئەندامانی بنەماڵەکە خۆیان وەك– حاجی سەید محەمەد، مامۆستا سەید عەبدوڕەحمان و مامۆستا سەید ڕەشاد. هەروەها هەندێ لەپیاوە بەتەمەنەکانی تەوێڵە سوودم وەرگرتووە.
(٦٢) – بنەماڵەی زانیاران– مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ل– ١٧٥.
(٦٣) – سەیری درەختی بنەماڵەکە بکە، شانزەهەم کەسە.
(٦٤) بۆ بەرواری کۆچی دوایی (سەید قوتبەدین)و (سەید فەتحولموبین) لەپەڕاوێزی کتێبی مامۆستا سەید ڕەشاددا نوسراوە.
(٦٥) یادی مەردان بەرگی دووهەم... ل ٢٣، ٢١.
(٦٦) – لەسەر قسەی حاجی سەید محەمەدی برای.
(٦٧) – سودم وەرگرتووە لەبنەماڵەی زانیاران ل (٤٢٧– ٤٢٩)وەپیر شالیاری زەردەشتی ل (٨٨)هەروەها سودێکی زۆرترم وەرگرتووە لەو درەختی بنەماڵەیەی کەمەلا عەبدولکەریمی مەلا ئەحمەدی قازی هەیەتی..

لێرەدا سێ تێبینی هەیە:

– لەبنەماڵەی زانیاران دا ناوی (عبدالمنعم)نیە بەڵام لەلای ئەودرەختەی سەرەوە باسمان کردهەیە. هەروەها لەدەمی حاجی سەید محەمەد بیستومە کەئەو کوڕەی هەبووە.

– لەبنەماڵەی زانیاران دا ناوی (عبد المبین) هەیە کەکوڕی مەلا نەزیر بووە کەچی لەپیرشالیاردا نیەو لەلای ئەو (درەختی بنەماڵەی) مەلاعەبدولکەریمی مەلا ئەحمەدیش نیە.

– هەروەها لەپیر شالیاری زەردەشتی‌دا دەڵێ (منعم و جلال )لە ساڵی (١٣٠٧)ك لەسەفەری حەج دا لە (بین الحرمین)لە دنیا دەردەچن.

(٦٨) - سودم وەرگرتووە لە:
کتێبی پیرشالیاری زەردەشتی- محەمەد بەهائەدین ل (٨٨- ٨٩)، بنەماڵەی زانیاران ل (٤٢٧- ٤٢٩) هەروەها لەمامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مەلا ئەحمەدی قازی. ئەوەی شایەنی باسە لەهەردوو سەرچاوەی (پیرشالیارو بنەماڵەی زانیاران)دا، مەلا نەزیر کوڕی کێیەو لەکوێوە باپیرەی هاتووە هەڵەی تیایە، لەسەر قسەی مەلاعەبدولکەریمی مەلا ئەحمەدی قازی.. ئەمەی کەئێمە نوسیومانە ڕاستی‌یەکەیەتی:
تێبینیەك: لەکتێبی- بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد- لەڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە دانراوی- محەمەد عەلی قەرەداغی- بەرگی (٣)چاپی یەکەم- ل (١٢) دەڵێت:
لەکتێبخانەی- دارصدام للمخطوطات- لەبەغدا- ژمارە- ٨٢. ١٧٠- کتێبێك هەیە بەناوی (غایة الاختصار) کتێبێکی فقهیە، عەبدولعەظیمی کوڕی مەلا مەحمودی سەروابادی لەگوندی تەوێڵە لەساڵی (١٢٦٣ك- ١٨٤٧ز) نووسیویەتیەوە. لێرەدا وا دەردەکەوێت کە:
١- ئەم (عەبدولعەظیم)ە مامی مەلا نەزیرە.
٢- ئەم بنەماڵە لەسەروابادەوە هاتوون نەك لە ئاوێهەنگەوە.
٣- خەتخۆشی و کتێبخانەی ئەم زانایانە دەردەکەوێت.
(٦٩) - خان ئەحمەد خان لەساڵی (١٠٠٢ك لەدایك بووە لەساڵی ١٠٢٥ ك چووەتە سەرتەخت لەساڵی ١٠٤٦ك بەرامبەر بە ١٦٣٦ز کۆچی دوایی کردووەو لەگۆڕستانی یونس پێغەمبەردا لەموصڵ نێژراوە.
(٧٠) - لەبنەماڵەی زانیاران- ل ٣٧٦- دا مەلامحەمەد سەرگەتی دەڵێ:
سێ‌خوشکم بووە شوویان کردووە بە شێخ محەمەد بەهائەدین و مەولەوی‌و مەلانەزیری تەوێڵەیی.
هەروەها لەگۆڤاری کاروان (ژ ٣٦ل ١٤٥)دا دەڵێ: ژنی مەلانەزیر تەوێڵەیی، ناوی فاتمەیە خوشکی محەمەد سەرگەتی‌یە، ئایا بەمەوە مەلانەزیر دووژنی بووە یائەمە سێ‌هەمیانە؟!
(٧١) - لەبنەماڵەی زانیاران (ل (٤٢٨) و علماؤنا في خدمة العلم والدين ص (٢٤٥- ٢٤٦) هەروەها لەپیاو ماقوڵانی تەوێڵەو کەسانی نزیکی مامۆستا وەك حاجی سەید عەبدوڕەحمان و حاجی عەبدوڕەحمانی حاجی محەمەدو مامۆستا دڵشادی کوڕەزای سودم وەرگرتووە.
(٧٢) - بۆ ژیانی ئەم ناودارە سودم وەرگرتووە لەبنەماڵەی زانیاران ل ٤٣٠- هەروەها مەلا حەمەئەمین مەلا عەبدوڵلاو مەلا عومەری مەلا صابرو کاك عەلی ئەحمەدی عەبدوڵلای کوڕەزای ناوبراو.

(۷۳) – مەلا حەمەئەمین کوڕی مەلا عەبدوڵڵای مەلا جەلیل و مەلا عەبدولکەریمی مەلائەحمەدی قازی دەڵێن: بنەماڵەی مەلاسەلام دەچنەوە سەر شێخ شەهابەدینی دزاوەری‌وە مەلا عەبدولکەریم دەڵێ: ئەم شێخ شەهابەدینە کوڕی شێخ ڕەزیەدینەو دەچێتەوە سەر شێخ حەسەنی شازلی..

(۷٤) – لەبنەماڵەی زانیاران دا ل ٤۳۱ مەلاعەبدە بەمەلا عەبدولباری هاتووە نەك مەلا عەبدوالله، هەرسێکی‌یان پێ وتووە.

(۷۵) – بۆسالی، تەمەنەکەی‌و لەدایك بوونی لەکاك عەلی ئەحمەدی کوڕەزای وەرم گرت.

(۷٦) – سود لەهەرسێ کوڕەزای– مەلاعەبدوالله (حافظ و عەبدوڕەحمان و طاهر)وەرگیراوە.

(۷۷) – مەلا کامیلی کوڕی حاجی مامۆستا دەڵێ: لەکۆڵەکەیەکی مزگەوتی باساکا نوسرابوو (مەلا عەبدولحەمیدی مەلا عەبدواللەو مەلا حەمەمین کەناسراوە بەحاجی مامۆستاو عەبدوڕەحیم مەحمود) لەساڵی (۱۳۱۷ك) لەدایك بوون.

(۷۸) – بۆئەم بنەماڵە سودم وەرگرتووە لە مەلاحەمە ئەمین و مەلا ئیسماعیل و مامۆستا مەحیەدین حاجی سەلیم.

دەڵێن: مەلا عەبدولخالق مەلا عەبدولمەجید باپیرەی مەزهەری خالقی گۆرانی بێژە– مامۆستا محەمەدی حاجی نادر وتی خۆم گوێم لە مەزهەر بووە لەڕادیۆی دەنگی ئەمریکا قسەی کردو خۆی وتی ئێمە ئەصڵ خەڵکی تەوێڵەین، هاتووینەتە ئێران دانیشتووین.

مامۆستا مەلا حەمەئەمین وتی بەڵێ ئێمە (مەلا عەبدولخالق)مان بووە چووە بۆ ئێران و لەوێ ماوەتەوە.

دەروێش لەتیف وتی: من خۆم باوکی مەزهەرم بینیووە هاتووەتە تەوێڵەو تەنانەت هاتبووداوای بەشی خۆی کرد.

(۷۹) یادی مەردان – ل (۲۷)

(۸۰) بەڕێز (م. ماجد عارف محەمەد)ئەم درەختی بنەماڵەیەی بۆهێناوم زۆرسوپاسی دەکەم.

(۸۱) – بۆژیانی سودم وەرگرتووە لەمانەی خوارەوە:
یەکەم درێری– لەیادی مەردان– مەلاعەبدولکەریم– ل (۲۱)، بۆشعرەکەی مەولەوی، لەدیوانەکەی مەولەوی– کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی مەلای عەبدولکەریم– ل (۳٦۷) ئەویتریشی لەم بەڕێزانە وەرم گرتووە: وەستا محەمەد وەستا حەمەصالح، هادی حاجی ئایزەی حەبیب، دەروێش لەتیفی وەستا محەمەد.

(۸۲) – بۆژیانی شێخ حەیدەر سودم لە (علماؤنا في خدمة العلم والدين ص (۱۸۰) وەرگرتووە.

(٨٣) - لە (علماؤنا)واهاتووە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێ لە (١١٦٥ك)لەدایك بوبێت و لە (١٣٥٣ك)مردبێت واتە تەمەنی (١٨٨)ساڵە، کەدوورە لەقەناعەتەوە.

(٨٤) - بۆژیانی مەلاعەبدوالله سودم وەرگرتووە لە گۆڤاری کاروانساڵی سێهەم ژمارە ٢٩، شباطی ١٩٨٥ نوسینێکی محەمەد عەلی قەرەداغی. هەروەها مقابەلەیەکی مەلامارفی کوڕی کەخۆم (عەبدولڕەزاق)کردوومە.

(٨٥) - سەیری بنەماڵەی زانیاران ل (٤٩٦- ٥٠٧)بکە دەربارەی ژیانی بنەماڵەی مەلا ئەبوبەکری موصەنیف..

لەبارەی ژیانی سەید حەسەنی چۆرییەوە دەڵێت:

**کوڕی سەید ئیبراهیمی کوڕە سەید عەبدوڕەحمانی کوڕی سەید ئیبراهیمی کوڕی سەید عەبدولغەفاری کوڕی سەید ئیبراهیمی کوڕی مەلاعەبدولکەریمی کوڕی مەلا ئەبوبەکری موصەنیفە لەنێوان ساڵانی (١٢٥٥ك- ١٣٢١ك. هەروەها باس لەوەدەکات و دەڵێ: لەسەر (ریاضیات و فەلەکیات و حیساب و شتیتر).. نوسراوو پەڕاوێزی زۆری لەسەر ئەو پەڕاوێزانەی لەسەر ئەم زانستانە نوسراون.**

(٨٦) - بۆژیان و بنەماڵەی مەلاصادقی تەوێڵە سودمان لەمانەی خوارەوە وەرگرتووە:

- زیندەگینامەی عەللامەی دەهر - حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشی - ل ٣٧ - یەحیا مەظهەری.
- یادی مەردان -ل (٣٦٣) - پێشەکی دیوانی مەولەوی.
- بنەماڵەی زانیاران -ل (١٩٣).
- چاوپێکەوتنێك لەگەڵ صەفیەخانی مەلاصادق، خێزانی حاجی مستەفای حاجی حەمەصاڵح.
- چاوپێکەوتنێك لەگەڵ خەدیجەخانی خێزانی مەلاسەلیم.
- نوسراوێکی دەستخەتی کاك بەهائەدین مەلاسەلیم کەوەڵامی چەند پرسیارێك بوون کەلێیکرابوون لەگەڵ کاك حسێنی برایدا وەڵامیان دابوویەوە.
- هەروەها چەند ناودارێکی تەوێڵە وەك: بەڕێزان محەمەی حاجی مەحەصاڵح، محەمەدی سان ئەحمەد، حاجی محەمەدی ڕەحمان، مەلاکامیلی حاجی مامۆستا، دەروێش لەتیفی وەستا محەمەد...تاد.

(٨٧) - بۆژیانی فەقێ عەلی سودم وەرگرتووەلە:

- وەستا صادق غەندی.
- حەلیمەی صۆفی حەمەکەریم خێزانی حاجی ئەحمەدی حاجی محەمەد.
- هەروەها بەقسەی دەورێش لەتیفی وەستا محەمەد ئەم فەقێ عەلیە نۆدشییەو هاتووە بۆ تەوێڵە دانیشتووە، چونکە موریدی شێخانی تەوێڵە بووە.

# خوێندەواری و زانست لە تەوێڵە

- خوێندنگاکانی بیارە و تەوێڵە ئەزهەرێکی بچوک بوون
- دەستخەتەکان
- تێڕامانێك
- خوێندن لە تەوێڵە پێش کردنەوەی قوتابخانە!
- قوتابخانەی تەوێڵە.. چۆن و کەی کرایەوە؟
- یادێکی مامۆستا گۆران
- ناوی قوتابیانی قوتابخانەی تەوێڵە لەشەش سالّی یەکەم دا.
- وکەلای موعەللمین
- لە بەڕێوە بەرەکانی قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان
- مەڵبەندی نەهێشتنی نەخوێندەواری
- قوتابخانەی سەرەتایی کچان
- قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵەی کوڕان
- ناوی یەکەم وەجبەی قوتابیانی قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵەی کوڕان
- بینای قوتابخانەکانی تەوێڵە
- کشانەوەی مەکتەب و دەزگاکانی میری لە تەوێڵەدا
- چەند زانیاری یەك لەسەر قوتابخانەکانی تەوێڵە
- ناوی ئەو تەوێڵەیی‌یانەی تاساڵی( ١٩٨١ ) بوونەتە مامۆستا
- ناوی خزمەت گوزارەکانی تەوێڵە تاساڵی( ١٩٨١ )
- ناوی مامۆستایانی سەرەتایی لەنێوان ساڵەکانی ( ١٩٩٢- ٢٠٠٣ )
- ناوی کارمەندانی ناوەندی لەساڵەکانی ( ١٩٩٢- ٢٠٠٣ )
- مامۆستا شێخ صەفائەدین
- مامۆستا ئیسماعیل
- مامۆستا هۆشمەن
- پەرتوکخانەی تەوێڵە
- پەراوێزەکان

# خوێندەواریو زانست لە تەوێڵە

لەسەربوردێکی هەورامان دا، ئاماژەمان بەخوێندن و نوسین کرد لەهەوراماندا، تەوێڵەش وەك ناوچەیەکی هەورامان بێبەش نەبووە لەوە. هەروەها وەك ناوچەکانی تری کوردستان خوێندن و زانست لە حوجرەی مزگەوت وخانەقاکانەوە سەری هەڵداوە.

**بیارە و تەوێڵە ئەزهەرێکی بچوك بوون:**

حوجرە و خانەقاکانی هەورامان بەگشتی، پەیوەندیەکی بەهێزیان هەبووە بەیەکەوە، بەتایبەت ئەوانەی بیارە و تەوێڵە، هەم لەبەر نزیکیان لەیەکەوە هەم لەبەر ئەوەی کەسەرپەرشتی کارەکان، یایەك بنەماڵە بوون، وەك بنەماڵەی شێخ عوسمان سراجەدین، یاخود مودەریسەکان خزمایەتیو هاورێیەتیەکیان، هەبووە بەیەکەو.. ئەمە بووەتە هۆی ئەوە کە لەباسکردنی حوجرەو خانەقای تەوێڵەدا دەبێت ئاماژەیەکیش بۆ بیارە بکرێت، سەرەڕای ئەوەش هەردووکیان کەخوێندنگای پەروەردەییو زانستی بوون، بەواتایەکیتر مەدرەسەی شەریعەتیو تەریقەتی بوون.

**مامۆستا جەمال بابان دەڵێ:**

(هەر لەزووەوە تەوێڵە و بیارە، مەڵبەندی زاست و ڕۆشنبیری بوون، لەگەڵ چەندەها ئاوایی تری کوردستان، کە ڕۆژ بەڕۆژ لە برەودا بوون.[1])

مامۆستا مەلا عەبدولکەریم، دەربارەی خوێندنگای بیارە کە شێخ عومەر ضیائەدین کوڕی شێخ عوسمان سراجەدینی تەوێڵەیی سەرپەرشتی کردوە، دەڵێ: بەکورتی خوێندگای بیارە دیمەنێکی بچکۆلەی (جامع الازهر)ی میصر بووە، لە کوردستانداو، شانی داوە لە شانی ئەو، لە بلاٌوکردنەوەی زانستیو لە خواترسیدا، بنکەیەکی تیشکدەر و ڕووناك کەرەوەی وڵات بووەو ئێستەیش هەرکەس لەم وڵاتەدا زانابێو خزمەتی دین بکا، بێگومان پەیوەندی- نزیك یادووری- بەو خوێندگاوە هەیە.[2] لە شوێنێکی تردا دەڵێ:

گەڵێ جار ژمارەی تەلەبە ئەگەیشتە هەشتا نەوەد کەس، کەیەك ئەکەوتن نزیکی پەنجا کەس لە تەلەبەی تێگەیشتوو، ئیجازەیان وەرگرت و بەم شێوە ئیرشادو دەرس وتنەوەو خزمەتی دین، چوو بەڕێوەو موسڵمانان، سودی زۆریان وەرگرت [3]

لەبارەی تەوێڵەشەوە دەڵێت:

خانەقای تەوێڵە هەمیشە پڕبووە لە پیاوی خاوەن دڵ و زانست و، کەسانی پۆح پەروەر، لەسەردەمی شێخ محەمەد بەهائەدین هەرگیز کەسانی پایەبەرزی وەك مەلاحامدی کاتب و مەولەویو حاجی مەلا ئەحمەدی نۆدشەییو مەلاعەلی تاڵشی و شێخ عەبدوڕەحمانی قەرەداغیو حاجی شێخ ئەمینی خاڵی لێنەبڕاوە.[٤]

ئەوەی شایەنی باسە:

ئەم خانەقایە، جگە لەوەی کە مەڵبەندێکی گەورەی زیکرو خواپەرستیو کۆڕی صۆفیان بووە، لە ولاشەوە ناوەندێکی بلاوکردنەوەی زانست و ئەدەب و هونەر بووە. ئەو هەموو خەلیفەو موریدانە زۆربەی زۆریان خوێندەواری باشیان بووە، هەر لەوێ لە پاڵ تەریقەتدا، شەریعەتیان خوێندووە. بۆ نمونە: لە کۆتایی چلەکاندا زانایەکی ناوچەکە (مەلا محەمەدی مەلابەهائەدین) ئیمام و مودەڕیسی خانەقای تەوێڵە دەبێت، فەقێیەکی زۆری لەدەوردا کۆدەبێتەوە و یەکێك لەو فەقێیانە، مامۆستا ئەحمەدی موفتی زادە، دەبێت.

بەم شێوە: خوێندگای تەوێڵە و بیارە لە خوێندگا بالاکانی کوردستان بوون و ڕۆڵێکی گرنگیان لەم بارەوە بینیووە، هەربۆیەش وەفاداران، دەڵێن: هەموومان قەرزار باری ئەو حوجرانەی بیارە و تەوێڵەین.[٥] چونکە ئەزهەرێکی بچوك بوون لەکوردستان دا.

**دەستخەتەکان:**

مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی، لەپەڕاوی بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد- لەڕێگەی دەسخەتەکانیانەوە-[٦]

باس لە (٢٤١) مەدرەسە دەکات کە ناویان هاتووەو، کەلە کوردستاندا بوون، هەروەها لە بارەی تەوێڵەوە، لە سەر ئەو دەستخەتەی کەخاوەنەکەی مامۆستایەکی نەناسراوە دەڵێ:

(... لایەنێکی دیکەی جێگەی بایەخ بێ لەم دەستخەتەدا ئەوەیە کە دەردەکەوێ، شارۆچکەی تەوێڵە، لە کۆندا- نزیکەی(٥٠٠) ساڵ لەمەویەر شارێکی گەورەو، جێگەیەکی دیارو، خوێندگای بالای کوردستان بووە، وەك لە مێژووی نووسینەوەی دەستخەتەکەوە کە (٩٨٣ك)یە بۆمان دەردەکەوێ. لەباسی دەسخەتەکەدا دەڵێ:

ئەم دەسخەتە لە (دار صدام للمخطوطات)دا بەژمارە (١٩٣٦٣) پارێزراوە، (٢٨٦) لاپەڕەیە، لاپەڕەی نزیکەی(١٧) دێڕی تێدایە، پێوانەکەی (١٤ *١٠)ە یە تێکڕا (١٤) کتێب و نامیلکە و پارچە شیعری تێدایە.[٧]

هەر لەم کتێبەدا ناوی(٤) مەدرەسە هاتووە بەم شێوەیە:[٨]

- مەدرەسەی گوندی تەوێڵە لە ساڵی (٩٨٣ك) لە تەوێڵەدا بووە ژمارەکەی لە (دار صدام للمخطوطات(١٩٣٦٣)یە.
- مەدرەسەی گوندی تەوێڵە لە ساڵی(١١٠٧ك) ژمارەکەی لە( دارصدام للمخطوطات) (١٢٧٠٢)ە
- مەدرەسەی گوندی تەوێڵە لە ساڵی(١٢٩٠ك) ژمارەکەی لە (دارصدام للمطوطات)( ١٦٦٥٣).
- مەدرەسەی باساکی لە تەوێڵە لە ساڵی(١٣١٤ك) ژمارەکەی لە (دارصدام للمخطوطات) (٢١١٩٤)[٩]
- هەروەها لە گەڵ شوێنی تر باسی ئەو دەستخەت و مەدرەسانەی دەکات ئێمەش لەم پەڕاوەدا لە چەند شوێنێکی تردا ئاماژەمان بە هەندێکیان کردوە.

**تێڕامانێك:**

سەرەڕای ئەمەی کە وتمان، گەر تێڕامانێك بکەین دەتوانین بڵێین:

- لە گەڵ زۆری خوێندگاو حوجرەکانی تەوێڵەدا، مێژوویەکی کۆنیشیان هەیە.
- وەك چۆن مەڵبەندێك بووە، وەستای کارامە و لێهاتوی پیشەیی بەناوبانگی تیا کۆبوەتەوە، هەروەها مەڵبەندێکی زانست و ڕۆشنبیریش بووە، بۆیە:

باپیرە گەورەی شێخ عوسمان سراجەدین لەچیای حەمرینەوە و بنەماڵەی مەلا نەزیر لە دەوروبەری سنەوەو فەقێ ئەحمەدی غەزایی لە بەغداوە و سەید قوطبەدین لە کەلجی‌یەوەو مەلاحامدی کاتب لە بێسارانەوە و مەلا عەبدوللەی مەریوانی لە مەریوانەوەو... هتد. دێنە تەوێڵە و تیایدا نیشتەجێ دەبن، پێش هاتنی ئەمان هەر خۆی ناوەندێکی زانست بووە و خەڵکەکەشی ئامادەیی هەبووە بۆ وەرگرتنی زانست.

- هەروەها.. کردنەوەی قوتابخانە، لەسەردەمی دەوڵەتی مەلیکیدا پێش زۆرێك لە شارو شارۆچکەو گوندەکانی پارێزگای سلێمانی کەوتووە، ئەمەش بۆ خۆی شتێکە.

- کاتێك کە قوتابخانەی تەوێڵە بۆ یەکەم جار دەکرێتەوە مامۆستا گۆران لیژنەیەك پێك دەهێنێ لەو مامۆستایانەی کەلە مزگەوتەکاندا وانەیان وتووە بە منالآن- کەهەندێك لە قوتابیەکان کەئاستی خوێندنیان بەرزتر بووە لە پۆلی یەك خرانە پۆلی دووەمەوە. ئەمانە هەمووی دەری دەخەن کە:

تەوێڵە لەزووەوە ناوەندێکی خوێندەواریو زانست بووە، خۆی مێژوویەکی لەم بارەوە دروست کردووە و هەیەتی.

**خوێندن لە تەوێڵە پێش کردنەوی قوتابخانە:**

(خیرکم من تعلم القران وعلمه)

لەروانگەی ئەم فەرموودەوە، لە تەوێڵەدا چەند مامۆستایەك - لەپیاوان و لە ئافرەتان- هەبوون، گرنگیان داوەتە منالآن و وانەی قورئانیان پێ وتونەتەوە، منالآنیان فێری نوسین وخوێندنەوەیان کردوون.

ئەمەش پێش ئەوەی قوتابخانە بکرێتەوە لە تەوێڵە و دوای کردنەوەیشی هەر گرنگیان پێ داون. قوتابیش بووە لە هەردوکی خوێندویەتی. لەومامۆستایانەی کەلە حوجرەو خوێندگاکان، وەك مەلایەك، فەقێ بووەو خزمەتی کردوە، زۆر بوون و لە ژیاننامەکەیان دا زۆریان ئاماژەمان پێ کردوون هەندێکی تریشیان کە گرنگیان زۆر داوە بەم بوارە، کە بریتی بوون لەمانەی خوارەوەن:

- مامۆستا(مەلا محەمەد کوڕی مەلا حامد، مەلا عەبدلئەحەد، مەلا عەبدوڵڵەی مالێدەر، مەلاعەبدوالحەمید، مەلا ئەحمەدی قازی، مەلاعەبدوڵڵەی مەلاجەلیل، مەلاحەبیبەڵڵە، مەلاحافظ، باباحاجی، سەیدتەها، مەلا عەبدوڕەحمانی مەلا عەبدوڵڵە، مەلاجەمیل مەلاعەبدولئەحەد، مەلاسەید عەبدوڕەحمان و مەلاسەید ڕەشاد..تاد) (١٠)

ئەوەی شایانی باس بێت ئافرەتی تەوێڵە زۆریان خوێندەواریان بووە. زۆریشیان کچانیان فێری قورئان خوێند کردووە، لەو ئافرەتانە:

١- خاتوو عومەرێ کچی شێخ سراجەدین، خێزانی سەیدحەمەئەمین، دایکی سەیفەتحە. کەلەزۆر شوێن موریدو مەنسوبی بووە بە تایبەت لە نۆدشە.

٢- خاتوو عائیشە کچی شێخ سراجەدین، خێزانی مەلانەزیری گەورە.
٣- خاتوو زارا کچی حاجی مەحیەدین، کچەزای شێخ سراجەدین، خێزانی مەلا صەلاحەدین کوڕی مەلا غیاثەدین.
٤- خاتوو ئاسمای کچی شێخ عەلی سەرگەت کە زاوای شێخ سراجەدین بووەو خێزانی (عەبدولمەتین) بووە، کە دووکوڕی لێ بووە پاشان شووی کردووە بە(مەلاموعینە دین).
٥- خاتوو ڕەعنا کچی سەیفەتحە، خێزانی مەلانظام.
٦- خاتوو سەلما کچی مەلاعەبدە، خێزانی مەلاعەبدوالله‌ی مەلاجەلیل.
٧- خاتوو خەدیجەی کچی مەلاعەبدوالله‌ی مەلاجەلیل، خێزانی حاجی سەلیم.[11]
٨- خاتوو ئامینەی کچی مەلاعەبدوالله‌ی مەلاجەلیل، خێزانی مەلا حەسەن.
٩- خاتوو فاطمەی کچی مەلاعەبدوالله‌ی مەلاجەلیل، خێزانی مەلاعەبدەی مەلاعەبدولحەمید.
١٠- خاتوو لەیلێ کچی ڕەحمان ئیبراهیم، خێزانی وەستا عەلی دایکی وەستا عەبدولعەزیز پاشان شووی کرد بەمەلا حەبیبوالله وە بوو بەخەلیفەی شێخ حیسامەدین. نزیەی ٤٠ قوتابی کورو کچی بووە.
١١- خاتوو عائیشە کچی عەبدوڕەحمان محەمەد ئەمین کە خێزانی مەلاحەمە عارف بووە دایکی مەلاکامل.
١٢- خاتوو ڕابیعە کچی عەبدوڕەحمان محەمەد ئەمین، خێزانی مەلامحەمەد مەلابەهائەدین- دایکی مامۆستا صەلاحەدین.
١٣- خاتوو عائیشەی کاکە شێخ ژنی حەمەسەعید شێخ ڕەشید عەبابەیلێ.
١٤- خاتووڕەحمەی کچی مەلاحەبیبەالله خێزانی مەلاعەبدولئەحەد.
١٥- خاتووشەمسەی الله‌وەیس خێزانی حاجی سەیدمحەمەد.
١٦- خاتوو خدیجەی کچی حەکیم، خێزانی مەهدی حاجی ئایزە.
١٧- خاتوو سوراحی عەلی محەمەد نەصروالله خێزانی نادر خاڵخاس، دایکی م. حەمەڕەشید.
١٨- خاتوو حەفصە نەجیبە فەندی، خێزانی سەعید میرزا عەبدولقادر.

زۆرێکی تریش... [١٢]

کەوابوو: پێش ئەوەی قوتابخانە لە تەوێڵە بکرێتەوە:

١- مزگەوتی گەورە و باساکاو خانەقا و قاپی شێخ، حوجرە و خوێندگابوون.

٢- کۆمەڵێك زانا و مامۆستا لە پیاو و لە ژن، جگەلە حوجرەکان، ماڵەکانیان کردووەتە خوێندگا بۆمنالاَن.

٣- دایکان و خوشکان شان بەشانی باوکان و برایان، گرنگییان داوە بەخوێندن وخوێندەواری، ئەوەتا ئەوەندە ئافرەتی مامۆستا بوون کومسایی خوێندنی کچانیان کردوە.

٤- کۆمەڵێك منالَ بوون کە قورئان و هەندێك کتێبی فارسیان خوێندووە، کەبۆ یەکەم جار قوتابخانە دانراوە، ئامادەیییان هەبووە لەسەرووی پۆلی یەکەوە دابنرێن وەداش نراون.

**قوتابخانەی تەوێڵە.. چۆن و کەی کرایەوە؟!**

لەبەر ئەوەی تەوێڵە ناوبانگێکی هەبوو، بەبۆنەی ئەو حوجرەو مزگەوت وخانەقایانەوە، جگە لەوەش خەڵکەکەی ئامادەیییان هەبوو، بۆ وەرگرتنی زانست، وەژمارەی دانیشتوانیشی زۆربوو... بۆیە لە ساڵی (١٩٢٨)دا بەهەوڵ و تێکۆشانی خەڵکەکەو شێخ حیسامەدین و بەتایبەت فەرمانڕەوای ئەوکاتەی تەوێڵە -قادربەگ- قوتابخانە لە تەوێڵە دەکرێتەوە.

ئالێرەدا هەقی خۆیەتی کەهەوڵ تێکۆشانی قادربەگ بخەینە ڕوو کەڕۆڵی سەرەکی بینیوە لەکردنەوەی ئەم قوتابخانەدا.

١- چەندجار پەیوەندی کردووە بەحامیدبەگەوە کەلەو کاتەدا قائیمقامی هەڵەبجە بووە، تاوەکو لە ساڵی(١٩٢٨) قوتابخانەیەك دەردەچێت بۆ لیوای سلێمانی، جابەهەوڵی ئەم دوانەو هۆیەکانی تر کەباسمان کردن قوتابخانە لە تەوێڵە دەکرێتەوە. لەلیوای سلێمانی، دوای سلێمانیو هەڵەبجە دەبێتە سێهەم قوتابخانە.[١٣]

ئەو کاتە (مستەفا مەزهەر) بەڕێوە بەری مەعاریف بووەو لە کەرکوك دانیشتووە، خۆی هاتووە بۆ کردنەوەکەی.[١٤]

٢- بینای قوتابخانەکە، هی قادربەگ خۆی بووە، بەخشیویەتیو کراوە بەقوتابخانە.

٣- قادربەگ هەوڵی داوە مامۆستایەکی چاك و باش و زیرەك بهێنێت کە ئەویش مامۆستا عەبدوللابەگی سلێمان بەگ ناسراو بە- گۆرانی شاعیر- بووە. کەلەو کاتەدا مامۆستا بووە لە هەڵەبجەو دەگوازرێتەوە بۆ تەوێڵە.

٤- قادربەگ لە دیواخانەکەی خۆیدا خزمەتێکی زۆری مامۆستا گۆرانی کردووەو پێداویستی بۆ دابین کردووە.

٥- قادربەگ چونکە نرخی زانست وخوێندەواری زانیووە، لەپێش هەموو کەسێکدا منداڵەکانی خۆیو کەس و کاری ناردوە بۆ قوتابخانە، تاوەکو بەشێوەیەکی عەمەلی هانی منداڵانی تر بدات کەبچن بۆ قوتابخانە. هەروەها کاتێکیش قوتابخانەی کچانیش دەکرێتەوە کچەکانی خۆیو براکەی، لەپێشەوە دەنێرێ.[١٥]

٦- قادربەگ خۆی زۆر سەردانی قوتابخانەکەی کردووە بۆ پاك وخاوێنی قوتابخانەکەو قوتابی، پرسیویەتیەوە بۆ کەم و کوڕیو پێداویستیەکانی.

٧- هەموو ئێوارەیەکیپێنج شەممە لەدوای دەوام لەگەڵ مامۆستا گۆران دا قوتابییەکانیان ڕاهێناوە لەسەر چەك و بەکارهێنانی.

**یادێکی مامۆستا گۆران**[١٦]

ناوی عەبدوللابەگی کوڕی سلێمان بەگی کوڕی عەبدوللابەگە، لەبەگزادەکانی میران بەگی ناوچەی مەریوانە. عەبدوللا بەگی باپیری ڕوو دەکاتە هەڵەبجەو تیایدا نیشتەجێ دەبێ. لە ساڵی(١٩٠٤) لەهەڵەبجە لەدایك دەبێ، سەرەتا لای باوکی دەست دەکات بەقورئان خوێندن وپاشان لە مزگەوتی پاشای هەڵەبجە بووە بە فەقێ.. دوایی دەچێتە قوتابخانەی سەرەتایی لە هەڵەبجەو تاپۆلی چوار تەواو دەکات پاشان دەچێتە قوتابخانەی عیلمیەی کەرکوك. لەساڵی(١٩١٩)دا بەبۆنەی ئەو بارودۆخەی کەروو دەدات بەهۆی ئینگلیزەوە هەڵەبجە چۆڵ دەکرێت و ڕوو دەکەنە هەورامان، ماڵی باوکی گۆرانیش لەبەهاری ئەو ساڵەوە تاپایز ڕوو دەکەنە چەمی بیارە و لەوێ لە باخێکدا هەوار دەخەن.

- گۆران بۆ یەکەم جار لەساڵی(١٩٢٥)دا بە مامۆستایی لە هەڵەبجە دامەزراوەو لە ساڵی(١٩٢٨) گوازراوەتەوە بۆ تەوێڵە. ماوەیەك گوازراوەتەوە بۆ دائیرەی ئەشغاڵ و چەند جارێکیش گیراوە لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە و زیندانی کراوە.

- سەردانی زۆر وڵاتی کردووە وەك سۆڤیەت، چین، کۆریا، لوبنان،..

- سەرپەرشتیو بەشداری زۆر گۆڤار و ڕۆژنامەی کردووەو، ئەندامی دەستەی نوسەرانی ڕۆژنامەی ئازادی بووە.

- لە (١٩٦٢/١١/١٨) بە نەخۆشی شێرپەنجە کۆچی دوایی دەکات.

مامۆستا گۆران لەلایەن خەڵکی تەوێڵەوە ڕێزێکی زۆری لێگیراوەو جوانیو ڕەنگینیی سروشتی ناوچەکەش کاریگەری زۆری لەسەر بووە، گەشتی هەورامانیش هەرچەندە دواتر نوسیویەتی، بەلاّم هەرئەم مانەوەی لە تەوێڵەدا وێناکەی لەمێشکدا بۆنەخشاندووە.. لەسروشتی تەوێڵەدا ئاماژەمان بۆ کردووە. مامۆستا لەسەر زمانی زارۆکانی تەوێڵە ئەم چەند دێڕە شیعرەی بە هەورامی بۆ نووسیون.

زارڕۆڵەو مەعصوم بی گوناهینمی ئیسلام زادینمی ئیسلام خواهینمی

عەزمما جەزما پەی وەنەو عیرفان عیرفانا، وەحشی کەرو بەئینسان

ساخوا تەوفیق، تەوفیق هەرجەتۆن تەوفیقما بدەی پەی وەنەو عیرفان(١٧)

وەك دەگێڕنەوە:

یەکەم ساڵ دراسەی قوتابیەکان بە فارسیو عەرەبی بووەو بەرەبەرە مامۆستا گۆران قوتابیەکانی فێری کوردی کردوون.

## ناوی قوتابیانی قوتابخانەی تەوێڵە لەشەش ساڵی یەکەم دا (١٨)

| ز | ناوی قوتابی | لەدایك بوون | بەرواری وەرگرتنی | لە چ پۆلێك دانراوە | ئەنجام | چی بەسەر هاتوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | مجید غفار بەگ | ١٩٢٣ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | یەکەم | ناجح | | لە ژمارە (١) وە تا ژمارە (١٨) یەکەم ساڵ ڕۆیشتون بۆ قوتابخانە لە پۆلی یەکدا دەوامیان کردووە. |
| ٢ | سەعدیبەگ عبدالقادربەگ | ١٩٢٣ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | یەکەم | ناجح | | |
| ٣ | سعید محمد ڕشیدئاغا | ١٩٢٠ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | یەکەم | ناجح | ٢٠٠٠/١٢/٥ مردووە | |
| ٤ | محمد حاجی عبدالله | ١٩٢٠ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | یەکەم | ناجح | | |
| ٥ | عبدالرحمان عزیز | ١٩٢٢ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | یەکەم | ڕاسب | | |
| ٦ | عزت عبداللەبەگ مەحمود خان دزڵی | ١٩٢٤ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | یەکەم | ڕاسب | | |
| ٧ | مهدی عزیز حبیب | ١٩٢١ | | | ناجح | | |
| ٨ | فاتح غەفاربەگ | ١٩٢٤ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | یەکەم | ڕاسب | ١٩٧٤ مردووە | |
| ٩ | عزت حمە سعید | ١٩٢٣ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | یەکەم | ڕاسب | ٩٢/٨/١٢ | |
| ١٠ | باباعەلی مەلاعبداللەی مەریوانی | ١٩٢٢ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | یەکەم | ناجح | بەمناڵی مردوە | |
| ١١ | جمال وەستا سعید | ١٩٢٢ | ١٩٢٨/١٠/١٥ | یەکەم | ناجح | | |
| ١٢ | محمد ڕؤوف خواجە هومر | ١٩١٩ | ١٩٢٨/١٠/١٥ | یەکەم | ناجح | ٩٥/٥/٢٥ مردووە | |
| ١٣ | حمە غریب خواجە هومر | ١٩٢٣ | ١٩٢٨/١٠/١٥ | یەکەم | ڕاسب | | |

| ز | ناوی قوتابی | لەدایک بوون | بەرواری وەرگرتنی | لە چ پۆلێک دانراوە | ئەنجام | چی بەسەر هاتوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٤ | ئەنوەر مەحمود محمود | ١٩٢٢ | ١٩٢٨/١٠/١٥ | یەکەم | – | | |
| ١٥ | محمد سعید محمد کریم | ١٩٢٠ | ١٩٢٨/١٠/١٦ | یەکەم | تـەرکی کردوە | | |
| ١٦ | صابر حمە یوسف | ١٩٢٤ | ١٩٢٨/١٠/١٦ | یەکەم | غائب | | |
| ١٧ | عثمان کەیخەسرەو | ١٩٢٢ | ١٩٢٨/١٠/١٦ | یەکەم | ڕاسب | | |
| ١٨ | نافع عزیز حبیب | ١٩٢٣ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | یەکەم | ڕاسب | | |

| ز | ناوی قوتابی | لەدایک بوون | بەرواری وەرگرتنی | لە چ پۆلێک دانراوە | ئەنجام | چی بەسەر هاتوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٩ | حسن محمد سلیم | ١٩١٨ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | غائب | ٧٧/٥/٢ مردووە | لە ناوی ژمارە (١٩)ەوە تا ناوی ژمارە (٣١)یەکەم ساڵ کە چوون بۆ قوتابخانە لە پۆلی دووەم دا دانراون |
| ٢٠ | کریم خواجە احمد | ١٩٢١ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | ڕاسب | ٨٩/٧/١٨ مردووە | |
| ٢١ | کریم محمد سعید | ١٩٢٠ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | ڕاسب | | |
| ٢٢ | ڕوؤف حمەباقی(عبدلباقی) | ١٩١٩ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | ناجح | | |
| ٢٣ | عبداللە عەلی (علیان) | ١٩١٨ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | ڕاسب | | |
| ٢٤ | محمد حاجی محمد رحیم | ١٩١٨ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | ناجح | | |
| ٢٥ | محمد سعید مەلا عبداللە | ١٩١٨ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | ناجح- یەکەم ١٥٤ی هێناوە لە ١٦٠ | | |
| ٢٦ | حمە کرم حاجی عبدالوهاب | ١٩٢٠ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | ناجح | | |
| ٢٧ | مصطفی فتاح | ١٩١٩ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | ناجح | ٨٨/٣/١٦ مردووە | |
| ٢٨ | محمد سان احمد | ١٩١٩ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | ناجح | لەسلێمانیەو ماوە | |
| ٢٩ | ڕوؤف محمد امین | ١٩١٧ | ١٩٢٨/١٠/١٤ | دووەم | غائب | | |
| ٣٠ | محمد وەستا محمد صاڵح | ١٩١٨ | ١٩٢٨/١٠/١ | دووەم | غائب | لەسلێمانیەو ماوە | |
| ٣١ | طاهر سان احمد | ١٩٢١ | ١٩٢٨/١٠/١٦ | دووەم | ناجح | ٩٧/٤/٢٨ مردووە | |

| ز | ناوی قوتابی | لەدایک بوون | بەرواری وەرگرتنی | لە چ پۆلێک دانراوە | ئەنجام | چی بەسەر هاتوە | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣٢ | محمد امین کاکە شێخ | ١٩١٧ | ١٩٢٩ | دووەم | ناجح | | لە (٣٢)وەوە تا (٣٦)ساڵی دووەم چونەتە قوتابخانە دووانیان لەیەک دانراون سیانیشیان دەبرێنە پۆلی دووەم چونکە ئاستیان بووە |
| ٣٣ | صفاءالدین کاکە شێخ | ١٩١٨ | ١٩٢٩ | دووەم | ناجح | | |
| ٣٤ | ڕؤوف شێخ مظهر | ١٩١٦ | ١٩٢٩ | دووەم | ناجح | لەهەڵەبجەیە | |
| ٣٥ | محمود کاکە شێخ | ١٩٢٠ | ١٩٢٩ | یەکەم | ناجح | لەسلێمانیە | |
| ٣٦ | عـــزت خواجـــە احمـــد اسحاق | ١٩١٦ | ١٩٢٩ | یەکەم | ناجح | ٨١/١/٣٠ مردووە | |

| ٣٧ | کریم شێخ مظهر | ١٩١٩ | ١٩٣٠ | یەکەم | ناجح | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٣٨ | نادر عبدالعزیز | ١٩١٨ | ١٩٣٠ | یەکەم | ناجح | | |
| ٣٩ | احمد عزیز | ١٩١٨ | ١٩٣٠ | یەکەم | - - | | له سالی سێهەمی قوتابخانە، ئەمانە تازە هاتوون خۆیان تۆمار کردووە |
| ٤٠ | محمود وەستا محمد | ١٩٢٢ | ١٩٣٠ | یەکەم | شەهادەی شەشی هێناوە | له مەڵەبجەیە | |
| ٤١ | عەلی مەلا عابد | ١٩٢٢ | ١٩٣٠ | یەکەم | - - | | |

| ٤٢ | محمد مەلا عبدالواحد | ١٩١٩ | ١٩٣١ | یەکەم | ڕاسب | | لە چوارەم ساڵی قوتابخانەدا لە ناوی ژ(٤٢)ەوە تا ناوی ژمارە (٦٦) وەر گیراوە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٤٣ | محمد عەلی کوێخا احمد خەڵکی ئێران | ١٩١٨ | ١٩٣١ | دووەم | - - | نقلْ بوو | |
| ٤٤ | مصطفی شێخ مظهر | ١٩٢٢ | ١٩٣١ | یەکەم | ڕاسب | | |
| ٤٥ | حسن محمد (حمە هەیتەم) | ١٩٢٣ | ١٩٣١ | یەکەم | ڕاسب | | |
| ٤٦ | محمد حسن محمد امین | ١٩٢٠ | ١٩٣١ | یەکەم | ناجح | ٩٩/٩/١٦ مردووە | |
| ٤٧ | عەبدوالله غەفاربەگ | ١٩٢٥ | ١٩٣١ | یەکەم | ڕاسب | ماوە | |
| ٤٨ | عارف مەلامحمد امین | ١٩٢٥ | ١٩٣١ | یەکەم | ڕاسب | ماوە | |
| ٤٩ | عبدالرحمان وەستا جعفر | ١٩٢٠ | ١٩٣١ | یەکەم | ناجح | ٩٨/١/٤ مردووە | |
| ٥٠ | مصطفی حاجی فرج حمە حسین | ١٩٢٥ | ١٩٣١ | یەکەم | ڕاسب | ٩٨/٢/٤ | |
| ٥١ | سەید کریم سەید محمد | ١٩٢٣ | ١٩٣١ | یەکەم | ناجح | | |
| ٥٢ | سعید میرزا عبالقادر | ١٩٢٥ | ١٩٣١ | یەکەم | - - | | |
| ٥٣ | نصرالله کیکاوس | ١٩٢٥ | ١٩٣١ | یەکەم | - - | ٨٠/٢/٤ لەتەوێڵە مردووە | |
| ٥٤ | ڕەضا یار احمد | ١٩٢٥ | ١٩٣١ | یەکەم | - - | له تەوێڵە | |
| ٥٥ | قادر محمد بەگ | ١٩٢٥ | ١٩٣١ | یەکەم | - - | | |
| ٥٦ | هادی عزیز حبیب | ١٩٢٤ | ١٩٣١ | یەکەم | - - | ماوە له تەوێڵەیە | |
| ٥٧ | نجم الدین فتاح | ١٩٢٤ | ١٩٣١ | یەکەم | - - | ٠١/٢/٢٧ مردووە | |
| ٥٨ | فاضل میرزا حەمە صالح | ١٩٢٥ | ١٩٣١ | یەکەم | - - | ٩٨/٢/١ | |
| ٥٩ | عارف محمد سلێمان | ١٩٢٤ | ١٩٣١ | یەکەم | - - | له پاوەیە | |
| ٦٠ | عەلی محمد حسین | ١٩٢٤ | ١٩٣١ | یەکەم | - - | | |
| ٦١ | طاهر حبیب الله | ١٩٢٥ | ١٩٣١ | یەکەم | - - | ٩٥/١٢/٣١ مردووە | |
| ٦٢ | جمیل عبدالاحد | ١٩٢٥ | ١٩٣١ | یەکەم | شەهادەی شەشی هێناوە | له سلێمانیە | |

| ٦٣ | فائق محمود مارف | ١٩٢٣ | ١٩٣١ | یەکەم | -- | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦٤ | عبدالحکیم سەید احمد | ١٩٢٠ | ١٩٣١ | یەکەم | -- | ٩٧/١/١٥ مردووە | |
| ٦٥ | محمد صالح وەیس | ١٩٢٣ | ١٩٣١/١٠/١ | یەکەم | -- | | |
| ٦٦ | محمد حمە ڕەحیم | ١٩٢٣ | ١٩٣١/١٠/١ | یەکەم | | | |

| ٦٧ | دەروێش مەلا احمد | ١٩٢٠ | ١٩٣٢/١٠/١ | یەکەم | -- | سالی پێنجەم | سلێمانەیی/باوکی قولچی بووە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦٨ | عبدالله کاکە حمە | ١٩٢٧ | ١٩٣٢/١٠/١ | یەکەم | -- | | سلێمانەیی/باوکی پۆلیس بووە |
| ٦٩ | محمد صالح عبدە | ١٩٢٤ | ١٩٣٣/٩/٢٩ | یەکەم | شەهادەی شەشی هێناوە | ٩١/١٢/٢٧ مردووە | لەژمارە ٦٧ تا کۆتایی سالی شەشەم وەرگیراون |
| ٠ | عەلی وەستا حمە امین | ١٩٢٥ | ١٩٣٣/٩/٢٩ | یەکەم | -- | ٩٩/١/٥ لەپاوە مردوە | |
| ٧١ | مصطفی نجیب افندی | ١٩٢٦ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | -- | | |
| ٧٢ | حمە کریم حاجی حمە امین | ١٩٢٥ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | -- | /٢/٢٥ ١٩٩٤ | |
| ٧٣ | حسین صوفی حسن اللەکرم | ١٩٢٤ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | -- | | |
| ٧٤ | عبدالله حاجی محمد | ١٩٢٢ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | | | |
| ٧٥ | عبدالعزیز سیدعمر بەرزنجی | ١٩٢٠ | ١٩٣٣/١٠/١٢ | چوارەم | لە سلێمانیەوە نقلبوە | باوکی مدیری قوتابخانەی تەوێڵە بووە | |
| ٧٦ | اللەکرم حاجی توفیق | ١٩٢٢ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | -- | لەسلێمانیە | |
| ٧٧ | عەلی نجیب افندی | ١٩٢٣ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | -- | | |
| ٧٨ | عبدالرحمن فتح الله ڕوستم | ١٩٢٤ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | -- | | چایچی |
| ٧٩ | محمد عوض | ١٩٢٢ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | -- | | |
| ٨٠ | محمد حاجی نادر | ١٩٢٤ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | دەرچوە بۆ یەکی ناوەندی | | |
| ٨١ | نصرالدین حمە سعید قادر | ١٩٢٤ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | -- | | |
| ٨٢ | محمد حاجی عبدالله | ١٩٢١ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | -- | | |
| ٨٣ | حمە شریف خواجە حسین | ١٩٢٥ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | | لەمەریوانە | |
| ٨٤ | محمد حمە سلیم | ١٩٢١ | ١٩٣٣/١٠/١ | یەکەم | -- | | |
| ٨٥ | حامد وەستا عزیز | ١٩٢٤ | ١٩٣٣/١١/١٣ | یەکەم | | | |

**وکەلای موعەللمین:**

وەکیل موعەلیم:

بەو مامۆستایە وتـراوە، کەباوەڕنامـەی خوێنـدنی تـەواوکردنی نـەبووە، بـەکریۆ بەدەمـەکی وەك(موحـاضـر) نـەك بـەڕەسمی وانـەیان وتووەتـەوە. هەندێکیش بوون وەك خزمەت گوزار تەعین بوون، بەڵام وەك وەکیل موعلیم ڕۆڵی بینیـووە. لـەم جۆرە وەك: محەمـەد مـەعروف عەبدوالله ناسـراو بـە مـەلامارفی مەلاعەبدواللەی مەریوانی و مامۆستا مەلاعەبدلئەحەد.

مامۆستا مارف خۆی دەڵێ:

کاتێك گۆران لە تەوێڵە مامۆستابوو، منیش دەچووم، هاوکاریم دەکردو، وانـەی عـەرەبیم دەوتـەوە بـە قوتابیـان. هـەروەها دوای دەوام مامۆسـتا گـۆران- حیسابی بەمن دەوت و منیش فارسیم بەئەو دەوت.

لەساڵی (١٩٣٢)ش تـەعین بـووم ئەوکاتـە شـێخ عومـەر عیرفـان بـەرزنجی بەڕێوەبەر بوو، هادی عەلی ڕەضای کەرکوکیش مامۆستا بـوو. ئەمەش یەك ساڵ بوو وازم لێ هێناو هاتمە سلێمانی... معاشی ئەو کاتەشم یەك دینار بوو.

مام(هادی حاجی عەزین) دەڵێ:

مـەلامارف بەخزمـەتگوزار تـەعین بـوو مـانگی بەیـەك دینـار بـەڵام دەوری مامۆستای دەبینی. دوای ئەم مەلاعەبدولئەحەد ئاوا تەعین بوو، بەڵام خۆی وەك مامۆستایەك بوو ئیشەکەی (ئەحمەد ئیبراهیم) دەیکرد زۆری نەخایاند(ئەحمەد) خۆی بە(فەڕاش) تـەعین بـوو،( صـاڵح مستـەفا- ناسـراو بـە صـاڵح قەیتـە) بە پاسـەوانی قوتابخانەکـە تـەعین کـرا، دواتـریش حەمـە حەسـەن خاتوونـەش بە(فەڕاش) دامەزرا.

لـەکۆتایی پەنجاکانـدا چـەند وکـەلا موعـەلمێکی تـریش تـەعین بـوون لەقوتابخانەی تەوێڵە وەك:

( محەمەد حەمەڕەحیم، جەمیل عەبدولئەحەد، ئیسماعیل صدیق، تۆفیق ئەبوبـەکر، حەمەخـەریب حەمەڕەشـید، محەمـەد بەهائـەدین صـاحب، کامـل حەمـەعارف) لـەدواییدا: دوانەکـەی ئـەخیر چـوونە دەورەوەو بـە ڕەسمـی تـەعین کران، بەڵام ئەوانی تر هەریەکەیان لەدائیرەیەك تەعین کران.

**لە بەڕێوەبەرەکانی قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان:**

قوتابخانەیەك مێژووەکەی بگەڕێتەوە بۆ ساڵی(١٩٢٨)، دەبێت چەندەها مامۆستای بەڕێزی بەڕێ کردبێت.. جالەو مامۆستایانەش کەبوونەتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان ئەمانەی خوارەوە بوون:

- عەبدوالله سلێمان- گۆران- (١٩٢٨- ١٩٢٩)
- ئەحمەد فەخری- سلێمانەیی (١٩٣٠- ١٩٣٣)
- سەید عومەر عیرفان بەرزنجی( ١٩٣٢- )هەر لەتەوێڵە کۆچی دوایی دەکات لەخانەقای تەوێڵە نێژراوە.
- عەبدولقادر بەصرایی (یەك ساڵ لە تەوێڵە بووە)
- عەزیز- باوکی هونەرمەند سمکۆ عەزیز.
- شێخ نوری شێخ ڕەضا- باوکی مامۆستا ئاسۆ پارێزگاری سلێمانی
- محەمەد ئەمین کاکەشێخ- تەوێڵەیی (١/١٠/١٩٣٩- ١٩٤١)
- صەفائەدین کاکەشێخ- تەوێڵەیی (١٩٤١- ١٩٥٩)
- قوتبەدین زەینەدین نەجمەدین- (١٩٥٩- ماوەیەکی کەم پاشان قوتابخانەکە دەبێتە دوو دەوام بەناوی قوتابخانەی تەوێڵەو هەورامان
- ئیسماعیل حەمەیوسف- بەڕێوەبەری قوتابخانەی هەورامان (١٩٥٩- ١٩٦١)
- ئەحمەد عەلی صادق، بەڕێوەبەری قوتابخانەی هەورامان - (١٩٦١- ١٩٦٣)
- محەمەد نادر- بەڕێوەبەری قوتابخانەی تەوێڵە (١٩٥٩- ١٩٦٣) لەساڵی (١٩٦٣- ١٩٦٤) قوتابخانە داخرا کەدواتریش کرایەوە یەك دەوام بوو تاچەند ساڵێك.
- ئەحمەد عەلی صادق بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی تەوێڵە بوو( ١٩٦٤- ١٩٦٧) دیسان لەوە بەدواوە کرایەوە بە دوو دەوام..
- ئیسماعیل محەمەد ڕەسوڵ- بەڕێوەبەری قوتابخانەی تەوێڵە (١٥/١٠/١٩٦٨- ١/٩/١٩٨١)
- ئەحمەد عەلی صادق- بەڕێوەبەری قوتابخانەیهەورامان (١٩٦٨- ١٩٦٩)
- حسێن محەمەد غەفور- بەڕێوەبەری قوتابخانەی هەورامان (١٩٦٩- ١/٩/١٩٨١) لەماوەی ساڵانی (١٩٨١- ١٩٩١) تەوێڵە چۆڵ بووە کەلەدوای

ڕاپەڕینەوە قوتابخانە کرایەوە دیسان بوویەوە بەیەك دەوام. بەناوی قوتابخانەی تەوێڵە.

- ئەیوب عەبدوڕەحمان ( ١٩٩١- ١٩٩٤)
- ئیسماعیل محەمەد کەریم (١٩٩٤- ١٩٩٦)
- کەریم محەمەد کەریم (١٩٩٦- )

**مەڵبەندی نەهێشتنی نەخوێندەواری**

لەساڵی (١٩٥٥)دا ئەم مەڵبەندە کرایەوەو دەوامەکەی لەئێواران دا بوو لەتەمەنی(١١)ساڵیەوە بۆ (٤٥) ساڵی وەردەگرت، لەپۆلی یەکەوە بۆ پۆلی شەشی تیاکرایەوە.

ماوەیەك م. شێخ صەفائەدین بەڕێوەبەری بوو، پاشان م. محەمەد نادر بووبە بەڕێوەبەر تاوەکوو ساڵی (١٩٦٣) دوای ئەوە داخرا بەهۆی بارودۆخی ناوچەکەوە.

لەساڵی (١٩٧٠) دوای بەیانی (١١)ی ئازار جارێکی تر کرایەوە، بەردەوام بوو تاوەکوو لەساڵی (١٩٧٩) کە نەهێشتنی نەخوێندەواری کرا بەئیلزامی زیاتر گرنگی پێدراو، بەشدار بوان تەواو زۆر بوون، دواتریش مەڵبەندی گەلیش کرایەوە، کەقوتابیانی، ئاستیان بەرزتر بوون و، ئەبوایە مەڵبەندی نەهێشتنیان بڕایە ئینجا لێرە دەوامیان دەکرد.

لەسەر قسەی مامۆستایان و جەماوەرەکەش ئەم مەڵبەندە (٦٠٪)ی بەشدار بوان زیاتر سودیان وەرگرت، بەتایبەت ئافرەتان باشتر سودیان وەرگرت و پابەند بوون بەدەوام و ئەرکەکانیانەوە، بینای ئەم مەڵبەندانە لە قوتابخانەکانی سەرەتاییدا بوون..

**قوتابخانەی سەرەتایی کچان**[١٩]

بێگومان بەهۆی نەریتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەوە کچان درەنگ تر نێردراون بۆ قوتابخانە، بۆیە قوتابخانەی سەرەتایی کچان لەتەوێڵە درەنگ تر کراوەتەوە لەساڵی(١٩٣٧)وە کراوەتەوە بیناکەی لەپاڵ پۆلیسخانە دەبێت پشت بەلەدیەکە.. یەکەم مامۆستای (صەبری خان)ی سلێمانەیی دەبێت، مێردەکەشی مامۆستا بووە لەتەوێڵە، لەساڵی دووەم دا(مەلیعە) ناوێکیش نقلْ دەبێت وەجبەی یەکەمی قوتابیان لەیەکەم ساڵدا زۆر بوون بەلام ئێمە ناوی ئەمانەمان دەست کەو توون:

١- ئافتاب غەفاربەگ
٢- بەدریە غەفاربەگ
٣- حەسیبە غەفاربەگ
٤- نافعە حاجی حەسەن (خێزانی عەلی قادر)
٥- مەلیعە حاجی حەسەن خێزانی حەمە حسێن
٦- قەتحە حامی حەسەن خێزانی حاجی بابا
٧- تەلیعە ئەحمەد مەولود.
٨- ئەختەر حەمە ئەمین- خەڵکی سلێمانی باوکیان پۆلیس بوو.
٩- صەبریە حەمە ئەمین - خەڵکی سلێمانی باوکیان پۆلیس بوو.
١٠- بەدریە حەمە ئەمین- خەڵکی سلێمانی باوکیان پۆلیس بوو.
١١- عەتیە ئەحمەد- خێزانی کەریمە خشیٚ
١٢- حەفصە حەمە ئەمین حاجی حەمە کەریم
١٣- قەتحەی حەمە کەرەم
١٤- خونچە قادر ئاغا
١٥- عەینا خواجە حسێن.

فەڕاشی قوتابخانەکەش ( ئاسکۆڵ خان) بووە کەخەڵکی سلێمانی بوو خێزانی نوری، برای حەمەسەعید قادر بوو.

ئەم قوتابخانەیە دووساڵ دەوامی کرد لەبەر کەمی قوتابیان و نقلْ بوونی ماموّستاکانیان.. قوتابخانەکە داخرا.. ئیتر قوتابییەکان هەندێکیان چوونە قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان و هەندێکیشیان چوونە حوجرە بۆ قورئان خوێندن کە چەندێکیان هەر قوتابی ئەویٚ بوون. بۆ نموونە نافعەی حاجی حەسەن کەیەکێك بووە لەوانە چووەتەوە بۆ حوجرە بۆلای خاتوو عائشە.. دایکی مەلاکامل.. بۆ قورئان خوێندن. پاشان لەساڵی ١٩٤٨ قوتابخانەکە کراوەتەوە تاساڵی ١٩٥٢ دیسان داخراوەتەوە تاوەکوو ساڵی ١٩٥٦ کراوەتەوەو ئیتر بەردەوام بووە.

بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە لەم ماوەیەدا عائشە خانی سلێمانەیی بووە، تاساڵی ١٩٦٣. دواتر مەعصومەخانی خێزانی عەبدولوەهاب ئەتروشی بوو بەبەڕێوەبەر. لەساڵی( ١٩٧٠) بۆ ساڵی (١٩٧٨) ڕوناك خانی مەلاعەلی هەڵەبجەیی خێزانی ماموّستا بارام سەعدی بوو بەبەڕێوەبەر.. لە ساڵی (١٩٧٨)

بۆ سالی (۱۹۸۱) شێوە نەصرەدین حەمەسەعید قادر تەوێڵەیی بوو بەبەڕێوەبەر. ئەم ماوەی ڕابوورد.. قوتابخانەی کچان لەتەوێڵە تا سالی (۱۹٦۷) بە تەواوی دانەمەزراو هەرماوەیەك دەکرایەوەو ماوەیەك دادەخرا، بۆیە هیچ کچێك لەوماوەیەدا نەیتوانی قوتابخانە تەواو بکات.

لەسالی(۱۹٦۷) یشەوە بۆ (۱۹۷٦) قۆناغێکی باشتر بوو گەلێك قوتابخانە چووە پێش وقوتابی تەواو زۆری بوو(۹) پۆل قوتابیان بووە.

بەلام لەسالەکانی- ۱۹۷۷ بۆ بەهاری ۱۹۸۱ قوتابخانەکە کرا بەدوو دەوام دەوامێکیان لەو قوتابخانەدا بوو لەپشت بینای شارەوانییەوە، ئەوی تریان لەو بینایەی پشتی حەوزی لای خەستە خانەکە ژمارەی قوتابی لەم سالانەدا تەواو زۆر بوو بەتایبەت لەسالی (۱۹۸۱) زیاد لە (٤۰۰) قوتابی بوون.

**قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵە:**

مامۆستایان ولێ پرسراوان و خەلکی تەوێڵە زۆر هەولیان داوە کەناوەندی لەتەوێڵەدا بکرێتەوە چونکە قوتابیان زۆر بووەو، زۆریان نەیان توانیووە بێن بۆ هەلەبجەو سلێمانی خوێندنەکەیان تەواو بکەن.. تاسالی(۱۹٦۸) جارێکیتر مامۆستا ئیسماعیل محەمەد ڕەسول بەپشتیوانی خەلکی تەوێڵە هەول دەدات سکالای جەماوەر دەگەیێنێتە لێپرسراوان. لەئەنجامدا لە(۱۵/۱۰/۱۹٦۸) ئەمری کردنەوەی دەردەچێت و مامۆستا ئیسماعیل بەوەکالەت دەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەکەو مامۆستاکانی سەرەتایی دەبنە(محاضر) لە ناوەندیەکەدا. پاشان مامۆستا (فەرەج ئەحمەد سلێمانەیی) دەبێتە بەڕێوەبەری ڕەسمی سالی خوێندنی (۱۹٦۸- ۱۹٦۹)، ئەوسالە تەواو دەبێت. لەسەرەتای سالی دووەمەوە (۱۹٦۹- ۱۹۷۰) لەبەر نەبوونی مامۆستا قوتابخانەکە دادەخرێت تاوەکو مامۆستا(هۆشمەن مستەفا فەتاح) لە (۲/۱/۱۹۷۰) تەعین دەبێت و دەبێتە بەڕێوە بەری قوتابخانەکەو لەوە بەدواوە قوتابخانەکە بەتەواوی دادەمەزرێت.

پاشان ئەم مامۆستایانە بوو، بوونە مامۆستای ناوەندی تەوێڵە:

- م.ئەنوەر ئیبراهم عەبابەیلێیی -کەئێستا بەڕێوەبەری پەروەردەی سلێمانی یە.
- م. بارام سەعدی تەوێڵەیی- کەئێستا عەقیدە لەئینضباطیەی سلێمانی.

– م. مەحیەدین سەلیم تەوێڵەیی– لەبەغداوە خۆی نقلی تەوێڵە کردەوە، ئێستا کۆچی دوایی کردوە.

– م. مەحمود عەبدوڕەحیم تەوێڵەیی– لەبەغداوە خۆی نقلی تەوێڵە کردەوە، ئێستا کۆچی دوایی کردووە.

– م. سەردار ئیبراهیم سلێمانەیی.....

– م.نورەدین ئاڵتون کوپری– تورکمان بوو.

– م. موسا عەزاوی– بەغدایی..

– م. عەبدولجەبار نەداوی– کەربەلایی.

– م.مەنصور عەزیز تەوێڵەیی.

هەروەها جارجارەش مامۆستاکانیسەرەتایش محاضرەیان بووە لەم ناوەندی‌یەدا بەتایبەت م. عوسمان حەمەصالح.

ئەم قوتابخانە بەم شێوە گوزەرا، تاوەکوو دوای نسکۆی (١٩٧٥) مامۆستا هۆشمەن بوو بەبەڕێوەبەری ناحیەی عەربەت و مامۆستا بارام سەعدی بوو بەبەڕێوەبەری ناوەندی‌یەکە، پاش ئەویش مامۆستا مەحمود عەبدوڕەحیم بوو بەبەڕێوەبەر تاوەکو بەهاری ساڵی (١٩٨١) ئیتر تەوێڵە چۆڵ کرا.

لەدوای نسکۆوە واتە لەساڵانی (١٩٧٥– ١٩٨١) ئەم مامۆستایانەی تر لەم ناوەندی‌یە مامۆستا بوون:

– م.یاسین عەبدوڕەحمان– تەوێڵەیی.

– م. ئازاد محەمەد سان ئەحمەد– تەوێڵەیی.

– م.حەمە سەعید عنایەت هەڵەبجەیی.

– م. فاضل حەیدەر– سەرگەتی.

– م. سەرکەوت و عەزیز و عومەرو جەزا و عاشور کەرکوکیو عەلی عەرەب، لەساڵی (١٩٧٥)ەوە ئیتر پۆلی چواری گشتیو پاشان پۆلی پێنج و شەشی زانستی تیاکرایەوە، تاساڵی (١٩٨١) قوتابخانەکە داخرا بەبۆنەی شەڕی عێراق و ئێرانەوە، قوتابیەکان ئەوساڵە هاتنە هەڵەبجە تاقیکردنەوەی سەریساڵیان دا.

ئالێرەدا حەقی خۆیەتی کەدڵسۆزیو گرنگی دانی ئەم مامۆستا بەڕێزانە دەربخەین لەم قوتابخانەدا کە ڕۆڵێی باش و چالاکیان بینیوە لەو ماوەیەدا کەلەم قوتابخانەیەدا بوون.

- م.هۆشەنگ مستەفا کەلە (١٩٧٠/١/٢)بۆ (١٩٧٥/١٠/١)بەڕێوەبەر بووە، بە ڕاستی ضەبط و ئیدارەی بەهێز بوو.

- م.بارام سەعدی -قوتابیانی فێری کوردایەتی کردن و هانی دەدان کەهەمیشە لەخزمەتی کوردو کوردستاندا بن.

- م.مەحیەدین سەلیم- چونکە دڵسۆز بوو بۆ قوتابیان، گوێی لێنەبوو هەموو مادەیەکی دەوتەوە، با پسپۆڕی ئەو مادەیەش نەبوایە، لەگەڵ ئەوەش بەسەرکەوتوویی دەیوتەوە.

- م.مەحمود عبالرحیم- ئێستاش ئەو وانانەی ئەو ئەیوتنەوە لەگوێی قوتابیەکانی دەزرنگێنەوە و لە بەریانە.

- م.مەنصور عەزیز- مامۆستایەکی نمونەیی سەرکەوتوو بوو لەمادەکەی‌دا.هەروەها مامۆستاکانی تریش ڕۆڵی خۆیان بینیووە، بەڵام کەم ماونەتەوە هەر یەکەیان ساڵێك یان دوو ساڵ- بۆیە ناوی ئەوانیشمان نەنوسیووە لەگەڵ ڕێزێکی زۆررمان بۆیان.

**ناوی یەکەم وەجبەی قوتابیانی قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵەی کوران لە ساڵی( ١٩٦٨- ١٩٦٩ )[٢٠]**

| ز | ناوی قوتابی | ساڵی لە دایکبوون | بەرواری وەرگرتنی | نمرە | ئەنجام |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | امیرە باقی حسن | تەوێڵە /١٩٥٣ | ١٩٦٨/١٠/٢٢ | | |
| ٢ | هادی عەلی جعفر | تەوێڵە /١٩٥٦ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | مردووە |
| ٣ | حسێن جعفر بابالە | تەوێڵە /١٩٥٢ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٤ | یونس عبدالخالق عبدالمجید | تەوێڵە /١٩٥٤ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٥ | یونس فرج بابالە | تەوێڵە /١٩٥٤ | ١٩٦٨/١٠/٦ | | |
| ٦ | محمود عبداللە حمە سعید | تەوێڵە /١٩٥٢ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٧ | مهدی عەلی جعفر | تەوێڵە /١٩٥٥ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | ٧٥٢ | دەرچووە بەچوارەم |
| ٨ | ناجح محمد قادر | تەوێڵە /١٩٥٣ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٩ | نادر عزیزمحمد | تەوێڵە /١٩٥٢ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ١٠ | محمد توفق نادرحمەلطیف | تەوێڵە /١٩٥٣ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | مردووە |
| ١١ | نیازی عزەت حسن | تەوێڵە /١٩٥٤ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | مردووە |
| ١٢ | سەردار حسن عزیز | تەوێڵە /١٩٥٤ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٣ | سەردار سعید محمد | بن گردان/١٩٥٥ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ١٤ | عمر عبدالرحیم محمود | تەوێڵە /١٩٥٥ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ١٥ | عبدالکریم حمە عەلی کوزاد | تەوێڵە /١٩٥٢ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ١٦ | عثمان امان الله بابالە | تەوێڵە /١٩٥٢ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ١٧ | عەلی احمد عبدالله | تەوێڵە /١٩٥٤ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ١٨ | عەلی عەلی محمد | بیارە/١٩٥٤ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ١٩ | فخرالدین مصطفی حمەصاڵح | تەوێڵە /١٩٥٤ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | ٧١٤ | دەرچووە بەپێنجەم |
| ٢٠ | فارق اللهکرم توفیق | تەوێڵە /١٩٥٥ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٢١ | فائق توفیق امین | سۆسەکان/١٩٥٢ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٢٢ | قاسم مهدی غفور | تەوێڵە /١٩٥٣ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٢٣ | شێرزاد حمە سلیم حمە رضا | تەوێڵە /١٩٥٤ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٢٤ | شوکت حمەصاڵح فرج | تەوێڵە /١٩٥١ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٢٥ | معصوم حمەرضا محمد | تەوێڵە / ١٩٥ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٢٦ | محمد احمد معین | سۆسەکان/١٩٥٣ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٢٧ | توفیق محمد حسێن | تەوێڵە /١٩٥٣ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | ٧٨٩ | دەرچووە بەدووەم (مردووە) |
| ٢٨ | ظاهر عبدالله حسێن | تەوێڵە /١٩٥٦ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | ٧٢٠ | |
| ٢٩ | غازی برهان عثمان | خورماڵ/١٩٥٤ | ١٩٦٨/١٠/٢٦ | | |
| ٣٠ | احمد عبدالله احمد | تەوێڵە /١٩٥٣ | ١٩٦٨/١١/٢ | ٧٧١ | دەرچووە بە سێهەم |
| ٣١ | ئەیوب عبدالرحمن حمەرحیم | تەوێڵە /١٩٥٤ | ١٩٦٨/١١/٢ | | |
| ٣٢ | جعفر عبدالله نصرالله | سۆسەکان/١٩٥٢ | ١٩٦٨/١١/٢ | | |
| ٣٣ | طاهر عبدالله حسێن | تەوێڵە /١٩٥٣ | ١٩٦٨/١١/٢ | ٨٥٠ | دەرچووە بەیەکەم |
| ٣٤ | عثمان اسماعیل بەکر | تەوێڵە /١٩٥٧ | ١٩٦٨/١١/٢ | | |
| ٣٥ | صدیق احمد محمد | تەوێڵە /١٩٥٤ | ١٩٦٨/١١/٢ | ٧٠٣ | |
| ٣٦ | صاڵح محمد مصطفی | بیارە/١٩٥٣ | ١٩٦٨/١١/٢ | ٧١٠ | |

### بینای قوتابخانەکانی تەوێڵە :

لەسالی (١٩٢٠)دا قادربەگ کۆمەڵێك خانوبەرەی دورست کرد کەپێکهاتبوو لەخانێك و قەیسەرییەك و گەرماوێك و دەستەیەك خانووی فراوان و جوان کەلەچەند شوێنێکەوە دەرگای هەبوو... جاکە قوتابخانە بۆ تەوێڵە دەرچوو، قادربەگ چەند ژورێکی لێجیاکردەوە بۆ قوتابخانەکەو بۆماوەی (٨) ساڵ بەبێ بەرامبەر دەوامی تیاکرا تا لە بەهاری سالی (١٩٣٦) بەر لافاوە زۆرەکە کەوت و زیانێکی زۆری گەیاند بە قوتابخانەکەو زۆربەی سجل و کەل وپەلی قوتابخانەکە هەبوو بەر لافاوەکە کەوت.

لەسالی (١٩٣٥) لەپشتی بینای شارەوانی ئێستاوە کەزیارەتی پێدەڵێن میری پارچە ئەرزێکی لەلای شێخ مەظهەر کڕیو دەست کرا بەدورست کردنی یەکەم بینای میری بۆ قوتابخانەی تەوێڵە و لەهاوینی (١٩٣٦) بیناکە تەواو بوو، ئیتر سالی خوێندنی (١٩٣٦- ١٩٣٧) لەم بینایە بوو. واتە پێش لافاوەکە بیناکە دورست کرابو وە کەمێکی مابوو.

لەسالی (١٩٥٩) کەقوتابخانەی تەوێڵە کرابە دوودەوام قوتابخانەی هەورامان و قوتابخانەی تەوێڵە، ئەم بینایە کرابە قوتابخانەی هەورامان و پاشان کرابە لاوان و قوتابیان و دواتریش کرابە قوتابخانەی کچان.. لەسالی (١٩٧١)یشەوە بەتەواوی ڕوخێنراو بۆجارێکیتر بەنەخشەیەکی تر دورست کرایەوە بۆ قوتابخانەی کچان تا لەسالی (١٩٨١) بەهۆی شەڕی عێراق و ئێرانەوە ڕوخێنراو تائێستا چاك نەکراوەتەوە.

لەسالی (١٩٥٩) کەقوتابخانەکە بوو بەدوو دەوام، دەوامی قوتابخانەی تەوێڵەش لەخانووەکەی (محەمەدی سان ئەحمەد) بوو. لەسالی (١٩٦٠)یشەوە ئەمر دەرچوو بۆ دروست کردنی بینای قوتابخانەی تەوێڵە، لەبەشی خوارەوەی تەوێڵە نزیك خانەقاکە ئەرزی تەکیەی پێدەڵێن تاهاوینی (١٩٦٣)ئینجا تەواوبوو کەپێکهاتبوو لە (١٥) پۆل، دوو نهۆم بوو لەبەشی پشتەوە حەوشەیەکی (٣٥٠)مەتری هەبوو هەمووی بەبەردی مەڕمەڕ دروست کرابوو، بەلام بە داخەوە بە هۆی بارودۆخەکەوە کەدائیرەکانی میری لەتەوێڵە کشانەوە، قوتابخانەش ئەوساڵە نەبوو...تا لە پایزی(١٩٦٤)قوتابخانە کرایەوەو بۆ یەکەم جار دەوامی تیاکرا هەمووشی بەیەك دەوام بوو (تەوێڵە و هەورامان ).

لەساڵی(١٩٦٧)کرایەوە بەدوو دەوام و هەردوو دەوامی (تەوێڵە و هەورامان) لێرە دەکرا، تاساڵی ١٩٨١، دوای ئەوە ئەمیش بەهۆی شەڕی عێراق و ئێرانەوە ڕووخێنرا.

لەدوای ڕاپەڕین لەساڵی (١٩٩٢)لە لایەن یەکێك لەڕێکخراوەکانەوە بەنەخشەیەکی تری (١٢)پۆلی درووست کرایەوە.

لەساڵی(١٩٧٦)لەپشتی حەوز قوتابخانەیەکی تر کرایەوە بۆ کچان ئەمیش لەلایەن ڕێکخراوە خێر خوازەکانەوە جارێکی تر ئەمیش بەنەخشەیەکی تر دروست کرایەوە ئێستا قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵە دەوامی تیا دەکات.

**بینای قوتابخانەی ناوەندی:**

لەسەرەتاوە کە کرایەوە لە بینای قوتابخانەی سەرەتایی کوڕاندا دەوامی دەکرد، دوای دووساڵ، دەوامی ئەم قوتابخانەیە چووە خانوەکەی (مستەفا فەتاح) لەپشتی حەوز لای بینای کارەباکە، لەبەهاری ساڵی(١٩٧٣)بینای تازە دروست کرا لەپشت قوتابخانەی کچانەوە و بەردەم پۆلیسخانە لەو ئەرزەی

قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵە ساڵی ١٩٧٤ دروستکراوە

کەپێیان دەوت زیارەت. ئەم بینایە لەبەهاری ساڵی(١٩٧٤)تەواو بوو، پێش وەرگرتنی، شەڕی (١٩٧٤)دەستی پێکرد، بۆیە لەوساڵەدا، کرا بە خەستەخانەی شۆڕش، بەڵام لەساڵی(١٩٧٥- ١٩٧٦)یەکەم ساڵی خوێندن بوو تیایدا.

ئەم بینایە بەڕاستی بەشێوەیەکی زۆر جوان و نەخشەیەکی گرنگ دروست کرابوو دیمەنێکی جوانی بەخشی بوو بەتەوێڵە. ئەمیش لەساڵی(١٩٨١)بەدواوە ڕوخێنرا ......ئێستا ئەمری دروست کردنەوەی بۆ دەرچووە دەستی پێکراوەتەوە و بناغەکەی دروست کراوە و بەداخەوە ماوەی ساڵێکە ئیشی ئەمیش لەبەر هەندێ هۆ وەستاوە.

**کشانەوەی مەکتەب و دەزگاکانی میری لەتەوێڵە:**

بەبۆنەی ڕەوشی سیاسی ناوچەکە، چەند جارێك مەکتەب و دەزگاکانی میری، کێشراونەتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی خۆی.هەرکاتێك حکومەتی عێراقی ئەو ناوچانەی دەسەلاتی نەبووبێ بەسەریاندا، مەکتەب و دائیرەکانی خۆی کێشاوەتەوە وەك لەساڵەکانی دوای ڕاپەڕین (١٩٩١- ). بێگومان ئەو دائیرانەی لەتەوێڵەدا هەبوون، بەکشانەوەیان زیانێکی زۆریان ئەدا لەخەڵکی ناوچەکە بەتایبەت قوتابیان.

لەم سالأنەی خوارەوە قوتابخانە داخراوە لەتەوێڵەدا:

- هەرلەسەتای شۆڕشەوە ساڵی(١٩٦٢) بۆ ماوەیەك داخراوە زۆری نەبرد کرایەوە.

- لەساڵی (١٩٦٣- ١٩٦٤) تەواوی ساڵەکە قوتابخانە داخرا.جالەو ساڵەدا هەرلەبیناکەی خۆیدا بەناوی قوتابخانەی (بەرزان)ەوە یەکەم قوتابخانەی شۆڕش لەکوردستان دا لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا لەتەوێڵە کرایەوە[٢١]. ماموستاو بەڕێوەبەری ئەم قوتابخانەیە ئەمانەی خوارەوە بوون.

- عەلی قادرئاغا بەڕیوەبەر
- عەلی حەمەئەمین ماموستا
- ساجد ئاوارە ماموستا
- بابامحەمەد شێخۆ ماموستا
- حەمەڕەشید عوسمان ماموستا
- عەباس حاجی محمەد ماموستا
- کامل مەهدی بەغدادی ماموستا کەعەرەبێکی نەیاری حکومەتی عێراق.

لەم ماوەی ساڵەدا باوکی قوتابیەکان هاوکاری‌یەکی باشی قوتابخانەکەو هەردوو ماموستا (ساجد و کامل)یان دەدا. لەپایزی ١٩٦٤ قوتابخانە کرایەوە

- لەساڵی (١٩٦٥- ١٩٦٦)یش داخرایەوە جارێکیتر قوتابخانەی شۆڕش کرایەوە مامۆستاکانی ئەمانەی خوارەوە بوون:
- م.کەریم کوێخا ڕۆستەم بەڕێوەبەر
- م.عەباس حاجی حەمەڕەشید
- م.شاهۆ محەمەدسان ئەحمەد
- م.بابا محەمەد شێخۆ
- م.عوسمان کەریم فەیزوالله

ساڵی (١٩٦٦- ١٩٦٧) دیسان قوتابخانەی ڕەسمی کرایەوە.

- لەساڵی (١٩٦٨- ١٩٦٩)دیسان بۆ ماوەی چەند مانگێك داخرایەوەو زۆری نەخایاند کرایەوەو ساڵی خوێندن نەفەوتا.

- لەمانگی ئازاری(١٩٧٤)بۆ مانگی ئازاری(١٩٧٥)بۆ جارێکیتر داخرایەوەو، ئەم ساڵە تاقیکردنەوەی سەری ساڵی قوتابیان لەدەوری دووەم لەمانگی (٩)لەناو باخەکانی تەوێڵەدا کرا. قوتابیەکی زۆری پارێزگای سلێمانیو هەڵەبجەو دەوروبەری هاتبونە تەوێڵەو لێرە تاقی کردنەوەکەیان دا. لەم ساڵەدا (١٩٧٤- ١٩٧٥)لەبینای قوتابخانەی سەرەتایی تەوێڵەی کوڕان هەرلەپۆلی یەکەوە بۆ پۆلی چواری سانەوی تیاکرایەوە، زۆرێك لەو مامۆستایانەی تەوێڵەو ئەو مامۆستایانەی کەلە شارەکانەوە پاڵییان دابوو بە شۆڕشەوە کەلە تەوێڵە بوون هەموو بوونەتە مامۆستای ئەم قوتابخانەیە. ئەمیش زۆری نەبرد نسکۆی شۆڕش هات بەسەردا. ئەم قوتابخانەیەی شۆڕش هیچ کامیان بەساڵی خوێندن حیساب نەکرا لەلایەن حکومەتی عێراقەوە لەگەڵ ئەوەشدا سودیان زۆر بوو بۆ قوتابی لەڕووی زانست و پەروەردەوە، هەروەها ئەو قوتابیانەش کەگەورەبوون لەپۆلی(٥و٦)داو باوکیان دەسەلاتیان باش بوو یاخزمیان هەبوو دەهاتن بۆ سلێمانیو هەڵەبجە بۆ خوێندن.

- لەبەهاری ساڵی(١٩٨١)بەهۆی شەڕی عێراق و ئێرانەوە نەك هەرقوتابخانەکان، بەڵکو تەوێڵە بەتەواوی چۆڵ کراو قوتابیان دیسان لانەیان شێواو پەرش و بڵاو بوونەوە بەشاران داو لەهەڵەبجەو سلێمانی تاقی کردنەوەیان ئەنجام دا. تاساڵی ڕاپەڕینی(١٩٩١- ١٩٩٢) قوتابخانەکانی تەوێڵە لەژێر سێبەری ئازادی حکومەتی هەرێم دا کرانەوە.

بەڕاستی لەم ماوەیەدا (١٩٦١- ١٩٩١)بەهۆی بارودۆخی کوردستانەوە زیاتر لەهەموو چین و توێژێك، قوتابی قوربانی داوەو بووەتە، سوتەمەنی بارودۆخەکە. هەروەها دەڤەری هەورامان و سەرسنورەکان لەهەموو دەڤەرەکانیتر زیاتر بەرئەمە کەوتوون. نەوەی ئەم سالأنەی (١٩٦١)وە بۆ(١٩٨١) کەقوتابی بووە، ئەوە خوێندنەکەی بووە، لە(١٩٨١- ١٩٩١)سەربازیو فیراری لەشەڕی عێراق و ئێران و کوێت دا[٢٢] تووشی چەندەها دەردیسەری کردووە.

**چەندزانیاریەك لەسەر قوتابخانەکانی تەوێڵە:**

- لەساڵی(١٩٢٨)دا، کەقوتابخانە لەتەوێڵەدا کراوەتەوە،(٣١) قوتابی خۆیان ناونوس کردووە.(١٨) یان لەپۆلی یەکدا دانراون،(١٣)شیان لەپۆلی دوودا دانراون، چونکە لەوەو پێش لەحوجرە خوێندویانەو ئاستیان باش بووە.
- لەساڵی(١٩٢٩)شدا، (٥) قوتابی خۆیان ناونوس کردووە، ئەمانیش(٣)یانیان لەپۆلی دوودا دانراون (٢) یان لەپۆلی یەکدا دانراون.
- لەساڵەکانیتر بەدواوە، هەرکەسێ ناونوس کرابێت هەرلەپۆلی یەکدا دانراوە.
- یەکەم قوتابی (مەجید غەفاربەگ) بووە لە(١٩٢٨/١٠/١٤)خۆی ناونوس کردووە.
- ئەخیر قوتابیش لە(١٩٨١/٩/٢١)خۆی ناونوس کردووە کەناوی (جوان کەریم حەمەصاڵح)ە ئەمە لەسجلی ژمارە(١١٥) لەقوتابخانەی تەوێڵەی سەرەتای کوڕان.[٢٣]
- لەساڵیخوێندنی (١٩٦١- ١٩٦٢)دا:

قوتابخانەی سەرەتایی تەوێڵەی کوڕان (٢١٢) قوتابی بووە.

قوتابخانەی سەرەتای هەورامانی کوڕان(٢٠٠)قوتابی بووە.

قوتابخانەی سەرەتای تەوێڵەی کچان(١٣٦) قوتابی بووە.

کۆی هەموویان =٥٤٨ قوتابی..(٢٤)

- لەساڵی خوێندنی(١٩٨٠- ١٩٨١)دا ژمارەی قوتابی کچانی سەرەتایی نزیکەی (٤٠٠)

ژمارەی قوتابی کوڕان نزیکەی(٥٥٠)

واتە کۆی قوتابیانی سەرەتایی لەو ساڵەدا(٩٥٠)بوون

- ژمارەی قوتابیانی سەرەتایی تێکەڵاو لەساڵی خوێندنی (٢٠٠٢- ٢٠٠٣)لەهەردوو دەوامەکەدا (٣٨٢) قوتابی بوون..

- لەبەرواری (١٩٦٨/١٠/١٥) کەقوتابخانەی ناوەندی تەوێڵە دەکرێتەوە، یەکەم قوتابی کەناوی خۆی تۆمار کردبێ (ئەمیرە باقی حەسەن) دەبێت، ئەویش لە(١٩٦٨/١٠/٢٢)ناوەکەی تۆمار دەکرێت.

- ئەخیر قوتابی لەساڵی خوێندنی (١٩٨٠- ١٩٨١)،(هەورامان عەلی حسێن) دەبێت لە(١٩٨٠/١١/٨)دا ناوی خۆی تۆمار دەکات و دەبێتە ژمارە(٦٦١) لەسجلی ناوەندی تەوێڵەدا.

- لەساڵی خوێندنی(١٩٧٦- ١٩٧٧)دا ناوەندیەکە دەبێتە دواناوەندیو ئیتر پۆلی چوارەمی گشتی بۆ دەکرێتەوە.

- لەساڵی خوێندنی(١٩٨٠- ١٩٨١)لەیەکی ناوەندیەوە تاپۆلی شەشەمی زانستی بووە.

- لەساڵی خوێندنی(١٩٦٨- ١٩٦٩) کەیەکەم ساڵی خوێندنی ناوەندی تەوێڵە بووە(٣٦) قوتابی بووە

- لەساڵی خوێندنی(١٩٧٣- ١٩٧٤)ژمارەی قوتابی ناوەندی گەیشتووەتە (٨٥) قوتابی

- لەساڵی خوێندنی(١٩٨٠- ١٩٨١) کەتەوێڵە چۆڵ کراوە(٢٦٠)قوتابی بووەکە ئەوکاتە دواناوەندی بووە.

- لەساڵی خوێندنی(١٩٩٦- ١٩٩٧) ژمارەی قوتابی ناوەندی(٨٧) قوتابی بوون.

- ژمارەی قوتابیانی ساڵی خوێندنی (٢٠٠٢- ٢٠٠٣)=١٧٥خوێندکار بوون.

- لەساڵی خوێندنی (١٩٩٦- ١٩٩٧) قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵە موافەقەتی بۆ وەرگیراوەتەوە لەپەروەردەی سلێمانی کەبکرێتەوە بەدواناوەندی (سانەوی)

- یەکەم مامۆستا کەچوبێتە خوێندگای تەوێڵە، مامۆستا عەبدوالله گۆران بووە.

- یەکەم مامۆستایەکیش کەتەوێڵەیی بێت کەبووبێتە مامۆستا هەردوو براشێخ حەمەئەمین و شێخ صەفائەدین بوون، کەلەساڵی(١٩٣٩)دا دەرچوون.

- یەکەم مامۆستایەك کەتەوێڵەیی بوبێت و لەتەوێڵە، وانەی وتبێتەوە شێخ حەمەئەمین بووە.
- یەکەم بەڕێوەبەرێکیش کەتەوێڵەیی بووبێت و، بووبێتە، بەڕێوەبەری قوتابخانەی تەوێڵە، شێخ صەفائەدین بووە.
- یەکەم تەوێڵەیی‌یەك کەبووبێتە (مودەڕیس)،(م. هۆشمەن مستەفا)بووە.
- یەکەم تەوێڵەیی‌یەك کەبووبێتە بەڕێوەبەری ناوەندیەکە، هەر(م.هۆشمەن مستەفا)بووە.
- لەدوای ڕاپەڕینیش ئەم بەڕێزانە بوونەتە بەڕێوەبەری ئەم ناوەندیە: عەدنان عارف محەمەد، سامی وەسیم عوەیز، نازم غەفور محەمەد.

**ناوی ئەو تەوێڵەیی‌یانەی تاساڵی( ١٩٨١ )بونەتە مامۆستا[٢٥] :**

| ز | ناو |
|---|---|
| ١ | محەمەد ئەمین کاکەشێخ |
| ٢ | صەفائەدین کاکەشێخ |
| ٣ | ئیسماعیل محەمەد ڕەسوڵ |
| ٤ | ئەحمەد عەلی صادق |
| ٥ | محەمەد نادر حەمەعەزیز |
| ٦ | حسێن محەمەد غەفور |
| ٧ | عەبدولخالق باباله مەعروف |
| ٨ | صابیر قادر مەعروف |
| ٩ | کەمال ئەسکەندەر حەمەحسێن |
| ١٠ | کەریم محەمەد کەریم |
| ١١ | ئەبوبەکر ئیسماعیل ئەبوبەکر |
| ١٢ | مەعصوم عەلی عەبدوڕەحیم |
| ١٣ | مەحمود عارف محەمەد |
| ١٤ | محەمەد عەبدوڕەحمان جەعفەر |
| ١٥ | شێرکۆ مەهدی عەزیز |
| ١٦ | جەزا حەمەصاڵح عیوەض |
| ١٧ | حامد عومەر ئەکرەم |
| ١٨ | حەمەشەریف حەمەڕەشید |
| ١٩ | عابد محەمەد وەیسی |
| ٢٠ | عەزیز جەعفەر باباله |
| ٢١ | عوسمان محەمەد صاڵح فەرەج |
| ٢٢ | عومەر کەریم حەمەعەزیز |
| ٢٣ | عەلی ئامانەالله باباله |
| ٢٤ | عەبدولواحد محەمەد حەمەصاڵح |
| ٢٥ | محەمەد عوسمان ئەکرەم |
| ٢٦ | کامل حەمەعارف عەزیز |
| ٢٧ | محەمەد بەهائەدین صاحب |
| ٢٨ | زاهیر عەبدوالحەمید عەبدوالله |
| ٢٩ | تاهر مەحمود نادر |
| ٣٠ | ئەحمەد عەبدوڕەحیم مەحمود |
| ٣١ | حەیدەر عوسمان سلێمان |
| ٣٢ | تالب مستەفا حەمەصاڵح |
| ٣٣ | جەمیل حەبیب محەمەد |
| ٣٤ | فازل عەلی عەبدوڕەحیم |

| | |
|---|---|
| ٣٥ | عەبدوالله کەریم حەمەعەزیز |
| ٣٦ | عەبدوڵلا عەلیحسێن |
| ٣٧ | مەناف قادر غەفور |
| ٣٨ | محەمەد عارف محەمەد |
| ٣٩ | حەمەصالح فەتحوالله سلێمان |
| ٤٠ | موختار عەلی محەمەد عەبدوڕەحیم |
| ٤١ | عومەر حەمەحسێن حەمەسەعید |
| ٤٢ | جەمال حەمەکەریم عەبدولوەهاب |
| ٤٣ | جەمال حەبیب اللەفەرەج |
| ٤٤ | فەخرەدین سەلیم حەمەیوسف |
| ٤٥ | فەرید ئەحمەد موعین |
| ٤٦ | کەریم ڕۆستەم کەریم |
| ٤٧ | بابا محەمەد شێخۆ |
| ٤٨ | عوسمان کەریم فەیزوالله |
| ٤٩ | شاهۆ محەمەدسان ئەحمەد |
| ٥٠ | عەبدولمەجید حسێن وەیسی |
| ٥١ | سەرتیپ تاهرسان ئەحمەد |
| ٥٢ | عومەر عەبدوڕەحیم مەحمود |
| ٥٣ | محەمەد مەحمود محەمەد |
| ٥٤ | فاروق اللەکەرەم تۆفیق |
| ٥٥ | ئەیوب عەبدوڕەحمان عەبدوڕەحیم |
| ٥٦ | حکمەت تۆفیق حەمەحسێن |
| ٥٧ | ڕەفعەت تۆفیق حەمەحسێن |
| ٥٨ | ناسرعەزیز حەمەئەمین |
| ٥٩ | عەباس حەمەڕەشید کەریم |
| ٦٠ | هۆشیار مەحیەدین نەجمەدین |
| ٦١ | سەرتیپ مەحیەدین حەمەسەعید |
| ٦٢ | صەباح ڕۆستەم عەزیز |
| ٦٣ | شیروان محەمەد سان ئەحمەد |
| ٦٤ | سەعدی حەمەعەزیز حەمەشەریف |
| ٦٥ | عەبدوڕەزاق عەبدەڕەحمان محەمەد |
| ٦٦ | صەباح هۆمەر عەبدولحەکیم |
| ٦٧ | غازی محەمەد عەبدولقادر |
| ٦٨ | دیاری نەزهەت عەلی محەمەد |
| ٦٩ | سەرتیپ ئادەم ئیسماعیل |
| ٧٠ | مەعروف عارف محەمەد |
| ٧١ | حەمید حەمەئەمین خالد |
| ٧٢ | جەبار حەمەلەتیف سلێمان |
| ٧٣ | کاوە ئیسماعیل صدیق |
| ٧٤ | دڵشاد محەمەد بەهائەدین صاحب |

| ز | ئەمەش ناوی ئافرەتانە |
|---|---|
| ١ | شێوە نەصرەدین حەمەسەعید |
| ٢ | شنە نەصرەدین حەمەسەعید |
| ٣ | ڕوناك حەمەلەتیف وەلی |
| ٤ | بەهارقادر حسێن |

## ناوی ئەو تەوێڵەیانەی تاساڵی (١٩٨١)بوونە مامۆستا (مدرس)[٢٦]

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١ | هۆشمەند مستەفا فەتاح | ٨ | هیوا صەفائەدین کاکەشێخ |
| ٢ | بارام سەعدی قادر | ٩ | سەرکەوت صەفائەدین کاکەشێخ |
| ٣ | مەحمود عەبدوڕەحیم مەحمود | ١٠ | ئازاد حەمەئەمین کاکەشێخ ئێستادکتۆرای هەیەلە زانکۆی صلاح الدین |
| ٤ | مەحیەدین سەلیم حەمەیوسف | ١١ | ئەدیبە تۆفیق حەمەحسێن |
| ٥ | مەنصور عەزیز حەمەئەمین | ١٢ | صەلاح ڕۆستەم عەزیز |
| ٦ | ئازاد محەمەد سان ئەحمەد | ١٣ | عومەر کەریم فەیزوالله |
| ٧ | یاسین عەبدوڕەحمان عەبدوڕەحیم | | |

**ئەمەش ناوی خزمەتگوزارەکانی قوتابخانەکانی تەوێڵەیە تاساڵی ١٩٨١:**

١- ئەحمەد ئیبراهیم اللەکەرەم
٢- صاڵح مستەفا- قەیتە- زیاتر دەوری پاسەوانی بینیوە.
٣- حەمەحەسەن حەمەصادق
٤- حەمەڕەشید عەبدوالله مەعروف
٥- محەمەد عەبدوالله مەعروف
٦- کەمال عەبدولواحد صەلاحەدین
٧- حەمەئەمین عەبدوالله
٨- نافعەدین نزامەدین نەجمەدین
٩- حەمەشەریف حەسەن سۆسەکانی
١٠- فەرەج ڕوحوالله
١١- حەیدەر محەمەد محەمەد
١٢- جەلال ئەسکەندەر حەمەیوسف
١٣- سلێمان فەتحوالله سلێمان
١٤- نەصرەدین عەزیز مەحمود
١٥- کەمال حەمەخان خواکەرەم
١٦- فەخرەدین صاڵح یارە
١٧- لەتیف فەتاح حەمەسور

## خزمەتگوزارەکانی ناوەندی تەوێڵە

١- مەحمود حەمەڕەحیم

٢- مورشید خودادا

## ناوی مامۆستایانی سەرەتایی تەوێڵە کەلە نێوان ساڵەکانی

(١٩٩٢/١/١- ٢٠٠٣/١/١) لەو قوتابخانە دەوامیان کردوە

| ز | ناوی مامۆستا |
|---|---|
| ١ | کەریم محەمەد کەریم (+) |
| ٢ | ئەیوب عەبدوالرحمان عەبدوڕحیم(+) |
| ٣ | غازی محەمەد عەبدولقادر |
| ٤ | عادل ڕەشید عابد (+) |
| ٥ | عەبدولمەجید حسێن وەیسی(+) |
| ٦ | جەبارحەمەلەتیف سلێمان |
| ٧ | جەمیل حەبیب محەمەد (+) |
| ٨ | ئیسماعیل محەمەد کەریم |
| ٩ | سالم خواکەرەم ئەبوبەکر (+) |
| ١٠ | ئارام خواکەرەم ئەبوبەکر (+) |
| ١١ | سەریاس جەبار سەعید (+) |
| ١٢ | ستار حەیدەر عەبدولحەکیم (+) |
| ١٣ | سەردەشت تۆفیق سان ئەحمەد(+) |
| ١٤ | ئەمین نەصروالله حەمەئەمین(+) |
| ١٥ | یاسین خدر ئەمین(+) |
| ١٦ | ئازاد حەمەلەتیف سلێمان |
| ١٧ | سەردار مەحیەدین ئەبوبەکر (+) |
| ١٨ | نەصرەدین عەلی قادر |
| ١٩ | جەعفەر محەمەد بابالە (+) |
| ٢٠ | سەیفەدین ئەبوبەکر ئەکرەم (+) |
| ٢١ | جەمیل زۆراب خالد |
| ٢٢ | شەماڵ جەماڵ مستەفا |
| ٢٣ | نەسیم عەبدولواحد کەریم |
| ٢٤ | بێساران ئیسماعیل محەمەد (+) |
| ٢٥ | ئاشتی ئەکرەم عومەر |
| ٢٦ | داناحەمەئەمین عەزیز |
| ٢٧ | جاسم حەمەئەمین صاڵح |
| ٢٨ | ریاچ حەمەعەزیز حەمەشەریف |
| ٢٩ | دڵشاد تۆفیق ئەبوبەکر |
| ٣٠ | سیروان مەحمود عەبدوڕەحیم |
| ٣١ | نازم عەزیز میرزا (+) |
| ٣٢ | محەمەد حسێن حەمەڕەحیم- نارنجڵەیی (+) |
| ٣٣ | چیمەن مەجید محەمەد |
| ٣٤ | نەرمین ئەحمەد محەمەد |
| ٣٥ | تانیا محەمەد خواجە حسێن |
| ٣٦ | گوڵچین فەرەج محەمەد (+) |
| ٣٧ | شەهلا جەمیل سەعید |
| ٣٨ | ساکار شێرکۆ مەهدی |
| ٣٩ | ڕێزان ئیسماعیل ئەحمەد |
| ٤٠ | مەهاباد عەبدوالله عومەر |
| ٤١ | ئاواز حەمەڕەئوف عەلی |
| ٤٢ | کەژاڵ مراد عەبدوالله (+) |
| ٤٣ | شنە حەمەخان جەعفەر |
| ٤٤ | گەزیزە تایەر مەحمود (+) |

| ٤٥ | پاکیزە حەمەخان جەعفەر (+) |
|---|---|
| ٤٦ | هودا محەمەد ڕەزا جەعفەر (+) |
| ٤٧ | وەزیرە جەعفەر عەلی (+) |
| ٤٨ | فەریدە عومەر صابر |
| ٤٩ | ئاشنا محەمەد ئەمین (+) |
| ٥٠ | مونیرە حەمەغەریب ڕەحیم (+) |

**تێبینی**: ئەو ناوانەی نیشانەی (+) زائیدیان لەبەردەم دایە واتە ئەو ماموٚستایانە لە ساڵی خوێندنی (٢٠٠٢- ٢٠٠٣)لەو خوێندنگایەدا دەوام دەکەن کەژمارەیان (٢٦) ماموٚستان.

لەهەمان کاتدا ئەم ناوانەی خوارەوەش لەقوتابخانە دەوامیان کردووە بەم جۆرە وەزیفەیە:

نوری حەمەئەمین – باخەوان
زاهر حەمەصاڵح صادق – پاسەوان
جەلال ئەسکەندەر حەمەیوسف – خزمەتگوزار
باقی محەمەد ڕۆستەم – خزمەتگوزار
خدر مەجید اللەوەیس – خزمەتگوزار
عەباس فەرەج عەزیز – خزمەتگوزار
لەتیف فەتاح محەمەد – خزمەتگوزار
زاهر عەبدولخالق سۆسەکانی – خزمەتگوزار
پەری بابالە – خزمەتگوزار
نافعە حەمەیوسف ڕەمەزان – خزمەتگوزار

## ناوی ماموٚستایانی ناوەندی تەوێڵە کەلە نێوان ساڵانی (١٩٩٢/١- ٢٠٠٣/١/١ )لەو قوتابخانەیە دەوامیان کردوە

| ز | ناوی ماموٚستا |
|---|---|
| ١ | عەدنان عارف محەمەد |
| ٢ | ئەدهەم عەبدولحامد حەمەلەتیف(+) |
| ٣ | سەعدون عەزیز بابا(+) |
| ٤ | نازم غەفور محەمەد (×) |
| ٥ | صیفەت عەبدولحەکیم عەبدولکەریم |
| ٦ | سامی وەسیم عوەیز |
| ٧ | ئارام حەسەن عەزیز |
| ٨ | ئیقباڵ عەبدولواحید کەریم |
| ٩ | هاشم غەفور محەمەد |
| ١٠ | ماجد عارف محەمەد (×) |
| ١١ | جاسم حەمەمراد حەمەمراد(×) |

| | |
|---|---|
| ١٢ | ئاسایش نەزهەت عەلی محەمەد |
| ١٣ | ئەمیرە مەحیەدین حەمە ڕەحیم |
| ١٤ | شەهلا حەمەعەزیز حەمەیوسف(×) |
| ١٥ | زەیتون حەمەصادق حەمەحەسەن(×) |
| ١٦ | ئەمیرە حەمەخەریب ڕەحیم(+) |
| ١٧ | شەمامە جەبار عەبدوالله- کەرکوکی |
| ١٨ | فەهمی عەبدولقادر مستەفا- (+) |
| ١٩ | شێرزاد عەبدوالله حەمەمراد- (×) |
| ٢٠ | کەریم بارام حسێن(×) |
| ٢١ | ئەمجەد جەعفەر مستەفا- هەڵبجەیی |

| | |
|---|---|
| ٢٢ | نازم ڕەئوف عەبدوڕەحمان- نارنجلەیی |
| ٢٣ | جەمیل قادر عەبدوالله- هەڵەبجەیی |
| ٢٤ | شەوکەت -سلێمانەیی |
| ٢٥ | ڕەفعەت حەمەڕەشید اللەوەیس. محاضر |
| ٢٦ | نەعمان حافڤ نەزیر - محاضر |
| ٢٧ | لقمان ئیسماعیل ئەمین -محاضر |
| ٢٨ | نهاد عوسمان حەمەکەریم- محاضر |
| ٢٩ | ریاض حەمەعەزیز حەمەشەریف- محاضر |

لەهەمان کاتدا ئەم بەڕێزانەی خوارەوەش هەریەکەیان بەجۆرێك ئێستا لەوقوتابخانەیە دەوام دەکەن:

تاهر مستەفا عەلی- نوسەر

ئاوات عەبدوالله - نوسەر

ئیقباڵە - نوسەر

مورشید خودادا - خزمەتگوزار

هادی خالد ئەحمەد- خزمەتگوزار

**تێبینی:**

- ئەو ناوەی ئەم نیشانەی(×) لەبەردەم دایە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئەومامۆستایە لەساڵی خوێندنی (٢٠٠٢- ٢٠٠٣) لەو قوتابخانەیە دەوام دەکات.

### مامۆستا شێخ صەفائەدین[٢٧]

صەفائەدین کوڕی شێخ محەمەد ناسراو بەکاکە شێخ کوڕی شێخ محەمەد بەهائەدین کوڕی شێخ عوسمان سراجەدینە. دایکی- خاتو سەنیە- کچی شێخ عومەر ضیائەدینە.

لە تەوێڵە لەساڵی(١٩١٨) لەدایک بووە، هەربەمناڵی لای باباحاجیو مەلا عەبدولئەحەد قورئانی خوێندووە، بۆیە لەساڵی (١٩٢٩) کەبۆ یەکەم جار دەچێتە قوتابخانە دەخرێتە پۆلی دووەمەوە. قوتابخانەی سەرەتایی هەرلەتەوێڵە تەواو دەکات.

لەساڵی (١٩٣٥)دا چووە- خانەی مامۆستایان لەبەغدا، لەبەر بچکۆلەیی بەزەحمەت وەرگیراوە. لەساڵی(١٩٣٩)دا خوێندنی تەواوکردووە. لە (١/١٠/١٩٣٩) تەعین بووەو کراوە بەمامۆستا لەقوتابخانەی بیارە، لەساڵی ئایندەدا خۆی نقلی تەوێڵە دەکات. کەئەمە یەکێك بووە لەئاواتەکانی کەببێتە مامۆستای قوتابخانەی تەوێڵەو خزمەتی هاولاَتیانی خۆیبکات.

مامۆستا لەساڵی(١٩٤١)دا دەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی تەوێڵە، تاوەکوو ساڵی(١٩٥٩) واتە بۆماوەی (١٨) ساڵ بەڕێوەبەر بوو.

جگە لەتەوێڵە لەقەمچوٚغەو هەڵەبجەو سلێمانیو ناصریەو دیالەو بەغدا مامۆستا بووە. دواساڵەکانی مامۆستایەتی لەساڵی(١٩٦٣)وەبۆ(١٩٧٠) لەبەغدا مامۆستا بووە، لە (١٩٧٠)دا خۆی خانەنشین کردووەو دەگەڕێتەوە هەڵەبجەی شەهید، هەرلەوێ دەبێت تالەکیمیابارانەکەی هەڵەبجەدا لەساڵی (١٩٨٨) لەگەڵ خەڵکی هەڵەبجەدا ئاوارەی ئێران دەبێت، پاشان دەگەڕێتەوە سلێمانیو باینجان و هەڵەبجەی تازەو دواتر لەسەرچنار جێگیر دەبێت، تالەڕۆژی شەمە (١٤/٦/١٩٩٧) کۆچی دوایی دەکات و تەرمەکەی دەبرێتەوە بۆ تەوێڵەو لەخانەقا بەخاك دەسپێرێ.

لەساڵی(١٩٤١)دا پەسەندی کچی وەستا ئیسماعیل نۆدشی هێناوەو هیواو گەلاوێژی بووەڵێ، لە(١٩٤٦) مردوە، پاشان لەساڵی (١٩٤٧) ناهدەخانی

کچی شێخ ڕەئوف ی شێخ ڕەشیدی عەبابەیلیێ دەهێنێ لەویش سێ کوڕو چوارکچی دەبێت- کوڕەکانی: سەرکەوت، هەڵکەوت، هەڵمەت،

- ماموستا زۆرجار نقلێ کراوەو دوورخراوەتەوەو زیندانی کراوە کەهەمووشی لەسەر سیاسەت و بیرو باوەڕ بووە.

- جارێکیان داوا لەپەروەردەی سلێمانی دەکات کەقوتابخانەی تەوێڵە پێویستی بەتەعمیرکردنەوە هەیە بەڵکو یارمەتی بدەن بۆ چاککردنەوەی .. پەروەردەش (٢٥) دیناری بۆ دەنێریێ، بەڵام ئەوبە (٤) دینار چاکی دەکاتەوەو باقی پارەکە دەنێرێتەوە..

- ڕۆژێکیان خۆی بەڕێوەبەری قوتابخانە دەبێت کەدێت بۆ قوتابخانە درەنگ دێت.. هۆکەشی ئیهمالی خۆی دەبێت بۆیە خۆی غائب دەدات و کیتاب دەنێرێ بۆ پەروەردە لەسلێمانی بەڕێوەبەری پەروەردە دەبینیێ، بەڕێوەبەری قوتابخانەی تەوێڵە خۆی غائیبی خۆی داوە.

- مماموستا زۆرهێمن و لەسەرخۆ بووە، دۆست و دڵسۆزی قوتابی بووە، خۆشنوس بووەو لەزمانی عەرەبیدا زۆر بەهێز بووە.

- زۆر هەولی داوە خەڵکی تەوێڵە منالەکانیان بنێرن بۆ قوتابخانە کەغائیب بوون زوو چوە بەدەمیانەوەو لێی پرسیونەتەوە. لەزستانێکدا قوتابیەك دوو ڕۆژ غائب دەبێت لەبەر بەفر ناتوانێ بێت بۆ قوتابخانە ڕۆژی سێهەم ماموستا خۆی دەچێت بەکوڵێ بیهێنێت، باوکی قوتابیەکە تەریق ئەبێتەوەو ئیتر هەموو ڕۆژێك خۆی دەیبات بۆ قوتابخانە.

ڕۆژێکیان وتی: ئاواتم بووە منالانی تەوێڵە پێبگەن، باش بوو نەمردم زۆر لەقوتابیەکانم بینی کەپێگەیشتن: وەك محەمەدی حاجی نادرو ئیسماعیل محەمەدو عەلی قادر.

لەسەردەمی ئەم دا کەبەڕێوەبەر بووە، چەند جارێك قوتابخانەی تەوێڵە یەکەمی لیوای سلێمانی بووە. بەکورتی: نمونەی ماموستای دڵسۆز بووە بۆ قوتابی و گەل و وڵات.

**مامۆستا ئیسماعیل محەمەد ڕەسول[(٢٨)]:**

لەتەوێڵە لەساڵی (١٩٢٨)دا لەدایك دەبێت لە(١/١٠/١٩٣٦) چووەتە قوتابخانەی سەرەتایی تەوێڵە، لە (١٩٥٢)دا قوتابخانە تەواو دەكات و لە(١٨/٩/١٩٥٢)دا بۆیەكەم جار لەپێنچوێن تەعین دەبێت، لە(١٩٥٣) خۆی نقڵی تەوێڵە دەكات، تاوەكو ساڵی(١٩٥٩) پاشان بۆ ماوەی یەك ساڵ دەچێتە قوتابخانەی سۆسەكان، دوایی دێتەوە تەوێڵەو دەبێتە بەڕێوەبەری قوتابخانەی هەورامان كەئەوكاتە قوتابخانەی تەوێڵە دەبێتە دوو دەوام. لەسەرسیاسەت لەساڵی(١٩٦١) گیراوە، دوایی بەردراوە، بەڵام نقڵی خوارووی عێراق (ناصریە - فوت چبابیش) دەكرێت، تاوەكو ساڵی (١٩٦٣) لەوێ مامۆستا دەبێت لە(٢٨/٣/١٩٦٣) گیراوەتەوە لەنوگرەسەلمان زیندانی دەكرێت، تالە(١٦/١١/١٩٦٤) بەردەبێت، بەڵام فەصلْ دەكرێت، تالە(١٩٦٥)دا دەگەڕێتەوە سەرخزمەت و دەنێررێتەوە بۆ ناصریە، لەپاش ساڵێك هاتووەتەوە سلێمانی بۆ قوتابخانەی سەرشەقام. لە (١٥/١٠/١٩٦٨)دا خۆی نقڵی تەوێڵە دەكاتەوەو دەبێتەوە بەبەڕێوەبەر، تاوەكوو ساڵی (١٩٨١) تەوێڵە چۆڵ دەكرێت. پاشان هاتووەتە قوتابخانەی هەرەوەز لەسلێمانی بووەتە، یاریدەدەری بەڕێوەبەر، دواتر لەقوتابخانەی هونەر لەسلێمانی یاریدەدەری بەڕێوەبەر دەبێت، تالەساڵی (١٩٩٤)دا خۆی خانەنشین دەكات، واتەدوای (٤٢)ساڵ خزمەت.

لەساڵی (١٩٩٤)وە چاوی تووشی نەخۆشی هاتووە لەوكاتەوە هیچ نابینێ لەماڵەوە بۆخۆی دانیشتووە.

مامۆستا ئیسماعیل بۆ كردنەوەی قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵە دەستێكی باڵای بووەو هەوڵێكی زۆری داوەو ماوەیەكیش بەڕێوەبەر بووە بەوەكالەت تابەڕێوەبەری ڕەسمی بۆ هاتووە.

بێگومان: ئەم جۆرە مامۆستایانە سەربازێكی نەناسراون، خزمەتێكی زۆری میللەتیان كردووە، بۆ میلەت سوتاون و منداڵی كوردیان پێگەیاندووەو فێری خوێندن و نوسین و ڕەشتی جوان و پەروەردەیان كردون.

ئەمانە تاجی سەرن و جێگەی ڕێزن هەقی خۆیانە ناویان لەبیر نەكرێ‌و لەلاپەڕەی مێژوودا ناویان تۆمار بكرێ.

**مامۆستا هۆشمەن[٢٩] :**

ناوی هۆشمەن مستەفا فەتاحە، لەساڵی(١٩٤٦ز) لەتەوێڵە لەدایك بووە، قوتابخانەی سەرەتایی لەتەوێڵە تەواو کردووە، ناوەندیو ئامادەیی لەهەڵەبجەو سلێمانی تەواو کردووە، پاشان چووەتە بەغدا- کۆلێژی پەروەردە بەشی جوگرافیای خوێندووە و لەساڵی(١٩٦٩) دەرچووەو، یەکەم تەوێڵەییەك کەبووبێتە (مودەڕیس) مامۆستا هۆشمەن بووە، وەیەکەم مودەڕیسی تەوێڵەیی بووە کەبووەتە مامۆستاو بەڕێوەبەری ناوەندیەکەی تەوێڵە. کەیەکەم تەعینی لە(١٩٧٠/١/٢) لەناوەندیەکەی تەوێڵە بووە.

مامۆستا تا(١٩٧٥/١٠/١) لەوکارەیدا لەتەوێڵە بەردەوام بووە، لەدوای نسکۆی ساڵی(١٩٧٥) کراوە بەبەڕێوەبەری ناحیەی (عەربەت، دواتر قەرەداغ پاشان سەرچنار) لەنێوان ساڵانی(١٩٨٢ تاڕاپەڕینی(١٩٩١) قائیمقامی هەریەکێك لەم شارانەبووە هەریەکەیان ماوەیەك بەڕێوەی بردون:

(کەلار، هەڵەبجە، پێنجوێن، ناوەندی سلێمانی، دەربەندیخان، کۆیە، دوکان، ڕانیە)

پاش ڕاپەڕین تا(١٩٩٢/٩/١٥) وەکیل پارێزگای سلێمانیبووە لەدوای ئەمە لەماڵی خۆی دانیشتووە.

مامۆستا لەژیانیدا، زۆرجار توشی گرتن و ئازاردان بووە، هەندێجار ماوەیەك بێسەرو شوێن بووە. بەڵام بە هۆی زیرەکیو وریاییو ئازاییو خۆگریەوە ڕزگاری بووە.

مامۆستا هۆشمەن:

وەك مامۆستایەك، کەسێکی زۆردڵسۆز بووە، بۆ قوتابخانەی تەوێڵە، ئەوبوو بەهۆی دامەزراندن و بەردەوامی ناوەندیە،کەزۆر موراعاتی ئەو مامۆستایانەی دەکرد، بەتایبەت ئەوانەی کەغەیری تەوێڵەیی بوون، تاوەکو خۆیان نقلْ نەکەن و خزمەتی قوتابیان بکەن. جگە لەوە مامۆستا خۆشی وەك مامۆستایەك وانەی دەوتەوە. هەروەها مامۆستا هۆشمەن: کەسایەتییەکی ئیداری، سیاسی، دڵسۆز لەکارەکەیدا، ئازاو بەتواناو لێهاتوو و سەرکەوتوو لەو

كارانەی كەگرتوونیەتی‌یە دەستی. مامۆستا هۆشمەن: خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێ: (قوتابخانەكانی تەوێڵە چ سەرەتایی‌و ناوەندی‌یەكەی لەو چەند ساڵەدا زۆر سەركەوتوو بون و لەپێشەوەی قوتابخانەكانی سلێمانی‌دا بوون. هۆكانیشی دەگەڕێتەوە بۆ:

- دڵسۆزی مامۆستاكان، چونكە لەپەنجاكانەوە هەموو مامۆستاكانی سەرەتایی تەوێڵەیی بوون. ناوەندیەكەشی لەدوای سی‌ساڵ كردنەوەی زۆربەیان تەوێڵەیی بوون. ئەمەش وای‌كردبوو زیاتر دڵیان بسوتێ بۆ قوتابی.

- جگە لەوەش، چونكە خەڵكی تەوێڵە بوون مۆڵەتیان وەرنەئەگرت و غیاب نەئەبوون، مەگەر بۆ ئیشێكی تایبەت بچونایە بۆشوێنێك.

- قوتابیەكانیش ئەوانەیان كەلە قوتابخانە دەمانەوە باش لێ‌بڕا بوون سەعی‌كەر بوون، زیرەك بوون. دەتوانم بڵێم ئەونەوە قوتابی‌یەی كەلەحەفتاكانەوە لەناوەندی تەوێڵە خوێندیان ئێستا هەموویان پێگەیشتوون و خاوەنی بڕوانامەو كەسایەتی‌و نمونەی كارمەندی لێهاتوون).

### پەرتوكخانەی تەوێڵە .(٣٠):

لەم سەردەمەدا بوونی پەرتوكخانەی گشتی‌و تایبەتی پێویستیەكی شارستانی‌یە تاوەكو ڕۆشنبیران بتوانن سودی لێوەربگرن و خۆیانی پێ ڕۆشنبیر بكەن..

لەسەردەمەكانی كۆن دا پەرتوكخانە كەم بووە، ئەوەشی كەبووە زیاتر تایبەت بووە بەتاكەوە (فەردەوە) بەلاّم هەندێ كەسایەتی پەرتوكخانەیان بووە، خەڵكانی دەوروبەری وەك پەرتوكخانەی گشتی سودیان لێوەرگرتوون.

لە تەوێڵەدا بەهۆی ئەوەی خوێندەواری زۆری تیابووە، گەلێك زاناو ڕۆشنبیر، بۆخۆیان پەرتوكیان كۆ كردوەتەوە لەناو صندوق و تاقەكان دا وەریان گرتوون و سودیان لێوەرگرتوون، بەلاّم دەتوانین بڵێین: ئەو پەرتوكخانانەی كەوەك گشتی بوون و خەڵكی سودی لێ وەرگرتوون، ئەمانەی خوارەوەبوون:

- **پەرتوكخانەی مزگەوتەكان**

- كەهەرمزگەوتێك كۆمەڵێك قورئان و چەند كتێبێكی ئاینی‌یان تیابوو، بەتایبەت مزگەوتی گەورەو خوێندنگا (مەدرەسە)كەی، تاساڵی (١٩٨١) گەلێك كتێبی نایابی دەست خەتی تیابوو، بەلاّم لەدوای چۆڵ كردن نەمانزانی چیان

لێهات- تەنانەت لەدوای ڕاپەڕین کەچووینەوە لەتاق و پەنجەرەکانی مزگەوتەکەدا چەند کتێبێک لەوێ بوون خراپ بوو بوون و لاپەڕەکان ڕەش هەڵگەڕا بوون هیچیان لێ نەئەخوێنرایەوە.

- **پەرتوکخانەی حوجرەی مەلانەزیر:**

ئەم پەرتوکخانە لەحوجرەکەی مەلانەزیر بووە، دوایی بەقاپی شێخ ناسراوە، هەرچەندە تایبەت بوو بەخودی مامۆستا مەلانەزیرەوە، بەڵام وەك پەرتوکخانەیەکی گشتی سودی لێبینراوە، دوای مەلانەزیریش زۆرێك لەکتێبەکان کەوتنەلای م. مەلاصاحب و بنەماڵەکەیان.

- **پەرتوکخانەی خانەقا:**

ئەم پەرتوکخانەیە هەرلەسەردەمی شێخ عوسمانی گەورەدا کتێبی بۆ کراوەتەوە تاسەردەمی شێخ حیسامەدین، لەدوای ئەویش هەرلەخانەقاکەی تەوێڵەدا پارێزراو بوون و خەلیفە مەحمود کەکلیلی خانەقاو پەرتوکخانەکەی بەدەستەوە بوو نەیدەهێشت بفەوتێن.. بەڵام جارجارە کەس و کارو بنەماڵەی شێخان خۆیان دانە دانە لەکتێبەکانیان دەبرد بۆ خوێندنەوە بەتایبەت برێکیان بران بۆبیارەو باخەکۆن و بۆ خانەقاکانی ئەوێ.

لەم سالأنەی دوایی م. شێخ صەفائەدین و شێخ محەمەد ئەمین کەلەتەوێڵەدا مامۆستا بوون، سودیان لەم پەرتوکخانە زیاتر وەرگرت لەساڵی (١٩٧٢ یا ١٩٧٣) لیژنەیەك لەئەوقافی سلێمانییەوە هاتن بۆ تەوێڵە، زۆربەی ئەو کتێبانەی کەمابوون لەخانەقاکەی تەوێڵە کڕینیان بۆ کتێبخانەکەی ئەوقافی سلێمانی.. ئەوانیتر لەدوای ساڵی (١٩٨١) نەمانزانی چیان لێهات لەوانەیە لەلای بنەماڵەی شێخ ئەحمەدەوە. - شێخ عەبدوڕەحمان و شێخ عەلییەوە - بن.

- **پەرتوکخانەی (کوردستان)** [٣١]:

ئەم پەرتوکخانەیە لەساڵی(١٩٧٢) لەلایەن مامۆستایان و قوتابیانی تەوێڵەوە کرایەوە، یەکیەتی قوتابیانی کوردستان، ڕۆڵێکی باشیان بینی بۆ کردنەوەیو سەرپەرشتی کردنی وەلەژێر چاودێریو سەرپەرشتی مامۆستا بارام سەعدیدا بوو. مامۆستایانی تەوێڵە بەتایبەت مامۆستایانی ناوەندیەکە بەچەندەها کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامە هاوکاریان کرد، هەروەها هاوکاری فەتاح ئاغاو صالح بەداوی لەکردنەوەی کتێبخانەکەو هاوکاری مادیو پەرتوك دا ڕۆڵێکی بەرچاویان بووە کەئەوکاتە دەسەلأتداری ناوچەکەبوون.

ئەم پەرتوکخانەیە لەخانوەکەی حاجی‌حامددا بوو لەپشت دوکانەکانی (شێخ)ەوە لەدامێنی بەشی بەرامبەر.. ئەم کتێبخانەیە سودی زۆری هەبوو، بەڕاستی ڕۆڵی مامۆستایارام لەکردنەوەو سەرپەرشتی و هاندانی قوتابیان بۆ خوێندنەوەو سەردانی ئەم پەرتوکخانەیە ڕۆڵێکی بەرچاوو گرنگی بووە.

حەمەصالح مستەفا حەمەصالح -یەکەم پاسەوانی قوتابخانەی تەوێڵە بووە- عارفی عیزەت چاپچی‌ئەم وێنە لەزەماوەندی حەمەکەریم حەمەسەعید قالە گیراوە - ١٩٣٧

لەدوای نسکۆی (١٩٧٥) ئەم پەرتوکخانەیە، داخراو کتێبەکانی کۆکرانەوەو نزیکەی(١٥) صندوق بوون لەقوتابخانەی ناوەندی تەوێڵەوەرگیران، بەلاّم لەچۆڵ کردنەکەدا کتێبەکان فەوتان و نەزانرا ئەم کتێبانە کەوتنە کوێ.

قوتابخانەی سەرەتایی تەوێڵە - دوای ڕاپەڕین دروستکراوەتەوە

قوتابخانەی ناوەندی تەوێڵە - دوای ڕاپەڕین دروستکراوەتەوە

ماموستایانی قوتابخانەی سەرەتایی تەوێڵە ۱۹۷۸/٤/۱ لەراستەوە بۆ چەپ - دانیشتووەکان: جەزا حەمە صالح، سەعدی حەمە عەزیز (راهێنەر)، محەمەد عەبدورەحمان، ئیسماعیل محەمەد رەسوڵ (بەڕێوەبەر)، حامد عومەر. راوەستاوەکان: مەعصوم عەلی، کەریم محەمەد، خالد (کەبەخاڵە ناسراوە) - چونکە یەکی نیسان بوو وتبویان پێی ماموستا ئیسماعیل ئیشی پێتە کەهاتبوو زانیبوی گاڵتەی پی دەکەن وتبوی دەبی منیش رەسم بگرم لەگەڵتان-، حەمەشەریف حەمەرەشید، مەحمود عارف، عەبدولخالق بابالە، کەمال ئەسکەندەر، عەبدورەزاق عەبدورەحمان (راهێنەر).

لەراستەوە بۆ چەپ/ حەیدەر محەمەد، سلێمان فەتح الله، نافعەدین نیزامەدین (هەرسێکیان خزمەتگوزار).
حەمەشەریف حەمەرەشید، ئەبوبەکر ئیسماعیل (هەردوکیان ماموستای قوتابخانەی تەوێڵە).
سەعدی حەمە عەزیز، عەبدورەزاق عەبدورەحمان (هەردوکیان راهێنەر لەقوتابخانەی تەوێڵە).
کورە بچکۆلەکەش کۆسالان ئەبوبەکر

قوتابیانی پۆلی شەشەمی سەرەتایی و چەند مامۆستایەکی
قوتابخانەی تەوێڵە – ١٩٧٨

قوتابیانی پۆلی چوارەمی سەرەتایی و چەند مامۆستایەکی
قوتابخانەی تەوێڵە - ١٩٧٨

سەیرانی قوتابیانی ناوەندی تەوێڵەو چەند مامۆستایەك
بەیدەری - ۱۹۷۲

قوتابیانی پۆلی یەکەمی ناوەندی تەوێڵەو چەند مامۆستایەك - ۱۹۷٦/۲/۳

قوتابیانی پۆلی دووەمی ناوەندی تەوێڵەو چەند ماموستایەك – ١٩٧٧/١٢/٢٥

قوتابیانی پۆلی سێهەمی ناوەندی تەوێڵەو چەند ماموستایەك – ١٩٧٧

## پەراوێزەکان

[١] سلێمانی شارە گەشاوەکەم - جەمال بابان ل(١٤١)

[٢] بنەماڵەی زانیاران- مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس- ل( ٤٠٩)

[٣] بنەماڵەی زانیاران- مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس- ل(٤١٨)

[٤] یادی مەردان- مەلاعەبدولکەریمی مودەڕیس- ل(٧٧)

[٥] لەو وەفادارانە:

مامۆستا (شێخ صەفائەدین، محەمەدی حاجی نادر، عوسمان حەمەصاڵح هەورامی) هەروەها من (عەبدوڕەزاق - نوسەر) لەساڵی(١٩٨٧- ١٩٩١) لەئێران سەردانی چەندمەلایەکم کرد لە(پاوە، خانەگا، جوانڕۆ، ڕەوانسەر، سنە، بێساران، مەریوان) هەریەکەیان ئەمەیان دەوت بەتەعبیری جیاواز.

[٦] مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی پەڕاوێکی بەناوی بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد- لەڕێگەی دەستخەتەکانەوە دەرکردوە تائێستا چواربەرگی دەرچووە. بۆناوی ئەم مەدرەسانە سەیری بەرگی یەکەم چاپی یەکەم ساڵی ١٩٩٨ چاپخانەی (ومیض) ل (٨٨- ١٠٧)

[٧] بوژانەوەی مێژووی زانایانی کورد- لەڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە- بەرگی سێهەم چاپی یەکەم ساڵی ٢٠٠٠- ل ١٦٧ محەمەد عەلی قەرەداغی بۆ زیاتر زانیاری سەیری ئەم کتێبەبکە شتێك لەسەری هەیە یەکێك لەو(١٤)ە ئاگاداردەبێت.

[٨] بوژانەوەی مێژووی زانایانی کورد- لەڕێگەی دەسخەتەکانیانەوە- بەرگی یەکەم- ل ٩٢- محەمەد عەلی قەرەداغی.

[٩] لەبوژانەوەی مێژووی زانایانی کورد- لەڕێگەی دەستخەتەکانەوە.

هەندێ دەستخەتی‌تر هەیە بەپێویستی‌دەزانم کەئاماژەی پێبکەم:

- قورئانەکەی مەلاحامد مەلا عەبدولحەکیم.. پێشترباسمانکرد لەژیاننامەی بنەماڵەی مەلا عەبدولحەکیم دا- بەرگی‌دووەم ل (١٩)

- الرسالة الوضعية- عەبدولموئمینی کوڕی شێخ شەمسەدین ساڵی ١١٠٧ك لەتەوێڵە نوسیویەتیەوە لە(دار صدام للمخطوطات) بەژمارە (١٢٧٠٢)، بەرگی دووەم ل٢٤.

- نامیلکەی عیلم لەعەقائیدا دەستی تەماعی (...) لەکۆمەڵە دەستخەتێکی دەرهێناوە. ساڵی ١٢٩٠ك لە تەوێڵە نوسراوەتەوە، بەرگی‌دووەم ل ٢٥.

– کۆمەڵە دانراوێکی هەمەدانی ساڵی(٩٨٣) لەگوندی تەوێڵە نوسراوەتەوە– دار صدام للمخطوطات– ژ ١٩٣٦٣. بەرگی دووەم ل ٢٤.
– غاية الاختصار: فقه. عەبدولعەزیمی کوڕی مەلامەحمودی سەروابادی لەگوندی تەوێڵە ساڵی (١٢٦٣) نوسیویەتیەوە. بەرگی سێهەم ل ١٢.

(١٠) ئەم چوار مامۆستایەی دوایی‌یان مەلاعەبدوڕەحمانی مەلاعەبدوالله لەمزگەوتی بابا ئەسکەندەر لەساڵەکانی (١٩٦٠ بۆ١٩٧٠) دەوری باشی هەبوو لەم بوارەدا. مامۆستا مەلاجەمیلیش لەهەمان کاتدا لەمزگەوتی (کاك عەلی فەیرۆز) بوو ڕۆڵی گرنگی بینی‌و بەڵکو قوتابی‌یەکی زۆری فێری قورئان خوێندن کرد، ساڵی واهەبوو زیاتر لە(٥٠) قوتابی بووە، جگەلە قورئان، منالانی‌فێری هەندێ کتێبی کوردی دەکرد وەك: مەولود نامەو معراجنامەو وەفاتنامە ئالەوکاتەدا ئەو نامیلکانە بۆ قوتابیانی سەرەتایی زۆر باش بوون، چونکە پێشی دەنوسینەوە بۆ خوێندنەوەی کوردی‌و ڕێنوسی کوردی باش بوون.
– هەروەها مامۆستا سەید عەبدوڕەحمان و سەید ڕەشاد لەمزگەوتی باساکاو مزگەوتی گەورەدا ڕۆڵێکی باشیان بینیووە.

(١١) دایکی مامۆستا (مەحیەدینە) کەقورئان گوڵستان و ڕۆڵە بزانی‌و ئقبالنامەی لەساڵی چلەکاندا لەلای خوێندوە.

(١٢) بۆناوی ئەم مامۆستا ئافرەتانە سودم وەرگرتەوە لە:
حاجی‌سەید محەمەد، وەستا محەمەدی حاجی حەمەصاڵح، مەلا حەمەئەمین مەلا عەبدوالله، مەلاعەبدولکەریم ئەحمەد موعین، مامۆستا مەحیەدین حاجی‌سەلیم..)

(١٣) لەسەر قسەی مامۆستا(محەمەدی حاجی نادر، هۆشمەن مستەفا، مەحیەدین حاجی‌سەلیم، حسێن محەمەد غەفور، عەزیز جەعفەر).

(١٤) لەمامۆستا محەمەد مەعروف مەلاعەبدوالله‌ی مەریوانی‌یم بیستووە.

(١٥) سەیری ناوی قوتابیان لەکوڕان و کچان بکە لەلیستەکەدا ناوی منالانی خۆی لەپێشەوەیە کەئامادە بوون بۆ خوێندن. وەك لەمێژووی هەورامان دا م.هەورامانی دەڵێ: ئافراسیاوبەگیش ئەرزی باخی خۆی لەدەرەی تەکیەی دا بەدەوڵەت بۆ قوتابخانەی بیارە وەجەمیل بەگ و یار ئەحمەدبەگیشی ناردنە قوتابخانە.

(١٦) سودم لەدیوانەکەی وەرگرتووە.

(١٧) ئەم هۆنراوەیە دوو دێڕی یەکەمی لەدیوانەکەی‌دا هەیە ل(٥٤١)، بەڵام من ئەوەش و دێڕەکەی‌تری لەدەمی‌مامۆستا عەلی قادرئاغاوە وەرم گرتووە، بێگومان زۆرێك لەقوتابیەکانی ئەوکاتەی کەئێستا ماون ئەم هۆنراوەیەیان لەبەرە.

[١٨] بۆ ئەم ناوانە سود وەرگیراوە لەوسجلەی کەلەقوتابخانەی سەرەتایی تەوێڵەدا هەیە.. ئەوەیجێگەی تێبینییە ئەوەیە سجلە ئەصڵییەکەی یەکەمجار لەساڵی(١٩٣٦)دا کەلافاو هاتووە قوتابخانەکەی بردووە ئەو سجلەش نەماوە.. دوایی شێخ(صفائەدین) کەدەبێت بەمدیری قوتابخانەکە سجلەکە دروست دەکاتەوەو ناوەکان تۆمار دەکات.. ئەمەش جێگەی ڕێزە. لێرەدا جێگەی خۆیەتی کەسوپاسێکی زۆری بەڕێوەبەری قوتابخانەکانی تەوێڵە لەساڵی (١٩٨١)دا بکرێت کەنەیان هێشت(مومتەلەکات)ی قوتابخانەکان لەناوبچن بەهۆی شەڕی عێراق و ئێرانەوە.

[١٩] سودم وەرگرتووە لەم بەڕێزانەی خوارەوە:

قەتحە حاجیحەسەن، نافعە حاجیحەسەن، عەلی قادرئاغا، محەمەدی نادر، حسێن محەمەد غەفور، ئیسماعیل محەمەد ڕەسوڵ.

[٢٠] بۆ وەرگرتنی ئەم ناوانە سودوەرگیراوە لەیەکەم سجلی ناوەندی قوتابخانەی تەوێڵە کە(م. نازم غەفور محەمەد) لەوکاتەدا بەڕێوەبەری ناوەندیەکە بووە هاوکاری کردین.. دواتریش بۆ لیستی ناوی مامۆستاکان و ژمارەی قوتابییەکان هاوکاری کردوین. زۆر سوپاسی دەکەین.

[٢١] لە (م. بارام سەعدی) و (م. عەلی قادر و چەندمامۆستایەکیترەوە) بیستومە.

[٢٢] بۆ نموونە بەندە (عەبدوڕەزاق- نوسەر) ئەو هەموو کێشەو دەردی سەریانەی داخستنی قوتابخانەی چەشتووە، (١٠) ساڵ فێراری سەربازی بووم، چوارساڵیش لەخوێندن دواکەوتووم.

[٢٣] سجلی قوتابخانەی هەورامانمان دەست نەکەوت بزانین ئەویش ئەخیر کەس کێ بووە، هەروەها هەرچەندە قوتابخانەی کچانیش هەبووە، بەڵام چەند کچێکیش لەپۆلی شەشدا بوون لەگەڵ کوڕاندا تێکەڵ بوون.

٢٤) مامۆستا محەمەد نادر چەند لاپەڕەیەك زانیاری بۆ نوسیوین دەربارەی تەوێڵەو ئەمەش لەوەوە وەرگیراوە. بەڵام لەژمارەی قوتابیانی کوڕان دا (٥١٢)ی نوسیووە قەناعەتم بەو ژمارە نەبوو بۆیە بەبۆچوونی خۆم کردمە(٢١٢) قوتابی.

[٢٥] بۆ ئەم لیستی ناوانە دوو تێبینی پێویستە:

- ساڵی(١٩٨١) چونکە گۆڕانکاریەکی زۆری هێناوە بەسەر ناوچەکەدا، پێمان باش بوو تائەو ساڵە ناوەکان بنوسین چونکە لەدوای ئەو ساڵەوە مامۆستامان زۆرە نەمان توانی ئەوانی تریش بنوسین.

- ئەم مامۆستایانە کەناویان نوسراوە، نیوەی یەکەمیان تاساڵی ١٩٨١ خزمەتی مامۆستاییان بەزۆری لەتەوێڵە بووە بەڵام لەدوای(١٩٨١) بەدەگمەن چونەتەوە

تەوێڵە، نیوەی دووەم خزمەتیان لەتەوێڵە کەمە مەگەر هەندێکیان لەدوای ڕاپەڕینەوە چوینەوە بۆ تەوێڵە، بەڵکو لەغەیری تەوێڵەن بەزۆری لەهەڵەبجەو سلێمانین.

(٢٦) مامۆستای تریش زۆر بوون لەتەوێڵە کەخەڵکی شوێنی تربوون، بەلاّم چونکە کەم ماونەتەوەو ناوی هەموومان دەست نەکەوت وە تەوێڵەییش نەبوون بۆیە نەمان نوسین.

(٢٧) بۆ ژیانی سودم وەرگرتووە لەمامۆستا نەزیف باباحاجیو، کاك(پێشڕەو جەمیل)ی کچەزای، هەروەها خۆشم (عەبدوڕەزاق) گفتو گۆیەکم بووە لەگەڵیداو چوومە خزمەتی.

(٢٨) لەدەمی مامۆستاخۆی وەرگیراوە لە(١٩٩٨/٧/٢٥)و(١٩٩٨/١١/٢).

(٢٩) لەڕۆژی (٢٠٠٢/١٢/٢٧) چاوپێکەوتنێکم لەگەڵدا کردوو ئەم زانیاریانەو وەلاّمی گەڵێ پرسیاری ترم لێوەرگرتووە...

(٣٠) سودم وەرگرتووە لە م. عوسمان حەمەصالح، م. محەمەدحاجی نادر، شێخ صەفائەدین، مەلاکامل حاجیمامۆستا..

(٣١) سودم وەرگرتووە لە م. بارام، م. هۆشمەن، م. مەحیەدین.

# تەوێڵە لەبواری کۆمەڵایەتی یەوە

* پەیوەندی یە کۆمەڵایەتی یەکان
* تیرەو خێڵایەتی
* هۆزو تیرەو بنەماڵەکانی تەوێڵە
* ناوی هۆزو تیرەو بنەماڵەکان
* کوێخاو ئەنجومەنەکان
* هەندێ نەریت و باوی گونجاوو باش:
  - گەلکاری
  - گزی بارەکلە
  - میوانداری
  - بەخشانە
* بۆنەکان:
  - بۆنە ئایینی یەکان
  - بۆنە کۆمەڵایەتی یەکان
  - بۆنە نیشتمانی و نەتەوایەتی و ئەوانی تر.
* ئەو شتانەی جارجارە کێشەیان دروستکردووە:
  - لەوەڕگا
  - ئۆباو
  - بەفرماڵین
* چەند دیاردەیەکە نابەجێ:
  - سوێند خواردن بەتەلاق
  - عارەق خواردن و قومار کردن
  - وەك دەگێڕنەوە...
* ئەو ئەهامەتی یانەی کەتووشی تەوێڵەیی و تەوێڵە بوون:
  - گرانی و برسیەتی
  - ئەخۆشی
  - لافاو
  - پێشێلکاری
  - شەڕی عێراق و ئێران
* تەوێڵەیی لەشارەکانی تری عێراق
* لیستێك ناوی مردوانی خەڵکی تەوێڵە
* هەندێك لەکەسایەتی یە ناودارەکانی تەوێڵە
* پەراوێزەکان

# تەوێڵە لەبواری کۆمەڵایەتییەوە

**باری کۆمەڵایەتی:**

بێگومان بوارەکان کاریگەریان هەیە لەسەر یەکتر، بۆیە باری کۆمەڵایەتی پەیوەندیو کاریگەری‌یەکی بەهێزی هەیە لەگەڵ باری ئابوریو ئایینی و ڕامیاری و ڕۆشنبیری‌دا.

باری کۆمەڵایەتی تەوێڵە، جیا نی‌یە لەگەڵ باری کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کوردی‌دا، تەنها ئەوەندە هەیە ئەو شتانەی کەپەیوەندی‌یان هەیە بەمەوە، ڕێژەیین، لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازی هەیە.

لێرەدا ئاماژە بەچەند شتێك دەکەین لەم بوارەدا، کەبریتین لەمانەی خوارەوە:

**پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەناو تەوێڵەیی‌یەکان:**

پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەناو تەوێڵەیی‌یەکان خۆیاندا، باشەو بەپێی پێویست دەچن بەدەم یەکترەوە، لەبۆنەکاندا یەکتر بەسەر دەکەنەوە، لەکێشە کۆمەڵایەتی‌یەکاندا هاوکاری یەکتر دەکەن. تێکەڵاوی‌وپەیوەندی خێزانەکان لەناو خەڵکی ماڵیدەردا، زیاترە تاوەکو خەڵکی چلانە، وبەرامبەر چەك و تەقەمەنی – چ تفەنگ و چ خەنجەر – لەتەوێڵە کەم بووەو کەم هەیە.

تەوێڵەیی شەڕەنگێز نین و – مسالمن– ئەگەر شەڕێکیش ڕوو بدات لەناویاندا ناهێڵن تەشەنە بکات و درێژە بکێشێ و بگاتە ڕادەی کوشتن و ئاوارە بوونی یەکتر، هەوڵیش دراوە کێشەکان ببرێنە لای مەلاو بەپێی شەرع چارەسەر بکرێن. ڕۆحی تۆڵە سەندنەوەیان تیا نی‌یەو لێبوردەیی زیاتر زاڵە بەسەریاندا. دەمارگیری تیرەو خێلایەتی و شەڕی عەشایەری زۆر کەمە. وەك تەوێڵەیی ڕێزو ئیحترام هەیە لەناویاندا.

پەیوەندی کۆمەڵایەتی تەوێڵەیی لەگەڵ گوندەکانی دراوسێشیاندا، بەگشتی باشە، کێشە کۆمەڵایەتی‌یەکانی نێوان گوندەکانی کوردستان، لێرە دووبارە نەبوونەتەوە، ئەگەر سەردەمێکیش شتێکی بچوکی وا بوو بێت، لەبیستەکانەوە ئەوەش نەماوەو، پەیوەندی بازرگانی‌یان بەهێزەو لەهەموو سەردەمێکدا لەیەك نەپچراون، بەتایبەت لەگەڵ لادێکانی ئێران دا، شۆشمێو نەوسودو دزاوەرو هەورامانی تەخت و هانە گەرمڵەو کەیمنەو بێرواس دا.

ژن و ژنخوازی کەمێك هەیە لەگەڵیاندا، ئەویش لەگەڵ خەڵکی دزاوەردا، ئەوانی تر دەگمەنە. خەڵکی دزاوەر بەهۆی باخەکان و لەوەڕگاو جارەلۆ وەزیاتر تێکەڵاوی هەیە.

هەروەها پەیوەندی‌یان لەگەڵ سۆسەکان و پالانیاو بەڵخەو دەگاشێخان و ناحیەی بیارەشدا زۆرباشەو کێشەو گیروگرفتیان نیەو بەتایبەت سۆسەکان و وەك بەشێکی تەوێڵە سەیرکراوەو زۆر بەدەم یەکترەوەن.

**تیرەو خێڵایەتی:**

ئەگەر چاوێك بەمەسەلەی خێڵگەرایی تەوێڵەدا بگێڕین و بەراوردێکی بکەین لەگەڵ تیرەو هۆزایەتی کۆمەڵی کوردەواری‌دا، دەبینین ئەم مەسەلەیە لەناو هەورامان دا، بەتایبەت لەتەوێڵەدا، زۆر لاوازەو، خێڵایەتی نەبووەتە کۆسپێك لەبەردەم پێشکەوتنی ناوچەکەدا، ئەوەندە لەدەوری زاناو شێخ و پیشەکانداو، ئێستاش لەدەوری ڕێکخراوەو ئینتیمای فکری‌و سیاسی‌دا کۆبونەتەوە لەدەوری ئینتمای خێڵ دا کۆنەبونەتەوە، بەڵکو زۆرێك لەتیرەکانیش هەر لەسەر بناغەی ئیش و کارو پیشەکانیان وەك ڕێکخراوەیەکی ناڕاستەوخۆ ناویان دەرکردووە، بۆ نمونە:

تیرەی شێخەکان (نەقشبەندی‌یەکان) - بەڕێبازی تەصەوفەوە خەریك بوون.

تیرەی مەلایان - بەزانستە شەرعیەکانەوە خەریك بوون و مەلایەتی‌یان کردووە.

تیرەی سەیدەکان - لەخزمەتی ئیسلام دا بوون لایەنی ڕۆحی خەڵکەکەیان بەهێز کردووە.

تیرەی وەستایان - ئاسنگەر بوون و وەستای چەقۆو زەنگن و پاچ و ئەوانە بوون.

تیرەی خادمی‌یەکان - خزمەتی مزگەوتیان کردووە.

تیرەی بەگزادەکان - دەسەڵاتداربوون و کاری سیاسی‌یان ئەنجام داوە.

تیرەی ئاغەلەری - وەك - ئاغا - لەبەڕێوە بردندا دەسەڵاتیان بووە.

تیرەی یاقوەسوری - کوێخاو ناودار بوون.

تیرەی سەید ئەحمەدی - کلاشکەر بوون.

تیرەی کۆزادی - جۆلاو هەلاج بوون.

تیرەی گەڕایی - زیرەك و قسە زان و وریا بوون.

تیرەی علیان - بازرگان و کاسپ بوون.
تیرەی عەزیز دەلاك - دەلاك و جەڕاح بوون.
تیرەی کەندەسمەیی - خەریکی کان و بەردو بناغەی خانوو هەڵکەندن بوون.
تیرەی بوڵینە - ئاسنگەرو دارتاش بوون.
تیرەی هاڵەکۆکی - کۆك و تەباو پشتیوانی یەکتر بوون.
تیرەی چاوشی - چاودێرو بەدەسەڵات بوون.
تیرەی خەیاتان - بەرگدروو بوون ... تاد.

بەم شێوەیە:
لەتەوێڵەدا، خێڵایەتی ئەوەندە خوێنراوەتەوە کەئیجابی بووبێ، گەورەو بچوکی پارێزراوە، نەسەب زانراوەو، بەشێوەیەکی سلبی کاری نەکردووەتە سەر کۆمەڵگا، بەو شێوەیە نی‌یە سەرۆك تیرە بەرەو هەر لایەك بڕوات ئەمانیش مل بنێن. هەر بۆیەش هەموو حیزبەکان لەتەوێڵەدا ئەندام و هەواداریان هەیە، هەر یەکێك بۆ خۆی سەربەست و ئازادە، چ فکرەو ئینتیمایەك هەڵئەبژێرێ لەلایەن تیرەو هۆزەوە فشاری لەسەر نی‌یە.
حکومەتی بەعس زۆر هەوڵی‌دا کەتەوێڵەیی لەژێر دەسەڵاتی مستەشارو خێڵ دا کۆبکاتەوەو بەکاری بێنێ، بەڵام بۆی کۆنەکرایەوە.

بەکورتە:
دیاردە سلبی‌یەکان لەتەوێڵە زۆر کەمن وەك: چینایەتی، شەڕو کوشتاری ناوخۆ، کێشە خێزانی‌یەکان لەهاوسەرگیری‌دا، ئینتیماو دەمارگیری عەشایەری... هتد، هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ :
- باری ئابوری: ئابوری پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بەدیاردە کۆمەڵایەتی‌یەکانەوە، چونکە بەگشتی ئابوری‌یەکە باش بووە، وای نەکردووە لەخەڵکی چینایەتی دروست بکات، بەناوی ئاغاو مسکێن یا شێخ و بۆرەپیاو. بێگومان بواری جوگرافی ڕۆڵی گرنگی بینیوە لەمەدا، کەدەرەبەگی سەرمایەدار دروست نەبێت لەناوچەکەدا.
-باری ڕۆشنبیری: بەبۆنەی‌مزگەوت و خانەقاو قوتابخانەوە،خەڵکەکەی ڕۆشنبیری‌و هۆشیاری‌یەکی بووە.
- باری سیاسی: ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەسەڵاتەی کەلە تەوێڵەدا بووە.

وادەردەکەوێ ئەو دەسەڵاتەی کەبووە لەسەردەمی کۆن و نوێدا، ستەمێکی وانەبووە، کەکاریگەری وابکات چینایەتی و شەڕی ناوخۆ دروست بکات. ئەو ئاغاو بەگیەی کەبووە، هەم خۆشیان ستەمی وایان نەکردووە، هەم خەڵکەکەش هۆشیار بوون و بواریان نەداوەو بەرامبەری وەستاون. جگە لەمەش یەك دەسەلات نەبووە تاوەکوو دکتاتۆرییەکی ڕەها -مطلق- دروست ببێت، چونکە لەگەڵ بوونی دەسەڵاتی بەگدا دەسەڵاتی شێخیش بووە.

- بوونی تەصەوف: ئەمەش بۆخۆی قوتابخانەیەکی پەروەردەیی ڕۆحی بووە، نەیهێشتووە ستەمێکی وا لەیەکتری بکەن، هەمیشە شێخ و موریدەکان، قیامەت و دواڕۆژیان بیری خەڵکی خستووەتەوە تاوەکو بەهێمنی و ئارامی بژین و تەبابن و پێکەوە بژین.

### هۆزو تیرەو بنەماڵەکانی تەوێڵە:

خوای گەورە لەسورەتی (الحُجُرات)دا ئایەتی (١٣) دەفەرموێ:

(يأأيها النّاسُ إنّا خَلَقْناكُم منْ ذَكَرٍ وأُنثى وَجَعَلْناكُم شُعُوباً وَقَبائِلَ لِتَعارَفوا إنَّ أكرَمَكُم عنْدَ الله أتْقاكُم إنَّ اللهَ عَليمٌ خَبير.)

واتە: ئەی خەڵکینە، بێگومان ئێمە هەمووتانمان لەنێرو مێیەك دروستکردووە - کەباوکە ئادەم و دایکە حەوایە-و کردومانن بەچەند گەل و هۆزو تیرەی جۆربەجۆر، تایەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە ... بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کەزۆرتر لەخوا ترسەو فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایە بەهەمووان.. (تەفسیری ئاسان ل٥١٧)

حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەی دەڵێ:

لا تَقُل أصلي وَفَصلي أبداً — إنّما أصل الفتى ماقد حَصَل
إنَّ الفَتى مَن يَقولُ ها أنا ذا — لَيسَ الفَتى مَن يَقولُ كانَ أبي
كُنْ إبنُ مَن شئتَ وَاكتَسِب أدَباً — يُغنيكَ مَحمُودُهُ عَن النَّسَبِ

پیرەمێرد دەڵێ:

نەپایەو پارە، نەڕیشەو ڕەگەز — نەجوای ڕووکەش، نەبەرگ و مەرەز
یەک تۆز لەنرخی،هیچ کەس زیادناکات — کەمرۆڤ نەیبێ، خۆی نرخێکی بەرز

پێشینان وتوویانە:

خۆت هەڵمەکێشە بەباوو باپیر — مەڵێ باوکی من پاشا بوو یامیر

سەرەتا پێش نووسینی ڕشتەی ئەم بنەماڵانە دەپرسین: ئەم نوسینە قورس و زەحمەتە بۆ؟ لەوەڵام دا دەڵێین: جارێ مەبەستمان لەنوسینەکە ئەوەیە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە سوودی لێ وەربگرین نەك زیندوو کردنەوەی ڕۆحی عەشایری و تیرەو خێڵگەرایەتی، پاشان دەڵێین:

بەگشتی زانینی ڕشتەی بنەماڵە بۆخۆی شتێکی باشەو مرۆڤ پێشینانی خۆی بزانێ خراپ نیەو بەتایبەت لەزانستی کۆمەڵناسیدا گرنگییەکی خۆی هەیە، بەتایبەت تر بۆ توێژەرە کۆمەڵایەتییەکان کارئاسانییەو سوودی زۆری لێوەردەگرن. بۆچی هەر بنەماڵە گەورەو دەسەلاتدارەکان ڕشتەکەیان دەنوسرێو گرنگی پێدەدرێ، بابنەماڵەکانی تری کۆمەڵگاش ڕشتەکەیان تۆمار بکرێ.

لەلایەکی تریشەوە: خەڵکی تەوێڵە ئەوسا هەموو بەیەکەوە بوون و کۆو جەم بوون و سنوور نەبووە لەنێوان ناوچەکان داو خەڵکەکە ئازاد بوون و ئەو هەموو خەڵکە لەدەوروبەرەوە هاتوون لەتەوێڵەدا نیشتەجێ بوون، بەلام بەهۆی شەڕی نەگریسەوە لەساڵی (١٩٨١) ئەو هەموو خەڵکە، کەبەچەند نەوە کۆبوونەوە پرژو بلاو بونەوەو، لەدوای ڕاپەڕینیش زوربەی لەسلێمانی و هەڵەبجەی شەهیدو هەڵەبجەی تازە ماونەتەوەو کەمێکیان چوونەتەوە تەوێڵە.

ئەمانەی ئەم شارانە بەهۆی مانەوەیان و بەهۆی ژن و ژنخوازییان لەگەڵ تیرەو هۆزەکانی تری کورددا، لەوانەیە دوای چەند ساڵێکی تر نەوەی زۆریان هەم زاراوەی هەورامیان لەبیر بچێتەوە، هەم ڕشتەی بنەماڵەو ئەصلی زێدەکەیان نەزانن کێیەو کوێیە...!!، بەم نوسینی ڕشتەیە ئەو نەوانەی ئێستاو ئایندە دەزانن ئەصڵ و زێدیان کێیەو کوێیە، ئەمەش دەمێنێتەوەو مێژوویەکیشە بۆ نەوەکانی داهاتوو.

لەڕۆژگارەکانی مێژوودا، زۆر بەسەرهات و ڕووداو بووە، چونکە نەنوسراونەتەوەو سەرچاوەیەك نەبووەو تۆمار نەکراون ئێستا دەنگ و باسیان نازانین و شتەکان ون بوون و لەناوچوون.

ئەمە مێژووە، گەلێك مێژووی خۆی نەزانێت و تۆماری نەکات نازانێ هەنگاو بنێو قەوارەی نەتەوایەتی خۆی لەدەست دەدات.

هۆزو تیرەو بنەماڵەکانی تەوێڵە چوون بەناو یەکداو ئاوێتە بوون لەناو خۆیاندا، هەربۆیەش تیرەو تایەفەگەری لەتەوێڵەدا زۆر ناخوێنرێتەوەو دەست نیشانکردنیان زەحمەتەو ماندوو بونێکی زۆری ویستووەو، لق و پۆپی زۆریان لێبووەتەوەو، لەناو تەوێڵەییدا باوەو دەڵێن: تەوێڵە بێگانەی تیا نیە..

ئەمەڕاستە، بەم ڕشتەی بنەماڵانەدا دەردەکەوێت بێگانەی تیا نی‌یەو هەموو خزم و کەسوکاری یەکترن، ئەگەر بێگانەیەکیش هاتبێتە تەوێڵە بەهۆی ژن و ژنخوازی‌یەوە لەگەڵ بنەماڵەکانی تردا بووەتە خزم و تەوێڵەیی.

دەربارەی ڕشتەی ئەم بنەماڵانە هەوڵمان داوە زانیاری ڕاستمان دەست کەوێت، چیمان بیستبێ و بەڕاست بۆمان دەرکەوتبێ ئەوەمان نوسیوە، ئیتر ئەگەر وانەبێ‌و ڕێگەمان نەکەوتبێتە لای شارەزاتر، ئەوە داوای لێبوردن دەوکەین.. گوێمان لەماندوو بوون و دووری و چەند جار ڕۆیشتنەوە بۆلای کەسەکە نەبووە. مەرجیش نی‌یە ئەمەی ئێمە هەمووی تەواوبێ‌و کەسمان لەبیر نەچوو بێ، بەلاّم ئێمە ئەمەمان کردووەو ساغ کردووەتەوە، کێش ڕەخنەمان لێ دەگرێ‌و تێبینی‌مان بۆ دەنێرێ سوپاسی دەکەین، بەس ئەوەندە بزانێ ئەم کارە قورسەو بێ‌هەڵە نابێ‌و هەڵەش ببێت بەئەنقەست نی‌یەو کێش لەمە باشتر دەتوانێ شت بنوسێ و ڕشتەکان ساغ تر بکاتەوە، بابنوسێ‌و ئێمە دەست خۆشی لێ‌دەکەین.

بەبۆنەی نەخوێندەواری‌یەوە، کەم کەس هەیە ڕشتەی بنەماڵەی بەنوسینەوە هەبێ، هەروەها بەبۆنەی ئەوەوە کەهۆزایەتی و تیرەگەرایی نەبووە لە تەوێڵەدا، خەڵکیش گوێیان نەداوەتە زانینی ڕشتەی بنەماڵەکەیان گرنگ تەوێڵەیی‌یەو لە تەوێڵە هەموو مافێکی تەوێڵەیی بووە، بابێ‌کەسیش بووبێ، وەك کەسدارەکە ژیاوە، جگە لەهەندێ ڕووەوە نەبێ کەئەوەش پەیوەندی بەبنەماڵەکەوە نەبووە.

ئەتوانین بڵێین: هەموو کەسایەتی و ژن و پیاوە شارەزاو بەتەمەن و قسەزان و مێژووزانەکانمان بەسەر کردوونەتەوە. هەمووشیان بەگشتی هاتوون بەدەممانەوەو هاوکاریان کردووین و هانیشیان داوین بۆ ئەم نوسینەو پێشیان خۆش بووە.

ئەوەی کەبۆمان دەرکەوت لەم نوسینی ڕشتەی هۆزو تیرەو بنەماڵانەدا ئەمەی خوارەوە بوو:

– ناوو ناتۆرەو نازناو لە تەوێڵەدا زۆر بووە، ئێمە هەوڵمان داوە خۆمان دوور بگرین لەمە، مەگەر نازناوەکە خراپ نەبووبێ، یاناچار بووبین لەبەر ناسینەوەی کەسەکە.

- گرتنەوەی ناوی باوك و باپیرو داپیرە... زۆر دیارەو دەردەکەوێت وەك: عەباس عەلی عەباس عەلی، محەمەد محەمەد محەمەد، قادر ئاغای عەبدوالله ی قادر ئاغا... تاد.

- هەر منالێك لەسکی دایکیا بووبێ، باوکی مردبێ، دوای مردنی باوکی منالە لەدایك بووبێ، ئەوە بەناوی باوکی‌یەوە ناونراوە، هەندێکیشیان نازناوی نامەوەشی یان لێ ناوە وەك: حەمەکەریم حەمەعەلی‌یە کوڵە، حەمەمراد حەمەمراد، ڕەمەزان لەتیرەی هەیاسان، حەمەکەریم حاجی حەمەکەریم... تاد.

- هەندێ جاریش منالەکە بچووك بووە باوکی مردووە، ئیتر دایکەکە بەخێوی کردووەو منالەکە بەناوی دایکیەوە ناسراوە وەك: مستەفا مستەفا نازناوی مستەفای ئاسمایە، حاجی حەسەن منە، ئایزەی فاتە، حاجی ئەوڕەحمانی موڵکی، فەحەی لالێ، ... تاد.

- ئەگەر نەنکی بەخێوی کردبێ ئەوە بەناوی نەنکیەوە ناسراوە وەك: نەصەهاجە، سمەپیکۆل... تاد.

- هەندێ ناویش هەیە نازناوی بابای بۆ بەکار هاتووە، وەك: مەعروف عەبدوالله= بابای منە، حەمەصادق حەمەحەسەن= بابای حەمەحەسەن، مستەفا ناجی= بابای ناجی، حەمە یوسف خواجە حسێن= بابای خواجە حسێن، حەیدەر محەمەد= بابای محەمەد ... تاد.

- هەندێ کەسیش دوو ناوی جیای هەیە، ناوە ئەصلی‌یەکەی جیاوازە لەگەڵ ناوە مەشهورەکەی وەك: مەحیەدین باسام= عەبوی باسامە، جەعفەر میرزا عەبدولقادر= کاکەی میرزا عەبدولقادرە، محەمەد عەبدوالله= کامەرانی هێمنەیە، قادر مەعروف= قالە مالەیە، ... تاد.

- هەندێ کەسیش نازناوی کاکەو کاکلەیان بۆ بەکار هاتووە وەك: حسێن غەفور= کاکلەی غەفورە، مەحمود کەریم= کاکلەی کەریمە، حەمەیوسف وەهاب= کاکلەی وەهاب، حەمەڕەحیم حەمە لەتیف= حاجی کاکەی حەمە لەتیف... تاد.

هەندێ جاریش نازناوی ناملە یا حەمەلە بەکار هاتووە وەك: صادقی عوسمانی محەمەد بەناملە مەشهور بووە، حەمەئەمین لەتیرەی وەستا جامی بەناملە مەشهورە، یا محەمەد عوسمانی محەمەد بەحەمەلە مەشهور بووە.

- هەندێ ناو هەیە، کورت کراونەتەوەو کورتەی ناوەکە وەك نازناوێکی لێ هاتووەو بەکارهاتووە، وەك ئەم ناوانە لەباتی وشەی ئەصلی تر بەکارهاتوون وەك: حەمە، ئەحە، فەتە، عەبە، فەجە، مەحە، شەفە، ڕەشە، مچە، بلە، ئەلە،

عەبو، ئۆڵلا، ڕەحلە، لەمان، مالە، قالە، عەزە، ئۆلە، ... تاد. یاخود وەك ئەم وشانە کەبۆ ناوی ئەصڵی ژنان بەکار هاتوون: ئایشێ، فاتێ، ئامێ، مەلێ، تەلێ، بەدێ، حەبێ، قەتێ، مەجێ، شازێ، نازێ، شیکلێ، خاتێ، منێ، گوڵێ، زیتە...

– هەروەها وشەی مەمول بۆ مەحمود بەکار هاتووە، حەمل یا ئەحل بۆ محەمەد، خاڵە بۆ خالد، حسلە بۆ حسێن، فالە بۆ فاضل یا فارس، عۆدە بۆ عەبدوالله.

– هەندێ بنەماڵە بوون هەر لەپێشینانیانەوە هەر کچیان زۆر بووە یا هەر کوڕیان زۆر بووە، یا هەر منالیان بەگشتی زۆر بووە، یاخود لەڕشتەکەدا دەردەکەوێ وەجاغ کوێریان زۆر بووە.

– ئەوەش دەردەکەوێت ئافرەت لە تەوێڵەدا بەبێوەژنی کەم ماوەتەوە مەگەر هۆکارێك بووبێ وەك تەمەن، منال – دوای مردنی مێردەکەی یا جیابونەوە، شوی تری کردووە.

پێشینان وتویانە:

ئەوەی کەنازانی کوڕی کێیە          مەچۆ لەگەڵیا بۆ هەموو جێیە

خەڵکی تەوێڵە لەچەند هۆزو تیرەو بنەماڵەیەك پێکهاتوون .. کەئەمانەش هەندێکیان هەر لەکۆنەوە لە تەوێڵە بوون و دەکرێ بڵێین ئەصڵ تەوێڵەیین، هەندێکیشیان مێژووی نیشتەجێ بوونیان لە تەوێڵەدا لەچەند سەدەیەك تێپەڕیوە، هەندێکی تریان نزیکەی سەدەیەك دەبێت، چەند بنەماڵەیەکیشمان هەن لەم سەردەمەی دواییدا هاتوونەتە تەوێڵەو جێگیر بوون، لەوانەیە بڵێین نزیکەی نیو سەدەیەکە، گرنگ ئەوەیە جیاوازی نییە لەنێوانیانداو هەموو پێکەوە دەژین و کۆن و تازەیی، یاچینایەتی یاتیرەی فلان، نەبووەتە کێشەوو... کێ کەسایەتی خۆی دەپارێزێ کاسپی و بازرگانی خۆی دەکات و کێ زیرەکە بڕوانامەی باش بەدەست دەهێنێ‌و ڕێزی دەگیرێ... تاد.

هۆزو تیرەو بنەماڵەکانی تەوێڵە کەلەبوارەانی ترا باس کراون ئەمانەی خوارەوەن:

– بنەماڵەی مەلا نەزیر – لەسەوڵەتئاوای سنەوە هاتوون.
– بنەماڵەی مەلا حەکیم – لەئەسڵدا مەردۆخین
– بنەماڵەی مەلا مەحمود – تیرەیەکن لەتیرەکانی یاقوەسوری.
– بنەماڵەی شێخانی نەقشبەندی – تیرەیەکن لەتیرەکانی ئاغەلەران.
– بنەماڵەی سەیدەکان – لەکەلجییەوە هاتوون.

- بنەماڵەی قادربەگ - لەبەگزادەکانی نەوسودن، لەوێوە هاتوون.
- بنەماڵەی فەقێ ئەحمەدی غەزایی - لەبەغداوە هاتوون.
- ئەم بنەماڵانەو چەند بنەماڵەیەکی تر لەشوێنی تری ئەم پەڕاوەدا باس کراون، بۆیە لێرەدا باسیان ناکەینەوە بەڵکو باسی بنەماڵەکانی تری تەوێڵە دەکەین.

ناوی هۆزو تیرەو بنەماڵەکانی تەوێڵە

| ز | ناو |
|---|---|
| ١ | هۆزی یاقوەسوری |
| ٢ | هۆزی خاڵە |
| ٣ | هۆزی ئاغەلەر |
| ٤ | هۆزی بوڵینە |
| ٥ | هۆزی ئەلی حاجی |
| ٦ | هۆزی هاڵەکۆك |
| ٧ | هۆزی فەرهاد |
| ٨ | هۆزی هەیاسان |
| ٩ | هۆزی خاڵەکە |
| ١٠ | هۆزی شاسوار |
| ١١ | هۆزی فەقێ ئەحمەدی غەزایی |
| ١٢ | هۆزی بایەزید صۆفی |
| ١٣ | هۆزی حەمە قوصەی |
| ١٤ | هۆزی قادری هەسەن |
| ١٥ | هۆزی وەستایان |
| ١٦ | تیرەی حەمە ئاغا |
| ١٧ | تیرەی خدرالی |
| ١٨ | تیرەی حەمزەیی |
| ١٩ | تیرەی حەمەی وەستا عوسمان |
| ٢٠ | تیرەی یاقۆ چاوشی کاکەڕەش |
| ٢١ | تیرەی هەیاسەی زۆراب |
| ٢٢ | تیرەی حاجی حەمەکەریمی دزاوەری |

| | |
|---|---|
| ٢٣ | تیرەی هەباسە |
| ٢٤ | تیرەی مەجید دەروێش |
| ٢٥ | تیرەی صۆفیان |
| ٢٦ | تیرەی ئەسکەندەری داود |
| ٢٧ | تیرەی مەولودی |
| ٢٨ | تیرەی ئیبراهیم جۆلا |
| ٢٩ | تیرەی خەسرەو خەشیل دزاوەری |
| ٣٠ | تیرەی ئەحمەد طەبیب |
| ٣١ | تیرەی قادری مارفە |
| ٣٢ | تیرەی خادمان |
| ٣٣ | تیرەی خواکەرەمی مەحمود |
| ٣٤ | بنەماڵەی مارفی حەبیبەاللە |
| ٣٥ | بنەماڵەی حسێن لەتیف |
| ٣٦ | بنەماڵەی حاجی عەلی محەمەد مەولود |
| ٣٧ | بنەماڵەی محەمەدی قادر |
| ٣٨ | بنەماڵەی وەستا عەزیز |
| ٣٩ | بنەماڵەی حەمەڕەزا |
| ٤٠ | بنەماڵەی فەتەی حەملی سۆسەکانی |
| ٤١ | بنەماڵەی ڕەمەزان سۆسەکانی |
| ٤٢ | بنەماڵەی ڕەحمانی بلە |
| ٤٣ | بنەماڵەی مەجنون شۆشمەیی |
| ٤٤ | بنەماڵەی بارام |
| ٤٥ | بنەماڵەی محەمەدی بابالە |
| ٤٦ | بنەماڵەی عەبدواللە ئەحمەد مەولان |
| ٤٧ | بنەماڵەی وەستا عەبدواللە ی پاوە |
| ٤٨ | بنەماڵەی وەستا عەبدوڕەحمانی دارتاش |
| ٤٩ | بنەماڵەی ڕەسولی نادر |
| ٥٠ | بنەماڵەی عوسمانی محەمەد |
| ٥١ | بنەماڵەی بارام سەوڵەتئاوایی |
| ٥٢ | بنەماڵەی حاجی فەرەج سەلیم |

| ٥٣ | بنەماڵەی لفت الله ئاسەوان |
|---|---|
| ٥٤ | بنەماڵەی حەمەیوسف حاجی محەمەد نۆدشی |
| ٥٥ | بنەماڵەی فەتح الله ی شوکرە |
| ٥٦ | بنەماڵەی هەیاس حەمەیوسف |
| ٥٧ | بنەماڵەی ئەلەی مەحمودە |
| ٥٨ | بنەماڵەی حەمەڕەزای مەحمود بەگ |
| ٥٩ | بنەماڵەی حاجی حەمەڕەشید پاوەیی |
| ٦٠ | بنەماڵەی مەلا ڕەشیدی مەلا عەبدولکەریم |
| ٦١ | بنەماڵەی عەبدوڕەحیمی مەلا جامی |
| ٦٢ | بنەماڵەی نەصرواللە ی ڕەسوڵی |
| ٦٣ | بنەماڵەی ئەحمەد نۆدشی |
| ٦٤ | بنەماڵەی نەصرواللە ی ڕەزاوی |
| ٦٥ | بنەماڵەی مومن حەمەشەریف پاوەیی |
| ٦٦ | بنەماڵەی نەجیبە فەنی عەلی ئاغا |
| ٦٧ | بنەماڵەی فەتاحی مەحمود سلێمانەیی |
| ٦٨ | بنەماڵەی علیان |
| ٦٩ | بنەماڵەی تۆفیق قادری هەڵە بجەیی |
| ٧٠ | بنەماڵەی ڕەحمانی جامی شۆشمەیی |
| ٧١ | بنەماڵەی حەمەحسێن خانەگایی |
| ٧٢ | بنەماڵەی مەولود گوشخانی |
| ٧٣ | بنەماڵەی محەمەد ڕوح الله دزاوەری |
| ٧٤ | بنەماڵەی حاجی محەمەدی فەتح الله |
| ٧٥ | بنەماڵەی حەمەگەلێنی |
| ٧٦ | بنەماڵەی ڕۆستەم خەرپانەیی |
| ٧٧ | بنەماڵەی غولام هانەگەرملەیی |
| ٧٨ | بنەماڵەی حەمەسەعید نۆدشی |
| ٧٩ | بنەماڵەی مستەفا مەحمود نۆدشی |
| ٨٠ | بنەماڵەی مەولە فەراد عەبابەیلەیی |
| ٨١ | بنەماڵەی حەمەڕەحیم تاوێرەیی |
| ٨٢ | بنەماڵەی حەمەڕەشید عەبابەیلەیی |

| | |
|---|---|
| ٨٣ | بنەماڵەی سەید شەریفی وڕایی |
| ٨٤ | بنەماڵەی حەمەڕەحیم هەجیجی |
| ٨٥ | بنەماڵەی برزو هانەگەرملەیی |
| ٨٦ | بنەماڵەی مەجید کەریم هەجیجی |
| ٨٧ | بنەماڵەی خوابەخشی عەلی |
| ٨٨ | بنەماڵەی الله مرادی عەلی |
| ٨٩ | بنەماڵەی حسێن سەرگەتی |
| ٩٠ | بنەماڵەی ئیسماعیلی ئەحلە |
| ٩١ | بنەماڵەی مەلا محەمەدی بانگوێژ |
| ٩٢ | بنەماڵەی حەسەن بڵبەری |

ئەمە جگە ئەو بنەماڵەو تیرانەی لەبەشەکانی تری بواری ئایینی و ڕامیاری و ... تاد باسمان کردوون کەزیاد لە (١٠) بنەماڵەن.

## هۆزو یاقوەسوری= هۆزی یاقوەسوری

یەعقوب كەبە یاقوەسور ناسراوە، نەوەی مەنوچەری كوڕی حاجی سەید ئەحمەد بەگە، ئەمیش بەچەند پشتێك دەگەڕێتەوە سەر سەید محەمەد زاهد، واتە پیر خدری شاهۆ.

باوو باپیری مەنوچەر، لەقەیتول ئاوای جوانڕۆ دانیشتوون، مەنوچەر كوشتن (قەتڵ)ی هاتووە بەسەرداو، ڕای كردووە چووەتە دەوروبەری سنە لەژێر دەسەلاتی ئەردەلانی‌یەكاندا نیشتەجێ بووە. - لەو كاتەدا جوانڕۆ لەژێر دەسەلاتی ئەردەلانی‌یەكاندا نەبووە- مەنوچەر كوڕێكی بووە بەناوی ڕۆستەم دواتر دێتە -دوست قول-ی لای هانە گەرمڵە نیشتەجێ بووە، سێ كوڕی بووە - حسێن و حەسەن و خالد-، حسێن پیاوێكی خوێندەوارو عاقڵ و زیرەك بووە، بەمیرزا حسێنی لهۆنی ناسراوە، بووە بەنووسەری خان ئەحمەد خانی ئەردەلانی كەلەسالانی (١٦١٦-١٦٣٦ز) فەرمانڕەوای ئەردەلانی‌یەكان بووە.

میرزا حسێن لهۆنی - ڕاوچی‌یەكی دەست ڕاستیش بووەو زۆر حەزی لەڕاوكردن هەبووە، جارێكیان خان پێی دەڵێ ئەمجارە بەیەكەوە دەچین بۆ ڕاو.. میرزا حسێن یەك دووجار خۆی نەخۆش دەخات و بیانوو دەدۆزێتەوە، خان لێ‌تێدەگات ئەمە بیانووە، تا جارێكیان میرزا دەڵێ: قوربان ڕاو كردن نارەحەتەو قورسە دەبێت لەكاتی ڕاوكردندا مرۆڤ خۆی بگرێ‌و صەبرو ئارامی هەبێت و نەچیر نەشڵەژێنێ، ئەمەش بۆ جەنابت قورسەو ناكرێ، دەترسم منیش خۆم نەگرم و هەڵەیەك بكەم بەرامبەرت، چونكە من لەگەڵ هەركەسدا بچم بۆ ڕاو دەبێت ئەو مەرجە قبوڵ بكات. خان دەڵێت: هەربەیەكەوە دەبێت ڕاوێ بكەین و مەرجەكەشت جێبەجێ ئەكەم.

دەچن بۆ ڕاو، خان لە (دامكا)و لەكاتی قەرەوڵ گرتنەوەی میرزادا خۆی ناگرێ‌و دەجوڵێ.. نەچیر دەردەپەڕێت و دەڕوات... میرزاش پێی ناخۆش دەبێت، شتێك دەڵێت یان شتێك دەكات، دوایی میرزا ئایا لەترسی خان دەبێت یاخود شەرمی لێدەكات ناچێتەوە بۆ دوست قولی، دێتە تەوێڵە دادەنیشێ. خان خەبەری بۆ دەنێرێ بگەڕێتەوە، ئەویش دەڵێ: قوربان من بێ‌شەرمی‌یەكم كردووە بەرامبەرت لەبەر ئەوە ڕووم نیە جارێكی تر بگەڕێمەوە. لەئەنجامدا خان دەڵێ: مادام ئاوایە هەر لە تەوێڵە دانیشەو هەندێ زەوی‌و زاری دەوروبەری جۆگەی قوڵەو داڵیتاو جارەلۆو قەدەغەی پێ دەدرێت.. بەم شێوەیە میرزا حسێنی لهۆنی لەتەوێڵە نیشتەجێ بووە.

میرزا حسێن کوڕێکی بووە بەناوی یەعقوب، چونکە ڕەنگی سور بووە بەیاقۆسور بەناوبانگ بووە، ئەم یاقۆیە پیاوێکی ئازاو زیرەك بووە، بەبۆنەی میراسی باوکی‌یەوە دەوڵەمەند بووە. چونکە باخ و باخاتێکی زۆری بووە، هەروەها ڕانە گەلیشی بووە لەقەدەغەو جاڕەلۆکەی سوودی لێ وەرگرتووە، لەولاشەوە چونکە کەس و کاری لەتەوێڵە نەبووە ژنی زۆری هێناوەو نەوەیەکی زۆری لێکەوتووەتەوە، تەمەنیشی زۆر بووە، ئیتر توانیویانە دەسەڵات پەیدا بکەن بەسەر ئەو میراسەیاندا دوایی هەندێکیان دەبنە کوێخا لەتەوێڵەداو ئێستاش زۆرترین هۆزی تەوێڵەن.

دوو کوڕەکەی تری ڕۆستەم (حەسەن و خالد) لەدوای براگەورەکەیان (میرزا حسێن) چی دەکەن؟.

حەسەن هەر لەدوست قول دەمێنێتەوەو ئێستاش نەوەیان لەهانەگەرملەو بیارەن، خێڵی حاجی حەمەوەیس و حاجی حامد و حەمەمینەڕووش لەو پیاوەن.

خالدیش دێتە نەوسوودو لەوێ ژیان دەباتە سەرو سێ کوڕی دەبێت ... لەهۆزی گەڕا دا باسی دەکەین.

جێگەی باسە بزانین ئایا دۆست قولی یا دۆست خول لەچی‌یەوە هاتووە؟

قەڵایەك هەیە لەهانە گەرمڵە بەم ناوەوە، دەڵێن: ئەم ناوە لەوشەی دەست قوڵەوە هاتووە، کەوەختی خۆی ئەو کەسەی ئەم قەڵایەی دروست کردووە دەستێکی قوڵ بووە، بۆیە ئەم شوێنە بەم ناوەوە ناونراوە.

**نەوەی یاقوە سور**

یەعقوبی میرزا حسێنی لهۆنی، حەوت کوڕی بووە: ئەحمەدو شێرزادو عوسمان و محەمەدو مستەفاو عەبدوالله و قادر... ئەوەشی کەبۆمان ساغ بووبێتەوە نەوەی هەر یەکێکیان بەم شێوەیەی خوارەوە بووە کە هەر یەکەیان تیرەیەك پێك دەهێنن.

**١- تیرەی کوێخا ئەحمەدی یاقوەسور:**

کوێخا ئەحمەد سێ کوڕی بووە - ئیسحاق و نادرو مارف- کەئەمانیش هەریەکەیان بنەماڵەیەك پێك دەهێنن:

**أ) بنەماڵەی ئیسحاق:**

دوو کوڕو چوار کچی بووە: کوڕەکانی : کوێخا حەمەئەمین و ئەحمەد.

* **کوێخا حەمە ئەمین** یان ئەم منالانەی بووە:

- فەتاح .. باوکی: مستەفا، نەجمەدین، مەحیەدین، سەعدەدین، قادر، ... تاد. ئەمانیش هەم خوشکیان هەیەو هەم نەوەشیان هەیە.
- محەمەد .. باوکی: حاجی صادق، ڕەشاد، سابق، عەینا، نازداریْ.
- عەلی.. باوکی: یاسین، عوسمان، ... تاد.
- نەجیب.. باوکی نەصرەدین، فاروق، حەمەئەمین، ظاهر، طارق... تاد. هەریەکێك لەم کوڕانەی کوێخا حەمەئەمین نەوەیان هەیە.

* **ئەحمەدیش** ئەم منالأنەی بووە:
- عەبدوالله ... باوکی فارس و ئەحمەدو ...
- کاکەبرا .. باوکی خەجیْ و نەزاکەت و شەرافەت.
- مەهدی ... باوکی صەلاح و صبحی و صەباح و...
- توبا.. خێزانی وەیسی سلێمانی شاسواری.
- خاتە .. خێزانی حەمەڕەشیدی سلیْمانی شاسواری.

* **چوار کچەکەی** ئیسحاقیش ئەمانەن:

عائیشە.. خێزانی حەمەیوسف حاجی مستەفای یاقوەسوری.

پیرۆزە.. خێزانی ڕۆستەم سان دوای ڕۆستەم سان شووی کردووە بە حەمەیوسف پاش مردنی عائیشەی خوشکی.

فاطمە .. خێزانی مەحمود ئاغای ڕەسولْ ئاغا.

خامیْ.. خێزانی حەمەیوسف وەستا محەمەدی بایەزید صۆفی.

ب) **بنەماڵەی نادر**...

کوڕێکی دەبێت بەناوی حاجی حەمە عەزیز .. لەگەڵ حەمەمینی صۆفی سلێمان دا برای دایکین - حاجی حەمە عەزیزیش دوو کوڕی بووە:

(١) حاجی قادر.. باوکی حاجی مستەفا...

(٢) حاجی نادر... باوکی مامۆستا محەمەد ...

ج) **بنەماڵەی مارفە**... منالەکانی ئەمانەن:
- حەمەلەتیف ... باوکی عەتیە خێزانی فەجە خالە.
- محەمەد ... باوکی فەرخی خێزانی وەستا محەمەدی وەستا قادر.
- ڕەحمان ناسراو بە لەمان ... باوکی سەلیم.
- عەزیز ناسراو بەعەزە.. باوکی حاجی حەمەمراد.
- عوزە ناسراو بەدێوانە ... باوکی حاجی وەسیم و محەمەد.

**٢- تیرەی کوێخا شێرزادی یاقوەسوری:**

کوێخا شێرزاد پێنج کوڕی بووە -مەلا مەحمودو یوسف و ئیسماعیل و حەمەلەتیف و قاسم- کەهەریەکەیان بنەماڵەیەك پێکدەهێنن:

أ) **بنەماڵەی مەلا مەحمود** - لەبنەماڵەی زانایاندا باس کراوە...

ب) **بنەماڵەی یوسف:** سێ کوڕی بووە بەم شێوەیەی خوارەوە:

= **شێرزاد** - بابالەشیان پێوتووەو بە (کەندەسمەیی) ناسراون، نۆمناڵی بووە کەئەمانەن:

١) حاجی حامد.. باوکی مەجیدو شێرزادو پەوەر خێزانی ئیسماعیلی حسێن و سوڵتانێ خێزانی محەمەدی حاجی عەبدواللە و خونچە خێزانی ئەوڕەحمانی صۆفی وەهاب.

٢) عابد.. باوکی ڕەشیدو مەناف و مەحبوبە خێزانی محەمەدی هێمنەو حەفصە خێزانی تۆفیق حەمەحسێنی شاپەری، ڕابعە خێزانی حامدی قالە غەفور.

٣) ئەحمەد.. باوکی صابرو عیززەت و جەمال و جەبارو شاپورو بەهیە خێزانی ئەبابەکر نۆدشی و نەهیە خێزانی حەمەصاڵحی عوزەو ڕەزیە خێزانی کەمالی خواکەرەم.

٤) محەمەد .. باوکی عومەرو نافع و عاصە خێزانی مومنی ئەولحامدو عائشە خێزانی حەمەحسێن حاجی فەرەج.

٥) حەلیمە خێزانی عەلی عەبدوڕەحیمی کوێخا قادر.

٦) پەسەند خێزانی محەمەدی سان ئەحمەد.

٧) سەلما خێزانی فەتاح کوێخا حەمەئەمین.

٨) مریەم خێزانی کەریم خان.

٩) زوبەیدە خێزانی ئاغەجافر.

= **حەمەحسێن** هەشت مناڵی بووە:

١) حەسەن باوکی عیزەت و عەبدولخالق و عەبدوڕەحمان و خەدیجە خێزانی جافر ئەلەو خاوەر خێزانی عومەری حەمە.

٢) حاجی تۆفیق.

٣) حاجی شەوکەت.

٤) حاجی عەلی (عەلی چاوش).

٥) عارف

٦) خەرامان خێزانی صۆفی حەمەکەریم.
٧) کۆفە خێزانی حاجی عەبدوڕەحمانی محەمەدی عەبدولمەجید.
٨) تفحە خێزانی فەتح الله حەمەلەتیف صەیفور.
= **زۆراب**.. چوار مناڵی بووە:
١) حەمە یوسف لەدەگاگای سەولاوای مەریوان دانیشتووە ئێستاش نەوەی هەیە بەناوی میرزا عەلی.
٢) کاکەسور ناسراوە بەکاڵە.
٣) عەبدولکەریم ناسراوە بە ئۆکە.
٤) عەینا دایکی مامۆستا غازی.
ج) **بنەماڵـەی ئیسماعیل**.. کچێك و دوو کوڕی بووە: حەمەکەریم و حەمە سەعید نەوەی ئەمانیش ئەمەی خوارەوەیە:
= **حەمەکەریم کەبەحاجیلە ناسراوە** نۆ منالی بووە کەئەمانەن:
١) حاجی قادر.. باوکی حەمەکەریم و حاجی حەمەشەریف و حەمەئەمین و ئامینەی خێزانی عوسمانی جافرە مەمول.
٢) حاجی فەرەج .. باوکی جەلال و فاطمە خێزانی کەریم حەسەن و عائیشە خێزانی کامیلی حاجی مامۆستاو مەنیجە خێزانی کاکەبرای نادرو دەڵوەت خێزانی عەبدولخالق حەسەن و کۆفە خێزانی ڕەشادی محەمەد و طەلیعە خێزانی عەبدولغەفوری حاجی مستەفا.
٣) حاجی محەمەد .. باوکی عەباس و نەصرەدین و ئیدریس و ڕەئوف و جەوهەرو عەدنان و نەزیرە خێزانی عەبدواللە ی صۆفی وەهاب و وەزیرە خێزانی فەخرەدین حاجی سەلیم و نازیلە.
٤) نوریجان خێزانی (محەمەد = حەملی) کوێخا قادری یاقوەسوری.
٥) بەگیج خێزانی ئەسکەندەری قالە لاڵ.
٦) شیرین خێزانی عوسمانەی وەهاب.
٧) کاڵێ خێزانی حەیبە الله ی سۆسەکانی.
٨) خاڵێ خێزانی حەسەن حەمە لەتیف ئامۆزای خۆی.
٩) خەمێ خێزانی صۆفی وەهاب.
= **حەمەسەعید**.. کوڕێکی بووە، الله کەرەم بەئەڵلاك ناسراوە چوار کوڕی بووە کەئەمانەن:

١) حەمە سەعید بەحەملە ناسراوە.. باوکی عەبدول و مەعروف و ڕەئوف و حەیات و نازیمە.
٢) محەمەد .. باوکی الله کەرەم و فائق و ئەیوب و طەیبەو شەوبۆ.
٣) شەفیع .. باوکی صدیق و نامق و ماتاب کەژاڵ و نەرمین.
٤) حەمەڕەشید .. باوکی ئاوات.
= ڕابعە .. شوی کردووە بەمحەمەدی هەباسە.

د) **بنەماڵەی حەملەتیف:** دوو کوڕی بووە حەسەن و حەمەسەعید، نەوەکانیشیان بەم شێوە بووە:
= **حەسەن** ... سێ کوڕی بووە:
حاجی کامیل و کەریم و ئەمین کەبەناوێ لاڵێی دایکیانەوە ناسراون.
= **حەمەسەعید**.. کوڕێك و دوو کچی بووە:
محەمەد بەحەملە سێنزە ناسراوە، غەریبە خێزانی حەمەحسێن عەبدوالله گوڵە، ڕابعە (ڕابەشەل).
٥) **قاسم**.. بەقاسم ئاغا ناسراوە، دوو کوڕی بووە:
- عەزەلاڵ.. ژنی نەهێناوە.
- حەمل.. برای دایکی مەحمودی فاتەی هاڵەکۆکی‌یە ئەم منالآنەی بووە: فەرەج الله ژنی نەهێناوە، ئامینە خێزانی وەهابی ئەلە، شیرین خێزانی تۆفیق شەریف، خۆرشید خێزانی ڕەشەی ڕەعنا.
**٣- تیرەی کوێخا عوسمانی یاقوەسور:**
کوێخا عوسمان سێ کوڕی بووە - کەریم، هۆمەر، مەحمود - هەر یەکێکیش لەمانە بنەماڵەیەك پێکدەهێنن بەم شێوەیە:
أ) **بنەماڵەی کەریم** .. دوو کوڕو کچێکی بووە هەریەکە لەمانە نەوەکانی ئەمانەن:
= **حەمەحسێن** - حاجی فەرەجی بووە، ئەمیش نۆ منالی بووە کەئەمانەن:
١) حاجی مستەفا.
٢) حەمەحسێن.
٣) حاجی حەمەصالح.
٤) ئەدیبە خێزانی عومەرە فەنی.
٥) بەدریە خێزانی ئیبراهیم حەمەحسێن.

٦) ئامانێ خێزانی حاجی ڕەشید ڕەزاوی.
٧) خانمە خێزانی حەمەکەریم حاجی حەمەمین.
٨) نەزیرە خێزانی ئیدریس حاجی عەبدوالله.
٩) حەفصە.

= **حەمەسەعید** - ئەم منالأنەی بووە:

١) کەریم.. باوکی عەلی و عەزیز و محەمەد و صابرو عەبدوالواحد و صاحب و عومەرو مەحیەدین و فاطمە دایکی یونسی وەهاب سۆسەکانی.
٢) حاجی عەبدوالله.
٣) ئەبوبەکر.
٤) عارف .. ئەمانیش نەوەیان هەیە.
٥) ئاسما خێزانی حاجی سەلیم حاجی حەمە کەریم

= **کچەکەشی سۆسەن** بووە خێزانی سلێمانی وەیسی شاسواری.

ب) **بنەماڵەی هۆمەر**.. یەك کوڕی بووە، حەمەصاڵح کەئەم منالأنەی بووە:

١) عەبدولحەکیم .. باوکی حەمەصاڵح و هۆمەرو حەیدەرو...
٢) عەبدولقادر.. باوکی نەجیب و محەمەدو...
٣) عەبدولوەهاب... پیرۆزی بووە خێزانی میرزا فەتح الله بولێنەیی، عاصیێ و محەمەدی بووە، دوایی شوی کردووە بەحەمەباقی غەفور.. حاجی تۆفیق هەورامی بووە.

ج) **بنەماڵەی مەحمود**.. **هەشت** منالی بووە پێنج کچ و سێ کوڕ، کەئەمانەن:

١) شەمام خێزانی ئۆلواحدی صۆفی مەحمود لەخارگێلأن.
٢) ئامانێ خێزانی صۆفی مەحمود خارگێلأنەیی.
٣) عائیشە خێزانی محەمەدی کوێخا حەمەئەمین.
٤) پەری خێزانی کەریم حەمەسەعید کەریم.
٥) گەوەر...؟
٦) بابالە ئەم منالأنەی بووە:

أ) حەمەسەلیم باوکی عیزەت
ب) مەحمود نەوەی نەبووە.
ج) عوسمان بەکوێخا عوسمان ناسراوە... باوکی عەینەدین نانەوا.
د) عیزەت بەگەنجی مردووە.
ه) ئامانێ خێزانی الله کەرەمی حەملە.

٧) عەلی محەمەد بەئەلە ناسراوە. ئەم منالأنەی بووە:

أ) جافر. ب) جەلال. ج) عەلی کاکل.

د) ئامینە خێزانی حاجی ئەبوبەکری ئەلە.

هـ) نەهیە خێزانی ئەبابەکر موئمن نۆدشی

٨) تۆفیق باوکی جافرو...

**٤- تیرەی کوێخا محەمەدی یاقوەسوری:**

کوێخا محەمەد یەك کوڕی بووە حەکیم، ئەمیش دوو کوڕی بووە، یەکی بنەماڵەیەکیان پێك هێناوە بەم شێوەیە:

أ) **بنەماڵەی غەفور**.. یەك کوڕی بووە عەزیز بە ئایزە ناسراوە، منالەکانی ئەمانەی خوارەوەن:

١) حەمەڕەزا، باوکی مەحیەدین و نەصرەدین کەبەنەصەهاجە بەناوبانگە.

٢) محەمەد بەترکە ناسراوە.

٣) حاجی ئەمین.

٤) حاجی حەسەن.

٥) ئامینە خێزانی حاجی فەتاح حەمەصاڵح.

٦) مەحبوبە خێزانی صادق

٧) هەمینە خێزانی عەبدوالله ی حسێن.

ب) **بنەماڵەی حاجی قوربانی** ... دوو کوڕی بووە:

١) حەکیم.. ئەمیش کچێك و دوو کوڕی بووە: محەمەد و عابدو، عالیە خێزانی خولەی ئاسنگەر.

٢) حەمەمراد.. نەوەی نەبووە.

**٥- تیرەی حاجی مستەفای یاقوەسوری:**

حاجی مستەفا کەبەمچە قایم ناسراوە، چوار کوڕو کچێکی بووە، کەئەوانیش یەکی بنەماڵەیەکیان پێك هێناوە بەم شێوەیە:

أ) **بنەماڵەی حاجی حەمەیوسف**.. منالەکانی ئەمانەن:

١) حەمەصالح، کەبەئەشکە ناسراوە، منالەکانی ئەمیش: حاجی مەحمود، حەمەکەریم، فاضل، فائق، عیسا، سەعادەت خێزانی محەمەدی

حاجی حەمەڕەحیم، قەتحە خێزانی حاجی محەمەدی وەیسی، ستارە خێزانی حەسەن مەلە.

٢) عەلی.. باوکی عابد کەبە عابلەکەڕ ناسراوە.

٣) ئەحمەد.. ژنی نەبووە.

٤) شیرین خێزانی سەعیدی ئەحمەد هاڵەکۆکی.

٥) فاطمە ...؟

جگە لەحەمەصاڵح ئەوانیتر دایکیان عەینا بووە، خوشکی ئامینە غەریبە کەهەردوکیان خەڵکی ژاوەڕۆ بوون.

ب) **بنەماڵەی مونمن**.. کوڕێك و سێ کچی بووە واتە چوار منالّی بووە کەئەمانەن:

١) حاجی مستەفا.. منالّەکانی ئەمیش: حاجی یونس، ئیدریس، محەمەد، حومەیرا خێزانی حاجی مستەفای حاجی قادر، عائیشە خێزانی ڕەحمانی قالە لاڵ، سورەییا خێزانی حەسەن عەبدوللە شارباژێڕی، حەمیدە خێزانی ناصری عەزە.

٢) زێبا خێزانی عەلی محەمەد .. دایکی حاجی شەفیع و مەحبوبەو عەللە.

٣) عەینا خێزانی حاجی ڕەحمان روح اللە.

٤) ڕەعنا خێزانی فەرەجی حەمەئەمین.

ج) **بنەماڵەی حاجی حەمەکەریم** .. ئەم حاجی‌یە لەسەفەری حەج دا مردووە، بۆیە لەدوای خۆی کوڕەکەی کەلەدایك دەبێ ناویان ناوەتەوە حەمەکەریم،.. نەوەکانی ئەمانە بوون:

١) ئەمین.. یەك کچی بووە، نازدارە خێزانی ئیدریس کەریم.

٢) حەمەکەریم، کوڕێك و سێ کچی بووە کەئەمانەن: عەبدولکەریم، نەزیرە خێزانی حسێن محەمەد غەفور، خەرامان خێزانی عەبدولواحدی حاجی عەبدواللە، حەمیدە خێزانی قادری محەمەد ڕۆستەم.

د) حسێن .. یەك کچی بووە.. بەیزا شووی کردووە بەمەلا عابد.

ە) غەریبە .. دایکی خودادای اللە مراد عەلی.

**٦- تیرەی عەبدواللە ی یاقوەسوری:**

عەبدواللە کەبەئۆڵلاّ ناسراوە.. دوو کوڕی بووە کەئەوانیش دوو بنەماڵەیان پێك هێناوە:

أ) بنەماڵەی ئەبوبەکر کەبەهەیبەکر ناسراوە، شەش منالی بووە، سێ کوڕو سێ‌کچ:

١) عەبدوالله بە ئۆڵلاّ ناسراوە، باوکی میرزاو جەلال.

٢) ڕەحیم .. باوکی محەمەدو غەریبەی خێزانی حەمیدی عەزیز.

٣) وەهاب یەك کوڕی بووە، بەناوی خواکەرەم.

٤) نازداریٚ خێزانی خالد خەسرەو خەشیل.

٥) خاتە خێزانی سەلیم ڕەحمان مارف.

٦) عەتیە خێزانی میرزا عەلی سەرهویەیی.

ب) **بنەماڵەی ڕۆستەم** .. کوڕێکی بووە یەعقوب، ئەمیش دوو کوڕی بووە:

١) حەمەشەریف... باوکی نازم و سالم و ئەشرەف و فاتمە خێزانی مستەفا محەمەد حەیدەر، عەزیمە خێزانی کوڕێکی خەڵکی گاپیلۆن، نازیمە.

٢) حەمەیوسف.. ژنی نەهێناوەو مردووە.

**٧- تیرەی کوێخا قادری یاقوەسوری:**

کوێخا قادر کوڕی بچوکی یاقوەسور بووە، .. (١٠) منالی بووە، پێنج کوڕو پێنج کچ، کوڕەکانی چوار بنەماڵەیان پێك هێناوە:

أ) **بنەماڵەی عەبدوڕەحیم**.. عەبدوڕەحیم لالێی کچی وەستا عەبدوالله ی وەستا جامی هێناوەو هاوسەری بووە، ئەم منالانەی بووە:

١) عەلی ... باوکی عەبدول و فاضل و حافظ ومەعصوم و کۆفە خێزانی عەبدوالله ی حەمەڕەشید و شەمام خێزانی حەمەڕەزای حاجی بابالەو توباخان.

٢) عەبدول محەمەد .. باوکی موختارو موعتەصەم و نەهیەو حەسیبەو زەکیەو نەفیەو ڕزگار خان.

ب) **بنەماڵەی حسێن**.. ئەم منالانەی بووە:

١) حەمەئەمین.. باوکی(حاجی حسێن=حسەشا)و فەرەیدونی مامالێ‌و غەریب و مەلا عەبدوالله .. ئەم دووانەی دوایی لەسیا گوێز ژیاون.

٢) عەبدوالله بەئۆڵلاّی حسلە ناسراوە.

٣) قادر.. بەقالەی حسلە ناسراوە.

٤) خەدیجە .. خێزانی فائقە پاوەیی.

ج) **بنەماڵـــەی عەبدولکـــەریم**.. کـوڕێکی بـووە بـەناوی حەمەڕەشـید کەبەحەمەڕەشیدی گوڵە ناسراوە، ئەویش ئەم منالأنەی بووە:

١) عەبدوالله بەعەبالە ناسراوە.

٢) عەبدولعەزیز.

٣) عەبدولکەریم بەبابالە ناسراوە.

٤) ئامینـــە(ئاملـــە) خێزانـــی ئۆلکـــەریمی حـــەکیمی نـــادر دایکـــی حەمەکەریمی ئاملەو حەفصەو سەنیە.

٥) هەمینـە خێزانـی کـەریمی حەمەصـاڵح دواتـر شـووی کـردووە بـە حەمەسەعید حەمەصالحی هێوەری.

٦) وەنەوش خێزانی محەمەدی ئەحمەد خدرالی.

د) **بنەماڵەی ڕەفیق** بەڕەفلە ناسراوە ئەم منالأنەی بووە:

١) کەریم .. باوکی وەستا عارف و مارف.

٢) لـەتیف.. بـاوکی عـەریف سـەلیم و عەبـدوڕەحمان بەئۆلـە پـەریجان ناسراوە.

ه) **محەمەد** بەحەملە مەشهور بووەو نوریجانی ئیسماعیلی کوێخا شێرزادی هێنـاوەو سـێ کچـی بـووە: دەڵوەت خێزانـی لـەتیفی ڕەزا وەیـس، عائیشـە خێزانی میرزا عەبدولقادر، خاتوون خێزانی مەلا صادق.

و) **کۆفە** ... شوی کردوە بەپیاوێکی ڕەزاوی.

ز) **شـەمام** .. شـوی کـردووە بـە شـێخ حیسـامەدین .. تفـەنگ لەدەسـتیان دەرچووەو کوژراوە.

ح) **خورشـید**.. دوای کـوژرانی شـەمام ئـەمیش شـوی کـردووە بـە شـێخ حیسامەدین.

ط) **حەلیمـە**.. شـوی کـردووە بەسـلێمانی خالـد فـەرهاد- دایکـی فەتحـەی خەیاتە.

ی) **پەروەر**.. شوی کردووە بەقادری مارفە، دایکی مارفەی قادرە.

**چەند تێبینی‌یەك:**

١- بـەڕێز م. هۆشمـەن دەڵـێ: ڕشـتەی بنەماڵـەی یاقوەسـور لای کوێخـا ئیسـحاق بـووە، دوایـی فـەوتاوەو بـاوکم هەنـدێ شـتی نوسـراوی هـەبوو لەکیمیاویەکەی هەڵەبجەدا نەماوەو ئەویش فەوتاوە.

٢- بۆ کوڕانی یاقوەسور پشتمان بەو زانیاریانەی م. هۆشمەن بەستووە، لەگەڵ ئەمەش دا حاجی یونسی حاجی مستەفاو حاجی صادقی کوێخا محەمەدو هەسەنی ئایزە دەڵێن:

حاجی مستەفاو عەبدواللە کوڕی یاقوەسور نەبوون، بەڵکو هەردوکیان کوڕی کوێخا ئەحمەدن.

٣- م. هۆشمەن دەڵێ: مەنوچەری حاجی سەید ئەحمەد بەگ .. لەئێناخیەکانی جوانڕۆیەو لەبەگزادەی جافەکانە.

**سەرچاوە:** م. هۆشمەن مستەفا فەتاح، حەسەن عەزیز غەفور، حاجی حەمەصاڵح حاجی فەرەج، عەبدول عەلی عەبدورەحیم، محەمەد حەبیب حەمەکەریم، حاجی صادق کوێخا محەمەد، حاجی یونس حاجی مستەفا، محەمەد عەبدولقادر، حاجی وەسیم عوزە، م. محەمەد حاجی نادر، ئیدریس حاجی محەمەد، حەمەکەریم حاجی قادر، مەعروف حەملە اللە کەرەم، جەلال عەلی محەمەد مەحمود، پەسەند بابالە، هەروەها دەروێش لەتیف و هادی حاجی ئایزەو ئەرشیفی خۆم.

* * *

**بنەماڵەی مەحمودەی سمێڵ**

مەحمود کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیمە، مەحمود دوو کوڕو کچێکی بووە:

* **ئیسماعیل (سمێڵ)**، ئەمیش یەك کوڕی بووە ئیبراهیم کە ئەم منالآنەی بووە:

أ) حاجی قادر.. باوکی ئیسماعیل و فاتمە...

ب) کەریم.. باوکی ئەنوەرو سیروان و نەزیرەو پەخشان و صەبریە.

ج) یونس.. نەوەی نەبووە.

د) کافیە.. خێزانی ڕەحمان حاجی سەعید.

ه) حەیات.. خێزانی وەستا نەجیب سۆسەکانی.

و) نەجات.. خێزانی (س) کەرکوکی.

* **حەکیم** .. دوو کوڕو کچێکی هەبووە کەئەمانەن:

أ) مەحمود باوکی حەمەصاڵح و حەمەیوسف و حەمەشەریف و حەمەکەریم و بەهیە خێزانی سەید ئەحمەدی عەلی سێلە.

ب) عەبدواللە بەعەبال ناسراوە، مناڵەکانی ئەمانەن:

- حاجی کاکەبرا.. باوکی داود، سلێمان، هادی، نەبەرد، خەدیجە خێزانی عەبدولی عەلی، مەحبوبە خێزانی فائقی حاجی تۆفیق، فاتمە خێزانی مەحیەدین حاجی محەمەد، ئامینە خێزانی ئیدریس حاجی حسێن.
- ڕەزا ... هەر لەبەغدا ژیاوەو منالی هەیە.
- سانیە .. دایکی عەلی و حسێن و مەهدی و عوزرا.
- خانمە.. دایکی حسێن (کاکلە)ی غەفور.

ج) بەیزا .. خێزانی وەستا حەمەئەمین وەستا عەبدوالله.

**تێبینی:**

ئەم بنەماڵەیەمان بۆیە بەدوای هۆزی یاقوەسوورییەوە نووسی، خۆیان و هەندێك كەس دەڵێن: یاقوەسورین، هەندێك دەڵێن دایكی مەحمودەی سمێڵ یاقوەسوری بووە، هەرچۆن بێت چونكە بەتەواوی بۆمان دەرنەكەوت كەیاقوەسورین بۆیە بەجیا نوسیمان لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوون هەیە كەیاقوەسورین بۆیە دورمان نەخستەوە لەم هۆزە.

**سەرچاوە:** فاتمە حاجی كاكەبرا، هادی حاجی كاكەبرا، حەمەكەریم مەحمود، م. هۆشمەن مستەفا، دەروێش لەتیف، ئەرشیفی نووسەر.

* * *

## هۆزو خاڵەی= هۆزی خاڵە

لەهۆزی یاقوەسوردا، باسی خالدی كوڕی ڕۆستەممان كرد كەلەدوای میرزا حسێنی براگەورەی، ئەویش دێتە نەوسوود لەوێ ژیان دەباتە سەرو سێ كوڕی دەبێت:

خالد كەخاڵەیان پێ وتووە، لەنەوسوود سەروەت و سامانێك پێك دەهێنێت و، پاش چەند ساڵێك كۆچی دوایی دەكات. سێ كوڕی لێ بەجێ دەمێنێت بەناوی مەحمود و محەمەد و ئەمین.

مەحمود پیاوێكی وریاو فێڵبازو گەڕكەر دەبێت كەمیراسی باوكیان بەش دەكەن ڕێك ناكەوێت و دەست دەكات بەفێڵ و گەڕكردن، ماوە نا ماوەیەك میراسەكە هەڵدەوەشێنێتەوەو ڕێك ناكەوێت بۆیە بەخولە گەڕا دەناسرێت.

محەمەدیشیان، پیاوێكی ساغ و پاك دەبێت گیری خواردووەو دەنگی بەرز بووە، جگە قڕەو هەراكردن هیچی تر نازانێ، هەر خولە گەڕ دەكات و ئەم دەیكات بەقڕە، بۆیە ئەمیش پێی دەڵێن حەمەقڕەو، نەوەكەی بەخێڵی قڕقەشە دەناسرێن

# تەوێڵە لەبواری ڕامیاریدا

* دێباچەیەك بۆئەم باسە
* تەوێڵە بووەتە جێگەی ململانێ
* ژیان و بەسەر هاتی قادربەگی جافرسان
  - قادربەگ وەك کەسایەتی‌یەك
  - قادربەگ وەك خوێندەوارێك
  - قادربەگ وەك فەرمانڕەوایەك
  - لەکارە چاکەکانی قادربەگ
  - ناکۆکی نێوان قادربەگ و شێخ حیسامەدین
  - قادربەگمان پێ‌باشترە
  - ڕۆڵی قادربەگ لە ئاشتبوونەوەی هەردو سالاردا
  - نەیارەکانی قادربەگ
* قەصف کردنی بانە گەورە
* ڕۆڵی شێخانی تەوێڵەو جەماوەری هەورامان لەبەرگری کردن لەئایین ونیشتمان.
  - خاکی وەتەن وشێخانی نەقشبەندی
  - خەباتی شێخانی نەقشبەندی لەڕاپەڕینی( ١٩٤٧ )دا
* بەشداربوون لە شەڕی فەلەستین
* پۆلیسخانەی تەوێڵە
* حیزب وحیزبایەتی لە تەوێڵە
  = شیوعیەت لە تەوێڵەدا
  - لە بیرەوەری ( ٢١ ) ساڵی تێکۆشاندا
  - بۆچی حزبی شیوعی گرنگی دابوو بە تەوێڵە؟
  - بۆچی شیوعیەت لە تەوێڵەدا پەرەی سەند؟
  = پارتی دیموکراتی کوردستان
  - هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول
  - هەموو دەست پێ کردنێك سەختە

- یەکەم دەست وەشاند لە رژێم
- رێگەگرتن بە مەئمور مەرکەزی تەوێڵە
- یەکەم بارەگای هێزی پێشمەرگە
- رزگارکردنی هەورامان
- گرتنی مەخفەری تەوێڵە
- گرتنی مەخفەری سۆسەکان
- گرتنی مەخفەری بیارە

= پەلامارە درندانەکەی زەعیم صدیق و شەڕی پردی زەڵم.

- پارتی‌یە دێرینەکان
- پێشمەرگەکانی شۆڕی ئەیلول

* تەوێڵە لە شۆڕشی ئەیلولەوە بۆنسکۆی ( ١٩٧٥ )و چەند تێبینیەك
* تەوێڵە لەنسکۆی بەهاری ( ١٩٧٥ )ە بۆ قەصفی بەهاری( ١٩٨١ ).
* بۆچی تەوێڵە ڕانەگوازرایەوە؟
* تەوێڵە لە شەڕی عێراق وئێرا ندا
* تەوێڵەیی لەئاوارەیی‌دا
* بێداری بانگەوازی ئیسلامی
* کیمیابارانی هەڵەبجەو خەڵکی تەوێڵە
* تەوێڵە ناوچەیەکی مین ڕێژکراوە
* تەوێڵە و تەوێڵەیی لە ڕا پەڕین و دوای ڕا پەڕین
* چەند زانیاری‌یەك لە سەرخەڵکی تەوێڵە

- پێشمەرگەکانی شۆڕشی نوێ
- شەهیدەکانی شۆڕش
- مەرگەساتەکانی تر

* کارەساتەکانی تری شەڕی ئێران و عێراق

- ئەو تەوێڵەی‌یانەی کەچوونەتە ئێران
- دیلەکانی شەڕی کوێت و عێراق
- سەردانی ناوداران بۆ تەوێڵە

# تەوێڵە لە بواری ڕامیاریدا

**دێباچەیەك بۆ ئەم باسە:**

بێگومان کە باس لە ڕامیاری دەکرێت، دەبێت باس لە فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارو شۆڕش وحیزب و ڕووداوو دائیرەو بارەگاکان بکرێت.

تەوێڵە لە فەرمانڕەوایی‌و دەسەڵاتدا جیا نەبووە لە هەورامان، لە ماوەی هەزار ساڵی ڕابردوودا، بنەماڵەی سانەکانی لهۆن و وخانەکانی ئەردەڵان و پاشاکانی بابان هەندێ جاریش لە ڕێگەی بەگزادەی جاف وعوسمانیەکان، دەسەڵاتیان بووە و فەرمانڕەوای دەڤەرەکە بوون.

وەك لە گۆشەیەکی مێژووی هەورامان دا باسمان کرد، فەرمانڕەوایانی هەورامان لەساڵی(٣٩٢بۆ ١٣٦٢ك)فەرمانڕەوا بوون، لە نێوان ئەوماوەیەدا جارجارە دەسەڵاتیان لاواز بووەو نەماوە، بەڵام توانیویانە دەسەڵات پەیدا بکەنەوەو لە ناوچەکە، دانەبڕێن.

ئەردەڵانیەکان ماوەیەك فەرمانڕەوای دەڤەرەکە بوون، بێگە بەگ خۆی‌و منداڵەکانی فەرمانڕەوای ناوچەکەو دەورو بەری بوون. هەروەها خانی تری ئەردەڵانی، وەك خان ئەحمەدخان، فەرمانڕەوای ناوچەکە بوون[1].

هەرچەندە زۆری نەبردووە، سانەکانی هەورامان دەسەڵاتیان پەیدا کردوەتەوەو، ئەردەڵانی یەکانیان دوور خستوونەتەوە.

**تەوێلە بووەتە جێگەی ململانێ:**

لەساڵی(١٨٤٨ز)یش کە سنور جیاکرایەوە، هێڵی هومایۆن، هەورامانی کردە دوو بەش، تەوێڵە بەر عوسمانیەکان کەوت، لە ساڵەکانی (١٩٠٥) و (١٩١٤)دا، کەمێك گۆڕانکاری تر هات بەسەر سنورەکاندا، ئەمەش بووە هۆی کەم کردنەوەی دەسەڵاتی جافرسان، ئیتر بەبەردەوامی جافرسان لە دوو بەرەدا شەڕی کردوە، لە لایەك لە گەڵ هێزەکانی ڕەزاشا، لە لایەکی تریشەوە لە گەڵ عوسمانیەکاندا.

پێش جەنگی یەکەمی جیهانی، جافرسان، بەهاوکاری جەماوەری ناوچەکە، توانی عوسمانیەکان لە دەڤەرەکە، دوور بخاتەوە، بەڵام زۆری نەبرد لە ساڵی(١٩١٤) عوسمانیەکان پەلامارێکی ناوچەکەیان دایەوەو، بەهێزێکی زۆرەوە هاتنە تەوێڵەو، هێزەکانی جافرسان یان دوور خستەوە بۆ نەوسود و نۆدشەو دەوروبەری، تەوێڵە یان کردە گۆڕەپانی شەڕەکەو، هەروەها شاخی پشتی بێدەری لە خوار تەوێڵەوە، عوسمانیەکان کردیانە تۆپخانە[2] و لەوێوە قەصفی

نۆدشەو نەوسود و شۆشمیّیان کردو، ئەو دەورو بەرەیان هەموو سوتاند، لە وکاتەدا جافرسان و جەنگاوەرەکانی خۆیان حەشار دابوو لە بناری شاخەکانی نەوسود و نۆدشەوە.

عوسمانیەکان، نەیان توانی زۆر، لەناوچەکە بمێننەوە، چونکە جافرسان وجەنگاوەرەکانی دیسان دەرپەڕینەوە بۆیان وشپرزیان کردن.. لە لایەکی تریشەوە عوسمانیەکان پەشۆکابوون بەشەڕی ئیطالیاو بەڵقانەوە، بۆیە سوپای عوسمانی لەناوچەکە کشایەوە.[٣]

هەورامان بەگشتی لەم بەرەنگار بوونەوەی جافرسان لە گەڵ ئێران و عوسمانیەکان دا زیانی لێکەوت، تەوێڵەش هەروەها زیانێکی زۆری لێکەوت، بەتایبەت لە هێرشەکانی عوسمانیەکان بۆ سەر جەنگاوەرانی جافرسان و ناوچەکە،[٤] خەڵکەکەی توشی کوشتن و دەردی سەری هات، لەو لاشەوە بەشداری ڕاپەڕین و شەڕەکانی جافرسانیان کردووە و بەشی خۆیان قوربانیان داوە.

حاجی محەمەد ڕەحمان کە بەتەمەنترین خەڵکی تەوێڵەیەو ئەم بارودۆخەی بەچاوی خۆی بینیوە لەم بارەوە دەڵێ:

(کەجافرسان و چەکدارەکانی هاتنە تەوێڵە، عوسمانیەکانیان دوور خستنەوە، لەو کاتەدا عوسمانیەکان کەوتنەوە خۆو، ئەمریان دەرکرد کەدەبێت عەشایری شارەزوور و بناری هەورامان چەك هەڵبگرن دژ بەجافرسان، لەم کاتەدا خەڵکی تەوێڵە حەزیان لەم شەڕە نەدەکردو دەیان زانی فەقیرو هەژار زۆر دەکوژرێت، بۆیە: چەند ڕیش سپیەك لەگەڵ سەید فەتحەو مەلا عەبدەو مەلا حەیبەالله ، چوونە نەوسود بۆلای جافرسان، داوایان لێکرد کە بەڵکو، ئەو، جەنگاوەرەکانی لهۆن بکشێنێتەوە تاوەکو ئەم شەڕە نەبێت، بەلاّم بیّ سود بوو، جافرسان تەوێڵەی چۆڵ نەکرد.

دوای ئەم نوێنەرە، ڕەئیس ئەرکانی حەربی عوسمانی، ئەمری شەڕیداو کوشتارێکی زۆر بوو. عوسمانیەکان بە جۆری چەك و بەژمارە لە پێشتر بوون لە لهۆنیەکان، توانیان پاشەکشە بە لهۆنیەکان بکەن و سوپای عوسمانی ڕژایە تەوێڵەو نەوسودیان سوتاند.

خەڵکی تەوێڵە هەندێکیان لەگەڵ عەبدوالله ئاغە بوون سەربە عوسمانی، هەندێکیشیان سەر بەجافرسان بوون، زوربەی زۆریشی بیّلایەن بوون.)

لێرەدا پێویست دەکات چەند خاڵێك ڕوون بکەینەوە:

یەکەم: ئەوەیە کە بزانین هەمووکات، شێخەکانی تەوێڵە ڕێزێکی بێ پایان یان لێگیراوە، لەلایەن ئەردەلانی‌و بابانی‌و سان و بەگزادەکانەوە، بگرە شاکانی ئێران و سوڵتانەکانی عوسمانیش بەڕێزێکی زۆرەوە سەیریان کردون و جۆرە سەربەخۆیەکیان بووە. لازاریف دەڵێ:

(.. شێخەکانی هەورامان و شەمدینان.. ناوێکی باشیان بۆ خۆیان پەیدا کردبوو، سەریان بۆهیچ یەکێك لەو حکومەتانە شۆڕ نەئەکردو تەواو سەربەخۆ بوون.[٥]

دووەم: عەبدوللا ئاغا کێیە؟ عەبدوللا ئاغا کوڕی قادرئاغایەو ئەویش کوڕی میران ئاغای کوڕی عەبدوللا ئاغای کوڕی خالد ئاغایە- ئەم خالد ئاغایە باوکی شێخ عوسمان سیراجەدینی یەکەمە- ئەمیش کوڕی عەبدوللا ئاغایە.

ئەم بنەماڵەیە هەرلە باوکی خالدئاغاوە کە عەبدوللا ئاغا بووە، ئاغای تەوێڵە بوون، سەروکاری بەڕێوەبردن وئیدارەی تەوێڵەیان کردووە کە وەك موختارو کوێخای تەوێڵە بوون.[٦]

عەبدوللا ئاغا چوار کوڕی بووە کەئەمانە بوون: ( قادر و ئەمین و مەحمود و سەعید).

لەناو ئەم چوار کوڕەدا، قادرئاغا کەبە قاراغە بەناوبانگە ناو دەردەکاو وەك کەسایەتیەکی ئازاو لێهاتوو دەردەکەوێت. دواتر لە تەمەنی(٦٥) ساڵی‌دا لە ساڵی(١٩٤٣) لە تەوێڵە دەکوژرێت، لەدوای خۆیشی تەنها یەك کوڕی لێ بەجێ دەمێنێت بەناوی (عەلی) لەگەڵ شەش کچ دا.[٧]

ئەم عەبدوللا ئاغەیە کەلە سەردەمی جافرسان دا بووە، دەسەڵاتداری ناوچەکە بووە و لە لایەن عوسمانی‌یەکانەوە، پشتگیری کراوە، لە ڕووی ئیداریەوە پەیوەندی بەعوسمان پاشای جافەوە بووە لە هەڵەبجە، بەڵکو جارجارە، عوسمان پاشا، عەبدوللا ئاغاشی ناردووە بۆ بەرزنجەو دەوروبەری بۆ سەندنی خەرج وباج وشاخانە.[٨]

کاتێك قادربەگ دێتە تەوێڵە و حوکم دەکات، عەبدوللا ئاغا ماوەیەك ماڵی دێتە باخەکۆن لەوێ ژیان دەباتە سەر تاوەکو لە ساڵی (١٩٣٥) کۆچی دوای دەکات و دەیبەنەوە لە خانەقاکەی تەوێڵە بەخاکی دەسپێرن. قاراغەی کوڕێشی ماوەیەك ماڵی دێتە هەڵەبجە دوایی دەگەڕێتەوە تەوێڵە.

**سێهەم**: کێشەی نێوان جافرسان وعەبدوڵڵە ئاغە لەسەر چی بووە؟

ململانێی نێوان عەبدوڵڵە ئاغەو جافرسان لە سەر دەسەڵات بووە وەك وتمان عەبدوڵڵە ئاغا، لە باو باپیرانیەوە کوێخایەتی تەوێڵەی بۆ ماوەتەوە و سەروکاری کردووە، بەتایبەت لە دوای ئەوەی کەسنور جیاکرایەوە، تەوێڵە بەتەواوی کەوتە سەر دەسەڵاتی عوسمانی. ئەمەش جافرسانی بێتاقەت کردبوو، کەبەشێك لە هەورامان لە ژێر دەسەڵاتی‌دا نەبێت... ئەمە بووە هۆی ئەوە کەخەڵکی تەوێڵە ببنە دووبەش، هەندێکیان پشتیوانی جافرسان بوون وچەکیان لە گەڵدا هەڵگرتبوو، هەندێکیشیان لە گەڵ عەبدوڵڵە ئاغادا بوون. هەردوو لا دژایەتی یەکتریان دەکرد.

کاتێك کەعوسمانیەکان دەسەڵاتیان لە ناوچەکەدا لاواز بوو و کشانەوە لە تەوێڵە و دەوروبەری، عەبدوڵڵە ئاغەش پشتیوان ودەسەڵاتی جارانی نەماوە، چونکە ئەو وەك جافرسان چەکدار نەبووە، لە بەر چەند هۆیەکیش پێی نەکراوە و بۆی نەلواوە کاروبارەکە وەك پێویست ببات بەڕێوەو کۆنترۆڵی بارودۆخەکە بکات.

لەهەمان کاتیشدا جافرسان نەیتوانیوە، یاخۆی نەیویستووە، ڕاستەوخۆ بێتە تەوێڵە و فەرمانڕەوایی بکات.

ئیتر بۆ ماوەی دووساڵ پەشێوی و ئاژاوەو ئاڵۆزی یەك لە ناوچەکەدا پەیدا بووە، شەوکوتی‌و ڕاو ڕووتی زۆر بووەو، خەڵکی لە هیچ سەردەمێکی تەوێڵەدا، وەزعی ئاوایان نەبینیووە، تەواو بێزار بوو بوون لەو بارو دۆخە چونکە بۆشاییەکی ئیداری دروست بووەو، دەسەڵات وەك پێویست نەبووە.

**چوارەم**: لەساڵی (١٣٣٣ك- ١٩١٥ز) لەڕۆژێکی جەژن دا، عەبدوڵڵە ئاغاو(١٥) پیاو لە تەوێڵەیی بۆ جەژنە پیرۆزە دەچنە خزمەتی شێخ نەجمەدین لە بیارە. لە گەڕانەوەشیان دا، عەبدوڵڵە ئاغاو (٥) لە پیاوەکانی لادەدەن بۆ دەگاشێخان، بۆپرسەی کوێخا ئیبراهیم، (١٠) کەسەکەی تر بەرەو تەوێڵە دەکەونەڕێ، کەکەمێك لەدەگاشێخان دوور دەکەونەوە بەرەو تەوێڵە دێن- دەگەنە (بانی واتواتا)، لەوێ لەمبەرو لەوبەری ڕێگەوە لەلایەن چەند چەکدارێکەوە، تەقەیان لێ دەکرێو (٩) یان لێدەکوژرێن و تەنها(١) کەسیان نەکوژراوە کەلەو کاتەدا دوور بووە لەوانەوەو لەدواوە بووەو پێیشیان نەزانیووە... ئەمەیان، دوایی دەگەڕێتەوە بۆ دەگاشێخان و هەواڵ دەدات بەعەبدوڵڵە ئاغا.

ئەو (٩) کەسەش کەکوژرابوون ئەمانە بوون:

١- عەلی قادر ئاغا، ٢- جافر سلێمان یاقو چاوش، ٣-حەمە یوسف حەمل، ٤- نادر حەمله سور، ٥-موئمن ڕۆستەم، ٦- موئمن وەستافەرەجوالله ، ٧- ئیسماعیل محەمەد ئاغا ٨- ڕەحمان شاناز، ٩- لەطیف ئەسلەم.

کوژرانی ئەم پیاوانە بەم شێوەو لەوکاتەدا، دەبێتە گرژیەك و بێتاقەتی‌یەك کەلە دەڤەرەکە، دەنگ و هەرایەکی گەورە دروست دەبێ‌و، چونکە کوژرانی (٩) کەس لەوزەمانەدا، بەبێ هیچ شەڕو جەنگێك بکوژرێن زۆرن.[٩]

**پێنجەم**: لەپایزی ساڵی(١٩١٥ز)دا زانایان و پیاو ماقوڵانی تەوێڵە لەگەڵ شێخ حیسامەدین، کۆدەبنەوە تاوەکو چارەسەرێك بۆ ئەم پاشاگەردانی‌یە بکەن، بۆ ئەوەی وڵات هێمن و ئارام بێتەوە و ئەم بارودۆخە ئاڵۆزە بەم شێوە نەمێنێتەوە.

لەئەنجام دا، لەسەر ئەوە ڕێك کەوتون کە داوا لەجافرسان بکەن کەیەکێك لەکوڕەکانی بنێرێتە تەوێڵە، بۆ ئەوەی کاروبار و فەرمانڕەوایی تەوێڵە بکات و بیبات بەڕێوە.

نوێنەری تەوێڵە چووە نەوسود، بۆلای جافرسان و داواکەیان پێگەیاند، لەسەرەتاوە جافرسان دوو دڵ بوو لەوەڵامدانەوەی ئەم داواکاری‌یە، لەوە دەترسا کەئەمە داوێك بێت بۆهەق سەندنەوەی ئەو (٩) پیاوەی کە لە(بانی واتواتا) کوژراون، چونکە لەناو تەوێڵەیی‌دا واگومان ئەبرا، کەئەوانەی تەقەیان کردووە لەو (٩) کەسە، چەکدارەکانی جافرسان بوون، بەڵکو قادربەگی جافرسان و حسێن بەگی ڕۆستەم سان لەگەڵیاندا بوون، ئەم گومانە کەوتبووە گوێی جافرسان، ئەوەش کەدوو دڵیەکەی بەهێزتر دەکرد لای جافرسان ئەوەبوو کە تەوێڵە یی یەکان قادربەگیان دەست نیشان کردبوو کەبێت بۆ تەوێڵە، لەکوژرانەکەش قادربەگ زیاتر تۆمەتبار کرابوو.

شێخ حیسامەدین، جافرسانی دڵنیا کردەوە لەوەو، کەفالەتی سەلامەتی قادربەگی کردو قەناعەتی پێ کرد کەئەمە فێڵ و داوو تەڵەکە نی‌یە.

ئەدمۆنس لەم بارەوە لەکتێبەکەی‌دا (کرد وترك وعرب-ص(١٤٠) ) دەڵێ:

(.. چونکە خەڵکی تەوێڵە حەزیان بەسەرفرازی و ئاشتی و تەبایی بوو، ناچار بوون خۆیان ڕزگار بکەن لەم دەست درێژی‌یەو، ئارامی و ئاسایش بگەڕێتەوە بۆ تەوێڵە، بۆیە بانگهێشتی قادربەگی جەعفەر سوڵتانیان کرد کەبێت بۆ تەوێڵە و فەرمانڕەوایی ناوچەکەیان بکات.)

**شەشـــەم**: بـەم شـێوەو، بـەم سیاسـەتە، جافرسـان تـوانی بـەهۆی یـەکێك لەکورەکانی لەتەوێڵە دەسەلأت پەیدا بکات و کۆنترۆڵی هەموو هەورامان بکات. قادربەگ لەرۆژێکی بەهاری ساڵی(١٩١٦ز) لەنەوسودەوە کە پایتەختی جافرسان بـوو بـەرێو رەسـم ومەراسـیمێکی زۆرەوە هـات بـۆ تەوێڵـە و لەلایـەن جـەماوەری تەوێڵەوە، پێشوازی لێ کراوە.

ئـەو رۆژە، قادربـەگ خـۆی و ئەوانـەی کەلەگـەڵی بـوون کـە نزیکـەی (٣٠٠)کـەس بـوون لـەپیاوماقولأنی هـەورامان و شـارەزوور، هـەموو میـوانی کەسایەتی ناوداری تەوێڵە (هۆمەری مەولود) دەبن.

وەك دەگێرنەوە:

سـێ شـەوو سـێ رۆژ لـەماڵی (هۆمـەری مـەولود) نـان دراوەو لـەبازاری تەوێڵە، شایی‌و هەڵپەرکێ بووە.

**حەوتـــەم**: جگـە لەتەوێڵـە زۆری نـەبرد، لادێکـانی تـری دەورو بەریشـی، کەوتنـە ژێـر دەسـەلأتی جافرسـانەوە، کـە(١٦) لادێ بـوون کـە لـەوەو پێشـتر بەگزادەی جاف و بابانەکان دەسەلأتی بووە بەسەریان دا.

عیزەت بەگی کەریم سان دەڵێ:

پـێش بـوونی جافرسـان بەسـان (لهـۆن) بریتـی بـووە لـە(هانـە گەرمڵـەو کەیمنەو بێدرواس وهە جیج و نۆدشەو نـەروێو شەرەکان و وەزڵـی‌و شۆشمێو تەشـارو شـێخان و نەوسـود)یـش پایتـەخت بـووە، پاشـان بـەهۆی جافرسـانەوە هەورامانی لهۆن پان وپۆر بوو وسنوری فراوان بوو.[١٠]

## ژیان و بەسەرهاتی قادربەگی جافرسان[١١]

### قادربەگ وەك کەسایەتی:

قادربەگ کوری جافرسانی محەمەد سەعیدسانی لهۆنە، لەساڵی( ١٨٨٨ز) لەنۆدشە لەدایك بووە. لەدووەم خێزانـی جافرسانە کە نـاوی(فاطمةخان) بـووە، لەنەوەی مەلا ئەحمەدە و لەبەگزادانی خورماڵە.

قادربـەگ- دوو بـرای دایـك و بـاوکی بـووە، کـە ئـەوانیش کـەریم سـان و غەفاربـەگ بـوون.. کـەریم بـەگ لـەدوای جافرسـان لەسـاڵی(١٩٤١ز) بـووە بەسـانی هەورامان و لەساڵی(١٩٤٥ز) لەنەوسود کۆچـی دوایـی کـردووە، یـەك کـوری بـووە بەناوی (عیزەت)کە دوایی ئەمیش دەبێتە ئەخیر سانی هەورامانی لهۆن.

غەفار بەگیش- هەر لەگەڵ قادربەگ بووە، هەردوکیان هەر بەیەکەوە کراون بەحاکمی تەوێڵە و سۆسەکان، بەڵام هەر ناوی قادربەگ دیار بووەو دەرکەوتووە. غەفاربەگ ئەمیری جەنگ بووە و هەر لە تەوێڵە مردووە لە (باوە سەرهەنگ) نێژراوە، سێ کوڕی بووە:

مەجید بەگ- یەکەم کەس بووە لە تەوێڵە چووەتە قوتابخانە لە (١٠/١٤/

سەعدی بەگ - قادربەگ - مەجید بەگ - عیزەت بەگ - عەبدوڵڵە بەگی مەحمود خانی دزڵ - بەغداد ١٩٣١

١٩٢٨)، دواتر باوکی لەگەڵ باوای (جافرسان)دا کە دەبنە پەناهندە لە کەرکوک. دەست دەکاتەوە بەخوێندن تا دەگاتە پلەی ئەفسەری لە عێراق داو هەر لە کەرکوک دەمێنێتەوە.

ئازاد هەورامی کە ئەندامی سەرکردایەتی یەکیەتی نیشتیمانی کوردستان بوو، کوڕی ئەم مەجید بەگەی لهۆنە، کەلە (١٩٨٨/٨/٢١) لە قەندیل بەهۆی قەصفی فڕۆکەی دوژمنەوە پێکراو زۆری نەبرد لە پێناو کوردو کوردستان دا گیانی بەخشیو لە (سەرکڕان)ی لای پاوە بەخاک سپێررا.

فاتح بەگ- لە سلێمانی مردووە.

نووری بەگیش- ئێستا لە سلێمانیە.

ئافتاب بەگی خێزانی عیزەت بەگی خانەگا کەبە خانمی هەورامان ناسراوە کچی ئەم غەفار بەگەیە.

**خێزان و نەوەکانی قادربەگ:**

قادربەگ سێ ژنی هێناوە:

-توباخان کچی شێخ حەسەنی عەبابەیلێ بووە، کوڕێك و کچێکی لەم ژنە بووە، بەناوی (سەعدی ومەدینە). مەدینەخان شوی کردووە بە (صائیب بەگی زۆراب بەگ) و لەم سالأنەی دواییدا لە سلێمانی کۆچی دوای کردووە.

-خاتوو شاناز- کچی نەزەری کلاوسیاوی تەوێڵەیی بووە کە واحیدەخان کە ئێستا لە ئێرانە کچی ئەم خاتوونەیەو شوی کردووە بە طاهری تۆفیق بەگ، هەروەها فەوزیەخانیشی بووە، شوی نەکردووەو ئێستا لەنەوسودە..

-خاتوو فەرخی- کچی خواکەرەم تەوێڵەیی- کە لەوەو پێش ژنی سالەی ئەحمەدی مەحمود بووە-خاتوو فەرخی لە گەڵ ئاوارەکانی نەوسودا لە ساڵی(١٩٨١) هات بۆ هەڵەبجەو، لەدوای دوو سێ ساڵێك هەر لە هەڵەبجە کۆچی دوایی کرد.

قادربەگ لە خاتوو فەرخی سێ کچی بووە:

-ئەدیبەخان ژنی شێخ لەطیفی شێخ صاڵحی عەبابەیلێ بووە، کەلە کیمیاویەکەدا، لەگەڵ کوڕێکی شەهید بوون.

-نافعەخان، ژنی نیازی حەسەن بەگ.

-زەکیەخان ژنی (ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی) نەوسودیە کە ئێستا لە کرماشانە.

قادر بەگ، لەم سێ ژنەی، تەنها یەك کوڕی دەبێ، کە ئەویش سەعدیبەگ بووە کەلە ساڵی (١٩٢٣) لە تەوێڵە لە دایك دەبێو، کە قوتابخانەی تەوێڵە دەکرێتەوە، دووەم کەس دەبێت، لە (١٤/١٠/ ١٩٢٨) ناوی خۆی تۆمار دەکات.

سەعدیبەگ، هەر لە تەوێڵە ژیاوە، تالەم سالأنەی دوایی کە خەڵکی تەوێڵە ناوچەکەیان چۆڵ کرد، ئەویش هاتە سلێمانی، تالە(٥/٩/١٩٨١) کۆچی دوایی کردو، تەرمەکەی برایەوە بۆ عەبابەیلێ لەوێ بەخاك سپێررا.

سەعدی بەگ.. خاتوو سەعادەتی کچی حەسەن بەگی مامی هێناوە کە خوشکی نیازیبەگ بووە. چوار کوڕو کچێکی بووە بەناوی:

( بارام و قەیسەر و غالب و سەریاس و وەزیرە) لە کیمیاویەکەی هەڵەبجەدا، قەیسەر و غالب شەهید بوون، سەریاسیش لە دوای ڕاپەڕین چوو بۆ هەندەران، بەلأم بارام بەگ ئێستا لە سلێمانیەو عەمیدە لە ئینضیباطیە ی سلێمانی وەزیرەخانیش شووی کردوە بە (              ).

قادربەگ، پیاوێکی بەسام و بەهەیبەت بووە، مۆن و تورە بووە، پێکەنینی کەم بووە، ڕەوشت بەرزو داوێن پاك و نەفس بەرز بووە،چاوی لە ناموسی خەڵکەوە نەبووە.

( ئازاو چاو نەترس بووە، لە شەڕەکانی جافرسان لەگەڵ دەوڵەتی ئێران و تورك وعەشایرەکانی دیکەدا بەشداری کردووەو ناوبانگی دەرکردووە) دەڵێن زۆر ڕقی لە کوفر کردن بووە.. حاجی محەمەد ڕەحمان فەتاح ناسراوە بەحاجی حەمەسور دەڵێت لە دەمی خۆی بیستومە لەو کاتەی کە لە بەغدا زیندان بووە جولەکەیەك کوفر دەکات، قادربەگ هەڵدەستێتەوە بۆی، بەجۆرێك لێی دەدات دەیکوژێت و دەمرێت.

قادربەگ (..زۆر دەوڵەمەند بووەو، هەروەك بەدەم خزمانی خۆیەوە دەگێڕنەوە، کاتی گوێزانەوە، قادربەگ، بەسندوق لیرەو پارەی سپی گوێزاوەتەوەو هەمیشە بەگزادەکان، بۆکڕینی موڵك یان، شتێ، بۆ پارەی پێویست، بەوکارە، چونەتە لای قادربەگ و هەروەك، هەندێ لە بەگزادەی جافیش، هەر چونەتە لای، قادربەگ و پارەیان. لای ئەو قەرز کردووە.

دەڵێن: زوربەی خەرجی جافرسان و کوڕانی کاتێ کەپەناهندە دەبن لە عێراق لەلایەن قادربەگەوە کراوە.. بەڵکو بەبەردەوامی بەدەمیانەوە بووەو لێیان نەبڕاوە.

حسێن بەگی ڕۆستەم سان، بەم جۆرە، باسی قادربەگ-مان بۆ دەکات و دەڵێ:

(باقی سالاران، بەیان ئاشکار

قادربەگ،چون شێر، نەدەس نامدار

حەقیقەت مەردەن، بە ئەقڵ و کەماڵ

بەماڵ و دەوڵەت، بەحسن و جەماڵ

بەجەماڵ یوسف، بەسەفا حاتەم

قەلعەو عەمارەت، چون جەمشێدی جەم

سەرای خوسرەویش، چەند زەڕین کەمەر

نمەیۆش وەچەم، دنیا سەرانسەر)

مێژووی هەورامان (٢٦٣، ٢٥٩)

قادربەگ.. زۆر پابەند بووە بەنوێژەوە، نوێژی بەیانیانی هەر بەجەماعەت کردوە، حەجی کردووە، بەرگری لەخەڵکی تەوێڵە زۆر کردووە، بەکورتە: وەك دەسەڵاتێکی ئەو کاتە سەیری بکەین، ئیجابیاتی زۆر بووە.

قادربەگ، لە ساڵی(١٩٧٨ز) لە نەوسود کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێش بەخاکی دەسپێرن.

**قادربەگ وەك خوێندەوارێك:**

قادربەگ هەر لەهەورامانی لهۆن، لەلای زانایانی ناوچەکە دەستی بەخوێندن کردووەو، خوێندەواریەکەشی وادیارە، لە پلەیەکی باش دا بووە، فارسی و عەرەبی باش زانیووە، دەستی شیعری بووە، هەرچەندە شیعرەکانیمان دەست نەکەوتووە، دەڵێن دیوانی خەیامی بەشیعر وەرگێڕاوەتە سەر هەورامی. زۆر حەزی لەکۆڕی زانایان و خوێندەواران بووەو پرس و ڕاوێژی لەگەڵیان بووە.

وەستا محەمەدی وەستا حەمەصاڵح دەڵێ: جارێکیان دەفتەرێك شیعری خۆی دانا بوو، من گرتم بەدەستەوە تاهاتەوە ئەم شیعرەم خوێندەوەو لەبەریشم کرد:

| | |
|---|---|
| باباست کەرو سەڵوی خەرامان | دەمت پڕنەقوڵ شیرینتەر جەگیان |
| دیمت ئوجو جام، چەم چەمیحەیات | قسەت دیسان قەن دەمت پر نەبات |
| لوتەت بەرو دوڕ، مانگی یەک شەوە | لالوتەوانە، هەم مانگی نەوە |
| یانی پیسە مانگ جەژنی ڕەمەزان | من ماچو نەویٚ ئاخری شەعبان |
| ئەوەن بی فەرح، ئیدە بی فەرەح | ڕەنگی جوانیش، چوون قەوس و قەزەح |
| دەهەمسش ماچی، ئادا ئەصحابە | بەهەشت وێنەشا ڕوو بەڕووی کەعبە |

صاف تەرا سینەش، تەوەن و کەعبەی نەک بەسیاوی، قەدیم بەچەرمەی.

م. محەمەد ئەمین لە مێژووی هەورامان ـل (٢٥٩، ٢٦٠)دا دەڵێ:

(.. شایانی باسە، دەفتەرێکی نیوە دڕاوی (قادربەگ) بەهۆی کوڕانی عیزەت بەگی ئەلی محەمەد بەگەوە، دەستمان کەوت و لەو دەفتەرەدا، هەندێ زانیاری کەممان لە بارەی تەوێڵەوە دەست کەوت و لەگەڵ چەند ئایەتێك، کە بەشێوەی کوردی هەورامانی وەری گێڕاون! وەپارچە شیعرێکیشە کە بەدەسخەتی خۆیەتی و باسی بەسەرهاتی خۆی دەکات! لەو زانیارانەی لە بارەی تەوێڵەوە، وەك هاتنی لافاوێکی گەورەو زیان بەخش کەساڵی(١٩٣٦)و بویشە، بەهۆی دامالینی باخ و باخات و خانووی زۆر. هەروەها بلاوبوونەوەی (ئاولە) کەساڵی(١٩٣١) بووەو نزیکەی (١٠٩) کەسێکی تەوێڵەیی کوشتووە!

قادربەگ دەستی وەرگێڕانی هەبووە، چونکە عەرەبی باشی زانیوە، بەم بۆنەیەوە خەریك بووە کە قورئان، بۆ کوردی هەورامانی بگۆڕیٚو، بەڵام ئێمە لەو دەفتەرەیدا، هەر تەنیا نەختێ لەو ئایەتە وەرگێڕاوانەمان، دەست کەوتن کە مابوونەوە!

ئێمە والێرەدا، وێنەیەك، یان، وەرگرتەیەك، لەو ئایەتە، وەرگێڕاوانە وەردەگرین و دەینوسینەوەو، بۆ ئەوەی خوێنەر ئاگاداری بیٚو ئەوجا دوابەدوای ئەمە، وێنەی دەست خەت و کارەکەی خۆی (وەرگێڕانی ئایەتی قورئان) دەخەینە، بەر چاو.

یەکێ لەو سورەتانەی کە قادربەگ، دەستی پیٚکردووە، کەوەری بگێڕیٚو بۆشێوە کوردی هەورامانی، ئەم سورەتەیە:

الم* ذلك الكتاب لاريب فيه هدى

کەلیمێ ڕەمزێ، ئیٚنویسەیە، هیچ شکەش نیٚیەنە چەنە

للمتقين* الذين يؤمنون بالغيب ويقيمون

ڕانیشان دەرا، پەی دینداری، بەچەم پەنە نەکەوتەی

الصلوة ومما رزقناهم ينفقون والذين

نمایاو ئانێ ڕۆزیما دێنی خەرجیش کەراوە، ئانێ

يؤمنون بما انزل اليك وما انزل

ئیماندارێنی بەئینەیە، ئامانەرەوار جەچێ وەڵی

من قبلك وبالآخرة هم يؤقنون

جەوەڵێنە، جەدماوە، ئانێ باوەڕشا هەن

اولئك على هدى من ربهم وأولئك هم المفلحون

ئانێ هیدایەتشا دریان، ئانێ جە خودای هۆرچینیەنێ

وێنەی ئەو پارچە ئایەتە کەبەدەست خەتی خۆی نوسراوەو، لە لایەن خۆیشیەوە بە شێوەی کوردی هەورامانی لێکی داوەتەوە ئێستا هەیەو ماوە...).

### قادربەگ وەك فەرمانڕەوایەك

پێشتر باسمان کرد کەچۆن زەمینە سازێنرا، تا قادربەگ هاتە تەوێڵە . واتە قادربەگ وەك فەرمانڕەوایەك هاتە تەوێڵە، هەر لەسەرەتاوە چەند کەسایەتیەکی ناوداری لە پیاو ماقولاٚن و زانایان لە دەوری خۆی کۆکردەوەو ڕاوێژی پێکردن، وەك:

مەلا عەبدوالله ی مەریوانی، ئەحمەدی ئیسحاق، هۆمەری مەولود، میرزا عەبدولقادرو حاجی فەرەج و حاجی ئایزەی حەبیب.. تاد.

هەروەها تفەنگچی بووەو لەکاتی پێویست دا، ئامادەباش بوون، وەك: قالەی مەجنون، حەمە ڕەضا بەگ، حەیبە الله سور، ئایزە بورپیزەن، فەتەگول، ئیتر دەستی بەئاوەدان کردنەوەو دروست کردنی خانویەکی قەشەنگ و جوان و گەورەو، گەرماوو قەیسەری‌و دوکان و بازاڕێکی گەورەو باخاتێکی فراوان و دڵگیر کەبریتی بوو لە باخچە میراو باخی نسارەی بەر شاجۆو نسارەی قرتە، ئەمانە هەموو ڕەونەقی شارۆچکەی تەوێڵەیان ڕازاند بووەوە.

کۆشك و خانوبەرەکەی بەجۆرێك بووە، کاتێك جافرسان لە نەوسود پیاوانی گەورەی میوان دەبێت، دەیان نێرێ بۆشاری تەوێڵە بۆ ماڵی(قادربەگ)ی کوڕی- هەروەك لە ژیاننامەی جافرسان دا ئاماژەمان بۆ کردووە.

**لەکارە چاکەکانی قادربەگ:**

ماوەی فەرمانڕەوایی قادربەگ لە نێوان ساڵانی (١٩١٦- ١٩٣٧) بوە، دوای ئەو ماوەیە ئەو دەسەڵاتەی نەماوە، چونکە نزیکەی(١٠) ساڵی زیندان بووەو دوای بەردانیشی، هەم فکرەی حیزبایەتی پەیدا بووەو هەم جەماوەرەکەش گۆڕاوە، لەو ماوەیەشدا، کە قادربەگ فەرمانڕەوا بووە، شێخ حیسامەدین وەك دەسەڵاتێکی ڕۆحی بووەو عەبدوالله ئاغاو دواتریش قادرئاغای کوڕی، کوێخای تەوێڵە بوون واتە لە ساڵەکانی (١٩٤٣- ١٩٥٧) کەدوای بەردانی لە زیندان دەکات ئەو دەسەڵاتەی جارانی نەماوە.

بەهەر حاڵ قادربەگ، لەماوەی دەسەڵاتی‌دا گەلێك ئیشی‌چاکی کردووە، کەلە شوێنی خۆیاندا بەدرێژتر باسمان کردون لەوانە:

١- لە سەردەمی فەرمانڕەوایەکەی‌دا ناوچەکە، هێمن و ئارام و ئاسایش بووە، ئەوبێ سەروبەری‌یەی جاران نەماوە، نزیکەی(٢٠) ساڵێك کاروباری باش ڕۆیشتووە بەڕێوەو، کێشە کەم بووە.

٢- هەوڵێکی زۆری داوە بۆ کردنەوەی قوتابخانەی تەوێڵە، بۆ ئەمەش بیناکەی -کەخانویەکی خۆی بووە- بەخشیویەتی بە قوتابخانەو جگە لەمەش خزمەتێکی زۆری قوتابی‌و مامۆستاکانی کردووە، قوتابی هەژار بەئارەزووی خۆی خوێندویەتی بەڵام قوتابی دەوڵەمەند واجبی کردوە دەبێت باوکی بینێرێت بۆ قوتابخانە.

٣- مزگەوتی گەورەی تەوێڵە لە ساڵی(١٩٢٩ز) دا، ڕووخاندووەو بۆجارێکی تر بەگەورەیی دروستی کردووەتەوە.

٤- نەخشەیەکی جوان وڕێك وپێکی داناوە، بۆدابەش کردنی ئاوی ئاوێسەرو چەمی دزاوەرو باخەکانی تر، کەبەڕاستی کارێکی زۆر گرنگ و باش بووە.

٥- هەندێ بینای دروست کردووە- هەرچەندە بۆ خۆی بووەو لەسەر ئەرکی خەڵك بووە-بەڵام بووەتە هۆی، بەرەو پێش بردنی بیناسازیو هونەری ئاوەدانکردنەوەو جوانکردنی دیمەنی شارۆچکەی تەوێڵە، چونکە وەستای کاراو لێهاتوی بۆ دروست کردنی بیناکانی هێناوە.

٦- کۆڵانەکانی تەوێڵەی چاك کردووە، بەتایبەت کۆڵانی گەڕەکی خەمەکاوە.

٧- هەروەها.. چەند یاسایەکی کۆمەڵایەتی داناوە، بۆ ئەو سەردەمە بۆ شارۆچکەیەکی وەك تەوێڵە زۆر باش بوون- لەو شتانەی کە قەدەغەی کردن:

ا- تەڵاق خستن بۆسوێند خواردن.

ب-وەستانی پیاوان لەسەر ڕێگەی کانی ژنان.

ح-زەنگ کردنەملی ئاژەڵ، لە ئاواییدا بۆ ئەوەی خەڵك ئەگەر خەوتبێت بەخەبەر نەبێتەوە.

د- لە ئاودەستخانە هەرکەسێك بێتە دەرەوەو خۆی گورج نەکردبێتەوەو بەنەخوێنی بەدەستەوە بوایە. ئەمانە سزاکەیان (٥) تمەن جەریمە بووە.

ه- دزی و جەردەیی هەرکەس بیکردایە سزای زۆری داوە، ئیتر وای لێهاتووە لەو ماوەیە بەدەگمەن دزی کراوە.

و- هەر تەوێڵەیییەك شکاتی لە غەیری تەوێڵەیی بکردایە، سزای دەدا،دەیوت دەبێت تەوێڵەیی ئازابیٚو کەسی تربێت شکاتی بکات.

ز- عارەق خواردنەوەو قومارکردن سزایەکی توندی دانابوو بۆیان.

ح-(ڕاگا گەلەی) واتە ڕێگەی بۆ ڕان کردەوە بەمانای ڕێگەیەکی تایبەتی بێت بۆ ڕان کەبڕوات بۆ لەوەڕگا، نەك زەرەر بدات ورەز و باخ پێشێل بکات.

- ئەگەر کەسێك پیشەیەکی زانی بێ وەك بەرگدروویی‌و دارتاشی و ئاسنگەریو یا وڵاخداری، بەڵام دەزگاکە یاوڵاخەکەی نەبوبێ ئەو دەزگاکە یا وڵاخەکەی بۆکڕیوە خستویەتی کارو دوایی پارەکەی بە(قیست) داوەتەوە، یاخود پارەی بەقەرز داوە بە بازرگان و کاسپ تا بەتاڵ نەبن کاسپی بکەن.

## ناكۆكی نێوان قادربەگ و شێخ حیسامەدین:

هەرچەندە، قادر بەگ كەدێتە تەوێڵە، شێخ كەفالەتی سەلامەتی دەكات و بەحیساب، جافرسان لەبەر خاتری ئەو قادربەگی نارد، كەچی پاش چەند سالێك، ناكۆكی كەوتە نێوانیان.

قادربەگ، لە تەوێڵەدا، كۆشك وتەلار و حەمام و خان وچایخانەو ئاش و قەیسەریو بازاڕێكی گەورە دەكاتەوە، لە لهۆن دا، ناوبانگی دەركردبوو، تەواو بوونی ئەو هەموو كۆشك و خانو و خانوبەرە، هەوەك خۆی نوسیویە لە سالی(١٣٤٠ك-١٩٢١ن) تەواو بووە.

م. محەمەد ئەمین لە مێژووەكەیدا -ل٢٥٨- دەڵێ:

(..دروست كردنی ئەو خانووەو هەندێ دوكانی قادربەگ لە تەوێڵەدا، بوون بەهۆی ئەوەوە، كە شێخ حیسامەدین پێی ناخۆش بێو پیاوی پیاوانەو بەناوبانگی تەوێڵەش، لایەنی شێخ حیسامەدین بگرێو دژی قادربەگ بوەستێو قادربەگیش، سێو دووی لێ نەكاو بیكوژێو، ئەمەش بووە بەهۆی كوشتنی یەكێ لە لایەكەوە، لەلایەكی دیكەوە یەكێكی تر زیندانی بكرێت و لەلای سێهەمیش، بووە بەهۆی داخستنی دووبەرەكی لە نێوان تەوێڵەییدا، كە ئەوانیش بەرەی شێخ و بەرەی بەگن.

دیارە لەو دوو بەرەكییەدا، هیچ لایەكیان وەك(سان ئەحمەد)و وەك (قادر ئاغا) زەرەریان نەكرد...)

ئێمە هۆكارەكان وەك دەماو دەم بیستراوە دەگێڕینەوە بۆ ئەمانەی خوارەوە:

- قادربەگ، داوای حەمیدەخانی لە شێخ كرد، بەلاّم شێخ حیسامەدین نەیدایە. ئەمە سەرەتاكەی بوو.

- لە كۆكردنەوەی سەروەت و سامان دا، مونافیسی یەك بوون، ئەمەش حەساسیەتی دروست كردبوو.

- دەسەلاّتی سیاسی قادربەگ، بەناڕاستەوخۆ، كاریگەری هەبوو، لەسەر كەم كردنەوەی دەسەلاّتی شێخ حیسامەدین.

- خزمانی شێخ-سان ئەحمەدو عەبدوالله ئاغەو قادرئاغای كوڕی- پێش هاتنی قادربەگ دەسەلاّتیان لە تەوێڵەدا هەبووە، چونكە لەڕاستیدا ئەمان هەر نەیار(معارض) بوون بەهاتنی قادربەگ. بەڵكو نەشیان دەتوانی مەنعی

هـاتنی بکـەن و جگـە لەمـەش بـۆ نەهێشتنی پشـێوییەکەو بـیٚ سـەروبەری لـە ناوچەکەدا ناچار بوون لەگەڵ جەماوەرەکە پێشوازیشی بکەن.

– ئەو هـەموو بـاج و سـەرانەیەی کـە قـادربـەگ خستبوویە سـەر خەڵکەکـە، خەڵکەکەی بێتاقەت کردبوو، ئەوانیش دەچوون بۆلای شـێخ دەردی دڵـی خـۆیـان دەکردەوە ئەویش پیٚی ناخۆش بوو.

– جگە لەمەش لـە هـەموو سەردەم و زەمانێکدا، ئاشوب گێڕو فیتنەچـی، دەوری زۆر دەبینن لەنێوان خەڵکیدا چونکە بەرژەوەندیان هەیـە لـەو ئاژاوەیـەدا– لێرەشدا لەناوچەکە چەند کەسانێك هەبون ڕۆڵی ئاژاوەو فیتنەیان دەبینی کەهەر لە نزیکەکانی خۆیان بوون.

کە قادربەگ حەمیدەخانی نەدرایە کەوتە بیانو گرتن و دەست گرتن بەسەر هەندیٚ ئەرزدا کە ئەرزی شێخیشی تێدا بوو. ئەمەو هۆکانی تـر ئاگری فیتنـەیان دروست کردو هەردولا، کەوتنە هەڕەشەو گوڕەشە لە یەکتری.

سان ئەحمەدو قادر ئاغا، پشتیوانی شێخ بوون و دژی قـادر بـەگ بـوون، ئەم دژایەتیو ناکۆکیەی نێوان شێخ و قادر بـەگ بـوو بـە هـۆی زیـانی تـەوێڵـەییو کوشتنی دوو پیاوی ناودرایان.

لـە ئەنجامـدا لـە (١٩٣٧/٩/٢٧)سـان ئـەحمـەدی مـەحمودئاغا دەکوژرێـت و قادر بـەگ لەلایـەن حکومـەتی عێراقیـەوە دەگیرێـت و بـەڵکو لەسـەرەتاوە زوربـەی کـەس و کاریشـی دەگیرێـت، دوای ماوەیـەك بـەردەبن بـەس قـادر بـەگ لـە زینـدان دەمێنێتەوە...ئەو ماوەیە ماڵەکەشی تالان دەکرێت و وەك کەلاوەیەکی لیٚ دێت.

مەحکەمـەی عێراقـی حـوکمی لەسـێدارەدانی دەرکـرد بـۆ قادربـەگ، بـەڵام دوایـی کـردی بـەحوکمی ئەبـەدی، پاشـان بـەهۆی حـوکمی عەشـایری دەسـەڵاتی بەگزادەوە حوکمەکەیان کرد بە(٢٠) ساڵ.

قادربـەگ لـە زینـدان مایـەوە تالـە شـەهریوەری سـاڵی (١٩٤١ز) کـە کـەریم بەگی بـرای لـە زینـدانی قەصـری قاجاڕ بـەردەبێت، لەگـەڵ مەنصـوربەگی بـرای‌دا دەچن بۆ بەغدا، لـەویٚ وەصـی عێـراق دەبیـنن وداوای بـەردانی قادربـەگ دەکـەن. وەصـی پـەیمانی دانـیٚ کەبـەری بـدات وفـەرمانـی‌دا بـەزووترین کـات ڕێگایـەك بـۆ بەردانی بدۆزنەوە.

کەریم بەگ لەو سەردانەی‌دا بۆ عێـراق، تـوانی سەردانی قادربـەگی بـرای بکات لە بەندیخانەی کەرکوك. ئەوەی لێرەدا جێگەی باسە و پەیوەندیشـی هەیـە بەم ڕووداوە، کوژرانی قادرئاغای عەبدوالله ئاغەیە.

لە شەوی سێشەمە \چوارشەمە ( ٢٣-٢/٢٤ ساڵی (١٩٤٣) لەلایەن دوو کەسەوە بەدۆستی، قادرئاغا لەماڵ دێننە دەرەوەو تادەیگەیەننە بەرامبەر خانەقای تەوێڵە لەوێ تەقەی لێ دەکرێت ودەکوژرێت.. دەڵێن: کوژەری قاراغە، سەعدی بەگی قادربەگ دەبێت کەلەو کاتەدا لە نەوسود بووەو شەوهاتووە قاراغەی کوشتووەو گەڕاوەتەوە نەوسود بۆیە حکومەتی عێراق نەیتوانیوە بیگرێت.

کوژرانی ئەم دوو ناودارە کێشەیەکی گەورە بوو لە تەوێڵەداو پشێویەکەی زیاتر گەورە کرد.. ئەمە مایەوە تاوەکوو ساڵی(١٩٤٧) حکومەتی عێراقی بڕیاری ئازاد کردنی قادربەگیدا، بەمەرجێك بنەماڵەی سان ئەحمەد لێی خۆش بن..

سەرەنجام زەمینە خۆشکرا، هەردوو بنەماڵە، بنەماڵەی ئاغەلەران و بنەماڵەی بەگزادە ئاشت ببنەوەو ڕێك بکەون.

ئەمەش بەهۆی حکمەت وعەقڵ و بیرکردنەوە لەئایندەی خۆیان تائاژاوەکە گەورەتر نەبێت...بەشێوەیەکی یاسایی و عەشایری چارەسەری کێشەکە کراو کۆتایی پێهێنرا... ئەویش ئەوەبوو حەمە ئەمین سان و نزیکەی(٢٥٠) کەس لە بەگزادە و عەشایر هاتنە تەوێڵە و سەردانی ماڵی سانەیان کردو داوای لێ بوردنیان کرد. لەلایەن خاتو (خاڵێ)ی خێزانی سان و کوڕەکانیو، بنەماڵەی ئاغەلەران لە ماڵێدەر لە ماڵەکەی سان ئەحمەد پێشوازیان کردو، لە قادر بەگ خۆش بوون و مەزبەتەیەکیان کردەوە بۆی بۆ ئازادکردنی. لەدواییدا چەند کەسانێك لە بەگزادەو ئەحمەدی ئیسحاق مەزبەتەکەیان هێنا بۆ سلێمانی بۆلای شێخ بابە عەلیو ئەویش گەیاندی بەشوێنی خۆی. بەم شێوەیە قادربەگ لەساڵی (١٩٤٧) ئازاد بوو و گەڕایەوە تەوێڵە.

– لەلایەکی تریشەوە کە ناکۆکی دروست بوو لەنێوان شێخ و قادربەگ داو خوێن ڕێژرا لە نێوانیان، ئیتر شێخیش وای بەباش زانی بچێت بۆ باخەکۆن لە تەوێڵە دور بکەوێتەوە..بەڵکو ئاژاوەکە بکوژێتەوە..

– سەعدی بەگیش دوای ئازاد بوونی باوکی ئەویش گەڕایەوە، بەڵام لەسەرەتاوە وتیان بالەسۆسەکان دانیشێ و نابێت بێتەوە تەوێڵە، لەبەر ئەوە چەند ساڵێك لە سۆسەکان مایەوە، دواتر گەڕایەوە تەوێڵەو هاتەوە لای قادر بەگی باوکی.

کە قادربەگ گەڕایەوە تەوێڵە، ئەو دەستەڵاتەی جارانی نەما، لە لایەکەوە بەگزادە بەگشتی دەسەڵاتی لاواز بوو بەهۆی دەسەڵاتی دادگاو پۆلیسخانەوە،

لەلایەکی تریشەوە، ئەو جەماوەرەی نەمابووبە هۆی بوونی ئەو کێشانەی لەوەو پێش، جگە لەوەش فکرەی کوردایەتیو حیزبایەتی بە تایبەت لەسەرەتای پەنجاکانەوە فیکرەی شیوعیەت سەری هەڵدابوو...بۆیە لە (١٩٥٧/١٠/٢١) دەچێتەوە بۆ نەوسود، شوێنی سەرەکی باو باپیرانی لەوێ دەمێنێتەوە تا کۆچی دوایی دەکات.بەڵام سەعدیبەگی کوڕی لە تەوێڵە دەمێنێتەوە لەسەر موڵك وماڵەکەی باوکی دادەنیشێ و ژیان دەباتە سەر.

**قادر بەگمان پێ باشترە:**

لە مێژووی هەورامان دا-ل ٢٦٣-هاتوە، کە بەدەم ڕەئیس (محەمەد سان ئەحمەد)ەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ:

(مستەفا بەگ-ی جافرسان، بۆ تەوێڵە دەچێو بەو نیازەی، لە تەوێڵە دابنیشێ، تاوەکو، بتوانێ، لە قادربەگی بسێنێو لە جێگای‌دا ببێ بەحاکمی تەوێڵە.

تەوێڵەیی، هەست بەوە دەکەن، کەلە هەموو ڕوویەکەوە، قادر بەگ، بۆ تەوێڵەیی باشترە، چونکە هەر وەك قادربەگ، سەرپاکی تەواوی تەوێڵەیی دەناسێ، هەروەها تەوێڵەیش زۆر چاك، فێری دڵ و دەرونی قادربەگ بوون و لەگەڵیدا ڕاهاتوون.

لەبەر ئەم هۆیانە، هەندێ پیاوی ناسیاو و دیاری تەوێڵەیی بۆ نەوسود بۆلای جافرسان، دەڕۆن و لەوێ، لای جافرسان، دەڵێن، کە مستەفابەگ بە تەداوی کردنی نەخۆشیەوە، بۆ تەوێڵە هاتوەو لەڕاستیدا، نەخۆش نیە، بەڵکو نەخۆشی تەوێڵەیەو، ئەگەر ئێوە لە ئێمە بپرسن، هەر قادر بەگمان دەوێ.

جافرسانیش، مەحمود هەجیجی بۆ تەوێڵە، بۆ سەر سالار (مستەفا بەگ)ی دەنێرێو فەرمانی دەداتێ کە لەوێ، دەری بکات!)

**ڕۆڵی قادر بەگ لە ئاشت بوونەوەی هەردو سالاردا:**

سالارە دەولە نازناوی، سالاری بەخشیوە بەهەندێ کوڕو برازایانی جافرسان، لەوانە:

- ئافراسیاوبەگی ڕۆستەم سان، کە حاکمی (هانە گەرمڵە و کەیمنە و بێدەرواز و بیارە و نارنجلە و گوڵپ و سەرگەت و گەچێنەو باخەکۆن و بنجە و دڕەیو هانەی دن و دەرەومەڕێ)بووە.
- هەروەها مستەفابەگی جافرسانیش کە حاکمی (دەگا شێخان و بەڵخە و خەرپانیو دەرەقەیسەر)بووە، کە هەردوکیان نازناوی (سالار)یان بووە.

هەر وەك لە مێژووی هەورامان دا –ل٢٢٥–هاتووە:

ئەفراسیاوبەگ و مستەفابەگ، هەمیشە لەسەر موڵك و لەسەر ئەوەی کە ئەم دڵخۆشی پیاوی ئەو دەکات و هەریەك لەوان، هانی پیاوی ئەو دژی ئەم هان دەداو بەو جۆرە.

بەهۆی قادربەگەوە، لەسەر فەرمانی جافرسان، (ئافراسیاوبەگ و مستەفابەگ لە تەوێڵە و لە ماڵی قادربەگ، دەبێ کۆببنەوە، بۆ ئەوەی لە یەکتری، خۆش بن و ئاشت بکرێنەوە.

لەوێ لەماڵی قادربەگ داو بەبێ ئەوەی قادربەگ پێ بزانێ‌و، مستەفابەگ تفەنگچی ئامادە دەکات، کە کەی پیاوی ئەفراسیا و بەگ گەیشتنە بەرەوە، ئەمان، لێیان بدەن!!

بەلام پێش ڕوودانی کارەکە، قادربەگ پێیان دەزانێ‌و پیاوەکانی مستەفابەگ، چەك دەکات و ئەوجا، پاش ئەوە، قادربەگ، هەردووکیان، ئاشت دەکاتەوە.بێگومان هەر وەك بەدەم خەڵکی ئەو سەردەمەوە دەبیسترێت ئاشت بوونەوەیەکی ڕواڵەتی بووەو لەدڵەوە، هەمیشە هەروەك دەرکەوتوە یەکتریان خۆش نەویستوە.

پاشان جافرسان خۆی ناچار دەبێ‌و دێتە ناوەوەو، جەماوەرێکی زۆر لە بیارە کۆدەکاتەوە و، صوڵحی هەردوولا دەکات...)

**نەیارەکانی قادر بەگ:**

جگە لەشێخ حیسامەدین و سان ئەحمەد و عەبدوالله ئاغا و قاراغای کوڕیو..

دەڵێن: هەندێك لە مەلاکانی تەوێڵەش، وەك مەلا عەبدەو مەلا حەبیبوالله مەلا ئەحمەدی قازی.. لەگەڵ قادر بەگدا نەبوون..

مەلا عەبدە چەند ساڵ مەلاو خەتیبی مزگەوتی گەورەی تەوێڵە بووەو، لەسەر مەسەلەیەکی شەرعی لەگەڵ قادر بەگدا تێك دەچن و ئیتر واز لە خەتیبی ئەهێنێت.

مەلا حەبیبوالله یەکێك بووە لەوانەی هەوڵی داوە پۆلیسخانە لەتەوێڵەدا ببێت، ئەویش بۆ ئەوەی دەسەلاتی قادربەگ کەم ببێتەوە.

مەلا ئەحمەدی قازی، قازی تەوێڵە دەبێت لەسەر تەداخول کردنی قادربەگ لە قەزاوەت، ئەویش تێك دەچێت و پاشان دەچێتە سلێمانیو هەڵەبجە دەبێتە قازی، پاشان دێتەوە بۆ سۆسەکان و دەبێتە مەلای ئەوێ، ئیتر دژایەتی قادربەگ

دەکات و خەڵکی هان دەدات دژی قادربەگ..ئەویش عەزیەتی ئەو کەسانە دەدات کە تێکەڵاوی قادربەگ دەکەن.دەگێڕنەوە:

مام ئەولحامدی ئەلیەکە پیاوێکی قسەزان و دانا بووە، لەگەڵ مەلا ئەحمەدی قازیدا نێوانیان خۆش بووەو بە نهێنی هات و چۆی کردووە لە دەرەی بەڵخ یەکتریان بینیوە.کە قادر بەگ بەمە دەزانێ پیاوی خۆی دەنێری بەشەق بیهێنن..پیاوەکانیش کە دەچن بە شوێنیا پێی دەڵێن ئێمە ئەمری وامان پێیە، هەڵسە پێشمان کەوە تا نزیک بارەگای قادربەگ لەوێ نەختێك مشتەکوڵەو بۆکسی لێدەدەن، لەوکاتەدا ئەویش کەلێی دەدەن دەڵێت(بەخوا لەت و پەتم کەردی مـن هەر وەش مەبووجە قەرزو وێم و هەر یاگیو ویش شارۆوە، ملو تەڵەبش تا حەق و وێم هور گیرۆ) واتە:

(بەخوا لەت و پەتم بکەن مـن هەر خۆش نابم لە قەرزی خۆم، لەهەر شوێنێك خۆی بشارێتەوە دەچم داوای خۆمی لێدەکەم تا حەقی خۆم وەردەگرمەوە) قادر بەگ گوێی لەمە دەبێت، کە دێتە بەردەمی قادر بەگ لیێی دەپرسێ قەرزی چی؟دەڵێ: قوربان من لەماڵی دونیا هەر ئەوەم هەیە لای ئەوە ئەویش نامداتەوەو منیش وازی لێناهێنم و جارجارە دەچم بەڵکو پارەکەم بداتەوە...بەم شێوە مام ئەولحامد خۆی ڕزگار دەکات.

-قادر بەگ کەلەگەڵ ئەم مەلایانە تێك دەچێت، مەلای تر دادەنێت و تەعین یان دەکات .. مەلا صاحب لە سلێمانیەوە دەهێنێتەوە بۆ تەوێڵە و دەیکاتە ئیمام و خەتیبی مزگەوتی تەوێڵە. مەلا عەبدواللە ی مەریوانیش دەکاتە قازی تەوێڵە..

**-لە کۆتایدا دەڵێین:**

قادربەگ، پابەند بووە بە دروشمە ئاینییەکانەوە، بەغیرەت و ئازا و لێهاتوو بووە، خوێندەوار و زانست پەروەر بووە، خزمەتگوزارو ئاوەدانکەرەوە بووە، بێ سلبیاتیش نەبووە.

**قەصفکردنی بانە گەورە:**

لەساڵی (١٩٣٠)دا کە جافرسان و چەکدارەکانی پەنایان بەعێراق هێنا سەرەتا هاتنە تەوێڵەو پالآنیا، نزیکەی (٤٠) ڕۆژێك لێرە مانەوە، پاشان تەسلیم بە حکومەتی عێراقی بوون. خودی جافرسان و بنەماڵەو نزیکەکانی کەنزیکەی (٣٠٠) کەس بوون حکومەتی عێراق هێنانی بۆ بەغدا، بەڵام هەندێکیان لەتەوێڵە مانەوە، بەتایبەت نۆدشییەکان، ئەمانە جارجارە شەو دەچوونە ناو خاکی ئێرانەوە ئەیاندا لەسەربازانی ڕژێمی ئێران.

لەو کاتەوە کەجافرسان هات بەم دیودا، چەند جارێك فرۆکەی ئێرانی هاتووە بۆ سەر خاکی تەوێڵە، بەلاّم زیانی نەداوە تاوەکو لەهاوینی (١٩٣١)دا قەصفی گەڕەکی بانەگەورەی لەتەوێڵە کردووەو ئەم زیانانەی خوارەوەی داوە:

– پیاوێکی نۆدشی بەناوی (کەریم)ەوە کوشت.

– عەینا ئەبوبەکر– خێزانی وەستاعەلی سەیدقادر، بریندار کردوو زۆری نەبردووە کۆچی دوایی کردووە، هەروەها وەستاعەلی خۆیشی و منالّەکانیشی (ئەمنەو عەطیەو حەمەڕەحیم) بریندار بوون، ئەمانەی تریش بریندار بوون:

– خونچە عەبدوالله ، خاوەر حاجیحەسەن، ڕەیحان خێزانی وەستا فەرەج، زوبەیدە خێزانی شەریفی جهان بەخش.

– جگە لەمەش خانووبەرەیەکی زۆری ڕوخاند و وێران کرد، چەند ولاّخ و مەڕومالاّتێکیشی کوشت.

**ڕۆڵی شێخانی تەوێڵەو جەماوەری هەورامان لەبەرگری کردن لەئاین و لەنیشتیمان[١٢]:**

دوای ئەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی بەسەر گەلانی ناوچەکەدا سەپێنرا، زۆرینەبرد کوردیشیگرتەوە، ئەوەبوو هێزێکی گەورەی ڕووس پەلاماری باکورو باکوری ڕۆژهەلاّتی کوردستانیدا، لەباشوریشەوە، هێزێکی بەریتانیا بەرەو بەصرە هەڵکشا ڕووەو خاکیکوردستانی باشور. لەباکورو باکوری ڕۆژئاوایشەوە هێزەکانی عوسمانی بەسەر پەرشتی چەند سەرکردەیەکی ئەڵمان، هەڵیان کوتایە سەر کوردستان... هەموو ئەمانە بەشوێن بەرژەوەندی خۆیان دا، دەگەڕان.

بۆ بەرپەرچ دانەوەی هێزەکانی ڕووس، سەرکردایەتی بالاّی سوپای عوسمانی، عومەر ناجیبەگی– ڕاسپارد کەپەیوەندی بەسەرۆك هۆزو شێخەکانی سلێمانی و شارەزوور و هەورامانەوە بکات.ئەمیش هاتە سەرئەو باوەڕەی کەبەبێ هاوکاری و ڕەزامەندی شێخەکانی نەقشبەندی لەهەورامان و شێخەکانی قادری لەسلێمانی ناتوانێ هیچ بکات و سەربکەوێ. بۆیە:

دەستی کرد بەپەیوەندی کردن بەشێخ نەجمەدین و شێخ عەلی حیسامەدینەوە لەهەورامان، کەپێش ئەمەش شێخ مەحمودی بینی بوو لەسلێمانی. لەم پەیوەندی کردنەدا باس لەپەلامارەکەی ڕووس کراو، تێی گەیاندن کەلە (١٩١٦/٦/١٣) سوپای ڕووس گەیشتووەتە، بانەو سەقزو سەردەشت و دەیانەوێ، لەوێوە بێنە مەریوان و پێنجوێن و سلێمانی، لەناوچەی مەهابادیشەوە، بەرەو ڕایات و ڕەواندز بێن. هەروەها باسی ستەم و خراپەکاری و کافری سوپاکەی ڕووسی بۆباس کردن.

شـێخ نەجمـەدین و شـێخ عـەلی حیسـامەدین، ڕۆڵێكـی سـەرەكیان بینـی لەئاگاداركردنـەوەی جەماوەرەكە، بۆ ئەم مەبەستەش زانـا و ناودارەكـانی ئـەو وەختە، وەكوو:

مەلاعەبـدولقادری مـودەڕیس و مەلاموسـتەفای خورمـاڵ و مـەلاقادری مەلاموئمین و شێخ بابە ڕەسوڵی بێدەن و چەندانی تر كۆكرانەوەو، باسی ئەم هێرشـەی دوژمنیـان بـۆ كـردن و وتیـان مـادام گـەل و نیشـتیمان و ئـاین لەمەترسیدایە، دەبێت بەهەموو شێوەیەك هەوڵ بدەین ئەم دەست درێژیو داگیر كردنە دژی بوەستین. بەهەموو لایەك قەناعەتیان هاتە سەرئەوە كەئەمە غەزایەو فەرزی عەینیشە.

بۆئەم كارە، شێخ نەجمەدین چەند نوێنەرێكی ناردە لای شێخ عەلائەدینی بـرای لەهـەورامانی ئێـران و شـێخ نزامـەدین لەخانـەقین. سـەرەڕای ئەمـەش جافرسوڵتانی سـەرەك عەشیرەتی لهۆن و سەرەك عەشیرەتی جـاف و نـاودارانی تری ئاگادار كردن.

بەهەموو لایەكەوە جەماوەریان هاندا، بەیارمەتی جەحفەلی سلێمانی دژی ڕووسـەكان بوەستن. داواكـرا لەخـەڵكی كەبـەخۆیان و چـەك و ئەسـپ- ئـەوەی كەهەیـەتی - لەگـەڵ نـان و تـووی وشـك، هـەڵبگرن و بچـن لەناوچـەی پێنجـوێن كۆببنـەوە. بڕیـاریش بـوو كەعومـەر نـاجی، چـەك وئازوخـەو پێداویستییەكانی جەنگ دابین بكات.

ئەم فتوایەی زاناكانی تەوێڵەو بیارەو شێخانی نەقشبەندی، كاریگەریەكی زۆری كـردە سـەر، هەسـت و سـۆزی خـەڵكی ناوچـەكەو دەوروبـەری‌و، بۆیـە ئامادەیی‌یەكی زۆریان دەربڕی.

مەحمود پاشای جاف، نێوانی لەگەڵ شێخ نەجمەدین دا زۆر خۆش بوو، دەستوری‌دا، كەهەموو هۆزەكانی جاف دەبێ بەشداری ئەم غەزایە بكەن.

ئاپۆرەی موجاهدانی كوردو، شێخەكان لەناوچەی پێنجوێن، عومەر ناجی سەرسام كردبوو، كەچۆن وابەگیانێكی بەرزەوە هاتوون شەڕ بكەن، لەپێنجوێن هەندێ كەل و پەل دابەشكرا بەسەر جەنگاوەراندا.

لەپـەیامی هـەورامان ل(١٥٧)دا هـاتووە و دەڵـێ: شـێخانی هـەورامان (حیسامەدین و نەجمەدین و عەلائەدین) هاتنە گوندی ڕەزاو، هەموو لەشكریان ڕێك خست كەزیاتر لەچوار هەزار كەس ئەبون..)

موجاهدان دابەشكران بەسەر سێ بەرەدا:[١٣]

– ناوچەی سنە بەسەر پەرشتی شێخ عەلائەدین و کوڕەکانی بەتایبەت شێخ عوسمانی کوڕی کەلەتەمەنی گەنجیدا بوو، ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەخزمەت، باوکی وبراکانیدا، شەڕیان دەکرد.(١٤)

– ناوچەی سەردەشت بەسەرپەرشتی شێخ عەلی حیسامەدین و براو کوڕەکانی بوو.. هەروەها بەگزادەکانی جاف، تاهیربەگی وەسمان پاشا و عەلی بەگی مەحمود پاشاو حسێن بەگی مەحمود پاشاو حسێن بەگی حەسەن بەگ و حەمەسەعید بەگ و حەسەن بەگی وەڵەدبەگ و عەلیبەگی ئەحمەدبەگی وەڵەدبەگ.. هەموو ئەمانە هاوبەشی ئەم شەڕەیان کردو لەم بەرەدا بوون کەشێخ حیسامەدینی لێبوو.(١٥)

– ناوچەی مەریوان بەسەرپەرشتی شێخ نەجمەدین و براو کوڕەکانی بوو. جەنگاوەران دەستیان کرد بە هەڵمەت بردن و دەست وەشاندن لەدوژمن، بەتایبەت، لەهەندێ شوێن دا، وەك شەڕی پارتیزانی زیان یان دا، لە ڕووسەکان و بۆی دەردەچوون.. واتە سیاسەتی –لێدەو ڕاکە– یان بڵێین کەڕوفەڕ.. هەبوو.. وایان لەدوژمن کرد، نەیانهێشت پەلبهاوێژن بۆ پێشەوە.

ئیتر ڕووسەکانیش کەزانیان گشتی ناوچەکە، بووەتە دوژمنیان و بەڕۆژو بەشەو لەسوپاکەیان دەدرێت، بڕیاری کشانەوەیاندا.

ڕووسەکان هەر گوندو شارێکیان گرتبوو جگە لەکوشتن و گرتنی خەڵکەکەی تالانیان کردبوون.. دوایش کەچۆڵیان پێکردن هەموو ناوچەکانیان سوتاندن ... ئەمەش بووە هۆی ئەوە کەجەنگاوەران سوود لەئاواییەکان وەرنەگرن بۆ خواردن و حەسانەوە.

دوای ئەنجام دانی چەندەها شەڕو چالاکی، غەزاکاران کەوتنە ڕاوی پاشماوە پەڕاگەندەکەی ڕوسیا. موجاهیدانی کورد، هەرچەندە ڕووسەکانیان دەرپەڕاندو دووریان خستنەوەو ناوچەکەیان پاراست لەپلانەکانی دوژمن، بەڵام بەداخەوە سەرکەوتنەکە تاسەر نەبوو، چونکە بەڕێوەبەرانی جەحفەلی سلێمانیو مەفرەزەکەی عومەر ناجیبەگ و سەرکردایەتی باڵای سوپای عوسمانی نەچوون بەدەمیانەوە.. پێداویستی یەکانی شەڕیان بۆ دابین نەکردن.. ئیتر:

١– دوای ئەوەی فەرمانی ئاینیو نیشتیمانی خۆیان بەرامبەر بەدین و بەگەلەکەیان بەجێهێنا.

٢–چونکە ڕووسەکان کشابوونەوەو مەترسیش لەسەر ناوچەکە نەمابوو.

٣–لەبەر بێ خۆراکی وبێ دەرمانی و نەمانیپێداویستی شەڕ.

٤-لەگەڵ ئەمەش دا بەشی خۆیان شەهیدو، بریندار و نەخۆشیان بوو..
بۆیە: بڕیاری کشانەوەیان داو، گەڕانەوە، ناو ماڵ و حاڵی خۆیان.
ئەوەی شایانی باسیشە:
بەشداری کردنی کورد لەشەڕەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی لەسالآنی (١٩١٤-١٩١٨) بەڕووداوی سەفەر بەلك ناسراوە لای کورد.[١٦]
لەم شەڕەدا:
- هێزی ڕووس و هێزی کورد، جیاوازی زۆری بوو، لەڕووی- ژمارە و جۆرەوە- ڕووسەکان ژمارەیان زۆرتر بوو، مەشقی سەربازی و جۆری شەڕکردن فێرکرابوون، جگە لەوەی کەچەك و ئامێری پێداویستی‌یە کانی جەنگیان هەبوو، بەلآم کورد بەپێچەوانەوە.
- ڕووسەکان زیانێکی زۆریان لێکەوت، بۆیە لە (١٩١٦/٧/٢٨)لە ناوچەکە دوور کەوتنەوەو دەرپەڕێنران.
- زوربەی لادێکانی ئەم دەڤەرە لەلایەن ڕووسەکانەوە سوتێنران و تالآنکران و کاولکران. خەڵکێکی زۆریان لەگوندەکان کوشت و بەدیل گرتنیان.
- زوربەی لادێکانی هەورامان چەندەها قوربانی و شەهیدیان دا، لەو شەهیدانە: -مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلاشەمسەدینی کوڕی مەلاحامیدی کاتب[١٧] لەتەوێڵەیش: زەینەدین کوڕی مەلانەجمەدین، مەحیەدین محەمەد وەستا عوسمان ناسراوە بە(دینە)، سورەی پەسەندو قالەی سۆسەن و هەروەها گەلێکیش بریندار بوون لەوانە:
خواکەرەمی قادر ناسراوە بەخواکەرەمی پیر، ڕەحیمی هەیبەکر. عەبدواللە ی وەستا مارفی تەوێڵەیش لەلای ڕووسەکان (٧) ساڵ دیل بوو.[١٨]
- دەرکەوت کەکورد هەمووی بۆ بەرگری لەکوردستان و لەئاینەکەی ئامادەیی باشی هەیە، کەقوربانی بداو ماڵ و سامان و گیانی خۆی ببەخشێ.
- لەمەوە دەرکەوت کەباشترین بزوێنەری گەلی کورد بۆ خەبات و تێکۆشان، ئاینی ئیسلامە، ئەوەتا فتوای (شێخ الاسلام)ی ئەستەنبوڵ و[١٩] زانایانی ناوچەکە، جەماوەرەکەی خرۆشاندووەو کاریگەری بووە لەسەر کۆکردنەوەو ئامادە بوونیان، بەڵکو بۆیان دەر کەوتبوو کەبێ ڕەزامەندی سەرکردە ئاینی‌یەکان ناتوانن کارەکانیان ئەنجام بدەن و[٢٠] ئەم بەرەنگاری‌یە بکەن لەئیسلام و نیشتیمان و گەل و دەسەلآت.

- کەسایەتی شێخانی هەورامان و زانایانی مەدرەسەی بیارە دەرکەوت کەکاریگەریان هەیەو جەماوەرەکە گوێ ڕایەڵیانن.

**خاکی وەتەن و شێخانی نەقشبەندی:**

جگە لەمەش شێخانی نەقشبەندی هەورامان، خۆشەویستی کورد و کوردستان لەهۆنراوەکانیاندا دیارەو، ئاماژە بۆ زانست دەکەن کەچرایەکی ڕوناکە بۆ سەرفرازی و پێشکەوتنی گەل، بۆنمونە: ئەوەتا شێخ عوسمان سراجەدینی دووەم لەکتێبی (چەپکە گوڵێ لەگوڵزاری عوسمانی-ل-٨٧-٩٠) دوانزە کۆپلە شعری پێنج خشتەکی هەیە.. ئێمەش لێرەدا هەندێکی دەنوسین:

**( خاکی وەتەنم )**

خاکی وەتەنم زۆری هەیە گەنجی نیهانی..
پڕیە لەمەعادین، لەدوڕو گەوهەری کانی
خاڵ خاڵی سپیو، سەوز و بڵند گردی جوانی..
هەردەم بەنیشانێکە ئەگەر بێتوبزانی
هەرعیلمی ئەوێ، عیلمە براوبابی کوڕانە

*    *    *

ئەی خاکی وەتەن، گوێ‌گرە لەم ناڵەیی زارە
لەم دەنگ خۆشە، لەم گەلە لاوان و قەتارە
گوڵ بۆچی نەهات، وەختی ئەمێستاکە بەهارە
یابۆ منی بێچارە بەلأهەر لەکەنارە
ئەستێرەیی بەختم لەشەوو ڕۆژ نیهانە

*    *    *

ئەی خاکی وەتەن، بۆچی نی‌یە شێوەیی پارت
بویتە(چەلەحانە) شەڕو شۆرە هەموکات
بۆ بوو بەشەوە زەنگ، شەوو ڕۆژی بەهارت
باڕۆح و سەرو ماڵی وەتەن بێ بەنیسارت
بۆتۆیە لەسەر چاوەیی چاو سەیلی ڕەوانە

*    *    *

(دالأنی)بە ناڵینی دڵ و گرمەیی خۆشی
ئەیوت بەنەوایی وەتەنی سینە خرۆشی
تاکەی بەبەلاش عومری من و خۆت ئەفرۆشی

بەعیلمی‌یە ناچاری قسەی فلس و قرۆشی

تێفکرە دەروونم کەپری گەنجی نیهانە

*    *    *

هەر عیلمە برا، زانستە ئەسبابی شەهانە

هەر عیلمە ڕەفیق، موونیسی یاری سەفەرانە

هەرعیلمە چرای ڕێگەی پاکی طەیەرانە

زانینە بەقیمەت لەڕەواجایە گرانە

هەر جەهلە کەهەرزانە، بەلایەکی گرانە

*    *    *

بەو خوایە کەیەکتاوو یەکە، من یەک ئەناسم

هەرکوردم و کوردە، وەتەنی ڕاسیو ڕاسم

بۆتۆیە شەوو ڕۆژنی‌یە خوردو خۆراسم

بۆتۆیە لەدنیا خەفەتم، بەرگی پەلاسم

بۆتۆیە کەوێڵم، ئەگەرێم من بە بەهانە

*    *    *

کورد پاکن و ئازان و جوان مەردن و بێباک

بۆڕاسی لەلای هەر بەشەرێ سافن و دڵ پاک

هوشیارو وەفادار و مونەووەر دڵ و ڕوناک

بۆکاتی شەڕو ڕۆژی، نەبەرد چوست و چالاک

تک تک ئەتکێ جەوهەری ئەو تێغە دەبانە

ئەم پێنج خشتەکی‌یە لەژمارە(٣و٤)ی ساڵی (١٩٤٢)ی گۆڤاری (گەلاوێژ)دا بلاو کراوەتەوە.

## ئاوێسەر مەکۆی پشتگیری:

دوای ئەوەی کۆماری کوردستان لەمەهاباد دامەزراو پێشەوا قازی محەمەد کرا بەسەرۆك کۆماری کوردستان، نوێنەری قازی محەمەد نێررا بۆ هەموو ناوچەکانی کوردستان، داوا لەهەموو سەرۆك عەشیرەکانی کورد کرا، کەپشتگیری ئەو کۆمارە بکەن و بچنە ژێر ڕکێفی‌یەوە.

لەبەر ئەمە لە (تەموزی ١٩٤٧)دا، لەئاوێسەر - هاوینەهەواری تەوێڵە- هەموو زاناو شێخ و سان و خان و بەگزادەو وەکیل و پیاوماقوڵ و ڕیش سپی و

ناوداران و جەماوەری هەورامان و مەریوان و جوانڕۆ کۆبوونەوە بۆ پشتگیری کردن لەو حکومەتە کوردی‌یە. لەو ناودارانەی ناویان دەزانین و بەشدار بوون لەو کۆبونەوەدا: حەمەئەمین سان، حەسەن سان، عەبدوالله خان، حەمەد سان و قادر بەگی تەوێڵەو ... تاد.

کۆبونەوەکە سێ شەوو سێ ڕۆژ بەردەوام بووە، خەیمەو چادرو کەپرێکی زۆریان هەڵدا بوو، نان و تفاق و خواردنێکی زۆر ئامادە کرابوو...

کۆبونەوەکە ئەنجامێکی باشی هەبوو، بروسکەی پیرۆزبایی‌یان نارد بۆ پێشەواو خۆشحاڵی خۆیان دەرخست بۆ دامەزراندنی حکومەتەکەی‌و، ئامادەیی هاوکاری‌یان دەربڕی‌و ... لەم کۆبوونەوەدا ڕۆڵی حەسەن سان زیاترو زۆرتر بووە لەکۆکردنەوەی پیاوماقوڵەکان و سەرکەوتنی کۆبوونەوەکەو زیاتر پشتگیری کردنی بۆ کۆمارەکە.

ئەوەی شایانی باسە:

- خەڵکی تەوێڵەو بیارەو دزاوەرو کەیمنەو دەوروبەریان بەگەورەو بچوکەوە هاتبوون بۆ ئاوێسەر...

- ڕۆڵی جەماوەری تەوێڵە لەخزمەتکردن و ناندان و ڕێکخستنی کۆبوونەوەکەو، هەروەها ڕۆڵی ئەو توێژە ڕۆشنبیرو سیاسیانەی کەلەحیزبی هیواو کۆمەڵەی برایەتی‌دا بوون، زۆر بووە.

- جگە لەمەش ڕۆژی سێهەم، کۆبوونەوەکە کرا بەهەڵپەڕکێ‌و گۆرانی‌و شایی‌و پێشبڕکێ‌ی سواری‌و نیشانە شکێنی‌و ...تاد.

- بەم شێوە هاوینەهەواری ئاوێسەر، بووە ناوەندو مەکۆیەك بۆ خۆسازدان و خۆ ئامادەکردن و پشتگیری بۆ دووەم حکومەتی کوردستان.

**خەباتی شێخانی نەقشبەندی لەڕاپەڕینی( ١٩٤٧ )دا[(٢١)]:**

کاتێك کەلەسەرەتای چلەکانەوە، بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان کەوتە گەشە کردن و جوڵە، کۆمەڵەی برایەتی‌و هیوا، دواتریش پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزران... هەستی کوردایەتی‌و نیشتیمانپەروەریش، جەماوەری گەلەکەمانی خرۆشاندو جوڵاند.

جالەم بزاڤ و کۆمەڵە و هەستەدا، شێخانی نەقشبەندی ڕۆڵێکی گەورەیان بینیووە لەکوردستان دا، ڕابەرایەتی و بەشداری شۆڕش و ڕاپەڕینەکانیان کردووە. یەکێك لەو بەشداری بوونە ڕاپەڕینی ساڵی(١٩٤٧)بووە دژی پەیمانی (پۆرت سۆس). لەساڵی (١٩٤٧) دوای هەرەسی کۆماری مهاباد جەماوەری

تەوێڵـە و بیـارەو لادێکـانی تـری هـەورامانی عێـراق و هەڵەبجـە تاسەرچـەمی سیروان، ڕاپەڕین و سەرانی ڕاپەڕینەکەش شێخانی نەقشبەندی هەورامان بوون.

.. شـێخ مـەحمودی کاکـە شـێخ دەگێڕێتـەوە کـەخۆی یـەکێك بـووە لەبەشـداربوانی ئـەو ڕاپەڕینـە، دەڵێـت: بلاّوکراوەیـەك هـاتبوو بـۆ شـێخ محەمـەد ئـەمین شـێخ عەبدوالله، ئـەویش هێنـای بـۆمن، تێیـدا داوای جموجـوڵ و دەسـت وەشاندنی بەرامبەر دام و دەزگاکانی میری دەکرد. منیش بردم بۆلای مامم شێخ تائب و بڕیارمان دا، هەموو کوڕەشێخەکان کۆبکرێنەوەو کارێك بکەین، بەم جۆرە هەموو کوڕە شێخەکان لەبیاوێڵە کۆبووینەوە، دابەش بووین بەسەر بنکەکانی پۆلیس(مەخفەر) لەناوچەکەدا، بەم جۆرە شێخ مەحمودی کاکە شێخ لەگەڵ چەند کەسێك بۆ هەڵەبجەو شێخ تائب و شێخ نەصرەدین بۆ خورماڵ و شێخ زاهدو شێخ محەمـەدی شـێخ عەلائـەدین بـۆ بیـارە و تەوێڵـە. بـەم جـۆرە ڕێو شـوێن و سـەعاتی سـفر دیـاری کـرا، لەیـەك شـەوداو لەیـەك کاتـدا لەناوچـەکەدا لەبیسـت بنکەی پۆلیس درا، هەر لەتەوێڵە و بیارەو سۆسەکان تاسەر چەمی سیروان.

پاش ئەم کارە، دەستکرا بەشالاّوی گرتن و ئـەم ناوانـەی خـوارەوە گیران. لەگەڵ ئەوانەی پێشتر باسمان کرد:

شێخ حەمە ئەمین شێخ عەبدوالله و شێخ خالیدی شێخ جەمیل و ڕەئوف یەحیاو دوو مامۆستای سلێمانەیی کەلە تەوێڵە بوون بەناوی کەمال و جەمال.

هـەموو ڕاپێچـی زینـدانی سـلێمانی کـران، مـاوەی(٥٥) ڕۆژ لێکۆڵینـەوە بەردەوام بوو، لەو ماوەیەدا خەڵکی سلێمانی هەروەك نەریتی خۆیان، کەهەمیشە مەڵبەندو قوتابخانەی کوردایەتی بوو هەرکە زانیان ئەم کۆمەڵە لەسەر کوردایەتی گیراون هەموو ڕۆژێك سێ ژەمەخواردن و هەموو پێداوویستیان بۆدابین ئەکردین و خزمەتی باشیان دەکرد. ئەم کارە لەخەڵکی سلێمانی دوورنیە. پاش (٥٥) ڕۆژ لێکۆڵینەوە لەبەردەم موتەسـەڕیفی سلێمانی (مەعروف چیاوك) ئامادە بووین و بڕیاری حوکمی بەمجۆرە بەسەرادابن.

هەریـەك لەشێخ تائـب و شـێخ مەحمود و شـێخ زاهیـد و شـێخ محەمـەد و شێخ نەصرەدین بەسێ‌ساڵ زیندان یا(٥٠٠) سەد دینارو، شێخ محەمەد ئەمین و هەردوو مامۆستا کەمال و جەمال بەدووساڵ زینـدان یـا(٢٠٠) دینـارو، ڕەئـوف یەحیاش بەیـەك ساڵ زینـدان یـان (١٠٠) دینـار، پـاش تەسلیمکردنی پارەکـان ئـازاد کـراین، بـەلاّم بەمەرجێك تـادوو مـانگ هـەموو ڕۆژێـك لەسەرای سلێمانی ئامادەبین.

ئەم ڕاپەڕینە بەگژا چوونەوەی ڕژێمی سەردەم بوو کەڕژێمی هێنایە لەرزین و سەلماندمان کەکورد هەیەو بەڵگەی بونی خۆی دەسەلمێنێت. بۆیە ڕژێم کەوتە پەلەقاژە، گەرچی نەیتوانی ئەوگیانی کوردایەتیە سەرکوت بکات، چونکە لەبیری کوردایەتی ڕاستەقینەوە هەڵقولاَ بوو.

سەرەڕای ئەوەی هەرچی لەتوانایدا هەبوو بەکاری هێنا، ئەمە بەڵگەیە لەمێژووی خوێناوی میللەتی کورد هەرلەکاتی دەسەلاَتی میدییەکانەوە کورد لەگەڵ داگیرکەران لەململانێدایە بۆ سەندنەوەی مافی خۆی کەلەکاتی خۆیدا خاوەن دەسەلاَت بووە، ئەمەش بازنەیەکی نەپساوەی زنجیرەی خەباتی گەلی کوردە.

**بەشداربوون لەشەڕی فەلەسطین:**

کەلەسەرەتای چلەکانەوە،جموجوڵی زایۆنی زیادی کردو زلهێزەکان بەبێ پەردە دژی خاك و خەڵکی فەلەسطین وەستان، ئیتر لەولاَتانی ئیسلامی بەتایبەت دەوروبەری فەلەسطین غیرەتی ئیسلامییان جولاَو فشاریان لەسەر دەوڵەتەکانیان دروست کرد کەئامادەن بەشداربن لەشەڕی فەلەسطین ئەمەش بەزۆری ئەفسەری عێراقی بوون ئەم فشارەیان دروست کرد.

سوپای عێراقی سێجار بەشدار بووە لەشەڕی فەلەسطین و جولەکەدا، لەچلەکان بەتایبەت لە(١٩٤٨)، لەساڵی (١٩٦٧) و (١٩٧٣)یشدا.

خالۆ حەمەڕەحیم حەمەشەریف لەم بارەوە وتی: پێش ئێمە وەجبەیەك سەربازی عێراقی لەساڵی (١٩٤٥)دا چوو بوون بۆ بەشداری شەڕی فەلەسطین .. ئەمانە پێیان دەوتن عەسکەری لەبی ئینگلیزی، جالەو تەوێڵەیی یانە:

سەید صادق عەلی مەولود، عەبدولکەریم کەناسراوە بە(بەگە). دەڵێ: وەجبەی دووەم ئێمە بووین، کەمەوالیدی ساڵی (١٩٢٨) بووین لەساڵی (١٩٤٦) براین بۆ سەربازی- ڕەئیس تەجنیدی هەڵەبجە لەوکاتەدا (ڕۆستەم بەگی ئافراسیاوبەگ) بوو، نزیکەی ساڵێك لەبەغداو دیوانیە بووین، پاشان نقلْ کراین بۆ فەلەسطین، چوینە (نابلس، طولکەرەم، جنین، عنبتە، رام الله ، بیت المقدس) ... نزیکەی (١٤) مانگ ماینەوە، زۆرمان بۆ جولەکە هێنابوو ئێمە لەکەتیبە هەندەسە بووین، ئامرەکەمان (ڕەفعەت حاجی ستری) بوو پیاوێکی زۆر موسڵمان بوو، من مەسئولی ئەرزاق بووم، بەلاَم زوربەی هەورامییەکان ئەوانەی خوێندەواریان بوو خرانە سەر جهاز- بۆئەوەی بە هەورامی قسەبکەن و جولەکە لێیان تێنەگات- وەجبەی ئێمە تەوێڵەیی زۆر بووین لەوانە:

- خۆم-حەمەڕەحیم حەمەشەریف عەزیز.
- عەبدولخالق حەسەن حەمەحسێن.
- ڕەحمان حەمەیوسف قادر.
- محەمەد عەبدوالله میرزا.
- عارف حەمەشەریف.
- محەمەد حەمە ئەمین ڕۆستەم(حەمە ئامله).
- شەوکەت عەبدوالله ئەحمەد.
- ڕەحمان فەتاح ڕۆستەم-تازە گەیشتبوین فڕۆکە قەصفی کردین و ڕەحمان بریندار بوو. ئیتر ئەویان گەڕاندەوە.
- عوسمان محەمەد- عوسمانی حەملی سۆسەکانی- لەگەڵ(٣١)کەسی تردا کەوتن بەسەر ڕەطڵێکی ئەلغام داو شەهید بوون. هەروەها دەڵێ: لەساڵی (١٩٤٨)دا شەڕ زیاتر گەرم بوو، سوپای عێراق زۆرتر بەشداری کردو زوربەی ئەمانەش (تطوع) بوون، لەلیواکەی عومەر عەلیدا خۆیان ناونوس کردبوو کەئەمانەش هاتن، ئێمە لەطولکەرەم بووین.

لەم بارەوە لەمێژووی هەڵەبجەدا هاتووەکە: (موسڵمانانی زۆر وڵات چونە بەرەی جەنگەوە دژبەجولەکە لە وانە: خەڵکی میصرو سوریاو ئەردەن و عێراق.

.. خەڵکی کوردستانیش بە لیوایەکی تەواو بەشداری لە وشەڕەدا کردو ئاگاهی غەزاو جەنگ لێدرا، لە هەمووولایەکەوە خەڵك بە پیری بانگەوازەکەوە چون خۆیان خۆبەخش کرد، سەرکردەی لیواکە(عومەر عەلی) بوو کە یەکێکە لە کوردەکانی کەرکوك و خاوەن غیرەتێکی ئیسلامی زۆر گەورەبوو. لە شاری هەڵەبجەش هەندێ گەنجی خوێن گەرم بۆتۆڵە کردنەوە لە جولەکە خۆیان خۆبەخش کرد لەگەڵ لیواکەی (عومەر عەلی)دا بەرەو فەلەسطین بەڕێکەوتن. وەك باسی لێوەدەکەن زۆر لە شارەگەورەکانی ئیسرائیل دەگرن و گەمارۆی (تەل ئەبیب)ی پایتەخت ئەدەن، لە وەدا ئەبێ هەموو شت کۆتایی پێ بێت، بەپلانێکی نێو دەوڵەتی هەموو سوپاکان پاشەکشە پێ دەکرێ، هێرشی موسڵمانان بۆ سەر جولەکە کۆتایی پێ دێت.[٢٢]

**تێبینییەك:**

چەند کەسانێك وەك (حەمە ڕەحیم حەمە شەریف، حاجی ڕەحمان فەتاح) دەڵێن:

حەمەکەریم حەمەسەعید یەکێك بووە لەوانەی کەلەساڵی(١٩٤٦) چوین بۆ فەلەسطین وە(حەمە کەریم) شەهید بوو.. بەڵام هادی حاجی ئایزە کە بەمام هادی ناسراوە دەڵێت:

(حەمە کەریم حەمە سەعیدو عیزەتی ئەحمەدی چایچی) لە ساڵی(١٩٤١) لەگەڵ ڕەشید عالی گەیلانیدا بوون، سەرباز بوون لەسەر بازگەی (سینە دەبان) لەو کاتەدا هەردوو کوژران، مامۆستا عەلی قادرئاغەش بۆ (عیزەت) هەمان شت دەڵێت کەپورزایەتی.

**پۆلیسخانەی تەوێڵە [٢٣]:**

ئاشکرایە کەمرۆڤ ناتوانێ خۆی بەتەنها بژی، بەڵکو بەکۆمەڵ دەژی، کەبەکۆمەڵیش ژیا، جارجارە کێشەو گیروگرفت لەنێوانیان دا ڕوو دەدات، جا بۆئەوەی ئەوکێشانە درێژە نەکێشن و گەورە نەبن، دەبێت چارەسەر بکرێت و هەق خوراوانیش، هەقی خۆیان وەربگرن و ستەمکارانیش بەسزا بگەن.

جگە لەوەش بۆڕێکخستنی هەندێ باری کۆمەڵایەتیو بگرە لەسەر سنورەکانیش بۆ ئەنجام دانی کاری ڕامیاریش... لەبەر ئەمانە بوونی پۆلیسخانە پێویستیەکی کۆمەڵەو بارەگایەکی شارستانییەو داواکردنی کردنەوەی لەناوچەکەدا.. بەڵگەیەکە ئەو خەڵکە نایانەوێ بەئاژاوەو پەشێوی بژین.

وتمان لەسەرەتای شەڕی یەکەمی جیهانیەوە تەوێڵە بێئیدارەییەکی پێوە دیار بوو، هەندێ کێشە ڕوویدا، بۆیە ناچار بوون کەقادربەگ بکەن بەفەرمانڕەوای خۆیان، دواتریش کەدەوڵەتی عێراق دامەزرا، هەڵەبجە بووە قەزایەکی ڕەسمی عێراق و، حامدبەگ بووە قائیمقامی هەڵەبجە.. [٢٤]

خەڵکی تەوێڵە چون بەدەم ئەو دەنگ و باسەوە کەگوایا حکومەتی عێراقی دەیەوێ پۆلیسخانە لەتەوێڵە بکاتەوە، لەبەر ئەوەی لەسەر سنورە ... بەبیستنی ئەمە چەند تەوێڵەییەك چون بەدەم ئەو قسەوە، لەوانە:

مەلا حەبیبوالله ، سان ئەحمەد، قادرئاغا. بەڵام قادربەگ پێی خۆش نەبووە، موعارز بوو، بۆیە: حامد بەگ داوای لەقادربەگ کرد کەوازبێنێو بەرەنگاری نەکات، چونکە بەهەر شێوەیەك بێت حکومەت بڕیاری داوە کەلەتەوێڵە دەبێت پۆلیسخانە بکرێتەوە. [٢٥]

ئیتر لەساڵی (١٩٢٥) پۆلیسخانە لەتەوێڵە کرایەوەوماڵی قادرئاغا بوو بەیەکەم بارەگای پۆلیسخانە و گومرگ، یەکەم لێپرسراویش... مستەفای پوتەبوو کەچاوشێکی سێخەت بوو.

پاشان لەبەردەم مزگەوتی گەورە، پاڵ سورە چنارەکە، بینایەك هەبوو کرا بەپۆلیسخانە، دوایی ئەم شوێنە خاڵۆ باسان کردی بەچایخانە..

ئیتر بەدانانی پۆلیسخانە لەتەوێڵە، دەسەڵاتی حکومەتی مەلیکی زاڵ بوو وکێشەکان دەچوونە بەردەم پۆلیسخانەو قادربەگیش دەسەڵاتی جارانی نەماو ڕۆژ بەڕۆژ کز دەبوو.

یەکەم بینای مەرکەز کەدروستکراوە لەساڵی(١٩٣٤)دابوو لەنزیك مزگەوتی گەورە لەپشتی شارەوانی یەوە کەلەبەشی خوارەوەی ماڵیدەرە، کەتاساڵی (١٩٦٣)مابوو دوایی کەکەمێك قولەکانی ڕوخێنرا لەوە بەدوا تێکدرا. لەساڵی (١٩٧٠) دروستکرایەوە تالەشەڕی عێراق و ئێران دا (١٩٨٨) بەیەکجاری ڕوخێنراو هێشتا دروست نەکراوەتەوە.

پۆلیسخانەی تەوێڵە تازە دروستکراوەتەوە - ١٠/ ٢ /١٩٧٢

لەساڵی(١٩٣٠)دا دائیرەی ئیستهلاك کرایەوەو، یەکەم مەئموری ئەحمەد غەفورئاغا بوو، پاشان چەند تەوێڵەیی یەك بوونە مەئمور: وەك عەبدوالله ی ئەحمەدو عارفی حەمەحسێن و چەند کەسێکی تر، ئەم دائیرە، هەر لەگەڵ پۆلیسخانە بەیەکەوە بوون.

دوای چەند ساڵێك دائیرەی گومرگ لەپۆلیسخانە جیاکرایەوە، یەکەم بینای دائیرەی گومرگ ماڵی حاجی عەزیز حەبیب بوو، پاشان لەماڵی مەهدی کوڕی حاجی عەزیز بوو، کەلەو کاتەدا چەند دەست خانووی لەباخچە میرا کردەوەو یەکێك لەوخانوانە کرایە دائیرەی گومرگ.

پۆلیسخانەی تەوێڵە بەردەوام بوو تاساڵی(١٩٦٢)- هەرچەندە جارجارە دەکەوتە بەر ڕاپەڕینەکان، وەك ڕاپەڕینی ساڵی (١٩٤٧، ١٩٥٨) کەشۆڕش دەستی پێکرد، خاڵۆ برایم دەوری مەئمور مەرکەزی بینیو وەکیل بوو. پاش چەند گفت و گۆیەك و تەقەیەك مەرکەز تەسلیم کرا .. ئیتر تەوێڵە کەوتە دەست شۆڕش کەیەکێك بوو لەناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان. ئیتر لەم کاتەدا ڕێکخراوی پارتی ڕۆڵی مەرکەزی بینیو کارەکانی ئەنجام دەدا، لەساڵی (١٩٧٠) دیسان پۆلیسخانەو گومرگ کرانەوە، تابەهاری (١٩٧٤)، پاشان حکومەت وەك دائیرەکانی‌تر گەڕاندنیەوە بۆ ژێر دەسەلاّتی خۆی. لەدوای نسکۆی (١٩٧٥) مەرکەز بەشێك لەدائیرەکانی ئەمنیشی تیاکرایەوە، بێگومان ئەم ماوەیەی لەوەوپێشیش لەپۆلیسخانە ئەودەورەی ئەمنیەتە بینراوە بۆ حکومەت. لەدوای ڕاپەڕینەوە دەسەلاّتی حیزبەکان، فەرمانڕەوایی تەوێڵەیان کردووە، بەلاّم لەساڵی(١٩٩٨) لەسەرداوای خەڵکی تەوێڵە پۆلیسخانە جارێکی‌تر کرایەوەو ماڵی بەڕێز (تەحسین حەمە ئیمام) لەناو بازاڕدا، کرایە بارەگای پۆلیسخانەو ئیدریس سەعید بوو بەبەرپرسی بنکەکە. ئێستاش کەلەساڵی (٢٠٠٢) ئەفسەری پۆلیس مولازم محەمەد صالح بەرپرسی بنکەیەو دوو موفەوەزو (١٣) پۆلیسن.

بوونی پۆلیسخانە لەوناوچەدا زۆرباشە هەرچەندە بەهۆی سیاسەتی ڕژێمە دکتاتۆرەکانی عێراقەوە دەوری سیخوڕیو ستەمکاریو چەوساندنەوە و کێشە دروستکردنی بینیووە.

بەڕاستی لەساڵی(١٩٧٧-١٩٨١) پۆلیسخانەی تەوێڵە، هەڵسوکەوتەکانی باش نەبوو، ڕق و کینەی خۆی بەرامبەر بەپێشمەرگە، بەجەماوەرەکەی دەڕشت و، زۆرجار لەوێوە تەقە دەکرایە ناو ماڵەکانەوە خەڵکیان دەکوشت، جگە لەوەی کەبۆ بەیانی‌یەکەی ئازاری خەڵکیان دەدا. هەروەها دائیرەی گومرگیش خەڵکی بێ‌تاقەت دەکرد، بەهۆی ئەو فشارە زۆرەی کەدەیخستە سەر کاسبکاران، بەڵکو هەڵس وکەوتیان زیادەڕەوی تیابوو. ئاشکرایە ئەو ناوچە سنوریانە نیوەی گوزەران و ژیانیان لەسەر

خواکەرەم حاجی ئەبوبەکر - پۆلیس

ئەو بازرگانی کردنەی عێراق و ئێرانە.

مەئموری مەرکەزەکانی تەوێڵە زۆر بون لەوانە:

- مستەفای پووتە.
- ڕەشیدە فەندی.
- مەجیدە فەندی
- حسێن محەمەد سلێمانەیی.
- عوسمانی مەلا.
- مەلا ڕەئوف.
- ئیبراهیم قەرەداغی- کەبە (خاڵە بلە) بەناو بانگ بوو.

ناوی هەندێك لەوپۆلیس و باش چاوشە تەوێڵەیانەی کەلەپێش (١٤) تەمموزی (١٩٥٨)ەوە بوونە پۆلیس. (صالح تاتە- یەکەم باش چاوش بووە، ڕەشید حەمە ئەمین، ئیبراهیم ئەحمەد، نادر حەمەلەطیف، مستەفا حەمەڕەشید، مەحمود حەمەصاڵح، طاهری کاکەلە، ئەنوەر قادر، محەمەد حەمەصاڵح، محەمەد حاجی عەبدوالله، حەمەکەریم حاجی حەمەصاڵح، عیسا حاجی حەمەصاڵح، سەعدەدین فەتاح، عەبدوالله حەمەسەلیم، حەمەکەریم قادر، حەمەکەریم شەمسەدین، عەلی حاجی سەعید، حافیظ حسێن...)

ئەمانەش لەساڵی (١٩٥٩)دا بوونەتە پۆلیس.. (..طالب حەبیب، محەمەد عەزیز حەمە حسێن، عەبدول محەمەد، مستەفا مستەفا واتە مستەفای ئاسماء..)

لەساڵی (١٩٧٦)یش ئەم سیانەی خوارەوە لەباتی سەربازی بوونە پۆلیس (جەعفەر عەبدولڕەحمان، نەبەرد کاکەبرا، سەعدەدین حەمەعەلی) لەساڵی (١٩٩٨)یش کەپۆلیسخانە کرایەوە چەند کەسێك خۆیان کردە پۆلیسی پۆلیسخانەی تەوێڵە. کەئەمانەن: (فەریق صابر کاکەلە، عەدنان محەمەد، عادل صادق غەندی، ئیدریس عەبدولوەهاب) باش چاوشەکانی گومرگیش ئەمانە بوون: (ئەحمەد غەفور ئاغا، عوسمان (زاوای حاجی بارام تەوێڵەیی)، سەید ئەحمەد، سەید قادر، غەریب سلێمانەیی و، چەند عەرەبێکیش...)

## حیزب و حیزبایەتی لەتەوێڵە

**حیزبی هیوا : بەڕێز د.مارف خەزنەدار دەڵێ:**

(.. حیزبی هیوا یەکەم قوتابخانەی کوردایەتی ڕەسەن بوو بیروباوەڕی نیشتیمان پەروەری بلاوکردەوە، فیکری نیشتیمانی کوردی قەرزاری هیوایە، تادەگاتە هەموو ئەوحیزبانەی لەدواییدا لەکۆمەڵی کوردەواری عێراقدا دروست بوون، هەموویان قەرزاری حیزبی هیوان، ئەمە کۆمەنیستەکانیش دەگرێتەوە. بەشێکی زۆر لە دامەزرێنەرانی لقی کوردی لەحیزبی کۆمەنیستی عێراق و کۆمەنیستە کوردەکان ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەگەر ئەندامی حیزبی هیواش نەبووبن ئەندامی بەچکە شێرانی هیوا بوون...) (٢٦)

حیزبی هیوا لە نێوان سالانی (١٩٣٩-١٩٤٤) لە کوردستانی عێراق بە سەرۆکایەتی ڕەفیق حیلمی دامەزراوە. لە ماوەیەکی کەمدا توانی ببێتە حیزبێکی جەماوەری لە کوردستان دا.

.. پێشتر کۆمەڵەی برایەتی لە ساڵی(١٩٣٧) لە لایەن شێخ لەطیفی شێخ مەحمودەوە دامەزرابوو، چەند تەوێڵەیی یەك پەیوەندی‌یان پێوە کردبوو، دواتر هەر ئەو تەوێڵە یانەو چەند کەسێکی تر پەیوەندیان کرد بە حیزبی هیواوە، لە ساڵی (١٩٤٣)دا (٢٣) تەوێڵەیی لە حیزبی هیوادا بوون ئەوانەی دەوروبەری تەوێڵەش پەیوەندیان بەمانەوە بووە، بەهەموویانەوە زیاتر لە (٥٠) کەسێك بوون، لەئەندامە چالاکەکانی خەڵکی تەوێڵە ئەمانە بوون: بابا حاجی، محەمەدسان ئەحمەد، قادرئاغای عەبدوالله ئاغا، شێخ صەفائەدین، شێخ محەمەد ئەمین، حەمە ئەمین عەلی مەولوود، حاجی تۆفیق نادر، کوێخا ڕۆستەم، حەمە صاڵح عەبدولحەکیم، محەمەد حاجی حەمە ڕەحیم، محەمەد قادر حاجیلە، فاضل حەمە صالح، حاجی نادر حەمەعەزیز، مەلا حەمە ئەمین (حاجی ماموستا)، مەلا عەبدولئەحەد، عەبدوالله ئەحمەد، مستەفا فەتاح، حاجی حەمە ڕەشید خودادی سۆسەکان، حاجی حەمەعەلی کوزاد، حاجی ئەبوبەکر حاجی حەسەن، حەیبەالله سور، کوێخاحەمەسەلیم، حەمە کەرەم حاجی ئۆلوەهاب).

لەساڵی (١٩٤٣)دا خەیروالله عەبدولکەریم- کەیەکێك بووە لە چوار ئەفسەرەکەی باشوری کوردستان کە لە (١٩٤٧/٦/١٩) لە لایەن عێراقەوە لە سێدارە دراون- کەئەو کاتە لێپرسراوێکی حیزبی هیوا بووە، هاتووە بۆ تەوێڵە، ناوی ئەندامانی حیزبی هیوای نووسیوەو پرسیاری لێ کردون کە چەندیان

چەکیان هەیە و جۆری چەکەکانیان چۆنەو کارو ئیش و چالاکیان چۆنەو چۆن دەڕوات و زۆر ئومێدی پێیان بووە، دڵخۆش بووە بە سەردانەکەی.[٢٧]

ئەم حیزبە لە سەرەتای چلەکانەوە سەرتاسەری کوردستانی گرتبووەوە، دوایی کە تەشکیلاتی ئەم حیزبە گۆڕاو بوو بە دوو بەشەوە، ئەندامەکانیشی بەهەمان شێوەیان لێهات. سەرەنجام ئەندامەکانی، خۆیان یان لە پارتی دیموکراتی کوردستان یاله حیزبی شیوعی عێراقی بینیەوە.[٢٨]

**شیوعیەت لەتەوێڵەدا:**

مامۆستا مەحیەدین حاجی سەلیم کەیەکێك بووە لەشوعیە کۆنەکانی تەوێڵە، تاکۆتایی ژیانیشی هەر لەسەر ئەو ڕێبازە بووە.[٢٩] دەڵێ:

یەکەم کەس کەشیوعیەتی هێنایە تەوێڵە- شێخ جەعفەری حاجی مامەندی بووە کەلەساڵی(١٩٤٨) مامۆستا بووە لەتەوێڵەو، سەرەتا پەیوەندی بەچەند کەسێکەوە دەکات لەوانە: شێخ صەفائەدین و شێخ محەمەد ئەمینی برای‌و چەند کەسێکی‌تر. پێشتر کەلەساڵی (١٩٤٦) یەکەم شانەی شیوعی لەهەڵەبجە دادەمەزرێت، هەرلەوکاتەدا، غەفوری میرزا کەریم کەشوعیەکی ناسراوی سلێمانیە، پەیوەندی کردوە بەخەسرەوی کوێخا عارفی بیارەیی‌یەوە- کەیەکەم هەورامی بووە بووەتە شیوعی- لەڕێگەی ئەویشەوە دەچێتە بیارەو فەقێکانی ئەوێ کەفاتح و حەمەی مەلاکریم و ئەحمەدی شێخ عابدو.. تاد. ئەوانەش دەکاتە شیوعی.

بێگومان ئەو چەند شیوعیە کەشێخ جەعفەر کاریگەری هەبووە لەسەریانەوە لەگەڵ چوار پێنج کەسی تر کەلەوەو پێش لەحیزبی هیوا بوون، دواتر غەفوری میرزا کەریم توانی شانە یەکیان لێ‌دروست بکات و شێخ صەفائەدین بکاتە سەرۆك شانەیان.

ئیتر شیوعیەکان، ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو زیاد بوون دەڕۆیشتن بەتایبەت لەساڵەکانی(١٩٥٨-١٩٦٢) بارەگاشیان لە(باخچان)بوو کەپێیان دەوت(گەنجان)[٣٠] زۆربەشیان لەبەگری میللی‌دا بەشدار بوون. ئەمانە لە(ماوەزا) مەشقیان پێ‌دەکراو شەوانەش پاسەوانیان لەبازاڕو کۆڵانەکان دادەگرت.[٣١]

(گەنجان) ڕێخراوی شیوعی یەکان بوو، (لاوان)یش ڕێکخراوی پارتی بوو، گەنجان زۆر بوون. دژایەتی یەکتریان زۆر دەکرد، شیوعی‌یەکان، هەرکەسێك لەگەڵیان نەبوایە پێیان دەوت کۆنەپەرست(ڕەجعی)و، بەدەوڵەمەند و ئاغاو بەگەکانیان دەوت (کللی ئیستعمار). زۆر لەدەوڵەمەندو ئاغاکان لەترسی

شیوعیی‌یەکان لەکوردستاندا ناوی خۆیان بەشیوعی نووسی بوو، چونکە دەسەلاّتیان هەبوو. میرزا مەنگوڕی لەم بارەوە زۆر بەسەرهات دەگێڕێتەوە لەشوێنێك دا دەڵێ:

.. بەم پێیە حیزبی شیوعی دەستی دابووە گاڵتەکردن بەمقەدەراتی گەلی عێراق. ئەوەی کەرەبەن بوایە پێیان دەوت حیزب ژنت بۆدێنێت و تفەنگێك و دەمانچەیەك لەگەڵ (٢٠) سەر مەڕو بزن و جوتە ئێستریك و (١٥٠) دینار بەخشیشت پێشکەش ئەکات. بۆ سەرکەوتنی مەبەستەکانیان ئەمەیان دەوت، بازاڕی شیوعی برەوی ساندو کالاّی شیوعی لەبازاڕی سیاسەتدا بەنرخێکی فراوان دەفرۆشرا، سرودی(وطن حر وشعب سعید)، (سنمضی سنمضی الی مایرید) لەهەموو لایەکەوە بەئاسمانی عێراقا بەرز بوو بوویەوە.[٣٢]

دەسەلاّتی شیوعی‌یەکان زۆری نەبرد، عەبدولکەریم قاسم لێی دان و، هەروەها پارتیش کەوتە مونافەسەیان. بەهەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول ئەو دەسەلاّتەیان بەرەبەرە کزبوو. واتە شیوعی‌یەکان لەساڵی (١٩٦٢)دا بەرەو ڕووی دوومەسەلەی گرنگ بوونەوە هەم سیاسی هەم فکری. یەکێکیان شوڕشی ئەیلول و ئەویتریشیان ڕژێمی قاسم لێی دان و لەدەسەلاّت دووری خستنەوە.

**لەبیرەوەری( ٢١ ) ساڵی تێکۆشان دا:**

نایب عەبدوالله کەلەسالأنی(١٩٦١بۆ١٩٦٨) سەرپەرشتی شیوعی‌یەکانی هەڵەبجەو دەورو بەری کردووە لەکتێبی (بیرەوەری ٢١ساڵی تێکۆشان)ەکەی‌دا دەڵێ:

حیزبی شیوعی بایەخێکی تایبەتی دابوو بە هەورامی‌یەکان. بۆئەوەی زیاتر بچنە ناویانەوەو ڕایان بکێشین بۆ ڕیزی تێکۆشان و بۆناو حیزب، چونکە لەڕاستی‌دا هەورامی‌یەکان بەشێکی چەوساوەو گرنگی کۆمەڵگای کوردەوارین... هەروەها دەڵێ: ڕۆڵێکی گرنگیان لەتێکۆشانی حیزبدا دەبینی‌و کەسایەتی ژیرو زانا و ئیشکەر و زانایان تیا هەڵکەوتبوو، بۆنمونە: ماوەیەکی زۆر سکرتێری لیژنەی هەڵەبجە هاوڕێ‌یەکی هەورامی ئازاو خوێندەوارو کۆڵنەدەرو تێکۆشەر بوو... لەڕووی چەکداریشەوە گەلێ قارەمانیان تیاهەڵکەوتووە، وەك نەسرەدین عابد کەلەتەمەنی(١٤) ساڵیەوە بۆماوەی (٢٥)ساڵ چەکی پێشمەرگایەتی لەشاندا بووە... گەلێ ڕۆڵەی تریشیان ئاوا هەبووە، نەك لەهەڵەبجە بەڵکو لەسلێمانی‌و کەرکوك و جێگاکانی تریشدا هەبوون. پاشان دەڵێ: من پێم وایە هەردەم بایەخ بەو جەماوەرە دڵسۆزە بدرێ‌و هەرگیز فەراموش نەکرێن.[٣٣]

نایب عەبدوالله –لەچەند شوێنی تردا لەباسی شیوعی‌یەکانی تەوێڵەدا دەڵێ:

– لەساڵی(١٩٦١)دا مامۆستا مەحیەدین سکرتێری لیژنەی‌تەوێڵە بووە.[٣٤]

– چەند جارێکیش باسی ئازایی‌و تێکۆشانی برهانی خواجە حسێن و وەستا مەقصودی دارتاش و مەناف حەمە ڕەشیدو نەصرەدین عابدو وەستا عارفی ئاسنگەر دەکات...[٣٥]

– لەباسی کۆبونەوەی لەگەڵ لیژنەی تەوێڵەدا دەڵێ:[٣٦]

– ساڵی (١٩٦٥)، کەبرادەرانی پارتی‌و پێشمەرگە، لەتەوێڵە و ناوچەکەدا دەسەڵاتدار بوون ڕێکخراوی حیزبمان لەتەوێڵەو هەموو ناوچەکەدا بەنهێنی کاریان دەکرد، ئالەو کاتەدا، ڕێخراوی تەوێڵە زۆر بەهێزو فراوان بوو، لیژنەکەیان لەئاستی ناحیەدا بوو، سکرتێری لیژنەکەیان ئەندامی لیژنەی قەزابوو، چوار لیژنەی گەرەکیان لەدواوە بوو، هەر لیژنەیەکیش زیاد لە (٦–٧)شانەی ئەندامی‌و پاڵێوراوی پێوە بەسترابوو، جگە لەژمارەیەکی زۆریش لەدۆستەکانی حیزب، پەیوەندیشیان بە هەندێ دێهاتی دەوروبەری خۆشیانەوە هەبوو، کەشانەو هاوڕێو دۆستێکی زۆریان هەبوو.

ئەندامانی لیژنەکە، هەموو لەکەسانی شارەزاو ئازاو بەجەرگ بون. گیانی لێبوردن و قوربانی دانیان زۆر هەبوو، بەلاّم لەسەر هەندێ شتی بچوك لەناوخۆیان دا هەمیشە گیرو گرفتیان هەبوو،... بڕیاردرا لەگەڵ هاوڕێ عارف سەردانی تەوێڵە بکەین..[٣٧] لەدێی عەنەبەوە بەڕێگای قاچاخ، زۆر دوورو سەخت و بەردەلانی بەیانی زوو کەوتینە ڕێو لەئێوارەدا گەیشتینە تەوێڵە. لەکاتی نان خواردنی ئێوارەدا بوو، خۆمان کرد بەماڵی عەلی قادر ئاغادا کە ئەودەم سکرتێری لیژنەی تەوێڵە بوو، لەپاش نانخواردن و پشودان لیژنەی کۆکردەوەو کۆبونەوە دەستی پێکرد. لەنیوە شەودا گەیشتینە ئەنجامێکی باش و گیرو گرفتەکان تارادەیەك چارەسەر کرا... هەروەها دەڵێ:

دوایی پێم وتن: هیچ گیروگفتی سەرەکیتان نیە، هەموو دڵسۆزو ئیشکەرو تێکۆشەرن، بەلاّم ئەو نەخۆشی‌یەی کەسەدان ساڵە توشی گەلی کورد بووە ئێمەشی گرتووەتەوە، ئەوەیە کەبەسەرکردایەتی خۆمان ڕازی نین...

بەیانی‌یەکەی لەگەڵ ڕێکخستنەکانی خوارەوەدا کۆبوینەوە، ڕۆژی دووەم پێش ئەوەی زەردە لەکەل دەرکەوێ تەوێڵەمان بەجێهێشت.

لەچایخانەی سەرڕێگای (سۆسەکان) نزیك بووینەوە، بۆنی سیی‌و جگەر ئەوناوەی پڕ کردبوو، وتم: هاوڕێ عارف، ڕێگەمان دوورەو سەختە، باتێر سی‌و جگەر بخۆین ئینجا بڕۆین. لەوەڵامدا وتی: بڕوا بکە من لەتۆ زیاتر حەزی لێ‌دەکەم، تۆقسەت نەکردبایە من دەمکرد، بەڵام ئەی ئەگەر پێشمەرگەیان کادریی پارتی هاتن و ئێمەیان بینی؟ وتم: زۆر زۆردەمانگرن و دەمانبەن بۆلای (عەبدولی سۆران) کەزۆر دەمێکە بەتەمام بیبینم.

هەرزانیم وادەڵێیت، بابڕۆین بۆ جگەر خواردن.

هەریەکەی بەشی دوو کەس جگەرمان بەپیازە سورە خۆشەکەی هەورامانەوە خواردو بەسەلامەتی کەوتینە ڕێ بۆ هەڵەبجە، ئەمسەر خۆش بوو. هەم تێربووین هەمیش ڕێگاکە لێژبوو.

**بۆچی حیزبی شیوعی گرنگی‌دابوو بەتەوێڵە؟**

وەك دەڵێن [٣٨] حیزبی شیوعی گرنگیەکی زۆری دابوو بەهەورامی‌یەکان بەتایبەت شارۆچکەی تەوێڵە، دیارە دەبێت چەند هۆیەك بن، بەلای ئێمەوە گەلێك هۆبوون، لەوانە:

١- تەوێڵە مەڵبەندێکی ئاینی بوو، لەلایەکەوە بنکەیەکی گەورە بوو بۆ ڕێبازی نەقشبەندی، لەلایەکی تریشەوە مەڵبەندێکی زانست و خوێندەواری بوو، کۆمەڵێك زانای چاکی لێ‌هەڵکەوتبوو.

ناوەندێك بوو بۆناوچەکەو دەوروبەری، بگرە بۆ دەرەوەی ناوچەکەش، چونکە شێخەکان موریدو مەنسوبێکی زۆریان هەبوو، لەهەموو کوردستان و ئێران و تورکیا و سوریا و عەرەبستانەوە دەهاتنە تەوێڵە بۆ وەرگرتنی، هەم عیلم، هەم عیرفانیەت... جا شیوعی‌یەکان ویستیان دەست بگرن بەسەر هەردوو سەرچاوەکەداو سەرچاوەکە لێڵ بکەن، تائەندازەیەکیش سەرکەوتن. چونکە زوربەی شیوعی‌یە سەرەتایی‌یەکان کوڕە مەلاو کوڕە شێخ بوون.

٢- ڕۆشنبیرو خوێندەوارێکی زۆری تیا هەڵکەوتبوو، بەهۆی ئەوەی کەلە ساڵی (١٩٢٨)ەوە قوتابخانەی تیاکرا بوویەوە، قوتابیەکانیش پێگەیشتبوون.

٣- تەوێڵە ژمارەی دانیشتوانی زۆربوو، لەچاو گوندو لادێ‌و ناحیەکانی دەورو بەری‌دا. [٣٩]

٤- لەسەر سنوری عێراق و ئێران بوو، ئەمەش گرنگی‌یەکی زۆری پێ دابوو تالەوێ‌وە ئەم فکرو بۆچونە، بچێتە ئەودیوی سنور، چونکە فکرەی شیوعی سنور لەبەردەمی‌دا نیە.

٥- مەڵبەندێکی بازرگانیو پیشە سازی بوو بۆدەوروبەرەکەی، بەو بۆنەوە خەڵکەکەی تێکەڵاوی زۆری هەبوو لەگەڵ کەسانی تردا.

**بۆچونی شیوعیەت لەتەوێڵەدا پەرەی سەند؟**

فکری شیوعی لەتەوێڵەدا زۆرو وەزووش گەشەی سەند بەتایبەتی لەساڵانی(١٩٥٥-١٩٦٥)، خوێنەوارێکی زۆر چوون لەگەڵیدا، بەپێی قسەی مامۆستا مەحیەدین لەساڵی (١٩٥٩)دا نزیکەی (٥٠٠) کەس بوون، بۆیە لەو ماوەیە بەتەوێڵەیان وتووە مۆسکۆی دووەم. جالەو کەسانەی زوو بوونە شیوعیو ڕۆڵیشیان بووەو بوونە هۆی گەشەکردنی شیوعی لەتەوێڵەدا:

شێخ صەفائەدین، شێخ محەمەد ئەمین کاردۆخی، م. ئیسماعیل حەمە یوسف، م. محەمەدی حاجی نادر، م. عەلی قادر ئاغا، م. فاضل عەلی، م. مەحیەدین حاجی سەلیم، م. مەحمود عەبدەلڕەحیم، م. ئەحمەد حاجی عەلی، م. حسێن محەمەد، م. حەمەصاڵح فەتحواللە ، م. ئیبراهیم فەتاح...تاد.

بێگومان ئەم پەرەسەندن و گەشەکردنەش هۆکاری خۆی هەیە لەوانە:

١- بەهێزی پلان و نەخشەکەی حیزبی شیوعی:

شیوعیەکان نەخشەکەیان بەجۆرێك دارشت لەسەرەتاوە، کوڕە شێخ و کوڕە مەلاو کوڕە میرزاو کوڕە ڕیش سپیەکانیان، قەناعەت پێ کردبوون، کەئەمانەش لەڕۆشنبیرو خوێندەوارو قسە ڕۆیشتوان بوون، هەم بەهۆی خۆیانەوە هەم بەهۆی بنەماڵەکەیانەوە... چینی کرێکارو جوتیاریش کەزوربەی جەماوەرەکەن داوی ئەم بنەماڵانە کەوتوون. واتە ئەو ئەندامانەی کەسەرەتا بوونە هەڵگری فکرەی شیوعی، کوڕی ناوداران بوون خەڵکی گوێیان بۆدەگرتن و کاریگەریان هەبوو لەسەر جەماوەرەکە لەقوتابخانەو دیواخان و چایخانەو بازاڕدا ڕۆڵیان هەبوو.

٢- ئەودەسەڵاتە ڕۆحیەی شێخانی نەقشبەندی کەم بوویەوە، بەتایبەت بەکۆچی دوایی شێخ حیسامەدین و نەبونی جێگرێکی وابەوشێوەیە کەجێگاکەی پڕ بکاتەوە، هەروەها هەندێ زانای ناوداریش بوون یاپیر بوو بوون یامەشغوڵ بوون بە (نەحوصەرف و فقهە)وە نەیان دەتوانی ڕۆڵی خۆیان ببینن... ئەمە لە لایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە، نەبونی بانگەواز کەرێکی ئیسلامی لەتەوێڵەدا بەشێوازێکی ڕەسەن و هاوچەرخ و بەشێوەیەکی ژیرانەو حەکیمانە بۆشایەك بوو.. ئەمە لەسەرەتای پەنجاکانەوە بۆ شەستەکان لەتەوێڵەداوا بووە...

٣- بوونی ململانێ لەنێوان قادربەگ و هەندێ لەجەماوەرەکە، بەگشتی خەڵکەکەی بێتاقەت کربوو، هەروەها کوژرانی سانەو قادرئاغاش کاریگەری خۆی بوو بوو، (٤٠) ئەمانە بوونە هۆی ئەوە فکرەیەك، حیزبێك باوەشی بۆبکرێتەوە کەببێتە مامە خەمەی خەڵکی، دروشمەکانی شیوعیش لەوکاتەدا هەڵگری خەمەکان بوون.

٤- دەوڵەتی صەفەوی‌و عوسمانی یاهاوپەیمانەکانیان سەرسنورەکانیان ماندو کردبوو، لەدوای ئەوانیش دوو شەڕی گەورەی جیهانیش ڕووی دابوو، ئەمیش دیسان خەڵکی ناڕەحەت کردبوو، چونکە تەوێڵە لەسەر سنوور بوو، جاهاتنی ئەوفکرەو ئەو حزبە، دڵخۆشکەرە بوو، بۆ ئەو ناوچانە.

٥- کە دەوڵەتی عێراق دامەزرا، حکومەتی مەلیکیش شتێکی وای پێ نەبوو، وەك فکرەو بۆچونی نوێ تەنها بۆشایی‌یەکی ئیداری پڕکردبووە وە. ئەمە بۆ خەڵك بەگشتی، بۆ تەوێڵەش هەروەها وابوو.

٦- خەڵکی تەوێڵە بەزۆری زەحمەتکێش و کرێکارو جوتیارو باخەوان بوون، شیوعیەتیش ئەو دروشمانەی هەڵگرتبووکەئەمانە ڕزگاردەکات. لەولاشەوە دروشمەکانیان قەناعەت پێ‌کەرو بیرقەدارو تازە بوون.

٧- دەسەڵاتی ئیداری‌و سیاسی- قادربەگیش بەرەو لاوازی ڕۆیشتبوو بەڵکو دەسەڵاتی وای‌نەماوە، واتە وەك دەسەڵات کەسێکی وانەبوو بەەرنگاری بکات.

٨- هەواڵ و دەنگ و باس و ڕاگەیاندنی جیهان و عێراق و واقعەکە یارمەتی دەریان بوو... بەرامبەر بەکێشەی کورد، چونکە یەکیەتی سۆڤیەت بەڕزگارکەری گەلان و نەتەوەکانی جیهان ناسرابوو بەخەڵکەکە، لەولاشەوە ئەمریکاو بەریتانیاو... بەداگیرکەرو ئیستعمار ناسێنرابوو.. جا چونکە شیوعی یەکانی تەوێڵە خوێندەوار بوون، ئەمەیان باش ڕاڤە دەکردو بەنوسراو بەوتە بلاویان دەکردەوەو مێشکی خەڵکەکەیان پڕ کردبوو بەلای خۆیاندا ڕایان کێشابوون.

٩- هەمیشە نەوەی نوێ-حەزدەکات و چاوەڕێ‌ی شتی تازەو بیرو باوەڕو مۆدێلاتی نوێ دەکات.. جا ئەو خوێندەوارەی کە خوێندنیان تەواو کردبوو پێگەیشتبوون.. ئەبوایە گۆڕانکاریەك لەبیرو باوەڕو هەڵس و کەوتیان دا ببوایە.. لەبەرئەمە ئامادەییان هەبوو بۆ ڕێبازێك کەوەری بگرن و خزمەتی تیابکەن.. ئیتر لەحیزبی شیوعی‌دا خۆیان بینیەوە.

١٠- حیزبی تری ساحەکە، کەپارتی بوو... تاشۆڕشی ئەیلول نەکەوتبووە گەشەکردن، پاشان جیابوونەوەی باڵی مام جەلالیش کاریگەری هەبوو لەسەر پارتی، چونکە ڕێژەی ئەو باڵە لەتەوێڵە کەم نەبوون.. هەروەها لەچاو شیوعی یەکانیش دا کادری خوێندەواریان زۆر کەم بوو..

بێگومان کەپارتی خۆی گرت و زاڵ بوو بەسەر کێشە ناوخۆیی یەکانی خۆی، بەتایبەت گرنگیەکی زۆری دا بەتەوێڵە ئیتر لەوکاتەوە شیوعی یەکان بەرەو کزیو لاوازی ڕۆیشتن..

ئەم خاڵانە هەرچەندە هەندێکیان گشتین بۆ شوێنانی تریش، بەلام لەگەڵ خاڵە تایبەتیەکان دا بەیەکەوە کاریگەریان بووە لەسەر پەرەسەندنەکە.

## پارتی دیموکراتی کوردستان

پێشتر وتمان حیزبی هیوا لەساڵی(١٩٤١)دا ئەندام و لایەنگری لەتەوێڵەدا پەیدا کردبوو، بەلام لەساڵی(١٩٤٤)دا ڕیزەکانی لەبەر یەك ترازان و بوو بەدووبەشەوە، بازووی چەپ لەحیزب جیابووەو وەك حیزبێکی سەربەخۆ بەناوی حیزبی ڕزگای کوردەوە، کەوتە چالاکی نواندن و پشتی بەیەکیەتی سۆڤیەت بەست. بازوی ڕاستیش پشت ئەستور بوو بەبەریتانیا کەڕەفیق حیلمی سەرۆکایەتی دەکرد. پاشان بازووی چەپ و ڕاست چەند گۆڕانکاریەکیان بەسەرهات، لەئەنجامدا:

ئەندامەکانیان یا لەپارتی دیموکراتی کوردستان یا لەحیزبی شیوعی عێراقی خۆیان بینیەوە... کەمێکیشیان وازیان هێنا.[٤١]

..چونکە سەرکردایەتی هەردو حیزب- شۆڕش و ڕزگاری- بڕیاریان دا کەحیزبەکانی خۆیان هەڵوەشێنن و، بێنەڕیزی پارتیەوە، بەمەرجێ هەردوکیان کۆنگرەی تایبەتی خۆیان بگرن و لەو کۆنگرەیەدا، چۆنیەتی گۆڕانکاریەکە بە ئەندامەکانیان ڕابگەیەنن.

کۆنگرەی ئەم دوو حیزبە لەسەرەتای مانگی ئابی(١٩٤٦)دا گیراو، زوربەی هەرەزۆری ئەندامان (چوونە نێو حیزبی نوێ) یان پەسەند کرد...[٤٢]. کەحیزبی نوێش پارتی دیموکراتی کوردستان بوو کەلە (١٦/ئابی/١٩٤٦) دامەزرا. ئەندامانی حیزبی هیواش لەتەوێڵە خۆیان لەم دوو حیزبە بینیەوە.

کەواتە:

مێژووی پارتی لەتەوێڵە دەگەڕێتەوە بۆچالاکی زوربەی ئەندامەکانی حیزبی هیوا کەئەو زۆربەیە لەپارتیدا خۆیان بینیەوە. ئیتر بەدامەزراندنی پارتی کۆمەڵێکی تر پەیوەندیان کردو هەستی نەتەوایەتی زیاتر کەوتە گەشەکردن.

ئەم پارتیانەی تەوێڵە پەیوەندیان لەسەرەتاوە بە سلێمانیەوە بووە، بەڵام دوایی پەیوەست کران بەهەڵەبجەوە. چالاکی پارتی بەنهێنی بوو تالە (١٩٥٩/١/٩)دا پارتی مۆڵەتی کارکردنی پێدراو بەئازادی کەوتە چالاکی نواندن.

لەوساڵەدا پارتیەکانی تەوێڵە، دوکانی مەهدی حاجی ئایزەیان کرد وەك بارەگایەك، کەلەناو بازاڕدا بوو، بەرامبەر بەمزگەوتی گەورە، کەئێستا دوکانی وەستا بەشیری عەبدوالله یە.

لەم ساڵەدا چەند قوتابیەك هاوینەکەی گەڕانەوە بۆ تەوێڵە بارەگای قوتابیانیان دامەزراند لەو قوتابیانە:

بارام سەعدی، عەلی حەمەئەمین، طەلعەت مەهدی، عەبدولکەریم محەمەد ئەڵڵاك، کەریم کوێخا ڕۆستەم، شێرکۆ مەهدی، صابر مەحمود، فائیق عەزیز...

بێگومان لەتەوێڵە وەك زوربەی زۆری ناوچەکانی تری کوردستان ، تاسەرەتای ساڵی شەستەکان: دوو حیزب ڕۆڵیان هەبوو، شیوعیو پارتی. شیوعیەکان زۆرتر بوون و، زۆربەشیان خوێندەوارو گەنج بوون و، پەیوەندیشیان بەگەلێ قۆناغدا تێپەڕیوە... (چونکە حیزبی شیوعی یەکەم حیزبی عێراق بوو کەڕێخراوی لەکوردستاندا ببێ، شان بەشانی پارتی دیموکراتی کوردستان.. کاتێ لەساڵی(١٩٤٦)دا پارتی دیموکراتی کوردستان دامەزرا، حیزبی شیوعی بەڕێکخراوێکی زیادەی داناو، پێی وابوو، هەبوونی پێویست نیە، چونکە لەکوردستان دا حیزبی‌شیوعی هەیە).[٤٣] (خاڵی ناکۆکیشیان زۆربوو)[٤٤].

ئەوەی شایەنی باسە:

هەردوو حیزب زەمینەی لەباریان لەبەردەم دابوو بۆگەشەکردن، حیزبی شیوعی بەپلانێکی بەهێزو کۆمەڵێك دروشمی بریقەدارو بەڵێنی دڵخۆشکەرو، بوونی فراغێکی فکریو سیاسیو پشتیوانیەکی زۆری سۆڤیەت و، وەبوونی کۆمەڵێك دەرچووی ڕۆشنبیر لەناوچەکە زەمینەیان سازان بۆی.

پارتیش بەبزواندنی هەستی ئاینیو نەتەوایەتی کۆمەڵێك لەناودارو پیاو ماقوڵ و گەنجی لەدەورو بەری خۆی کۆکردەوە. لەو سەردەمەدا ئەوەی شیوعی

نەبوایە بەدواکەتوو و کلکی ئیستیعماریان دادەنا. بەڕێز کاک مەسعود بەرزانی لەم بارەوە دەڵێ:

(سەیر لەوەدایە کەئەو سەردەمە، هەڵسەنگاندنی چاکەو خراپە دوو سەرە بوو، ئێستاش هەرواماوە، ئەو ئاغایەی لایەنگری حیزبی کۆمۆنیست بوایێ بە( ئاغای دیموکراتیو پێشکەوتوو،) دەژمێردراو، هەرئاغایەك بەلای پارتیدا بوایێ بە(کۆنە پەرست و دواکەتوو) دەزانرا، ئەوچەند کەسەش کەلایەنی حیزبی بەعسی عەرەبیان گرتبوو بە(یەکیەتی خوان) ناودەبران).[٤٥]

خاڵێکی تریش لێرەدا پێویستە ئەویش ئەوەیە، دژایەتی کردنی ئیسلام لەلایەن شیوعیەکانەوە کاردانەوەیەکی دروست کردبوو بۆ ئەوەی پارتی جەماوەرێکی ببێت، چونکە زۆرێك لەپارتیەکان هاندەری ئاینی پاڵی پێوە نابوون کەبچنە ناوی، لەساڵی(١٩٧٠) کەیەکیەتی زانایان دروست بوو، زانایانێکی زۆر لەتەوێڵەدا چونە ناو ئەو یەکیەتیەو چالاکیان ئەنجام دا.

هەردوو حیزب شان بەشانی یەك، لەپێشبڕکێو کێشمە کێش دابوون. لەساڵەکانی (١٩٥٨) بۆ (١٩٦٥) شیوعیەکان زیاتر دەسەڵاتیان بووە، ئیتر لەوە بەدواوە هەر پارتی لەتەوێڵەدا باڵادەست بووە تاساڵی(١٩٧٥).

**هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول:**

لەئەنجامی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی حکومەتی عێراق و هەڵوێستە ناڵەبارەکانی بەرابەر بەکورد، جەماوەرو عەشایری کوردستان هەستی نەتەوایەتیان جولاو دەنگی نارەزایان بەرز کردەوە، گەلێك خۆپیشان دان و مانگرتن دەستی پێکرد، دواتریش خێڵەکان خۆیان چەکدارکردو دژ بەحکومەت وەستان، لەئەنجامدا:

پارتی لە (١١/ئەیلولی/١٩٦١)دا بڕیاری دەست پێکردنی شۆڕشیدا، ئیتر لەهەموو ناوچەکانی کوردستانەوە، خێڵ و عەشایرەکان جولان. ئەوەی شایەنی باس بێت عەشایرەکان، بەتایبەت ئاغاو دەرەبەگەکان زۆر پڕبوون لەحکومەت، چونکە لەوکاتە بڕیاری چاککردنی کشتوکاڵ درابوو، لەلایەن حکومەتی قاسمەوە، ئەو بڕیارەش لەبەرژەوەندی ئاغاکان نەبوو.

جەماوەری کورد هەر لەبادینان و خۆشناوەتیو پشدەرو بتوێن و شارباژێرو سورداش و گەرمیان و شارەزوورو پێنجوێن و هەورامان... خۆی ئامادە کرد بۆ پێشگرتن لەو سوپایەی عێراق کەلەموصڵ و کەرکوکەوە دەیویست بێت بەرەو کوردستان.

جـەماوەری دەڤـەری سـلێمانی، لـەدوو قوڵـەوە، خۆیـان ئامـادە کـرد، لەدەربەندی بازیان و دەربەندیخان، لەهەردوو قوڵەوە شەڕ گەرم بوو، لەسەرەتاوە هێزی چەکداری کورد، دەستی خۆی وەشاند لەسوپا، بەڵام زۆری نەبرد، ڕژێم بە تۆپ و فڕۆکە، بۆمبارانێکی سەختی هێزی چەکداری کوردی کرد، توانی هێزی کـورد، پەرتـەوازە بکـات و، ورەیـان بڕوخێنـێ. لەڕاستیدا هێـزی کـورد،تۆکمـەو پڕچەك نەکرابوو، جۆری چەکیشی زۆر لەئاستی چەکی حکومەتدا نەبوو... ئەمە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول بوو، وەیەکەم پێکدادانی کوردو حکومەت بوو.

جاخـەڵکی تەوێڵـەش بەشداری ئـەم پـەلامار دانـەیان کـردووە، دەگێڕنـەوە کە: لەناو بازاڕی تەوێڵەدا چەند پیکابێك لەخەڵك کۆبوویەوە، بەچەکی خۆیانەوە بەرەو دەربەندیخان بەڕێکەوتن، کەهەموویان سەربە ڕێکخستنەکانی پارتی بوون کەئەمەش ناوی هەندێکیانە:

سـەعدی بـەگ، مەهـدی حـاجی ئـایزە، هـادی حـاجی ئـایزە، حـاجی بابـا حاجی محەمەد، طاهری حەبیبە، حەمەمراد عەزە، عەلی هەباس، عیزەت حەسەن، کوێخا ڕۆستەم، ئۆڵڵای حسلەو، چەندانی تر.

دوایی کەگەڕانەوەو، حکومەتی عێراقی زاڵ بوویـەوە، ئەوانـەی لەوشـەڕەدا بەشدار بوون زۆریان گیران لەوانە:

- طاهری حەبیبە لەبازاڕدا (خاڵەبلە) چەکی کرد کەدەمانچەیەکی پێبوو.
سـەعدی بـەگ، مەهـدی حـاجی ئـایزە، حـاجی بابـا، هـادی حـاجی ئـایزە .. هەندێکیشیان خۆیان کەناردا و نەگیران.

**هەموو دەست پێکردنێك سەختە :**

بێگومان هەموو دەست پێکردنێك هـەم سەختەو هـەم لەخاڵێکـەوە دەست پێدەکات. شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێش هەم سەرەتاکەی سەخت و قورس بوو، کە دەستی پێ کرد، هەم لەدەڤەری شارەزوورو هەورامانـەوە سـەری هەڵداو کەوتـە گەشـەکردن.[٤٦]، بـەڵکو گرتنـی مەخفـەرەکانی تەوێڵـە و دەڤەرەکـە، بـووە خاڵی دەست پێکردن و سەرەتای شۆڕش، ئیتر ناوچەکە بووە پەناگا بۆ شـەڕی پارتیزانی پێشمەرگە.

کەشۆڕشی ئەیلول هەڵگیرسا، پارتی بەساچمەو وەرەندڵ و تاپڕ دەستی پێکـرد، دوایـی بڕنـەوی درێـژو وەسـەط و کلاشـینکۆف و دەمانچـەو ڕەشاشـی دەست کەوت.

بەڕێز کاك حەمەی فەرەج هەڵەبجەیی کەخۆی ئەندامێکی کاراو لێهاتووی ناو پارتیو شۆڕش بووە لەکتێبی بیرەوەریەکەی خۆیدا- لەشنرویوە بۆ ستۆکهۆڵم- دەڵێ:(٤٧)

.. لەساڵی(١٩٦١)دا پارتی خواخوای ئەوەی بوو بڕنەوێکی دەست کەوێت، بۆیە کەوتینە جمو جوڵ وپەیوەندیمان کرد بە حیزبیەکانمانەوە، هەندێکیان، یەکی تفەنگێکیان پێشکەش کردین، ئەوە بۆئێمە زۆر پێویست و شتێکی زۆر بەنرخ بوو، لەوانە:

- حاجی مستەفای تەپی سەفا.
- مستەفا فەنی لەخورماڵ.
- مستەفای حاجی فەرەج لەتەوێڵە.
- حاجی ئەولەی نەسە لەتەوێڵە.

ئەمە وای کرد کە هێزی چەکداری کورد، بەهێزبێت و توانای چالاکیو ڕزگارکردنی ناوچەکەیان کرد.

**یەکەم دەست وەشاندن لە ڕژێم:**

دوای ئەوەی چەند تەوێڵەیی‌یەك بونە پێشمەرگە، لەگەڵ پێشمەرگەکانی دەڤەرەکە، کەوتنە گەڕان بۆ تر ساندنی حکومەت و پیشاندانی هێزی پێشمەرگە. خەڵکی تەوێڵە زۆرێکیان بژێویان لەسەر کاسپی کردنی سەر سنورەکان بوو کەشمەکیان ئاڵ و گۆڕ دەکرد لەنێوان تەوێڵە و گوندەکانی ئێراندا.

جالەو کاتە لەتەوێڵەدا دائرەی گومرگی لێبوو، چەند قۆڵچی‌یەکی عەرەب ڕێگەیان بەو کاسب کارانە دەگرت، بۆئەمەش وەك کەمین دەردەچوونە ناو باخەکانەوە خۆیان دادەگرت بۆ کۆڵبەرەکان بەتایبەت لەقەلامسێن و گەریات کەمینیان دادەنا.

پێشمەرگەش لەوکاتەدا تازە پەیدا بوو بوون، چالاکی وایان ئەنجام نەدابوو، ویستیان هەڕەشە لەو قۆڵچیانە بکەن کەفشار نەخەنە سەر خەڵکی تەوێڵە و بیان ترسێنن. لەبەر ئەوە لە (١٩٦٢/٨/٢٤) چەند پێشمەرگەیەك لەخوار خانەقاوە لەپاڵ چایخانەکەی حەمەرەضا-دوایی بەچایخانەی ئەوڕەحمانی ملکی ناسراوە- ئێوارەیەك بۆیان دادەنیشن و کەمین دادەنێن بۆ قۆڵچی‌یەکان.

قۆڵچی‌یەکان دوان دەبن (حەمودیو سەید حەسەن) کەئێوارە دەگەڕێنەوە پێشمەرگەکان تێیان دەخوڕن، بەلام یەکێك لەپۆلیسەکان دەست دەکاتەوەو

سەلیەیەك دەکات و کەسیش ناپێکێ، بۆیە لەولاوە پێشمەرگەیەکی تر تەقەیان لێدەکات و دەیان کوژێت.

ئەمە سەرەتایەك بووبۆ شۆڕش و گۆڕانی بارو دۆخەکە لەناوچەکەدا، جا چونکە تەقەو کوشتن کەم بووە لەتەوێڵە، ئەمە زۆر دەنگی دایەوەو پێشمەرگە سامێکی پەیدا کرد.

**ڕێگە گرتن بەمەئمور مەرکەزی تەوێڵە:**

کاك حەمەی فەرەج دەڵێ:[٤٨]

..لەناوچەی هەڵەبجەوە نامەیەکیان بۆ ناردین کەئاگاداریان کردین کارمەندی نێوەندی تەوێڵە (مأمور مرکز) کەناوی (خاڵە بلە)[٤٩] بوو لەهەڵەبجە مانگانەی پۆلیس وەردەگرێو سبەینێش دەگەڕێتەوە، نامەکە لەلایەن حەمە ڕەحیم بەڵخەیی‌یەوە نێرابوو، ئێوارە نامەکەمان بەدەست گەیشت، لەنامەکەشدا ئەوەی دیاری کرابوو کە خاڵە(٦) پۆلیسی لەگەڵدایە، بەئۆتۆمبیلی (مسەلەحە) ئەگەڕێتەوە، پارەکەی کەپێیانە (١٥٠٠) هەزارو پێنج سەد دینارە، کەبۆ ئەو ڕۆژانە زۆربوو، خۆشیان ئامادە باشی ڕووداوی ڕێگەکەیان پێشبینی دەکرد، کەپارەکەیان لێ بسێنن.

ئێمە لە (زەڵەکێ)[٥٠] بەرەو(وەزەنێ)[٥١] بەڕێکەوتین، بەیانیەکەی گەیشتینە ئەوێ، ئەوجێیە، دەیڕوانیە نێوان بیارەو بەڵخە. هەرزوو خۆمان کرد بەدوو بەشەوە، من و جەمال بابان و عەلی شیعە، لەدەورو بەری جادەکە لەناو تەلانێکەوە خۆمان حەشاردا، بڕیار وابوو کە تەقە نەکەین هەتا(مسەلەحەکە) دەگاتە بەردەممان، شایانی باسە کەتەقەکردن ئەودەمە هێندە ئاسان نەبوو، سەرەتای شۆڕش بوو،

کاك (حلمی)[٥٢] لەسەر چیا بەدووربین تەماشای ڕێگەکەی دەکرد، ئاگاداری کردین کە(مسەلەحەکە) لە دەرگا شێخان دەرچوو بەرەو وەزەنێ دێت، ئێمەش خۆمان ئامادە کرد تادەگاتە نزیکمان، بەڵام لەناکاو لە پشتمانەوە بوو بەتەقە، کەلە(مسەلە حەکە) ورد بوینەوە، بۆمان دەرکەوت کەئەو نی‌یە تەقەدەکات، بەڵکو پۆلیس لەسۆسەکانەوە هاتبوون بۆ پاراستنی پارە هەڵگرەکان، پۆلیسێك[٥٣] کەدەچێتە سەر سەنگەرەکەی کاك حیلمی پێی دەڵێت چی دەکەیت لێرە؟ ئەویش پێشمەرگەیەکی لەگەڵ دەبێت، فریا دەکەوێت بۆ ئەوەی تەقە لە کاك حلمی نەکات، ئەم یەتە دەست و دەیکوژێت، کاتێك کەپۆلیسەکانی ناو(مسەلەحەکە) گوێیان لەتەقە کردنەکە کەدەبێت، ئەوانیش

خێرا دەیکەن بەتەقەو گەرانەوە بەرەو بیارە، ئەوەندە بەپەلە گەڕابووەوە، لەوێ وەرگەڕابوو، ئێمەش بەزەحمەت توانیمان لە وێ دەربچین، چونکە شەڕەکە زیادی کرد، کاک حیلمیو کاک تایەر تەوێڵە یی[٥٤] بریندار بوون و بەزەحمەتێکی زۆر هەردوکیانمان گەیاندە (تاوێرە). ئاگاداریشیان کردین کە هێزی پۆلیسی (قوەی سیار) کەدەورو بەری (١٥٠-٢٠٠)کەس دەبن لەسلێمانیەوە گەیشتونەتە ئەوێ.

ئێمەش بۆ بریندارەکانمان هەرئەوندە فریاکەوتین، کەفریاگوزاری بەپەلەیان (اسعافات اولیة)یان بۆ بکەین و دوو ئێسترمان بۆ گرتن لەڕێگەی شاخی شنرویێوە، شەو ناردنمانن بۆ هەڵەبجە، بە نهێنی بۆ ماڵی دۆستەکانمان بۆ تەداوی کردن، پاش ئەوە ئێمە ناوچەکەمان بەجێ هێشت و بەرەو سازان رۆیشتین و.. کاک تایەریشمان بەنهێنی ناردەوە بۆ سلێمانیو کاک حلمیش کەبرینەکەی چاکتربوو لەگەڵ خۆمان بەرەو سەرتەك و بەمۆ بەولاخ بردمان..

**یەکەم بارەگای هێزی پێشمەرگە:**

کەشۆڕشی چەکدارانەی کورد دەستی پیکرد لەمانگی(١٩٦٢/٧)دا یەکەم بارەگای هێزی پێشمەرگە لە ناوچەی وەزگێڵ دانرا.. کەکەوتۆتە پشتی هاوارو کەژی شنرویێوە. وەیەکەم مەفرەزەی سەرەتایش لەوکاتەدا تەشکیل کرا.[٥٥] هەر لەوکاتەشدا ئەندامەکانی پارتی ئاگادار کراونەتەوە ئەوانەی کەچەکیان هەیە چەکەکەیان بنێرن بۆیان بۆ بارەگاکانی هێز.لەوانەی چەکیان بۆناردون لەتەوێڵە:

مستەفای حاجی فەرەج، حەمەصاڵحی حاجیفەرەج، حاجیئەولەی نەسە، سەعدی بەگ، عیزەتی حەمەسەعید، مەحیەدین حەمە سەعید....

هیوا هەبوو ساچمەیەك، هەش بووە تاپڕێکی ناردووە، نزیکەی (١٦) تفەنگ لەشانێك کۆبووەتەوە...[٥٦]

**ڕزگار کردنی هەورامان:**

دوای ئەوەی کەپارتی لەگەڵ حکومەتی عێراق دا تێکچون و گفتوگۆیان گەیشتە بنبەست، پارتی بڕیاریدا چەند، ناوچەیەك ئازاد بکات و بیکاتە بنکەی پێشمەرگە لەکوردستان دا، بەتایبەت ڕزگارکردنی دەڤەری هەورامان و قەرەداغ و ماوەت زۆرپێویست و لەباربوو. بۆئەمەش هەورامان کرا بەسەرەتای ڕزگارکردن.

یەکەم مەفرەزە تەشکیل کرابوو لەمانگی تەموزی ساڵی(١٩٦٢)دا بوو، وەرزی زستانیش لەدواوە بوو، بۆیە بیرکردنەوە لەڕزگار کردنی چەند ناوچەیەك زۆر پێویست بوو.

لەهەورامان... هەنگاوی یەکەم لەوەزگێڵەوە بەرەو هاوارو جاوری‌و بەڵخە دەڕۆن، ئەو(٢٥) پێشمەرگەیە شەو لەبەڵخە دەمێننەوەو، زۆر یارمەتی‌یان دەدەن، وە ئاگاداری دۆست و لایەنگرەکانیان دەکەن کە بلاوی بکەنەوە کە پێشمەرگە دەیانەوێ جادەکە کۆنترۆڵ بکەن.

لە ملەی وەزەنێ عەمودێکی تەلەفۆن دەردەهێنن و کەڵەکێك دروست دەکەن و عەمودەکەی لە سەر دادەنێن، بە بەتانی و گوێنی، باش دەیبەستن، هەروەها کەڵەکێکی تر دروست دەکەن بە بەتانی دای دەپۆشن گوایە، ئەمەش گوللەی تۆپەو ئەوی کەش (مەدفەعە)و هەرچی جێ‌یەکیان بوێت بۆردومانی دەکەن.دووسێ ساچمە ژەن بەدەست دادەنێن لەگەڵ باوەڕ پێکراوێکدا بۆ پاسەوانی کردن، تەنیا باوەڕ پێکراوەکە ڕاستی مەسەلەکەی زانیوە کە ئەوە(مەدفەع) نیەو عەمودە...

هەر لەوێ خەبەر دەدەن بەمەخفەری سۆسەکان و بیارە گەر چۆڵی نەکەن و تەسلیم نەبن ئەوا ناچار دەبین کە مەخفەرەکەتان بەسەردا بڕوخێنین. ئیتر لەوێوە بەرەو ئاوێسەر دەکەونە ڕێ بۆگرتنی تەوێڵە [٥٧]

**گرتنی مەخفەری تەوێڵە :**

هەر لەسەرەتای شۆرشی ئەیلولەوە پۆلێك لەگیانفیداکانی تەوێڵە چوبوونە ڕیزی پێشمەرگەکانی کوردستانەوەو لەگەڵ شێخ حەمەئەمین و نوری حەمەی نانەواو حەمەی فەرەج... تاد چەکیان هەڵگرتوو لەوانە:

(تاهری حەبیبە، جەلالی وەیسی، عەبدولکەریم عەلی محەمەد (بەگە)، کوێخا ڕۆستەم، ڕەحمانی الله وەیس، نەصرەدین عەبدوالله ، عەبەکەی وەهاب، نوری غەفار بەگ، ئیدریس حاجی عەبدوالله ، صابری کاکەلە، شەفیعی ئەڵلاك، حەمە یوسفی مارفە..تاد) بەڕێز کاك حەمەی فەرەج دەڵێ: ...کەگەیشتینە ئاوێسەر وەلاممان بۆ دۆستەکانمان نارد وەك: مستەفای حاجی فەرەج، حەمە صاڵحی حاجی فەرەج، عەبدولخالقی حاجی عەبدولوەهاب، سەعدی بەگ، ئەولەی نەسە، عیزەتی حەمەسەعیدو کۆمەڵێکی دیکە لەتەوێڵە و، داوامان لێ‌کردن کەلەگەڵ خۆیانا نان و ئازوقەمان فریا بخەن. ئەو برادەرانەی گەیشتنە لامان، لەدانیشتنەکەدا زانیاری تەواومان سەبارەت بە پۆلیسەکان و ڕوتبەکانیان و ژمارەو جۆری چەك و تەقەمەنیان وەرگرت. بڕیاماندا کە پەیوەندیان لەگەڵ بکەین کەبێ هیچ تەقە کردنێك تەسلیم بەئێمە بن، ئەم بڕیارەمان تاقی کردەوە، وەلاممان بۆ(خاڵەبلە) نارد کەمەئوری مەرکەز بوو کەوا بەرگری نەکات و خۆی

بەدەستەوە بدات، خۆشمان دابەزینە ناو تەوێڵە و دەوروبەری مەخفەرەکەمان گرت، بەدالەکەی تەوێڵەمان گرت[٥٨] و بەتەلەفۆن لەگەڵ خاڵە بلە قسەمان کرد بۆ خۆ بەدەستەوەدان، شایانی باسە کەچەند جارێکی دیکەش داوامان لێکردبوو، بەلاّم ئەو هەر ئەم کارەی دوادەخست و داوای ئەوەی لێدەکردین کەجموڵمان لەشوێنێکی دیکە دەست پێ بکەین. لەئەنجامدا پەیمانی داینێ کەلە ماوەی(٢٤) کاتژمێردا خۆی بەدەستەوە بدات، بەلاّم دیار بوو کەگفتەکەی خاڵە بلە ڕاست دەرنەچوو، برادەرێکمان بروسکەیەکی خاڵە بلەی گرتبوو کەتیایدا نووسیبوی (ارحمونا یرحمکم الله) کەبۆ بەڕێوەبەرێتی پۆلیسی ناردبوو. لەبەر ئەوەی ئەوان جێ‌و ڕێو هەڵوێستیان لاوازو هی ئێمە سەرکەوتوو تربوو، بڕیارمان دا پەلاماریان بدەین.[٥٩]

پێشمەرگەکان بوونە چەند بەشێکەوە، بەشێکیان لەپشتی خانوەکەی (مام بلە)وە لە (بەرامبەر)، سەنگەریان بەستبوو، دووسێ پێشمەرگەش لەقەلاّی گاوران بوون، ئەوانی تر دەوری مەخفەرەکەیان دابوو، لەسەربانی خانوەکەی حاجی ئیسماعیلی بەکرەو، ژێر مارەکەی حاجی تۆفیق بوون، لەوێوە چەند تەقەیەکیان کرد. لەئەنجام دا خاڵۆ برایم و پۆلیسەکان تەسلیم بوون. بەم شێوە لە (٧/١٠/١٩٦٢)دا مەخفەری تەوێڵە گیرا (پێشمەرگە چونە ناو مەخفەرەکەوەو پۆلیسەکان چەك کران و لەژوورێکدا دانران و خاڵە بلەش لەژوورێکی تر. دەست کەوتیش (٢٤) تفەنگ و یەك ڕەشاش و دەمانجەیەك و دووربینێك و جیهازێکی پەیوەندیو کۆمەڵێك فیشەك.)[٦٠]

لەو پۆلیسانەی کەلە مەخفەرەکە بوون:

(ڕەشید حەمە ئەمین، عەبە ڕەش، ڕەشید ڕەحیم، سەعدەدین فەتاح، حەمەی صالح تاتە، محەمەدحاجی عەبدوالله ، جەمیل ئاغە جافر، فەرەجوالله محەمەد، حەمە ئەمین حەمەخالد، نافع محەمەد، قادرە سوری سۆرانی، ئەم بەڵخەیانەش: غەفور ئەمین، مستەفا خدر، حەمەڕەحیم، عەبدوڕەحمان، وەچەند بەرزنجەیی‌یەکیش:

ئیتر ئەم پۆلیسانە هەندێکیان بوونە پێشمەرگەو، خاڵۆ برایم وئەوانی تر بەرەو هەڵەبجە بەڕێ کران. ئەوەی شایەنی باسە: ڕێکخستنی پارتی لەتەوێڵە هاوکاریەکی باشی پێشمەرگەیان کردو بەخواردن و ئازوقە بەڕێ نیشاندان و چەکداری کردن و... تاد.

لەو ماوەیەدا خەڵکی تەوێڵە لەناو ئاوایی دوورکەوتنەوەو چوونە ناو باخەکانی دزاوەرو ئاوێسەر، بەڵکو هەندێ ماڵیش بەرەو دزاوەرو کەیمنەو هانەگەرمڵە ڕۆیشتن، لەترسی ئەوەی نەوەك حکومەت بە فڕۆکە تەوێڵە بۆردومان بکات، بەڵام ئەمە زۆری نەبرد خەڵکی گەڕایەوە ناو خانوەکان، چونکە لەلایەکەوە سەرما دەستی پێ کردبوو، دوای ئەوەش ناوچەی هەورامان بەتەواوی کۆنترۆڵ کراو، بووە ناوچەی ڕزگار کراوی کوردستان کەتاساڵی (١٩٧٥) بەردەوام بوو.

**گرتنی مەخفەری سۆسەکان:**

دوای ئەوەی تەوێڵە ڕزگارکرا، نوری حەمەی نانەواو چەند پێشمەرگەیەك مانەوە لەتەوێڵە، ئەوانی تریش بەرەو مەخفەری سۆسەکان هاتن. بەڕێز کاکە حەمەی فەرەج دەڵێ:

..لەبەر ئەوەی هێرش بکەینە سەر مەخفەرەکە، یەکێکمان ناردە ئەوێ کەلەهاتنی ئێمە ئاگاداریان بکەن، لەوێ دووسێ کەسی لێبوو، کاك حەمەی گوڵپی‌و کاك کەریم هاواری، هەردووکیان پۆلیس بوون سەر بەخۆمان بوون.[٦١] کاتێك گەیشتین داوامان لێکردن مەخفەرەکەمان بدەنە دەست، خۆئەگەرنا ئەوا هێرش دەکەینە سەرتان بەزۆر لێتان دەسێنین. ئێمەش چووبووینە نزیك تەنکی ئاوی مەخفەرەکەوە، دوو پۆلیسەکەی سەربەخۆمان هەولێکی زۆریان دابوو کەپۆلیسەکانی دیکە کەژمارەیان (١٢) کەس بوون قەناعەت پێ بکەن، بەڵام هەوڵدانەکەیان سەری نەگرت. فەرماندەی مەخفەرەکە کەعەریف محەمەد کەللەڕەقی دەمار گرژبوو، بڕیاری دابوو کەهەروا بە ئاسانی خۆی نەدات بەدەستەوە، ئیدی ناچاربووین کەپەلاماریان بدەین.

لەئەنجام دا: عەریف محەمەدو چوار پۆلیسی دیکە ڕایان کرد،[٦٢] بەرەو هاوارو، لەوێوە بەڕێی تاوێرە بەرەو هەڵەبجە بڕۆن، چوینە ناو مەخفەرەکەو، پۆلیسەکانی دیکەمان چەك کردو کاك شێخ محەمەد ئەمینمان لەوێ دانا، من و جەمال بابان و عەلی شیعە، دوای عەریف محەمەدو چوار پۆلیسەکەی ترکەوتین، مەبەستمان ئەوە بوو کەبەر لەوەی بگەنە هەڵەبجە ڕێیان پێ بگرین، ڕێگەی نێوان هاوارو تاوێرەش دوورەو دەبوایە فریا بکەوتینایە، ئەودەمە هیچ بیرمان لە هیلاکی‌و ماندو بوون نەدەکردەوە، گرنگ بەلامانەوە بڵاو کردنەوەی دەسەڵاتی شۆڕش بوو، بەماوەیەکی کەم ڕێگەکەمان بڕی‌و تاریکی‌و لێڵی بەیانی گەیشتینە تاوێرە، لەوێ گوێمان بۆ ئەو کاروانچی‌یانە هەڵخست کەبەرەو هەڵەبجە دەڕۆشتن، یەك لەوانە ئاگاداری کردین کەعەریف محەمەدو چوار پۆلیس

بەدوامانەوەن، بەرێکەوت پۆلیسەکان لەو نزیکانەی ئێمە دەبن و گوێیان لەقسەکانمان دەبێت و بەرەو دواوە دەگەڕێنەوە، ویستیان ڕێگەیەکی دیکە بەرەو هەڵەبجە بگرن، بەلاّم ئیمە پێمان زانین، بەرەو ئەو ڕێیەی ئەوان دوایان کەوتین ڕێگەکە زۆر هەوراز بوو، گەیشتبوینە نیوەی ڕێگەکە گوێمان لەدەنگە دەنگ بوو لەدۆڵەکەدا، دونیا کەمێك ڕوناك ببوو، ئێمەش کەمێك بلاّو بوینەوە تارِیِّی ئەوەیان نەبێت بەرەو یاڵەکانی سەرەوە بڕۆن، ئێمە تارماییەکانی ئەوانمان دەبینی‌و هاوارمان لێکردن کە خۆبەدەستەوە بدەن، بەلاّم ئەوان کەوتنە تەقە کردن لیمان، ئەوجێیەی کەئێمەی لێبووین بەسەر ئەواندا دەیڕوانی هاوارمان لێکردنەوە، ئەگەر خۆبەدەستەوە نەدەن دەتان کوژین، پاش مشتومڕێکی نێوان خۆیان هەستیشیان دەکرد کەژمارەی ئێمە زۆرەو، ناچار خۆیان دا بەدەستەوەو دەرکەوت کە دوو پارچە چەکی زێدە شیان پێبوو، کاك عەلی ئەحە کەچەڵ لەگەڵ ئێمە بوو بێ چەك بوو، چەکێکمان دایەو ئەوانی کەش میلەکانمان دەرهێناو لەگەڵ فیشەلغەکاندا دامان بەسەر شانی پۆلیسەکانداو هەموو پێکەوە بەرەو هاوار ڕێکەوتین، خەڵکی ئەوێ بەچەپڵەڕێزان پێشوازیان لێکردین، خواردن و نان و دۆیان بۆ هێناین و پیرۆزبایی گەرمی ئەم سەرکەوتنەیان لێکردین.

لەهاوار بریارمان دا بەرەو بەڵخە بڕۆین و وەلاّمیش بۆ شێخ حەمەئەمین و ئەوانی دیکە بنێرین کەبێنە بەڵخەو گشتمان لەوێ کۆببینەوە بێگومان هەموومان لەوێ یەکترمان گرتەوە، شەو کۆبونەوەیەکمان کرد کە پلانێك بۆ گرتنی مەخفەری بیارە دابنێین.[٦٣]

**گرتنی مەخفەری بیارە:**

هێزی پێشمەرگەی کوردستان سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتنیان بەدەست هێناو، بەرەو بیارەش کەوتنە ڕێ، کەبڕیار بوو ئەویش ڕزگار بکرێت.

لەو کاتەدا هەم پێشمەرگە ژمارەیان زیادی کردو هەم ورەشیان بەرز بوویەوە بۆیە: .. هێزەکە بووبە سێ ڕەتڵ و لە سێ قۆڵەوە، پەلاماری مەخفەرەکە درا کە نزیکی مەخفەرەکەش بوونەوە هاواریان لێ کردن کە خۆیان تەسلیم بکەن. وەلەڕێی دۆستەکانیشیانەوە پەیوەندیان پێوە کردن کە خۆیان بدەن بەدەستەوە بۆ ئەوەی نەکوژرێن. پێشمەرگەکان بەهۆی دوان لەپۆلیسەکان کەپارتی بوون، هەموو زانیاریەکی ناو مەخفەرەکەیان دەزانی. ئەوشەوە دەوری مەخفەرەکەدرا، تابەیانی، کەڕۆژ بووەوە پۆلیسەکان خۆیان دا بەدەستەوە کەژمارەیان (١٩)کەس بوون لەگەڵ بەڕێوەبەری مەخفەرەکەدا. دەستکەوتی پێشمەرگە لەم مەخفەرەدا:

(١٩) تفەنگ، یەك ڕەشاش، جیهازێك، لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر لەفیشەك و كەل و پەل. لەپۆلیسەكان حەمەسەمینۆف و حسێن مەحمود، بوون بەپێشمەرگەو ئەوانی دیكەش بەكەفالەت بەردران كەجارێكی دیكە نەچنەوە ڕیزی حكومەتی عێراق.[٦٤]

ئەوەی شایەنی باسە:

–حەمەگوڵپی لەگرتنیمەخفەری بیارەدا دەورێكی قارەمانانەی هەبووە.[٦٥]

– حەسەن بەگی پالأنیاش لەگرتنی مەخفەری بیارەو ناوچەكەدا بەگشتی ڕۆڵی زۆری بووە.

–.. دواتر مەخفەری بیارە كراوە بەبارەگای لق و بەر پرسیاری لق شێخ حەمەئەمین بووە، بەرپرسیاری عەسكەریش كاك حەمەی فەرەج بووە.. حیلمی عەلی شەریفیش كەئەندامی سەركردایەتی بووە لەبەمۆوە هاتوەتە هەورامان و بڕیار دراوە مەخفەرەكەی خورماڵ بگرن.. لەم كاتەدا ژمارەی پێشمەرگە لەدەڤەرەكە گەیشتووەتە (٧٠) پێشمەرگە.[٦٦]

– ئیتر ناوچەی هەورامان بەگشتیو، تەوێڵەو بیارە بەتایبەتی بووە پەناگاو پارێزەرو قەڵاو ناوەندی شۆڕش و پێشمەرگە، بۆ شەڕی پارتیزانی لە هەڵەبجەو دەورو بەری دەستیان دەوەشاندو دەگەڕانەوە بۆ تەوێڵە، هەروەها زوربەی پێشمەرگەكانی خەڵكی هەڵەبجەو سلێمانیودەورو بەری كەلەوێ بوون ماڵ و منداڵەكانیشیان هێنایە بیارەو تەوێڵە .

– بێگوكان ساڵی (١٩٦٢) بەساڵی شۆڕشی پۆلیس بەناوبانگ بوو، چونكە لەوساڵەدا،پۆلیسی شارو شارۆچكەكانی لیوای سلێمانی و هەولێر پەیوەندیان كرد بەشۆڕشەوە، زوربەی لقەكانی پێشمەرگە لەپۆلیس پێكهاتبوون، زوربەی سەرپەل و سەرلقەكانیش لەپۆلیس دانرابوو، بەڕاستی پۆلیسی كورد لەوساڵەدا، ڕۆڵێكی زۆر گەورەیان لەگەشەكردن و پەرەپێدان و خورت كردن و سەقام گیرر كردنی شۆڕشی ئەیلول دا هەبوو.[٦٧]

**پەلامار دانەكەی زەعیم صدیق و شەڕی پردی زەڵم[٦٨] :**

دوای ئەوەی هەندێ ناوچە لەلایەن هێزی پێشمەرگەی كوردستانەوە ئازاد كرابوو، وە ڕۆژانەش پێشمەرگەش دەستی لەحكومەت دەوەشاند. حكومەت لیوای (٢٠)ی تەرخان كرد، بۆكپ كردنەوەی شۆڕش لەناوچەی سلێمانی، ئەمەش زەعیم صدیق سەرپەرشتی دەكردو لەلایەن عەبدوسەلام عارفەوە ڕاسپێرا بوو. لە (١٩٦٣/٦/٩) حكومەت هاتوچۆی لەناو شاری سلێمانی قەدەغە كرد،

نزیکەی (٤٠٠٠) کەسی گرت و، (٣٠٠) کەسی گوللە باران کردن و باقی دیلەکانیشی بۆماوەی دوو مانگ ئەشکەنجەدان، وەچەند گوندێکی سوتان و وێران کرد، وەك گوندی (بیلکێ)و (سیارە)و گوندەکانی ناوچەی (خەلەکان و عەربەت و سورداش و قەرەداغ و بازیان) کە نزیکەی (٣٠) گوند بوون وە زۆریشی لێگرتن و کوشتن[٦٩].

لەو گیراوانە فەرمانبەری حکومی زۆری تیابوو ( ڕەئیسی صحەو مدیری مەعاریف و مدیری طاپۆ)شی تیابووە.

ئەمە هەموو بەفەرمانی زەعیم صدیقی خوێن ڕێژ بوو.

کەهێزەکەی زەعیم صدیق بەرەو سەیدصادق هات، ماوەیەك لەوێ مایەوە، پێکهاتبوو لەلیوای (٢٠)و دوو فەوجی موظە لیو (٧٠٠) جاش و چەند دەبابەو فرۆکەیەك.

هێزی پێشمەرگەش (٧٥)کەس بوون، نەوشیروان فوئاد مەستی بەرپرسی یەکەم بووە، لەبیارە دانیشتبوو، حەمەی فەرەج لێپرسراوی سەربازی بووە، تەها بامەڕنیش سەرپەرشتی ناوچەکەی کردووە. چەکی پێشمەرگە ئەوکاتە (١١)تیرو (٥) تیری ئینگلیزیبووە، تاك تاکە کلاشینکۆف و ڕەشاش بووە. بۆ ئەم شەڕە (١٢) کەس لەخەڵکی تەوێڵە لەم هێزەدا بەشدار بوون لەوانە:

حاجی الله کەرەم حاجی تۆفیق - ١٦ / ١٢ / ٢٠٠٢

(الله کەرەم حاجی تۆفیق، مستەفای حاجی قادر، حەمەیوسف مارفە، عەبدوالله نەصروالله ، عەبدولکەریم عەلی محەمەد (بەگە)، نەصرەدین عەبدوالله ، ئادەم کەریم، عەبدولخالق عەبدولوەهاب، عەبدوالله حەمە ڕەشید،... هەروەها چەند کەسێك لەخەڵکی تری هەورامان وەك: محەمەد گوڵپی، ئەمین دەگا شێخانی، حسێن بەگی غەفار بەگ و .. چەندانی تر.. بەشداربوون.

کەهەواڵ دراوە سوپای عێراق دەیەوێ بەرەو هەڵەبجەو هەورامان بێت، پێشمەرگە بڕیاری داوە تادەتوانێت

بەرەنگاری دەکات. بۆیە لەپردی زەڵم لەم بەرو ئەبەری جادە، پێشمەرگە چووەتە کەمینـەوە کەسـەرلەبەیانی یـەکی (مـانگی /٧/١٩٦٣) چـەند تانـك و زریێپـۆش هاتون و پاشان چەیش و جاش هاتون، بۆماوەی نیوسەعات شەڕ بەردەوام بووە، جەیشـەکە شـکاوەو نـەیتوانیوە بێتـە پێشـەوە، بۆیـە گەڕاوەتـەوە بـەرەو سـەید صادق. دوای چەند ڕۆژێك حکومەت بەهێزێکی زۆرترەوە کەوتوەتەڕێ، بەسێ ڕەتڵـەوە یـەکێ لـەقاجرەوە یـەکێ لەگێڵەکـەوە، یـەکێ لـەجادەوە.. هێـزی پێشـمەرگەش ڕەشاشـێکی لەسـەر گردەکـەی گـردی گـۆوە دانـاوە لەگـەڵ چەند پێشمەرگەیەك، پێشمەرگەش لەمبـەرو ئەوبەری جادەکەی گرتووە لەناو جۆگەو زەلکاوەکاندا. (لەسەر پێشنیاری مستەفای حاجی قادر ئاو دەکەنە سەر مەزرای ئەو ناوە بۆ ئەوەی کەدەبابەهات بچەقن.)(٧٠)

ئەم جارەش: کەشەڕ گەرم بووە، ماوەی دوو سەعاتی خایاندوە، سەربازو جاشێکی زۆر کوژراوەو هێزی پێشمەرگەش هیچ زیانی نەبووە، بەڵام زۆری پـێ نەچووە حکومـەت هێرشـێکی تـری کتـوپڕی لەدەمـەو ئێوارەیەکدا کردووەتـەوەو ئـەمجارەش سـەرکەوتوو نـەبووە، لەهێرشـی چـوارەمیدا تانکـەکان پشـتی پێشـمەرگەیان گرتـووەو، خۆیـان گەیانـدوە دوو ڕیانەکـەی هەڵەبجـە- خورماڵ ٤ سەعات بەبەردەوامی شەڕبووە. لەم شەڕەدا (١٤) پێشمەرگە شەهید بوون، کە(٣) پێشـمەرگەیان، تانکـەکان چـوو ›بوون بـە سـەریاندا، کـە (ئـەمین دەگـا شـێخانیو عنایەت ئێناخیو شەهید حەسەن) بوون، چەند پێشمەرگەیەکیش بریندار بوون.

یـەکێکی تـر لەو پێشـمەرگانەی تـر، کەشـەهید بـووە لەم شەڕەدا، شەهید حەمـەگوڵپی بـووە کەتافیشـەکی پـێ بـووە شـەڕی کـردووە کەفیشەکیشـی پیێنەماوە، بەخەنجەرەکەی چووەتە سەر دەبابەیەك، بۆئەوەی پەلاماری عەدەد تۆپەکە بدات، بەڵام لەدواوە دەبابەیەکی تر، تەقەی لێدەکات و شەهیدی دەکات، دواتر بەدوای دەبابەیەکدا تاسەیدصادق ڕای دەکێشن(٧١).

ئـەم چـوار هێرشـە لـەماوەی (١٥) ڕۆژدا کـران و، هێـزی پێشـمەرگە جگـە لەکشـانەوە بـۆ خورمـاڵ و بیـارە هـیچ چاریـان نـەماوە، هێـزی حکومـەتیش بـەرەو هەڵەبجـە ڕۆیشـتوون، لەوێشـەوە بـەرەو زەردەهـاڵ کەوتنـەڕێ، هێـزی پێشـمەرگە لەشاخەکانی بیارەوە، چوونەتە سەنگەرەوە، جەیش دەسـتی کـرد بەتۆپ بـارانی دێهاتەکانی ئەو ناوە. لەو شەڕەدا ئەو دەورو بـەرە هەمووسـوتاوە، زیـانێکی زۆر لەمەڕو ماڵات کەوتووە، خەڵکێکی بێتاوان کوژراون، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك پاشان جەیشەکە گەڕاوەتەوە بەرەو هەڵەبجەو نەیتوانیوە بگاتە بیارە.

دەوری کاک (فەرەجی لەمە بیارە)یش کەم نەبووە لەم شەڕەدا کەوەك کادیرێك، پێشمەرگەی لەهەواڵەکان ئاگادار کردوەتەوە.

لەم هێرشە دڕندانەی زەعیم صدیق، خەڵکێکی زۆری دەڤەری سلێمانیو شارەزوورو هەڵەبجەو خورماڵ، لەدەست زوڵمی ئەو هێرشە ڕای کردبووە هەورامان بەتایبەت تەوێڵە، لەنفوسی خۆی زیاتر خەڵکی لێبووەو داڵدەی خەڵکی داوە.

**پارتی یە دێرینەکان:**

پارتی دیموکراتی کوردستان، پێش ئەوەی بێتە حیزبێکی چەکدارو شۆڕش هەڵگیرسێنی، وەك پارتێکی سیاییو تەنزیمی لەکوردستاندا کاری دەکردو کۆمەڵێك تەنزیمی هەبوو. پارتی‌یە دێرینەکانی پێش شۆڕشی ئەیلول لەتەوێڵەدا نزیکەی(١٥٠)کەس بوون لەوانە:

هادی حاجی عەزیز حەبیب - ١٠ / ٧ / ٢٠٠٢

(مەهدی عەزیز حەبیب، حەمە مراد عەزیز، هادی عەزیز حەبیب، سەعدی بەگ، کوێخا ڕۆستەم، محەمەد محەمەد(حاجی بابا)، عەلی عەباس، محەمەد ئەڵلاك، شەفیع محەمەد، عیزەت حەسەن، عەزیز عەزیز(ئایزەی فاتە)، کوێخا حەمەسەلیم، عەبدوالله حەمەڕەشید، عەبدولخالق عەبدولوەهاب، مەحیەدین حەمەسەعید، مستەفا فەرەج، طاهری حەبیب، ڕەحمان الله وەیس، عەلی کوێخا عەبدوالله ، حەمەصالح فەرەج، حامد لاوە، عەبدوالله نەصروالله (حاجی ئەولە)، عیزەت حەمەسەعید، عەبدولکەریم ئەحمەد موعین، مستەفا قادر، عەبدولکەریم عەلی محەمەد (بەگە)، جەلال وەیسی، فەجەی حاجیلە، حەمەی حاجیلە، حەمەصاڵحی وەیسی، عارفی حەمەحسێن، ئەحمەد عەبدوڕەحیم (وەستا ئەحمەدی تارتاش)، عەزیز کەریم، صابری کاکەلە، عابد سان ئەحمەد، عابد عەبدولقادر... تاد.

**پێشمەرگەکانی شۆڕشی ئەیلول:**

لەسەرەتای شۆڕشەوە بۆ نسکۆی شۆڕش، نزیکەی (١٢٠) کەس لەخەڵکی تەوێڵە بوونەتە پێشمەرگە. زوربەی زۆری ئەو کەسانەی کەسەر بەڕێکخستنی پارتی بوون، لەسەرەتاوە بوونەتە پێشمەرگە، لەشەڕی دەربەندیخان و گرتنی مەخفەری تەوێڵە و شەڕی زەڵم دا بەشدار بوون. بەڵام لەساڵی(١٩٦٥) بەولاوە زۆرێك لە مانە لەپێشمەرگایەتی وازیان هێنا یا هەروەك تەنزیمێك مانەوە، جگە لەمانەش هەندێکی تر بوونە پێشمەرگە وەك:

نەصرەدین عەبدواللە ، محەمەد حەمە سەعید کەریم، شەفیع ئەڵڵاك، ئیدریس عەبدواللە، هادی برزوم، مەجنون قادر، زۆراب عەزیز بارام، یوسف محەمەد، نەصرەدین محەمەد حاجیلە، محەمەد ئەحمەد، ئیدریس محەمەد ئەحمەد، عەباس تۆفیق، عوسمان عەبدولڕەحمان ، ئەنوەر عەلی کەریم، فاتح عەلی شەریف، محەمەد جەعفەر، ئەمین ڕەشید، دڵسۆز محەمەد سان ئەحمەد، عوسمان باسام، عومەر باسام، ئەحمەد عەلی سێلە، عەبدول ئەبوبەکر حەسەن، عەبدول عۆدە، مەحیەدین ئەڵڵاك، حەمەسەلیم حەمەصاڵح ، حەمەسەلیم لەطیف، حەمەلەطیف حەمەڕەحیم، عوسمان حەمەکەریم، عومەر سەعید، حەمەفەرەج محەمەد بابا، جەمال حەمەسەعید، عەبدواللە عەلی، سەعید حەمەصاڵح، عەزیز عەبدواللە، نوری حەمەئەمین، نەزهەت ڕەحمان، عەبدولوەهاب عەبدولحەمیدو تاد.

**محەمەد حەمەسەعید لەساڵی ( ١٩٦٧ )ەوە پیشمەرگەیە تائیستا.**
**نەصرەدین عەبدواللە لەساڵی ( ١٩٥٩ )ەوە پیشمەرگەیە تائیستا.**

هەریەك لەمانە بەبەردەوامی پێشمەرگە بوون یاماوەیەك، هەیانبووە وەك پێشمەرگەیەك لەسەر جیهازی لاسلکی بووە یاخود

لەڕێکخراودا ئیشی کردووە، هەیانە شەهید بووەو هەشیانە ئێستاش هەر پێشمەرگەیە لای پارتی یالای یەکیەتیو ..تاد.

**تەوێڵە لەشۆڕشی ئەیلولەوە بۆنسکۆی ١٩٧٥و چەند تێبینییەك:**

دوای ئەوەی تەوێڵە لەلایەن شۆڕشەوە ڕزگارکراو، بووە یەکێك لەناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان، ئیتر تەوێڵە چەندەها ڕووداوو بەسەرهات و خۆشیو ناخۆشیو هەڵوێست و کاری بەخۆوە بینی، کەدەکرێت ئامارژە بەهەندێکیان بکەین:-

- چەند جارێك لەلایەن حکومەتەوە مەکتەب و دام دەزگاکانی خۆی کێشاوەتەوە ژێر دەسەڵاتیو، هەرکە نێوانی پارتیو حکومەت باش دەبوو دەیناردنەوە. ئەمەش زیانێکی زۆریدا لەناوچەکە بەتایبەت لەقوتابیان.

- هەرلەسەرەتای شۆڕشەوە، تەوێڵە بووە مەڵبەندێکی گرنگ بۆ هێزی پێشمەرگە، بووە پەناگاو جێگەی حەوانەوەی ماڵ و منداڵ و خودی پێشمەرگە خۆشی. زۆرێك لە لێپرسراوانی(پ د ك )و شۆڕش ماڵیان هێنایە تەوێڵە لەوانە: هەر لەسەرەتاوە ماڵی ئەم بەڕێزانە هاتە تەوێڵە: شێخ حەمە ئەمینی شێخ عەبدواللە، نوری حەمەی نانەوا، حەمەی فەرەج، شێخ سەعیدی موفتی، حەمەی لاسلکی ... پاشان ئەمانەش ماڵیان هێناوە:

عەبدولوەهاب ئەتروشی، فەتاح ئاغا، موعاون کەمال شێخ غەریب، صاڵح بێداوی، فاضل سۆرانی، فاضل تاڵەبانی، ڕەشید سەندی، جەمال نامق، دیاری حامد بەگ، عومەر تاڵەبانی، جەمال خەفاف، کەمال خەفاف، عەبدولی سۆران، کەریم دەروێش، دەروێش ئاغا، نوری حەمە عەلی، ئەکبەر حەیدەر، شەوکەت حاجی عەلی، حەمەئەمین حاجی مامە ندی، عەزیز دەروێش،...تاد

- لەسەرەتای شۆڕش دا خەڵکی هەورامان بەگشتیو تەوێڵەو بیارە بەتایبەتی، زۆر لێبڕاوانەو مەردانە هاتنە مەیدانی خەبات و تێکۆشان، چەند پێشمەرگە یەکی ئازاو ناوداریان تیا هەڵکەوت وەك (کەمالی ئەحەڕوش و ڕەشەی صاڵحە)، خەڵکی ناوچەکەش زۆر لەدەوری ئەم دوانە کۆبوو بوونەوە، بەڵام عەبدولوەهاب ئەتروشی، کەوتە دژایەتیان و پیی ناخۆش بوو ئەم دووانە ئاوا هەڵکەوتوون و ملی نادەنێ. لەئەنجامدا عەبدولوەهاب بەفێڵ کەمالی کوشت و باوکیشی لای قاینەجەی شارەزوور کوشت، ئەوانەی خەڵکی هەڵەبجە و هەورامان، کەلەگەڵی بوون، بەزۆرو بەلێدان هێناینیە ژێر ڕکێفی خۆی، نەیهێشت لەهەوراماندا ناودارو لێپرسراوێ هەڵکەوێ.[٧٢]

- ڕەشەی صاڵحەش، لەداخی عەبدولوەهاب هەرلەوکاتەوە کەماڵی کوشت، پاڵی‌دا بەڕژێمی عێراقی‌یەوەو کەوتە دژایەتی کردنی شۆڕش، بەتایبەت دەست و پێوەندی عەبدولوەهاب.. ڕەشەی صاڵحە لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بوو،وە بووە بەیەکێك لەدڵسۆزەکانی ڕژێم و تەنانەت لەشەڕی عێراق و ئێران دا- نوط الشجاعە-ی وەرگرت، بەلاّم لە ئەنجام دا ڕژێم لە (١٩٨٦/٤/٢٠) لەسێدارەی دا لەسەر ئەوەی کەگوایە خیانەتی کردووە لەهێرش کردنێکدا بۆگرتنی کەژێك لەشەڕی عێراق و ئێران دا.

- ناکۆکی.. نێوان هەردوو باڵی پارتی گەیشتە خەڵکی تەوێڵەو، ناکۆکی خستە نێوان تەوێڵەیی‌یەکانیش. ئەوکاتە بەهەردوو باڵەکەیان دەوت(مەلایی‌و جەلالی)، هەردوولا ئازاری ڕێکخستنەکانی یەکتریان دەدا، جەلالیەکان لەشارەکاندا بەتایبەت لەهەڵەبجە دەسەلاّتیان دەڕۆیشت، ئازارێکی زۆری خزم و کەس و کارو ئەندامەکانی مەلایی‌یەکانیان دەدا، مەلایی‌یەکانیش درێخی‌یان نەدەکرد لەخزم و دۆست و ئەندامەکانی جەلالی‌یەکان، بەتایبەت لەتەوێڵەدا ڕێکخستنی جەلالی‌یەکان زۆربوو، هەردوولا ئەوکاتە ئەوەندە ئازاری یەکتریان دەدا ئازاری دوژمنی سەرەکیان نەدەدا، بەڵکو دوژمنی سەرەکیان لەبیرچوو بوویەوە... لەو سەردەمەدا عەبدولوەهاب لە تەوێڵەدا بالاّ دەست بوو بڕیاری گرتنی جەلالی‌یەکانی داو، زیندانی کردن و، هەندێکیشیانی نارد بۆ(خەلان) لەوێ زیندانی کران. لەوانەی کە گیراون و ئازاردران:

سەعدی بەگ، جەلال حەمە سەعید قادر، حاجی ئەولەی نەسە، مستەفا حاجی فەرەج، ئازەی کەریم، نوری بەگ، تۆفیق گوڵناز، ئۆلخالق فایق... بەڵکو لەچەمی دزاوەر لەناو باخەکاندا قەبری بەدەستی گیراوەکان خۆیان هەڵکەند بۆیان بۆئەوەی بیان ترسێنێ‌و ئیعتراف بکەن لەسەر ڕێکخستنی جەلالی‌یەکان.هەندێکیشیان خۆیان گەیاندە هەڵەبجەو پاڵیان دا، بەجەلالی‌یەکانی ئەوێوە، وەك: عەلیەسانەو حەمە مرادی باقی... هەر بەهەڵهاتنی ئەوان لەتەوێڵە کەس و کاریان گیران و بەڵکو خانوەکانیشیان سوتێنران.

- لەو سەردەمەدا شەوانە، چریکێکی زۆر دەهاتنە تەوێڵەو لەوێ دەمانەوەو شەوانە هێرشیان دەکردە سەر هەڵەبجەو گوندەکانی دەوروبەری. شەوی(١٩٦٩/٨/٨) چرێکێکی زۆر ڕژانە ناو تەوێڵەو هەموو مزگەوت و چایخانەکانیان پڕکرد، لەوێ بەرەو هەڵەبجە هاتن و شەڕێکی گەورە لەنێوان

چریك و مەلایی لەلایەکەوە، جەلالی و جەیشی عێراق لەلایەکی ترەوە، لەوشەودا چرێکێکی زۆر کوژران و بەدیل گیران.

- یەکیەتی قوتابیان لەتەوێڵە بەردەوام بوو، گەلێك چالاکی ئەنداند، بەلاّم زیاتر لەدوای (١١) ئازاری (١٩٧٠) کەیەکیەتی لاوان لەتەوێڵە دامەزرا، کۆمەلێك قوتابی لەناوەندی تەوێڵە پێگەیشتن لەبۆنەکاندا چالاکی جوان و گرنگیان ئەنجام دەدا کەکۆمەلێك تیپی شانۆییان تەشکیل داو لەدواتر لە بەشی شانۆدا باسێکی لێوە دەکەین.

-هەرکاتێك لەبەرەکانی جەنگدا لەگەڵ حکومەت شەڕبوایە، خەڵکی تەوێڵە چاوەڕوانی ئێوارەیان دەکرد کەبروسکە، بێت چونکە ئێواران بروسکەو هەواڵە گرنگەکان کەدەهاتن، لەبڵندگۆی مزگەوتی گەورەی تەوێڵەوە، لەلایەن مامۆستا مەلاجەمیل یا محەمەدی وەستا جافرەوە، دەخوێنرانەوە.

- بەدێژایی ئەو (١٤)ساڵەی شۆڕش، کەپێشمەرگە لەبەرەکانی جەنگەوە دەگەڕانەوە تەوێڵە، لەلایەن خەڵکی تەوێڵەوە خزمەت دەکران، چونکە شوێنی تر نەبوو بۆ جێگەی حەوانەوە، ئوتێل و بارەگاکان، پێشمەرگەی موقیمیان تیابوو.

ئەو پێشمەرگانە، لەلایەن ئینضباطی شۆڕشەوە، کە(عەبەڕەش و سلێمانەو کەریم تەتەر)بوون، دابەش دەکران بەسەر ماڵەکان دا، هەرماڵێك لەیەکێکەوە تاپێنج کەسی بەردەکەوت بەپێی کەم و زۆری پێشمەرگە لەوشەوەدا. پێشمەرگەکان دوای نان خواردن دەچوون بۆ مزگەوتەکان دەخەوتن، لەوماڵەوە نوێن و پێخەفیان بۆ دەبردن. لەماوەی ئەم (١٤) ساڵەدا خەڵکی تەوێڵە خزمەتی‌وای بەپێشمەرگە کردووە کەهیچی کەم نەبووە لەو پێشمەرگانەی کەلەبەرەکانی جەنگدا بوون، جگەلەمەش بەپارەو پول و ئازوخەو پێشمەرگەش بەشداری لە شۆڕش دا کردوە.

- هەرلەم بارەوەچەند هەڵوێستی گرنگی خەڵکی تەوێڵە دەبێت تۆماربکرێت بەرامبەر خەڵکی کوردستان کردویانە.

* لەدوای (١٩٧٤/٣/١١) کەحکومەت و پارتی ڕێکنەکەوتن و حکومەت پەشیمان بوویەوە لەبەیانی ١١ئازار، ئەوەبوو شۆڕش دەستی پێکردەوە، جەماوەرێکی زۆر لەکوردی شارەکان لەسلێمانیو هەڵەبجەو کەرکوك و دەوروبەرەوە، خۆیان گەیاندە ژێردەسەلاتی شۆڕش.. تەوێڵەش قەرەباڵغی‌یەکی زۆری تێکەوت، ماڵ و مزگەوت نەمابوو میوانی نەبێت، هەرماڵێك بۆخۆی تابەیانی خەریکی دروست کردنی نانی هەورامی بوون فریا نەئەکەوت...

بەڕاستی خزمەتێکی جوانی ئەو میوانانەیان دەکر بەخواردن و پۆشاك و پێداویستی ترەوە.

ئەو کەسانەش کەبەخێزانەوە هاتبوون لەلایەن خەڵکی تەوێڵەوە ژوورو خانویان پێدان بەبێ ئەوەی هیچ کرێیەك لەکەس وەربگرن.

* لەماوەی ئەو ساڵەدا، خەڵکێکی زۆر چووە ئێرانەوە، وەك پەناهیندەیەك لەئۆردوگاکانی سەریاس و قەصری شیرین، مانەوە، بەڵام کەنسکۆی ١٩٧٥هات زۆریك لەو ماڵانە گەڕانەوە بۆعێراق، جاچونکە سەیارە نەبوو، قەرەباڵغ بوو، ماوەیەك لەناو باخەکانی تەوێڵە مانەوە... لەوکاتەدا خەڵکی تەوێڵە لەناو ماڵەکانیان دا خواردنیان لێناو.. چێشت و کولیچەو خەپلەو گوێزو مێوژو نانی هەورامیوچاو.. بردیان بۆ خەڵکی کەلەناو باخەکاندا بوون، ئالەو کاتەدا نانێك چەند قات پارەی خۆی دەکرد، کەچی تەوێڵەیی بەخۆڕایی لەڕێی خوا دابەشیان دەکرد بەسەر ئەو خەڵکەدا کەهەموو ورە ڕوخاوو ناڕەحەت بوون، بەشکستی شۆڕش و زۆر دڵ پڕ لەئاهو حەسرەت بوون، ئەوچوون بەدەمەوەیە کارێکی ئیجابی بوو بۆسەر دەرونیان، هەقی خۆیەتی شۆڕشی کورد، هەمیشە ئەم جۆرە خزمەتانەی تەوێڵەییو نمونەی تەوێڵەیی لەبیر نەکات، هیچ نەبێت لەکتێبە مێژوویەکاندا تۆماربکرێت و بنرخێنرێن و ببنە نموونە بۆ نەوەی داهاتوو.

*چەندجار هێزیحکومەت هێرشی کردووەوپەلاماری بیارەو تەوێڵەی داوە کەبیگرێت و بیخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، وەزۆر کوشتاری بۆداوە چ لەهێرشەکەی زەعیم صدیق و چ دواتریش، بەجەیش و جاش هەوڵی بۆداوە، بەلام هێزی پێشمەرگە بەهەموو شێوەیەك بەرگریان کردوە بەهیچ شێوەیەك نەیان هێشتووە، هێزی حکومەت لەناوچەی هەورامان نزیك بێتەوەو هەورامان بکەوێتە دەستیان.

* لە(١٩٧٤/٤/٢٦) کەشاری هەڵەبجە بەبۆمبای ناپاڵم لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە بۆمباران کرا، خەڵکێکی زۆری لێ شەهیدو بریندداربوو، وەخەڵکەکەشی ئاوارە بوو. شەوەکەی (٢٦-١٩٧٤/٤/٢٧) بازاڕی تەوێڵە ڕێگە نەبوو، هەر بریندار بوو، دەیان هێنا بۆ تەوێڵەو، خەڵکەکەشی ئەوشەوە تابەیانی بەرەو بیارە و تەوێڵەهاتن. ماڵ و دوکان و چایخانە و مزگەوت و خانەقاو قوتابخانەکان پڕ بوونەوە، لەوکاتەدا خەڵکی تەوێڵە، ئازایانەو کوردانە چوون بەدەم ئەو هەموو خەڵکەوە، کەلەوە پێشتریش ماڵ نەبووە ماڵی تری نەگرتبێتەخۆ، ئەو هەموانەی تریشی دالدەدان تادوای چەند ڕۆژێك بڕێکیان بەرەو ئۆردوگاکانی ئێران ڕۆیشتن.

* هـەر لـە (١٩٧٤)دا دکتـۆرو مامۆسـتاو ڕۆشـنبیرێکی زۆر هاتبوونـە دەرەوە، تاماوەیەك ئەو هەموو خەڵکە بلاّو بوو بونەوە لەناو باخەکانی تەوێڵەدا، دوایی (تـەوظیف) کران لـەدەزگاکانی شۆڕش دا.. لەشـوێنی تـردا باس کـراون کەچۆن باخەکان کرانە قاعەی تاقی کردنەوەی قوتابیان و بنکەی تەندروستی.

* لە(١٩٧٤/٣/١٢) پێشمەرگە لەدەربەندیخان لەگەڵ شیوعیەکان لەیەکیان دا، لەوشـەوەدا کەیەکـەم شـەڕ بـوو کەدەسـتی پێکرایـەوە،(نـافع حـەبیب اللە ی سۆسەکانی) شەهید بوو مەیتەکەیان هێنایەوە مزگەوتەکەی تەوێڵە، لەو شـەوەدا هەندێك لەکەس و کاری دەگریان، لەوکاتـەدا پـورە عەللەی خێزانی حەمەشیرینە کەپوری نـافع بـوو هاتـە مزگەوتەکـەو ڕووی کـردە خەڵکەکەو وتـی کـەس: بۆنـافع نەگری، نـافع چونکە نوێژکـەر بـووەو لەڕێگـەی نیشـتیماندا کـوژراوە، شـەهیدە، شەهیدیش گریانی ناوێ.. ئەو وتەی پیرەژنە زۆرکاریگەربوو.

* دەرگای سنوری ئێران لەم ساڵەدا زیاتر کرایەوە، هاتو چۆکردن بۆئێران ئاسان بوو، جۆرە گەمارۆیەکی ئابوری لەلایەن ڕژێمەوە خرابووە سەرناوچەکانی ژێردەسەلاّتی پێشمەرگە، بۆیە:

فرۆشگایەکی گەورە لەگاراجەکەی حاجی اللە کـەرەم دا کرایـەوەو، هیـوای جەلال حەمدی سلێمانەیی بووە لێپرسراوی. لەشۆشمیێ سەرسنوریش حـاجی عەلی عەباس تەوێڵەیی سەر پەرشتی دەکرد.

حاجی عەلی عەباس و عەباسی کوڕی - ١٩٧٩

- سـالاّنی (١٩٦٢-١٩٧٠) هـەر پـارتی دەسـەلاّتداربوو، حکومەت هیچ دەسەلاّتی نـەبووە، لەسـالاّنی(١٩٧٠-١٩٧٤)یـش، پـۆلیس لەتەوێڵـە هـەبوو، بـەلاّم هـەر پێشـمەرگە دەسـەلاّتدار بـوو،... لـە (١٩٧٤)وە هەنـدێکی کـەم لەکارمەنـدو پۆلیس و مامۆستایان بەنهێنی هاتنـە ژێردەسـەلاّتی حکومـەت، زۆرێك لەوانـەش شیوعیەکان بـوون، کەلەوکاتـە لەگـەڵ حکومەتـدا لەبەرەیەك دابـوون، چەکیان دژ بەشۆڕش هەڵگرتبوو.

## تەوێڵە لەنسکۆی بەهاری ( ١٩٧٥ ) بۆ قەصفی بەهاری ( ١٩٨١ ):

چەند ڕۆژێك دەنگی بڵندگۆی مزگەوتی گەورەی تەوێڵە نەبوو، کەبروسکەکان بخوێرێنەوە، وتیان سەرکردایەتی پارتی کۆبونەوەیەکی گرنگیان هەیەو ڕووداوو گۆڕانکاری‌یەك دەبێت، بۆیە چاوەڕوانی (عەبدولوەهاب ئەتروشی) دەکرا کەبگەڕێتەوەو بروسکەیەکی گرنگ بخوێنرێتەوە، کەچی گەڕایەوەو کۆبونەوەی بەسەر لق و ئامر هێزو لێپرسراوانی پارتی کرد" دوای کۆبونەوەکە مقۆمقۆیەك پەیدا بوو، جەماوەر نەیان دەزانی چی‌یەو لێپرسراوانیش سەرسام بوو بوون.. تومەز، عەبولوەهاب هەواڵی نسکۆی گەیاندوە بەلێپرسراوان و کەسیش ناوێرێ ئەمە بدرکێنێ نەوەك درۆبێ‌و سیاسەتێك بێت.

بۆ بەیانی (عەبدولوەهاب) لەبەرچاوی خەڵکی لەهەیوانی بەلەدیەکە هەندێ قسەی وت بە شۆڕش و چەند ڕەسمێك لەوناوە بوون فرێ‌ی‌دان ، ئیتر خەڵکی بۆیان دەرکەوت ئەم هەواڵە وادیارە ڕاستەو ڕادیۆکەی پارتی (دەنگی کوردستان) دەنگی نەما، هەواڵەکانی جیهانیش کەوتنە باس لەم ڕووداوە. سێ‌ڕۆژ خەڵکی وڕو سەرسام و حەیران بوون، هەرخەڵك بوو دوو، دوو و سێ سێ قسەیان دەکرد، هەندێك هەبوون هەرقەناعەتیان نەبوو، تاهەواڵ هات کەلێپرسراوان لەسلێمانین، ئیتر سەیارە بەرنەئەکەوت بۆ خۆ تەسلیم کردنەوە.

خەڵکی بوو بەدوو بەشەوە، بەشێك بەرەو ئێران ڕۆیشتن و بەشەکەی تریش خۆیان تەسلیم بەحکومەتی عێراق کردەوە.

هەرچەك بوو دەفرۆشرا، بەنرخێکی هەرزان، بڕنەو دەدرا بەدینارێك، بەڵکو هەندێك، لەداخانا فرێ‌یان دەدایە ناو چەمەکەی بازاڕەوە.

ئەوانەی خۆیان تەسلیم دەکردەوە، دەهاتنە عەربەت، عەربەت لەوکاتە قەرەباڵغی‌یەکی زۆری تیابوو، چونکە هەموو دەڤەری هەورامان و هەڵەبجەو خورماڵ و شارەزوورو پێنجوێن و سەیدصادق دەهاتنەوە ئەوێ. حکومەت فایلی خۆتەسلیم کردنەوەی کردبووەوە نزیکەی (١٠٠) پرسیاری لەخەڵکی دەکرد. خەڵکی بەگشتی (پێشمەرگەو بێ‌لایەن) دەبوایە خۆی تەسلیم بکردایەتەوە بەتایبەت فەرمانبەرو ئەوانەی سەربازیان لەسەر بوو. هەمووشیان کەسەربازیان لەسەر بوو بەر یاسای لێبووردنی ژمارە (٥٢) ساڵی (١٩٧٥) کەوتن کەبەپێ‌ی ئەو یاسایە ئەمانە گەڕاونەتەوە(عائدونن)بۆڕیزی نیشتیمانی، هەموو بەر ئەولێبوردنە کەوتن، هەوڵ درا هیچ کوردێك لەڕیزی سوپادا نەبێت ئەمەش سیاسەتێکی تری

حکومەت بوو، بەرامبەر بەکورد بەکاری هێنا، نەوەك کورد جارێکی تر شۆڕش بکاتەوە بالە سوپادا فێری چەك و مەشق و ئامێری سەربازی نەبن.

– لەوکاتەدا، ئەو فرۆشگا گەورەیەی کەلەتەوێڵەدا بوو، هەمووی تالآن کرا، زیاتر لەلایەن لێپرسراوانەوە، شتە گرنگ و بەنرخەکانیان برد، دەڵێن: لەوکاتەدا (٤٠) چل هەزار دینارو دووسێ هەزار کارتۆن جگەرەی دیمۆری و ڕۆسمەنی تیابوو، لەگەڵ پۆشاك و خۆراك و سەعات و ڕادیۆو شمەکیتر...

– هەموو مقەڕو بنکەو بارەگای شۆڕش تالآن کرا، بەڵکو هەموو کەلوپەلی شارەوانیو قوتابخانەو ئەوانەش بران.هەرچەندە دوایی هەندێك لەو کەلوپەلانەیان گەڕاندەوە، بەلآم بەڕاستی ئەم ڕاو ڕووت و تالآنی کردنە کەلەناو کورددا هەیە، کارێکی دزێو خراپە، چەندجار دووبارە بووەتەوەو کەچی پەندو عیبرەت وەرناگرین. ئەمەش لەئەنجامی ئەو شکست و ڕووداوانەوەیە کەکورد بەخۆیەوە دەیبینێ.

– نزیکەی مانگێك شوێنێکی وەك تەوێڵە هیچ حوکمڕانی تیانەبوو نەپێشمەرگەی تیابوو نەحکومەت، لەکۆتایی مانگی نیسانی (١٩٧٥) بەرەبەرە سوپای عێراق گەڕایەوە ئەو شوێنانەی وەك تەوێڵە.

لێپرسراوانی حکومەت زۆر دەهاتن بۆ تەوێڵە، خەڵکیان کۆدەکردەوەو هێرشیان دەکردە سەرپارتیو شۆڕش و بارزانیو بێئەوەی موڕاعاتی هەست و شعوری خەڵکی بکەن. لەلایەکی تریشەوە بەڵێنیشتی زۆریان دەدا بەجەماوەرەکە بۆ هێورکردنەوەی خەڵکەکەو ڕەواندنەوەی مێشکیان... لەو لێپرسراوانە:

طارق عەزیز، سەعدون حەممادی کەهەردوکیان وەزیر بوون، قائد فرقەو پارێزگاری سلێمانیو لێپرسراوانی پۆلیس و دەزگا حکومیەکان.

– لەکۆتایی مانگی نیسان دابوو،دەزگاکانی میری گەڕانەوە بۆ تەوێڵە. وەك قوتابخانەو خەستەخانەو بەدالەو شارەوانیو دائرەی کارەباو پۆلیسخانەو گومرگ و ئەمن و کەتیبەیەك لەعەسکەری.

– بۆماوەی ساڵێك تەوێڵەو شوێنەکانی تری کوردستان، ئارامیو ئاسایشی تیابوو، بەلآم خەڵکی بەگشتی بێتاقەت بوون، لەلایەکەوە ئەونسکۆیە کاریگەری سلبی هەبوو بۆ نیشتیمان پەروەران و خەمخۆرانی گەل، جگە لەمەش خزم و دۆستێکی زۆر ئاوارەی ئێران بوو بوون بێئەوەی پاشە ڕۆژی ئەوانە بزانرێ بەرەوکوێ دەڕوات.

هەروەها سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیرانیش، هەریەکە بۆخۆی دەترسا حکومەت فشاریان بخاتە سەرو ئازارو ئەشکەنجەیان بدات.

- حکومەت لەوساڵەدا سیاسەتی بلاۆوکردنەوەی فەسادو لەبیر بردنەوەی کوردایەتی بەکاردەهێنا. لەوماوەیە چەند جار ئافرەتی بەرەلاو سەماکەرو زورناژەن و فلیمی بێئەخلاقی سینەمای گەڕۆکی دەهێنا، بۆناو بازاڕی تەوێڵە و گەنجێکی زۆر کۆدەکرایەوە. هەندێجار بەناوی بەرنامەی تەندروستییەوە خەڵکی کۆدەکرایەوە، کەچی نیوسەعاتێ ئەو بەرنامەیە بوو، دوای ئەوە دوو سەعات لەو فلیمە خراپانەی لێئەدا کەگەنج مەشغوڵ دەکەن و حەزی لێدەکەن.

- هەرلەبەهارو هاوینی ساڵی(١٩٧٥) چەند جار کۆپتەری ئێرانیو عێراقی دەهاتن نوێنەری عێراق و ئێران یان پێبوو، لەسەر شاخەکانی تەوێڵەوە دادەبەزین و قسەیان لەسەر سنورەکان دەکرد کەلەڕێکەوتنی جەزائردا، ڕێکەوتبون لەسەری.

- هەرلەوماوەی ساڵەدا- چەند کەسانێکی زمانزان، ڕۆڵێکی باشیان بینی بۆ بەدەمەوە چوونی ئەولێپرسراوو قیادانەی کەدەهاتنە تەوێڵە لەوانە:

(حەسەنی حەمە سلیم، حاجی حەمەمرادی عەزە، حەسەنی خاڵێ...) چونکە ئەمانە فارسیو عەرەبییەکی باشیان دەزانی.

- ساڵێك بەسەر نسكۆدا کۆتایی نەهات، بەرەبەرە فشار کەوتە سەر جەماوەر بۆ بەبەعسی کردن و نقڵ و گرتن، هەروەها ئەودەنگ و باسە گەرم بوو کەماوەیەکیتر خاڵەکانی تری جەزائر دەبێت جێبەجێ بکرێت لەوانە: داگرتنی دێهاتەکانی سەرسنورو کردنەوەی ئۆردوگا بۆیان.

- زۆری نەبرد شۆڕشی نوێی کورد، دەستی پێکردەوەو، هەورامان بەتایبەت تەوێڵە، بوویەوە بەلانکەو جێژوانی پێشمەرگە. هاوینی (١٩٧٦) بوو، دەنگ و باسی پێشمەرگە پەیدا بوویەوە، لەناوباخەکانی تەوێڵە، لەئاوێسەرو دەرەقازان و قاقوڵی کەوتنە هوشیار کردنەوەی گەنجان و ئەنجام دانی چالاکی.

- وەك وتمان تەوێڵە بوو بەلانکەی پێشمەرگە... پێشمەرگەکانی یەکیەتی مەقەڕیان لە (پەرۆنی)بوو نزیك شۆشمێ، بەرابەر سۆسەکان، لەوێوە دادەبەزینە ناوباخەکانی خوارەوەی تەوێڵە،(دەرەقازان و قاقوڵی)، توانیان زۆرێك لەوگەنجانە کەهاتوچۆی ئەوباخانە دەکەن قەناعەت پێبکەن و. بچنە ڕیزی ڕێکخستنەکانیانەوە.

لەدەوروبەری هانەگەرمڵەو کەیمنەش پارتی‌یەکان مەقەڕو بارەگایان دانا، ئەمانیش زیاتر هاتووچۆی ئاوێسەریان دەکردو کەوتنە چالاکی نواندن.

بێگومان دوایی ئاوێسەر بووە جێژوانی جەماوەرو پێشمەرگەی پارتی‌و یەکیەتی، چەندجار لەئاوێسەر کۆبونەوەی فراوان کراوە بەجەماوەر لەلایەن یەکیەتی‌و پارتی‌یەوە. لەوانە:

- لە(١٩٧٩/٧/٤)لەئاوێسەر بەئامادەبوونی خەڵکێکی زۆری تەوێڵە لەلایەن (محەمەدی حاجی مەحمودو، سامان فەرەج زۆراب بەگ و حەمەی حەمەسەعیدو عەبدولخالق عەبدولوەهاب تەوێڵەیی‌یەوە) کۆبوونەوەیەک کرا کاک حمەمەدی حاجی مەحمودو کاک سامان هەندێک ڕوونکردنەوەو باسی بارودۆخی کوردو شۆڕشیان کرد. هەروەها چەند جاریش لەلایەن کاک نادر هەورامی‌یەوە کۆبونەوەو قسەوباس لەسەر وەزعی کوردوپارتی‌و شۆڕش لەئاوێسەر کراوە بۆخەڵی تەوێڵە. لەڕاستیدا کاک نادر لەتەوێڵەو دەڤەرەکە توانی جارێکی تر پارتی‌و شۆڕشی گوڵان بناسێنێتەوە بەجەماوەری ناوچەکە.

نادر هەورامی - ١٩٧٨

- لەیەکی ئایاری ساڵی(١٩٧٧) خەڵکێکی زۆری تەوێڵە وەک ساڵان چوون بۆ ئاوێسەر بۆ سەیران، بەداخەوە لەنێوان چەند کەسێکدا، شەڕێک ڕووی‌دا، دوایی شەڕەکەش گەورە بوو، وای لێهات سەیران لەهەموو خەڵکی تێک چوو، هەڕەشەو گوڕەشە لەیەکتری زۆرکرا، خەڵک دەیوت بەیانی لەناوبازاڕی تەوێڵە ئەم شەڕە دەست پی‌دەکاتەوە، بەڵام هەرئەوشەوە ڕووداوێکی تر ڕووی‌دا بۆبەیانی ئەوباسە نەما.

هەر لەو شەوەدا (١-١٩٧٧/٥/٢) چەندپێشمەرگەیەک دەچنەسەر ماڵی (حەسەنی حەمەسەلیم و جەمیلی ئاغا جافر) دەیانبەن بۆسەر جادەکەی باجگیرا دەیان کوژن... کوشتنی ئەم دوو تەوێڵەیی‌یە، خەڵکی زۆرترساند، بەتایبەت ئەوانەی نزیک بەڕژێم بوون سڵەمینەوەو دوورکەوتنەوە.

- هاوینی ساڵی(١٩٧٧)بوو، ڕەمەزان بوو، بازاڕو چایخانەکانی تەوێڵە تاپارشێو هەبوون، هێشتا هاتووچۆی شەوانە ئازاد بوو، خەڵکێکی زۆر

ئەوهاوینە لەناوباخەکاندا بوون، شەوی ٢٧ڕەمەزان، کارەبا نەبوو لەدوای نوێژی عیشا لەبەردەم دەرگای قەیسەری‌یەکەی سەعدی بەگدا تەقینەوەیەك بوو، کەمینی عەسکەری لەناو بازاڕدا بوو، هەرلەگەڵ تەقینەوەکەدا سەربازەکان خۆیان کرد بەچایخانەکەی بەڕێز(عەبدولی عەلی)دا کەخەڵکێکی زۆری تیابوو،سێ‌کەسیان دەرهێنا بەناوی (موختارعەزیزکەریم، یاسین محەمەدوەهاب. بەختیارعەبدولعەزیز) هەرلەبەردەم چایخانەکە سەلیەیان لێ‌کردن، موختار و یاسین کوژران و بەختیار پێوە نەبوو، بەڵام خۆی کردبوو بەمردوو تاسەربازەکان ڕۆیشتبون دوایی بەهەرچۆنێك بووبێت ئەوخۆی دەرباز کردبوو.

ئەوشەوە تادرەنگانێ هەر تەقەبوو، نوێژکەرانی تەراویح هەر لەمزگەوتی گەورەدا بوون نەیان ئەتوانی بێنە دەرەوە لەبەر گوللەباران، چەند جار لەبڵندگۆوە بەکوردی‌و عەرەبی داوایان کرد لەجەماعەتی(سریه) کەتەقە ڕابگرن و باخەڵکەکە بگەڕێتەوە، ناوماڵەکانیان، بەڵام بێ‌سود بوو، تانوێژی بەیانی کرا، ئینجا تەقە وەستا، دوایی دەرکەوت کەیاسین و موختار کوژراون. لاشەی ئەودوانە تانزیکی نیوەڕۆ هەرکەوتبون و خەڵتانی خوێن بوو بوون، دوای نیوەڕۆکەی نێژران. جەژنی ڕەمەزان لەتەوێڵە نەکرا، ڕۆژی جەژن ئامرلیوای زەردەهاڵ هات، موقەدەمێك بوو، لەمزگەوتەکەدا خەڵکی کۆکردەوە، دەیوت ئەمانە کەکوژراون کوڕانی خۆتان کە(متمرد)ن کوشتویانن. مەهێڵن کوڕەکانتان بچنە ناویانەوە، چەك وەربگرن دژیان و مەهێڵن بێنە ناوتانەوە.

لەوکاتەدا هەندێك کەس قسەیان کرد کەئێمە چی‌بکەین و دەسەڵاتمان نیەو لەوبابەتانە، بەڵام دووکەس بەجەسورانەو ئازایانە ڕووبەڕووی ئامر لیوا وەستانەوەو وتیان:

نەخێرجەنابی ئامرلیوا، ئێمەخۆمان دەزانین بەبەرچاوی خۆمانەوە سەربازەکان خۆیان کردووە بەچایخانەکەداو ئەوانەیان دەرهێناون کوشتویانن و بەڵگەشمان هەیە. ئەو دوو چاو نەترسەش حاجی حەمەمرادی عەزەو حەمەسەلیم فەتحواللە بوون.[٧٣]

– لەدووای ئەم ڕووداوە، بارودۆخی تەوێڵە تێك چوو، وەزع ناخۆش بوو، گرتن و فشار زۆربوو، شەوانە هاتووچۆ قەدەغەکرا، ئەوباخانەی کەشەو نۆبەئاویان بوو بەترس و لەرزەوە دەچوونە باخەکانیان، ڕەبایەکان لەسەرلوتکەی شاخەکانەوە دانران و هەرتەقەیەك کەدەبوو ئەوان، خانوەکانیان دەدایە بەرگوللە، بەهیچ شێوەیەك دەست پارێز نەئەکرا، چەندجار گوللە لەپەنجەرە و

دەرگاکانەوە چووە ماڵەکانەوەو خەڵکیان بریندار یاکوشتووە، لەشوێنی تردا ئاماژە بەو بیرندارو کوژراوانە دەکەین.

– لەو ماوەیە بەدواوە تاچۆڵ کردنی تەوێڵە، شەوانە چەندجار پێشمەرگەکانی یەکیەتی یاپارتی دەهاتنە ناو تەوێڵەوە تەقەیان دەکرد لەپۆلیسخانە یا–سریە–سریە ئەوکاتە لەپاڵ خەستەخانەکەدا بوو بەرامبەر بەماڵەکانی بەڕێز (محەمەدی سان ئەحمەد). پیاوانی ڕژێم کەئێوارە دەهات لەمەقەڕەکانیان نەئەهاتنە دەرەوە، کەتەقەش دەبوو بەکوێرانە دەستیان دەکرد بەتەقە بەناوماڵەکان دا.

– لەڕاستیدا ماوەیەک تەوێڵە وەک زیندانێك وابوو، شەوانە هاتووچۆ قەدەغە بوو، کەژوکوێوو سەیرانگاو باخ و باخاتەکان کەس نەیئەوێرا سەردانیان بکات و... ئەگەر شەو پێشمەرگە دەستی بوەشاندایە یاهەر ئەو شەوە یەکێك دەکوژرا لەماڵەکانەوە، یابۆ بەیانییەکەی سەربازەکانی ڕژێم ئەکەوتنەگیانی هاوڵاتیان و ئازاریان دەدان.

بەکورتەو پوختە دەتوانین بڵێین تەوێڵەو تەوێڵەیی:

– هەمیشە قەڵایەك بووە بۆ شۆڕشەکانی کورد.

– بەشداری شۆڕشەکانی کوردیان کردوە بەتایبەت شۆڕشی ئەیلول و حوزەیران و گوڵان.

– بەشداری شەڕی ڕوسەکانیان کردوەو قوربانیشیان داوە.

– سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیری بەتواناو لێهاتوویان لێهەڵکەوتووە کەلەکۆمەڵ و حیزب و ڕێخراوە کوردستانیەکاندا ئەسپی خۆیان تاوداوە بۆ خزمەتکردن بەکۆمەڵگای کوردەواری.

– بەشداری شۆڕشەکانی جافرسانیان کردوە کەدژبەزوڵم زۆرداری کراون.

– لەسەردەمی جەنگی جیهانی یەکەم، بۆدەڤەری شارەزوورو دەوروبەری سودێکی زۆر وەرگیراوە لەبەروبومی هەڵەبجە بەگشتی و تەوێڵە بەتایبەتی.

– بەشداری شەڕی (فەلەسطین)یان کردوە.

– بەرەنگارییەکی زۆری ستەمکارو خوێنڕێژ، زەعیم صدیقیان کردوە لەشەڕی زەڵم دا.

– بەدرێژایی شۆڕشی ئەیلول وگوڵان وەك پێشمەرگەو وەك ڕێکخستن بەشدار بوون.هەروەها لەگەڵ یەکیەتی نیشتیمانیشدا چ وەك پێشمەرگە چ وەك ڕێکخستن بەشداریان کردووە.

- پێشوازی و بەدەمەوەچوونی -خەڵکی هەڵەبجەیان کردووە لەبۆمبارانەکەی ساڵی(١٩٧٤).- خەڵکی شارەکانی سلێمانیو دەوروبەری لەهەڵگیرسانەوەی شۆڕش لە(١٩٧٤)دا. گەڕانەوەی خەڵکی لەئێران لەنسکۆی (١٩٧٥)دا. هەروەها هاوکاریو خزمەتکردنی جەماوەری گوندەکانی دەڤەری نەوسود لەساڵی(١٩٨٠)دا.

- لەڕاپەڕینی (١٩٤٧) کەلەشارەزوورو هەڵەبجەو هەورامان کرا، لەڕاپەڕینی (١٩٨٢، ١٩٨٧)ی شاری هەڵەبجەدا، لەڕاپەڕینی (١٩٩١)لەشاری سلێمانیدا... لەهەموو ئەمانەدا بەشدار بوون و ڕۆڵی بەرچاویشیان بووە.

- لەدوای ڕاپەڕین لەکۆڕەودا پەناگابووبۆ زۆرێك کەنەهاتنە ناوئێرانەوە.

- لەشەڕەکانی ناوخۆدا لەساڵی (١٩٩٤-١٩٩٥) بۆ پارتیو بزوتنەوە، قەلأو سەنگەربوو، لەساڵەکانی دواتریش بووە جێگەی سەرکردایەتیو هێزەکانی بزوتنەوە، بەڵکو لەساڵی (٢٠٠٠)دا، یەکبون، ئەوێی بەباشترین شوێن دانا کەکۆنگرەی تیابەست.

**بۆچی تەوێڵە ڕانەگوێزرایەوە؟**[٧٤]:

یەکێك لەبەندەکانی ڕێکەوتنامەی جەزائیر لەنێوان عێراق و ئێران دا، ئەوەبوو کەهەر یەك بە قوڵایی (٢٠کم) خاکی خۆیان چۆڵ بکەن و گوندو شارۆچکەکان دابگرن، تاوەکوو لەیەکیان دابڕێن و هەریەکە بۆخۆی کوردستان بکەنە قەفەزێك و دانیشتوانی ئەو شوێنانەشی بخرێتە ئۆردوگاکانەوە، وەك دەست بەسەربن تا جارێکی تر کورد نەتوانێت شۆڕش بکات ... شای ئێران ئەم بڕیارەی خێرا جێبەجێ نەکرد، دوایش ئینقلاب کراو جێبەجێ نەکرا... بەڵام عێراق کردی بەبڕیارێك و کەوتە جێبەجێ کردنی... (٤) قەزاو (٣٠) ناحیەو نزیکەی (٥) هەزار گوندی وێران و خاپور کرد... ئەم بڕیارە تەوێڵە و بیارەشی ئەگرتەوە...هاوینی (١٩٧٨) خەڵکی ناوچەکە بەم دەنگ و باسە تەواو بێتاقەت بوون، دڵسۆزان و خەمخۆرانی تەوێڵە، کەوتنە قسەو باس لەسەر ئەمەو چی بکەین و چارەسەری ئەم کێشەیە کەڕوبەڕوومان دەبێتەوە چۆن بکەین.

بۆیە: لەسەرەتاوە کۆبونەوەیەکی فراوان کراو، تاوتوێی کێشەکەیان کردو گەیشتنە سەر ئەوەی: باشترین چارەسەر گرتنەبەری ڕێگەی یاسایییە، ئەویش بەپێکهێنانی لیژنەیەکی دڵسۆزو کۆڵنەدەرو ئازاو بەصەبر، کەئەم بەڕێزانە بوون:

- مامۆستا مەحیەدین حاجی سەلیم-لێپرسراوی لیژنە
- مامۆستا ئیسماعیل حەمەیوسف -ئەندام

-کاك محمد سان ئەحمەد - ئەندام
-کاك محەمەد حەمە ڕەحیم (دارا بەگ)- ئەندام
-حاجی محەمەد حاجیلە - ئەندام
-حاجی محەمەد فەتحوالله - ئەندام
- حاجی حەمەئەمین حاجی حەمەڕەشید - ئەندام
ئەم لیژنە ئەم بڕیارانەی دا:
- سکاڵانامەیەك بنوسن بەکورتەو بەپوختە.
-ئەو سکاڵانامەیە (٢١) نوسخە بێت..
- ئەندامانی لیژنە کۆڵنەدەن تا بگەنە ئەنجام.
سکاڵانامەکەش ئەم خاڵانەی تیابوو:

١- تەوێڵە خاوەنی مێژوویەکی کۆنەو شوێنەوارەکانی دەگەڕێنەوە بۆ پێش ئیسلام.

٢- هەر لەدێر زەمانەوە جێگەی خوێندن و خوێندەواری بووەو ئێستاش چوار قوتابخانەی سەرەتایی‌و سانەوییەك و دوو مەڵبەندی نەخوێندەواری، پیاوان و ژنانی تیایە.

٣- هەموو خزمەتگوزاریەکانی تیایە وەك: شارەوانی‌و پرۆژەی ئاوو کارەباو بەریدو بەدالە و دائیرەی ئەمن و پۆلیسخانە و بنکەی تەندروستی‌و کتێبخانەو بنکەی کەشناسی، سریەیەك سەربازو هەروەها جادەکەشی قیرتاو کراوە.

٤- ژمارەیماڵەکانی زیاتر لە(١٦٠٠) ماڵە، دانیشتوانیشی نزیکەی (٥٣٠٠) کەس دەبن.

٥- جێگەی پیرۆزی تیایەو خاوەنی پێنج مزگەوت و یەك خانەقایە، جگە لەوەی گۆڕی چەند پیاوچاکێکی وەك شێخ عوسمان سراجەدین و سەید فەتحەو مەلا نەزیرو فەقێ ئەحمەدی غەزایی لێیە، هەروەها مووی موبارەکی ڕیشی پێغەمبەریشی لێیە (ص).

٦- خانوەکانی بە شێوەیەکی هەندەسەیی‌و شارستانی دروست کراوە کە نمونەی جوانین لەعێراقدا.

٧- باخ و باخاتێکی زۆرو هەموو جۆرە میوەو بەرو بومێکی هەیە کەبەرهەمن بۆ وڵات، وەئەم باخانەش بەرهەمی چەند ساڵێکن کەڕەنج و ماندوبونێکی لەگەڵ دا کێشراوە تا گەیشتونەتە ئەمڕۆ.

٨- جگە لەمانە، خاڵێکی سەر سنوریشە لەم ناوچەیەدا، بۆ پەیوەندی کردن بە ئێرانەوە، بۆ حکومەتی عێراق، بوون و مانەوەی تەوێڵە لەشوێنی خۆی زۆر پێویستە.

لەکۆتایشدا نوسرابوو...حەز دەکەین خانوەکان بڕوخێنن بەسەرماندا و بیانکەنە گۆڕستان بۆمان نەك بارکردن و ڕاگواستنمان.

ئەم سکاڵانامەیە درایە ئەم (٢١) دەزگایانەی خوارەوە:

١- پۆلیسخانەی تەوێڵە.
٢- ڕێکخراوی بەعس لەتەوێڵە.
٣- بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی بیارە.
٤- قایمقامیەتی هەڵەبجە.
٥- ڕێکخراوی بەعس لە هەڵەبجە.
٦- پارێزگاری سلێمانی.
٧- شوعبەی حیزبی بەعس لەسلێمانی.
٨- بەڕێوبەرایەتی ئەمن لە سلێمانی.
٩- مەنزومەی باکور لەکەرکوك.
١٠- ئەنجومەنی یاسادان - هەولێر.
١١-ئەنجومەنی جێبەجێ کردن - هەولێر.
١٢- وەزارەتی ناوخۆ.
١٣- ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق.
١٤- ئەنجومەنی وەزیران.
١٥- قیادەی قوتری.
١٦- جێگری سەرۆك کۆمار-صەدام حسین.
١٧- سەرۆك کۆماری عێراق ئەحمەد حەسەن بەکر.
١٨- ڕۆژنامەی - الثورة.
١٩- ڕۆژنامەی- العراق.
٢٠- ڕۆژنامەی - الجمهوری.
٢١- ڕۆژنامەی - طریق الشعب.

ئەم لیژنەیە خۆیان هەڵسان بەگەیاندنی ئەم سکاڵانامانە بەهەریەکێك لەو دەزگایانە مامۆستا مەحیەدین کەلێپرسراوی لیژنەکە بوو وتی:

کەچوین بۆلای هاشم عەقراوی لێپرسراوی ئەنجومەنی یاسادانان وتی:

ئەمری سەید ڕەئیسە کەدەبێت دێهاتی کوردستان بێنە (موجەممەع) پاشان هێرشی کردە سەر خەڵکی لادێ... کاك محەمەدیش (ڕەئیس) وتی: جەنابی کاك هاشم هێرش مەکەرە سەرخەڵکی لادێ، زوربەی کورد لادێیی یە خۆشت لادێیت.. ئیتر بێدەنگ بوو. هەروەها مامۆستا مەحیەدین دەڵێ: کەگەیشتینە نوسینگەی سەرۆك کۆمار سکاڵاکەیان لێوەرگرتین و دوایی وتیان خۆمان وەڵامتان دەدەینەوە.

ئەوەی شایەنی باس بێت لێرەدا ئەوەیە:

چەند کەسانێك لە خەڵکی بیارەو بەڵخەش بۆهەمان مەبەست سکاڵانامەیان بۆبەڵخەو بیارەنوسیو لەگەڵ ئەم لیژنەدا ئەوانیش هەوڵیان دا..

لەدوای دوو مانگ پارێزگاری سلێمانی کەئەرشەد زێباری بوو هات بۆ تەوێڵەو خەڵکی تەوێڵەی کۆکردەوەو مژدەی دانێ کەبەفەرمانی سەرۆك کۆمار- تەوێڵە و بیارە- لەجێگەی خۆیان ئەمێننەوە. لەوکاتانەدا بەڕاستی مژدەیەکی خۆش بوو بۆ دانیشتوانەکە.

کەواتە: هەوڵ و تێکۆشانی ئەم لیژنە، بوو بەهۆی نەگوازتنەوەی تەوێڵە... لەبەرئەمە نابێت هەوڵی ئەم بەڕێزانە فەرامۆش بکرێت بەتایبەت هەردوو بەڕێزان کاك محەمەدی سان ئەحمەد و مامۆستامەحیەدین کەزیاتر ماندوو بوون و هەوڵیان داوە. خەڵکی تەوێڵە بەم شێوە هەوڵیان داوە تاوەکوو لەجێگەی باو باپیرانیان دا بمێننەوە.

### تەوێڵە لەشەڕی عێراق و ئێران دا

پێگە (مەوقع)ی تەوێڵە لەسەر سنوری دوو دەوڵەتی هەمیشە ناکۆك لەگەڵ یەکتردا.. زیانێکی زۆری لێداوە، بەتایبەت لەشەڕی هەشت ساڵەیان دا ، بووە هۆی کوشتن و وێرانکردن و چۆڵکردن و ئاوارە بوونی دانیشتوانەکەی. لەکاتی ئینقلابی کۆماری ئیسلامیدا، ناحیەی نەوسود بەدەستی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە بوو... تائەم شەڕەش سوپای ئێران نەگەڕابووەوە ناوچە سەرسنوریەکانی کوردستان.

ئەوەبوو سوپای عێراق، هەر لەسەرەتاوە چووە ناوخاکی ئێرانەوە، بەتایبەت لەم دەڤەرە، ناحیەی نەوسودی بەبێ تەقە کۆنترۆڵ کردو، بەرامبەر سوپای ئێران وەستا..هەرلەم سەرەتای شەڕەوە، (نائیبی حاجی عەلی عەبدوالله) کەجێبێکی پێبوو لەهەڵەبجەوە بەرەو تەوێڵە دەهاتەوە، فرۆکەیەکی ئێرانی لەپێچی بلە تەقەی لێکردو کوشتی. کەسوپای عێراق چووە دەڤەرەکە

دانیشتوانی نەوسودو لادێکانی دەوروبەری ناچاربوون گوندەکان چۆڵ بکەن، زوربەیان بەرەو تەوێڵە هاتن.. خەڵکی تەوێڵەش.. لێهاتوانەو کوردەواریانە، چون بەدەم ئەو خەڵکە لێقەوماوانەوە، ئەوهەموو خەڵکە لەتەوێڵە جێگایان کرایەوە.. جەماوەرەکە زۆردڵخۆش بوون، بەو بەدەمەوە هاتنەی خەڵکی تەوێڵە.. بەڵام دوای ماوەیەك حکومەتی عێراقی لەئۆردوگای عەنەبدا، لەهەڵەبجە خەیمەی بو هەڵدان، هەندێکی هێنان بۆ ئەوێو ئەوانیتر برێکیان چوونەوە ناودەوڵەتی ئێران و هەندێکیشیان هەرلە تەوێڵە مانەوە، کەتەوێڵە چۆڵیکرد ئەوانیش هاتنە ئۆردوگای عەنەب، دوای چەند مانگێك لەوێش بردنی بۆ ڕومادی...

تەوێڵە لەمانگی چواردا بارودۆخی گۆڕاو، بەرەبەرە بەرتۆپ درا، سەرەتا جادەی نێوان تەوێڵە و بەڵخە کەوتە خەتەرەوە سەیارەکانی‌نێوان، ئەوجادە درانە بەرتۆپ پاشان تەوێڵەشی گرتەوە.

یەکەمجار لەڕۆژی (١٩٨١/٣/٢٤) تۆپ دای لەخانوەکەی مەهدی حاجی ئایزە لەباخچە میرا.. ئەو خانووە، ماڵی سابیری مەحمود مستەفای تیابوو، سەربانی هەیوانەکەیانی ڕوخاند، هەرچەند هەموو خانەوادەکە لەژوورەوە بوون، بەڵام کەس نەکوژرا، تەنها بەدریە عەلی عەباس، خێزانەکەی سابیر بریندار بوو، ئەویش بەسوکی، هەرلەوکاتەدا چەند تۆپێکی‌تر، دای لەباخچە میرا لای‌پردەکەی هانە سوسو، سابیر ناوێکی نەوسودی کوژرا کەئەو ڕۆژە، لەزیندانی جەماعەتی ڕزگاری لەبیارە بەر بووبوو.

دوای دوو ڕۆژ (١٩٨١/٣/٢٦) تۆپ بارانێکی تری تەوێڵە کرا، تۆپێك دای لەخانوەکەی مزگەوتی گەورە، کەلەپشتی مزگەوتەوە بوو، کەماڵی مامۆستا سەید عەبدوڕەحمانی سەید تەهای تیابوو، بەڵام هیچ زیانێکی گیانی نەدا. ئیتر لەوکاتەوە جارجارە تۆپ ئەیدا لەتەوێڵە، بەڵام لەتۆببارانی ڕۆژی (١٩٨١/٤/١٩)دا چەند کەسێکی کوشت کەئەمانە بوون:

(حەمەعەلی کەرەم، نافعەحاجی تۆفیق خێزانی هادی عەزیز، سنۆبەر مستەفا نەجیب، کاظم حەمەشەریف یەعقوب) هەروەها هەڵکەوتی (حاجی عیزەت و مامۆستا حامدی خەلیفە عومەرو حاجی مەحیەدینی حەمە یوسفی)بریندار کرد.

لەکۆتایی مانگی(١٩٨١/٦)ئامرلیوایەکی سوپای عێراق بەخۆی و کەتیبەیەکەوە تەسلیم بەئێران بوون.. مەدفەعیەکانی ئەو کەتیبەیە کەلە (ملەندو، دانرابوو بەرامبەر سوپای ئێران ڕوویان وەرگێرا بەرەو تەوێڵە و قەصفێکی

سەختی چلانەی کردو زۆر خانووی ڕوخاند، بەڵام کەس پێوە نەبوو، پاشان قەصفەکە بەردەوام بوو بۆناو بازاڕو ماڵێدەرو زۆر شوێنی گرتەوەو، بوو بەهۆی کوشتنی کۆمەڵێکی تر. کەئەمانە بوون:

حامد عەبدورەحمان - حەمەعەلی کەرەم - بەغداد ١٩٧٦

(ڕەفیق حەمەباقی، نەریمان وەهاب صادق، نازیمە وەهاب صادق، منالێکی حەمەیوسف مەحمود، پیرۆزە مستەفا خێزانی حاجی خواکەرەم، بابا خالد (بابای سێلە)و دواتریش میرزا عەبدوالله و فەرەیدون جافر ڕەسوڵ و مستەفای نەجیب و پیاوێکی نۆدشی و چەند کەسێکیش بریندار بوون).

لەم بەهارەدا کەبەم شێوە تەوێڵە بۆمباران کرا بەرە بەرە خەڵکەکەی بەرەو هەڵەبجەو سلێمانی هاتن.. هەرچەندە لەلایەن حکومەتەوە زۆر بەزەحمەت ڕێگە بەخەڵکەکە ئەدرا کەتەوێڵە چۆڵ بکەن.. بەڵام خەڵکی هەردەهات، هەندێك لەهاوارەوە بەپێو بەوڵاخ هاتن بۆ هەڵەبجەو دواتر لەمانگی تەموز حکومەت ناچاربوو کەبوار بەهەموو خەڵکەکە بدات.. ئیتر لەکۆتایی مانگی تەموزدا تەوێڵە بەتەواوی چۆڵ کرا... ئەو هەمووذانیشتوانەی جگەلە هەندێ پێداویستی کەم نەبێت هەموو سەروەت و سامان و خانوبەرەو باخ و باخاتی چەند ساڵەیان بەجێهێشت..

وەك دەڵێن:

ماڵی وەستا حەمەسەلیمی محەمەد غەفور دواماڵ بووە هاتووە بۆ هەڵەبجە، ماڵی کەماڵی مستەفاش تاپایز هەرلەناو باخەکانی چەمی خوارەوەدا ماوەتەوە ئیتر سەرماو سۆڵە ناچاری کردوە تەوێڵە بەجێ بێڵێ. حەمە خانە شەلەش هەرلەناو خانوەکەی خۆی دابوو، تارۆژێك عەسکەریە دەیبینن و سواری زیلێکی دەکەن و دەیهێننە هەڵەبجە، بەڵام صۆفی حەمەصالح نۆدشی کەپیاوێکی بەتەمەن بوو، هەرلەخانەقای تەوێڵە مایەوە تالە(١٩٨٨/٢/١) کۆچی دوایی کردو لەوێ بەخاکیان سپارد.

هەندێك لە خەڵكی تەوێڵە تادوو سێ‌ساڵ بەنهێنی‌و بەوەرەقەی قائیمقامی هەڵەبجە، لەهاویندا دەچوونەوە بۆئاودێرانی باخەكانی ئاوێسەر، ئەوانەش سێ‌كەسیان لێ‌كوژرا، دوای ئەوە خەڵكی تەوێڵە تابەهاری ڕاپەڕینی (١٩٩١) نەچونەوە تەوێڵە، ناوچەكەیان بووە، ناوچەیەكی قەدەغەكراو(موحەڕڕەمە) تەنها سەربازی عێراقی تیابوو...

**تەوێڵەیی لە ئاوارەیی دا[٧٥]:**

لەبەهاری ساڵی (١٩٨١)دا، دانیشتوانی تەوێڵە ئەو بەهەشتە جوانەیان لێ كرا بەدۆزەخ و ئەو نیشتمانە خۆشەویستەیان بەجێ هێشت و خواخوای ئەوەیان بوو، وڵاخێك یا سەیارەیەكیان دەست كەوێت تادوور بكەونەوەو، لەكوشتن خۆیان و منالیان ڕزگاربكەن. ئیتر سۆزی نیشتیمان و زێدی باوباپیران بووە، وێردی سەرزمان و هەوێنی شیعرو سۆزو گۆرانیان هەردەم بەیتەكەی شێخیان دەوتەوە لەسیاچەمانەكانیان دا كەدەڵێ:

فرە گیلانی سەحراو دەشت و دەر
نەدیم مەسكەنیو تەوێڵی وەشتەر

ئەوەتا بەخەیاڵ سەفەردەكەن بەرەو هەورامان و سەرلە زێدەكەیان دەدەنەوەو ئاهو ناڵەیان بەسیاچەمانە ئاوا دەردەبڕن و دەڵێن:

| | |
|---|---|
| یاران گەرەكما، سەفەری كەرو | بەرەو هۆرامان، من یادێ كەرو |
| ئەوەڵ سەفەرم یاوانێ خورماڵ | دیم بیەن وێرانە، نەمەنەن یەك ماڵ |
| بەرەو زەردەهاڵ، ڕام گیرتێنە قەر | دیم ئاییچ پاسە، جەخورماڵ بەتەر |
| چاچ نەمیدرانی، ڕووەم نیابیاری | دیم ورێنی یورە، هەرچوار دیواری |
| باسش مەكریۆ، دەگاشێخانی | بەهەشت و چیشی، خوا وێت مزانی |
| چاچ دیسانۆ، ڕووەم نیا بەڵخە | چیش شا سەرئامان، ئاگرد عەشرەتە |
| پێچ و بلەینە، لوانێ سۆسەكان | چیش ئامان پێشان، دوس و ڕەفیقان |
| كەوەختیو لوانی، ڕووەو تەوێڵی | ئازیزی وڵاتی، گرد بیێنی وێڵێ |
| باقی وەسەلام، شاخی هەورامان | ئینە دووری تۆن، پیسەم سەرئامان |

- تەوێڵەیی كەبەرەو خوار هاتن زوربەیان بەرەو هەڵەبجەو سلێمانی هاتن، ڕێژەیەكی زۆركەم لەخورماڵ و سەید صادق و عەربەت و دەربەندیخان و هەولێرو كەركوك و بەغدا ڕۆیشتن.

- ئەو تەوێڵەیی‌یانەی كەلە هەڵەبجە بوون لەكیمیاویەكەدا زۆریان لێ‌شەهید بوون.. لەشوێنی خۆی‌دا ناوەكانیان نوسراون، ئەوانی تر لەساڵی

(١٩٨٧)و لەوکاتی کیمیاویەدا ئاوارەی ئۆردوگاکانی ئێران بوون لە(سەلاس و جوانڕۆو سەریاس و کامیاران و بارام ئاواو دزلیو سەقزو شارەکانی ئێران دا بوون).

- لەدوای کیمیاویەکەشدا تەوێڵەییش وەك خەڵکی هەڵەبجە بەرەو ئۆردوگاکانی باینجان و بازیان و بەرحوشترو گردەچاڵ کەوتن و شالاوی گرتن و کوشتن و زیندانی کردنی ڕژێم، گرتنیەوە.

- ئەوماوەی دە ساڵە (١٩٨١-١٩٩١) خەڵکی تەوێڵە بەهۆی عیزەتی نەفس و ڕەنجی دەست و بازوو و دەست ڕەنگینی خۆیانەوە، بژێوی خۆیان دابین کردەوەو دەستیان پان نەکردەوە بۆهیچ لایەك و هیچ کەسێك، چونکە زۆربەیان پیشەیەك یازیاتر دەزانن، ملیان کەچ نەکرد بۆ ڕژێم و گوێیان لە فەصلْ کردنی وەزیفە نەبوو، زۆر بەدەگمەن چەکیان بۆ دوژمن هەڵگرتووە، ئەمەش لەچاو شوێنانی ترو زۆری خۆیان زۆر زۆر کەم بوون.. بەڵکو بەپێچەوانەوە یالەناو ڕیزەکانی خەبات و تێکۆشان دا بوون یا زیانیان نەبووە بۆ گەل و نیشتمان، واتە گەر گوڵ نەبووبن دڕکیش نەبوون.

- ئەوماوەیە لەلایەن ڕژێمەوە، هیچ یارمەتیەك و کۆمەکیەك بەرامبەر تەوێڵەیی نەکراوە، نە ئۆردوگایان بۆ کراوەتەوە نەیارمەتی دراون نەسەرۆك تیرەو بنەماڵەکانیش بوونەتە موستەشارو بەرەعیەتەکەیان دیواخانەکەیان گەرم بکەن.

- خەڵکی تەوێڵە- تەعویزی-خانوبەرەو موڵك و ماڵیان وەرنەگرتووە، بەلام هەندێکیان بەناوی زیانی جەنگ (ضرر الحرب) هەندێ پارەیان وەرگرتووە لەچاو خەڵکی تەوێڵەدا، ڕێژەیەکی زۆرکەم ئەوەشیان وەرگرتووە.

- ئەو ماوەیەو ئێستاش، ئەوانەی کەلە غەیری تەوێڵەدا دانیشتون زۆر بەچاکی بەدەم یەکترەوە بوون و، لەخۆشیو ناخۆشیەکانی ژیان دا یەکتریان بەسەر کردووەتەوەو لەیەکتر دانەبڕاون.

- لەوماوەیەدا (هەرچەندە ئامارێکی وامان نیە) تەوێڵەیی بەهۆی باروددۆخی دەرونی و خەم و خەفەتەوە، ڕێژەیەکی ئەوەندە زۆریان لێمردن بەتایبەت بەتەمەنەکان، خەڵکی هەڵەبجە دەیان وت: تەوێڵەیی کاتێك بچنەوە تەوێڵە، بەقەد پڕی پیکابێکیان نامێنێ.

**بێداریو بانگەوازی ئیسلامی:**

بێگومان پێشتر بواری ئاینیمان باس کرد، کەلەتەوێڵەدا چۆن بووە، لێرەدا بەکورتە باسێکی بێداری ئیسلامی دەکەین لەتەوێڵەدا چۆن بووە.

هەرچەندە بێداری ئیسلامی لەسەرەتای پەنجاکانەوە لەعێراق و کوردستان دا بڵاوبوەتەوە، بەڵام ماوەیەك کەوتە بەر شاڵاوو هێرشی دوژمنان و ناحەزانیەوە، ئەوەبوو ماوەیەك لاواز بوو، لەسەرەتای هەشتاکانەوە کەوتەوە گەشەکردن، لەم کاتەدا لاوان و گەنجانی تەوێڵەش بەش بەحاڵی خۆیان لەدەوری ئەم بانگەوازە بێداریەدا کۆبونەوە. دیارە لەم کاتانەدا، خەڵکی تەوێڵە لەهەڵەبجە و سلێمانیو شارەکاندا بوون، لەهەورامان دا نەبوون. ئەو تەوێڵەییيانەی کەلەهەڵەبجە بوون زیاتر چوون بەدەم بانگەوازی ئیسلامیيەوە، لەدوای ڕاپەڕینیش کەبێداری ئیسلامی زیاتر کەوتە گەشەکردن، تەوێڵەیی زۆر، لەناو ئیسلامیيەکان دا قەناعەتیان بۆدروست بوو لەدەوریان کۆبوونەوە، بەتایبەت لەناو یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان دا، بەڵکو لە تەوێڵە یەکگرتوو ئەوەندە ئەندام و لایەنگری بوو، کەتوانی بارەگای ناوچە بکاتەوە لەناو خودی تەوێڵە، جگە لەوەش لەکاتی هەڵبژاردنی شارەوانیيەکاندا لەساڵی(٢٠٠٠) ئەگەر چەند شتێك نەبوایە ئیسلامیيەکان دەردەچوون.

بەکورتەو بەپوختە:

خەڵکی تەوێڵە چونکە زۆرن، لەناو هەموو حیزبەکانیشدا زۆرن، لەزوربەی حیزبە سەرەکیو ڕەسەنەکانی عێراق و کوردستان دا هەبوون و هەن، گەیشتونەتە ئاستی سەرەوەی لێپرسراویەتی، چونکە لەدەوری سەرەك خێڵ و هۆز، کۆنەبوونەتەوە، وەخوێندەواریشیان زۆرەو، هەموویان لەناو یەك حزب یادوو حیزب دانین، قەناعەت و بەرژەوەندیان بۆ دروست بوبێت لەگەڵ ئەو حیزبەدا بوون.

هەندێ ناوچە لەبەر ئەوەی لەدەوری سەرۆك خێڵ کۆبوونەتەوە، سەرۆکەکەیان سەر بەچ حیزبێك بێت زوربەی ئەوخێڵە سەربەو حیزبەن. لەتەوێڵە وانیە قەناعەتی فیکریو سیاسیو بەرژەوەندیە.

**کیمیابارانی هەڵەبجە و خەڵکی تەوێڵە:**

هەڵەبجە یەکێکە لەکۆنترین و گەورەترین قەزای عێراق، ڕێژەی دانیشتوانی لەساڵی(١٩٧٧)دا زیاتر لە (٨٥) هەشتاو پێنج هەزار کەس بووە، جگە لەناحیەی ناوشار. لەپێنج ناحیەو (٢١٦)گوند پێکها تبوو، بەلام لەکاتی کیمیاویەکەدا ئەوهەموو گوندانە کۆکرابوونەوە لەئۆردوگاکانی عەنەب و زەمەقیو سیروان و خورماڵ و شانەدەرىو زەڕایەن، تەنها (١٨) گوندیان مابوونەوە.

هەڵەبجە بەچیاکانی هەورامان و سورێن و بالامبۆ دەشتی شارەزوور دەورەدراوە. ئەم شارە بەشارێکی ئیسلامپەروەر نیشتیمانپەروەر ناسراوەو لەبێداری ئیسلامی لە کوردستان و عێراق و دەرەوش دا، ڕۆڵی خۆی بینیووە. هەروەها گەلێزاناو بیریارو ڕۆشنبیرو ناوداری تیا هەڵکەوتووە کەڕۆڵیان بووە لە شۆڕش و خەباتی گەلەکەماندا.

خەڵکەکەی هەمیشە دژ بەستەم و زۆرداریو ناڕەوایی بوون، چەند جار ڕاپەڕیون و پەلاماری دوژمنیان داوە. هەر ئەم خەبات و مێژووەی وای کردووە لەدوژمنان هەردەم لەپیلانگێڕان دابن بۆی... هەربۆیە بەرهێرشی فڕۆکەکانی ئینگلیز لەساڵی (١٩٢٠و١٩٢١)و گرتن و زەبرو زەنگی ساڵەکانی (١٩٤٧، ١٩٥٤، ١٩٥٥)و هێرشە دڕندانەکەی زەعیم صدیق لەساڵی(١٩٦٣)و قەصفی ساڵی (١٩٧٤) و (١٩٨٧).. کەوتووە. کیمیابارانی ساڵی (١٩٨٨)یش شالاوێکی تری دوژمنانە بوو، بەرئەم ناوچەیە کەوت، بەلام شالاوو هێرشی ئەم جارە، گەلێ بەر فراوانترو دڕندانە ترو کوشندە تربوو، ئەوەندە بەئازار و پڕمەینەت و سەخت بوو ویژدانی گەلانیتری هەژاندو، بوو بەمانشێتی ڕۆژنامەکان و باس و خواسی هەموو جیهان. گۆڕانکاریەکی زۆری هێنا بەسەر ناوچەو هەرێمەکەدا، بەڵکو کوردی ناساند بەولاتان و کێشەکەشی بردە پێشەوەو، بووە خاڵێکی وەرچەرخان و بێدارکردنەوە لەخودی کوردیشدا.

لەم کیمیابارانەدا نزیکەی (٥) هەزار شەهیدو (١٠) هەزار بریندارو (٧٠) هەزاریش ئاوارە بوو. دیارە دانیشتوانی هەڵەبجە لەوساڵەدا پێکهاتبوو لەخەڵکی خودی هەڵەبجە و لادێکانی هەورامان و شارەزوور.

خەڵکی تەوێڵەش لەوکاتەدا ڕێژەیەکی زۆری لەشاری هەڵەبجە بوون، بۆیە، لەم کیمیاویەدا ژمارەیەکی زۆری لێشەهید بوون.

وابـزانم بەتـەواوی ئامـارێکی وردو تـەواو نـەکراوە بۆنـاوی شـەهیدانی هەڵەبجە، بەلاّم تائەندازەیەك ئەوەی کەکراوە زۆر نزیکە لەڕاستی‌یەوە.

تەوێڵـەیی (٢٥٨) کەسـێك شـەهید بـوون، لەوانەیـە هـەش بێت ناویمـان دەست نەکەوتبێ، بەلاّم پێویستە خوێنەر پێشتر ئاگاداری ئەم چەند سەرنجانەی خوارەوە بێت:

١- ئەم ناوانە لەسێ سەرچاوە وەرگیراون:

یـەکێکیان: هـەرخۆم (عبـدالرزاق نووسـەر) لـەکاتی کیمیاویەکـە نـاوی (١٩٢)کەسم لای خۆم نوسی بوو.

یـەکێکی تریـان: بـەڕێز مامۆسـتا (فـەخرەدین حـاجی سـەلیم) تەوێڵـەیی کەئێستا لەهەڵەبجەیە، لەم بارەوە هاوکاری باشـی کردووین و لیستێك ناوی بۆ ناردووین کە (٢٠٦) ناوی تیابوو.

سێهەمیان: نامیلکـە خنجیلانەکـەی بـەڕێز هـەورامان عـەلی تۆفیـق بـەناوی هەڵەبجە کارەساتی کیمیابارانی ساڵی (١٩٨٨)- کەناوی (٢٥٦٩) لەشـەهیدانی هەڵەبجەی نووسیووە، وەجیاشـی کردونەتـەوە کەخـەڵکی کوێن ، لەوانـە (٢٨٨) شەهیدی تەوێڵەی نوسیووە...[٧٦]

٢- ئـەم ناوانـەی کەنووسـیومانن چـەند کەسـێکیان دواتـر مـردوون، نـەك لـەکاتی کیمیاویەکـەدا، بـەلاّم هۆکارەکـە هەرکیمیاویەکـە بـووە، بۆیـە لەسـەر ئـەو شەهیدانە نووسراون.

٣- لەسـەر ئەم ڕووداوە نەمان ویست زۆرتـر بڕۆین، چونکە بابەتەکەمان تایبەت نیە بۆئەمە، هەم نوسینی تریش زۆرهەیە لەسەر ئەم مەرگەساتە، لەوانـە: مرثیـةی حلبجـە- نصـرەت الله مـەحمود زادە، خـەزانی هەڵەبجـە- بـارامی وەڵەدبـەگی، ناڵـەی هەڵەبجە -جـەمال بێدار، کارەسـاتی کیمیابارانی هەڵەبجە- شەوکەتی حاجی مشیر، هەڵەبجە کارەساتی کیمیابارانی ساڵی١٩٨٨- هەورامان عەلی تۆفیق..تاد.

٤- خـەڵکی هـەورامان بەگشـتی زۆری بەرئـەم کیمیاویـە کـەوتن، لـەو نامیلکەیـەی (هـەورامان عـەلی)دا جگـە لـە خـەڵکی تەوێڵـە زیاتر لـە (٥٠٠) کـەس ناوی هەیە کەخەڵکی لادێکانی هەورامانن، لەگەڵ ئەوەی تەوێڵەدا خۆی لە(٨٠٠) شەهید زیاتر دەدات.

٥- لەوانەیە هەش بێت کەلێرەدا ناوی تۆمار نەکرابێت، ئێمە بەدووری نازانین، هەوەك چۆن بەدوری نازانین کەناو بەهەڵە نوسرابێت، بەلاَم هەردوو حاڵەتەکە لەوانەیە دەگمەن بێت.

## ناوی ئەو تەوێڵەیی‌یانەی کەلەکیمیابارانی هەڵەبجەدا شەهید بوون

| ز | ناوی سیانی | لەدایك بوون |
|---|---|---|
| ١ | ئاوێسەر عەبدولقادرمحەمەد | ١٩٧٦ |
| ٢ | ئاریوش غالب سەعدی | ١٩٨٥ |
| ٣ | ئازاد ئیسماعیل حسێن | ١٩٦٦ |
| ٤ | ئاریان حەمەکەریم عومەر | ١٩٨٢ |
| ٥ | ئافتاو ئیبراهیم ڕەشید | ١٩٦٢ |
| ٦ | ئاشنا عەبدولقادر محەمەد | ١٩٧٧ |
| ٧ | ئاواز عابد ئەکرەم | ١٩٦٨ |
| ٨ | ئاژین فەخرەدین سەلیم | ١٩٧٧ |
| ٩ | ئامینە عەزیز بارام | ١٩٥٢ |
| ١٠ | ئامینە حەبیب مەولود | ١٩١٧ |
| ١١ | ئارام فەخرەدین ئیبراهیم | |
| ١٢ | ئاوێنە عەبدولقادر محەمەد | |
| ١٣ | ئاراس فەخرەدین ئیبراهیم | |
| ١٤ | ئەدیبە قادر جعفرسان | ١٩٣٧ |
| ١٥ | ئەسمەر حەمەصالح قادر وەلی | ١٩٧٧ |
| ١٦ | ئەسمەر عەبدواللە ئەحمەد | ١٩٦٥ |
| ١٧ | ئەڤین حسێن تۆفیق | ١٩٧٧ |
| ١٨ | ئەمین قادر ئەسکەندەر | ١٩٣٣ |
| ١٩ | ئەمیر محەمەد حەمە ڕەحیم | ١٩٧٦ |
| ٢٠ | ئەژین سەربەست مەحیەدین | |
| ٢١ | ئەحمەد ئەحمەد وەهاب | ١٩٥٢ |
| ٢٢ | ئەکرەم فەخرەدین ئیبراهیم | ١٩٧٤ |
| ٢٣ | ئەحمەد عەبدواللە ئەحمەد | ١٩٥٣ |
| ٢٤ | ئیبراهیم نەصرەدین ئیبراهیم | ١٩٧٦ |
| ٢٥ | ئیسماعیل حسێن لەتیف | ١٩٣٠ |
| ٢٦ | ئەحلام عومەر حەمەڕەشید | ١٩٦٨ |
| ٢٧ | ئەدهەم حەمەعارف حەمە | ١٩٦ |
| ٢٨ | ئیسماعیل ئەبوبەکر | ١٩١٥ |
| ٢٩ | ئێران عابد ئەکرەم | |
| ٣٠ | ئەمیرە حەمە سەعید وەیسی | |
| ٣١ | باخەوان جەمیل مەحمود | ١٩٧٥ |
| ٣٢ | بێساران عەبدوڕەحمان عەبدولوەهاب | ١٩٧٢ |
| ٣٣ | بێرون جەمیل مەحمود | ١٩٨٤ |
| ٣٤ | بێگەرد سەعدواللە صادق | ١٩٧٠ |
| ٣٥ | بێخاڵ سەعدواللە صادق | ١٩٦٨ |
| ٣٦ | بەهمەن جەمیل مەحمود | ١٩٧٣ |
| ٣٧ | بەکر وەیسی عەبدولکەریم | ١٩٣٤ |
| ٣٨ | بەفراو اللە کەرەم ئەبوبەکر | ١٩٧٦ |
| ٣٩ | بەدیعە عەبدوڕەحمان عەبدولوەهاب | ١٩٧٤ |
| ٤٠ | بەدریە محێدین حەسەن | ١٩٥٧ |
| ٤١ | بەهار فەخرەدین ئیبراهیم | ١٩٨٦ |
| ٤٢ | بەهار حسێن | |
| ٤٣ | پشتیوان سەعدواللە صادق | ١٩٥٤ |
| ٤٤ | پەروین مەحیەدین حەسەن | ١٩٦٢ |
| ٤٥ | پەری کەریم | ١٩٢٨ |
| ٤٦ | تانیا مەحیەدین سەلیم | ١٩٦٧ |
| ٤٧ | توبا حەمە ڕەشید کوزاد | ١٩٣٢ |
| ٤٨ | توبا شەفیع اللە کەرەم | ١٩٦٢ |
| ٤٩ | توبا ئەحمەد ئیسحاق | ١٩٣٠ |
| ٥٠ | جوان فەرید جەمال | ١٩٨٤ |
| ٥١ | جهانگیر سەعدواللە صادق | ١٩٧٦ |
| ٥٢ | جمال مستەفا مەولود | ١٩٣٣ |

| ٥٣ | جیهان صادق حەمەصاڵح | ١٩٥٣ |
|---|---|---|
| ٥٤ | جیهاد الله کەرەم ئەبوبەکر | ١٩٧٩ |
| ٥٥ | چنور حەمەکەریم حەمەکەریم | ١٩٧٠ |
| ٥٦ | چرۆ نعمان حافظ | ١٩٨٢ |
| ٥٧ | چنور حسێن تۆفیق | ١٩٧٩ |
| ٥٨ | چیمەن مستەفا فەتاح | |
| ٥٩ | چرۆ ناجی حەمە لەتیف | |
| ٦٠ | حەمە یوسف مارف قادر | ١٩١٧ |
| ٦١ | حەمەصاڵح حەمەشریف حەمەعزیز | ١٩٢٦ |
| ٦٢ | حەمەشریف یەعقوب ڕۆستم | ١٩٢٦ |
| ٦٣ | حەمەصاڵح حەمەڕەشید فتاح | ١٩٤٠ |
| ٦٤ | حەمەکریم حاجی حەمەکریم | ١٩٥٣ |
| ٦٥ | حامد حەکیم ئەحمەد | ١٩٥٣ |
| ٦٦ | حسین توفیق نادر | ١٩٤٩ |
| ٦٧ | حەمەکریم عومەر حەمەکریم | ١٩٣٤ |
| ٦٨ | حەسەن فارس عبدالله | ١٩٦٧ |
| ٦٩ | حەمەمراد ئەحمەد عەزیز | ١٩١١ |
| ٧٠ | حەمیدە حەکیم مەجید | ١٩٥٠ |
| ٧١ | حەسیبە تۆفیق صادق | ١٩٤٨ |
| ٧٢ | حەلیمە عەلی حسەین | ١٩٣٩ |
| ٧٣ | حامدە مستەفا فەتاح | ١٩٦٥ |
| ٧٤ | حەمەخان وەیس حەمەخان | ١٩١٠ |
| ٧٥ | حەسەن حسەین عەبدولکەریم | ١٩٦٧ |
| ٧٦ | حەمەصاڵح ئەحمەد ڕەشید | |
| ٧٧ | حسێن قادر عەبدوالله | |
| ٧٨ | خوشکان سەعدوالله صادق | ١٩٧٢ |
| ٧٩ | خونچە حامد بابا | ١٩٤٤ |
| ٨٠ | خەرامان حەمەیوسف حەمەحسێن | ١٩٥٥ |
| ٨١ | خاڵخاس صادق حەمەصاڵح | ١٩٤٥ |
| ٨٢ | خۆراسان حەکیم حەسەن | ١٩٧١ |
| ٨٣ | خەدیجە محەمەد ڕەحیم | |
| ٨٤ | خانزاد سەعید ڕەحیم | ١٩٢٠ |
| ٨٥ | خاتون عەبدوالله مەعروف | |
| ٨٦ | دەشتی عابد ئەکرەم | ١٩٧٥ |
| ٨٧ | دیلمان جەمال عەبدوالعەزیز | ١٩٨٥ |
| ٨٨ | داریوش غالب سەعدی | ١٩٨٠ |
| ٨٩ | دنیا صادق محەمەد | |
| ٩٠ | دانا لەتیف حەمەصاڵح | |
| ٩١ | دولبەر لەتیف صاڵح | |
| ٩٢ | ڕازاو تاریق نەصروالله | |
| ٩٣ | ڕەنج فەخرەدین سەلیم | ١٩٨٧ |
| ٩٤ | ڕێبوار نەصرەدین ئیبراهیم | ١٩٨١ |
| ٩٥ | ڕزگار نەجمەدین فەتاح | ١٩٦١ |
| ٩٦ | ڕامش غالب سەعدی | ١٩٨٧ |
| ٩٧ | ڕەمزیە نەجمەدین ئەبوبەکر | ١٩٧٨ |
| ٩٨ | ڕەنگین سەعدوالله صادق | ١٩٨٠ |
| ٩٩ | ڕابعە محەمەد مەولود | ١٩٥٨ |
| ١٠٠ | ڕۆشنا عەبدوڕەحمان عەبدولوەهاب | ١٩٨٢ |
| ١٠١ | ڕێزان عابد ئەکرەم | ١٩٨٠ |
| ١٠٢ | ڕێکان عابد ئەکرم | ١٩٨٦ |
| ١٠٣ | ڕەعنا نادر حەمە لەتیف | ١٩٤٧ |
| ١٠٤ | ڕەعنا مەحمود محەمەد قادر | |
| ١٠٥ | ڕەزا ئەحمەد قادر | ١٩٣٠ |
| ١٠٦ | ڕەعنا حەمە یوسف قادر | ١٩٢٥ |
| ١٠٧ | زەکەریا عەبدوڕەحمان عەبدولوەهاب | ١٩٦٣ |
| ١٠٨ | زێبا حەمە ئەمین | ١٩٣٠ |
| ١٠٩ | زانا لەتیف صاڵح | |
| ١١٠ | ژیان حەمەئەمین | |
| ١١١ | ژیان حەسەن توفیق | |
| ١١٢ | سەردەشت ئەحمەد عەبدوالله | ١٩٧٩ |

| ١١٢ | سەربەست حەسەن عەزیز | ١٩٧١ |
|---|---|---|
| ١١٤ | سەرپێز محەمەد حاجی حەمەڕەحیم | ١٩٧٤ |
| ١١٥ | سەربەست عابد ئەکرەم | |
| ١١٦ | سەریاس عابد ئەکرەم | ١٩ |
| ١١٧ | سەفیە محەمەد حەمەحسێن | ١٩٤٢ |
| ١١٨ | سەعادە خالد ئەحمەد | ١٩٥٣ |
| ١١٩ | سەعادە حەمەصاڵح حەمەیوسف | ١٩٣٤ |
| ١٢٠ | ساکار محەمەد حەمەصاڵح | ١٩٨١ |
| ١٢١ | ستار حەمەسەلیم محەمەد | ١٩٦٣ |
| ١٢٢ | سەعدواللە صادق غەنی | ١٩٣٥ |
| ١٢٣ | سەرهەنگ فەخرەدین عەبدولعەزیز | ١٩٧٨ |
| ١٢٤ | سەنگەر فەخرەدین سەلیم | ١٩٨٢ |
| ١٢٥ | سەربەست مەحیەدین | |
| ١٢٦ | سیروان عەبدولخالق فایەق | |
| ١٢٧ | سەعید محەمەد | |
| ١٢٨ | سەیوان ڕەحمان قادر | |
| ١٢٩ | سەرکەوت ڕەحمان قادر | ١٩٦٨ |
| ١٣٠ | سەنیە محەمەد | |
| ١٣١ | شنۆ نعمان حافظ | ١٩٨٠ |
| ١٣٢ | شوانە حەمەسەعید | |
| ١٣٣ | شاهۆ حەمەڕەشید | |
| ١٣٤ | شاخەوان مەجید | |
| ١٣٥ | شاخەوان حسین تۆفیق | ١٩٧٥ |
| ١٣٦ | شاخەوان فەخرەدین ئیبراهیم | ١٩٨٢ |
| ١٣٧ | شاخەوان محەمەد حەمەصاڵح | ١٩٨٢ |
| ١٣٨ | شەمسە حسێن قادر ئاغا | ١٩٢٧ |
| ١٣٩ | شیلان عەبدوڕەحمان عەبدولوەهاب | ١٩٧٩ |
| ١٤٠ | شنۆ حەمەئەمین | |
| ١٤١ | شیلان ئەحمەد عەبدواللە | ١٩٧٧ |
| ١٤٢ | شادان ئەحمەد عەبدواللە | ١٩٨٧ |
| ١٤٣ | شەرمین ئەحمەد عەبدواللە | ١٩ |
| ١٤٤ | شەمعە جەعفەر بابالە | ١٩٥٠ |
| ١٤٥ | شادان نەریمان مستەفا | ١٩ |
| ١٤٦ | شیرین عابد ئەکرەم | ١٩ |
| ١٤٧ | شەمعە حەمەئەمین مەحمود | |
| ١٤٨ | صابر فەرەج حەمەئەمین | ١٩٣٤ |
| ١٤٩ | صەلاح کەریم نەجمەدین | |
| ١٥٠ | صەباح صائیب زۆراب | ١٩٥٤ |
| ١٥١ | صەبیحە کوێخا ڕۆستەم کەریم | ١٩٥١ |
| ١٥٢ | طەلیعە قادر مەجنون | ١٩٤٨ |
| ١٥٣ | طەلیعە قادر فەتاح | ١٩٤٨ |
| ١٥٤ | عەبدولکەریم وەیس عەبدولکەریم | ١٩٤١ |
| ١٥٥ | عارف محەمەد حامد | ١٩١٤ |
| ١٥٦ | عومەرعەبدولحەکیم حەمەصاڵح | ١٩٣٠ |
| ١٥٧ | عابد عەبدولحەکیم قوربانی | ١٩٢٦ |
| ١٥٨ | عابد ئەکرەم عوسمان | ١٩٣٢ |
| ١٥٩ | عەدنان نەسرەدین ئیبراهیم | ١٩٦٧ |
| ١٦٠ | عەزیز کەریم حەمەسەعید | ١٩٢٢ |
| ١٦١ | عەلی محەمەد عەبدواللە | ١٩٢٧ |
| ١٦٢ | عەزیز محەمەد حسێن | ١٨٩٧ |
| ١٦٣ | عەبدولواحد کەریم حەمەسەعید | ١٩٣٦ |
| ١٦٤ | عەبدوڕەحمان حەسەن حەمەحسێن | ١٩٤٦ |
| ١٦٥ | عەبدواللە حەمەحسین عەبدواللە | ١٩١١ |
| ١٦٦ | عائیشە حەمەخان | ١٩٢٢ |
| ١٦٧ | عصمەت حەسەن حەکیم | ١٩٣٠ |
| ١٦٨ | عائیشە مستەفا مۆمن | ١٩٣٢ |
| ١٦٩ | عائیشە یەعقوب ڕۆستەم | ١٩٢٥ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٧٠ | عاليه باسام نەصروالله | |
| ١٧٢ | عائيشه فەتحوالله صەيفور | ١٩٥٨ |
| ١٧٣ | عەبدولخالق فايەق | ١٩٣٨ |
| ١٧٤ | عەبدولكەريم صاحيب نەزير | ١٩٥٥ |
| ١٧٥ | عەبدول محەمەد ئەمين | |
| ١٧٦ | غالب سەعدی قادر | ١٩٥١ |
| ١٧٧ | فەلاح سەعدوالله صادق | ١٩٦٩ |
| ١٧٨ | فەخرەدين عەبدولعەزيز عەلی | ١٩٤٢ |
| ١٧٩ | فەريد جەمال مستەفا | ١٩٥٦ |
| ١٨٠ | فەخرەدين ئيبراهيم عوسمان | ١٩٤٣ |
| ١٨١ | فەتحوالله عەبدوالله فەتاح | ١٩٠٩ |
| ١٨٢ | فەتحوالله سليمان فەتحوالله | ١٨٩٨ |
| ١٨٣ | فريشته حەمەكەريم حەمە | |
| ١٨٤ | فريشته نامەوەش | |
| ١٨٥ | ڤيان حسێن تۆفيق | ١٩٧٨ |
| ١٨٦ | ڤيان فەريد جەمال | |
| ١٨٧ | قەيصەر سەعدی قادر | ١٩٥٢ |
| ١٨٨ | كاروان فەريد جەمال | ١٩٨٦ |
| ١٨٩ | كۆسالان عەبدوڕەحمان عەبدولوەهاب | ١٩٧٤ |
| ١٩٠ | كاروان جەمشير فارس | ١٩٨٥ |
| ١٩١ | كاوە حسين حەمەلاو | ١٩٦٨ |
| ١٩٢ | كۆسار نعمان حافظ | ١٩٨٧ |
| ١٩٣ | كاكەبرا ئەحمەد ئيسحاق | ١٩٣٥ |
| ١٩٤ | كامەران نەريمان مستەفا | ١٩ |
| ١٩٥ | كارزان نەريمان مستەفا | ١٩٨٢ |
| ١٩٦ | كاروان نەريمان مستەفا | ١٩٨٧ |
| ١٩٧ | كەويارحسێن تۆفيق | ١٩٧٦ |
| ١٩٨ | كەلسوم فەخرەدين ئيبراهيم | ١٩٧٨ |
| ١٩٩ | كافيه مەحمود عەبدوڕەحمان | ١٩٣٠ |
| ٢٠٠ | كوێستان عەبدوڕەحمان قادر | ١٩٧٠ |
| ٢٠١ | كەژاڵ عەبدوڕەحمان حەسەن | ١٩٧٤ |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٠٢ | كاڵێ قادر ڕەسوڵ | ١٩٢٨ |
| ٢٠٣ | كۆسالان قادر احمد | |
| ٢٠٤ | كارزان نەصرەدين محەمەد | |
| ٢٠٥ | كۆسار نەصرەدين محەمەد | ١٩٨٢ |
| ٢٠٦ | كوردستان نەصرەدين | |
| ٢٠٧ | كەريم عەزيز | |
| ٢٠٨ | گوڵزار عەبدولخالق | |
| ٢٠٩ | گوڵزار تاريق نەصروالله | |
| ٢١٠ | گوڵگوش غالب سەعدی | |
| ٢١١ | گۆران محەمەد صاڵح | |
| ٢١٢ | لاولاو عەبدوالله هۆمەر | ١٩٦٥ |
| ٢١٣ | لهۆن عابد ئەكرەم | ١٩٨٨ |
| ٢١٤ | مەدينە حەمەئەمين | |
| ٢١٥ | ماكوان سەعدوالله صادق | ١٩٦٥ |
| ٢١٦ | مەحمود محەمەد مولود | ١٩٤٤ |
| ٢١٧ | موئمين عەبدوالله ئەحمەد | ١٩٥٣ |
| ٢١٨ | مستەفا فەتاح حەمەئەمين | ١٩١٦ |
| ٢١٩ | محەمەد صاڵح حەمەڕەزا | ١٩٤٠ |
| ٢٢٠ | مژدە عابد ئەكرەم | ١٩٨٢ |
| ٢٢١ | مەنيجە نەصرەدين ئيبراهيم | ١٩٧٣ |
| ٢٢٢ | مريەم عەبدولكەريم | ١٩٣٣ |
| ٢٢٣ | ميديا محەمەد حەمەصاڵح | ١٩٧٦ |
| ٢٢٤ | محەمەد عەبدوالله مەولود | ١٩٣٠ |
| ٢٢٥ | مەريوان عەبدوالله حەمەصاڵح | ١٩٧٠ |
| ٢٢٦ | مەحبوبە عەلی مەحمود | |
| ٢٢٧ | مريەم مەحمود | |
| ٢٢٨ | مەدينە حەمەشەريف | |
| ٢٢٩ | ( ) مەحمود محەمەد محێدين | ١٩٨٧ |
| ٢٣٠ | ناجح ئيسماعيل حسێن | ١٩٦٠ |
| ٢٣١ | نازم حەمەشەريف يەعقوب | ١٩٦٨ |
| ٢٣٢ | نەصرەدين ئيبراهيم عوسمان | ١٩٤٠ |
| ٢٣٣ | نەصرەدين محەمەد حەمەكەريم | ١٩٤٧ |

| ٢٣٤ | نزار فایەق حەمەصاڵح | ١٩٨٦ |
| --- | --- | --- |
| ٢٣٥ | نەریمان مستەفا فەتاح | ١٩٤١ |
| ٢٣٦ | نەجیب عەلی ڕۆستەم | ١٩١٤ |
| ٢٣٧ | نەرمین سەعدوالله صادق | ١٩٨١ |
| ٢٣٨ | نیان فەرید جەمال | ١٩٨٣ |
| ٢٣٩ | نگین فەخرەدین سەلیم | ١٩٨٠ |
| ٢٤٠ | نیاز عابد ئەکرەم | ١٩٧٦ |
| ٢٤١ | نگین نەصرەدین ئیبراهیم | ١٩٨١ |
| ٢٤٢ | ناسکە شیروان محەمەد | ١٩٨٧ |
| ٢٤٣ | نازەنین محەمەد عەبدوالله | ١٩٦٥ |
| ٢٤٤ | نوخشە صاڵح | |
| ٢٤٥ | نازدار فەتاح مەولود | ١٩١٠ |
| ٢٤٦ | وەزیرە عەبدولقادر محەمەد | ١٩٧٦ |
| ٢٤٧ | واحیدە حەمەشەریف حەسەن | |
| ٢٤٨ | هەرێم حسێن تۆفیق | ١٩٨٠ |
| ٢٤٩ | هەورامان فەخرەدین ئیبراهیم | ١٩٨٥ |
| ٢٥٠ | هەورامان عەبدولقادر محەمەد | ١٩٧٨ |
| ٢٥١ | هەورین فەخرەدین سەلیم | ١٩٧٨ |
| ٢٥٢ | هەنا نەصرەدین محەمەد | ١٩٨٧ |
| ٢٥٣ | هەدیە زاهیر حەمەصاڵح | ١٩٨٦ |
| ٢٥٤ | هەمینە سلێمان وەیس | ١٩٢٢ |
| ٢٥٥ | هەمزە سلێمان عوسمان | ١٩٧٢ |
| ٢٥٦ | هەرێم حەمید حەمەسلێمان | |
| ٢٥٧ | هوشیار جەبار عەبدوالله | |
| ٢٥٨ | یوسف حەمەحسێن حەمەسەعید | ١٨٩٠ |

ئەمانەش ئەنفال کراون:

| شیرین حەمد قاسم ئاغا | ١٩٢٥ |
| --- | --- |
| عەلی قادر ئەسکەندەر | ١٩٣٠ |
| سەلما حەمەصاڵح وەستا قادر | ١٩٢٩ |
| ئادەم کوری سەلما (ئادەم مەحمود) | ١٩٥٥ |

## تەوێڵە ناوچەی مین ڕێژکراوە:

بەهۆی بارودۆخی ناوچەکەوە-بەتایبەت شەڕی نێوان عێراق و ئێرانەوە، زۆرر شوێنی تەوێڵە ئەڵغام ڕێژکراوە، زیاتر چەمی دزاوەر، چەمی‌ئاوێسەر، کەمەرسپی‌و سەرچاڵ و گوزیندار و قەلاّمیرزاو پشتی خەڵەفی‌و لوتکەی صۆفی جانە... هەرچەندە مینی هەندێ شوێنیان دەرهێناوەتەوە، بەلاّم زۆری ماوە، لەکۆڕەوەوە، تاساڵی (٢٠٠٠) (٢٢) کەسی کوشتووە بەپێی تۆماری بنکەی تەندروستی تەوێڵە کەئەمەش ناوەکانیانن.

١-بەرزان محەمەدسان ئەحمەد

٢-عاصیمە محەمەدسەعید

٣-فەریق عوسمان کەی‌خەسرەو

٤-ئازاد عارف حەمەحسێن

٥-فەهمی محەمەد حەمەڕەحیم

٦-ئەنوەرمیرزا عەبدوالله

٧-سەردارخالد
٨-شاهۆحەمەیوسف
٩-ئەشرەف نورەدین مستەفا
١٠-دڵشاد نافع بابا
١١-فکرەت محەمەد حەمەڕەحیم
١٢-فەرحان عوسمان جەعفەر
١٣-کاوە غەریب حەمەئەمین
١٤-کەمال عەلی محەمەد
١٥-ئاریان جەعفەر ئەکرەم
١٦-نەزهەت ڕەحمان جامی
١٧-هۆمەر شفیع محەمەد
١٨-فەرید حاجی کامیل حەسەن
١٩-عەبدولواحد عەبدواللە مەولود
٢٠-بەهمەن عەبدولکەریم حەکیم
٢١-پەروێز عەبدولکەریم حەکیم
٢٢-شیروان ئەحمەد ئیبراهیم.

لەهەمان بنکە ناوی (٣٧) کەس تۆمارکراوە کەبریندار بوون بەهۆی لوغوم و مینەوە کەئەمەش ناوەکانیانە.

| ز | ناو | زیان لێ کەوتنی |
|---|---|---|
| ١ | ڕزگار جەبار سەعید | پەڕینی قاچی ڕاستی |
| ٢ | وەهاب صادق ئەحمەد | پەڕینی قاچی چەپی |
| ٣ | ژیان حەمەمراد | پەڕینی قاچی ڕاستی |
| ٤ | نەعیمە وەسیم عوەض | پەڕینی قاچی ڕاستی |
| ٥ | ئەحمەد تۆفیق | پەڕینی قاچی ڕاستی |
| ٦ | نەهیە ئەبوبەکر کوزاد | پەڕینی قاچی ڕاستی |
| ٧ | توبا ڕەحمان روح الله | پەڕینی قاچی ڕاستی |
| ٨ | حەمزە نورەدین مستەفا | پەڕینی هەردوو پەنجەی دەستی ڕاستی |
| ٩ | ماجد مستەفا عەبدولحامید | پەڕینی هەردوو قاچی لەگەڵ چاوی ڕاستی |
| ١٠ | حەمزە حەمەحەسەن | پەڕینی دەستی ڕاستیو کوێریش بووە |
| ١١ | حەیدەر عەلی محەمەد | پەڕینی دەستی ڕاستیو کوێر بووە. |

| ١٢ | زۆراب عوسمان جافر | پەڕینی قاچی ڕاستی. |
|---|---|---|
| ١٣ | ئەنوەر عارف ڕەسوڵ | پەڕینی قاچی ڕاستی |
| ١٤ | عەدنان عارف محەمەد | پەڕینی قاچی ڕاستی |
| ١٥ | ئافتاب محەمەد حەمەسەلیم | پەڕینی قاچی ڕاستی |
| ١٦ | حەسەن نەجمەدین ئەبوبەکر | چاوێکیو دەستێکی لەدەست داوە |
| ١٧ | تالب عەبدوالقادرئەبوبەکر | بریندار |
| ١٨ | باران جەمال محەمەد | بریندار |
| ١٩ | جەمال محەمەدحەسەن | بریندار |
| ٢٠ | شاهۆ عەلی عەلی | قاچێکی لەدەست داوە |
| ٢١ | محەمەد صابر عەبدوالله | هەردوو قاچی لەدەست داوە |
| ٢٢ | لەتیف ڕەحمان | سێجار برینداا بووە |
| ٢٣ | دیاری تۆفیق سان ئەحمەد | دوو پەنجەی دەستی لەدەست داوە |
| ٢٤ | عوسمان کەریم | بریندار |
| ٢٥ | یونس کەریم | بریندار |
| ٢٦ | عەتا محەمەد ئەمین | پەڕینی هەردوو قاچی |
| ٢٧ | هێمن فەتاح | بریندار |
| ٢٨ | هاوڕێ فەتاح | بریندار |
| ٢٩ | حەمەسەلیم محەمەد غەفور | قاچێکی لەدەست داوە |
| ٣٠ | عەتا محەمەد ئەمین | هەردوو قاچی |
| ٣١ | هێمن صەلاح جافر ڕەسوڵ | قاچێکی لەدەست داوە |
| ٣٢ | سارەوان سالار جافر ڕەسوڵ | دوو پەنجەی دەستی لەدەست داوە |
| ٣٣ | عەزیمە عەلی قادر | قاچێکی لەدەست داوە |
| ٣٤ | پەروین کاکل | بریندار |
| ٣٥ | نەزمی حەمەصالح فەرەج | قاچی ڕاستی لەدەست داوە |
| ٣٦ | نەزهەت عەلی محەمەد | قاچێکی لەدەست داوە-لەکۆڕەودا لەنەوسود مینی پیادا تەقی |
| ٣٧ | حەمە یوسف مەحمود حەکیم | بریندار |

## تەوێڵە و تەوێڵەیی لەڕا پەڕین و دوای ڕا پەڕین:

لەم ماوەی كەگوزەرا لەپێش ڕاپەڕین دا.. خەڵكی قەزای هەڵەبجە بەگشتی تووشی دەردی سەریو مەینەت و ئازارێكی زۆرهاتن.. كەم دەڤەر هەبێ- مەگەر ناوچە ئەنفال كراوەكان- وەك ئەم خەڵكی قەزایە شەهیدو دەربەدەریو ئەشكەنجەیان چەشتبێ. سەردەمێك بوو ئەوەی دەفتەر نفوسەكەی هەڵەبجە بوایە لەشاری سلێمانی قاچاغ بوو، خانویان بەكرێ پێنەدەدرا، مناڵیان لەقوتابخانە وەرنەدەگیرا بایەعیان نەبوو، لەدائیرە وەرنەئەگیرانەوە..تاد.

پێشینان دەڵێن:

هەمووشت لەباریكیدا دەپچڕێ تەنها ستەم لەقایمیدا.. ستەم كردن لەكورد بەگشتیو هەڵەبجەیی بەتایبەتی گەیشتە قایمی.. هەرلەبەر ئەمەش بوو لەڕاپەڕین دا هەڵەبجەیی ڕۆڵی خۆیان هەبوو... خەڵكی تەوێڵەش لەسلێمانی بەشداریەكی باشیان هەبوو لەپەلاماردان و ڕاپەڕینەكەدا، چونكە تەوێڵەیی چەند جار ماڵ وێران كرابوون كاتێك لەتەوێڵەبوون، چوونە هەڵەبجەو لەوێوە چوونە ئێران- هاتنەوە سلێمانی، كەچی لەسلێمانیش نەیان دەهێشت دانیشن، چوونە باینجان و بەرحوشتر و هاتنەوە سلێمانیو كۆچڕەویان كردو پاشان بەرە بەرە نیشتەجێ بوونەوە، واتە زۆرداخ لەدڵ بوون ستەمیان زۆر لێكرابوو.

لەكۆچڕەودا تەوێڵە وەك ئۆردوگایەكی لێهات و هیلال ئەحمەری ئێرانی، لەتەوێڵە ڕۆڵێكی باشی بینی لەدابەشكردنی چادر و دابینكردنی بنكەیەكی تەندروستیو بەداو دەرمان و دكتۆرەوە... نزیكەی دووسەد ماڵێكی تەوێڵەیی لەو ئاپۆڕەدا مانەوە، چوونەوە سەر كەلاوە كۆنەكانیان و دەستیان كردەوە بەدروستكردنی خانوەكانیان.. لەناو ئەوانەدا كە زوو چوونەوە تەوێڵە و خانوویان دروست كردەوە بەڕێزان (وەهاب صادق و ڕاغب كەریم یارئەحمەد)بوون.

لەدواتردا قوتابخانەو دەزگاو دائرەكان كرانەوەو، خەڵكەكە نیشتەجێ بووەوەو شادبوویەوە بەزێدی خۆیان. ئێستا زیاتر لە (٦٥٠)ماڵی تیایەو ئەوانی تر لەهەڵەبجەو سلێمانیو هەڵەبجەی تازەو شارەكانی ترن.

**چەند زانیاریەك بەگشتی لەسەر خەڵکی تەوێڵە :**

پێشمەرگەکانی شۆڕشی نوێ:

کەشۆڕشی نوێ دەستی پێکردەوە، تەوێڵە و تەوێڵەیی یەکان دوور نەبوون لەشۆڕش، بەڵکو کەسانێکی زۆر بوونە پێشمەرگە و پەیوەندیان کرد بەڕێکخستنەکانی شۆڕشەوە.

پزگار مەحیەدین - حەمە فەرەج مستەفا
سیانزاری بیومك - هاوینی ١٩٧٩

لەدەست پێکردنی شۆڕشەوە، بۆڕاپەڕین (١٩٧٦-١٩٩١) زیاترلە (١٠٠) پێشمەرگەی تەوێڵەیی بوون. لەوانە کەزیاتر لەناو شۆڕش دا ناویان بووە بەڕێزان:

لەیەکیەتی نیشتیمانی کوردستان:

ئازاد مەجید غەفاربەگ ناسراو بەئازاد هەورامی، جەمیل هەورامی، محەمەد حەمەسەعید، نیازی عیزەت، حەمە فەرەج محەمەد بابا، شەوکەت حەمە صالح، عوسمان صۆفی حەمەکەریم، حەمەسەلیم فەتحواللە ، ڕزگار مەحیەدین، سەردار شەوکەت...تاد.

لەپارتی دیموکراتی کوردستان:

نەصرەدین حاجی عەبدواللە ، محەمەد حەمەسەعید، زۆراب عەزیز بارام، نەصرەدین عابد عەلی وەیس، عوسمان حاجی عەبدوڕەحمان، کامیل کەریم، سەید ئەحمەد سەید عەلی، ئەنوەرعەلی حەمەسەعید، عەبدواللە محەمەد، مەجنون قادر..تاد.

لەناو حیزبی شیوعیدا:

نەجمەدین فەتحواللە ، مەناف حەمەڕەشید،

لەناوحیزبی سۆشیالیست دا:

عەبدولخالق عەبدولوەهاب...

**شەهیدەکانی شۆڕش:**

لەشۆڕشی ئەیلولەوە بۆ شۆڕشی نوێ و لەوێشەوە بۆ ڕاپەڕین لەڕاپەڕینەوە بۆ پاراستنی حکومەتی هەرێم تاساڵی (٢٠٠٠) نزیکەی (١٠٠) پێشمەرگەی تەوێڵەیی شەهید بوون لەوانە:

لەناو پارتیدا: (سەید ئەحمەد سەید عەلی، مەجنون قادرمەجنون، کامیل کەریم خواجە ئەحمەد، سەرکەوت حاجی کامیل حەسەن، صەباح باسام نەصروالله، نەصرەدین عابد عەلی وەیس، سۆران ئیسماعیل محەمەد، ئاراس محەمەد حەمەڕەشید ... تاد).

لەناویەکیەتیدا: (ڕێبوارحەمە لەتیف وەلی، یاسین ئەمین کەریم، سەعدی ئەبوبەکر ئەکرەم، ئازاد مەجید هەورامی، نەریمان ئیدریس عەبدالله، نیازی عیزەت حەسەن، حەمەفەرەج محەمەد بابا... تاد).

نیازی عیزەت - ڕزگار محیەدین

بەهۆی وەزعی سیاسیەوە کەشۆڕشی نوێ دروست بوویەوە، لەتەوێڵە چەند کەسانێك لەلایەن حکومەتی عێراقیەوە گیران و زیندانی کران، دوای ماوەیەك ئازاد کران، لەوانە:

جەعفەرحاجی عەبدالله ، هادی حەمەیوسف، جەمال ئەلی محەمەد، بەڵام (عەبدولحەکیم فەتاح) ناسراو بە(حەکلە) گیراو بێسەر و شوێن کرا.

دواتریش لەشەڕدا وەك پێشمەرگە چەند کەسانێك گیران و هەشیانە تائێستا هەربێ سەروشوێنە، وەك:

یونس فەرەج و ناجی حەمەلەتیف لەئەحمەد ئاوا گیران و(٢٠) ساڵ حوکم دران، دوایی بەر لێبوردن کەوتن، هەروەها ئەیوب محەمەد حەمەڕەحیم لەهەمان شوێن گیرا ئائێستاش بێسەروشوێنە.

(فەخرەدین عەبدالله حەمەسەعید) لەساڵی (١٩٨٨) گیراو لەدوای ڕاپەڕین لەساڵی (١٩٩٧) بەربوو، ئێستا ئەفسەرە بەپلەی عەقید لەناو فەرماندەیی یەکیەتی نیشتیمانیدا.

**مەرگەساتەکانی‌تر:**

- ئەمانەی خوارەوە لەساڵی (١٩٧٧ بۆ ١٩٨١) کوژراون لەتەوێڵەدا، لەئەنجامی ئەو زروف و بارودۆخەی کەلە تەوێڵەدا هەبوو، ئیتریا بەئەنقەست یا بەگوللەی وێڵ لەلایەن ڕژێمەوە کوژراون:

(موختار عەزیز کەریم، یاسین محەمەد مستەفا، حەمەعەلی عەبدولحەمید، دەوڵەت عەزیز مەعروف (خێزانی حاجی ئیسماعیل ئەبوبەکر)، عەزیز مەحمود حەمەزەریف، حەمەیوسف وەهاب صادق)

- ئەمانەش برینداربوون:

(موڵکیمەجید الله وەیس، دوڵبەر نوری خودادا، ئامینە صدیق عەلی، ڕێبوار یوسف مەولود، دیاری حەمەصاڵح فەرەج (بەئەڵغام لەدەرەی بەڵخ)

- دوای ئەوەی کەتەوێڵە چۆڵکرا لەساڵی (١٩٨١) هەندێك لەخاوەن باخەکان دەچونەوە بۆ ئاودێرانی باخەکانیان، جا تاساڵی (١٩٨٧) سێ‌کەس کوژران کەئەمانەن:

حەمەسەعید ڕۆستەم حەکیم-لەچەمیئاوێسەر شەو تەقەی‌لێ‌کراو کوژراوە.

محەمەد حەمەڕەحیم (دارابەگ) لەئاوێسەر بەئەڵغام کوژرا.

محەمەد عەبدوالله (کامەران هێمن) لەئاوێسەر بەئەڵغام کوژرا.

-لە شۆڕشی نوێشدا لەنێوان (١٩٧٧ بۆ ١٩٨١) لەلایەن شۆڕشەوە سێ تەوێڵەیی لە تەوێڵەدا کوژراون کەئەمانەن:

(حەسەن حەمەسەلیم، جەمیل ئاغە جافر، محەمەد حەمەڕەشید.)

- لەکۆتایی شەستەکان دا (هەیاس حەمەسەعید) کەپیاوێکی کاسب بوو هاتو چۆی بەغدای دەکرد، لەلایەن ڕژێمەوە گیراو لە(نوگرەسەلمان) زیندانی کرا، دوای ماوەیەك هەواڵ هات کەکوژراوە.

- لەنێوان ساڵانی(١٩٧١بۆ١٩٧٥)لەسلێمانی ئەم سێ تەوێڵەیی‌یە بەبێ تاوان کوژراون کەکاسب بوون:

(یاسین حەمەئیمام) شەوی(٢٤-١٩٧١/١٢/٢٥، (جەبار سەعید محەمەد)و (ئەمین حەسەن) هەردوکیان بەیەکەوە کوژراون لە (١٩٧٤/١٢/٢٨).

- ئەم دوانەش ونن(مەفقودن) لەدایك بووی پەنجاکانن:

(حەبیب عەبدولقادر حەمەیوسف) لەکۆتایی حەفتاکان دا لەتەوێڵە هاتووە بەرەو هەڵەبجەو سلێمانی و ئیتر دیار نەماوە.

(حەمەوەیس میرزا عەبدوالله ) لەساڵی(١٩٨١)دا سەربازی فیرار بووە، چووە ئێران و لەتاران دیار نەماو ونبوو.

**مەرگەساتەکانی تری شەڕی عێراق و ئێران:**

لەم شەڕەدا خەڵکێکی زۆرگیرا بەسەرباز، زور بەیان فیراریان کردو، بەلاَم هەندێك لەسەرەتای شەڕەکەوە چوون بۆ سەربازیو کوژران کەئەمانە بوون:

(نەجمەدین ئەبوبەکر حەسەن، هادی عەلی جەعفەر، یادگار حەمەعەلی مستەفا، عومەر مەحمود محەمەد، ئیدریس مەحمود، فەیزوالله فەتحوالله ، ئارام مستەفا قادر، حیکمەت محەمەد حەمەیوسف...)

بەهۆی تۆپبارانی شوێنە مەدەنیەکانیشەوە لەغەیری تەوێڵە ئەم تەوێڵەیی‌یە مەدەنیانە شەهید بوون:

نیهایەت کاکەبرا نادر لەهەڵەبجە، ئەفرۆز حەمەسەعید خێزانی ئەولە جەمیل لەهەڵەبجە، ظاهرمەلا فائق لەسلێمانی، ئافتاب مەهدی ئەحمەد لەسلێمانی، حامد سەعید سەلام لەسەرچنار.

لەهەمان شەڕدا ئەمانەش بەدیل گیراون:

ظاهر عەبدوالله حسێن، صەباح حەمەکەریم ئیمام، داود غەفور محەمەد، هادی حسێن عەبدولحامد، سەیفەدین صاحب نەزیر، ڕەئوف صدیق ئاغە جافر...ئەمانە لەدوای شەڕەکە ئازاد کران و گەڕانەوە.

ئەمانەش لەوشەڕەدا سەرباز بوون و ونبون(مەفقودن):

جەبار حسێن لاوە، مەهدی ئەحمەد ڕۆستەم، سەلام حەمەصاڵح عەبدوالله، ئیبراهیم صدیق ئاغەجافر، فوئاد کاکەعەلی کەرەم...

ئەو تەوێڵەیی‌یانەی کەچوونەتە ئێران:

ئەوانەی لەسەردەمی مەلیکی‌دا چوون: ئەو تەوێڵەیی‌یانەی کەلەپێش (١٤ی تەموزی ١٩٥٨)وە چوونەتە ئێران ئەمانەن: حاجی ئەولکەریم برای ئەوڕەحیم، عەلی‌وەستا حەمەئەمین–هەردوو لەپاوە دانیشتون.

حەمەیوسف موئمن لەگەڵ حەمەئەمینی کوڕی لەهەورامانی تەخت بوون، حاجی حەسەن قادر لەخانەگا بوو، مەحمود کوزاد لەسنەیە، حەمەشەریف خواجە حسێن لەمەریوانە... ئەمانە کەناومان بردن وەك تەوێڵەیی ناسراون هەرچەندە لەئەصڵدا هەندێکیان هەرخەڵکی ئەو شوێنەن، بەلاَم چونکە ماوەیەك لەتەوێڵە بوون بۆیە ناومان نووسین...

**ئەوانەی دوای نسکۆی ١٩٧٥:**

**ئەو خانەوادانی کەلەنسکۆی شۆڕشی ئەیلول دا چونە ئێران:**

(عەباس تۆفیق، ئەنوەرعەلی، عەلیعەباس، هەرسێکیان تاکۆتایی ژیانیان هەرلەوێ مانەوە، مناڵەکانی حاجی عەلی عەباس لەدوای ڕاپەڕین گەڕانەوە، عەلی قادرئاغا، عوسمان عەبدولڕەحمان، محەمەد ئەحمەد، عەبدولڕەحمان ئەحمەد...

ئەمانەش لەدوای یەك دووساڵ گەڕانەوە، عوسمان باسام لەساڵی(١٩٩٧)، گەڕایەوە. بەڵام زۆراب عەزیز بارام تائێستاش هەرلەوێیە.

– ئەوکەس و خانەوادانەی لەشەڕی عێراق و ئێران دا چوونەتە ئێران..

صەباح مەحمود، ناصر حەمەحەسەن، عەبدولکەریم مەجید، حەمەحسێن فائیق، عەبدولڕەحمان تەها، لوقمان حافظ، مەهدی ئەحمەد، سابق ئەحمەد، هادی کاکی.. تاد.

–ئەو تەوێڵەیی یانە لەڕاپەڕینی ساڵی (١٩٨٧)ی هەڵەبجەدا چوونەتە ئێران:

لەم ڕاپەڕینەدا نزیکەی (١٠هەزار) کەس لەجەماوەری هەڵەبجە لەناوچەی

کۆمەڵێ تەوێڵەیی - ئێران - تۆزدرگای سەریاس - ١٩٨٧

دڕۆڵەو هاوارو زەڵمەوە وەك پەناهندەیەك چوونە ناو دەوڵەتی ئێرانەوە لەناو ئەو جەماوەرەشدا چەند خانەوادەیەکی تەوێڵەیی ڕۆیشتن لەوانە: (مەلائەحمەد مەلاعەبدە، عەلی مەلائەحمەد، حامد عەبدولڕەحمان، عەبدولڕەزاق عەبدولڕەحمان، جەزا محەمەد، غەفار مەحمود، لەتیف محەمەد، محەمەد حەمەڕەشید، جەبار ئەمین، ستار مستەفا، تۆفیق خواکەرەم، بارام خواکەرەم، حەمەصادق حەمەحەسەن، ئەیوب حەمەحەسەن، حەسەن تۆفیق، جەلال فائق، مستەفا محەمەد، حەسەن عابد، فاضل عابد،...)

چەند ڕەبەن (مجرد)ێکیش چوونەتە ئێران وەك: (نهاد عوسمان، سەرتیپ خواکەرەم، عەباس حەمەخان..)

– بەهۆی نسکۆی(١٩٧٥)و ڕاپەڕینی (١٩٨٧)و کیمیاوی (١٩٨٨)و کۆڕەوی (١٩٩١)ەوە تەوێڵەیی یەکی زۆرچوونە ناوخاکی کۆماری ئیسلامی یەوە وەك پەناهندە، جالە تەوێڵەیی یانە نزیکەی (٧٠) تەوێڵەیی لەناوخاکی ئێران دا کۆچی دوایی یان کردوەو خاکی غەریبی بووەتە ماوای هەمیشەیی یان، بەتایبەت لەکیمیاوی یەکەدا زیاترلە (٥٠)کەس هەرلەوێ بەخاك سپێرراون و هەریەکەشیان لەشوێنێك.

**دیلەکانی شەڕی کوێت - عێراق:**

لەساڵی (١٩٩١) لەشەڕی کوەیت-عێراق دا چەند تەوێڵەییەك دیل کران لە سعودیە، لەوانە: صابرعوسمان کەریم- دوای چوار ساڵ لەسعودیە برا بۆ هۆڵەندا لەوێ لە(١٩٩٩/٣/٨) کۆچی دوایی کرد.

تەها محەمەد کەریم - دوای چوارساڵ لەسعودیەوە چوو بۆ ئەمریکاو ئێستا پەناهەندەیە لەوێ.

غاندی عابد حەبیب لەوشەڕەدا دیار نەماوە.

نزیکەی (٢٠) سەربازێکیش دیل کران، بەڵام لەدوای مانگێگ ئازاد کران و گەڕانەوە لەوانە:

عومەر حاجی ئامانە اللە ، فاروق حاجی ئەحمەد، بەختیار خالد، نهاد عوسمان، عومەر عەبدولڕەحیم ...تاد.

هەرلەو شەڕە، نزیکەی ٤هەزار سەرباز لەسەر سنوری خاکی (عێراق-ئێران)دا بوون و لەوکاتەدا چوونە ناوخاکی ئێرانەوە وەك پەناهەندەیەك، بەڵام لەوێ دیل کران، دوای هەشت ساڵ لە(١٩٩٩/١/١٧) ئازاد کران کەئەم دوو تەوێڵەییەش لەوانە بوون: (جەزا محەمەد حامد، مەهدەن حەمەعارف).

**سەردانی ناوداران بۆ تەوێڵە:**

تەوێڵە هەمیشە گرنگیەکی خۆی هەبووە لەزۆر ڕووەوە، خەڵك و پێگەی تەوێڵە جێگەی بایەخ دان بووە، بۆیە:لەزانستخواز و مێژوو نوس و فەرمانڕەواو سیاسەتمەداران، هەریەکە بەمەبەستێ سەردانیان کردووە، جالەو کەسانە:

- مەولانا خالیدی نەقشبەندی.. زاناو پێشەنگی ڕێبازی نەقشبەندی، چەندێ جار لەنێوان ساڵانی (١٧٩٤-١٧٩٨)ز.

- مێجەرسۆن- گەشتیارو ئەفسەرێکی بەریتانی بووە لەساڵی (١٩١٩-١٩٢١)یش حاکمی سیاسی سلێمانی بووە کەلەلایەن ئینگلیزەوە دانراوە، لەساڵی (١٩٠٩)دا گەشتی کردوە بۆ تەوێڵە.

- سی.جی-ئەدمۆنز.. سیاسەتمەدارو ڕۆژهەڵاتناسی بەریتانیو ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق بووە، لەساڵانی (١٩٣٥-١٩٤٥)، دووجار سەردانیکردووە لەساڵی(١٩١٩)،وە لەساڵی(١٩٤٣)، سەردانی تەوێڵەی کردووە.

- میر عەبدوالله خانی تەهماسب لەساڵی(١٩٢٦) دێتە تەوێڵە بۆ ماڵی قادربەگ.

- کابتان لیس--- لەسیەکاندا سەردانی تەوێڵەی کردووە.

- ڕەزمارا-ئەفسەرێکی ئێرانی بووە، سەر لەشکری کوردستان بووە دوایی بووە بەسەرۆك وەزیران لەساڵی (١٩٣٣) سەردانی تەوێڵەی کردووە.
- شاکر فەتاح...نوسەرو ڕۆژنامە نوس و ناوداری کورد لە(١٩٣٣) گەشتێکی تایبەتی کردوەو لەساڵی (١٩٤٠)یش بەدواشەوە چەند جار ڕۆیشتووە.
- تەهاهاشم... ڕەئیس ئەرکانی سوپای عێراق...(١٩٣٦)
- شێخ باباعەلی شێخ مەحمود... ناودارێکی سلێمانیو دوایش کرا بەوەزیری عێراق.
- خەیرواللە عەبدولکەریم-لێپرسراوێکی حیزبی هیوا بوو، بەنوێنەرایەتی ڕەفیق حیلمیو شێخ لەتیف نێرراوە.. یەکێکە لەچوار ئەفسەرە قارەمانەکانی کورد، کەلەسێدارە دران.. لەساڵی (١٩٤٣)سەردنی تەوێڵەی کردووە.
- سەعید قەزاز.. وەزیری ناوخۆ...سێجا (١٩٥٣، ١٩٥٥، ١٩٥٧)
- عومەر عەلی - موتەسەریفی سلێمانی بووە لەسالأنی (١٩٥٤-١٩٥٧) سێجار (١٩٥٥، ١٩٥٦، ١٩٥٧).
- عەبدولئیلا-وەصیمەلیك فەیصەڵی دووەم (١٩٥٦/٩/٢٦)
- سامی فەتاح...وەزیری ناوخۆی عێراق.. (١٩٥٧)
- فاضل جەمال.. سەرۆك وەزیران و سەرۆکی ئەنجومەنی عێراق.. (١٩٥٧)
- سەعدون حەمادی.. سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتیمانی ١٩٧٥
- تارق عەزیز.. وەزیری عێراق ١٩٧٥
- شکری الحدیثی... بەرپرسی فەیلەقی یەك ١٩٧٦
- ئیسماعیل تاهر النعیمی بەرپرسی فەیلەقی یەك /٤-١٩٧٧
- ئەرشەد ئەحمەد زێباری.. پارێزگاری سلێمانی (١٩٧٧)و(١٩٧٩)
- عەبدولڕەقیب یوسف.. شوێنەوار ناس و نوسەر ١٩٨٠

لەدوای ڕاپەرینی ساڵی (١٩٩١)یشدا... چەند لێپرسراوی حیزبیو حکومیو کەسایەتی سەردانیان کردووە لەوانە:
- مامۆستا مەلاعوسمان عەبدولعەزیز.. ڕابەری گشتی بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق.
- مامۆستا مەلاعەلی عەبدولعەزیز کاتێك کەجێگری ڕابەر بووە دواتریش کەڕابەری گشتی بزوتنەوەو یەکبوون بووە.

- کاك مەسعود بارزانی.. سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق
- مام جەلال تاڵەبانی.. سکرتێری گشتی یەکیەتی نیشتینانی کوردستانی عێراق
- کاك محەمەدی حاجی مەحمود.. سکرتێری حیزبی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان
- پرۆفیسۆر دکتۆر عەلی مەحیەدین قەرەداغی.. سەرۆکی یەکگرتووی ئیسلامی کورد
- حاکم قادر حەمەجان عەزیز-سەرۆکی شارەوانی وپارێزگاری سلێمانی لەسالآنی (٢٠٠٠، ٢٠٠٣).
- هەروەها لەدوای گەڕانەوەی دەسەلآتی حکومەتی هەرێم بۆ ناوچەکە، چەندەها کەسایەتیو دەسەلآتدارانی حکومەتی هەرێم سەردانی تەوێڵەیان کردووە وەك بەڕێزان:
- مام جەلال و د.بەرهەم، هەندێك لەئەندامانی پەرلەمانی کوردستان و چەندەها کەسایەتیو ناوداری تریش.

نائب ضابط
حامد سەعید عەبدورەحمان
ناسراو بەبابای حاجی سەعید

عەبدول حاجی ئەبوبەکر - سەرباز

# پەراوێزەکان

(١) سەیری ئەم سەرچاوانە بکە:
-شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی ل ١٩٨-٢٠٥
-مذاکرات مامون بەگ بن بیگە بەگ- محەمەد جەمیل ڕۆژ بەیانی-شکور مستەفا ص ١٧.
-مێژووی ئەردەلان-مەستورەی کوردستانی- د.حەسەن جاف و شکور مستەفا.. کرویانە بەکوردی. ل ٢٧-٥٠
-لەشەرەفنامەی ل ١٩٩دا هاتووە کە:
مەئمون بەگ لەساڵی(١٤٥٧-١٤٩٤و) حوکمی کردووە. مەئمونیش لە مذکرات ل ٥٨دا دەڵێ:
کاتێك کەبێگە بەگ و زۆراب(سوهراب)بەگ تێك دەچن و دەچن بەگژیەکدا، زۆراب بەگ لەقەڵای مێشلە(کەلە خوار تەوێڵەیە-نوسەر) خۆی دادەمەزرێنێ‌و لەئەنجامدا ناوچەکە توشی سوتان و وێران و کاولکاری دێت.
-خان ئەحمەد خان جگە لەشارەزوور دەسەڵاتی فراوان کردووە. لەمێژووی ئەردەلانی مەستورەخانم دا ل ٦١هاتووە کە: ..خان ئەحمەد خان کرماشان و هەورامان و گەرووس و ورمێ‌و سەنقەری گشت خستە سەر قەڵەمڕەوی وڵاتەکەی‌و، هەرچی ناوچەکانی دەوروبەریش بوون سەر لەبەری تاڵان کردن..)
(٢) ئێستاش شوێنەواری ماوەو هەربەتۆپخانە بەناوبانگە.
(٣) کردو ترك و عرب-ادموندز-ص(١٤٠) هەروەها جریدەی الاتحاد- ژمارە(٣٣٥)
(٤) بەپێی قسەی ڕیش سپیانی تەوێڵە وەك حاجی محەمەدی ڕەحمان، حاجی‌بابا، محەمەدی حاجی حەسەن، حاجی حەمەڕەق..تاد.
(٥) کێشەی کورد-ب(١)،ل (٤٧)لازاریف.
(٦) سەیری بنەماڵەی شێخ عوسمان سراجەدین بکە لەم پەڕاوەدا.
بۆ ژیان و بەسەرهاتی عەبدوالله ئاغاو قادر ئاغای کوڕی‌و هەروەها ئەو ڕووداو بەسەرهاتە سودم وەرگرتووە لەم بەڕێزانە: م.عەلی قادرئاغا، محەمەد سان ئەحمەد، حاجی محەمەد ڕەحمان، وەستا محەمەد حەمەصاڵح، حاجی حەمەمراد، وەستاصادق غەندی، عەبدولخالق حاجی عەبدولوەهاب)
(٧) کورتەیەك لەژیانی مامۆستا(عەلی قادرئاغا): قادرئاغا لەدوای خۆی شەش کچ و یەك کوڕی بەجێ‌ماون کچەکانی (ڕەعناو حەبسەو ماتاب و خونچەو ئایشەو ئەدیبە)بوون، کوڕەکەیشی کەهاوناوی ئەوعەلی‌یەیە کەلە بانی واتواتا کوژراوە.

ماموستا عەلی، لەساڵی(١٩٣١ن) لە تەوێڵە لەدایك بووەو، قوتابخانەی سەرەتاییشی هەرلەوێ تەواو کردووە، خانەی ماموستایانیشی لەسلێمانی ودهۆك و بەعقوبە تەواو کردوە، لەساڵی (١٩٥٢) لەسەر گەڵو بۆ یەکەمجار تەعین دەبیٚو دەبێتە ماموستای ئەوگوندە. پاش ساڵێك خۆی نقلی تەوێڵە کردووە، تاوەکو ساڵی(١٩٥٧)نقلٚ کراوە بۆ ئاوەکورتیٚ، دوای ساڵێك دیسان دەچێتەوە تەوێڵە. لەساڵی(١٩٥٩) گوازاروەتەوە بۆ سلێمانی، ساڵی(١٩٦١) دیسان چووەتەوە تەوێڵە.

کەشۆڕشی ئەیلول دەست پیٚدەکات و دام و دەزگای میری لەتەوێڵە نامێنیٚ، ئەویش وەك ماموستایەك لەساڵی (١٩٦٢) دێتە هەڵەبجە، بەلاٚم لەساڵی (١٩٦٣) کەزەعیم صدیق دێتە هەڵەبجە، ماموستا لەگەڵ چەند کەسێکیتردا دەگیرێت لەسەر ئەوەی دژ بەبارزانیو پارتی قسەی خراپ ناکەن و جنێو نادەن.

پاش ئەم گرتنە نقلٚ دەکرێتە دوکان. لەساڵی (١٩٦٣) کەلەعێراق کۆدێتا دەبێت، ئەمری گرتنی ئەمیش دەردەچێت، بۆیە دەچێتە کەڵکەسماق و پەیوەندی دەکات بەبنکەی حیزبی شیوعی ئەویٚوە، لەوکاتەدا ئەمری فەصلٚ کردنی دەردەچێت. هەرلەو ساڵەدا دەگەڕێتەوە تەوێڵەو، لەساڵی (١٩٦٤) یەکەم قوتابخانەی ئازادی کراوەتەوە لەناو شۆڕش دا ئەم بوو بەبەڕێوەبەری.

ماموستا عەلی یەکێك بووە لەشیوعییە کۆنەکانی تەوێڵەو، بەڵکو لەساڵی(١٩٦٥)یش سەرۆکی لیژنەی تەوێڵە بووەو ئەو هەموو گرتن و نقلٚ و فەصلٚ کردنەی لەسەر ئەوەبووە.

لەکۆتایی ساڵی(١٩٦٥) لەسەر جیاوازی فکری شیوعی، وازی لەشیوعیەت هێناوەو پەیوەندی کردوە بە پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، لەوکاتەوە تائێستا هەرلەگەڵ پارتیدایە.

لەساڵی(١٩٧٠) تەعین بووەتەوەو ماڵیان دێتە خورماڵ، لەوکاتە هەم یاریدەدەری بەڕێوەبەر بووە لەقوتابخانە ، هەم لیٚپرسراوی ڕێکخراوی پارتی خورماڵ بووە.

لەساڵی(١٩٧٥) ماڵی چووەتە ئێران و لەمانگی (١٩٧٦/١٠)گەڕاوەتەوە عێراق و لەسلێمانی دانیشتووەو چووەتەوە سەرکاری ماموستاییەکەی خۆی،

تالەساڵی(١٩٨٣) خۆی خانەنشین کردووە،و ئێستاش لەسلێمانی بۆخۆی دانیشتووە، خاوەنی ماڵ و مناڵی خۆیەتیو حەزدەکات خزمەت بکات بەگەل و نیشتیمان و هاولاٚتیانی خۆی و کەسایەتییەکی ناوداری تەوێڵەیە.

(٨) مێژووی هەورامان –محەمەد ئەمین هەورامانی– ل (٩٢٠).

(٩) ئەم ڕووداوە زوربەی ڕیش سپیانی تەوێڵە دەیگێڕنەوە، بەلاٚم ئێمە زیاتر سودمان لەم بەڕێزانە وەرگرتووە: حاجی محەمەدی ڕەحمان و ماموستا عەلی قاراغەو

---

وەستامحەمەدی حاجی حەمەصاڵح و هادی حاجی ئایزەو حاجی بابا. بۆ ناوەکان و ساڵەکە:

مامۆستا عەلی لەدەفتەری یادەوەریەکانی خۆی نوسیبونی هەروەها حاجی محەمەدیش هەندێ ناوی دەزانیو لەبیری مابوون و وەدەڵێ: باش بیرم دێ کەوەختێ مەیتەکانیان هێنانەوە تەوێڵە، هەموو تەوێڵە بوویە شیوەن و گریان و نزیکەی مانگێ کەس ئیش و کاری نەدەکرد. وەدەڵێ: عەبدوالله ئاغا بەیانییەکەی لەگوزیندارو کەمەرسپیێوە گەڕایەوە تەوێڵە.

[10] مێژووی هەورامان –ل (١٤١)

[11] سودمان وەرگرتووە لە مێژووی هەورامان، لەگەڵ ئەوەشدا چەند تێبینیەکمان هەیە لەسەر ئەم مێژووە لەم باسی قادربەگەدا:–

–لە ل(٢٥٧)دا نوسراوە کەقادربەگ لەساڵی(١٣١١ك)لە دایك بووە، ئەمە هەڵەیە لەساڵی(١٣٠٦ك)لەدیك بووە کەبەرامبەرە بە (١٨٨٨ز).

– لە ل(٢٥٨)دا نوسراوە کەلەساڵانی (١٣٢٦)ك قادربەگ ئازاد کرا. ئەمەش هەڵەیەکی زەقە ئەگەروابێ لە (١٣١١) لەدایك ببێو لە(١٣٢٦) لەزیندان ئازاد ببێ واتە لە ١٥ساڵیدا هاتە تەوێڵە و حوکمی کردو(١٠)ساڵ زیندان مایەوەو ئازاد کرا، نەخێر ئەمە دەبێت ساڵی کۆچی هەتاوی بێت واتە(١٣٢٦+٤١) = ١٣٦٧کۆچی مانگی کەدەکاتە ساڵی(١٩٤٧ز).

–کەکەریم بەگ چووە بۆلای وەصی ساڵی(١٩٤١ز) بووە دوای ئەوەبە (٦)ساڵ ئینجا قادربەگ بەربووە.

–ل(٢٥٨)نوسراوە ئەوخانو کۆشکەی لەساڵی(١٢٤٠)کۆچی تەواو بووە، ئەمەش هەڵەیەکی تری گەورەیە، چونکە لەوساڵە هێشتا قادربەگ لەدایك نەبووە ڕاستیەکەی ساڵی(١٣٤٠ك)یەکە دەکاتە ساڵی(١٩٢١ز).

لە ل (٢٥٩)نوسراوە(١٩٢٦) لافاوێکی گەورە لەتەوێڵە بووە زیانی زۆری داوە لەباخ و باخات، ئەمەش لەوانەیە هەر لافاوەکەی ساڵی(١٩٣٦ز)بێت کەزیانێکی زۆری داوە لەقەیسەریو قوتابخانەکەی تەوێڵە کەبیناکەی هی قادربەگ بووە.

–لە ل (٢٥٩)دا نوسراوە قادربەگ لەساڵی (١٣٥٧) ڕۆژی مردووە. لەتەمەنی ٩٢ساڵیدا ئەمەش هەڵەیە، چونکە ئەو ساڵە یەکەم ساڵ بووە لەزینداندا بەرامبەرە بەساڵی (١٩٣٨ز) بەڵکو لەساڵی ١٣٥٧+٤١ = ١٣٩٨ك مانگی مردووە کەبەرامبەرە بە ١٩٧٨زاینی. ئەوکاتە بەساڵی کۆچی دەکات(٩٢)ساڵ بەم شێوە ١٣٩٨–١٣٠٦=٩٢ساڵی کۆچی، بەساڵی زاینیش دەکاتە ٩٠ ساڵ بەم شێوە ١٩٧٨–١٨٨٨=٩٠ ساڵی زاینی.

–قسەشمان لەسەر تەفسیرەکەی هەیە کەلەلاپەڕەی (٢٦٠)دا نوسراوە.

[١٢] بۆئەم باسەسودم وەرگرتووە لەنوسراوێکی گۆڤاری ڕۆشنبیری نویٚ ژ-١٤٥ساڵی ٢٠٠٠ل ١٧-٢٤ کەلەلایەن لیوا ڕوکن محەمەد شێخ نەجمەدین نەقشبەندی‌یەوە نوسراوە.

[١٣] بێگومان ئێمە لێرەدا، زیاتر ڕۆڵی شێخان و جەماوەری هەورامان دەخەینە ڕوو، چونکە مەبەستی باسەکەمانە، ئەگین عەشیرەتەکانی تری کورد، زۆری بەشدار بوون لەم شەڕەدا وەك عەشیرەتەکانی:

(پیران، مامەش، مەنگور، موکری، سیوسنی، گەوڕك، زەزرا، هەرکی، شکاك...) هەروەها پیاوە ناودارەکانی تری کورد وەکوو: شێخ مەحمودو خاڵۆ قوربانی‌و شێخ جەلال حسێنی نەقشبەندی، قاضی فەتاح- مامی باوکی قازی محەمەد بووە کەلەو شەڕەدا شەهید کراوە-، شێخ یوسف شەمسەدین بورهانی، شێخ باباحەکیم سەیدی زەنبیل، مەلامحەمەد سەعید صەدرلعولەمای موکری..).

سەیری ڕۆژنامەی یەکگرتوو ژ١٤٧، بەرواری ١٩٩٧/٧/٢٥بەشی عەرەبی‌یەکەی.

[١٤] تەئریخی جاف- کەریم بەگی فەتاح بەگ-بەغداد-١٩٩٥-ل ٨٦دەڵێ:

بەڕێز شێخ عوسمانی شێخ عەلائەدین نەقشبەندی بۆمی گێراوە کەخۆی لاوبووە لەم شەڕەدا بەشداری کردووە، زوربەی عەشایری کورد ئازایانە شان بەشانی تورکەکان دژی ڕووسەکان شەڕیان کردووە.

[١٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٦] سەفەر بەلك.. یاسەمەر بەرلەك یاخود سەفەر بەکلەك، زاراوەیەکی تورکی‌یە بەمانای (نەفیرعام) هاتووە بەڵام لای کورد دەلالەت لەسەر سەفەرێکی شوم دەکات و گەڕانەوە لەوسەفەرەدا کەمە، چونکە لەوشەڕەدا هەرکەس چوبێت بەزۆری کوژراوەو نەگەڕاوەتەوە.

[١٧] ڕۆژنامەی کوردستانی نویٚ ژ (٢٣٢٦) بەرواری(٢٠٠١/٢/١١).

[١٨] بۆئەم ناوانە سودم لەدەروێش لەتیف وەستا محەمەدو حاجی محەمەدی ڕەحمان وەرگرتووە.

حاجی محەمەد دەڵێ:

بەئەمری شێخ حیسامەدین لەبازاڕی تەوێڵەدا جاڕدرا کەخەڵکی خۆی ئامادە بکات بۆ غەزای ڕوس. تەوێڵەیی زۆر ئامادە بوون لەوانە کەدەوریان بوو:

مەلا عیصام و مەلا حەبیبەاللە، وەستا حەمەڕەحیم، غەفورە زلە، حامدی خەسرەو، سەعەی فەتاح ناسراو بەسەعەی خونچێ، کەسەعە لەوشەڕەدا گەیشتە ئەستامبوڵ و دوایی هاتەوە تەوێڵە.

[١٩] کردستان فی‌سنوات الحرب العالمیه‌الاولی بغداد-١٩٨٤. هەروەها گۆڤاری ڕۆشنبیری نویٚ ژ(١٤٥) ساڵی ٢٠٠٠ل(١٩).
ڕۆژنامەی یەکگرتوو- عەرەبی‌یەکەی ژ (١٤٧)، ١٩٩٧/٧/٢٥
[٢٠] ڕۆشنبیری نویٚ ژ (١٤٥)ساڵی (٢٠٠٠)ل (١٩).
[٢١] ڕۆژنامەی کوردستانی نویٚ ژ ٢٤٢٠ بەرواری ٢٠٠١/٤/٧ نوسینێکی صەلاح نەقشبەندی... من خۆم (عەبدولرزاق) لەشەوی ٢٣-٢٠٠٢/١/٢٤ مقابەلەیەکی شێخ مەحمودم کرد وتی: ئەو مامۆستا جەمال و کەمالە لەتەوێڵە مامۆستا بوون نەك لە هەڵەبجە وەك کوردستانی نویٚ وایان نوسیووە.
[٢٢] لاپەڕەیەك لە مێژووی هەڵەبجە (١٧٠٠-١٩٥٨ز) بەکر حەمە صدیق ل ٧٤. هەروەها ناوی ١٣کەسی نوسیوە کەبەشدار بوون لەو شەڕەدا کەخەڵکی هەڵەبجە بوون.
[٢٣] بۆئەم باسە سودم وەرگرتووە لەم بەڕێزانە:
محەمەد سان ئەحمەد، مامۆستا مەحمود، مامۆستا مەحیەدین، م. عەلی قادرئاغا، مەلا حەمەئەمین مەلا عەبدوالله، مەلا عەبدولکەریم مەلا ئەحمەدی قازی، تالب حەبیب..)
[٢٤] ٢٤-حامد بەگ کیٚیە؟
کوڕی مەجید بەگی عوسمان پاشای محەمەدپاشای جافە.
عوسمان پاشا پێنج کوڕی بووە: حەمەسەعیدو مەجید لەیەکەم ژنی عوسمان پاشان، تاهرو عیزەت و ئەحمەد موختار لەعادلە خانمن کەژنی دووەمی بووە.
حەمەسەعید باوکی داود بەگی عەبابەیلیٚیە، مەجیدیش باوکی حامد بەگە. حامدبەگ لەسالآنی (١٩٢٤-١٩٣٢) قائیمقامی هەڵەبجە بووە.
.. دۆستایەتی وخزمایەتی وەسمان پاشاو بەگزادەکانی هەورامان زۆر باش بووە، چونکە یەکەم ژنی وەسمان پاشا، کەدایکی مەجید بەگ و حەمەسەعید بەگ بووە خوشکی(جافرسان) بووە، واتە جافرسان خاڵیانە کەواتە قادربەگ و حامدبەگ خاڵۆزاو پورزا زابوون.
سەیری (هەڵەبجە لەکلاٚو ڕۆژنەی مێژووە-عەبدوالله قەرەداغی)بکە، ل ٢٥، ٣١ هەروەها کردو ترك و عرب- ص ١٣٣
[٢٥] لەبەڕێز مەلامارفی مەلا عەبدوالله ی مەریوانیم بیستووە.
[٢٦] گولاٚن ژ (٢٦٤)، (٢٠٠٢/١/١٠)
[٢٧] بەپیٚ قسەی بەڕێزان (محەمەدی سان ئەحمەد، م. مەحیەدین حاجی سەلیم، م. عەلی قادرئاغا، م. شێخ صەفائەدین..)
[٢٨] جولاٚنەوەی ڕزگاری نیشتیمانی کوردستان -ل (١٨٩-٢٠٢) د. عەزیز شەمزینی. سەیری بکە بەکورتە لەسەردابەش بونەکە ئاماژەی پیٚدەکات.

[٢٩] مامۆستا مەحیەدین لەدایك بووی (١٩٣٤)و لەنیوەی پەنجاکاندا پەیوەندی کردوە بەحیزبی شیوعیەوە، یەکێك بووە لەو شیوعیانەی کەزیرەکانە کاری کردوەو توانیویەتی خەڵکێکی زۆر بهێنێتە ناو شیوعیەوە، وەتا کۆچی دوایی کرد لەسلێمانی لە(٢٠٠١/١١/٥) بەفکرەو بەتەنزیم کاری کردوە بۆ شیوعی... لەڕۆژی (٢٠٠٠/٩/١٠) وتی: زیاتر لە (٤٠) ساڵە شیوعیم.

-ئێستاش هەرلەگەڵیاندام.

-زوربەی هاوڕێکانم بەتەنزیم وازیان هێناوە لەشیوعی بەڵام کەمێکیان بەفکرە هەر شیوعین.

لێمان پرسی گرنگترین وەسیلە بۆ کەسپ کردنی خەڵکی بەلاتەوە چیبوە؟ وتی:

-بەمامەڵەی جوان و بواری کۆمەلایەتی و سۆزو عاتفەی خەڵکم ڕاکێشاوە.. ئەوانەشیان بۆ ڕێکخستن باش بووبن بەفکرە کارم لەسەر کردون بەتایبەت گەنج و قوتابی.

-مامۆستا بۆئەم کتێبە زۆر پەیوەندیمان پێوە کردوەو هاوکاری زۆری کردوین و یەکێك بووە لەوانەی کەزۆر هاندەرمان بووە.

[٣٠] گەنجان- وەکو لاوانی پارتی وابوو کەهەموو گەنج بوون، ئەم بارەگایە لەخانویەکی حاجی تۆفیق دا بوون کەلەم دوایی‌یە حاجی حەمەئەمین حاجی حەمەڕەشید کڕی‌و کردی بەدوکان و خانوو.. پشتی گەنجان باخچەیەك بوو لەداری هەڵوژەو قەیسی‌و قۆخ پێکهاتبوو کەلەپشتی حەوزەوە جۆگەیەك ئاوی بۆ هاتبوو.

[٣١] کورتەیەك لەسەر بەرگری مللی:

مەبەست لەپێکهێنانی بەرگری مللی چەکدارکردنی گەل و مەشق پێکردنی بوو بۆ بەرگری لەکۆمار شان بەشانی سوپا دژی مەترسی دەرەوە، کەچی ئەو بوویە دەوڵەتێك لەنێودەوڵەتدا، لەوە دەرچوو کەبۆی دانرابوو.. ئەومافەی دابوو بەخۆی کەبەبێ قانون دەسەڵاتی دەزگاکانی دەوڵەت بەکاربێنێ، جاچونکە لەداهاتنی بەرگری میللی‌دا حیزبی شیوعی دەوری هەرەگەورەی هەبوو، تەواوی ئەو دەست درێژییانە بەسەر ئەودا شکایەوە.

بەرگری میللی بەپێی فەرمانی سوپایی ژ(٩٨٩) ڕۆژی (٢٢)ی تەموزی (١٩٥٨)دامەزرا، عەقید تەها بامەڕنی کرابە فەرماندە و بەسەر سێ سەرکردایەتی‌دا دابەش کرا، باکور و نێوەڕاست و باشور، دەوری بەرگری لەهەموو ناوچەکان زیادی کردو دەست درێژی‌و سەرەڕۆیی بۆسەر هاونیشتیمانان گەیشتە ڕادەیەك کەبیری لێنەکرابووەوەو، بەتایبەتی پاش تێکشکانی بزوتنەوەی شەواف لەموصڵ و ڕوداوەکانی کەرکوك، وای لێهات عەبدولکەریم قاسم ناچاربوو فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی دەرکرد. پاش ڕووداوە ناخۆشەکانی کەرکوك لەتەموزی (١٩٥٩) لە

کوردستانیشدا کردەوەکانی بەرگری میللی کاریگەریەکی بەهێزبوو لەهەڵگیرساندنی ناکۆکی نێوان حیزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان دا. هێزی بەرگری لەژێر دەسەلاّتی شیوعیدا بوو، سەرەڕای دەست درێژیەکانی ویستی زاڵ بوونی خۆی بەسەر حیزبەکاندا بسەپێنێ‌و، دانیان پێ‌بنێ کەحیزبی شیوعی دەوری سەرکردایەتی هەیە.

ئەمە گەلێك گیرو گرفتی هێنایە پێش لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستاندا زۆرجار دەمەقاڵێ نێوان کادێرەکانی ئەم دووحیزبە دەگەیشتە لێکدان کەزەلامەکانی بەرگری میللی دەهاتن و لەسەر شیوعیەکانیان دەکردەوە. ئەوەی زیاتر پەیوەندی نێوانیانی تێك دەدا، دەستێوەردانی حیزبی شیوعی‌بوو لەکاروباری نێوخۆی پارتی، لەوکاتەدا، ناکۆکی کەوتە نێوان ئەو دوو لایەنەی پێیان دەڵێن لایەنەکانی هەمزە عەبدوالله و برایم ئەحمەد.

بارزانی‌و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد- (١٩٥٨-١٩٦١)ل (٦٨، ٧٢) مەسعود بارزانی

[٣٢] بەسەرهاتی سیاسی کورد-بەرگی یەکەم-میرزا محەمەدئەمین مەنگوری ل ١٧-١٨.

[٣٣] بیرەوەری ٢١ساڵی تێکۆشان- نایب عەبدوالله ل (٢٠٠-٢٠١)

[٣٤] هەمان سەرچاوە ل (١١٦)

[٣٥] ٣٥-هەمان سەرچاوە ل (١١١، ١٢٩، ١٨١، ١٨٦، ٢٠٠، ٢٠٥)

[٣٦] هەمان سەرچاوە ل (١٨١-١٨٣)

[٣٧] هاوڕێ عارف- وەستاعارفی کەریمی ڕەفلەیەکە لەزووەوە ماڵی هاتبوو بۆ هەڵەبجە، ئاسنگەر بوو.. بۆیە ڕۆیشتووە لەگەڵی‌دا، جگە لەوەی ئەویش هاوڕێبازی نایب عەبدوالله بووە چونکە خەڵکی ناوچەکە بووەو شارەزای ڕێگەکە بووە بەڕێگایەکی قاچاخ دا ڕۆیشتوون.

[٣٨] وەك ئەوەی کە نایب عەبدوالله دەڵێت پێشتر ئاماژەمان پێ‌داوە، شیوعیەکانی تەوێڵە، هەرهەمان قسەدەکەن کەگرنگی‌یەکی زۆر دراوە بەتەوێڵە، لەلایەن حیزبی شیوعی‌یەوە.

[٣٩] سەیری ژمارەی دانیشتوانی بکە کەلەپێشەوە باسمان کردوە.

[٤٠] پێشتر باسی سان ئەحمەدو قادرئاغامان کردووە.

[٤١] جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتیمانی کوردستان ل(١٨٩-٢٠٢) د. عەزیز شەمزینی.

[٤٢] بارزانی‌و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد (١٩٣١-١٩٥٨) ل ١٥٩... مەسعود بارزانی

لەسەرتاوە ناوی (پارتی دیموکراتی کورد)بوو دوای ١٤ی تەموز بوو بەپارتی دیموکراتی کوردستان

[٤٣] بارزانیو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد(١٩٥٨-١٩٦١) ل ٦٦.. مەسعود بارزانی

[٤٤] هەمان سەرچاوە ل (٦٦-٧٥) سەیر بکە هەندێ لەخاڵەکانی باس دەکات.
[٤٥] هەمان سەرچاوە ل (٦٣)
[٤٦] لەکوردستانی نوێ ژ ٢٤٥٥، ٢٠٠١/٥/١٧ دا هاتووە کە:
ماموٚستا شێخ محەمەد ئەمین عەبابەیلێی لەمانگی ١٩٦٢/٧دا بۆیەکەم جار لەشاخی شنرویێ لەسەر کانی وەزگێلێ یەکەم مەفرەزەی سەرەتایی دروست کرد.
کاك حەمەی فەرەج هەڵەبجەیی لەکتێبی(لەشنرویێوە بۆ ستۆکهۆڵم)دا ل ٥٣دا دەڵێ:
بۆ مێژوو دەیڵێم لەناوچەی ئێمەدا، هەوێنی دروست کردنی مەفرەزەی سەرەتایی پێشمەرگەی کوردستان دروست بوو، لەم مەفرەزەوە ناوی پێشمەرگە کەوتە سەرزاری خەڵکی و جەماوەر... بوونە پێشەنگی کاروانی خەبات و نەبەزین، هەروەها کاك محەمەدی حاجی مەحمود لەڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك دا ل ٢٩دا دەڵێ:
تەنیا مەفرەزەیەکی پارتیزانی چەکداری لەسەرانسەری کوردستان دا لەوکاتەدا ئێمە بووین کەدەست پێکی شۆڕشی تازەو مەشخەڵی داگیرساوی دژبە تاریکستانی زۆرداری ڕژێم بووین. کاك شەوکەتی حاجی موشیر لە(کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە) ل ٧٣دا دەڵێ:
لەشەوی ٢٦-١٩٧٦/٦/٢٧دا بوو یەکەم مەفرەزەی چەکداری لەگوندی تەپیصەفا کۆبوونەوەو ڕێگەی شاخیان گرتەبەرو پێشمەرگە دروست بونەوەو یەکەم تەقەش لەشۆڕشی نوێدا لەپردی زەڵم بوو بەرامبەر بەدوژمن کرا. هەروەها لەگوڵان ژ (٤١٩)، بەرواری (٣٠/١/ ٢٠٠٣) باس لەشۆڕشی گوڵان و هەڵگیرسانەوەی دەکات کەچۆن کاك نادر هەورامی دێتەوە بۆ هەورامان و شۆڕشی نوێ دەست پێ دەکەنەوە.
[٤٧] لەشنرویێوە بۆ ستۆکهۆڵم- ل ٣٦ حەمەی فەرەج
[٤٨] لەشنرویێوە بۆ ستۆکهۆڵم- ل ٦١-٦٣
[٤٩] خاڵەبلە: ئیبراهیم فەتاح قەرەداغی بووە.
[٥٠] زەلەکێ: لەنزیك گوندی عەبابەیلێیە لەدامێنی شنرویێدا ئەوکاتە دووسێ ماڵ و چایخانەیەك بووە.
[٥١] وەزەنێ: لەنێوان دەگاشێخان و بەڵخەدایە.
[٥٢] مەبەست لە (حلمیعەلی شەریف)ە، وادیارە لەلایەن پارتییەوە ئەو بەسەرپەرشتی کەریان دانراوە ئەوکاتە ئەندامی ل. م پارتی بوو.
[٥٣] پۆلیسەکە ناوی مەلاقادر دەبێت.
[٥٤] مەبەست لەتاهری حەبیبەیە.

[٥٥] لەشنرویێوە بۆستۆکهۆڵم ل- ٦١هەروەها کوردستانی نویێ ژ ٢٤٥٥ ،٢٠٠١/٥/١٧.
[٥٦] هەمان سەرچاوە ل ٦٨
[٥٧] هەمان سەرچاوە ل ٧٠
[٥٨] بەدالەی تەوێڵە ئەوکاتە لەخانوەکەی حاجی عەلی کوێخا عەبدوالله دابووە لەپشتی حەوز، تۆفیقی هەڵەبجەیی مەئموربەداله بوو.
[٥٩] لەشنرویێوە بۆ ستۆکهۆڵم ل (٧٠-٧٢)
[٦٠] لەشنرویێوە بۆ ستۆکهۆڵم ل ٧٢ بۆ بەرواری گرتنی مەخفەرەکە لەئیدریسی حاجی عەبدوالله حاجی باباو چەند کەسێکی ترم بیستووە، بەڵام مام هادی حاجی ئایزە دەڵیێ لە ٩/١٣/گیراوە.
[٦١] بەڕێز دکتۆرفائق محەمەد گوڵپی لەکوردستانی نویێ ژ ٢١٨٤بەرواری ٢٠٠٠/٦/٢٨ نوسینێکی بلاو کردوەتەوە بەناوی (ڕاست کردنەوەی چەند هەڵەیەکی مێژوویی) تێبینی لەسەر گرتنی مەخفەری سۆسەکان و بیارە هەیە دەڵیێ:
(کاك حەمە گوڵپیو کاك کەریم هاواری پێش ئەوەی کاکەحەمەی فەرەج و ئەوان، بچن بەماوەیەك لەمەخفەرەکەی سۆسەکان دەرچوو بوون و پەیوەندیان بەهێزی پێشمەرگەوە کردبوو، تەنانەت لەسەربانی مەخفەرەکەوە بەحەبل خۆیان شۆڕ کردبووەوە، ئەوەش بوو بووە هۆی ئەوەی کەپێستی دەستیان لیێ بێتەوەو پاش مانگێك چاك بوونەوە، ئەوکاتەی هەولی گرتنی مەخفەری سۆسەکان درا ئەوان پێشمەرگە بوون و بەشداریان لەگرتنی مەخفەرەکە کرد، تەنانەت خەڵکی تاوێرە بۆیان باسکردم کەچۆن شەهید حەمەگوڵپی باوکم، دوای ئەو چوار پۆلیسە کەوتووەو بەلەهجەی هەورامی لەگەڵ پێشمەرگەکانی تردا هاواری کردووە (پیلارە) واتە بۆئەملا برۆن..)
[٦٢] ئەوچوار پۆلیسە: یەکێکیان نالەی خاڵخاس تەوێڵەیی بووە، یەکێکی تریان ئەڵماس هاواری، یەکێکی تریان عەبدوالله تاوێرەیی بووە (برای شێخ سمایل)، چوارەمیان ناوەکەمان نەزانی کیێبووە!
[٦٣] لەشنرویێوە بۆ ستۆکهۆڵم- ل ٧٣-٧٤-٧٥)
[٦٤] لەشنرویێوە بۆ ستۆکهۆڵم ل ٧٦
[٦٥] کوردستانی نویێ ژ (٢٢١٠ ، ٢٠٠٠/٧/٢٩)
[٦٦] لەشنرویێوە بۆ ستۆکهۆڵم ل (٧٧)
[٦٧] خواروکوردستان و شۆڕشی ئەیلول، بنیاتنان و هەڵتەکاندن (١٩٦١-١٩٧٥)چاپی سێهەم- ئیبراهیم جەلال- ١٩٩٩-ل٨٨.

[٦٨] بۆ ئەم باسە سودم وەرگرتووە لەکتێبەکەی کاك حەمەی فەرەج لە(شنرویۆوە بۆستۆکهۆڵم) ل (٩٢-١٠٤) هەروەها نوسینێکی دکتۆر فائق گوڵپی لەکوردستانی نوێ ژ ٢١٨٤، ٢٠٠٠/٦/٢٨ وەچەند پیاو ماقوڵێکی خەڵکی تەوێڵە وەك:
ڕەحمان الله وەیس، هادی حاجی ئایزە، حاجی باباو حاجی حەمەمراد، حاجی الله کەرەم حاجی تۆفیق، حاجی الله کەرەم دەڵێ: من پێش ئەم شەڕە چوم بۆ قەرەداغ بۆ شەڕ، بۆیە لەشەڕی دەربەندیخان بەشداریم نەکرد، بەلاَم حاجی عەلیهەباس بەتفەنگەکەی من چوبۆ شەڕی دەربەندیخان.
[٦٩] بەسەرهاتی سیاسی کورد- بەرگی یەکەم- میرزا محەمەد ئەمین مەنگوری ل (٥٠، ٦١)
[٧٠] هەمان سەرچاوەل ١٣٤
[٧١] بەسەرهاتی سیاسی کورد بەرگی یەکەم-میرزا محەمەد ئەمین مەنگوری ل ١٣٤ ، دەڵێ: حاجی الله کەرەم کلاَشی لەپێ دەبێ، کلاَشەکان لەزەلکاوەکان دەچەقن و دەگیرێنە قوڕ و زەلکاوەکە، مستەفای حاجی قادر مشکیەکەی سەری ئەبەستێ بەقاچییەوە لەباتی پێلاَو بۆئەوەی پێخاوس نەبێت و زیخ و بەرد نەدات لەقاچی، تابتوانێ بڕوات بەڕێوە.
[٧٢] کاك محەمەدی حاجی مەحمود لەڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك دا بەرگی یەکەم ل (٣٥٤)دا ئاماژە بەمە دەکات.
[٧٣] خۆم (عەبدولڕەزاق- نوسەر) لەو کۆبەنەوەیەدا بووم.
[٧٤] بۆئەم بابەتە زیاتر سودم لەبەڕێزان (م. مەحیەدین و کاك محەمەدی سان ئەحمەد)وەرگرتووە.

[٧٥] بۆیە وشەی ئاوارە بەکارهاتووە، چونکە زێدەی مرۆڤ خۆشەویستە، کۆمەڵێك یادگاریو یادەوەری تیایە بۆمرۆڤ، ئەگینا خاکی کوردستان هەموونیشتیمانە بۆ تەوێڵەیی.
[٧٦] لەگەڵ دەست خۆشییەکی زۆرم بۆ کاك هەورامان عەلی تۆفیق کەماندوو بووەو ئەرکێکی زۆری کێشاوە، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا لەو ناوانەی تەوێڵەدا ئەوەی من زانیبێتم کەمێك هەڵەیە لەژمارەو ناوەکاندا(٣٠) کەس بەهەڵە نوسراوە، یا نەمردووە یادووبارەیە، وەنزیکەی (٢٠) ناویش نوسراوە کەناناسرێن.

# تەوێڵە لەبواری تەندروستیدا

پێشەکی:

جەرڕاح و حەکیمەکانی تەوێڵە

مامانەکانی تەوێڵە

بنکەی تەندروستی تەوێڵە

کورتەیەك لە ژیانی سەید عوسمان

خەستەخانەی تەوێڵە لە سەردەمی شۆڕش دا

دوکتۆرە تەوێڵەیییەکان

هەڵوێستێکی جوامێرانە

پەراوێزەکان

# تەوێڵە لە بواری تەندروستیدا[1]

**پێشەکی:**

بە شێوەیەکی گشتی چەند هۆکارێك کاریگەریان هەیە لەسەر ئەم بوارە.

ئاو و هەوای ناوچە و پیشە و جۆری ئیش و جۆری خواردن و خۆراك و ئاستی ڕۆشنبیری و خوێندەواری، بەڵکو بواری ڕۆحیش لەسەر نەخۆشی یە دەرونی یەکان کاریگەری هەیە.

ئەمانە هەموو تایبەتمەندیەك دەدەن بەم بوارە. بۆ نمونە:

تەوێڵەیی یەك لە ژێر سێبەری فێنکی درەختەکانی ئاوێسەر و گەریات، هاوین بەسەر بەرێ، نەخۆشی یەکانی جیاوازی هەیە. -بەڵکو لەوانەیە بە هۆی ئاو و هەوای هاوینەوە نەخۆش نەکەوێ-لەگەڵ ئاو و هەوا و گڕە و هالاوی گەرمیان و شارەزوور جیاوازە.

تەوێڵەیی یەك هەمیشە پیشەکەی کرێکاری و باخەوانی و ئاسنگەری و دارتاشی و ...تاد، جیاوازی هەیە لەگەڵ کەسێکدا کە لە شاردا کەمتر دەجوڵێ و وەرزش ناکات.

تەوێڵەیی یەك زیاتر خواردنە ڕوەکی یەکان بخوات و شەوچەرەی -گوێز و مێوژ و بادام و قەزوان و تووە وشکەی تارانی بێت، نەخۆشی یەکەی جیاوازی هەیە لەگەڵ کەسانێکدا ئەم جۆرە خواردنانە ناخوات، یا بڵێین وەك ئێستا خواردنەکانی هەموو بائعین و یا موعەللەباتین و ...

هەروەها تەوێڵەیەك قوتابخانەی ڕۆحی تیابێت، خەڵکانی تر لە شوێنانی ترەوە بێن بۆ چارەسەری ئەو نەخۆشی یە دەرونیانە و، چەند ڕۆژێك لەو قوتابخانانە بمێننەوە، تا لە ڕووی دەرونی یەوە چاك ببێتەوە، جیاوازە لەو شوێنانەی کە خەڵکەکەی ساڵی جارێك قوتابخانەی ڕۆحی و دەرونی بەسەر ناکەنەوە..

لێرەدا مەبەستمان ئەوەنی یە کە نەخۆشی لە تەوێڵەدا بڵاونەبوەتەوە و نابێتەوە نەخێر، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە نەخۆشی یەکانی تەوێڵە و ئەو جۆرە شوێنانەی کە وەك تەوێڵە وان، هەندێك نەخۆشی تایبەتی خۆیان هەیەو هەندێك نەخۆشیش هەن لە ناویان زۆر کەمە، بۆ نمونە:

ئەم نەخۆشیانە زیاتر لە تەوێڵەدا هەبوون وهەن -سەرما خوردەگی یەکانن- ئەو نەخۆشیانەی بەهۆی سەرما و سۆڵە و باران و بەفرەوە توش دەبن وەك: هەلامەت، ڕۆماتیزم، ئەنفلۆنزا.

هەروەها ئەم نەخۆشیانەش لە تەوێڵە کەمتر بڵاوبونەتەوە: مەلاریا، کولێرا، گرانەتا، چاوئێشە.

بەهۆی بەفرەوە چاوئێشە یان بڵێین چاو بردن، هەر بەهۆی بەفرەوە دەست و پێ و پەنجەکان بەفر دەیانبات، ئەو نەخۆشیانەی کەبەهۆی قەڵەویەوە مرۆڤ توشیان دەبێت لە تەوێڵە زۆر کەمن، چونکە دەوێڵەیی ئەوەندە دەجولێت و دەچێت بۆ ناو باخ یا بۆ سەرشاخ یا بۆ کرێکاری و یا لە بازاڕەوە لە ڕۆژێکدا دوو و سێ جار دەچێتەوە بۆماڵەوە دێتە خوارەوە ئەمە وادەکات کە تەوێڵە قەڵەوی کەمتر تیا بێت.

بەهەرحاڵ ئەو نەخۆشیانەی کە لە مێژوودا ڕوویان داوە و کوردستانی بە گشتی گرتۆتەوە، تەوێڵەش لێی دەرنەچووە و خەڵکانێکی زۆری گرتووە وەك:

دەگێڕنەوە لە کاتی گرانی و برسیەتی‌یەکەی ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی نەخۆشی بڵاو بوەتەوە و خەڵکانێکی زۆری کوشتووە، یاخود هەر بەهۆی برسیەتی‌یەوە، چەندەها خەڵك مردوون.

یاخود لە یاداشتنامەکەی قادر بەگدا هاتووە کە لە ساڵی (١٩٣١)دا نەخۆشی ئاولە بڵاوبوەتەوە نزیکەی (١٠٩) کەسی کوشتووە. یاخود ساڵی (١٩٦٣) سورێژە بڵاوبۆتەوە و منالی زۆری کوشتتووە.

### جەڕڕاح و حەکیمەکانی تەوێڵە

لەلای هەمووومان ئاشکرایە کە ئەوسا بەم شێوەیەی ئێستا خەستەخانە و دوکتۆر نەبووە، چەند کەسانێك زیرەك و دانا، بە مومارەسەی ڕۆژانەی خۆیان وەك دوکتۆر ڕۆڵیان بینیووە.

لە ڕیزی ئەم خەڵکانەش لە تەوێڵەدا شێخانی نەقشبەندی زیاتر دەوری (حەکیم) یان بینیووە وەك دکتۆرێکی جەستەیی و دەرونی.

ئەمانە نەك بۆ تەوێڵەیی بەڵکو بۆ دەرەوەی تەوێڵەو هەورامان و کوردستانیش ڕۆڵی خۆیان بینیوە. تەنانەت زۆرێك لەو دەرمانخانە گیایی‌یانەی ئێستاش کە لە عێراق و ئێراندا هەن، کاریگەری ئەم حەکیمانەی نەقشبەندیان لەسەرە، هەروەك میرزا صدیق ئەحمەد لە کتێبەکەیدا -گژ و گیا و ئاژەڵ-ل -١١- ئاماژەی بۆ کردووە.

بێگومان چەند کەسانێکیش لەبەردەم ئەم شێخانەدا فێری هەندێ شت بون و دەرمانیان نوسیوە بۆ نەخۆش، یاخود هەر خۆیان جۆرە مومارەسەیەکیان کردووە و فێر بوون.

ئەو داودەرمانانەش کە بەکارهاتوون بۆ نەخۆشی‌یەکان بە زۆری، دەرمانە کوردەوایەکان بوون و زیاتر سودیان لە گژو گیا وەرگرتووە. لەبەشی گژوگیاش دا ئاماژەمان بەم جۆرە گیایانە داوە کە بۆ دەرمان بەکارهاتوون.

## حەکیمەکانی تەوێڵە

- شێخ محەمەد بەهائەدین
- شێخ حیسامەدین
- شێخ ئەحمەد شێخ محەمەد
- میرزا عەبدولقادر حەمە یوسف
- وەستا عەزیز دەلاك
- وەستا جەعفەر عەزیز دەلاك
- وەستا صادق عەزیز دەلاك
- وەستا صدیق جەعفەر عەزیز دەلاك
- وەستا عەبدوڕەحمان جەعفەر عەزیز دەلاك
- وەستا عەلی حەمە باقی عەزیز دەلاك
- مامۆستا باباحاجی
- ئیمام محەمەد خالد
- وەستا حەمە ڕەحیم وەستا نادر
- حاجی نادر حەمە عەزیز
- حەکیم مەولود
- محەمەد غەفور
- خاتو ڕەحمە
- بەیزای وەستا حەمەئەمین
- خاتو شەمسە الله وەیس
- عەینای حاجی محەمەد
- حەفصەی نەجیبە فەنی
- صادق غەندی

جەڕاحەکانیش ئەمانەی خوارەوە بوون:

- محەمەد ئەمین کوێخا ئەحمەد
- ئیمام محەمەد خالد
- محەمەد غەفور
- غەفور محەمەد غەفور
- صادق غەندی
- محەمەد ڕەحمان (حەمە سور)
- گوڵەی الله وەیس ڕەحمان
- ڕەشاد محەمەد حەمە ئەمین کوێخا
- صادق محەمەد حەمە ئەمین کوێخا.
- نەصرەدین دەروێش مەحیەدین
- خەرامان عەبدولعەزیز

## مامانەکانی تەوێڵە

مامانەکانی تەوێڵە ئەمانەی خوارەوە بوون:

- شیرین.. دایکی دەروێش مەحیەدین
- نوری جان خالد
- گوڵە الله وەیس
- ڕەیحان حەمە صاڵح
- عەینا حەکیم مەولود
- ئامینە عەبدو الله ڕەضا
- دەڵوەت عەلی حەمە حسێن
- یاسەمەن حەمە ئەمین دەوڵەتیار
- کۆفە تۆفیق مستەفا
- سۆسەن ژنی سلێمان حەمە ڕەحیم
- ئامینە لاوە
- ئامینە قادر حاجیلە
- خەرامان عەبدولعەزیز
- بەهیە سەعید سێلە
- صافیە مەحمود حەمە..

لە کوردستانی نویٚ ژمارە (١٧١٦)ی بەرواری (١١/١٠/١٩٩٨) دا هاتووەو دەڵیٚ:

خاتوو صافییە مەحمود تەوێڵەیی کە لەدایك بووی ساڵی (١٩٤٩)یە، مامانە و نەشتەرگەری -مایەسیری-دەکات و تا ئێستا (١٠٠٠) نەشتەرگەری زیاتری کردوە، ئەم ژنە ئێستا لە گەڕەکی سەرای سەید صادق دانیشتووە.

## بنکەی تەندروستی تەوێڵە

بەڕێز کاك محەمەدی سان ئەحمەد دەڵیٚ:

لە ساڵی (١٩٣٢)دا، یەکەمجار خەستەخانە لە تەوێڵە کرایەوە. یەکەم (موضەمید، ستارەفەنی سلێمانەیی بوو- ئێستا خەزوری شیروانی مەهدی حاجی ئایزەیە-، ستارەفەنی کەم مایەوە زوو نقلٚ ببوو، پاشان ئەمانەی خوارەوە وەك برین پێچ و یا وەك یاریدەدەری پزیشکی دەوامیان تیاکردووە:

- سەید عوسمان-بەرزنجی. (برینپێچ)
- صالح حەمە ئەمین-خەمزەیی. (برینپێچ)
- حەمید - عەرەب بوو. (برینپێچ)
- عەبدولقادر - عەرەب بوو. (برینپێچ)
- سەید جەمیل سەید عوسمان. (برینپێچ)
- صدیق عەلی حسێن- تەوێڵەیی. (برینپێچ)
- عەبدوڕەضا عەبدوڕەزاق- سەماوەیی- (یاریدەدەری پزیشکی).
- فاخر- موسلاّوی. (ی.پ)
- یەحیا-سەماوەیی. (ی.پ)
- باقر مەطەر غرەیبیج-بەغدادی. (ی.پ)
- حەسەن محەمەد حسێن-سلێمانەیی- (ی.پ)
- سەلمان عەبود سەلمان - شەرقاطي (ی.پ)
- نوری محەمەد محەمەد تەوێڵەیی (ی.پ)
- کەنعان کەمال (ی.پ)

**سستەرەکانیش ئەمانەی خوارەوە بوون:**

- شیرین مەحمود-خورماڵی.
- فاطمە عوسمان-دوکانی.
- ئاسۆ جەلال-سلێمانەیی.

- هەتاو -خورماڵی.
- شوکری ئەحمەد خضر-قەڵادزەیی.
- پەخشان - سلێمانەیی.
- ڕەنگین کەریم-خورماڵی.
- چیمەن کەریم-خورماڵی.

**تێبینی**: ئەم بەڕێزانە هەیانە کەم ماوەتەوە. هەشیانە زۆر ماوەتەوە لە (برینپێچ)ەکاندا بەڕێزان (سەید عوسمان و صدیق عەلی)یەکی زیاتر لە (١٠)ساڵ لەو بنکەیە خزمەتیان کردوە، لە(یاریدەدەر)ەکانیش بەڕێز (باقر مەطەر و نوری محەمەد) خزمەتیان زۆر بووە.

**لەدوای ڕاپەڕین:**

سەرەتا وەك دەزگایەکی تەندروستی کاتیهەبوو کە ئەم سیانەی خوارەوە بەڕێوەیان دەبرد:

(داود خالد، نائب فەیضو الله، بەختیار عەبدولعەزین) دواتر بنکەیەکی تەندروستی تیا کرایەوە ئەمانەی خوارەوە وەك یاریدەدەری پزیشکی دەوامیان تیا دەکرد:

بەختیار عەبدولعەزیز-بەڕێوەبەر

نائب فەیضو الله مەحمود

حکمەت حەمە ڕەحیم حەمە شەریف.

لە ساڵی (٢٠٠١) بەولاوە ئەمانە لەم بنکەیە خزمەت دەکەن:

- دوکتۆر ئەفرام محەمەد حەسەن-خەڵکی کفری.

حکمەت حەمە ڕەحیم، نائب فەیضو الله، ئەمیرە حسێن محەمەد، بێخاڵ جەمیل محەمەد، هاشم حەمە عەلی، لەیلا ئەبوبەکر، سەعدی ئەحمەد محەمەد.

بینای ئەم بنکە تەندروستییەی تەوێڵە، لەسەرەتاوە، لەسەر دوکانەکەی صۆفی حەمە کەریم بوو لە ناو بازاڕدا، پاشان کە بینا بۆ شارەوانی تەوێڵە دروست کرا، دوایی کرایە دوو قات، قاتی خوارەوە سەر کانییەکە، کرایە بینای خەستەخانە، تا لەسەرەتای شەستەکانەوە بینای تایبەتی بەرامبەر خانوەکەی محەمەدی سان ئەحمەد کە ئێستاش لەوێیە بۆی دروست کراوە. لەساڵی (١٩٧٦) کەمێك دەستکاری کراو لەولاتریشەوە بینای تر دروستکراوە.

لەو کاتەشدا کە تەوێڵە چۆڵ بووە، ئەو بینایەش وەك بیناکانی تری تەوێڵە تێکدراوە، تا لە دوای ڕاپەڕین ئەو بینایە بە شێوەیەکی جوانتر دروست کراوەتەوە.

خزمەتگوزارەکانی ئەم بنکەیەش هەر لەسەرەتاوە تا ئێستا ئەم بەڕێزانەی خوارەوە بوون:

- حەسەن حەمە یوسف، عەبدولخالق حەسەن، عەبدواخالق حەمە مراد، عومەر حەمە عەلی، فاروق ئەحمەد محەمەد، نافعە ڕۆستەم کەریم، نافعە صادق فەتاح، یونس ڕەشید خودادا، فائق عەزیز، فاضل حەمە سەلیم غەفور.

**کورتەیەك لە ژیانی سەید عوسمان**

سەید عوسمان کوڕی سەید مستەفای بەرزنجەیە، لەساڵ (١٩٣٣) لە خەستەخانەی سلێمانیەوە دەگوازرێتەوە بۆ تەوێڵە، دووەم کەس بووە لە دوای ستارە فەنی دەچێتە بنکەی تەندروستی تەوێڵەوە، لەسەر داوای مەرحومی شێخ عەلائەدینیش بۆ ماوەیەك لە هەموو مانگێکدا (١٠) ڕۆژ لە بیارە دەوامی کردووە، چونکە لەو کاتەدا لە بیارە دکتۆری بۆ تەعین نەکراوە. سەید عوسمان سێ ژنی هێناوە:

- ئاسکۆڵ میرزا عارف سلێمانەیی.. ئەم منالآنەی لێ بووە: عومەر، بەهیە، عەلی، لەتیف، کەمال،.

- عائشە مەلا عەبدوالله مەلا یاسین تەوێڵەیی.. ئەم منالآنەی لێ بووە: جەمیل، بەدریە، غازی، گەلاوێژ، بەختیار، فوئاد.

- خەرامان یوسف بەلْخەیی.. ئەم منالآنەی لێ بووە: ئەمیر، مەزهەر هاشم.

سەید عوسمان هەر لە تەوێڵە دەمێنێتەوە، لەوێ ژنی دووەم دەهێنێ تا لە (١٩٥٤/١١/١) لە تەوێڵە کۆچی دوایی دەکات و لە خانەقای تەوێڵە بەخاك دەسپێردرێ.

سەید جەمیلی کوڕیشی کە کارمەندی تەندروستی (موظف الصحي) دەبێت لەبەرواری (١٩٧١/١/١) لە هەڵەبجەوە خۆی نقلْ دەکات بۆ خەستەخانەی تەوێڵە تا لە (١٩٧١/١٠/١٠) نقلْ دەبێتەوە بۆ هەڵەبجە.

لەسەردەمی سەید عوسمان دا (حەسەن حەمە حسێن یوسف) فەڕاشی خەستەخانەی تەوێڵە بووە، دوای خۆیشی عەبدولخالقی کوڕی تەعین کراوە لە شوێنەکەی.

**خەستەخانەی تەوێڵە لەسەردەمی شۆڕشدا**

لەساڵی (١٩٦٢) بەولاوە، خەستەخانەی تەوێڵە دەورێکی باشی یبنیوە بۆ شۆڕش، بە تایبەت لە ساڵی (١٩٧٤)ا زۆرێك لە دوکتۆرەکانی شاری سلێمانی هاتنە دەرەوە لە تەوێڵە دانیشتن، بۆیە: لە باخەکەی محەمەدی حاجی حەمە ڕەحیم، چەند کەپرێکیان دروست کرد قەرەوێڵەیان تیا دانا و، هەروەها بینای قوتابخانەکەی ناوەندی تەواو بوو بوو، بەلاّم هێشتا قوتابی تێنەچوو بوو، لەم کاتەدا کرایە خەستەخانەیەکی گەورە و ئەم دوکتۆرانەی تیابوو:

- د.ئومێد مەدحەت موبارەك-سەرۆکی بەڕێوەبەری تەندروستی بوو.
- د.کەمال عەبدوالله ناجی
- د.عەبدولقادر شاڵی
- د.ئەحمەد کەمال شاڵی
- د.جەمال ڕەشید حەمادی
- د.باقر محەمەد مالك
- د.عەلی سەعید
- د.جەبار عەبدولڕەحمان
- چەندەها دکتۆری تر.

**دکتۆرە تەوێڵەییەکان:**

ئەو تەوێڵەییانەی تاساڵی (٢٠٠٣) بوونەتە دوکتۆر ئەمانەی خوارەوەن:

١- د.جەبار عەبدولڕەحمان محەمەد-لە ساڵی ١٩٧٤ بووەتە دوکتۆر و یەکەم دوکتۆری تەوێڵەییە.

٢- د.حامد عەلی صادق -دوکتوراه

٣- د.طاهر عەبدوالله حسێن-دوکتوراه

٤- د.ئومێد حەمە کەریم عەبدولوەهاب-دوکتۆراه

٥- د.جوان مەعصوم عەزیز

٦- د.صەباح عابد حەکیم

٧- د.جەلال عوسمان کەریم-صەیدەلانی

٨- د.جەزا عەبدوالله حەمە کەرەم

٩- د.فەلاح عەبدوالله حسێن

١٠- د.عەفان حەمەخان جەعفەر

١١- د.صابر وەسیم عوەز-صەیدەلانی

١٢- د.عومەر حەمە کەریم قادر
١٣- د.ئاسان ڕافع عەزیز-دوکتوراه
١٤- د.سەروەت توفێق سان ئەحمەد
١٥- د.زمناکۆ دڵشاد کەریم
١٦- د.دیاری عەبدولڕەحمان محەمەد-دوکتوراه
١٧- د.شەوقی موختار حەمە حەسەن
١٨- د.ئەزهەر حەمە کەریم محەمەد
١٩- د.حەمید حەسەن محەمەد
٢٠- د.هەردی تۆفیق حەمە حسێن
٢١- د.سوهام محەمەد ئەمین
٢٢- د.شەهلا حەمە یوسف حسێن
٢٣- د.نیشتمان ظاهر محەمەد
٢٤- د.باخەوان ڕافع عەزیز
٢٥- د.شەنیەر ڕافع عەزیز
٢٦- د.یوسف ئەسعەد عابد
٢٧- د.ئەمیر ئەسعەد عابد
٢٨- د.شاخەوان عەبدوالله کەریم
٢٩- د.شایان بارام سەعدی
٣٠- د.کاوێنا مەحیەدین سەلیم
٣١- د.نەوزاد ڕۆستەم زۆراب.....تاد

ئەمە جگە لەوەی هەندێك لەم بەڕیزانە قوتابی ماجستێر و دوکتۆران، وە زیاد لە دوانزە قوتابیش لە کۆلێژی پزیشکین و هەروەها چەندەها یاریدەدەری پزیشکی و برنپیێچمان هەیە.

## هەڵوێستێکی جوامێرانە

د. طاهر هەورامی

لە دوای ڕاپەڕینەوە دوای ئەوەی بنکەی تەندروستی تەوێڵە کرایەوە-کارمەندی تەندروستی بۆ نقلّ کرا، ئەم بنکە خزمەتێکی گەورەی تەوێڵەیی کردووە، بەتایبەت ئەو کارمەندانە، بەلاّم لەوە گرنگتر هەڵوێستی جوامێرانەی دوکتۆر طاهر هەورامییە، کە لەدوای ڕاپەڕینەوە، جار جارە خۆی و دکتۆرە جوانی خێزانی، یان دکتۆر فەللاحی برای، کە دوکتۆری ددانە دەڕۆنەوە بۆ تەوێڵە بەخۆبەخش لەو بنکەیەدا نەخۆش دەبینن و چارەسەریان بۆ دەنوسن، بەڵکو ماوەیەك ڕۆژانی هەینی، تەوێڵە وای لێ هاتبوو خەڵکی لە ئێرانیشەوە لە سنە و مەریوان و پاوە و هەورامان و ڕەوانسەرەوە دەهاتن بۆ تەوێڵە، بۆ لای دوکتۆر طاهر. بەڕاستی ئەمە خزمەتێکی گەورەبوو بەرامبەر بەو کەسانە دەکرا.

دەبێت ئەم هەڵوێستە جێگەی ڕێز و سوپاس بێت لەلایەن جەماوەرەکەوە بە گشتی و تەوێڵە بە تایبەتی. نمونەی ئەم جۆرە کەسانە لە ناومانا زیاد بێت.

---

## پەراوێزەکان

(١) بۆ ئەم بەشە بە گشتی سودم وەرگرتووە لەم بەڕیزانەی خوارەوە:

- محەمەد سان ئەحمەد
- سەید جەمیل سەید عوسمان
- صدیق عەلی حسێن
- حکمەت حەمە ڕەحیم حەمە شەریف
- حاجی عەبدوڕەحمان حاجی محەمەد
- صابر مەحمود مستەفا
- جەننەت حاجی ئەبوبەکر
- د. سەروەت توفێق.

# تەوێڵە لەبواری ئەدەب و هونەردا

## شیعرو شاعیران:

-مەولەوی تاوگۆزیو شیعرەکانی تەوێڵەی

-میرزا عەبدولقادری تەوێڵەیی
-مامۆستا بابا حاجی
- محەمەد ئەمین کاردۆخی
-دانای هەورامی

-م. عوسمان هەورامی
-م. جەمال بێدار
-م. نەبەز هەورامی
-م. عادل شاسواری
-م. گۆران عەباس
-خوشکە کەتان خادیمی

-عەبدولکەریم نەقشبەندی
-تۆفیق هەورامانی
-مەلاکامیل حاجی مامۆستا
-طاهری وەستا مستەفا

-مەلائەحمەدی قازی
-حاجی مامۆستا
-وەستا مستەفای ئەلە
-وەستا عەبدولعەزیز

## فۆلکلۆر:

-لەهۆنراوە فۆلکلۆریەکان
-وتەی پێشینان و قسەی نەستەق
-حیکایەت و حیکایە تخوازەکان
-قسەو قسەزانەکان
-قسەو قسە خۆشبوەکان
-گۆرانیو گۆرانی بێژەکان
-تێرامانێك
-شانۆو شانۆگەرەکان
- کورتە ژیانێکی م.ئەیوب ڕۆستەم
-وەرزش و تیپەکان
-هەڵپەڕکێو سەرچۆپی کێشان
-تەپڵ لێدەرەکان
-دەهۆڵ لێدەرەکان
-شمشاڵ ژەنەکان
-چاوگێڕانێکی خێرابەڕۆژنامەی خورماڵ دا

# تەوێڵە لەبواری هونەرو ئەدەب دا

لەڕاستیدا، هونەرو ئەدەب بەگشتی، ئاوێنەی واقعی زەمان و زەمینی خۆیەتی، هونەرو ئەدەبی خەڵکی هەورامانیش بەگشتیو تەوێڵەیش بەتایبەتی ئاوێنەی ئەو واقیعەی خەڵك و خاکەکەی پیشان دەدات.

ئاوو هەوای دەڤەرەکەو، سروشتی جوان و قەشەنگی هەورامان و سەختیو قورسی ژیان و باوو نەریتە کۆمەڵایەتیو کاریگەری ئاینی زەردەشتیو ئیسلام و بوونی ئەوهەموو پیرو شێخ و خانەقاو مزگەوتانەو...تاد. ئەمانەو چەندانی تری لەوشێوە، ئاوێنەن و کاریگەرن لەسەر هونەرو ئەدەب... ئەمانە هەموو لەم بەشی هونەرو ئەدەبەدا کەباسی دەکەین ڕەنگ و دەنگ دەدەنەوە...

هونەرو ئەدەب لەڕووی خاوەنیەتی‌یەوە دووجۆرە:

جۆرێکیان: ئەوهونەرە یائەو ئەدەبە، خاوەنی هەیەو پاڵ ئەدرێتە کەسێکەوە، وەك دەڵێن ئەم شیعرە هی ئەوشاعیرەیە.

جۆری دووەمیان: ئەو هونەرو ئەدەبەیە کەخاوەنی کەسی‌نیەو بوەتە موڵکی میللەت و تایبەتمەندی نیە بۆتاکە کەسێك، ئەمەیان بەشێکە لەفۆلکلۆری ئەوگەلە. بەشی یەکەمیش هەرچەندە دەچێتە ناومێژووەوەو دەبێتە موڵکی گەل و نەتەوە، بەلاّم تایبەتمەندی تاکە کەسی خۆی‌هەیە. ئەوەی شایەنی باسە زۆرجار جۆری یەکەمیش خاوەنەکەی ون دەبێت و دەبێتە فۆلکلۆر، بەتایبەت پەندو قسەی نەستەق و حیکایەت و ئەو هۆنراوانەی کەنانوسرێنەوە...

**شیعرو شاعیران**

بێگومان شیعر، چێژو کاریگەری خۆی هەیە لەسەر هەست و سۆزی مرۆڤ، هەمووکەسێك ناتوانێ وشەکان بهۆنێتەوە، بەڵکو کەسی تایبەتی خۆی هەیە.

ئەم پەڕاوەی ئێمەش نامانەوێت بێ‌بەش بێت لەم چێژو خۆشی‌یەو لەم ناوداره تایبەتی‌یانە، بەلاّم ئەو شیعرو شاعیرانەی کەبمانەوێت بەسەریان بکەینەوە زۆرن، ئەگەر هەموویان بهێنین لەم بەشەدا ڕیزیان بکەین زوربەی کتێبەکەی ئەگرتین بۆیە:

* ئەوکەسانەیان کە وەك زانا، یاوەك، شێخێك، ناسراون، بەلاّم شاعیریش بوون لەڕیزی زاناو شێخەکاندا نوسیومانن، بەلاّم ئاماژەشمان بۆ شیعرو شاعیریەتی‌یەکەی کردووە، ئیتر لێرەدا بەپێویستمان نەزانیوە دوبارەیان بکەینەوە چونکە زۆرێك لەزاناو شێخەکان دەستی شیعریان بووە.

* ئەوانەی کەبەسەرمان کردوونەتەوە پۆلێن مان کردوون،بەچوار بەشەوە:

– بەشی یەکەم: چوار شاعیری ناودار بوون کەکۆچیان کردووەو، دوانیان تەنها شاعیربوون، لەسەردەمی خۆیان دا لەبۆنەکاندا شیعریان نوسیوەو لەناو جەماوەریش دا خوێندویانەتەوە وەك:

میرزای تەوێڵە و باباحاجی. دوانەکەی تر جگەلەوەی شاعیربوون دەستی نوسینیشیان هەبووەو نوسراویان هەیە وەك: م.کاردۆخیو دانای هەورامی.

–بەشیدووەم: ئەوشاعیرە لێهاتوانەن کەهەم شاعیرن و هەم نوسەریشن و ئێستاش لەژیانـدان و بـەهۆی شـیعرو نوسـراوەکانیانەوە ناسـراون، وەك ماموستایان: ( عوسمـان هـەورامی، جـەمال بێـدار، نەبـەز هـەورامی، عـادل شاسواری، گۆران عەباس، کەتان خادیمی).

–بەشی سێهەم: چەند شاعیرێکی میللین، نەدیوانیان هەیە نەنوسەریشن، ئێستا لەژیانـدان و لێـرەو لـەوێ شـیعریان لێوە دەگێڕنـەوە، بـەڵام چـونکە خوێنـدەواریان هەیـە خۆیـان شـیعرەکانیان نوسـیوەتەوەو لای خۆیـان پاراستوویانن هەرچەندە لەناو جەماوەردا وەك شاعیرێك نەناسراون. لەوانەیە لەم جۆرە شاعیرانەمان زۆرهـەبێت، ئێمـە ڕێگـەمان نەکەوتبێتـە لایـان و ئـەوانیش خۆیان دەرنەخستبێ. ئەم شاعیرە میللییانەش ئەمانەن:

(م عەبدولکـەریم، تۆفیـق هـەورامانی، مـەلاکامیلی حاجیماموستا، تـاهر مستەفا.)

–بەشیچوارەم: چوار شاعیری کۆچ کردون، دوانیان زاناو ناودار بوون کە (حاجی ماموستاو مەلائەحمـەدی قازی) بـوون دوانەکـەیتر خوێنـدەواریان کـەم بووە، تەنها قورئان خوێن بوون ئەمانیش:

(وەستا ئۆلعەزیزو وەستامستەفای ئەلە) بوون. ئەم کۆمەڵەیان شیعریان بەدەگمەن دەستمان کەوتوون، بەڵام ناوەکانمان تۆمار کردوون بەڵکو لەئاینـدەدا بەرهەمەکەیان دەستمان بکەوێت.

بەپێویستمان زانیپەڕاوەکەمان بێبەش نـەبێت لەبەهرەی هەریـەکێك لـەم شـاعیرانەی ناومـان بـردن، بۆیـە بـەپێی توانـا–ئـەوەی دەسـتمان کـەوتبێت– شتێکیان لەسەر بلاو دەکەینەوە. هەڵسەنگاندنی شیعرەکانیشیان بەجێدەهێڵین بۆ خوێنەر.

پێشمان باش بـوو، مەولـەویش بخەینە ئەم ڕیزەوە، نـەك مەولـەوی وەك تەوێڵەییـەك، نـەخێر مەولـەوی نەهەورامییـەو نەتەوێڵەییـە لەژیانەکـەیدا باسمان کردووە–بەڵام وادەزانم ئەگەر باسێك لەسەر هۆنراوەی هەورامی بکرێت

یاخەیرباس لەشاعیرانی هەورامی بکرێت بێ'باسی مەولەوی‌و شیعری مەولەوی، ئەوباسە، ناتەواو دەبێت. خۆئەگەر کەسێکیش سیاچەمانە، بچرێت، شیعرەکانی مەولەوی نەکاتە هەوێنی شیعرەکانی ناتەواودەبێ..

بەڵێ مەولەوی هەورامی نیە، بەڵام لەهەورامان زۆرژیاوە، سۆزی دڵ و خامەکەی بەهەورامی هۆنیوەتەوە بەتایبەت لە تەوێڵە زۆرژیاوەو پەیوەندی بەتینی بەشێخانی تەوێڵەوە بووەو، شیعری زۆری هەیە لە تەوێڵە یا بەسەر شێخانی تەوێڵەی‌دا وتووە. بۆیە:

کورتە باسێکی مەولەوی‌و ئەو شیعرانەی کەپەیوەندیان بەتەوێڵەوە هەیە، لێرەدا دەیانخەینە ڕوو، وسەردانەکەی تەوێڵەمانی پێ'دەڕازێنینەوە، بەڵکو لەویشەوە دەست پێ'دەکەین.

**کورتەیەك لەژیاننامەی مەولەوی**[1]

یەکێکە لەئەدیبە هەرەبەرزەکانی گەلەکەمان، زانایەکی بەرزی ئایینی‌و سۆفی‌یەکی‌بێ'گەردو، شاعیرێکی بێ'هاوتابووە.

شیعری مەولەوی خۆی گەیاندوەتە، زوربەی کۆڕو دیواخانەکان، بەڵکو دەرەوەی کوردستانیشیان گرتووەتەوە.

ئێستاش ناوی مەولەوی‌و، شیعرەکانی، لەهەرشاعیرێکی‌تری‌کورد زیاتر بەسەر زمانی خەڵکەوەیە.. ئەم ڕاستی‌یە بەشێکیشی ئەگەڕێتەوە، بۆئەم پەیوەندی‌یە بەتینەی کەمەولەوی لەگەڵ خواڵێ'خۆشبوان شێخ (سراجەدین و بەهائەدین و ضیائەدین)بوویەتی، کەئەوانیش خاوەنی گەورەترین خانەقاو خوێندنگای ئاینی بوون، لەسەردەمی خۆیانا لە کوردستانا، مەنسوبیان لەهەمووڵایەکیدا بووە، وەخوێندنگاو خانەقاکانیان، فەقێ'و صۆفی‌لەزوربەی ناوچەکانی کوردستانەوە تیابووە. ئەمەش بووبە هۆی ئەوە، شیعری مەولەوی زوربەی ناوچەکانی کوردستان بگەڕێ جگەلەوە، سەردەمی ژیانیشی پێشکەوتووتر بووە لەسەردەمی بێسارانی‌و صەیدی.. هەروەها پلەی زانستی‌و وردی‌و ناسکی‌و سۆزو ئەقڵی مەولەوی زۆرلەسەرەوە بووە.

ئەمانە وایان کردووە، شیعری مەولەوی، زۆرلەپێشەوە بێت و، خەڵکێکی زۆرئاشنابن پێ'ی.

-ناوی سەید عەبدوڕەحیمی کوڕی مەلا سەعیدە، لە نەوەی یوسف جانی کوڕی مەلا ئەبوبەکری موسەننفی چۆڕیە، کەئەگەڕێتەوە، سەر سەید محەمەد زاهد، کەبە پیر خدری شاهۆ ناسراوە...

-نازناوی شیعری (مەعدومی)یەو، لەناو خەڵك و لەکۆڕی ئەدیبانا بە(مەولەوی)ناوبانگی دەرکردوە.

-لەساڵی(١٢٢١ ك-١٨٠٦ ز)لەسەر شاتەی ناوچەی تاوگۆزی عێراق، لەدایك بووە.

-بۆ خوێندن چووە بۆ پاوە و چۆر و سنە و بانە و سلێمانی، دوایی هاتووەتەوە هەڵەبجە لەمزگەوتی جامیعە، لای مەلا صادقی تەوێڵەیی، کە موستەعید بووە لە خزمەتی مەلا عەبدوڵلەی خەرپانیدا، خوێندویەتی، پاشان چووە بۆ جوانرۆ لەخزمەتی مەلا محەمەدی قازی خوێندویەتی، بۆ جاری دووەم، چووەتەوە بۆ سنە، لە مزگەوتی (دار لئیحسان)دامەزراوە، دواتر گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی و لەخزمەتی مەلا ئەحمەدی نۆتشەیی، کەموفتی سلێمانیو ماموٚستای مزگەوتی مەڵکەندی بووە خوێندنی تەواو کردووەو، مۆڵەتی دەرس وتنەوەی وەرگرتووە.

-مەولەوی لە چروستانەی لای هەڵەبجە، بوەتە مەلاو دامەزراوە و فەقێی ڕاگرتوە، پاش ماوەیەك هەوای تەصەوف ئەکەوێتە کەللەیو دەچێت بۆ تەوێڵە، بۆ خزمەتی شێخ عوسمان سراجەدین، دەبێتە موریدیو وەختێکی زۆر بەسلوکەوە ئەباتە سەر.

ماوەیەك ماڵی لە(بیاوێڵە)بووە پاشان دەچێتە (گونە)دواتر دەچێتە (شەمێران)لە کۆتاییدا دەچێتەوە (سەرشاتە)و لەوێ دەمێنێتەوە، تا لەساڵی (١٣٠٠ ك-١٨٨٣ ز)کۆچی دوایی دەکات و، لەگۆڕستانی ئەسحابە لە (سەرشاتە)بە خاك دەسپێرێ.

-مەولەوی لە عیلمی کەلام دا دەستێکی باڵای هەبووە لەم بارەوە گەلێك پەڕاوی داناوە لەوانە:

(الفضيلة)کە٢٠٣١ شیعری عەرەبییە کەلە (١٢٨٥ ك)دایناوە.

(العقيدة المرضية) (٢٤٥٢)شیعری کوردییە کەلە (١٣٥٢ك)چاپ کراوە.

(الفوائح)کە (٥٢٧)شیعری فارسییەلە (١٣٥٢ك)چاپکراوە؟

-جگەلەمەش نامیلکەیەکی بەفارسی هەیە باسی ئوسوڵی تەریقەتی نەقشبەندی ئەکا.

-مەولەوی دیوانەکەی لەلایەن ماموٚستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسەوە کۆکراوەتەوەو، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەو لەسەری نوسیوەو چاپیکردووە.

-وەك وتمـان مەولـەوی موریـدی شـێخ سراجەدین بـووە، پـاش وەفـاتی ئـەو،بـووە بەموریـدی شـێخ بەهائـەدین، وەپەیوەنـدی ڕۆحـی لەگـەڵ شـێخ ضـیائـەدین-یـش بـووە. زوربـەی هەڵبەسـتەکانی پـڕن لەهەسـتی بەسـۆزی، بەرامبەربە (پیر)، وەنیشانەی ئەوەن کەموریدێکی چەند ڕاست بووە، وەلەڕێگای ئەم موریدی‌یەتیەوە دەستێکی گەورەی لە (تەوصەف)دا پەیدا کردووە.

-جارێکیـان لەخانـەقای تەوێڵـە ئـەبێ، لەچروسـتانەوە دێـن بـەدوایا، کەبگەڕێتـەوە بۆمـاڵ، چـونکە کـوڕێکی نـەخۆش ئـەبێ، ئـەمیش سـوارئەبێ‌و ئەگەڕێتەوە تائەگاتەوە چروستانە کوڕەکەی ئەمرێ.

بەبۆنـەی مردنـی ئـەم کوڕەیـەوە شـێخ بەهائـەدین ئەچـێ بـۆلای، بۆسـەر خۆشـی لێکردنـی، مەولـەوی بـەهاتنی شـێخ ئەوەنـدە خۆشـحاڵ ئـەبێ وەجـد ئەی‌گرێ‌و ئەڵێ حەزم ئەکرد، تاماوم ساڵی کوڕێکم بوایەو بمردایە، بەوشەرتە تۆهەمووجارێ بهاتیتایە بۆلام و سودی ڕۆحیم لێوەربگرتیتایە.

مەولـەوی گـەلێ بەسـەرهات و نوکتـەو شـتی تـری هەیـە، هـەروەها گـەلێ دۆستی ناوداری بووەو سەردانی کردون و بەشیعر نامەشیان گۆڕیوەتەوە.

ئەمەش گوڵبژێکی شیعرەکانی مەولەوی‌یە کەپەیوەنـدیان بەباسەکەمانەوە هەیەو وەبۆ هەر شیعرێکیشی ئاماژەمان بەژمارەی لاپەڕەی دیوانەکەی کردووە.

-١- [١]

| | |
|---|---|
| ئایینەی کامڵ! ئازیزەکەی فەرد! | فیدای ئامات بم، صەفاییت ئاوەرد [٢] |
| خەیلێن گەردپات، نەدیدەم دووربێ | یانەی چەم وێران، تەمام خاپوربێ [٣] |
| خاس بی، تەشریفت هەم ئاوەردەوە | گەرد پات وەتەن، ئاواکەردەوە [٤] |

---

[١] مەولەوی ئەم قەسیدەی لەپێشوازی شێخ بەهادینی تەوێڵەداوتووە.

[٢] واتـە: ئـەی ئەوکەسـەی کـەوەك ئاوێنـەی بێگـەرد وایـت، بـووەرگرتنی شـێوەو خوڕەوشـتی باوکـە پـێ گەیشـتووەکەت، ئەی تاقانـە ئازیزەکـەم! بـەقوربانی هاتنـت بم، خۆشیت لەگەڵ خۆت هێنا.

[٣] واتە: دەمێکە تۆزی کەوشەکانت دوورە لەچاوەکانم و ماڵی چاوم بەتەواوی وێران بووە، گوایە وەك بانی خانوو کەخۆڵی بەسەرەوەنەمێنێ، دلۆپەئەکاووێران ئەبێ، چاوی ئەویش ئەگەرتۆزی کەوشەکانی شێخی بەسەرەوەنەبێ، فرمێسکی لێئەڕژێ‌و کوێرئەبێ.

[٤] واتە: چاك بـوو دیسـان تەشـریفت هێنـاوەو تـۆزی پێـت وەتـەنی خـۆی-کەچاوەکانی منە-ئاواکردەوە.

ساقی، ئینە بەزم، وەصڵ یارانەن چەرخیچ هەرئەوچەرخ، هەردە جارانەن[٥]
دەورێ دەر، وەبەزم، وەپیاڵەوە ژەنگ دڵ وەزاخ، مەی بماڵەوە[٦]
جامێمان جەدەس، تۆهەم سەندەبۆ فرسەتەن، نصیو، نەک نەماندەبۆ[٧]

* * *

-٢-[١]

ئێمەگشت فانی، هەرئەوەن باقی نازوون وەبازووی، پڕنەیرووی ساقی[٢]
خەلأصیش دا پێت، وەیەک پەیمانە ئازاد بیت جەبەند، بەستەی پەیمانە[٣]
عارفان چ خاس، پەیوەحەق بەردەن وەصیەت (حافظ)وەجا ئاوەردەن[٤]
دەفنت نەپەهلووی، مەیخانە کەردەن وەسەرخاکت دا، سەبووی مەی مەڕدەن[٥]

---

[٥] هەردەجاران: جاری جاران، مەعنای ئەم شیعرەو شیعرەکانی پاشەوە لەدوا شیعرادێ.
[٦] لەگەڵ شیعری دوایی‌دا مانەکەی دێت.
[٧] واتە: کاکەی پیاڵەگێڕ ئەم کاتە، کاتی بەزم و ڕابواردنی گەیشتن بەیارە. چەرخیش هەروەك جاران وایە، ساخوڵێبدەبەدەورماناو بەزاخاوی مەی ژەنگی دڵمان پاك کەرەوە، باتافرسەتە پیاڵەیەك مەیمان لەدەستی تۆیش وەرگرتبێ، نەوەك بەشمان لەمە زیاترنەمابێ بەدنیاوە.ل (٤٧-٤٨)

* * *

[١] مەولەوی ئەم قەسیدەیەی بۆلاواندنەوەی عەبدوڕەحمانی حاجی مەحمودی یاروەیسی وتووە، کەلە تەوێڵە بەگوللەیەکی لەدەس دەرچووی شێخ هیدایەتی حاجی شێخ ئەحمەدی شێخ عوسمان کوژراوە قەبرەکەی لەپاڵ خانەقای تەوێڵەیە.
[٢] نازوون: بنازم، پڕنەیروو: بەهێز، مەعنای ئەم شیعرەلەگەڵ شیعری دواییدادێ.
[٣] پەیمانە: پیاڵەی شەرابی‌مەرگ، بەستەی پەیمانە: پەیمانێ لەگەڵ خوادابەسراو، واتە: ئێمەهەموومان ئەمرین و مانەوە هەر بۆخوا خۆیەتی، سابا بنازم، بەشان و قۆڵی بەهێزی ساقی (مەبەست قودرەتی خوایە) کەبەپیاڵەی شەرابی مەرگ ڕزگاری‌کردی لەبەندی پەیمانێ لەگەڵ خوادابەسراوی ئازادکردی کەئەبوو بەپێی ئەمرو نەهی ئەو بجوڵێیتەوە.
[٤] عارفان: خواناسەکانی خانەقای تەوێڵە، مەعنای ئەم شیعرە لەگەڵ شیعری دواییدادێ.
[٥] پەهلو: تەنشت، سەبوو: کوپە، مەڕدەن، شکاندووە، واتە: پیاوچاکەکانی خانەقای تەوێڵە، چەندباش بۆی‌چوون کەوەسیەتەکەی حافظی‌شیرازی‌یان لەتۆدا بەجێ هێناوە، گوایەوەك چۆن ئەو وەسیەتی کردبوو کەلەپاڵ مەیخانەدا بینێژن و کوپەیەشەراب

بەناوی پیاز نوسراوە. قادر بەگیش ئاوا دەکات و نوسینەکە دەردەکەوێت و دەیخوێنێتەوە، پاشان (میرزا ئۆلقادر یان مەلا ئەحمەد) دێتە لای قادر بەگ دەڵێ: بەگم نەخۆش نەبووم بەلاّم بۆیە نەهاتم ئەوە نامەیەکی نهێنی تۆو ئەو کەسە بوو، وتم با هەر خۆت بیزانی و بیخوێنیتەوە. قادر بەگیش دەڵێ بە خوا خۆ وابوو، ئەمەت ژیرانە ترو عاقلاّنە تر بوو لە ئەسڵی خوێندنەوەکە.

لەو کاتە قادر بەگ وتی:

بەڕاستی تەوێڵەیی کاغەزی چەرمە مواناوە.

هەروەها دەگێڕنەوە:

حاجی ئۆلوەهاب و حاجی محەمەد (حاجی یەخرە)، بە شەریکی کاسپی دەکەن لەو ماوەیەدا کاکڵەیان کڕیوە و بردویانە بۆ بەغداد حاجی ئۆلوەهاب دەچێت لەگەڵیدا، ئەڵێت ئەگەر ئەمەم باش فرۆشت خەبەرت بۆ دەنێرمەوە کاکڵەی تر بکڕە....کاکڵە لە بەغدا دەفروشێت و قازانجی باش دەکات، ئیتر حاجی ئۆلوەهاب کاغەزێکی سپی دەنێرێتەوە بۆ تەوێڵە، کە کاغەزە سپی‌یەکە دەگاتە دەستی حاجی محەمەد، حاجی عەبولەی هۆمەر ئاگای لێ دەبێت و کاغەزە سپی‌یەکە دەبینێت و تێ دەگات کە مەبەستی ئەوەیە کە کاکڵە لە بەغدا پارەی باش دەکات. جا پێش حاجی محەمەد هەڵدەسێ کاکڵەیەکی زۆر دەکڕێ و دەیبات بۆ بەغدا و دەیفرۆشێ. کە حاجی ئۆلوەهاب بەمە دەزانێ، دەڵێ: بە حاجی محەمەد من هیچم نەنوسی لە کاغەزەکە نەوەك بکەوێتە دەستی تەوێڵەیی و بیخوێننەوە نەمزانی (تەوێڵەیی کاغەزی چەرمە مواناوە).

-تەوێلەی مەبە و، تەوێلینە بە.

واتە: تەوێڵەیی مەبە و بەلاّم لە تەوێڵە بە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە تەوێڵەیی خزمەتی غەریب دەکەن، ڕێزی غەریب دەگرن، لە ڕاستی‌دا نیوەی خەڵکی تەوێڵە، تەوێڵەیی ئەسڵی نین بەلاّم کە هاتوون بۆ تەوێڵە ڕێزیان ئەوەندە لێ گیراوە لە تەوێڵە ماونەتەوە.

-تەوێڵەی بەو، دەربەدەربە.

واتە تەوێڵەیی لە دەرەوەی تەوێڵە، زۆر بەدەم یەکترەوەن و هاوکاری یەکتر دەکەن و نزیك دەبنەوە لە یەکتر.

-یاخوا تەوێڵەی هەر فرە بوو، بادەربەدەر بوو.

ئەم پەندە بەم جۆرەش هەیە(قۆم فرە بوو بادەربەدەر بوو).

لەگەڵ پەندەکەی سەرەوەش هەر نزیکە واتاکەی واتە:تەوێڵەیی یا خزم یاخوا هەر زۆربێت یا دەربەدەریش بێت و لە تەوێڵەش نەبێت، بەلاّم هەر ڕۆژێک بەهاناتەوە دێت و سودی دەبێت.

-تەوێڵەیی، یانە وێرانی، ئاوی پلورینی.

ئاوی پلور ئەو ئاوەیە لەناو بازاڕدا لە پاڵ مزگەوتی گەورە، ئاوێکی خۆش و سازگارە، ئەوسا دوو چایخانەش لەو ناوەدا هەبوو، سێبەری سورە چنارەکەش خۆشتر و جوانتری کردبوو، جا تەوێڵەیی ئەو ئاوە سازگارەیان بەلاوە زۆر خۆش بووە، زۆرجار لەکاروان و سەفەریان یا بڵێین کاتێک دوور کەوتونەتەوە و چونەتە غەریبی بیریان لەم ئاوی پلورە کردۆتەوەو وازیان لەو کاروانە یان لەو سەفەرە هێناوە. دەڵێن: حەمە کەرەمە خاڵە چووە بۆ کاروان لە نیوەی ڕێگە گەڕاوەتەوە، دوایی چووەتە سەر ئاوەکە و، گوایا تفێکی لەئاوەکە کردووە و وتویەتی بەئاوەکە چیمان پێ دەکەی ئێمە لە بۆنەی تۆوە ناتوانین لە تەوێڵە دوورکەوینەوە و پاشان ئەم پەندەی وتووە.

-تەوێڵەی تانەچەشۆش قەناعەت مەکەرۆ.

واتە: تەوێڵەیی عاقڵە و زیرەکە تاشت ئەزمون و تاقی نەکاتەوە، باوەڕ و قەناعەت ناکات، بە عاطفە و سۆز ناکەوێتە شوێن هەر هەواڵ و خەبەرێک کە ببیسێ.

-تەوێڵەی نادرشاش دان کوشتەی[٥١].

نادر شا، شای ئێران بووە، کوردستانی داگیر کردوە، دوایی بەغداش داگیر دەکات و پاشان کە عوسمانیەکان پەلاماریان داوە لە شارەزورەوە هاتوەتە تەوێڵە و لەوێ چوەتەوە ئێران بەلاّم ستەمی زۆر کردوە.

دەگێڕنەوە: لەکوشتنەکەیدا دەستی تەوێڵەیی تیابووە ئەمە لە کاتێکدا دەوترێت بەخەڵکی، کەدوژمنایەتی تەوێڵەیی بکات پێی دەڵێن: ستەم مەکە لە تەوێڵەیی و خۆت مەکە بە دوژمنیان چونکە ئەوانیش ئەگەر بیانەوێت دەتدەن بە کوشت و بەخۆشت نازانی.

-بەلێ نا تەوێڵەی بیەنی:

دەڵێن کە جافرسان دەگەیشت بە تەوێڵەیی پرسیاری زۆری لێ دەکردن، دەربارەی دەنگ و باس و هەواڵ. ئەوانیش وەلاّمی جوانیان لابووەو شتیان زانیوە، بۆیە تەوێڵەیی لای جافرسان بە زیرەک و هۆشیار و وریا کەوتونەتە بەرچاوی... جا ئەگەر لەکەسێکی تر پرسیاری بکردایەو وەلاّمی نەزانیایەو

ئاگای لە دونیا نەبوایە پێی دەوت: بەڵێ نا تەوێڵەیی بیەنی واتە: بەڵێ وامزانی وەکو تەوێڵەیی زیرەك و وریای.

–تەوێڵەی بە ئافەرین مەخەڵەتیۆ.

واتە: تەوێڵەیی بە پیا هەڵدان و ستایش ناخەڵەتێت.

–خوایا جە دەم و تەوێڵەی لام دەی.

واتە تەوێڵەیی بیانەویٚ بە زمان شایعە و جەنگی دەرونی بکەن، لەگەڵ دوژمندا دەیڕوخێنن، بۆیە ئەم دۆعایە کراوە، دەشلێن ئەمە وتەی ئەولحامدی ئەلیەیە کە دژایەتی قادر بەگی کردووە. خەڵکی ڕاپۆرتی زارەکیان لەسەر داوە بەڵکو هەندیٚ کەس ڕقیان لیٚ بووە، شتیان بۆ دروست کردوە، ئەویش لەم کاتەدا ئەمەی وتووە.

–مانگە شەوە و خوای و کلاشی تەوێڵەیا.

ئەمە کاروان چی وتویانە واتە شەوێك بڕۆی بۆ کاروان، مانگە شەوبێت و کلاشی تەوێڵەیشت لە پێدا بیٚ، ئەو کاتە سەفەر خۆشە، هەم دونیا ڕۆشنە و هەم بەو کلاشانەوە دەتوانی پیادە ڕیٚ بکەیت، لە کاتی تردا دەوترێت کە ئەگەر کارێك بکەیت دوشتی بوێت هەردوو بن ئەو کاتە ئەم پەندە دەوترێت.

–ئەی نەوەری گەرەکتا وێت کەری بە صاڵح تانە.

واتە: ئەی نەیخۆی دەتەوێت خۆت بکەیت بە صاڵح تانە.

دەگێڕنەوە:

صاڵح تاتە لە باشوری عێراق، پۆلیس دەبێت، موخالەفەیەك دەکات و ئامرەکەی لێی توڕە دەبێت، دەڵێت.. شەرت بیٚ نقڵت بکەمە شوێنێکی دوور، ئەویش دەڵێت: منەتت نەبیٚ ئەگەر نقڵم نەکەیت بۆ ئاخر دێی سەرسنوری ئێران و عێراق کە تەوێڵەیە... ئامرەکە دەڵێت شەرت بیٚ نقڵی ئەو شوێنە دورەت بکەم.. لەئەنجامدا نقڵی تەوێڵەی دەکات کە زێدی لە دایکبونی خۆیەتی.

–من تاتەیم ژەنی پیٚ ناردە نا.

واتە من باوکم ژنی بۆ نەهێناوم بەڕەنجی شانی خۆم ژنم هێناوە. کاتێك دەوترێت کە کوڕ داوای ژن بکات لە باوکی بەلاّم هیچی نەبێت. دەڵێن ئەم پەندە خاڵۆ (حەمەی سلێمان) وتویەتی کە باوکی (حەمە عارف و حەمە عەلی)یە کە بە حەمیٚ ناسراوە.

–تاتەکە و حەملە قشقەڕیا.

واتە: باوکەکەی حەملە قشقەڕە.

بەمانای کاروئیش پەك دەخات و ئیش دەشێوێنێ، دەگێڕنەوە:

جارێکیان لە ڕۆژی هەینیدا لە تەوێڵە (٣٩)کەس ئامادە دەبن بۆ نوێژی هەینی، دەنێرن بە شوێن باوکی حەملەدا بەڵکو بێت و ببنە (٤٠) کەس و نوێژی هەینی بکەن ، چونکە بەپێی مەزهەبی ئیمامی شافعی دەبێت ئامادەبوانی نوێژی هەینی لە (٤٠)کەس کەمتر نەبن- ئەویش دەڵێ: بە خوا هەلە، خوا ئیشی منی زۆر جار پەك خستووە، ئەبێ ئەمڕۆ منیش ئەم نوێژ کردنە پەك بخەم، نایەت و خەڵکەکەش نوێژەکە ناکەن.

-جەنان و دۆی وارتەر نمەو.

لە کاتێکدا دەوترێت بۆ کۆتایی هێنان بە گفتوگۆیەك ئەوە ئیتر ئاخیر قسەیە. ئەگێڕنەوە:

صاڵح تاتە و دوو پۆلیس دەچنە لادێیەك و، وا بڕیار بووە کوێخا پۆلیسەکان بەسەر ماڵەکاندا دابەش بکات و هەریەکێکیان بەر ماڵێك دەکەون، صاڵح تاتەش بە خۆی و ئەسپەکەیەوە دەچنە بەرماڵێ، دوای مەرحەبایی و بەخێرهاتن، صاڵح تاتە دەڵێت: زەحمەت نەبێ ئاوی فرۆجاوەکە با سوێر نەبێ.. خاوەن ماڵ دەڵێ... بەخوا فرۆجمان نییە تاسەری ببڕم بۆت ... صاڵح تاتە دەڵێت: دەی حەلیماو، واتە (ئاوی پلاوی برنج)ـەکە مەڕژێنە با بیدەم بە ئەسپەکەم، خاوەن ماڵ دەڵێت: بە خوا برنجیشمان نییە..صاڵح تاتە دەڵێ: کەواتە ساوەرمان بۆ لێ دەنێن. دەڵێت: بە خوا ساوەریشمان نییە. ئیتر صاڵح تاتە دەڵێت: تەلاقم کەوتبێ لە نان و دۆ بەرەو خوارتر نایەم.

-کوڕو یودەی بەو، زەڕت بۆ.

واتە: بە داخەوە کوڕی یەهودی بیت -کەلەناو کۆمەڵدا سوك و بێ نرخن- بەڵام پارەت بوو، نرخت هەیە و ڕێزت دەگرن، ئەم پەندە ، وتەی حاجی حەمەی حامدە، ئەمە سیفەتێکی خراپە لەناو کۆمەڵگادا، نابێت کۆمەڵ کەسایەتی بە پارە بخوێنێتەوە.

-بەخوا خوەم مێو.

واتە: بەخوا پێکەنیم دێ، لە کاتێکدا دەیڵێی کە گاڵتەت بێ بەو وتەو کردارەی لەبەرامبەرت دەکرێت. هەمان ئەوکەسە وتویەتی کەلەسەرەوە باسمان کرد.

-تاتە عومرتا درێژ بۆ.

واتە باوکە عومرتان درێژبێت... ئەمە بە تانە و تەعلیقەوە وتراوە و دەوترێت. بە مانای عومرتان کورت و نەمێنێت.. ئەمەش خاڵۆ ئەولحامدی ئەلیە وتویەتی بە گەنج یان بە منداڵ.

-مەڵڵا صابیر مەردەن، نەك خاتوو سەعدا.

خاتوو سەعدا خێزانی مەلا صابیر بوو، کاتێك کۆچی دوایی کرد وتیان بە خاڵۆ ئۆلحامد، خاتوو سەعدای ژنی مەلا صابر مرد. ئەویش ئەم پەندەی وت. مەبەستی ئەوە بوو خاتوو سەعدا ڕۆیشت بەڵام چونکە مەلا صابیر پیر بووە ناتوانێ ژن بێنێت دوای ئەو، کەواتە ئەو پەکی کەوت و زەرەری کرد، واش بوو نەیتوانی ژنیتر بێنێت.

ئێستا لە کاتێکدا دەوترێت یەکێك ژنەکەی بمرێت، بەڵام پیر بێت و ژنی بۆ نەیەت.

-هەرەکەی بارە بەزوانمۆ بەسەشۆ.

بەمانای: کەرەکە بێنە بە زمانمەوە بیبەستەرەوە، دەگێڕنەوە:

حاجی مستەفای حاجی قادر لە چایخانەیەکی تەوێڵە دانیشتووە، مەلا عابد بەخۆی و گوێ درێژەکەیەوە لەو ناوە تێدەپەڕێت و سەلام لە حاجی دەکات، ئەویش فەرموی لێ دەکات کە دانیشێ شتێ بخوات.. مەلاش ئامادەیی دەردەبڕێ و دەڵێ ئەی کەرەکەم لە کوێ ببستمەوە، حاجیش لەوەڵامدا ئەم پەندەی وتووە. مەبەستی حاجی ئەوە بووە، ئەگەر بە زمان خوڵکی تۆم نەکردایە تۆش نەت ئەوت لە کوێ کەرەکەم ببەستمەوە، قابیلە خۆ فەرمووی خۆتم کردوە نەك ئەوە کە دەبێ خەمی کەرەکەشت بخۆم-لە کاتێکدا دەوترێت ئەگەر زمان هەڵەیەك بکات و خاوەنەکەی پەشیمان بێت لە وتنەکەی.

-کۆمەڵێك پەند هەن بە تەڵاقەوە وتراون وەك ئەم تەڵاقانە کە بە تەڵاقی خاوەنەکانیانەوە ناسراون لەوانە:

بارام بەگ (۱۹۰۳-۱۹۹۱) قسەخۆش بووە، تەلاقی زۆری خستووە، تەڵاقەکانیشی بوونەتە پەندو قسەی نەستەق، بۆ نمونە: بارام بەگ تەڵاقی خستووە وتویەتی:

تەڵاقم کەوتە بو، کەس بیمەك نیا، وێش وێش بیمەك کەرۆ.

بە مانای: کەس ناشرین نیە، خۆی، خۆی ناشرین دەکات. ئەمەش بەهۆی هەڵس و کەوت و ڕەفتاریەوە، ئیتر ئێستا کەسێك کارێکی ناباش بکات و خەڵك

لێی بیٚ تاقەت بن دەڵێن..تەلاٚقەکەو بارام بەگ یا کەس بیمەك نیا وێش وێش بیمەك کەرۆ.

-پیسەنە عەلادینی خەیرەش پیٚ وێش نیەنە.

بە مانای: وەکو زۆپای عەلادین خەیری بۆ خۆی نی‌یە، دەگێڕنەوە: بارام بەگ تەلاٚقی خستووە عەلادین بنی خۆی گەرم ناکاتەوە واتە: خەیری بۆ خۆی نی‌یە ئیتر بە تەمای خەیر بداتەوە بۆ کەسی تر، ئەمە بەیەکێك ئەوتریٚ کە کەس بەتەمای خەیر و چاکەی لیٚ نەکات.

-بارام بەگ ڕاستش واتەن: هەرکەس تکەو یانەی و، ڕێز و دلی پالاٚیش قبولٚ کەرو (گە ...) قبولٚ کەرو.

بارام بەگ تەلاٚقی خستووە هەرکەس لە ماڵەوە بێت و خانوەکەی دلۆپە بکات و نەچێت بیگێڕیٚ و لە ناو پێلاٚوەکەیدا بەردی بچوك ببێت و بڕوات بەڕێوە، دەری نەهێنێت.. ئەمانە قبولٚ بکات.. شتی تریش ؟ قبولٚ دەکات.

-تەعویز پیسە کەرو سەرۆشۆسەیۆ سەیارە مدۆماونە.

کە لادێکان بارکران، خەڵکی تەعویزیان وەرگرت، هەرخەڵك بو نەیئەزانی لە شۆفێری کەچی سەیارەیەکی دەکڕی و پارەکەی خەرج دەکرد. جا بارام بەگ تەلاٚقی خستبوو تەعویز ئاوا بکات لەسەر ئەم شۆستە سەیارە لیٚمان دەدات. ئەوەندە کەسی ناشی سوکان دەگریٚ بەدەستیەوە..دەڵێن هەر لەوشوێنە کە تەلاٚقەکەی خستبوو، دوای چەند ساڵێك سەیارە لیٚی‌داو دوایی کۆچی دوایی کرد.

-مەوەرو مەجمنو.

واتە ناخۆم و نایجولێنم.

دەگێڕنەوە: سەید حەمە شەریف کوڕی سەید صادق، (پەری) باوەژنی بانگی دەکاتە ماڵەوە کە نان بخوات، ئەویش دەزانیٚ مەسەلە، نان خواردن نی‌یە و بۆ ئەوە بانگی ناکات، بەڵکو دەیەویٚ بێشکەی منالی پیٚ بجولێنیٚ، بۆیە یەکسەر ئەم پەندە دەلیٚ.

-هەرچی کریا و شی.

واتە: هەرچی کرا تەواو ڕۆیشت و ناگەڕێتەوە. بەمانای لەکاتی خۆیدا هەلت دەست کەوت دەستی خۆت بوەشێنە و مەترسە لە ئایندەکەی....

دەگێڕنەوە و دەڵێن: حەمە خانە شەلە، شتی زۆری کردوە و دەستی زۆری وەشاندوە، پیٚی دەڵێن: باشە تۆ بیر لەم شتانە ناکایتەوە دەیان کەیت، ڕۆژێك دەبێت تووش ببیت، ئەویش لەوەلاٚمدا ئەمە دەلیٚ.

-جا ئینە ڕێکا، جارێك مەنەن.

لە تەوێڵە دوو برا بوون بەناوی (ظاهر) و (طاهر)، ظاهر براگەورە بوو، بەڵام (طاهر) ی برا بچوك لە پێشەوە ژنی هێنا. کاتێك (ظاهر) بەمە دەزانێ، دەڵێ بەبرا بچوکەکەی (جا ئینە ڕێکا) واتە: جا ئەمە ڕێکە تۆ پێش من ژن دەهێنی، ئەویش هیچی بۆ نامێنێتەوە تەنها ئەوەندە نەبێت دەڵێ: (جارێك مەنەن) واتە جارێك ماوە، واتە با ئەم کارە ناڕێکەی منیش بچێتە پاڵ ناڕێکە کانی تر.

-مەردا، ناڕازیی نەبیدی، ئانە حوکم و حەمە عەلی مۆلەیتا نەدیەن. لە کاتی بێزاریدا دەوترێت، کە ئاوات لە مردن بخوازی و بێ تاقەت بی لەو حوکمەی کە دەکرێ و دەسەڵاتی هەیە بەسەرتا.

دەگێڕنەوە:

لە ساڵی شەستەکاندا چەند تەوێڵەیی‌یەك لەلایەن عەبدولوەهاب ئەتروشی‌یەوە دەگیرێن و عەزیەت دەدرێن، پاشان دەدرێنە دەستی حەمەعەلی مەولود کە ببرێن بۆ بیارە، لە ڕێگا حەمە عەلی زیادە ئازارێکیان دەدات، لە نزیك گۆڕستانەکەی سۆسەکان یەکێك لە زیندانیەکان ڕوو دەکاتە مردوەکان ئەم وتە دەڵێ.

-بیمەکی یەکتری میزاوە، واتە: ناشرینەکان یەکتر دەدۆزنەوە. بە مانای ئەوانەی خویەکیان هەیە یەکتر دەدۆزنەوە لێرەدا مەبەست لەو کەسانەیە کە خوی ناشرینیان هەیە و لار و چەوێڵن یەکتر دەدۆزنەوە و دەکەونەیەك-ئەم پەندە وا دەگێڕنەوە کە حەمە کەرەمە خاڵە وتویەتی.

-وێم چێگەو یار جە دالانی.

بە مانای خۆم لێرە و یار لە دالانی. دالانی کەژێکی پشتی تەوێڵەیە مەبەست ئەوەیە شتی وانابێت چۆن دەبێ من لێرەو ئەو لەوێ.

-لاسی خەزان بەرامبەری تەخت.

لاسی خەزان لە پشتی چلانەوەیە، تەختیش کەژێکی بەرزە لەپشت ئاوێسەرەوەیە هەرچەندە دیارن لە یەکترەوە بەڵام نێوانیان هەیە. دەگێڕنەوە: میرزا ئۆلقادری تەوێڵە، هەندێ (لۆ)ی دەبێت، دەیەوێت بیفرۆشێ بە پیاوێك پیاوەکە دەڵێت من (لۆ)ی کوێستانم دەوێت، هی تەخت و بزازەراو ئەو ناوەم دەوێ، میرزاش لەوەڵامدا دەڵێ: ئەم لۆیەی منیش هی لاسی خەزانە کە بەرامبەری تەختە...وادیارە کڕیارەکە نازانێ لاسی خەزان لە کوێیە و قەناعەت

دەکات بەو قسەی میرزا. ئەم پەندە لە کاتێکدا دەوترێت بۆ قەناعەت پێ کردن یا بۆ خەڵەتاندن.

-ڕوێو یەری جاری مرونەو زیننە بوۆ.

دەگێڕنەوە: (جافر ناوێك) هەژارو نەدار بووە، منالی زۆریشی بووە، حەزی کردوە وەك منالانی خەڵکی خواردنی سێ ژەمەیان باش بێت، بەلام ئەمیش هەژار بووە خەم و خەفەتی زۆری خواردووە، وتویەتی هەر ژەمە خواردنێك مردنە بۆ من، بۆیە تەلاقی خستووە ڕۆژی سێجار دەمرم و زیندوو دەبمەوە.

-بەخەم و کۆنەیۆ سەرم نەنیانۆ.

بەمانای: بەخەمی کۆنەوە سەرم نەناوەتەوە، دەگێڕنەوە هەر ئەم خالۆ جافرە چونکە گیرو گرفتی زۆربووە، هەمیشە خەم و خەفەتی هەبووە، تەلاق دەخا تائێستا بەخەمی کۆنەوە نەخەوتووم، هەمیشە خەمی تازەم بۆ پەیدا بووە.

ئیتر ئێستا لە ناو تەوێڵەیدا خەم بێت بەسەر خەمی تردا دەڵێن ڕەحمەت لە خالۆ (جافر) کەئەم تەلاقەی خستووە مەبەست لەوەیە ئەم دونیا پڕە لە خەم و خەفەت و خەمیش هەر تەواو نابێ.

-توتکولی وەی کەری خاستەرا تا زاولێ ئی زەمانەیە.

بەمانای توتکە سەگ بەخێو بکەی چاکترە تا منالی ئەم زەمانەیە، دەگێڕنەوە: (عەبە ناوێك) بووە کە پیاوێکی هەژار بووە، هەمیشە خەریکی باخەوانی و کرێکاری بووە، ڕزق و ڕۆزی پەیدا کردوە بۆ مندالەکانی، کەچی مندالەکانی بە گوێی ناکەن، ئەویش تەلاق دەخات توتکە سەگ...

واتە ئەوان بەوەفاترن و نانیان بدەی دێن بە دەمتەوە، بەلام منالی ئەم سەردەمە بێ وەفان و بە گوێت ناکەن، ئیتر ئێستا ئەم پەندە ناسراوە بە (تەلاقەکە و عەبەی) لەکاتێکدا دەوترێت کە منال بە گوێی دایك و باوکیان نەکەن.

-دژمانی فەرزەیچ هەنە.

بە مانای جنێوی فەرزیش هەیە، دەگێڕنەوە: قالەی مەجنون لەناو باخ دێتەوە ماندووە و بەژنەکەی دەڵێ: خەجێ گیان چۆڕێ ئاوم بەرێ، خەجێ وەلامی ناداتەوە: دەڵێ: خەجێ تینومە و ماندووم لەو کونە کەمێك ئاوم بدەرێ، خەجێ ئاوەکەی ناداتێ، ئەمجارە دەڵێ: سەگباب دەی هەڵسە نەختێ ئاوم بەرێ. خەجێ خان ئینجا هەڵدەسێتەوە و ئاوەکەی دەداتێ، لەم کاتەدا قالە دەڵێ: (تەلاقم کۆتەبۆ دژمانی فەرزێچ هەنی)، مەبەستی قالە ئەوە بووە ئەگەر

خەجیێ ئیجباری نەکردایە جنێوەکەی نەئەدایە، ئیتر ئێستا یەکێك تورە ببێت و جنێو بدات دەڵێن (تەلاَقەکەو قالە و مەجنونی نیا... دژمانی فەرزەیچ هەنە).

-دەرمانەکەو علیانیا

دەڵێن: علیان ناوێك لە تەوێڵە بووە، چاوی مژمۆرو تەواو نەبووە، کەچی دەرمانی دەستنیشان کردووە بۆ ئەو کەسانەی کەچاویان تەواو نەبووە، ئێستا ئەمە بووەتە پەندێك، واتە کەسێك نەتوانێت گیروگرفتی خۆی چارەسەر بکات، چۆن گیروگرفتی خەڵکی تر چارەسەر دەکات.

-ئوجۆ حەکەو حچەنیێ.

دەڵێن: حەکەو حچە دوو پیاو بوون هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکتر بوون، هەمیشە بەیەکەوە بوون، ئاواتیان خواستووە بەیەکیشەوە بمرن. دەڵێن: کەحچە دەمرێ حەکەش لەخوا دەپاڕێتەوە سێ ڕۆژەی حچە تەواو نەبێ ئەمیش بمرێ.. بەفەرمانی خوای گەورە لەسێهەم ڕۆژدا حەکەش دەمرێو بەئاواتی خۆی دەگات.. هەردوکیان لەئەخیر تەلاَنی باخەکەی کوێخا حەمەسەلیم دا نێژراون.. ئەم پەندە لەکاتێکدا دەوترێ کەببینی دوو کەس زۆر بەیەکەوە بگەڕێن، ئەوکاتە دەڵێی: ئەم دوانە دەڵێی حەکەو حچەن.

-تەمەنم هەر ئی سەعاتەنە.

فەرەج الله ناوێك بووە، تەمەنی زۆر بووەو قسە زان و دانا بووە، بەلاَم هەموو کەس لەقسەکانی تێنەگەیشتوون، بۆیە پێیان وتووە فەرەج الله شێت، هەروەك چۆن بەباڵوڵی دانایان وتووە باڵۆڵە شێت.

جارێکیان خاڵۆ فەرەج الله پاڵ دەدات بەکۆڵەکەکەی مزگەوتەوەو لێی دەپرسن خاڵۆ فەرەج الله تەمەنت چەندە؟ ئەویش لەوەلاَم دا دەڵێ: تەمەنم هەر ئی سەعاتەنە.. واتە: تەمەنم هەر ئەم سەعاتەیە.. ئەوەی گوزەراوە ناگەڕێتەوەو ئەوەی ئایندەش نازانم چۆنەو تاکەی دەبێت، کەواتە ژیان هەر ئەمەیە کەئێستا تیایدا دەژیم.

ئەمانەش لەو پەندانەن کە زۆر باون لەسەر زمانی تەوێڵەیی:

-ئاگات ئافەرمی بۆ.

واتە: بە ئافەرینی خەڵکی نەخەڵەتێی بەتایبەت لە کاتی گەنجیدا بە گەنج دەوترێت و لەشتدا زۆر دەچێتە پێشەوە تا تێدەکەوێ، ئەمە بەو کەسانە دەوترێت، بۆ ئەوەی تێنەکەون.

-چیرو لوسێوی لوە بتاویش.

واتە: قورسایی‌یەك هەڵگرە بیتوانی، مەچۆرە ژێر باری قورسەوە.

-ئەدالی هەشەنە بوەش وەشەنە.

واتە: دایك باوەك ورچیش ناشرین بێت، بەلام هەر بۆنی خۆشەو خۆشەویستە.

-ئەدالو هۆمەرەی لوا سەیەو نەرەی.

دایکی هۆمەر زۆر جار هۆمەر ئەکات بە بیانو بۆ خۆدزینەوە و کەنارگرتن و، هۆمەر دەبات بۆ بن سێبەری دار بەڕوو، گوایا هۆمەر خۆرەتا و ئەیبات، ئەمە کاتێك دەوترێت کە یەکێك خۆی بدزێتەوە و شتێك بکات بە بیانوو.

-تاسی وات مەرییێنی نەوەك زرییێنی، یاخود، شیشی وات مەرییێنی نەوەك زرییێنی. واتە مردن باشترە لەوەی ناوت بزڕێ.

-دۆم بۆ کلاشی پەی وێش کەرۆ.

واتە خاوەن کار و پیشەساز ئەگەر ئیش بۆ خۆی بکات زۆر بە دڵسۆزی دەیکات و هەوڵ دەدات بە چاکترین شێوە ئەو کارە دەکات.

* بێ گومان کۆمەڵێك پەند و قسەی نەستەقیش هەن لە شێوەی هۆنراوەدا داڕێژراون وە تایبەتیش نین بە تەوێڵەوە، بەلام لەسەر زاری زۆر کەسانی بەتەمەنەوە لە تەوێڵە دەبیسترێن. وەك ئەمانەی خوارەوە:

- تا دالێ و مەنۆ بە دالە هۆوە   شەرتەن بنیشو بە دیار و تۆوە.
- پای پەتی وەشا، نەکو پالآی تەنگ   بێ ژەنی وەشا،نەک یانەی پڕ جەنگ
-بێ یانەی وەشا، دلێ ئاکوا   نەک یانەی پڕ دەنگ چەنی بەدگوا
-دنیای بێ وەفا، کاروان سەرای ڕەنگ   نیمێ بە دڵشاد، نیمێ بە دڵ تەنگ
-دنیا هەر دنیان ئی دنیا بادەن   ئەبلەهـ کەسێوەن، بە دنیا شادەن
-جەبێ کەسی وێم، تۆم کەردەن بەکەس   نەبەکەس شیای نەبە نیمە کەس
-هەرکەس ئارەزووی، دیدەو کەسیوشا   ساتێو وینۆنەش، سالی و وەسیشا
-حاکم نۆشیروان، وەزیر بەختیار   ئاوەدانە یۆ ، وێرانە هەزار
-کەس بیەن بەناکەس،ناکەس بیەن بەکەس   صاحب خانەدان، بەرشیەن عەبەس

| | |
|---|---|
| -هەی داد هەی بێ دادن چارەم سیاوەن | منیشو دەریا، وشک و بێ ئاوەن |
| -دەلیلم کیاست ، ڕاگا ڕازنۆ | نەزانام دەلیل، شەرمەسازنۆ |
| -تاکو نەچەشی زوقم و زمسانی | بەدەست نماری باخ و بێستانی |
| -تا گۆرە نەواچوو یانەنە | گولانە مەگێلنوش بانەنە |
| -نیا یانەشا، شام و دەروێشا | لنگی پێ شا، سەرچۆپی کێشا |
| -ئەی واڵی ژێر برات بۆ پیر | جەنگ کەری ئاشتیت بۆ ویر |

## حیکایەت و حیکایەت خوانەکان:

ئەوسا تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامەو گۆڤار و پەڕاو نەبوون، بۆیە خەڵکی، شەویان زیاتر بە حیکایەت کردن بردووەتە سەرو، لە دەوری ئاگردانەکان کۆبونەتەوە و شەو چەرەیان ئامادە کردوەو گەنجان و لاوان لە دەوری پیاوە بەتەمەنەکان، ئەوانەی کە توانیویانە حیکایەت و چیرۆك بگێڕنەوە کۆبونەتەوە و گوێیان بۆ گرتوون.

جا لە تەوێڵەش گەلێك حکایەتخوان بوون و خەڵکی لە دیوەخانەکاندا لە دەوریان شەوانە کۆبونەتەوە لەوانە:

-عەبدواللە- کە بەعەبە درێژ بەناوبانگ بووە-باوکی (موراد) ئەم پیاوە ئەوەندە قسەی خۆش بووە زۆر جار -جافرسان- دانیشتووە و گوێ ی بۆ گرتووە.

-حەمە ئەمین خالد-کە بە حەمە مینە خاڵۆد ناسراوە.

خالد مەعروف- کە بە خاڵەی مارفە ناسراوە.

-ئایشێ (خێزانی میرزا ئۆلقادر)

-فاتمە (خێزانی صۆفی حەسەن).

-بەگیج عەبدولحامید.

-خورشید حاجی حەمە ئەمین.

-فاتمە حەبیب.

-صالەی حاجی صادق.

-حاجی عەلی حاجی صادق.

-خواجە حسین.

-حاجی عەلی عەباس .

-حاجی ڕەحمان ڕوحواللە.

-کوێخا حەمە سەلیم حەمە ڕەزا.

-مەلا ئیسماعیل مەلا عەبدوالله.
-عەباس فەتاح ڕۆستەم.
-حاجی محەمەد حاجی صادق.
-دەروێش لەتیف وەستا محەمەد.

**قسەو قسەزانەکان (داناکان):**

قسەکرد ئاسانە، هەموو کەسێ دەتوانێ قسە بکات، بەلام مەرج نیە قسەکان، خۆش بن، لەشوێنی خۆیاندا بن، خەڵك تاقەتی هەبێ گوێیان بۆ بگرێ و سود بەخش بن بۆ خەڵکی.

هەندێك قسە دەکەن قسەکانیان، ڕەقن، تاڵن، بێتامن، جەرگبڕن، گەزندەن. هەندێك قسە دەکەن، قسەکانیان حیکمەتن، گەوهەرن، دڵگیرن، نەستەقن، هەندێك قسە دەکەن قسەکانیان، خۆشن بەتامن، دڵخۆشکەرن، نوکتەن، هەندێکیش قسەکانیان ئاساییـن، جارجارە ڕەقن، جارجارە باشن، جارجارە نوکتەن، بەلام بەزۆری وتەکانیان ئاساییـن و سادەن.

مرۆڤەکان بەم شێوەیە لەقسەکردندا جیاوازن. لەڕوویەکی تریشەوە، هەیە زۆر بڵێیە، هەیە کەم دووە، هەیە لەشوێن و کاتی خۆیدا قسە دەکات، هەشە ئاسایی‌یە. جائێستا ئاماژە بەهەندێ لەقسە زانەکانی تەوێڵە دەدەین لەوانە:

ئەحمەدی ئیسحاق، حەمەلەتیف صەیفور، عەبدوالله ئاغا، کوێخا عەبدوالله میرزالە، هۆمەری مەولود، میرزا عەبدولقادر، حەمەکەرەمە خاڵە، حەیبە الله حەمەئەمین، حاجی مامۆستا، خواجە حسێن، حاجی عەلی حاجی صادق، طاهری سانە، حەسەن حەمەسەلیم، فازڵ حەمەصالح، مستەفا فەتاح، حاجی محەمەدی حاجی صادق، حەسەنی خاڵە.

**قسەو قسەخۆشبووەکان:**

مەلا عابد، مام سەعەی وەیسی، وەستا ئۆلعەزیز، محەمەدی عەلی محەمەد، کەرەمی حەمل، باسام نەصروالله، مەلەکی کەیکاوس، سوراحی عەلی محەمەد، خاتو ئاسیە خێزانی سەعید ئاغە، خاتون نەصروالله.

بۆ نمونە: مەلا عابد قسەی خۆش بووە، نوکتەی زۆر لەسەری هەیە، لەوانە،

* جارێکیان دەڵێ بەژنەکەی کەمیوانم هێنایەوەماڵەوەو دەستم هێنا بەڕیشما، واتە ئەوە بووە بەڕیشمەوەو توش بووم، هەرچی هەیە بۆی بێنەو بابیخوات و بڕوات و لەکۆڵم بێتەوە، بەڵام کەدەستم هێنا بەسەرچاوما، واتە سەر چاوم هاتووەو خۆشەویستە، خێرا خواردنی چاکی بۆ دروست بکەو شتی باشی بۆ بێنە.

* هەرکەس بزانێ چی لەدەستماڵەکەمدایە، ئەوە هەرمێ گەورەکەیانی ئەدەمێ.

* نۆ هەرمێم پێیە کێ دەازانێ تاقن یا جوتن.

* جارێکیان خاتوو (بەیزا)ی خێزانی مامۆستا دێت بۆ سلێمانی بڕیارە سێ ڕۆژ لەسلێمانی بێت و بگەڕێتەوە، سێهەم ڕۆژ هەر لەبەیانی‌یەوە مامۆستا دێت بۆ بازاڕ بۆ چاوەڕوانی مەلا ژن، خەڵکیش دەزانن مامۆستا بەم بەیانی‌یە زووە بۆچی هاتووە بۆ بازاڕ، تائێوارە مەلاژن ناگەڕێتەوە، مەلا خۆی ناگرێت و لەناو خەڵکەکەدا دەڵێ: ئەی سایقەکا خوا ناروتاوە ئارۆ هەر پیێ ماردێ. لەپڕ سەیارەیەك دێت و مەلا ژنی تیایە خێرا دەڵێت: نا، نا خێر بەیدێ .

* دەڵێن جارێکیان چەند پیاوێك بانگ دەکات بۆ تووەتەرە خواردن بۆ باخەکەی لەو کاتەدا پیاوەکان دوو سێ کەسی تر دەبینن کەئەوا لەبەردەم تەلآنەکەدا دێن تێدەپەڕن، دەڵێن مامۆستا مەگەر خوڵکی ئەوانە بکەین، مامۆستا دەڵێت: ئێوە چاو بنوقێنن بائێمە ئەوان نەبینین، کاتێك کەهاتن ئەوان سەلامیان کرد مامۆستا چاوی نوقاندبوو بەدەست وەڵامی سەلامەکەی دانەوە.

نمونەیەکی تر: مام سەعە کەبە سەعە کولەکە ناسراوە، قسەی خۆش بوو، ئینسان لەلای‌دا بێ تاقەت نەدەبوو.

– عەلی محەمەدی وردەواڵە فرۆش هەبوو، کەبەئەلەپشقەل ناسراو بوو، دوکانی هەبوو ماوەیەك سەوزەو میوەی دەفرۆشت، جارێکیان کولەکەی باشی لەلا دەبێت و مامە سەعە بانگ دەکات دەڵێ: وەرە مام سەعە کولەکە بکڕە بزانە چەند کولەکەیەکی چاك و باشن، مام سەعەش تێ‌دەگا ئەو چی مەبەستە یەکسەر دەڵێ: ئەی تاتە ئانە پشقەلی خاسیشا کەردینی.. واتە: ئەی باوکە ئەوە پشقەلی باشیان کراوەتە بنی بۆیە ئاوا چاکن.

### گۆرانی و گۆرانی بێژەکان

بێگومان گۆرانی بەشێکی گەورەی لەفۆلکلۆری هەورامان داگیر کردووە. گـۆرانی هـەورامی ڕیـتم سـۆزو ئـاوازی تایبـەتی خـۆی هەیـە، بـۆ هـەر بۆنـەو کاروبـارێکی ژیـان، جـۆرە گۆرانی‌یـەکی تایبـەت هەیـە، بـەڵکو هۆنراوەکانیشـی تایبەتن و جیاوازن.

تەوێڵە وەك دەڤەرێکی گەورەی هەورامان لەم هونەرە دانەبڕاوە، بەڵکو هەر لـەدێرین زەمانەوەناوەنـدێکی ئـەم هونـەرە بـووەو گرنگـی زۆری پـێ دراوەو لەسـالأنی ئـەم دوو سـەدەیەش لانکەیـەك بـووە بـۆ گـۆرانی بێـژەکان و، بووەتـە جێگەی سۆزی عیشقی عاریفانی طەریقەت و، لەساڵەکانی پەنجاکان بەدواوەش مەیـدانی بـازاڕی تەوێڵـە جێگـەی هەڵپـەڕکێ‌و شـایی‌و ژوانـی گـۆرانی بێـژانی- برایانی کەیمنەیی بوو[٥٣].

گۆرانی هەورامی بەشێوەیەکی سەرەکی دوو جۆرە:

١- گۆرانی خاو: ئەمیش دوو جۆرە:

ا- گۆرانی زۆر خاو، کەبەسیاچەمانە ناسراوە.

ب- گۆرانی کەمێك خاو، گۆرانی‌یەکانی ئەم جۆرە بەوردە بەزم و بەزمی شێخانەو بەزمی گێلأی = گەڕیان ناسراون.

٢- گۆرانی خێرا: ئەم جۆرە گۆرانی‌یانە بەچەپڵەوە دەوترێن، ئەمیش دوو جۆرن:

ا- گۆرانی زۆر خێرا، ماوەی نێوان چەپڵەیەك و چەپڵەیەکی تر کەمە، واتە چەپڵەکان بەخێرایی لێدەدرێن، لەکاتی هەڵپەڕکێدا ئەم گۆرانی‌یانە دەوترێن.

ب- گـۆرانی کـەمێك خێـرا، مـاوەی نێـوان چـەپڵەیەك و چـەپڵەیەکی تـر زۆرترە، وەك گۆرانی ئامە کوڵێ و فاتە کوڵێ و گوڵ یا حاجی مریەم.

### گۆرانی خاو (سیاچەمانە):

جـۆرە گۆرانی‌یـەکی میللـی تایبـەت بەناوچـەی هەورامانـە، ڕەسـەنایەتی خۆی هەیە لەناوچەکەدا، وەك مەقام وایە، وەك چۆن جاف هۆرەی هەیە، بادینان و دەشتی هەولێر لاوك و حەیرانیان هەیە هەورامانیش ئەم سیاچەمانەی هەیە.

## سیاچەمانە یان گۆرانی خاو:

خەم ڕەوێنە، دروستکەری ئەڤینی خاوێنە، دلۆڤانی و بەزەییو هەستی مرۆڤایەتی‌یە، لەسەر خۆو هێمن و بەئەسپایی گەروو خۆی خاوێن دەکاتەوە، لەگەڵ هۆزانی بەرزی بۆ سەدای دەنگی (کنا لەیل)ی هەزارانی یا (چاو ڕەشەکاڵی) سەرقافڵەی خاوی گۆرانی. ئەم گۆرانی‌یە زۆر بەئیقاعی هێواش و لەسەر خۆ دەوترێ، مرۆڤ سەرمەست و خەیاڵاوی دەکات[٥٤].

سیاچەمانە لەزمانەوانی‌دا: سیا- ڕەش، چەمانە - چاوانە، واتە چاوڕەشانە.

لەڕووی زاراوەدا، بەو ئاوازو گۆرانی‌یە کوری‌یەی هەورامان دەوترێ کەلەسەر شێوەی مەقامە.

سیاچەمانە: هۆنراوەکانی زیاتر باس لەژیان و گوزەران و سروشت و ئەوین دەکات.

هۆنراوەکانی یا فۆلکلۆرین یا هۆنراوەی شاعیرانن، وەك مەولەوی و بێسارانی و صەیدی و خاناو..تاد. گۆرانی بێژ زۆر بایەخ دەدات بەهۆنراوەی لەڕووی ناوەرۆك و ماناکەیەوە، هەروەها بۆ ئەوەی زۆر ماندووی نەکات - چونکە سیاچەمانە چڕین توانایەکی تایبەتی دەوێ - بۆیە زۆرجار دوو گۆرانی بێژ بەیەکەوە دەیڵێن تا زوو ماندوو نەبن، سیاچەمانە مێژووی سەرهەڵدانی و پەیدا بوونی نازانرێ و خاوەنی یەکەمی (ونە) وەك گۆرانی‌یە فۆلکلۆریەکانی تری کوردی، بەڵام ڕایەك هەیە:

(یوسف ئاسکە) مامۆستای قوتابخانەی سیاچەمانە بووە، نەك بەیەکەم سیاچەمانە بێژی دابنێین، چونکە سیاچەمانە لەوە کۆنترە.

یوسف ئاسکە، گۆرانی بێژی دیوەخانی (خان ئەحمەد خان)ی ئەردەڵانی بووە، خاتوو کلاوزەڕیش کەخێزانی خان دەبێت ئافرەتێکی زۆر شۆخ و شەنگ و چاوڕەش بووە، گوایا یوسف ئاسکە گۆرانی سیاچەمانە بەچاوڕەشەکانی خاتوو کلاو زەڕدا دەڵێت، لەئەنجامدا خان بەمە دەزانێت فەرمانی مەرگ بەسەر (یوسف) دا دەداو هەر بەزیندووی دەیئاخنێتە دیوارێکەوە کەبەقسڵ هەڵچنراوە، تائێستا شوێنەواری ئەم ڕووداوە لەپشت ئەحمەدئاوای سەر بەناحیەی خورماڵ ماوە[٥٥].

جاچونکە ئەو گۆرانی‌یە خاوبووە زیاتر شیعرەکانی بەسەر چاوڕەشەکانی خاتوو کلاوزەڕدا وتراون..دوای ئەوە بەوگۆرانی‌یە خاوانەیان وتووە سیاچەمانە.

سیاچەمانە جۆری زۆرە، هەرجۆرێك لەبۆنەو مەبەستێکدا وتراوە بۆنمونە:

(دەرەیی و پەسەك): باسی کەژوو کێوو باخەکان دەکات لەو شوێنانەشدا دەوترێت.

(میناداد و خواڵەداد و ئایشیێ ڕۆ): باسی زۆرداری و ستەم و بەگژا چوونی هەژاران دەکات دژ بەستەمکاران.

(ولە هەنارگیان و خاڵ سیاو لەیل و یاران یاران): باسی خۆشەویستی و وەسف دەکات.

(بادەو بادە) لەکاتی بووک گواستنەوەدا دەوترێت.

(صەیادی کەڵ کوژ): باسی ڕاووشکار دەکات.

(شێخانە): باسی ئەو پەیوەندیو خۆشەویستی‌یەی نێوان صۆفی و مورید دەکات لەگەڵ شێخەکانیاندا.

(کۆنە هەواران و ئەی وەتەن): باس لە وەتەن و دوورکەوتنەوەو غەریبی دەکات.

هەروەها بەڕێ کردنی کاروان و گەڕانەوەیان، لەپێشوازی حاجیان و بەخاك سپاردنی مردوودا بەزمی چەمەرێ وتراوە.

جۆرەکانی گۆرانی خاو بەگشتی زۆرن لەوانە:

١- دەرەیی
٢- پەسەك
٣- میناداد
٤- خواڵەداد
٥- کنالەیل
٦- ئای لەیل
٧- ولە هەنار
٨- ڕەفیق داد
٩- چیبکەم
١٠- ڕابە ڕابە
١١- وەسەت مەڕۆ
١٢- ئایشیێ ڕۆ
١٣- ئای دادە ڕۆڕۆ
١٤- خاڵ سیاو لەیل
١٥- ئەسلێ
١٦- صەیادی کەڵ کوژ
١٧- ئەی خاڵ وەی خاڵ
١٨- یاران یاران
١٩- پێچە پیچی
٢٠- بەزمی ئۆقاڵ
٢١- لاوە لاوەکە - شێخانە
٢٢- ئای مەدەد - شێخانە
٢٣- گوڵەکەم عەلی گیان -شێخانە
٢٤- دیدەم ئاخ - شێخانە

٢٥-ئاخ ئازیز – شێخانە
٢٦- سەلەسەلە
٢٧- کۆنە هەواران
٢٨- سەوزیٚ مەزەدار
٢٩- عەر عەر داد
٣٠- مەچۆ مەچۆ
٣١- هەوری لەمل
٣٢-ئۆسا ژەن
٣٣- کورپەلی قەد باریك
٣٤- تەقەی تەوەن میر
٣٥- چەمەریٚ
٣٦- سوەیبە داد
٣٧- شلێرگیان
٣٨- ڕەز بڕین
٣٩- خاڵخەنێن
٤٠- عەتیلی
٤١- نازار وەی
٤٢- بەزمی قالەمراد
٤٣- بەزمی مام حەیدەر
٤٤- بەزمی یوسوڵەی جانە
٤٥- بەزمی ئەحمەدی نازاریٚ

**گۆرانی خێرا = چەپڵە**

ئەم جۆرە گۆرانیانە بەخاو ناوترێن، بەڵکو بەخێرایی دەوترێن، وەك بەستە وایەو گۆرانیەکە کێشێکی مۆسیقای ڕێك و پێکی هەیە، دەتوانین هاوتامی بین بەچەپڵە لێدان یا هەڵپەڕکیٚ و دەپڵ و دەف و مۆسیقاو..

لەبەر ئەوەی لەهەورامانـدا زیاتر چەپڵە بەکار هاتووە لەگەڵ ئەم جۆرە گۆرانیانە بۆیە بەگۆرانی چەپڵە ناسراون.

**جۆرەکانی:**

١- شرینە و خانم
٢- گوڵەکەم نەخشانم
٣- ئامەکەو ئامینە
٤- خەجیم خەجیٚ
٥- نارنجەو نارجە
٦- بەتۆری کرد بەتۆریای
٧- خرنگەگیان خرنگە
٨- بیمارم وەی بیمارم
٩- بەرزی بەرزی
١٠- قاسمخان
١١- کاوە شنگیەنە
١٢- نارنجەو نارنجە
١٣- کەتانەو کەتانە
١٤- مینا خاتوو مینا
١٥- خاڵداری خاڵداری
١٦-هەناری گوڵ هەناری
١٧- ئای وەییە وەییە
١٨-گوڵاڵە سوورە
١٩- ئای بێنە بێنە
٢٠- هەلام هەلامە
٢١- ... تاد.

**لەگۆانی بێژەکانی هەورامان**

١- حەمـەی داد، ناسـراو بەئەسـڵی نەوسـودی، گـۆرانی ئەسـڵی بـەناوی ئەوەوە ناونراوە.

٢- حەیدەر نۆدشەیی - ناسراوە بەمام هەیەر.

٣- حەمە جافر حەمیٚ - نۆدشەیی.

٤- یوسف جانەی - دزاوەری.

٥- عەلی نەوسودی - ناسراوە بەئەلیلەی نەوسودی.

٦- ئەحمەدی نازداریٚ - بیارەیی.

٧- حەیران محەمەد کەیمنەیی -ناسراوە بەواڵە حەیرانیٚ-.

٨- عارفی چایچی - زەردەهاڵی.

٩- شەوکەت دەگاشێخانەیی.

١٠- هادی دەگا شێخانەیی.

ئەمانـە کۆچیان کـردووەو گـۆرانی تۆمارکراویـان نیـە، جگـە لـەمام هەیـەرو ئەلیلەو شەوکەت و هادی چەند شریتێکی گۆرانیان بەجیٚ ماوە.

لەگۆرانی بێژە ناودارەکانی ئێستا کەماون و گۆرانی تۆمارکراویان هەیە:

١- عوسمان کەیمنەیی - کەبەماموٚستای گۆرانی ئەم سەردەمە دادەنرێت لەهەوراماندا، لەهـەردوو جۆری گۆرانی سیاچەمانەو چەپڵەدا توانایەکی باشـی هەیە[٥٦].

٢- حەمە حسێن کەیمنەیی.

٣-شەفیع کەیمنەیی.

٤- جەمیل نەوسودی.

٥- جیهانبەخشی نەوسودی

٦- فەتحوالله ی ئەمینی جوانرۆیی

٧- تۆفیق دزاوەی

٨- عەلی گوڵپی

٩- فەرەج کەیمنەیی

١٠- سیروان حەمەحسێن کەیمنەیی

١١- مەولود شۆشمەیی

١٢-نەوزادی نەصرو بەگ - بنجەی درەیی

١٣- صەباح حەمە صالح خارگێلانەی

١٤- دارا محەمەد عوسمان بەڵخەیی
١٥- عادل ڕەحمان بەڵخەیی ناسراو بەعادل هەورامی
١٦- عیسا دشەیی
١٧- شیروان زەردەهاڵی ناسراو بەشیروان هەورامی
١٨- حسێن حەسەن خارگێلانەیی
١٩- بەهرۆز بەڵخەیی
٢٠- عەتا شەریف زەڵمی
٢١- باقی هەورامی
٢٢- ئەرجومەن دەگا شێخانەیی
٢٣- هێرش هەورامی
٢٤- ئیسماعیل هانە گەرمڵەیی
٢٥- رۆستەم کەیمنەیی

## گۆرانی بێژە تەوێڵەییەکان:

لەگۆرانی بێژە ناودارەکان کەمردوون:
١- حەمە کەریم عەبولەی قادر- گۆرانی تۆمار کراوی نیە
٢- حەمەکەریم سلێمان - گۆرانی تۆمار کراوی نیە
٣- فەرەج حەمە ئەمین - گۆرانی تۆمار کراوی نیە
٤- حسێن حەمەلاو - گۆرانی تۆمار کراوی نیە
٥- عەلی عەبدولعەزیز (عەلیە گوڵە)
٦- محەمەد مەحمود مەعروف (حەمەی مەحمود مالە)
٧- داود حەمە سەلیم
٨- حەمەی ئەلی محەمەد - گۆرانی تۆمار کراوی هەیە
٩- نەصروالله کەیکاوس ناسراو بە نەسکۆڵ لەدەنگی ڕادیۆی کوردیەکەی بەغدا گۆرانی تۆمار کراوی هەیە. هەروەها لەتەلەفزیۆنی کەرکوك لەپێشەکی تەمسیلە کوردیەکان گۆرانی ئەم لێدەدرێت.
١٠- عەزیز حەمە ئەمین (حاجی ئایزە) - گۆرانی تۆمار کراوی هەیە.

**ئەو گۆرانی بێژانەی کەئێستا بەردەوامن و گۆرانی تۆمارکراویان هەیە ئەمانەن[٥٧]:**

١- حاجی ڕەحمان فەتاح ڕۆستەم .
٢- عەلی حاجی خدر سلێمان.
٣- نەصرەدین حەمەسەلیم - ئێستا لەئەمەریکایە.
٤- دەروێش محەمەد حاجی حەمەڕەشید.
٥- عەبدوڕەحمان قادر.
٦- نوری قادر فەتاح.
٧- مالك حەمە عەلی محەمەد.
٨- عەزیز حەمە سەعید.
٩- نزار صابر فەرەج.
١٠- نەجمەدین عەلی عەبدولعەزیز.
١١- ئاوات حەمە صاڵح مەحمود.
١٢- سیروان جەلال عەبدوالله.
١٣- هەورامان عیزەت مستەفا.
١٤- ئەدهەم سوبحان جەعفەر.
١٥- یونس میرزا عەبدوالله.
١٦-نازم صابر فەرەج.
١٧-وەهبی حەمەڕەشید عەلی

**تێڕامانێك:**

**لەپێشتردا – وتمان– هونەرو ئەدەب ئاوێنەی واقعی خۆیەتی، جا هەروەك نمونەیەك ئەگەر چاوێك بەگۆرانی و شیعرە فۆلکلۆرییەکاندا بگێڕین، بۆمان دەردەکەوێت کەبەڕاستی ئەو گۆرانی و شیعرە فۆلکلۆرییانەی کەلەساڵەکانی هەشتاکاندا وتراون، هەمووی باس لەغەریبی و ئاوارەیی و چۆڵی و وێران بوونی باخ و خانووەکانی هەورامان و بەگشتی ئاهوناڵەو حەسرەت و ئاخ و داخی کۆچ و بارو دەردی سەرییەکە لێرەو لەوێ تووشیان بووە.**

**ئەو ئاهوو ناڵەو حەسرەتەش بەئاوازەکانی سیاچەمانە دەریان بڕیوەو.. گۆرانی چەپڵە لەو ماوەیە کەم وتراوە، چونکە گۆرانی چەپڵە زیاتر ئاوازی خۆشی و صەفاو زەوقە.. بەلاّم گۆرانییە خاوەکان هەموو سۆزو خۆشەویستیو موناجات و پیاهەڵدان و لاواندنەوەن، جگە لەئاوازەکانی کەخەمبارن و حەزینن، شیعرەکانی ئەو ماوەیەش یابڵێین شیعرەکانی سیاچەمانە، جیاوازن لەگەڵ شیعرەکانی گۆرانی چەپڵە. ئەمەش کۆمەڵێك شیعری فۆلکلۆرین، کەلەگۆرانی خاوو سیاچەمانەدا دەوترێن، لەو ماوەیەشدا بەزۆری لەم جۆرانەوتراون:**

شەوی تاریکە، هەساری ماتی — وەشڵەی پاشەوی، داما گەریاتی
هەورامان گردش چنوراو شەوبۆ — ئینە چن ساڵێن نەکەردەنم بۆ
ئینە نۆ ساڵین نەدیەنم بەچەم — نیمۆ عەمرەکەیم، پەیتۆ کەردەن کەم
وەتەن و ویما، بیەنا ئاوارە — کۆتا غەریبی، خاس نیگام دارە
بەتەقەی بڕنەو، هاڕەی سەلیبی — وەتەن هورکنیام، کۆتا غەریبی
وەتەن هورکنیام، تەمای دڵنیام — دەک کۆر بۆ، ئێگە، بێ تۆ چۆن ژیام
نەوسودە خەمبار، شۆشمێ ماتە — گرد بارشا کەردەن، ئینێ گەڕیاتە
چەواشە بۆ، چەرخ و زەمانە — دیدەو ڕەفیقاش، کەردەن بیگانە
شەماڵ دەخیلەن، لوەشوشمێ — دماو ڕەفیقا، شایی مەکەرمێ
شەماڵ دەخیلەن، لوە تەوێڵێ — لوە هەوارگە، هەم یانی وێڵێ
ئای پەی گەڕیاتی، هەم پەشت و حۆزی — خەزانش کەردەن، نەمەنەن سۆزی
ئای پەی مەرو، دەرەو زاوەری — هامنۆ چۆلاّ، باوەڕ مەکەری
کوەکی شاهۆی، ئۆبەراو بەرم — تیری غەریبی، دانش جگەرم
ئاکەشە سەختە، ئا هۆرامانە — گردش نمونەو بەهەشتیمانە
زامانم سەختا، دەردم بی دەرمان — دریا نۆ جەرگم، تیری هۆرامان
ئاهۆرامانە من گەڕیام پێدا — ئاد هەر باقیا، من شیم لەرێدا

یێکەس و غەریب، ئەرامەندەوێم      جەوەتەن برشیام، پەڕاکەندە وێم

دەرونم بیەن، بەگومەلێڵی      پەی ئاوارەکا، دەرەو تەوێڵی

هەی داد هەی بێداد، حەشر هەڵساوە      ماجەرای گەردوون، لای من ڕووی داوە

غەریب و غەمبار، کوچەی شارانم      وێڵ و دەربەدەر، دوور جەیارانم

کەسی فرینی، چون گەلاّی داران      کەسی بەمن چیش، وێڵم جەشاران

هەرکەسێو کەرو، غەریب نەوازی      بێشک خواوەن، بوش چنە ڕازی

سەریاس غەریبم، قەدرم بزانە      قەدری غەریبان خەیلێ گرانە

وەختێ بەرکۆتا، بژناسە دەنگم      تۆزی غەریبی، نیشتەن ئۆ ڕەنگم

غەریبی شارا، هەر پەی وێم خاسا      خۆراکم خەماو، بەرگم پەلاّسا

غەریب غەریبا، غەریب دیارا      یانۆ غەریبا، گۆشەو کەنارا

غەریب ئانە نیا، ملورە یەمەن      غەریب ئانەنە، ملۆ تۆی کەفەن

بامن هورکێشو، هەناسانی سەرد      پیری وێش ئاما، جوانیەکەیم ویەرد

وەتەن ئەی وەتەن، مایەو خەفەتیم      ئینە چن ساڵێن، ئامان نەگبەتیم

ئاخ لەبانی ئاخ، ئێش لەبانی ئێش      دەردی هۆرامان، قەد نابێ سارێژ

من کورە هۆرامی، بەچنور پەروەردە      ئیسە جەگەرمیان، سەبونی بەردە

سورە هەراڵە چنور خیزیان      شارەزوور گەرما، پۆکەیم بێزیان

هامنا گەرما وەهار سەرشیەن      قلی قای بەردە، دڵ غەمگین بیەن

حەکیم ئامانە، دەردما گرانە      سەیری هۆرامان بۆمان دەرمانە

تەرسو مرونە، بیابان بۆ جێم      ڕفیقی بەیا، نەزانا من کێم

هەلاّلە برەمی، ولیش کەردینی      وەشلەی پانیشا، وەتەن مەردینی

ژەرەژ نەبینی، قەفەز کریانێ      بولبول نەبینی، وەتەن بڕیانێ

نێرگز کەرونە، پێشوازی وەهار      ئاوەختە وەشا، بلمێوە هەوار

ئاوەختە وەشا، بلمێ ڤیاری      هەلاّلەو دەرەی دۆوە دیاری

یاخوا هۆرامان! بەرز بۆنە پایەت      هەزار پیسەو من، بنیشا سایەت

تازە وەرکۆتەن، پایین و کەشا      هۆرامان گردش، ماچی بەهەشتا

## شانۆو شانۆگەرەکان[٥٨]

* بۆیەکەم جار لەساڵڕۆژی چوونە سەر تەختی مەلیك فەیسەڵی دووەم لەساڵی ١٩٥٧دا لەبازاڕی تەوێڵەدا شانۆگەری‌یەکی گاڵتەجاڕ، نمایش کراوە کەئەکتەرەکان ئەمانە بوون:

- صادق غەنی – دەوری ورچی بینیوە.. مردووە.
- حەمەسەعید حەسەن ناسراو بە –خیشە– دەوری ورچەوان...مردووە.
- حەمە لەتیف سلێمان.. مردووە.

* لەساڵی ١٩٥٩دا لەساڵڕۆژی ١٤ی تەموزدا، شانۆگەریەك لەسەر کێشەی دەرەبەگ، پێشکەش کراوە، کەئەمانە دەوریان تیا بینیوە: – عەلی قادر ئاغا – بارام سەعدی بەگ – حسێن محەمەد غەفور – جەمال سەعید سێلە – ئەحمەد حاجی عەلی – عوسمان محەمەد صالح ناسراو بە (عوسمان هەورامی)

* لەساڵی ١٩٦٣دا شانۆی (نرخی ئازادی) پێشکەش کراوە کەلەنووسین و دەرهێنانی مامۆستا ساجد ئاوارە کەئەو کاتە لە تەوێڵە مامۆستا بووە، ئەکتەرەکان:

- پرشنگ جەمال خەفاف – جەلال جەمال خەفاف – بابا محەمەد شێخۆ
- ئەیوب ڕۆستەم – دەوری منداڵێکی گوڵە بەڕۆژە فرۆش دەبینێ لەتەمەنی نۆ ساڵیدا، هەروەها چەند قوتابیەك.

لەمەودوا جموجوڵی شانۆ، وەستا لەبەر بارودۆخ تاساڵی ١٩٧٠.

* لەساڵی ١٩٧٠ مانگی تەموز، تیپێك دروستکراوە بەناوی (تیپی شانۆی تەوێڵە) ، بەڕێوەبەر – ئەیوب ڕۆستەم.

بەشدارانی تیپ:

- جەعفەر عەبدوالله – ئادەم محەمەد – حەمەصاڵح تۆفیق – نیازی عیزەت – طاهر عەبدوالله

سەرجەم ئەندامەکان (٢١) ئەندام بوون، بەڵام ئەم شەش کەسە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر بوون.

ئەم تیپە بۆیەکەم جار، لەساڵی ١٩٧١ شانۆگەری (سەفەرێك بۆ حەج)ی نومایش کرد، لەنووسین و دەرهێنانی بەڕێز ئەیوب ڕۆستەم بوو. ئەکتەرەکان: – ئەیوب ڕۆستەم– عەدنان شەفیع – عوسمان کەریم – شێرزاد حەمە سەلیم – ئادەم محەمەد – مالیك حەمەعەلی – حەمەصاڵح تۆفیق – ڕزگار ڕۆستەم– عوسمان عەبدوالله.

* لەساڵی ١٩٧٢ شانۆگەری (کاوەی ئاسنگەر) نوسینی میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی. ئەکتەرەکان:

– میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی (کاوە) – ئەیوب ڕۆستەم (زوحاک) – عەدنان شەفیع – سۆران ئیسماعیل – حەمەصاڵح تۆفیق – نیازی عیزەت – ئادەم محەمەد – شەوکەت حەمەصاڵح – داود حەمەکەریم – ڕەحمان فەتاح – صابر مەحمود – ڕزگار ڕۆستەم – نوری قادر – کەمال حەمەسەعید – مالیک حەمەعەلی – مەحمود بەڵخەیی – بەیان عیزەت.

ئەم شانۆگەریە زیاتر لە (٤٢) ئەکتەر ڕۆڵیان تیا بینیوە، گەورەترین و

شانۆگەری کاوەی ئاسنگەر - بازاری تەوێڵە - ٢٤ / ٣ / ١٩٧٢

بەهێزترین شانۆیی بووە، لەتەوێڵەدا نمایش بکرێت کەلەناوەڕاستی بازاڕی تەوێڵەدا، جەماوەرێکی زۆر کۆ بوو بوویەوە بۆ سەیرکردنی. هەمان شانۆ بەهەمان تەشکیل بێجگە لەگۆڕانی دەوری (ئەیوب ڕۆستەم) بە (ناصر عەزین) بۆ دەوری زوحاک لەنەورۆزی (١٩٧٣)دا، دووبارە کرایەوە.

ئالێرەدا جێگای خۆیەتی یادێکی میرزا محەمەد مەنگوڕی بکرێت.

**کورتەیەك لەژیاننامەی میرزا مەنگوڕی[٥٩]:**

– لەساڵی ١٩١٠ لەقەڵادزێ چاوی بەژیان هەڵهێناوە.

– لەساڵی ١٩٣٥ بەشداری دامەزراندنی حیزبی خوێنڕێژی کردووەو ئەندامی حیزبی (برایەتی)یش بووە[٦٠].

– لەساڵی ١٩٤٥ بەشداری کۆماری مەهابادی لەکوردستانی ئێران کردووە.

– لەساڵی ١٩٤٨ گەڕاوەتەوە سلێمانی و بووە بەفەرمانبەر.

– لەساڵی ١٩٥٢ چۆتە ڕانیەو لەوێ نیشتەجێ بووە.

– لەساڵی ١٩٧١ لەسەر چاپکردنی کتێبی (گەشتی ئەستێرەی مەریخ) گواستراوەتەوە بۆ تەوێڵە.

– لە ١٩٧١/٦/٦ لەتەوێڵە چووەتە سەر ئیشەکەی (محاسب و ملاحظ)ی شارەوانی تەوێڵە بووە، ئیتر جگە لەو ماوەیەی کەلەساڵی ١٩٧٤ چووەتە ئێران وەك پەناهەندەیەك ...هەر لە تەوێڵە ژیاوە، تاوەکو ١٩٧٦/١/١ خۆی خانەنشین دەکات و دێتە سلێمانی دادەنیشێ.

بازاڕی تەوێڵە - نەورۆزی ١٩٧٣

– لە ١٩٨٨/١/١٣ لەتەمەنی ٧٨ ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات و لەگردی سەیوان لەسلێمانی بەخاك دەسپێررێ‌و، لەساڵی ١٩٩٢ لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمەکەی دەبرێتەوە بۆ سەر شاخی (کێوەڕەش) لەڕانیە.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی:**

-چیرۆکی ماهراکۆ، چیرۆکی فەیرۆزخانی پشکۆ، زێڕینای ئامێدی، بوکێکی ناکام و گەشتی ئەستێرەی مەریخ.

لەدوای خۆیشی (دوو بەرگی بەسەرهاتی سیاسی کورد) و (بەسەرهاتی مەنگوڕی) لەکوردستانی نوێ بە (١٠) بەش - چاپ و بلاوکراوەتەوە- گەلێك بەرهەمیشی هەیە کەچاپ نەکراون.

- لە ١٩٨٠/٣/٢٠ میرزا لەئێستگەی کوردی بەغدا گفتوگۆیەکی لەگەڵدا ساز کراو، بەسەرهاتی ژیانی خۆی گەلێك باس کردو، پاشان باسی نەورۆزی شارۆچکەی تەوێڵەی کرد کەچۆن ئاگر لەسەر بانەکان دەکەنەوە، وتی: جوانترین دیمەنی نەورۆز ئەو دیمەنە بووە، بەلامەوە، کەلە تەوێڵە بینیومە، .. هەروەها دەیوت من هەرچەندە بۆ تەوێڵە نەفیان کردم، بەلام لەڕاستیدا بەبۆنەی ئەو چالاکی‌یە هونەری‌یەو بەهۆی جوانی دیمەنی شارۆچکەکەو، ئاوو هەواکەیەوە خۆشترین کات و وەختم بووە.. ئەگەر بەبۆنەی منالەکانمەوە نەبوایە کەقوتابی بوون نەئەهاتمەوە سلێمانی و هەر لە تەوێڵە دەمامەوە(٦١).

* * *

* لەساڵی ١٩٧٤ شانۆیی (کابتن ئای) نووسین و دەرهێنانی ئەیوب ڕۆستەم کرا، ئەکتەرەکانی:

- ئەیوب ڕۆستەم - ئادەم محەمەد - نیازی عیزەت - قازی عیزەت- .. هتد.

* لەساڵی ١٩٧٤ شانۆیەك کرا بەناوی (وزەی بیرو بازوو) لەلایەن کۆمەڵێك لەهونەرمەندانی هەڵەبجەوە لەوانە:

- غازی مەلا عەلی - نیهاد و نەجات (دوو برا بوون) ئەم شانۆیە لەنوسینی (محەمەد غەفور شەریف).

* لەساڵی ١٩٧٥ شانۆگەری (ڕێگای نیشتمان) نووسین و دەرهێنانی مامۆستا فەرەج قابلەمە کەخەڵکی سلێمانی بوو. ئەکتەرەکان:

- ئەیوب ڕۆستەم - حەمەصالح تۆفیق - صەباح جەمال - عومەر نافع - صابر وەسیم ... هتد.

* لەساڵی ١٩٧٨ شانۆیی (پیاوێکی ڕەزیل) نووسین و دەرهێنانی (فەرید جەمال) لەئەشکەوتەکانی خانەقا پێشکەش کرا. ئەکتەرەکان:

- فەرید جەمال - بەهرۆز عابد - حەیدەر مەجید - ئەیوب فەتحوالله.

* لەوە بەدواوە جموجوڵی شانۆیی لەبەر بارودۆخ وەستاو، شەڕی عێراق ئێران دروست بوو، خەڵکی بەرەو شارەکان هاتن.

لەدوای ڕاپەڕین دەست کرایەوە بەدروستکردنی لیژنەیەك بەناوی (لیژنەی سەرپەرشتی کارە هونەریەکان) بەڕێوەبەر بەڕێز ئەیوب ڕۆستەم بوو لیژنەکەش لەئەمانە پێکهێنرا:

- جەلال باباڵە - ئیمام باباڵە - فەرەج حەمەڕەحیم - سۆران ڕەحمان.

بەرهەمی ئەو لیژنە لەو ساڵەدا شانۆیی (هەنگاو) نووسین و دەرهێنانی یاریدەدەری پزیشکی یوسف عیزەدین سلێمانەیی بوو، ئەکتەرەکانی:

- صەباح جەمال - هاژە (خێزانی یوسف) - جەلال باباڵە - سەرتیپ صابر - تەحسین محەمەد - گوڵاڵە عەبدوالله - (س) کچی فائق فەتحوالله.

* لە ١٩٩١/٨/٢٠ دا ئاهەنگێك سازکرا کەتێیدا دوو شانۆیی پێشکەش کرا، یەکێکیان: گاڵتەجاڕیەکی کورت بوو (دیمەنێك لەچایخانە) نووسین و دەرهێنانی (ئەیوب ڕۆستەم). ئەوی تریان شانۆیی (خۆر هەڵاتن) نووسینی م . شفیق محەمەد و دەرهێنانی ئەیوب ڕۆستەم. پاشان بوو بەدوو تیپ:

- تیپی هونرەی هەورامان کەئەمانە دەستەکەی بوون: ئەیوب ڕۆستەم، صەباح جەمال، سەرکەوت حەمەحسێن.

- تیپی شانۆی شەهید نیازی کەدەستەکەی ئەمانە بوون: ئادەم محەمەد، ئەختیار عەزیز، حەیدەر مەجید.

لەبەرهەمەکانی تیپی هونەری هەورامان:

- (دیمەنێك لەدائیرە) نووسین و دەرهێنانی: ئەیوب ڕۆستەم.

- (ئاوێنە) نووسین و دەرهێنانی: صەباح جەمال.

- (بانێکەو دوو هەوا) نووسین و دەرهێنانی: ئەیوب ڕۆستەم.

- (سەگ بیمەی بێکاریە) ئامادەکردنی: موەفەق لهۆنی، دەرهێنانی: ئەیوب ڕۆستەم.

دوای دروستبوونی یەکێتی هونەرمەندانی یەکگرتووی کوردستان، توانرا هەردوو تیپەکە لەلیژنەی هەورامانی ئەو یەکێتی‌یەدا کۆبکرێتەوە. دەستەی لیژنەکە:

- ئەیوب ڕۆستەم - لێپرسراوی لیژنە.

- جەلال باباڵە - سکرتێر.

- سەریاس جەبار سەعید - ژمێریار.

- سەرکەوت حەمەحسێن - ئەندام.
- ئەختیار عەزیز- ئەندام.

بەرهەکانی:

- (سۆزو پەشیمانی) ئامادەکردنی: ئەیوب ڕۆستەم، دەرهێنانی: لوقمان عەزیز. پاشان لەبەر بارودۆخەکە شانۆییەکانی گواستەوە بۆ هەڵەبجەی تازە. لەوانە: (پەیامی مرۆڤایەتی، کەرنەڤاڵ) بەهاوکاری هونەرمەندانی لیژنەی ناوچەی شارەزوور، لەنوسین و دەرهێنانی ئەیوب ڕۆستەم. لێرەدا بەپێویستی دەزانین کەکورتەیەك لەژیانی بەڕێز مامۆستا ئەیوب ڕۆستەم بخەینەڕوو.

**ئەیوب ڕۆستەم**(٦٢):

ژیانی لەچەند دێڕێکدا:

- ناوی: ئەیوب کوێخا ڕۆستەم کەریم ڕۆستەمە.
- ساڵ و شوێنی لەدایك بوونی: ١٩٥٤ تەوێڵە.
- خوێندنی: پەیمانگەی ڕاهێنان و ڕێنمایی کشتوکاڵی.
- باری خێزانی: خێزاندارەو چوار منالّی هەیە.
- دەستپێکرد بەکاری هونەری ١٩٧٠.
- لەم بەرهەمە شانۆییانەدا بەشداری کردووە:

١- شانۆیی کچ بۆ فرۆشتن - نووسین.

٢- شانۆیی سەفەرێك بۆ حەج - نووسین و دەرهێنان و نواندن.

٣-شانۆیی عەزە فریام کەوە، نووسین و دەرهێنان و نواندن.

٤-شانۆیی کاپتن - A- دەرهێنان و نواندن.

٥-شانۆیی لەڕێگەی نیشتماندا - نواندن.

٦-شانۆیی کاوەی ئاسنگەر - نواندن.

٧-شانۆیی خۆرهەلاّتن - دەرهێنان.

٨-شانۆیی دیمەنێك لەدائیرە نووسین و دەرهێنان.

٩-شانۆیی بانێکەو دوو هەوا -نووسین و دەرهێنان.

١٠-شانۆیی ئاوێنە - نواندن.
١١-شانۆیی سەگ بیمەی بێکاریە - دەرهێنان و نواندن.
١٢-شانۆیی سۆزو پەشیمانی - ئامادەکردن.
١٣-شانۆیی ئەو جیهانە خەون نیيە - ئامادەکردن و دەرهێنان.
١٤-شانۆیی کەرنەڤاڵ - نووسین و دەرهێنان.
١٥-شانۆیی مەرگەساتی پەپولەکان - نووسین.
١٦-شانۆیی بەسەرهاتی تارمایییەکان - نووسین و دەرهێنان.
١٧-شانۆیی دێوی عاشقان - نووسین و دەرهێنان و نواندن.
١٨-شانۆییقەل و ڕووتە - دەرهێنان.
١٩- شانۆیی خاك دەمێنیٚو درەخت نامریٚ - نووسین و دەرهێنان.

ئەم بەڕێزە شان بەشانی بواری هونەری لەبواری ڕۆشنبیریشدا چالاکی نواندوە، تا ئێستا دەیان کۆڕو سیمیناری بەستووەو لەچەندین مونازەرەدا بەشداری کردووە لەبوارە جیاجیاکانی - سیاسی - فیکری - ڕۆشنبیری گشتیدا، هەروەها چەند نامیلکەیەکیشی بەچاپ گەیاندووە، لەوانە:

١- دەروازەیەك بۆ سۆسیال دیموکرات.
٢- عەلمانیەت.
٣- عەولەمە شۆڕشی عەقڵەکانە.
٤- کتێبی وەڵام بۆ (١٠٠) پرسیار بەبەشداری بەڕێز عەلی حاجی فەرەج.

لەبواری کارکردن لەڕادیۆو تەلەفزیۆندا کاری کردووە بەم شێوەیە:

١) ئامادەکردن و پیشکەش کردنی بەرنامەیەکی هەفتانە بەناوی (وەشەن هەورامان) ماوەی پێنج ساڵەو تائێستاش بەردەوامە، لە دەنگی گەلی کوردستان،.

٢) ئامادەکردنی بەرنامەی (هەوارگەی شیعر)و بەشداری کردن لەپێشکەش کردنیدا بۆ ماوەی (١٨) مانگ (دەنگی گەلی کوردستان).

٣) ئامادەکردنی بەرنامەی (لاپەڕەیەك لەمێژوو)ماوەی زیاتر لەسیٚ ساڵەو تا ئێستاش بەردەوامە. (دەنگی گەلی کوردستان).

٤) ئامادەکردنی بەرنامەی (فەرهەنگی زانیاری) ماوەی زیاتر لەسیٚ ساڵەو تا ئێستاش بەردەوامە. (دەنگی گەلی کوردستان).

هەروەها چەند بەرنامەیەکی تایبەتی بەهونەرو مێژوو لایەنەکانی تری ژیانی خەڵکی هەورامان ئامادەکردووە، کەئەم بەرنامانە زیاتر لەجەژنەکان و بۆنەکاندا پیشان دراون.. لەوانە:

١- لەساباتی هونەری هەوراماندا - (١٤٠) دەقیقەیە بەسێ ئەڵقە.
٢- بەرنامەی تایبەت بەسیاچەمانە - ٤٥ دەقیقە بەیەك ئەڵقە.
٣- شەوانی جەژن - ٥٠ دەقیقە بەیەك ئەڵقە.
٤- نەورۆزی هەورامان - ٩٠ دەقیقە بەیەك ئەڵقە.
٥- چەژنی هەورامان - ٩٠ دەقیقە بەدوو ئەڵقە.
٦- شۆچەرۆ هۆرامانی - ٩٠ دەقیقە بەدوو ئەڵقە.
٧- هەوای کەمالاً - ٩٢ دەقیقە بەدوو ئەڵقە.
ئێستاش ئەم دوو کتێبەی ئامادەن بۆ چاپ:
١- مێژووی هەوارگەکانی جاف و شارەزوور.
٢- مێژووی حوکمڕانی هەورامان.
هەروەها ناوبراو کارگێڕی مەڵبەندی ڕۆشنبیری هەورامان و لێپرسراوی هونەرمەندانی هەورامانە.

*          *          *

وەرزش و تیپەکان[٦٣]:

لەڕاستیدا وەرزش لەشوێنە شاخاویەکاندا وەك شارۆچکەیەکی تەوێڵە لاواز دەبێت، چونکە:

- خودی ئیش و کاری خەڵکەکە بۆخۆی وەرزشە، هەموو جموجوڵ و هاتووچۆیەك هەر سەرکەوتن و دابەزینە، لەبازاڕەوە بۆ خانووەکان و لەخانووەکانەوە بۆ بازاڕو .. هتد. وەرزشە، ئەمە لەلایەك.

لەلایەکی ترەوە نەبوونی شوێنی گۆڕەپان بۆ یاری کردن خۆی بۆخۆی کێشەیە، تەوێڵە شوێنێکی فراوانی وای نییە یاچەند شوێنێکی وای نیە، تیپێك یان چەند تیپێك دابمەزرێن.. ئەو شوێنەش کەئێستا هەیە شوێنی ئوتێلەو ئوتێلەکە ڕووخاوەو دروست نەکراوەتەوە.

وەرزش لەپێش ڕاپەڕینەوە مەگەر لەقوتابخانە یا لەناو باخەکاندا کرابێ.. لەدوای ڕاپەڕینەوە لەخوار خانەقاوە شوێنی ئوتێلە سیاحیەکە پاك کرایەوەو کرایە گۆڕەپانی یاری کردن.

ئیتر چەند تیپێك دامەزران لەوانە:

تیپی وەرزشی چیا، لەلایەن فاروق ئەحمەدەوە، تیپی وەرزشی ئاوێسەر، لەلایەن ستار مەجیدەوە، دوایی شوان حەمەسەعید کرایە سەرۆکی تیپەکە،

تیپی وەرزشی لاوانی شەرام، لەلایەن چەند گەنجێکەوە، دوایی بوو بەتیپی وەرزشی دواڕۆژو هێمن محەمەد کرایە سەرۆکی، تیپی وەرزشی شاڵاو لەلایەن نیعمەت هادی‌یەوە، تیپی وەرزشی زانیار دوایی بوو بە هەورامان لەلایەن ناجح حاجی ئەحمەدەوە، ئەم تیپە یەکێکە لەتیپە بەهێزەکان، ئێستا شاخەوان فەرەج بەڕێوەبەرێتی. تیپی وەرزشی ڕابەر، لەلایەن فکرەت نەصرەدینەوە. تیپی وەرزشی دەریا لەلایەن عەدنان ئیسماعیلەوە.

ئێستا (٢٠٠٢) شاخەوان فەرەج محەمەد بەڕێوەبەری یانەی وەرزشی هەورامانە، دەڵێ: (ئێستا یاری تۆپی پێ‌ی پلە (١، ٢، ٣، ٤)مان هەیە، هەروەها باڵەشمان هەیە، ژمارەی یاری چی‌یەکانمان (٨٥) یاریزانەو (٢٠) یاریزانی باڵەشمان هەیەو بەنیازین یاری تێنسیش بکەینەوە.

خولی تایبەتیشمان بۆ کراوەتەوەو لەو خولەشدا (١٢) تیپ بەشداری‌یان کردووە، کەتێیدا یانەی وەرزشی هەورامان بەپلەی یەك سەرکەوتووە).

ئەوەی شایانی باسە: ئەم ماوەی ڕابردووە چەند خولێکی تۆپی پێ کراونەتەوە لەلایەن تیپەکانەوە، هەروەها چەند خولی یاری (ماراسۆن)یش لەبەڵخەوە بۆ تەوێڵە کراونەتەوە. جگە لەمەش ماوەتەوە ئەوە بڵێین .. لەڕاستی‌دا ئەم ماوەی ڕابردووە بەبۆنەی بارودۆخەکەوە تیپەکان بەتەواوی جێگیر نەبوون و گۆڕانکاری‌یان جارجارە بەسەردا دێت.

* * *

### هەڵپەڕکێ‌و چۆپی کێشەکان

هەڵپەڕکێ:

هەڵپەڕکێ یەکێکە لەو کەلەپوورە کۆن نەبووەی کورد، کەهەر لەزووەوە هەبووەو ئێستاش لەبرەودایە، هەڵپەڕکێ شێوەیەکی سەماکاری مۆسیقا ئامێزی کوردەواری پێوەیە، کەهەر هەڵپەڕکێ‌یەکی کوردی، خاوەنی ئیقاعێکی تایبەتی و ئاوازی تایبەتی خۆیەتی.

هەڵپەڕکێ‌ی هەر ناوچەیەك دەربڕین و ئاوێنەی ژیانی ئەو میللەتەیە لەو ناوچەیەی خۆی‌دا.

ژمارەو جۆری هەڵپەڕکێ‌ی کوردی لە کوردستاندا زۆرە[٦٤]، لەهەر ناوچەیەکی کوردستاندا، چەند جۆرێك لەهەڵپەڕکێ باون، لە تەوێڵەشدا زیاتر ئەمانە باون:

(چەپێ)، (یەك پێیی، فەتاحیشی پێ دەڵێن)، (سێ پێیی)، (دیدەکانی) واتــە: دیلانــێ، وەك دیلانــێ وایــە، دێــن و دەچــن، زیــاتر لەســەرەتای هەڵپەڕکێکانەوە ئەم جۆرە هەڵپەڕکێیە دەکەن، بۆ گەرم بوون، (لەمەنەوشانی) ئەمیش بەسك و بەشان، سك دەردەپەڕێنی و شانیش هەڵدەتەکێنی، هەروەها (شێخانە)ش هەیە کەزیاتر صۆفی یەکان لەسەرەتای حال کردندا دەیکەن.

دەتوانین بلێین لە تەوێڵەدا چەپێ لەهەموویان زیاتر بەناوبانگە، پیاو ماقوڵان و ژنان زیاتر ئەم هەڵپەڕکێیە دەکەن، یەك پێیی و سێپێیی زیاتر گەنجانەیەو گەنج زیاتر پێی هەڵدەستێ، چونکە خێرایەو ماندوو بوونی تیایە.

بازاڕی تەوێڵە - بەهاری ١٩٧٢

ئەوسا لەناو بازاڕی تەوێڵەدا دوو سێ ڕیز هەڵپەڕکێکەران، دەوەستان و بەنۆرە گۆرانی بێژو شمشاڵ ژەن و دەهۆڵ لێدەرەکان، گەرمیان دەکرد.

لەبۆنەکاندا لەگۆرەپانی بازاڕی تەوێڵەدا، خەڵکی کۆ دەبوویەوەو هەڵپەڕکێ گەرم دەبوو.. بەتایبەت لەبۆنەی نەورۆزو (١١)ی ئازارو (١٤)ی تەموزدا.

بازاڕی تەوێڵە - ١١ی ئازاری ١٩٧٢

لەکاتی هەڵپەڕکێ کردندا، لەبازاڕی تەوێڵە خەڵکی لەدەوروبەردا دەوەستان و سەربانی قاپی و قەیسەری و سەعدی بەگ و سەر دوکان و خانووەکان، ژنان و منالآن دادەنیشتن بۆ سەیرکردنی هەڵپەڕکێکەران.

ئەوەی شایانی باسە: کەم سەیران بکرێت لە تەوێڵەدا، هەڵپەڕکێی تیانەبێ، بەڵکو مەرجە کەسەیران بکرێت لە تەوێڵە دەبێت بۆ (تەلانی باخێك یا لاسی شاخێك) بڕۆن تاشوێنی هەڵپەڕکێی تیا بێت.

ئەوانەی جوان هەڵپەڕیون و ناسراون لە تەوێڵەدا زۆرن لەوانە:

- کەریم یار ئەحمەد - حەمەلەتیف سلێمان - حامد لاوە - حەمەکەریم سلێمان - باقی حەمە ئەمین - کوێخا نەزهەت عەلی محەمەد - حەمەصالح عەبدولحەکیم - جەمیل ئاغە جافر - سەعید وەیسی - حاجی ئەبوبەکری حاجی حەسەن - باسام نەصروالله - حاجی ئەبوبەکری عەلی - حەبیبە الله حەمەئەمین - تۆفیق وەستا حەمە ئەمین - یوسف حەمەحسێن - کوێخا حەمەسەلیم حەمەڕەزا - حەمەڕەئوف هۆمەر - محەمەد حەمەڕحیم (دارا بەگ) - حاجی عیزەت حەمەسەعید قادر - مەحیەدین حەمەسەعید.

- نەصرەدین حەمەسەعید - نەصرەدین کەریم یار ئەحمەد - ستار کەریم یار ئەحمەد - سەعید حاجی محەمەد.

کۆمەڵێك گەنجی تەوێڵە - چوون بۆ سەیران بۆ لێژلە - ١٩٧٦/١/٢٩

**تە پڵ لێدەرەکان:**

- حەمەکەرەم خاڵە - دەروێش محەمەد حاجی حەمەڕەشید - هادی حاجی ئەبوبەکر - ئەبوبەکر باسام - نادر مەحمود ناسراو بەناڵە ئاسەوان - ئیبراهیم حەمەحسێن - عەلی عەلی (عەلیە سانە) - سەید حەمەئەمین (حەماڵ)

**دەهۆڵ لێدەرەکان:**

- ئەبوبەکر باسام
- عەلی عەلی (عەلیە سانە)

**شمشاڵ ژەنەکان:**

- فەرەج خالد - ڕەشید حەمەسەلیم ڕۆستەم - عوسمان جافر مەحمود - حەمەصالح تۆفیق - محەمەد الله کەرەم - حسێن عەبدولحامید - ئیسماعیل حاجی محەمەد ڕەحمان.

* * *

**چاوگێڕانێکی خێرا بەڕۆژنامەی خورماڵ دا[٦٥]:**

ئەگەر بەخێرایی چاوێك بگێڕین بەڕۆژنامەی خورماڵ دا، هەندێك زانیاریمان دەست دەکەوێت، سەبارەت بە تەوێڵەو دەڤەری هەورامانی عێراق، کەوەك شتێکی مێژووی ئەو زانیاریانە خراپ نین و بەڵکو سود بەخشن، بۆیە لێرەدا دەینوسین.

ڕۆژنامەی خورماڵ، لەخورماڵ دەرچووە، کارگێڕی ناحیەی خورماڵ کە(شاکر فەتاح) بووە، بەیارمەتی و پشتیوانی مەلا خالد، پێش نوێژی مزگەوتی خورماڵ و شێخ محەمەد حیلمی برین پێچ دەری کردووە.

ئەم ڕۆژنامەیە یەکەم ژمارەی لە ١٩٤٠/٦/٣ دەرچووە، وەئەخیر ژمارەشی کەژمارە (٢٤)ە لە ١٩٤٠/٩/٢٤ دەرچووە، لەدوای ئەم بەروارە (شاکر فەتاح) براوە بۆ سەربازی و کەسی تر نەبووە سەرپەرشتی بکات و بڵاوی بکاتەوە.

ئێستا هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەکە کۆکراونەتەوەو وەك نامیلکەیەکی خنجیلانە لەکتێبخانەکاندا هەیە، ئەمەش هەندێك لەو زانیاریانە:

- لە (ل٣)دا لەپێشەکیدا دەڵێ: (.. گوندی خورماڵ خۆ بچوك بوو، هەر پەنجا شەستماڵێك دەبوو، بەلام لادێکانی خورماڵ، زۆر گەورەو ژمارەیان لە (٧٠-٨٠) گوندێك بوون، کە (١٥٠٠٠) پانزە هەزار کەسێك بوون.

- لە (ل٤)دا دەڵێ: (لەهەموو لادێکانی دا سێ خوێندنگاو سێ نەخۆشخانەیان هەبووە، سێ دەردیان هەبووە، هەژاری، نەخۆشی، نەخوێندەواری.. تائەندازەیەکی باش لەچاو گوندەکانی تری کوردستاندا، دێیەکانی هەورامان، بەتایبەت تەوێڵەو بیارەو باخەکۆن، پێشکەوتوو بوون، لەپیشەسازی و بازرگانیو باخ بەرهەم هێنان و خانوو بەرەدا. لەڕاستیدا لەم ڕووەوە سەرۆکە بەگ و شێخەکانیان دەستێکیان هەبووە لەمەدا.. جۆرە ئارامیو ئاسایشێکیان بۆ ئەو دێیانە دامەزراندبوو، بەهۆی ئەوەوە دەیانتوانی بازرگانی لەگەڵ براکوردەکانی ئێران دا بکەن و دەوڵەمەند بن..)

- لە (ل٦)دا دەڵێ: (.. لەخورماڵ خوێندنگایەکی شەوم کردەوە، بۆ بەرەنگاری نەخوێندەواری، لێرەدا بەپێویستی دەزانم سوپاسێکی پڕ بەدڵی (شێخ حیسامەدین) بکەم کەلەخانەقاکەدا، ژوورێکی دامێ، هەروەها هەندێك دارو هەندێك پارەیشی دامێ، کەژوورەکەی پێ چاك بکەم و پڕی بکەم لەکورسی و مێزوو تەختە بۆ ١٦ شاگرد، دوای شێخیش کوڕەکەی (شێخ محەمەد) بۆ باخچەی ڕۆژنامەکە یارمەتی دام، .. بەپارچەیەك زەوی‌و ئاوو دارێکی زۆر..)

- لە (ل١٤) دا دەڵێت: (.. فەرمانڕەوایی عێراق لە ١٩٤٠/٥/٣٠ دا بە (مستەفا بەگی جافر سوڵتان) ی گەیاند کەئیتر دەتوانێ بچێتەوە (دەرگا شێخان) و لەوێ تەماشای کاروباری خۆی بکات.)

- لە (ل٨٨)دا دەڵێ: (سەرۆکی تەندروستی سلێمانی چووە بۆ تەوێڵە، لای کوێخا محەمەد دەستی گرتبووەوە .. - وادیارە دەستی شکاوە، (نوسەر)- لەم ڕۆژانەدا بە(٩) ئۆتۆمۆبیل لەگەڵ پزیشکی هەڵەبجەدا گەڕانەوە هەڵەبجە لەوێشەوە بۆ سلێمانی.

لەهەمان لاپەڕەدا دەڵێ: (.. لەم ڕۆژانەدا لەلایەن قائمقامی هەڵەبجەو کارگێڕی خورماڵەوە، ڕێگای ئۆتۆمبێلی هەڵەبجەو بیارە چاك کراو تەخت کرا.

- لە (ل ١١٢)دا دەڵێ: (.. نوسیاری باڵباز خانەی خورماڵ - عەباسی سەعەدز کوژ- گوێزرایەوە بۆ تەوێڵە.)

لەخۆزگەکانی ڕۆژنامەی خورماڵ، ژمارە (١٨) بەرواری ١٩٤٠/٨/٢٦ ئەمەی خوارەوەن:

- خۆزگە.. ڕێگای خورماڵ و تەوێڵەو ، خورماڵ و زەڵم، وا تەخت دەکرا بۆ ئۆتۆمبێل بشێت.

- خۆزگە .. خورماڵ بەهەڵەبجەو تەوێڵەو بیارەوە بەتەلەفۆن دەبەسترا.

- لە (ل ١٤٠)، ژمارە ٢٠ لە ١٩٤٠/٩/٥دا دەڵێ:

(ئەحمەدی غەفور) فەرمانبەری ئازووقەی تەوێڵەو (سەید ئەحمەد) فەرمانبەری گومرگی تەوێڵە، بۆ سەرلێدانی کارگێڕی لادێی خورماڵ، دوو شەو لەخورماڵ مانەوە، کارگێڕی لادێی خورماڵیش لەگەڵیاندا چووە بۆ هەڵەبجە..

لە (ل١٦٦)دا دەڵێ: (.. لە(قادر کەرەم) و (چەمچەماڵ) و (گەرمیان) ەوە، پۆل، پۆل، جوتیارو لادێیەکان هاتوون بۆ توو کڕین، بەڵام هێشتا کڕیاری گوێز نەهاتوون.)

# دەگا شێخان

- پێناسە
- ناوی دەگا شێخان
- مێژووی دورست بوونی دەگا شێخان
- دەگا شێخان وسەیرانگاکانی
- تیرەو هۆزەکانی دەگا شێخان و پیاوە ناودارەکانی
- ژیانی ئابوریو بژێوی خەڵکی دەگا شێخان
- حەکیمان وجەڕاحەکان
- دەگاشێخان ومزگەوت
- دەگا شێخان وقوتابخانە
- حاکمەکانی دەگا شێخان
- خەبات وقوربانی دانی خەڵکی دەگا شێخان
- دەگا شێخان لەڕاگوازتن ودوای ڕاپەڕین

# دەگاشێخان[10]

دەگاشێخان لە ڕۆژ هەڵاتی بیارەوەیە،( ٣ کم) لە بیارەوە دوورە، (١١کم)یش لەڕۆژ ئاوای تەوێڵەوەیە.لە باشورەوە بەرەو باکوری ڕۆژ هەڵات، تەپۆڵکەو چیاکانی: بانیتا، ملە دەرەشۆڵا، لوتکەی سیپەی کوێخا ئیبراهیم، لیدۆڵێ، کەمەر بەڕەزا.

بەرەو خۆر ئاوا: هەوارا، گامەخەڵ، باخچە میرە، سەردەرەوەن، ملەخانەگای ژوورین، ملە خانەگای خوارین، ملەگاو کاواتی، لە نێوان ئەم تەپۆڵکەو چیایانەدا چەمێکی تەسکی درێژی قوڵ- کەچەند وردە چەمێکی تری دێتەوەسەر- پێکهاتووە، کەپێی دەڵێن: (چەمی دەگاشێخان) ولەلای باشورەوە دەڕژێتە نێوچەمی بیارەوە. ئەوچەمە بەناوی گوندەکەوە ناونراوە(دەرەو دەگاشێخانی).

گوندەکە ڕوو بەقیبلەیە پاڵیداوە بەچیای (کەمەر قەتارا)وە، وەلەنێوان چیای( باخچەمیرە)و چیای(سەردەرەوەن) دایە.

ئاواییەکانی دەوروبەری بریتین لە: تەوێڵەو بەڵخەو دەرە قەیسەروو بیارە لە دیوی عێراق دا، کەیمنەو هانە گەرمڵەش لەدیوی ئێران دا.

### ناوی دەگاشێخان[11] :

ناوی گوندەکە وشەیەکی لێك دراوە، لەدوو وشەی(دەگا + شێخان) دروست بووە. وشەی (دەگا) بەزاری هەورامی واتە(دێ)، وشەی (شێخان) یش، کۆی (شێخ)ە، بەم جۆرە ناوەکە بەسۆرانی واتە(دێی شێخان) کەچی وشە کەبەهەڵە لەلایەن دەزگا ڕەسمی یە کان و هەندێ خەڵکەوەبە(دەرگاشێخان) وەرگیراوە. ئەمەش لە وەوە ئەم هەڵەکراوە کەهەورامی وتویەتی دەگا، سۆرانی بەدەرگا تێگەیشتووە، چونکە وشەی دەگا لە سۆرانی دانیە.

### بۆچی بەدەگا شێخان ناونراو؟

وەك دەردەکەوێت ژمارەیەك شێخ لەم دێیەدا ژیاون، چەند ئارامگا (مەرقەد)ێك لەدەوروبەری ئەم دێیە دا شوێنەواریان ماوەو هەیە وەك: لەڕۆژ هەڵاتیەوە گۆڕی (دەروێشە پرچنە)، لەسەرووی ڕۆژهەڵاتیەوە گۆڕی( ئیمام ڕەزا)، لەڕۆژ ئاوایەوە ئارامگای (ئیمام قاسم وشێخ ئەحمەد جامی وشێخ مەحمودی برای). لەباشورەوە (تفلی ساواو شێخ مەزران).

لەنەوەی ئەم شێخانە (شێخ عارف وشێخ قەسیم) بوون، کەلەدەورو بەری ساڵی(١٩٣٠ن) کۆچی دوایان کردووە. ئەمانیش ئێستا نەوەیان ماوەکە (شێخ حەمە عارف مصطفە فا عارف وشێخ محەمەد ئەبوبەکرتەها قەسیم)ن. جالەبەر بوونی ئەم شێخانە کەتیایدا ژیاون بەوناوەوە ناونراوە.

## مێژووی دروست بوونی دەگا شێخان.

ئەم دێیە، هەرچەندە بەتەواوی و بەشێوەیەکی ڕاست وڕوون مێژووی دروست کردنی نازانین، بەڵام بەقسەی پیاوە بەتەمەنەکان دەماو دەم لەباب و باپیرانیانەوە بیستویانە کەئەم دێیە زۆرکۆنەو سەدان ساڵە هەربووەو هەیە، ئێمەش بەپشت بەستن بە چەند بەڵگەیەك دەتوانین لە سەر مێژووەکەی چەند قسەیەك بکەین، لەوانە:

- هەندێك دەڵێن: ئەم بنارەی هەورامان کەوتوەتە ژێر دەسەلأتی ئەسکەندەری مەکدۆنییەوە، بەزۆر کراون بە(نەصرانی) جانەریت وباوی ئەو سەردەمەش وابووە کەزاخەیەکی گەورەیان دروست کردوەو هەرکەس مردووە، خستویانەتە ناو ئەو زاخە گەورەوەو پێیان گوتووە ( گۆڕیچە).

جاتا ئێستاش لە نزیك ئەم گوندەوەو لەدامێنی ڕۆژ ئاوایەوە، باخێك هەیەو ماوە، ناوی (گۆڕیچە)یە. بەم پێ یە دەکرێت بگوترێت: دێی دەگاشێخان لە و ڕۆژگارەدا هەبووەو، ئەو ناوی گۆڕیچەیە دەگەڕێتەوە بۆئەو سەردەمە.

- هەندێکی تردەڵێن: ئەم دێیە لەبیارە کۆنترەو دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی ساسانیەکان کەئەوکاتە ناوی (داشارە) بووە.

- دەیان ساڵە، لەناو خەڵکی دەگا شێخان دا، قسەیەك بە(تەواتر) ووەك ڕاستی یەکی بەڵگە نەویست، دەکرێت ودەگوترێت، گوایا کاتی خۆی (سوڵتان ئیسحاق - سوڵتانی ساق)و (شێخ ئەحمەدی جامی) لەسەر موڵکیەتی دەگاشێخان بووە بەهەراو ناکۆکیو قڕەیان، دواجار چوونەتە لای (تڵفی ساوا)و کێشەکەی بۆ چارەسەر کردون و، دەگا شێخانی داوە بە شێخ ئەحمەدو سوڵتانی ساقی ناردووە بۆ قەراغ ڕۆخانە، بۆگوندی (پیردیوەر) ی سەرڕوباری سیروان، لەنزیك گوندی(شێخان) ی ئێستای ناوچەی هەورامانی لهۆن.

دەبێ ئەوەش بزانین، کەسوڵتان ئیسحاق لەسەدەی چواردەهەمی زاینی داژیاوە لەساڵی( ٧١٦ك)ی بەرامبەر بە(١٣١٦-١٣١٧ن)ی هاتۆتە دنیاوە[١٢].

بەم پێ یەش بێت( دەگاشێخان) ئەوکاتە هەبووە، کەواتە: تەمەنی دەگاشێخان (٢٠٠٣-١٣١٧- ٦٨٦) شەش سەدوهەشتاو شەش ساڵ زیاترە.

لەساڵی (١٩٦٢ن) دا، م. جەمال بێدار بەچاوی خۆی لەگۆڕستانەکەی (دەروێشە پرچنە)دا، کێلێکی مەرمەڕی دیووە، لەسەر گۆڕێك بەعەرەبی لەسەری هەڵکەندراوەو، ناوی مردووەکەو مێژووی مردنەکەی لەسەر نوسراوە،کەحیسابی کردووە تائەو کاتە کردویەتی یە(٣٦١) ساڵ واتە تائێستاکە ساڵی(٢٠٠٣) یە دەکاتە (٤٠٣) ساڵ.

- هەروەها... لەرۆژئاوای دەگاشێخانەوە، شوێنەواری دێیەك ماوە گەرچی شوێنەکەی کراوە بەباخ پێیان گوتووە(داشارە)، بەواتای (دێ‌ی‌شار) گوایە گوندێکی ئەوەندە گەورەبووە، شارەدێیەك بووە، زۆربەی خەڵکەکەی بەنەخۆشی تاعون مردون.

- لەڕۆژ هەڵاتی دەگا شێخانیشەوە، شوێنەواری دێیەك هەیە پێ‌ی دەوترێت(دەگاو هالی)، چونکە لەخواروویەوە هالێکی گەورە هەیە.. (هاڵ) شوێنێکی بەرزی سەختە کەلەبەر بەرزی‌سەر تێیدا گێژ دەخوات.

- لەخوارووی ڕۆژ ئاوایشەوە، شوێنەواری دێ یەکی تریش هەیە کەبە(کەلارو گاورا) ناسراوە، بەناوەکەیدا وادەردەکەوێ کەوەختی خۆی دانیشتوانەکەی (گاور) بوون. لەساڵی حەفتاکاندا لەم شوێنە کۆمەڵێك شت دۆزراونەتەوە، کەجارێکیان کوپەیەك دۆزراوەتەوە (٩٠) دانە سکەو شمشێرێك وپەیکەری کەڵە شێرێك وچەند شتی تری تیابووە، دۆزەرەوەکان بەپارەیەکی باش فرۆشتویانن.

ئەمانەی کەباسمان کردن، ئەوانەن، کەوادەکرێت بکرێتە بەڵگەی مێژوویی، بۆمێژووی دروست بوونی دەگا شێخان.

### دەگاشێخان وسەیرانگاکانی:

وەك لەسەرەتاوە گوتمان، دەگا شێخان دەکەوێتە نێوان ژمارەیەك تەپۆڵکەو چیای بەرزەوەو، دەڕوانێت بەسەر چەمێکی درێژی تەسکی قووڵدا، ئەم چەمەش چەند چەمێکی تری دێتەوە سەر، کەلە سەرەوە بۆ خوارەوە ئەمانەن:

چەمی هانەکە ناتر، چەمی کەمەر بەڕەزا، چەمی شێخ مامۆ، چەمی هەنارا سمێڵی، چەمی دەرەو کۆرێ، چەمی دەرە دووکەڵا، چەمی چنارە.

ئەم تەپۆڵکەو چیا بەرزو سەوزە پڕ لە دارو درەختە، بەکانیاوەکانیەوە، بەگژوگیاو لۆجاڕەوە: بە هەوای فێنك و سازگارەوە: بەجریوەی مەل و قاسپەی کەوەوە..بە باڕەو باعەی ئاژەڵەوە، بە ڕەزە دەیمەکانەوە..تەلاَن تەلاَنی باخە سەوزو قەشەنگەکانیشی بێتە پاڵ، هەمووی سەراپا دەبێتە سەیرانگایەکی فراوانی خوا کردی. سروشتی ..هەمووی دڵ و دەرون و مێشك و خەیاڵ دوێنە..خەم ڕەوێنە ..تاسکە شکێنە..حەزو ئاوات بزوێنە..خەم و داخ مرێنە.لەگەڵ ئەوەشدا سەیرانگای جوانی تایبەتی هەیە، وەك: گوزیندار، تایلێ هەوارا، هەنجیرە، دەرەو شێخ ئەحمەدی، هانەو چنارەی، هانە تازە، سەرەوەزەند، وێرگا، سەردانی، هانەو مەرێ، هانە پاڵەوان، هانەو دەرەوجانی، هانەدرەی،دەرەشۆلاَ، هانەو محەمەدی کەبەهانەی چایخانەش ناسراوە.

### تیرەو هۆزەکانی دەگاشێخان و پیاوە ناودارەکانی:

خەڵکی دەگا شێخان لە چەند تیرەو هۆزێك پێکهاتوون گرنگەکانیان ئەمانەن:

تیرەی کوێخا برایم، صۆفی عەولاَ، وەستایان، شێخان، فەقێو تیرەی عەزە ... ئەم تیرانەش خزمایەتیو تێکەلاَوی یەکی بەتین بەیەکیەوە گرێ‌داون.

خەڵکی ئەم دێیە تێکڕا، خەڵکێکی دڵپاك وڕووخۆشی بەزەوق ودەرون فراوان وبەرچاو تێرومیوان پەروەرن. لەناوخۆشیان دا هاوکاریو هاودەردی یان هەبووەو هەیەوبەردەوامە.

لە نێوان خۆشیان دا پیاوێکی ژیرو دانایان هەڵبژاردووە، بووە بەکوێخایان ودەم سپیان، ئەویش درێغی لەکارو خزمەت کردن نەکردووە. لە کوێخاکانیان: .. کوێخا ئیبراهیم عەبدوالله، کە لە ساڵی( ١٩١٥ز) کۆچی دوایی کردووە، کوێخا حەمە ڕەشیدی کوێخا ئیبراهیم، کوێخا حەمە صالح، کوێخا عیزەتی کوێخا ئیبراهیم، کوێخا حسێن الله کەرەم، کوێخا شەوکەتی کوێخا عیزەت.. بەلاَم لەدوای ڕاپەڕینەوە کوێخا ڕۆڵی نەماوە، لەجیاتی کوێخا ئەنجومەنی گوند ئەو ڕۆڵە دەبینێ.

بێگومان گەلێك پیاوی تری ناودار لەدەگا شێخان دا هەڵکەوتوون، وەك حاجی ئەحمەدی نادر، کەپیاوێکی نان بدەو بەخشندە بووە، حەمە نەبات کەپیاوێکی لێهاتوو بووە، نەوەکانی چوونەتە گوندی دەرەقەیسەر، بەڵکو دەڵێن ئەمان گوندی دەرەقەیسەریان ئاوەدان کردووەتەوە. هەروەها وەستا مستەفا،

تۆفیق صالح، ئەحمەدی فەقێ، صۆفی نعمەت، وەستا بابا، وەستا قادرو وەستا زامن ورەحمان وعەزیزوئەحمەدی عەزیزو محەمەدی نیعمەت وحەمەڕەزای وەستا مستەفاو ئەمین حەمە کەریم و عەلی مەحمود زەلام و حاجی حامدی تۆفیق و مەجید حامدو سەید باباو ئەحمەدی قادرو محەمەد طە یب و حەمەخان کەریم ومیرزا ئەمین. ئەمە جگە لەمەلاو شێخەکان و چەندانی تر..

### ژیانی ئابوری وبژێوی خەڵکی دەگاشێخان:

ئاشکرایە، ئەوسا، بەشێوەیەکی گشتی ئاستی ژیان و گوزەران نزم بووە، بەڵام خەڵکی ئەم دەڤەرە، نەبوونی وقات و قڕی لەهەموو کەسانی تری عێراق و ئێران کەمتر بەخۆیەوە دیوە، چونکە ژینگەکەی باشترین یارمەتی دەربووە.

دەکرێت بڵێین:، خەڵکەکە بەگشتی پشتی بەبەرهەمی باخات ورەزەدێمەکانیان بەستووە، هەرلەسەرووی ئەم دێیەوە، ئەم بەروئەو بەری چەمەکە هەتا دەچێتەوە چەمی بیارە، هەمووی باخ و باخاتی پڕ لەبەرهەمی جۆراوجۆرەو، بەرهەمەکانیش هەموویان دەچنە خانەی خۆراکەوە، وەك: گوێزو توو، هەنارو هەڵوژەو سێوو هەرمێو قەیسیو.. شاخەکانیش پڕن لەداربەڕوو، بلاڵووك، هەرمێ کێویلە، چەقالە، گژوگیای پاك و بەتام کەبۆ خواردنی مرۆڤ لەبارن. لاپاڵی شاخەکانیش کراوە بەڕەزەدێم، کەگەڵێ جۆرە ترێی بەتام دەبەخشن بەخاوەنەکانیان.

قەد پاڵی چیاکان وهەندێ دۆڵی نیوا نیان وچەندان تەپۆڵکەش هەن بەهۆی گاوە، یان بە پاچ وبێڵ کێڵاویانەو گەنم وجۆو گەنمە شامیان تێدا چاندووە، نۆك ونیسك وتوتن وماشیان تێدا کردووە، ئەمە جگە لەسەوزە بەهەموو جۆرەکانیەوە، کەزوربەی خێزانەکان بۆخۆیان کردویانەو، هەشیان بووە بۆفرۆشتن کردوویەتی.

کێڵگەی باخەکانی دەگاشێخان بەخەیاری گەورەو سەوزو ناسك بەناو بانگن... قەد پاڵی شاخەکانیشی بەترشە سماقی جوان وسورو ترش ناسراون.

لەگەڵ ئەمانەشدا، ئاژەڵداریو دامداریهەر هەبووەو بەبەشێك لەئابوری خەڵکەکە ژمێرراوەو سوودی پێ گەیاندون. کاروان کردن ودارفرۆشتن وکرێکاریش، بەبەردەوام لەبەر دەستی خەڵکەکەدا بوون.

لەڕووی پیشەو صنعا تیشەوە، هەندێ وردە صنعاتیان کردووە، هەرچەندە بەگشتی کۆڵ بوون لەم بوارەدا. پیشەو پیشە کارەکانیش ئەمانە بوون:

ئاسنگەرەکان .. مەلا عوسمان، وەستا ڕەحمان، وەستا مصطه فا .

جۆلاَکان .. مەلا کەریم، محەمەد عەزیز.

بەناکان .. وەستا قادر، وەستازامن، وەستا حەمە ئەمین، وەستا ئەحمەد، وەستا عەلی..

پێلاوۆدروو و کلاشکەرەکان.. وەستا حەمە طەیب فەتح الله و وەستا محەمەدی کوڕی.

کلاش چنەکان .. خالۆ ئەوڕەحمان وعەبە شەل..

تەنەکەچیەکان .. وەستا باباو وەستا عەلیو وەستا حەمە ئەمین.

هەلاجەکان .. عەلی مەحمود زەلام..

لێفەدرووەکان .. خالۆ عەباس قادر..

بەرگدرووەکان .. وەستا جەعفەر مەحمود، وەستا حەمە فەرەج ڕەحمان..

وردەواڵە فرۆشەکان .. کەریم مەحمود.

دوکاندارەکان .. قادر وەستا ئەحمەد، فرحان حەکیم، صابر جافر، عومەر جافر. شایەنی باسە، خەڵکی ئەم دێیە، خەڵکێکی بەقەناعەت وبەکەم ڕازیە، هەڵپەو تەماعی زۆرکەمەو زۆریش بەرچاو تێرە.

## حەکیمان وجەڕاحەکان:

لەناو خەڵکی دەگاشێخان دا، هەندێ کەس وەك حەکیم(پزیشك) هەڵکەتوون، لەناودارەکانیان:

تۆفیق صالح، مەلا عوسمان، حەمە خاتە، وەستا بابا، شەمامی حەمە خاتە، گەوهەرڕەحمان زۆراب کەئافرەتێکی ئێجگار زیرەك بووە لەپزیشکە وانیدا.

## دەگاشێخان ومزگەوت:

دەگا شێخان پێش ڕاگوازتن، مزگەوتێکی گەورەی لەبەشی خوارەوەی دێیەکەدا هەبوو، لەسەر کانیاوێکی ڕوون وپاك وسازگار، ئاوەکەی بەزستاندا هەڵمی لێ هەڵدەسا، بەهاوینیشدا، بەفراوێکی ساردو نایاب بوو.مزگەوتەکەش دێرین بوو، کەس نەیدەزانی کوت ومت کەی ولەلایەن کێوە دروست کراوە،

گەرچی هەندێ لەپیاوە بەتەمەنەکان باوەڕیان وابووکەبۆ یەکەمجار لەلایەن شێخ ئەحمەدی‌جامی‌یەوە دروست کراوە.بەهەرحاڵ ئەم مزگەوتە لەساڵی(١٩٣٠ز) لەلایەن (مصطە فابەگی جەعفەر سوڵطانە) وە بەشێوەیەکی نوێو جوانتر دروست کراوەتەوەو، بنمیچەکەی سەر پاك (تەختە بەند)بوو.. ئەم مەلایانەش پێشنوێژیو خوطبة خوێندنەوەیان تێدا ئەنجام داوە..

مەلا شێخ عارف، مەلا عوسمان، مەلا عەباس، مەلا بەهائەدین، مەلا کەریمی ئەحمەدی فەقێ، مەلامصطةفای بیارەیی... جارێکی‌تر مەلا کەریمی ئەحمەدی فەقێ تاڕاگوێزرانی گوندەکە.. دیارە پێش ئەمانیش کەسانی ترهەبوون، بەلاّم ئێستا ئێمە نایانزانین.

لەدوای دروست بوونەوەو ئاوەدانکردنەوەی دەگاشێخان لەم شوێنە نوێیەیدا.. بەهەوڵ وتەقەلای خەڵکی‌دێیەکە بەتایبەتی مامۆستا ئەسعەد خواکەرەم و محەمەدی حەمەطەیب وئیبراهیمی کوێخا حەمە ڕەشیدو فەرحان حەکیم و، بەوەستاییو لێبڕانی ئەحمەدی وەستا قادر.. سەرلەنوێ مزگەتێکی نوێ لەشوێنێکی ترو کەمێك لەپشت جادەوە دروست کرایەوە.. یەکگرتووی ئیسلامی کوردیش دەست گیرۆییەکی چاکی کردن و بۆی تەواوکردن.. نەخش وجێگە پەنجەی هەردیارو دیاربێت.

مامۆستا ئەسعەد کەمامۆستای قوتابخانەکەش بوو، توانی بۆماوەی (٤) ساڵ مەلایەتی مزگەوتەکەش بکات، تامامۆستا مەلا ڕێبوارسەلیم بەڵخەیی بووە مەلای ڕەسمی مزگەوتەکە، دوای ئەویش مەلا فارس حەمە طە یب هات. خەڵکی دەگا شێخان بەگشتی ئەهلی جومعەو جەماعەتن کەمیان هەبێت نوێژ نەکەن، پیاوچاك ومسوڵمانی باشی لێهەڵکەوتووە.. گەنجێکی زۆری هەیە لەدەوری ڕابوون وبانگەوازی ئیسلامی‌دا کۆبوونەتەوە.

### دەگا شێخان وقوتابخانە:

لەسەرەتای ساڵەکانی پەنجاکانەوە ژمارەیەك فەقێ لەمزگەتی دەگاشێخان دا، لای بەڕێز مەلا مصطە فای بیارەیی دەرسیان دەخوێندو، خەڵکی ئاواییەکەش زۆربەڕێزەوە سەیری دەکردن وبەپێی توانا خزمەتی دەکردن وبەفەڕوخێری ناوچەکەو دێیەکەی دەزانین.

م. مەلا مستەفا خۆی دەیگێڕێتەوەو دەڵێ:

(نزیکەی (١٥)ساڵ مەلای دەگاشێخان بووم، لەساڵی(١٩٥٦)دا کەوەصی (عەبدولئیلاه) و وەفدەکەی مەلیك هاتن بۆ دەڤەرەکەو چوون بۆ تەوێڵە، من خەڵکی دەگاشێخانم کۆکردەوەو لەسەر ڕێگە، پێشوازیمان کردن ونزیکەی چارەکێ ڕاوەستان و، داواکاری خۆمان مان پێشکەش کردن، کەبریتی بوو: لەکردنەوەی قوتابخانە لەگوندەکەمان، هەرلەوێ (عومەر عەلی) کەپارێزگای سلێمانی بوو، وەرەقەیەکی دامێو لەسەری نووسی لەبەیانیەوە دەست بەکاربە، ئیتر منیش بۆماوەی ساڵێ وەك موحاضر دەرسم وتەوە. قوتابخانەکەشمان بەناوی (مدرسة مکافحة الامیة فی قریة دەرگاشێخان)ەوە بوو، پاش ساڵێك بەشێوەیەکی ڕەسمی قوتابخانەی سەرەتایی کرایەوەو- وابزانم- یەکەم مامۆستاشی (حەسەن) ناوێبوو.).

م. جەمال بێدار دەڵێ: (لەوکاتەی (م. مەلا مصطفەفا) قوتابخانەکەی کردەوە نزیکەی (٢٠-٢٥) منالْ ڕوومان کردە قوتابخانەکەو من یەکێك بووم لەوقوتابیانە.).

دوای ئەوەی بەڕەسمی قوتابخانە کرایەوە، لەخانوەکەی (سالار)دا کە( هێوانە چەرمێ) واتە: هەیوانە سپی یان پێ دەوت، بۆماوەی (٥) ساڵ دەوامی تیاکرا تابینای تایبەتی بۆ دروست کرا.

لەم قوتابخانەیەدا چەندان مامۆستاو بەڕێوەبەر دەوامیان تیاکردووە، ئەمانە بەتەرتیب بەڕێوەبەرەکانن:

تۆفیقە فەندی، عومەرە فەندی عەبابەیلێیی، عوسمان محەمەد صالْح تەوێڵەیی ناسراو بەعوسمان هەورامی، مەنصور مەلا ظاهر بیارەیی، عەبدولمەناف عەبدولقادر غەفور تەوێڵەیی، جەمال حەبیب اللە (بێدار)، حەبیب محەمەد سەعید بەڵخەیی، محەمەد چەمچەماڵی، لەدوای ڕاپەڕینیشەوە کە لە( ٢١/ ١١/ ١٩٩٢) جارێکی تر قوتابخانە کراوەتەوە بەڕێوەبەرەکانی ئەمانەبوون:

ئەسعەد خواکەرەم دەگاشێخانی، نزیکەی (١٠)ساڵێ بەڕێوەبەر بووە، بەڵام ئێستا(٢٠٠٣) کۆسالان عومەر جەعفەر دەگاشێخانی بەڕێوەبەرە. هەروەها گەلێك کەسی تر لەم قوتابخانە مامۆستا بوون وەك:

حسێن محەمەد غەفور، موختار عەلی محەمەد، ئەبوبەکر ئیسماعیل، فەخرەدین سەلیم، جەزا حەمە صالْح، جەمیل حەبیب محەمەد.. کەئەمانە هەموویان تەوێڵەیین.

م.ئەسعەد دەڵێ: لەدوای ڕاپەڕین، کە قوتابخانە کرایەوە بۆماوەی دووساڵ تەنها خۆم بووم لە قوتابخانەکە وە(٤) پۆلم هەبوو، دوو دەوامم دەکرد، بەڵام ئێستا (١٩٩٨)،(٦) پۆلین و(٨٥) قوتابیمان هەیە، من بەڕێوەبەرم و ماموستاکانیش ئەمانەن:

خالد حەمە عەلی، سەرکەوت یوسف، هوشیار محەمەد، ئاراس قادر، کەهەرچواریان خەڵکی بیارەن، کامەران حەمە ئەمین خەڵکی هەولێرە.

## حاکمەکانی دەگاشێخان:

دەگاشێخان تاپێش دەسەلاتی بەگزادەی لهۆن، کوێخا ئیبراهیم و بنەماڵەکەی سەروکاریان کردووە، کە ئەمیش پەیوەست بووە بە عەبدوالله ئاغەی تەوێڵەوە، باج وسەرانەیەك یاتەبلیغا تێك بوو بێت لەڕێگەی ئەمەوە گەیەنراوە.

وەك پێشتر وتمان کەجافر سان هاتە سەر حوکم، مصطەفا بەگی کوڕی کەبە (سالار) ناسرابوو کردی بەحاکم و فەرمانڕەوای دەگا شێخان وبەڵخەو خەرپانی.

ئەم پیاوە دەسەلاتێکی تەواوی هەبووە، لەسەرووی دێکەوە کۆشکێکی گەورەی سێ نهۆمی بەبەردو قسڵ ودار کردبووە وەو، دەیڕوانی بەسەر باخچەیەکی جوان دا کە بە( باخچەی سالار) ناودەبرا وبەهار بەندێکی لەتەنیشتەوە بوو.

خەڵکی گوندەکە کەبەتێکڕا، گەواهی دەدەن، لەسەر ئازایەتیو بەهێزیو داوێن پاکی (سالار). ئەم حاکمە گەلێ سیفاتی جوانی تێدا بووەو کارانێکی چاکیشی ئەنجام داوە، لەوانە:

تازە کردنەوەی مزگەوتەکەی دەگاشێخان.. کڕینی باخێکی شێخ عارف بۆ مزگەوت، پاك وتەمیزیو ڕێز گرتنی مزگەوتی زۆر بەلاوە گرنگ بووە، زۆردژ بەداوێن پیس وڕەفتاری ناشیرین بووە.

## خەبات و قوربانیدانی خەڵکی دەگاشێخان:

خەڵکی دەگا شێخان، خەڵکێکی تێکۆشەری، گیانفیداکاری، موسوڵمانی ماندونەناسن، خەڵکێکی دوورەپەرێزی لە دونیا دابڕاو نین، هەرچەندە خەڵکەکەی دەرونێکی هۆگرو ئارامیان هەیە، حەزیان لەتێکەلاویو ژیانی کۆمەلایەتیيە... ئەمەش وای لێکردون کە گەلێ جار نرخی ئەوە بدەن بۆیە، لە

چاو کەمی خۆیداو لە چاو هێمنیو ئارامی خەڵکەکەیدا، دەتوانین بڵێین: قوربانی جۆراو جۆرو زۆری داوە، ئەمەش لە ئەنجامی ئەو گیانی ئیسلامەتیو کوردایەتییە بووە، کە لەناو دڵ و دەرونی خەڵکەکەیدا بووە.

دەگا شێخانەیی هیچ کاتێك درێغیان نەکردووە، لەگەڵ وڵاتەکەیاندا، بەڵکو هەمیشە پشتیوانی کێشەی ڕەوای گەلەکەیان بوون و، لە هەموو کات و ساتەکاندا پێشمەرگەیان بووەو، بەشداریان کردووە لە شەڕەکاندا دژ بەستەم و زوڵم و زۆرداری ... هەر لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا، لە شەڕی پردی زەڵمدا دژ بە زەعیم صدیق پێشمەرگەیان بووەو شەهیدشیان داوە. کە ئەویش ئەمین دەگا شێخانەیی بوو.

لە هەڵگیر ساندنەوەی شۆڕشی نوێشدا، دیسان پێشمەرگەیان بووە، وەك قادری وەستا زامنی اللە مورادو فاتح قادرو....تاد. بەڵکو لەم شۆڕشەشدا قادری وەستا زامن شەهید بوو.

بەهەر حاڵ قوربانیەکان جۆراو جۆرن و خۆیان زیاتر لە (٣٠)کەس دەدەن. ئەوەی کە دەست ئێمە کەوتبێت ئەمانە بوون، بەم شێوەیە:

- لە پێشمەرگایەتیدا:

حەمە ئەمین یوسف ئیبراهیم، ئەمین حەمە کەریم ئیبراهیم، قادر زامن اللە موراد، هادی عزەت ئیبراهیم، مەنصور شەریف، قادر حەمە موراد ئەحمەد، بورهان عەبدوڕەحمان نعمەت، حەمەخان ئەمین حەمە کەریم، دیاری حەمە تۆفیق، کەیوان عەبدوڕەحمان ئەسکەندەر، سەفەر عەبدواللە.

- لە سەربازیدا:

ئیدریس نوری مصتەفا، حەمەکەریم عەبدواللە، طاهر محەمەد نعمەت، عەبدوڕەحمان ئەسکەندەر ئەحمەد.

- لە کیمیاوی هەڵەبجەدا:

میرزا ئەمین حەمەکەریم، پیرۆز اللە کەرەم، نایافت حەمە حسین، کافیە عوسمان ئەحمەد، ئیقباڵ حەمەخان کەریم، فەریح غەفار شەریف.

- لە شەڕی عێراق و ئێران بەتۆپ کوژراوە:

قەدەم خێر جەعفەر مەحمود، طەلعەت جەعفەر مەحمود، ڕابیعە ژنی مەحمود ئەحمەد، نادیە عەبدواللە ئەحمەد، ئەمیرە حەیدەر قادر، عیرفان حەیدەر قادر، عمران حەیدەر قادر، سەمیع حەیدەر قادر .

**دەگا شێخان لە ڕاگوازتن و دوای ڕاپەڕیندا:**

لە بەرواری (١٩٧٨/١٠/١٥)لە لایەن ڕژێمی عێراقەوە دەگا شێخان ڕاگوێزرایەوە بۆ ئۆردوگای سیروان، کە ئەو کاتە(٩٥)خێزان بوون، نزیکەی (٥٥٠)کەس بوون و، مزگەوتێك و قوتابخانەیەکی تێدا بوو.ئەوسا خانوەکانی دێکە، نزیکەی (٢)کم لەسەرووی جادەکەوە بوون، بەڵام لە دوای ڕاپەڕین لە ساڵی (١٩٩١ ز)دێیەکە، لە شوێنەواری (کەلارو گاورا)دروست کرایەوە، کە جادەکە لەبەردەمی دێیەکەدایە، ئێستا دەگا شێخانی نوێ، هەر ماڵێك بۆ خۆی بەلوعەی هەیە، چونکە لەلایەن یەکگرتوی ئیسلامی کوردەوە بە هاوکاری دەزگای یونسێف بە بۆری لە کانیەکەی دەگا شێخانی کۆنەوە ئاوی بۆ ڕاکێشاون. ئەوسا کارەبای نەبوو، بەڵام ئێستا مولیدەیەکی کارەباییان هەیەو، بەشی ماڵەکان دەکات، لەگەڵ ئەمەشدا مزگەوتێکی جوان و قوتابخانەیەکی قەشەنگیان هەیە کە ژمارەی قوتابییان زیاد لە(١٢٥) قوتابین.

لەم کاتەدا (ساڵی ٢٠٠٣)خەڵکی دەگا شێخان (٦٥)خێزانیان لە دێکەن، (٣٠)ماڵیان لە هەڵەبجەی شەهیدن، (١٥)ماڵیان لە هەڵەبجەی تازەن (٣٥)ماڵیان لە سلێمانین، (٢٥)ماڵیان لە ئێران و هەولێرو شوێنەکانی ترن، واتە: بە گشتی نزیکەی (١٧٠)ماڵێك دەبن هەر بۆ ئەوەی بزانین کە دانیشتوانی دەگا شێخان لە ساڵی (١٩٥٧)دا، (٣٥١)کەس بوو کە نزیکەی (٦٦)ماڵ بوون.

دەگا شێخان - بەهاری ٢٠٠٠

# بیارە

- پێناسە
- سنورو چەم و جۆگەکانی بیارە
- بیارە لەمێژوودا
- بیارەو گەڕەکەکانی
- بیارە سەیرانگایە
- بیارەو گوزەرانی خەڵکەکەی
- تیرەو هۆزەکانی بیارە
- کوێخا کانی بیارە
- ناودارانی بیارە
- بیارە وەك دەسەلآتداریەتی
- ئافراسیاو بەگ
- ڕشتەی بنەماڵەی بەکر بەگ
- مزگەوت وخانەقای بیارە
- مەلا ئیبراهیمی بیارە
- خانەقاو خوێندنگای بیارە
- دام و دەزگا حکومی‌یەکانی ناو بیارە
- بیارەو چۆڵ بوونی
- بیارە مەڵبەندو داڵدەدەری شورشگێران بووە.
- بیارە لەدوای ڕا پەڕین
- گەشتی بیارە

# بـیـــاره (١٣)

بیاره یەکێکە لە شارۆچکەکە ڕەنگینەکانی هەورامانی لهۆن لە کوردستانی عێراق، ناوچەیەکی دێرینەو شوێنەواری کۆنی زۆری تیایە. (٢١کم) لە سەرووی هەڵەبجەوەیە،( ١٨کم) لەخورماڵەوە دوورە، نێوان تەوێڵەو بیارەش(١٤کم)ە.

**سنورو چەم وجۆگەکانی بیارە:**

بیاره کەوتووەتە سەر سنور، باخەکانی بیارەو هانە گەرمڵە تێکەڵاو بوون و چوون بەیەکدا، تەنها جۆگەیەکی بچوك هەیە لە نێوانیان دا، لە ویٚ وە دەپەڕیتەوە بۆئەو بەر کە هەورامانی ئێرانە، واتە ئەو جۆگە سنورەکەیەتی.

ئەو لادێیانەی بەشی سەرەوەی بیارە لە هەورامانی ئێران، پێکهاتوون لە (بێرواس وکێمنەو هانە گەرمڵە) هەرسێکیان کەوتوونەتە دۆڵێکی فراوان وپشتەوەیان شاخەکانی(هەیات ونوەیجەرو مارانیو تەتە)ن، ئاوی ئەو شاخ وکانیانە بەتایبەت چەمەکانی هانە گەرمڵەو هانە سواراو گوزیندارو.. دەبنەوە بەیەك ولە گەڵ چەمی(دەرەو تەکیە)دا لە بیارە یەك دەگرنەوەو چەمی بیارە پێك دەهێنن وبەناوەڕاستی بیارەدا دەڕوات ودوو سیٚ پردی بۆکراوە، ئەم بەرو ئەو بەری بیارە دەبەستێت بەیەکەوە، یەکێك لە وپردانە پردی جادەی نێوان بیارەو تەوێڵەیە دەیلکێنیٚ بەیەکەوە.

ئاوی ئەو چەمە لەخوار بیارەوە لەگەڵ ئاوەکەی (دەلێن) یەك دەگرن و، پاشان دەڕژێنە ناودەریا چەی دەربەندیخان.

بێگومان ئەم ئاوە بەم شکڵ وشێوەیەکە هەبێت و زۆربێت، لەکاتی بارانی زستان و بەهاران دا ئاوایە، چونکە لەوەختەکانی تردا، ئەم ئاوە کەمەو هەربەشی کشتوکاڵ وباخەکانیان دەکات کە لەوکاتەدا چەند جۆگەیەکی لیٚ هەڵدەکەن بۆ ئەو باخانە وەك جۆگەی:

(جوەو کۆی، جوەو بێڵە خای، جوەو ئاساوە بەرزەی، موسا قەڵبە، خواجای، باخە قوڵە، موسایان، ئەجیٚ، هانە نەوتیٚ، هانە قالاوا، زەردە هاڵە، هەزارگری، جووەو ئاش وشێخ عومەری، جووەو ئاش وموفتی.....هتد.

بێگومان ئەوسا هەموو هەورامانی کوردستانی عێراق سەربەناحیەی خورماڵ بووە، بەلاٚم لە ساڵی (١٩٧٠)وە کە بیارە کراوە بەناحیە، لە وکاتەوە ئەم شوێنانەش لە ڕووی کار گێڕی یەوە جیاکراونەتەوە لە خورماڵ وخرانە سەر ئیدارەی ناحیەی بیارە:

خودی (بیارە)، تەوێڵە، سۆسەکان، بەڵخە، پالانیا، دەگاشێخان، دەرە قەیسەر، نارنجلە، زەردەهاڵ، بنجۆدرەی، خارگێلان، گوڵپ، باخەکۆن، گەچێنە، هانەی دن، سەرگەت، دەرەی مەڕ، خەرپانی، (تاوێرە، گریانە، جاوری – ئەم سێ گوندە سەربەعەشیرەتی جافن)، (هاوار، هەوارە کۆن، دەرەتفێ– ئەم سیانەش کاکەیین بەسۆرانی جافی قسەدەکەن).

بیارە بە ناوچەیەکی شێخ نشین ناوبانگی هەیە، بەبۆنەی شێخەکانیەوە، شێخ عومەرو شێخ نەجمەدین و شێخ علائەدین و شێخ عوسمانەوە، هەروەها بوونی مووی ڕیشی پێغەمبەر (ص)(مەحاسینی شەریف)ەوە بە(بیارەی شەریفە) ناوبانگی دەرکردووە.

**بیارە لە مێژوودا:**

(ئاسەوارەکان ئەوە دەسەلمێنن، بناری شاخی سورێن و هەورامان لەگوندی نەوێ تاکو خورماڵ و، لەوێشەوە تاوەکو ئاتەشگای لای (بارا)[١٤]، (بیر)[١٥]، بیارەی ئێستا یەکپارچە کراوەتە شارێکی بەرفراوان و ئاوەدان).[١٦]

وادەرئەکەوێ (لە سەردەمی لۆلۆیی‌یەکان دا، لە شوێنی بیارەی ئێستادا شارێك هەبووە بەناوی (بیر)و ئەو شارە یەکێك بووە لە شارەکانی مەملەکەتی (زاموا)و ناوی (بیارە)ش لە ناوی ئەو شارەوە هاتووە، هەروەها لەسەردەمی لەشکرکێشی‌یەکانی (ئەسکەندەری مەقدۆنی)، بیارە ئاوەدان بووە، کەواتە: لە (دەگا شێخان)بیارە کۆنترە).[١٧]

هەروەها لوتکەی کەژی ڕۆژئاوای بیارە بە (کلاوەی ئاشور) بەناو بانگە، ئەمەش بۆ سەردەمی ئاشوریەکان دەگەڕێتەوە.

.. بیارە ئاتەشگە دەیەکی سێ چوار کیلۆمەتری درێژی تێدایەو، کاتی خۆی شارێکی زۆر درێژ بووە، کە لە بیارەی ئەمڕۆوە (کێلی ئەسپوڵ) تاوەکو (پاینی شار–بانی شار) کێشراوەو سەرپاکی‌خانوەکانی‌بە یەکەوە نوسراون ([١٨]

شاکر فەتاح لە گەشتەکەی‌دا، کەلە (١٩٣٣/٨/٢٣)کردویەتی بۆ هەورامان دەڵێ:

(.. بیارە پەنجا ماڵێکە، بەڵام بە باخ و باخات تەنراوە، ئەو چەمانەی کە بەناو دێدا دەڕوات، لە گەڵ ئاوی ئەو تاڤگەیە کەئاشەکەی شێخ ئەگێڕێ، لە گەڵ ئەو کێوو کەژە ڕەنگینەدا، چاو ئەندازێکی یەجگار ئاوازەی هەیە، لە بیارە، یەك دوو شۆڕەبیم تیادی، بالابەرز بوون، لقەکانی واشۆڕ بووبونەوە ئەتگوت پرچی

کچێکی جوانن، بەڕاستی جوانترین دارێك بوو کە لە هەورامان دا دی بووم، هەروەها بیارە لە هەموو دێهاتەکانی تر جوانترم هاتە پێش چاوو، لادێیەکان چایخانەیەکیان لە سەر ئەو چەمە لە جوانترین جێگای بیارەدا کردبووەوەو.تەخت و کورسی یەجگار نایابیان تیا دانابوو.لادێییەکانیش وەك هی ئەولا ڕێکوپێك بوون. قەیسەریەك و چەند دوکانێکی تریشی تیایە.)[19]

هەندێك دەڵێن: ناوەکەی لە وشەی (بیارە -بوێرە)وە هاتوە..[20]

(نامی) دەڵێ:[21]

| | |
|---|---|
| ابزانن یارم پێکامی بە تیر | تیری دڵگیری (بیارە)دڵگیر |
| (بیارە)مەعنای (پیادەڕێ)یە | ڕێگەی پیادەیە، پشتی ئەو دێیە |
| وەختی هێرشی، سوپای ئەسکەندەر | وڵاتیان داگرت، ئەم سەر تا ئەو سەر |
| سوارە بەدڵی، نا ئەمینەوە | هەموو سەر کەوتن، لە سورێنەوە |

پیادەش لە بیارەی خۆش سەرو سامان سەرکەوتن بۆ سەر، کێوی هەورامان

| | |
|---|---|
| جا ئەو تیەریوا، دڵبەر دای لە دڵ | دڵی کرد بەجێی، تێراوێی موشکوڵ |
| هەر لەو ساتەوە، هەتا ئەم ساتە | دڵم چاوەڕێی، بۆی بەرەکاتە |
| هەرچەند پێکامی، بە تیری نیگا | دۆعای بۆ ئەکەم، کاتی سەحەرگا |
| قەد بێزار نابم، بە ئێش و ئازار | ئازارم بۆنێ، دێنێ لە گوڵزار) |

**بیارەو گەڕەکەکانی:**

بیارە لەسەرەتای هەشتاکاندا فراوان و گەورە بووبوو، (لەلایەکەوە لەداوێنی کەلی یاخود شاخی ئاشوردا بەرەو (هارە گلان)و (قەڵا) ڕاکێشرا بوو، لەلایەکی دیکەشەوە (وەرانوەر)ی داگرتبوو بەرەو (تەپی نیعەت) کشا بوو،خۆی چەند گەڕەکێکی پرژوبڵاوی پێکەوەنابوو)

هەرە گرنگترین گەڕەکی بیارە ئەمانەن:

- گەڕەکەو سمێڵی = گەڕەکی سمێڵ
- گەڕەکەو گەلانی = گەڕەکی گەلان
- گەڕەکەو دلی دەگای = کەڕەکی ناودێ
- گەڕەکەو پەشت جۆی = گەڕەکی پشتجۆ
- گەڕەکەو هارەگلانیو قەڵێ = گەڕەکی هارەگلان وقەڵا
- گەڕەکەو لابلاو تەختە قەرەجی = گەڕەکی تەختە قەرەج
- گەڕەکەو مەرقەدیو شێخا = گەڕەکی مەرقەدو شێخان

– گەڕەکی ملەی چنارو تەپی ئەحل وتەپی کاوات... ئەم گەڕەکانە بەتایبەت ئەوانەی پێشەوە کە نوسراون کۆنن، بەڵام ئەوانەی دوایی لە گەڕەکە تازەکانن.

دەشتوانین بڵێین: بیارە بەگشتی دەکرێت بەسێ بەشەوە (سێ گەڕەکی سەرەکی یەوە).

– پشتجۆ = پشت جۆگا
– هانۆ چناری = کانی چنار
– وەراوەر = بەرامبەر

ئەوەی شایەنی باسەچونکە بیارە ناوچەیەکی شاخاویەو، خانوەکانی چین لە سەر چین و کەمیان هەیە یەك نهۆم بن، زۆربەیان بەدوو یان بەسێ نهۆم دروست کراون و خانو بەرەکەی لە دۆڵێکدایە بەشی زۆری لە خۆرئاوایە.

### بیارە سەیرانگایە:

سروشتی خاك و ئاوو هەواو باخ و باخاتی بیارە، وای کردووە کە بۆخۆی ببێتە سەیرانگا یەکی جوان وقەشەنگ وهاوینە هەوارێکی فێنك وسازگار. هەر باخێك وهەربن دارێکی بگری بۆخۆی جێگەی خۆشیو صەفاو سەیرانە، لە گەڵ ئەوەش دا هەندێ شاخ وتەپ وشوێنی هەیە، زیاتر دڵرفێن و خۆشی بەخشە بۆ سەیران و گەشت وگوزارو شایی کردن وەك:

هارە گلاَن، تەپی ئەحلە، تەپی نیعمەت، کەمەر سەلارە، ملەگای چنار، هانەوا، هێڵە گەمە، تەپە قوت، ئاسنە وەرد، ئاڵیاوا، وەیولێ، گەناوڵێ، وەزەنێ، ماوەزاو لەقە لەقا، هانە نەوتێ، کاوات،.. تاد.

| | |
|---|---|
| خۆشە بیارە، لە ڕووی هەورامان | مەنزڵگەی بیارە، سەرتا بەدامان |
| بەهەشتی عەرزە، گوڵ وگوڵزارە | بێنی دەرمانی، دەردو ئازارە |
| بێستان وباخەو، درەختی بەبەر | شۆڕەبیو چنار، بەوێنەی عەرعەر |

سەرروی سەر سەوزو، نەمامی نەوتوڵ بەسروەی شەماڵ، دێنە جم وجوڵ

| | |
|---|---|
| دەلێی قەتارەی، دۆست ودڵدارن | بۆدەست لەملان، موشتاقی یارن |
| شنەی وەنەوشەی، کەئەدا لە دڵ | دڵ بۆن خۆش ئەبێ، وێنەی پەڕەی گوڵ |
| کەدێن بەیەکا، گوڵی ڕەنگامە | سەوزو زەردو سور، وێنەی شەمامە |
| دێتە بەرچاوت، وەرەق بەوەرەق | بەرگی سندوس و، کالاَی ئیستەبرەق |
| ئامان نشینگای، یارانی سامی | فەرامۆش مەکەن، ئەحواڵی (نامی)[٢٢] |

مامۆستا کاردۆخی گەڵێ هۆنراوەی هەیە لەسەر جوانی دیمەنی(بیارە) لە هۆنراوەی(کەمەر سەلارە)دا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| (.. هاژەو دەرەیو، دەنگ وبوڵبولاَ | نمازا مەنۆ، هیچ دەردو بەلاَ |
| ڕەنگ هەراڵەو، هەڵوچا باخا | دڵە نەلابەرا، چێش ئاخ وداخا |
| دەنگ وباڵدارو، سەرچڵ و(وەنا) | قاسپەو (ژەرەژا)و، سەرو تەوەنا |
| خەمێت لابەراو، وزاوەتەوە ویر | دەورو دڵداریو، سەیرانگای دڵگیر |
| چند جوان وسورا، قۆخ وقەراخ ڕێ | زیوی تاویان،(دەرە) بەخوڕمێ |
| باعەو مەیامێ، چاکەش وهەردە | هۆرەو هیتیاریا، چەودەس چاوەردە..)[٢٣] |

لەدواییدا- لەسۆرانی یە کەدا- دەڵێ:

| | |
|---|---|
| لەبەر جوانی، خاکی کوردستان | سوپاس گوزاربووم، لەعاستی یەزدان |
| ئاواتم وابوو، جادەی (بیارە) | لە(تافا) بێتە (کەمەر سەلارە) |
| بەناو باخانا، ئۆتۆمبێل بڕوات | تەپی(نیعمەت وقەلاَوو کاوات)[٢٤] |

**بیارەو گوزەرانی خەڵکەکەی:**

بیـارە زیـاتر بەناوچـەیەکی کشـتوکاڵی و ئاژەڵداری یـەوە بەناوبانگـە، خەڵکەکـەی زۆر کـەمیان بەپیشـەی دەسـتی یەوە خـەریکن، کـەم خێـزان هەیـە کەباخی نەبێت و خەریکی کشتوکاڵ و باخداری نەبێت.

باخی بیارە، سەرەرای گوێزوتوو، باخی میوەی زۆری تیایە وەك: هەڵوژەو قەیسـی و قـۆخ وهـەنجیرو هـەرمێ و هـەنارو سـێوو تـرێ و.. هـەروەها داری چناری زۆری هەیە. جگە لەمەش کشتوکاڵی لێ دەکرێت وەك: گەنم وجۆو برنج ونۆك و لۆکەو تەماتەو پاقلەو سەوزەو میوەهاتی تر...

لەبەر ئەوەی کەوتووەتە سەر سنوریش مەڵبەندێکی بازرگانی بووە لە کۆن و نوێدا، ئەوسا ڕێگەی کاروانی خەڵکی شارەزوور بووە بەرەو پاوەو کرماشان، یـاخود بـەرەو مـەریوان وسـنە، لـە سـەردەمی تازەشـدا بازرگـانی کردنـی لـە گـەڵ گوندو شارۆچکە کانی دەورو بەری لێنەبڕاوە.

**تیروهۆزەکانی بیارە:**

خـەڵکی بیـارە وەك خـەڵکی ناوچـەکانی تـری هـەورامان، تـیرە تـیرەن و هـەر تیرەیەك دەچێتەوە سەر هۆزێك، لە هۆزەکانی بیارە وەك:

( هـۆزی گـەلان، هـۆزی سمێـل- ئـەم دوو هـۆزە دەڵـێن لەپایگەلانـەوە هاتوونەتە بیارە-، هۆزی مەلا ئیبراهیم، هۆزی بەگان، هۆزی بابا، هۆزی شێخان،

هۆزی شێخ مکێڵ، هۆزی شێخ عەلی، هۆزی مەلا عەبە، هۆزی لەیلیٚ، هۆزی حەمە شارەزووری، هۆزی نەسەخانم(حاجی خەلیفە)، هۆزی وەستایان، هۆزی حەیدەر ئاغا، هۆزی ڕەشە تەوێڵەیی، هۆزی فەتەی حەمە کەریم، هۆزی سەییدا،.. تاد.

ئەوەی شایەنی باسە: زۆرێك لەم هۆزانە لە شوێنەکانی تری بیارەوە هاتوون، لە بیارە نیشتە جیٚ بوون، بۆنمونە: هەرسیٚ هۆزی شێخان و، هۆزی ڕەشە، لە تەوێڵەوە ڕۆیشتوون...

**کوێخاکانی بیارە:**

کوێخاکانی بیارە بەزۆری لە تیرەی سمێڵ بوون کەرشتەکە یان بەم شێوەیە هاتووە:

ئیسماعیل بیارەیی یابڵێین کوێخا سمێڵ- کوێخا حەمە ئەمین- کوێخا مستەفا، کوێخا مستەفا ئەم چوار کوڕەی بووە: (کوێخا عارف، میرزا غەفور، فەتاح، ئەمین)

- لە کوێخا عارف، حاجی محەمەدو حاجی مستەفاو حەمەدەمین هەڵکەوتوون و لەو سیانە، دوانەکەی پێشەوە بوونەتە کوێخا.
- لە میرزا غەفور، حاجی ئەحمەدو خەسرەو، حەمە ڕەشید هەڵکەوتوون.
- لە فەتاح، حەمە عەلیو بارام بوون.
- لە ئەمین...؟

بێگومان لە سەردەمێکیشدا، کوێخا محەمەد کە بەشا محەمەدی فەقیٚ مەحمود ناسراوەو، لە تیرەی مەلا ئیبراهمە، کوێخاو دەسەڵاتداری بیارە بووە لەلایەن بابانەکانەوە دانراوە.

لە کوێخانی تریش ئەمانەبوون:

کوێخا عەزیز، حەمە ڕەضا، غولاٚم، عەلاون، قادر، لەساڵەکانی ئەم دواییەش حاجی مستەفا بوو بەکوێخای بیارە.

**ناودارانی بیارە:**

لە بیارەدا جگە لە بنەماڵەی مەلاو شێخ و بەگزادەو کوێخاکان، گەلێك پیاوی پیاوانەو بەسەلیقەو خوێندەوارو دونیا دیدە هەڵکەوتوون، لەوانە:

فەتحوالله حەمەکەریم، نەصروالله فەتحوالله، ڕەحمان فەتحواللە، مەحمودی مستەفاو حاجی الله کەرەم و ڕەحیمی قەصاب و فەرەجی سەعیدو جافری فەتاح و وەستا حەمە حسێن و وەستا ڕەشیدو وەستا حەمە ئەمین و

حاجی حەمە وەیس، حاجی غەفار، غەفوری حەمەسەعید، عیزەت حەمە کەریم، لەم سەردەمەشدا گەلێك ناودارو خوێندەواریان تیا هەڵکەوتووە لە هەموو چین وتوێژێك وەکو:

مامۆستا مەلا موسا حەبیب، حاجی ئەحمەد، حاجی عەبدالله، ئەمین حەمە وەیس، فائق عەبدولواحد مامۆستا بورهان مەحمود، مامۆستا حەمە ئەمینن هەورامانی، مامۆستا حەمە عەلی، مامۆستا حەمە ئەمین حاجی فەرەج...

مامۆستا مەلا موسا حەبیب

وێنەی بەڕێز حاجی ئەحمەد میرزا غەفور مستەفا بیارەیی‌یە.

ئەم ناودارەی بیارە لەدایکبووی (١٩٢٨)ە تا پۆلی شەشی سەرەتایی خوێندووە، پیاوێکی عاقڵ و داناو خواناسە، شارەزایی زۆرە لە مێژوو و ئایین دا، سێ حەجی کردووە، وێنەی ئەم جۆرە پیاوانە هەر زۆر بێت.

**بیارە وەك دەسەڵاتدارییەتی:**

بێگومان هەورامانی عێراق بەگشتی وبیارەش هەروەها.. لەلایەن سانەکانی هەورامانەوە فەرمانڕەوایی کراوە، بەڵام ماوەیەك خانەکانی ئەردەڵان دەسەڵاتیان بووە بەسەریدا، ماوەیەکیش لە ژێر دەسەڵاتی بەگزادەی جاف وبابانەکاندا بووە لەم ماوەیەشدا چونکە سەر سنوربووە خۆیان وبابان وجافەکانیش پەیوەست بوون بەدەسەڵاتی عوسمانیە کانەوە، بۆیە، عوسمانیە کان سوپایان لەم ناوچەدا هەبووە، بەڵام بەڕێوە بردنی کاروباری دەڤەرەکە، خودی کوێخای ناوچەکە کەسەر پەرشتی خەڵکەکەیان کردووەو، کاروبار یان بردوون بەڕێوە. جالە ڕاستی دا بیارەو تەوێڵە هەرماوەیەك بەدەست بنەماڵەیەکەوە بووە. بیارە ماوەیەك لەلایەن نەوەکانی بەکر بەگەوە حوکم کراوە کە دەسەڵاتداری هانە گەرمڵە بوون.. لە دەورو بەری ساڵی(١٨٤٨ز) لە سەردەمی حەمە سەعید سان دا بیارەو تەوێڵە پشت دەڵێن بەدەست پاشایانی بابانەکانەوە بوون. کە لە و کاتەدا، شا محەمەد( کوێخا محەمەدی فەقێ مەحمود) سەروکاری بیارەی کردووە،عەبدوالله ئاغاش، کوێخای تەوێڵە بووە. عەبدوالله ئاغا تاجەنگی یەکەمی جیهانی لە تەوێڵە دەسەڵاتی بووە، بەڵام شا محەمەد زۆرنابات لە سەردەمی دەسەڵاتی ڕۆستەم سان دا، دەکوژرێت، ئیتر بیارە، چەند ساڵێك محەمەد بەگ (حەمیتە)ی کوڕی حەمە سەعید سان وپاشان فەتاح بەگی برایەوە حوکم کراوە، دوای ئەمانیش ئافراسیاو بەگ لەلایەن جافرسانەوە کراوە بەحاکمی بیارەو دەوروبەری.

حوکمی ئەمانیش زۆری نەبردووە، عوسمانیە کان دەسەڵاتیان پەیدا کردووە تەوەو، بەڵام پاش ماوەیەك لەلایەن بەگێکەوە، سەربازێکی عوسمانی لەپشتی بیارە دەکوژرێت- ئەمە لە سەردەمی جافرسان دا بووە- لە سەر کوشتنی ئەم سەربازە، عوسمانیە کان وجافرسان تێك دەچن، لە سەرتاوە عوسمانیە کان چەند بەگێك دەگرن، بۆیە جافرسان پەلاماری عوسمانیەکان دەدات ولە ناو چەکەدا دووریان دەخاتەوە، بەڵام عوسمانیە کان خۆیان کۆکردوەتەوەو هێرشێکی گەورەو بێ ڕەحمانە دەکەنە سەر ناوچەکەو بەڵکو نەوسودو نۆدشەش دەسوتێنن..

کەشەڕی یەکەمی جیهانی دەست پێدەکات عوسمانیەکان لە ناوچەکە دەکشێنەوەو، بەگزادەی لهۆن دەسەڵات پەیدا دەکەنەوە.. بیارە دیسان دەکەوێتەوە ژێر دەسەڵاتی ئافراسیاو بەگ.

دەکرێت بڵێین: لەساڵی(١٨٩٥)ەوە جگە لە دووسێ ساڵێك نەبێ تاماوەی چل ساڵێك، بیارە ئافراسیاو بەگ حاکمی بووە، چونکە لە سەردەمی سانیەتی جافرسان وکەریم سان دا، هەرناوچە یەکی لهۆن بەر بەگزادەیەك کەوتووەو، بەگەلێك لەبەگزادەکان کراوەتە حاکمی ناوچەکە.

ئەم شوێنانەی خوارەوە لە سەردەمی سانیەتی- جافرسان وکەریم سان- دا بەر حاکمیەتی ئافراسیاو بەگ کەوتن:

(سەرگەت، هانەی دن، دەرەی مەڕ، باخەکۆن، گەچێنە، گوڵپ، نارنجلە، کەیمنە، هانە گەرملە، بێدرواس، بنجەی دڕەی، بیارە)

بۆیە لێرەدا بەباشی دەزانین کورتەیەك لەژیانی ئافراسیاو بەگ باس بکەین وئەوەش بڵێین، ئەوەی بەکر بەگ پێش کوێخایەتی شامحەمەد دەسەلاتیان بووە لە بیارەدا.

**ئافراسیاو بەگ**[٢٥]:

ئافراسیاو بەگ کوڕی ڕۆستەم سانی محەمەد سەعید سانە- سەیری ڕشتەی بنەماڵەکە بکە لەبەشی مێژووی هەورامان دا- دایکی ناوی خاتوودەوڵەتەو کچی (یاقۆ چاوشی کاکەڕەش)ی تەوێڵەییە.

لە ساڵی(١٨٤٧ز) لە( نەوسود) لە دایك بووە، هەر لە هەورامانیش گەورە بووەو،(١٢) ژنی هێناوەو(٩) کوڕی هەبووە.کەبووەتە یەکێك لە حاکمەکانی جافرسان وفەرمانڕەوایی ئەو شوێنانەی کەباسمان کردن پێ سپێررا، هاتە(هانە گەرملە) دانیشت و فەرمانڕەوایییەکەی کرد.

ئافراسیاو بەگ: نازناوی (سالار) بووە، کەسایەتیەکی زیرەك و،هوشیارو زۆر ئازاو بەجەرگ و کۆڵنەدەر بووە. هەرچەندە نەخوێندەوار بووە، بەلام زۆر تێگەیشتوو بووەو بەفەیلە سوفی نەخوێندەوار ناوبراوە. دەروونناس ودیبلۆماس وسیاسی ونەخشە کێش بووە، خاوەنی ئەقڵ وبیرێکی ئابوری و باخداری بەهێز بووە. حسێن بەگی برای- کەدەستی شیعری هەبووە- بەم شێوەیە باسی ئافراسیاو بەگ دەکات ودەڵێ:

| | |
|---|---|
| سالار ئیجلالەن، دیارەن جەدوور | برقەی بەیداخش،ها، نەقوبەی نوور |
| هانە ڕکابش، سەرداران چەند تەن | مەیۆوە ڕاوە، شێر بەچەی ئەژەن |
| مەر ئەفراسیاو، پادشای تورکان | بۆهام ترازووی، شێری نەوجەوان |
| وەگشت سالاران، سالار سالارەن | نەزۆری مەساف، ڕەسمش دیارەن |
| دایم موزەففەر، عەزمش وەجەزمەن | مەشهورەن نەجەنگ، سالاری ڕەزمەن |

ئافراسیاو بەگ: خاوەنی پیاوو تفەنگچی ئازاو دلێر بووە، لە کاتی پێویست دا چووە بەدەم سانەوەو لە شەڕەکاندا هاوکاری کردووە، بەتایبەت لەساڵی (١٩٣٠)دا لە (هەیات) لە گەڵ لەشکری (ڕەزمارا) توشی شەڕێکی قورس بووە، بەڵام لە ئەنجام دا تفەنگچی یەکانی بڵاوەدەکەن وخۆی لە عێراق وئێران قاچاخ دەبێت و، چەند ساڵ بەزستانان بەجلی دەروێشی لەشارەکانی کەرکوك و سلێمانی‌وچەمچەماڵ دەمێنێتەوە و، بەهاوینانیش دێتەوە لەشاخەکانی هەورامان شەڕی پارتی زانی دەکات و سەربازەکانی ڕژێمی ئێران، لەوناوە شپرز دەکات و چەند مانگێکیش ناوچەکانی هانە گەرمڵە ڕزگار دەکات. لەکۆتایدا:

(تەمساری سیاپۆش) کە ئەفسەرێکی ئێرانی بووە لە وسنورەدا، لەگەڵ سالاردا ڕێك دەکەون بەهۆی مەلا ئەحمەدی کەیمنەوە... ئێران، لێبوردن بۆ سالارو کەس وکاری دەردەکات و سەروەت و سامانەکەی پێ دەداتەوەو حسێن بەگی برایشی کەلە وکاتەدا زیندان دەبێت لە تاران ئازادی دەکات وسالاریش سەرپشك دەکات لە هەرکوێ دادەنیشێ، ئیتر سالار نەچوویەوە بەخاکی ئێران داو بڕواو متمانەی نەبوو، هاتە سەرگەت دانیشت ودەستی کرد بەکشتوکاڵ وباخداری.

- ئافراسیاو بەگ، هەورامان و عەشیرەتەکەی زۆر خۆش ویستوە، زۆر دڵی کراوەتەوە بە هەورامان و بەرگری زۆری کردووە لە خاك و خەڵکەکەی.

- لەگەڵ شێخ حیسامەدین دا نێوانیان زۆرخۆش بووە، ولە لایەکی تریشەوە زاوای شێخ نەجمەدین بووە.

- لەگەڵ مستەفا بەگی ئامۆزای دا، نێوانیان باش نەبووە.

- زۆر هاوکاربووە بۆکۆکردنەوەی قوتابخانەی بیارەو، کوڕەکانی خۆیشی- جەمیل بەگ ویار ئەحمەد بەگ، لەپێش هەموو کەسێکەوە دەنێرێتە قوتابخانە.

- ئافراسیاو بەگ، لە وکاتەی کە لە هانە گەرمڵە بووە.. کۆشك و خانویەکی جوان وڕازاوە دروست دەکات وکەبە (یانە چەرمە) بەناو بانگ بووە... مزگەوت وحەوزو ئاوو ئاوەڕۆیەکی ڕێك وپێك و جوان دروست دەکات.

- ئەدمۆندز لە گەشتەکەی بۆ تەوێڵەو بیارە.. لە بیارەوە دەچێتە هانە گەرمڵەو، شەوێك لەلای ئافراسیاوبەگ دەمێنێتەوە، زۆر سەری سوڕدەمێنێ لەوکۆشك و تەلارو خانوبەرەی سالار، بەتایبەت بەرامبەر مزگەوتەکە، چۆن ئەو ئاوو جۆگەو جێگەی دەست نوێژو تەرتیباتە، بەو شێوە جوان وڕێکوپێکە،

کەبەشێوەیەکی تەندروستیو پاك دروست کراون... دەڵێ: لە هیچ شوێنێك بەو شێوە جوان وپاك وخاوێنیو تەندروستی یە شتی وام نەبینیوە نە لە عێراق ونە لە ئێران، ئەمە بەڵگەیەکە لەوەی (ڤسباسیان)ی ئیطالیاش پێشکەوتووترە، کە(تیتوس فلابیوس)ی ئیمپڕاتۆری ڕۆمانی دروستی کردووە کەبە ئاوادانکردنەوەی ئیطالیا بەناوبانگ بووە، هەروەها دەڵێ:

بەڕاستی هەورامان زۆر جیاوازە لە شوێنەکانی تر بەتایبەت لە چاکسازی کارگێڕی- ئیصلاحیئیداری-و تەنظیماتی خەیریەوە.

بێگومان ئافراسیاو بەگ و ئەدمۆندز، سەردانی یەکتریان کردووە.. لە وکاتانەش کەسالار لە سەرگەت بووە ئەدمۆندز هاتووە بۆلایو ڕادیۆیەکی باتری تەڕی بۆ هێناوە.

بیارە - ١٨ / ٧ / ١٩٩٨

عەلی مەردان سان (٢٦)
عوسمان سان
بەکر بەگ (٢٧)
مەحمود بەگ
ئەحمەد بەگ
عەلی بەگ
فەتحوالله
فەرەجوالله بەگ
محەمەد بەگ
عەبدوالله بەگ
قادر بەگ
حسێن بەگ
سلێمان بەگ
ئاغە بەگ
حاجی عنایەت
فائق
زۆراب
ڕەحمان
تۆفیق
ڕەحمان
جانوالله
عزەت
حەمەلاو
مەجید بەگ
فەتاح
صالح
مەحمود بەگ
عەبدوالله بەگ
سەعید
محەمەد
حەمەئەمین
حەمەصالح
ڕەحمان
عوسمان
کەریم
ڕەشید
عەزیز
محەمەد
ئیدریس
زۆراب
حەیدەر
حەمەخان بەگ
نوری
قادر
صدیق
ئەمین
عەلی
کەمال
جەمال
بەهمەن
مەهدی
ئەنوەر

**مزگەوت وخانەقای بیارە:**

لە بیارەدا گەلێك مزگەوت وخانە قا بوون، وا دەگێڕنەوە کە کۆنترین مزگەوتی بیارە مزگەوتی(عەبدوالله)یە کە گوایا (عەبدوالله ی کوڕی عومەر) لە سەرەتای هاتنی ئیسلام بۆ کوردستان دروستی کردووە. (سەیری بەشی هەورامان مەڵبەندێکی ئاینی بووە لە کۆن ونوێدا بکە- باسی ئەم مزگەوتە کراوە).

هەرچۆن بێت ئەم مزگەوتە کۆنترین مزگەوتی بیارەیە، ژێر زەمینێکی سێ گەز پان وپانزە گەز درێژی بووەو کتێبی نایاب وجۆراو جۆری تیابووە، بەداخەوە ئەم کتێبانە لە ساڵەکانی حەفتاکاندا سەریان خورا.[٢٨]

دەڵێن: لەم ژێر خانەدا، سەید محەمەد( پیر محەمەد) ناوێکی تێدا نێژراوە کەبایرەی هەرەگەورەی مەلائیسماعیلی بیارەبووە، هەندێك هەر بەناوی مزگەوتی پیر محەمەد ناوی دەبەن ودەڵێن هەرئەم پیر محەمەدە دروستی کردووە.[٢٩]

ئەم مزگەوتە ڕۆڵی زۆری بینیووە لە پێگەیاندنی زۆر زانادا، وەزۆر زاناش لە مزگەوتەدا دەرسیان گوتوەتەوە، بەتایبەت نەوەی ئەم پیر محەمەدە، کەزانای ناوداری ئەم دوایی‌یان مەلا ئیبراهیمە، بۆیە بەپێویستی دەزانین کورتەیەکی لە سەر بنوسین. لە بیارەدا جگە ئەم مزگەوتە مزگەوتی تری تیایە، کەئەمانەن:

دوای ئەم مزگەوتە، خانەقا دروست دەکرێت، لەحەفتاکانیش مزگەوتی پشتجۆ لەلایەن خەڵکەوەدروست کراوە.. ئەم سێ مزگەوتە لەچۆڵ بوونی بیارەدا ڕوخان ودوای ڕاپەڕین دروست کرانەوە.

لەساڵی(١٩٩٥)یش لەوبەری پردەوە لە بەشی- کاوات- یەککگرتووی ئیسلامی کورد، مزگەوتێکی دروست کرد. هەرلە هەمان ساڵدا، لە ملە گای چنار بەڕێز حاجی فاتحی حاجی ئەحمەدی میرزا غەفووریش مزگەوتێکی دروست کرد، بەم شێوە تا ئێستا(ساڵی ٢٠٠٣) ئەم مزگەوت وخانەقایانەی تیاکراوەتەوە.

**مەلائیبراهیمی بیارە**[٣٠]

مەلا ئیبراهیم کوڕی مەلا ئیسماعیلە، کە ئەمیش لە نەوەی پیر محەمەدە. مەلا ئیسماعیل زانایەکی ناوداری سەردەمی خۆی بووە، ماوەیەکی زۆر موفتی بابانیەکان بووە. ماوەیەکیش لەمزگەوتی بیارەدا وانەی وتوەتەوەو، فەقێی زۆری پێگەیا ندووە. لە دەورو بەری ساڵی(١٢٠٠ك) لەجیهان دەرچووە، دەڵێن: ئەم مەلا ئیسماعیلە بیست وپێنجەم مەلایە لە ڕشتە (شەجەرە)ی بنەماڵەکەی دا. واتە بیست وپێنج پشتی مەلای بیارە بووە. ئەگەر ئەمە ڕاست بێت ئەبێ لە دەورو بەری ساڵی(٧٠٠)کۆچی یەوە ئەم بنەماڵە لە بیارەدا مەلابوون. مەلا

ئیبراهیم لە لای مەلا ئیسماعیلی باوکی دەستی کردووە بەخوێندن، لە دوای کۆچی باوکی دێتە سلێمانی لای سەید عەبدولکەریمی بەرزنجی دەخوێنێ، چەند ساڵێك دەمێنێتەوە، تاوەکو مۆڵەتی مەلایەتی وەردەگرێو، لە ساڵی(١٢٠٤یاە ١٢٠٥) ی کۆچی لە گەڵ چەند فەقێ یەکی موستە عیدی باش دەگەڕێتەوە بیارەو، دەبێتە مەلاو مودەڕیسی بیارەو، جێگەی باوکی دەگرێتەوەو، لە لایەن بابانیە کانیشەوە یارمەتی زۆری دەدەن و چەند پارچە باخ لەپشتجۆگەی بۆ تاپۆ دەکەن و بۆ خەرجی خۆیو قوتابیەکانی.

مەلا ئیبراهیم لە سەردەمی ئەوڕەحمان وئیبراهیم پاشای بابان ژیاوەو سەردەمێك (قاضی القضاة) موفتیان بووە، تێبینیو فتواو قەزاوەتی تۆمارکراوی زۆری بووە کەپێویستی یان بە کۆکردنەوە هەیە.

مەلا برایم زانایەکی بەرزبووە بەتایبەتی لە زانیاری بەلاغەدا. ئەڵێن: کەم مەلا بووە وەکو ئەم مەلائیبراهیمە کتێبی (عیصامەدین وەضعی) زانیبێ. واباوە مەولاناخالید لە خوێندنگای (مەلا برایم وشێخ عەبدوللەی خەرپانی ومەلا جەلالی خورماڵی)دا خوێندویەتی. چونکە ئەم سێ خوێندنگا لەو سەردەمەدا لە خوێندنگا بەرزە کانی کوردستان بوون.

مەلا ئیبراهیم لە خوێندنگای بیارە دەرسی وتووەتەوە هەتا لە ساڵی(١٢٥٠ك)دا بەرەحمەتی خواچووە.

**خانەقاو خوێندنگای بیارە**

یەکێکە لە وەڵبەندە ئاینی ورۆشنبیریانەی کوردستان، کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، ڕۆڵێکی گەورەو دیاری هەبووە، لەپێگەیاندنی ژمارەیەکی زۆر ماموستای زاناو دانای کورد، کەبوونەتە هەڵگری مەشخەڵی زانست و ئەدەب و ڕێبازی نەقشبەندیو قادری، کە تاوەکو ئێستا جێگەو پلەو پایەیان لە وبوارەدا بەڕوونی دەدرەوشێتەوە. قوتابخانەی بیارە، یەکەم قوتابخانە بووە لە کوردستان دا دابمەزرێت وئەرکی پێگەیاندنی ماموستایان بگرێتە ئەستۆ، کە شێخ عومەر ضیائەدین کوڕی شێخ عوسمان نەقشبەندی تەوێڵە- خوالێیان خۆش بێت- لە ساڵی(١٣٠٧ك = ١٨٨٩ز) سەرەتا وەك مزگەوت دایمەز راندووەو پاشان بووەتە قوتابخانەو مەڵبەندێکی ڕۆشنبیری ئاینی کۆمەڵایەتی لە ناوچەکەدا، چ وەك قوتابخانەیەك بۆ زانایان وقوتابیان، چ وەك مەنزڵگایەك بۆ ڕێبازی نەقشبەندی، هەروەها ببووە داڵدەی هەژارو لێقەوماوو بێدەرەتان لەسەر تاپای ناوچەکەدا.

لەم مەدەرەسەیەدا گەلێك زانای پایە بەرزو ناودار دەرچوون. لە وانە: شێخ قاسم ئەلقەسیمی موفتی عێراق، مەلا عەبدوڵلەی وەڵزی، مەلا زەینەڵ عابدینی نۆدشە، مەلا عەبدورەحیمی چرۆستانی، مەلا بەهائەدینی دزاوەری‌و مەلا مستەفای خورماڵی‌و گەلێکی تر. لە وماموستایانەی دەرسیان وتوەتەوە، ماموستا مەلا عەبدولقادری کانی کەوەیی‌و مەلا ئەحمەدی نۆدشی.[٣٢]

خانەقای بیارە لە سەردەستی شێخ عومەر دروست کراوەو، پاشان لەسەردەمی شێخ نەجمەدین وشێخ عەلائەدین دا برەوی پێدراوەو گەلێك زانای تری بۆ هاتووە بۆ وانە وتنەوە، چەند دام ودەزگایەکی دەوڵەتیش لەم سەردەمەدا کرانەوە، بەهەر حاڵ بیارە دوو خانەقای تیاکراوەتەوە، ئەوەی سەرەوە خوێندنگاکەی تیابووە. لەئەنجامدا: بیارە بووەتە مەڵبەندی عیلم وعیرفان وبەئەزهەرێکی بچوك یابڵێین بەئەزهەری کوردستان دانراوە. هەربۆیە گەلێك شاعیرو خواناس بەشیعرە کانیان باسیان کردووە لەوانە:

بێخود لە دیوانەکەی دەڵێت:[٣٣]

خەڵکە بۆناچن لە بۆ ڕەوضە ی بیارە بۆ طە واف
خاکی وەک خاکی بەقیعەو، ئاوی ئاوی زەمزەمە

نەک بەتەنها قەیصەری ڕۆم، خادیمی دەرگای ئەوە
بۆسوجدەی حاجیبی خاقانی چین پشتی خەمە

نێرگسی ئەو تا طەبیبم بێ، چ باکم زەخمە من
بۆ بـڕینی ظاهیرو باطین، نیگاهی مەرهەمە
هێندە بۆ ئیحیای دڵی مردوو، یەدی بەیضای هەیە
گاورو جووش پێی ئەڵێن موسادەسەو عیسادەمە
ئیلتیفاتی شاهی من بۆ دۆست و دوژمن وەک یەکە
خزمەتی(سیان)ە گەربێگانەیە یامەحرەمە
خاکی بەرپێی ئەوبە، (بێخود) گەربە ڕیفعەت طالیبی
دەس بەداوێن گرتنی بۆبانی عیرفانی سوللەمە

شێخ عوسمانی دووەم ئەم شیعرە پێش کەش دەکات بە شێخ عەلائەدینی باوکی–لە مەدحی‌ئاستانەی بیارەی شەریفدا، نوسیویەتی:(٣٤)

سەرگەشتە مەبن، هەروەکو پەروین وستارە
بۆئەهلی خیرەد خۆنی‌یە، لازم بەئیشارە
هەرکەس ئەیەوێ عەفوی خودا، عومری دووبارە
ئەمڕۆ بەیەقین کەعبەیی حاجاتە بیارە
مەعلومە کەوا طوری موناجاتە بیارە
* * *

ئەتراف ودەروبانی، بەقورئانە مونەووەر
ناوهۆدەو سەقفی، بەئەحادیثە موصەووەر
ئەرواحی مەلەک گردە، لە ئەرکانی مودەووەر
باخاتی جینان ئاوی ڕەوانی وەکو کەوثە ر
وەک بوومی (بەقیع) جێگەیی ئاواتە بیارە
* * *

خاکی دەری بینایی‌یە،بۆ دیدەیی کوێران
باعیث بەشیفای زامی، دڵی چاکی ئەسیران
دەربانی دەری خان وئەمیر، شاە و وەزیران
جێی ڕەحم ودەوای نوری دڵی‌چاکی فەقیران
ساموژدەبێ واکانی کەراماتە بیارە
* * *

هەرکەس ئەیەوێ نوری عیباداتی لە دڵ بێ
ئازو هەوەسی مەحبەسی زامی دڵی‌چڵ بێ

خاریدڵ وخاشاکی هەموو پاکی بەگوڵ بێ
خۆیشیدڵی بۆهۆشی خودادۆزی بەقوڵ بێ
ئاوارە نەبێ، بەحری فیوضاتی بیارە
* * *

جێی مووی مەحاسینی نەبی سەییدی سەروەر
یەک مووی شەریفی بەنەبییێکە بەرابەر(٣٥)
بەم مەسئە لە یە ناطیقەی خۆشەرعی موطەهەر
جێی فەخری هەموو عالەم و ئەبرارە سەراسەر
عالی هیمەمە، شاهی مەقاماتە بیارە
* * *

ڕەحمێکە ئیلاهی بەویصالی شەهوماهم
ئەوشاهە کەوا صەیقەلە بۆ قەلبی سیاهم
ئەو شاهە کەوا باعیثە بۆ عیززەت و جاهم
بۆ ڕێی هودا هەر ئەوە دەسگیرو پەناهم
میرئاتی صەفا مەطلەعی ئایەتە بیارە
* * *

یاران وەرنۆسەرکەنە پێ، دیدە بەگریان
تاکەی دەگەڕێن مات وسەراسیمەو حەیران
بەو سۆزی دەروون، قرچەییدڵ سینەیی بوریان
بێنۆ بەصەفای قەلب ویەقین جەمعی برایان
بۆ نوری (ضیا) فەوزی سەعاداتە بیارە
(قانع)ی شاعیریش دەڵێ:(٣٦)

بەڕێکەوت ڕێکەت، ڕۆژێ لە ڕۆژان — هاتمە (بیارە) مەعدەنی عیرفان
زووبۆم کرابوو، باسی ئەوصافی — سەرچاوەی فەیزی بێ لە کەوسافی
ئەیانوت بێشک کانی مورادە — ڕێگەی نەجاتی ڕۆژی مەعادە
کەهفی ئەمانە بۆ خەتاباران — مەنزڵگای تەوحید بۆتەقواکاران
کەنواڕیم فەیزی لە بەر ئەباری — عەرش بوو بۆلیقای حەزرەتی باری
گرۆی شەوخێزان، دەروون ئاوەدان — ماتەم نشینان بەظاهیر وێران
ڕوانیم خەلایق ڕیز ڕیزو قەتار — ئەجووڵێنەوە، هەزار بەهەزار
یەکێ دڵ گەرمی صەدای قورئان خوێن — بەتیری عەشقی یەکێ دڵ پڕ خوێن

یەکێ موبتەدی لە عیلمی فەنا
یەکێ شەهسوار مەیدانیبەقا
یەکێ خەریکی عیلمی ظاهیر بوو
یەکێ مەنظور بوو، یەکێ ناظیر بوو
ڕۆییم، گەییمە، نانەوا خانە
برسێتیم بۆخۆم کرد بە بەهانە
داخڵ بووم بەناو ژوری نان کردن
دانیشتم لەپێی، کولێرە خواردن
وتم: نانەوا، خۆت وئیمانت
ڕۆژێ چەندێکە، مەصرەفی نانت؟
ووتی: هەرڕۆژێ میوانمان کەم بێ
هەشت پووت ئەشێلم،خاترت جەم بێ
بەعزێ ڕۆژ میوان نایەتە تەحریر
دە تەنەکە ئارد، ئەکەم بەهەویر
هێشتا بەش ناکات، ئەشێ دووبارە
هەویر بشێلم، چارم ناچارە
خۆم وچوار شاگرد، هەتا نیوە شەو
ئارامان نی یە، بەدەوانی دەو
لەوێ تێپەڕیم، چوومە خانەقا
ئەماشا ئەکەم وەک (یوم البقا)
صەفێ نوێژ ئەکا، صەفێ مەشغوڵە
صەفێ لە یادی، شاهی ڕەسوڵە
گاهێ نەعرەتەی (یاالله)ی شەیدا
ئەگاتە حوزورعەرشی بارەگا
یەکێوەک قازان، بەدڵئەدا جۆش
یەکێ لەبادەی،مەحەببەت سەرخۆش
یەکێ شاگردە، یەکێ ئوستادە
گشت کەس لە ڕوتبەی خۆیا دڵشادە
ئەمجا ڕووم کردە، ناو تە لە بەی دین
(رضوان الله عنهم أجمعين)
سوختەو موستەعید لەسەر ئیجازە
(الحمد لله) بەبێ ئەندازە
گرمەیدەرس و دەور،موتالآی تەفسیر
حوجرەی شافیعی، ئەخاتەوە بیر
پرسیم لە مەلا، کە فەقێی چەندە
وەک خونچە پشکوت بە لێوی خەندە
وتی: نازانم، هەر دێت و دەڕوا
مەپرسە لە سیڕ، کردەوەی خودا
کە دیققەتم کرد، هەر یەکە کارێ
هەر یەکە ویردێ، هەر یەک هاوارێ
شێرانی ڕێی حەق، بە عیلم و عەمەل
خەیمەو خەرگایان، بردۆتە سەر کەل
بە سۆزی دەرون، ئاهی نیوەشەو
ڕووبەڕووی مەقصەد، بێ ئارام و خەو
کاروان ڕێگەی کۆچ، سارای مەحەببەت
سەرحەڵقەی حەڵقەی شۆری طەریقەت
ئەوسا کە زانیم، بێشەی شێرانە
ئارامگای کوڕی، دڵ بێدارانە
ڕووم کردەمەجلیس،شای(سراج الدين)
(عثمانی)ی ثالث، سەرچاوەی یەقین
موجەددیدی دین، ڕەسولی ڕەهبەر
وەکیلی موتڵەق، شای (خير البشر)
خەریکی ئیرشاد، ڕێگەی خودا بوو
لە سەرتا بەپێ غەرقی لیقا بوو
بەدەس کیتابەت، بە دەم نەصیحەت
بەدڵ دڵداری، یاری طەریقەت
بە چاو تەوەججوە، بە ڕۆح هۆشیاری
لەگەڵ مریدان، بۆ نیگەهداری
نزیک تالەدوور زۆرچاک هۆشیارە
بۆ هەموو مورید، باش ئاگادارە

کەدیم ریسالەی، نەصیحەت نامە
تۆشەی ساری دەشت (یوم القیامة)
ئەینوسیەوە بۆ (عبدالرحمان)
نەتەنها بۆ ئەو، بۆ هەموو یاران
چرا ئاسابوو بۆ ڕێی هیدایەت
چاوساقی کوێربوو، بۆسەر سەعادەت
بەڵێ بە ظاهر بۆم خوێنرایەوە
گرێی مەعانیم بۆ کرایەوە
نەسیمی عەتری دای لەدەماغم
بوو بەبەرهەمی دڵەی ناساغم
ئەوسا داچڵەکام بۆ پەرێشانیم
بۆ عومری فەوتا لەڕێی نەزانیم
کردم بە چرای بەرپێی تاریکم
کردم بە عاسای دەستی باریکم
وتم: یا (کریم)، (علام الغیوب)
(رحمان الرحیم)، (غافر الذنوب)
بمکە بە خاتر، شای (قاب قوسین)
بمبەخشە بەنوور، سەییدی کەونەین
بەسۆزیسینەی، فاطیمەی مەعصوم
بەقەتلْ ناحەق، حوسەینی مەزڵووم
بەضیای قەلبی، شای (سراج الدین)
عثمانی سێهەم، موجەددیدی دین
بمخەرە زومرەی، مەنسوبی دەرگای
بێبەشم نەکەی لەسایەو سەرسای
بائیتربەس بێ، لەسەرگەردانی
فرسەتە (قانیع) بگرە دامانی

**دام ودەزگا حکومییەکانی ناو بیارە:**

**بیارەو قوتابخانە:**

قوتابخانەی سەرەتایی لە بیارەدا لە ساڵی(١٩٣٣-١٩٣٤ز) داکراوەتەوە، یەکەم مامۆستای، عەبدوالله صەبری سلێمانەیی بووە، پاشان ئەم بەڕێزانەی تر یەك لە دوای یەکتر بەڕێوە بەری ئەم قوتابخانە بوون:م. عەلی ئەمین، م. شێخ صەفائەدین تەوێڵەیی، م. محەمەد مەلاحسێن بیارەیی، م. ئەحمەد مەحمود عەزیز هەڵەبجەیی، م.محەمەد عەلی فەتاح بیارەیی، م. حەبیب فەرەیدون بیارەیی، م. مەنصور ظاهر بیارەیی،م. برهان مەحمودبیارەیی، م. صەلاح قادربیارەیی.. ئەمانە هەموو تاساڵی(١٩٨١) بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان بوون.

لە کۆتایی حەفتاکانیش قوتابخانەی دووەم بەناوی قوتابخانەی ڕەنگینی سەرەتایی کرایەوەو، م. ئیقباڵ میرزا ئەحمەد بیارەیی بوو بەبەڕێوەبەری، دواتر م. ظاهر محەمەد سەعید بیارەیی کرا بە بەڕێوەبەری تاساڵی (١٩٨١) بیارە چۆڵ کرا.

لە ساڵی پەنجاکانیشەوە قوتابخانەی کچانی تێدابووە، تاوەکو چۆڵ کردنی لە ساڵی(١٩٨١). لە سەرەتای حەفتاکانیشەوە دواناوەندی تێدا کرایەوە.

لە دوای ڕاپەڕینەوە، قوتابخانەیەکی سەرەتایی تێکەڵاوی تیا کراوەتەوە، بەڕێوە بەرەکانی ئەمانەن:

م. مودریك مەجید، م. سەرتیب محەمەد ڕەحمان، م. محەمەد عەلی فەتاح، م. یاسین کەریم، م. خالد حەمە عەلیمحەمەد، کەهەموویان خەڵکی بیارەن. ئێستاش ناوەندی ودواناوەندی تیایە.

ئەوەی شایەنی باسە:

کاتێك لە ساڵی ( ١٩٣٥)دا، کە دەوڵەت ویستی بینا دروست بکات بۆقوتابخانەی بیارە، زەوی دەست نەئەکەوت، چونکە هەمووی باخ وباخات بوو، ئەوە بوو ئافراسیاو بەگ لە باخەکەی خۆی لە (دەرەی تەکیە) ئەرزیدا بەمیری بۆبینای قوتابخانەکە.

خەڵکی بیارە خوێندەواری زۆرهەیە، چەندەها ڕۆڵەی پێگەیشتون وچەندەها مامۆستای سەرەتایی‌و ناوەندی‌و دەیەها ئەندازیارو دکتۆرو خاوەن بڕوانامەی بەرزی هەیە، هەروەها نوسەرو شاعیرو ئەدەبیی زۆریشی هەیەو پێگەیاندووە.

**شارەوانی:**

لەساڵی (١٩٥٦)دا شارەوانی بیارە دامەزراوە، یەکەم سەرۆکیش شێخ ناجی شێخ عەلائەدین بوو، پاشان حەمە سەعید بەگی دەرەشیش و عەلی تۆفیق بیارەیی بوو، لە دوای نسکۆی ساڵی (١٩٧٥)یشەوە، بورهان توفیق ئەبوبەکر بیارەی بووە تا چۆڵ بوونی بیارە ساڵی (١٩٨١).

لەدوای ڕاپەڕینیشەوە بەوەکالەت و مووەقەت سەرۆکی بووە، بەڵام لە(٢٠٠٠/١/٣) بەهەڵبژاردن ئەم بەڕێزانەی خوارەوە دەرچوون بۆ سەرۆك و ئەنجومەنی شارەوانی بیارە.

تەها کەریم ئەحمەد-سەرۆکی شارەوانی.ئەمانەی تریش بە ئەندامیەتی ئەنجومەنی شارەوانی دەرچوون..

(ڕەفعت محەمەد کەریم، طاهر حەمە عەلی عەزیز، سالم کەریم محەمەد، صاڵح محەمەد مەعروف).

**پرۆژەی جادەو ئاوو کارەبا:**

لە ساڵی (١٩٣٤)وە جادەیەکی خاکی سادە لە چەمەوە هاتووە بۆ ناو بیارە، هەر لەو ساڵەدا، ئەحمەد فەخری قایمقامی هەڵەبجە لە و جادەوە ئۆتۆمبیلێکی هێناوە بۆ ناو بیارە، بەڵام لە ساڵی (١٩٣٦)دا لافاوە گەورەکە جادەکەی بردووەو تێکی داوە.ئەو جادە بەو شێوەیە نەبووە، تا ساڵی (١٩٥٦) ئەو جادەی کە ئێستا هەیە چاك دەکرێت و دەبرێت بۆ بەرەو تەوێڵە.

**پرۆژەی ئاوی بیارە:**

لەکۆتایی پەنجاکاندا شارەوانی بیارە، هەندێ چاکسازی بۆ ئاوی بیارە کرد، تاوەکو لەحەفتاکان بەتەواوی پرۆژەی ئاوی دامەزراو بە ڕێك و پێکی چاك کراوە.

**کارەبای بیارە:**

لە ساڵی (١٩٤٢)دا، شێخ عەلائەدین موەلیدەیەکی (١٠٠) گڵۆپی هەبوو، بۆ گەڕەکی شێخان بۆ خانەقاو خوێندنگاو ماڵی خۆی بەکار دەهێنا.خودی شارەوانیش، شتێکی لەو جۆرەی هەبوو، شەوانە بۆخۆی بەکاری دەهێنا، تا لەساڵی (١٩٧٠) کارەبای سەرەکیو ناوەندی لەهەڵەبجەوە بۆی هات.لە دوای ڕاپەڕینیشەوە موەلیدەی کارەبای هەیە.

**دەزگا حکومیەکانی تری بیارە:**

**پۆلیسخانە:**

لە ساڵی (١٩٣٦)ەوە پۆلیسخانە لە بیارەدا کراوەتەوەو، تا ئێستاش بەردەوامە، یەکەم بینای کە بۆ دروست کراوە لەساڵی پەنجاکاندا بووە لەملەگای چنار بوو، بەڵام لە شەڕی عێراق ئێراندا ڕوخێنراوە، تا ئێستاش شوێنی تایبەتی بۆ دروست نەکراوەتەوە، ئێستا (موعاوینیەتی شورطەو نفوس و..) تیادایە.

**بوون بە ناحیە:**

بیارە لە سەرەتای حەفتاکاندا بووە بە ناحیە، پێشتر خۆیو گوندەکانی دەورو بەریشی سەر بەناحیەی خورماڵ بوون، کە لە ساڵی (١٩٧٠) کراوە بەناحیەو، جگە لە خودی بیارە و تەوێڵە (٢٢)گوندی خرایە سەر.

**بەڕێوەبەرەکانی ناحیە ئەمان بوون:**

فاضل سوارە تووکەیی، جەمال شێخ کەمال، سەعید یەعقوب، لە دوای نسکۆی ساڵی (١٩٧٥)یشەوە، محەمەد عەلی (ئەبولوەفا)، سیروان فەوزی سلێمانەیی بوو، ئەمە تا ساڵی (١٩٨١): لە دوای ڕاپەڕینیشەوە (ناصر ئەحمەد غەفور) بیارەیی بەڕێوەبەری ناحیەیە.

**بنکەی تەندروستی:**

بیارە لە ساڵی پەنجاکانەوە بنکەیەکی تەندروستی بۆ کراوەتەوە، ئێستاش هەر هەیە.

**فەرمانگەی كشتوكاڵی :**

لە دوای نسكۆیساڵی (١٩٧٥)وە فەرمانگەی كشتوكاڵی تیا كراوەتەوە، ئێستاش ئەو فەرمانگەیە هەیەو كۆمەڵێك فەمانبەری هەیە كەسەرپەرشتی كشتوكاڵ و باخ و دارستانەكانی ئەو ناوچەیە دەكەن .

**هەندێ زانیاری هەر بۆ زانین :**

- بۆ یەكەمجار لە دەوروبەری ساڵی (١٨٨٠ ز) كوێخا عەزیز لە لای بەگزادەی جافەوە چای هێناوە بۆ بیارە.

-ئەحمەد فەخری قایمقامی هەڵەبجە لەساڵی(١٩٣٤) ئوتۆمبێلی هێناوە بۆ بیارە.

- رادیۆ لە ساڵی (١٩٣٩) شێخ محەمەد شێخ حسامەدین هێناویەتی پاشان شێخ عوثمان هێناویەتی.

- سەعات لە مانە كۆنترە.

**بیارەو چۆڵ بوونی :**

بیارەش وەك تەوێڵەو لادێ كانی تری هەورامان، ئەمری ڕاگوێزانی هەبووە، بەلاّم وەك لە بەشی تەوێڵە باسمان كرد، بەهۆی هەوڵ وتێكۆشانی خەڵكە كەی‌و چەند هۆیەكی تر ئەمری ڕاگوازتنەوە كەی وەستاو

بیارەو تەوێڵە لە هەورامانی عێراق دا مانەوەو ڕانەگوێزران، بەلاّم لە شەڕی عێراق وئێران كەوتە بەر تۆپ وقەصف و لەساڵی (١٩٨١)دا بەرەبەرە خەڵكی خۆی چۆڵی كرد، بەلاّم تاچەند ساڵێك هەرهات وچۆی دەكرا بەهۆی بوونی هێزی چەكداری ڕزگاری‌یەوە، لەساڵی(١٩٨٨) ەوە ئیتر كەسی تیانەماو ئەویش بەركیمیاوی كەوت و زۆربەی خەڵكەكەی كە لەهەڵەبجە بوون بەشی خۆی شەهیدیان بوو، بەڵكو زۆربەی باخەكانی بیارە بەركیمیاوی كەتن وسوتان و وشك بوون، خانوەكانیان ڕوخاندوووێران بوون.

لە وساڵەدا كەچۆڵ بووە نزیكەی (٧٠) دوكانی بووە، ئوتێلێك وخانێك وئەو دام ودەزگایانەش كەباسمان كرد. ئەو ساڵەش(٤٥٠) ماڵێك بوون. لەكیمیاوی هەڵەبجەش دا نزیكەی (٨٥) كەسیان لێ شەهید بووە.

**بیارە مەڵبەندو داڵدەدەری شۆڕشگێڕان بووە :**

بیارە هەرلە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول وبگرە پێشتریش، مەڵبەندو ناوەندی شۆڕش وپێشمەرگە بووە. بەڵكوبووە بەپەناگاو داڵدە دەری پێشمەرگەو خانەوادەكانیان. چەندەها كەسیان هەبوو چەكی پێشمەرگایەتیان كردە شان

